**أَهْلَ:** راهاتن ، هۆگریی ، کەوی بوون

**أَهْلاً وَسَهْلاً:** بەخێر بێی،خۆشحاڵی دەربڕین بەهاتن و ئامادەبوونی

**إِهْلاَك:** لەناوبردن، قەلاچۆکردن

**أَهْلَب:** مەردومی تووکن

**أَهْلِيّ:** ماڵی ، کەوی

**أَهْلِيَة:** شیاوی ، گونجان، شایان

**إِهْلِيلِجِيّ:** شێوە هێلکەیی

**أَهَم:** گرنگتر، لەپێشتر

**إِهْمَال:** فەرامۆشکردن ، خستنە پشتگوێ ، وەلاخستن

**أَهْمَلَ:** فەرامۆشیکرد

**أَهَمِيَّة:** گرنگی ، بایەخ ، باك ، بەهەندگرتن

**أَهْنَأ:** خۆشتر، مەزەدارتر

**إِهْنَاء:** پیرۆزبایی کردن، بەنۆشی گیانکردن

**أَهْوَس:** شێتی، کەم عەقڵی

**أَهْوَك:** نادان و گێل ، عەقڵ نزم

**أَهْوَن:** ئاسانتر، سووکتر، ساناتر

**أَهْيَب:** بەسامتر، بەکەسایەتی

**أَهْيَف:** رقەڵە

## او - أو

**أَوَى:** پەنای برد،چووە پاڵ ، هانای برد

**أَوْب - أَوْبَاً:** رق هەستان ، خەشم گرتن

**أَوْ:** یان ، یا ، یاخود

**أَوَام:** تینویەتی

**أَوَان:** رۆژگار، چاخ ، دەم

**أَوَانِيّ:** قاپ ، قاچاخ

**أَوْبَاش:** مەردومی پەست و نیگەران

**أَوْتَار:** ژێ

**أَوْثَق:** قایمتر ، بەهێزتر

**أَوْج:** بڵندی ،چڵەپۆ، بەرزترین خاڵ ، لوتکە

**أَوْجَبَ:** فەرزیکرد،خستیە ئەستۆی

**أَوْجَدَ:** دۆزییەوە،دییەوە، بینیەوە

**أَوْجَعَ:** ئێشی پێگەیاند، ژانی بەبەرا هێنا

**أَوْحَد:** تاقانە، تاك

**أَوْحَى:** ئامازەی بۆ کرد

**أَوْحَى** خێراتر، گورج تر، توندتر

**أَوْدَاء:** چەوت و خوار ، نارێك

**أَوْدَعَ:** بەئەمانەت ئەسپەردەی کرد

**أُورُوبِيّ:** ئەورووپایی ، خەڵکی ئەورووپا

**أَوَز:** قاز

**أَوْسَط:** میانە ، ناوەڕاست

**أَوْسَع:** فراوانتر ، گوشادتر

**أَوْصَلَ:** گەیاندی، لکاندی بەیەکەوە

**أَوْصَى:** مۆچیاریی و ئامۆژگاریی‌کرد

**أَوْضَأ:** پاکیزو پوخت تر، جوانتر

**أَوْضَحَ:** رۆشنی‌کردەوە ، تیشکی خستە سەر

**أَوْطَاد:** کێوان

**أَوْعَدَهُ:** بەڵێنی پێدا

**أَوْعِيَة:** موولوولەکان

**أَوْقَ - آق (أتَاهُ بالشُؤم):** بەدبەختی بۆ هێنا ، بەلا لێی‌دا

**أَوْقَاف:** ماڵ و سامانێکە بەتەنیا تەرخانکراوە بۆ هەژارو نەداران

**أَوْقَدَ النَّار:** ئاگرەکەی داگیرساند

**أُوقِيَانُوس:** دەریا ، زەریا

**أُوكْسِجِين:** ئۆکسجین

**أَوَّل:** یەکەم ، سەرەتا

**الأَوَّل:** یەکەمین
**أولاد:** منالّ ، بەچکە
**أَوَّلاً:** یەکەم، لەپێشا، لەبەراییدا
**اولئكَ ( أُوْلاء ـ هؤلاء ):** ئــەوان ، ئەڤانـە (بۆ دوور)
**أُولُو ( أُوْلات ـ ذو أصحاب ):** خاوەن
**أُولُوْ الأَبْصَار:** خاوەن ژیریو بینا
**أُولُوهِيَة:** خوایەتی،پەروەرگاریەتی
**أَوْلَوِيَّة:** لەپێشتر، بەراییتر
**أَوَّلِي:** سەرەکی ، یەکەمی
**أَوْلَى:** چاکتر ، سازتر، باشتر
**أَوْمَأَ:** ئاماژەیکرد

## آي ـ أي

**آيَة:** نیشانە ، هێما
**آيِسَ:** نــائومێدبوو ، دڵشکـــــاوبوو، رەنجا
**آيِن:** رووناك ، رۆشن ، دیار
**أَيْ:** واتە ، یەعنی
**إِيْ:** بەڵێ، ئەرێ
**أَيّ:** کام ، کامیان ، کامە ، چ
**أَيُّ شَخْص:** کامە ، کامەیان
**أَيُّ شَئ:** چی ، چ شتێك
**أَيُّ نَوْع:** کام جۆر، کام چەشن
**أَيُّ وَاحِد:** کامیان
**أَيَا:** هۆ ،های (بۆبانگکردنی دوور)
**إِيَاب:** گەڕانەوە، هاتنەوە
**أَيَار:** مسی زەرد
**أَيَّار ( مايس ):** جـۆزەردان ، بەختەباران
**إِيَاكَ:** نەکەی ، ئامان
**أَيَّام:** رۆژگـار ، چاخ ، سەردەم ، گاف
**أَيَّام الإِسْبُوع:** رۆژانی هەفتە
**أَيَّان ( متى ):** کەی ؟ چ کات ؟

**إِيتَاء:** بەخشین ، پێدان
**إِيثَار:** خۆنـــەویستن ، خۆرەنجان بـۆ بەرانبەر
**إِيجَاب:** پێویست بوون
**إِيجَاد:** دۆزینـەوە، پەیداکردن،دیتنەوە
**إِيجَاز:** کورتە ، خولاسە، پاڵفتە
**إِيحَاء:** نیگا ، بۆ هاتن ، کەوتنە دڵەوە
**أَيَّدَ:** پشتگیری کرد، کۆمەکیکرد
**إِيدَاع:** سپاردن ، دانان
**إِيذَاء:** ئازاردان ، چەوسانەوە
**إِيرَاد:** داهات ، دەرامەت
**أَيِسَ:** ناهومێدیکرد ، هیوابڕاویکرد
**أَيْسَر:** ئاسانتر، ساناتر
**إِيصَال:** گەیاندن ، پێوە نووسان
**أَيْضاً:** هــەروەها ،دیســان ، دووبــارە جارێکی دی
**إِيضَاح:** روونکردنەوە، والآکردن
**إِيعَاز:** ئاماژەدان، بەگوێدادان
**إِيفَاد:** ناردن ، رەوانەکردن
**إِيقَاظ:** بێدارکردنەوە، بەئاگاهاتن
**إِيقَاف:** راوەستان ، داگرتن
**أَيْقَن:** دڵنیابوو، گومانی نەما
**أَيْك:** جەنگەڵ ، دارستان
**إِيكَاء:** هەڵسپاردن، بـەقـەدا هەڵواسین
**إِيكَال:** پێدان ، سپاردن
**أَيِّل:** بەرانە کێوی
**إِيلاف:** هەتککردن
**إِيلام:** ئێشان ، ژانکردن
**إِيلان:** حەوانەوە، پشوودان
**أَيْلَة:** سرووشت
**أَيْلُول( الشـــهر التاســع ):** رەزبـــــەر ، مشتاخان ، مانگی نۆ

**أيِم** (**أرْمَل - أرْمَلَة**): رەبـەن ، زگـورت ،
ژن مردوو ، شوو مردوو
**إيحَاء**: ئاماژەكردن ، نیشاندان
**إيمَان**: باوەڕ ، ئیمان
**أيْمَن**: لای ڕاست ، ڕاستە لا
**أيْن**: لەكوێ ؟ ، كوا ؟

**إينَاس**: خڵەفاندن ، خەریك كردن
**أيْنَمَا**: لەهەركوێ
**أيُّهَا**: گەلۆ ، هۆ ، بۆ بانگكردنە
**إيوَاء**: گرتنەخۆ ، جێكردنەوە
**إيْوَان**: هەیوان
**أيِيدْ**: توانا ، هێز



**أَسْبَانَغ** (سپيناخ)



**أَرْمُود** (هەرمێ)



**أَسَدْ** (شێر)



**إبْرِيق الشَّاي** (قۆری ـ چاپەز )



**إبْل** (وشتر)



**أرْنَب** (کەروێشك)



**إنَاء خَزَفِي**(قاپی کاشی)



**أصص** (ئینجانە)



**أطَار** (چوارچێوە)



**أرْجُوحَة**(جۆلانە ـ دیلانە)



**أفْعَى** (مار)



**أدْهَم** (ئەسپی رەش)



**تلفزيون** (تەلەفزیۆن)



**مروحة** (پانکە)



**ثلاجة** (یەخچال ـ سەلاجە)



**ماكنة الخياطة** (مەکینەی درومانی)



**تسجيل** (تەجیل )



**مذياع** (رادیۆ )



**كومبيوتر** (کۆمپیوتەر )



**مكواة** (ئوتو )



**تلفون** (تەلەفۆن )

## إبْتِكَارات ( بەدیهێنراوو دروستکراوەکان ) (2)



قِطَار (شەمەندەفەر)



طيّارَة (فڕۆکە )



باخِرَة (کەشتی )



سَيّارَة (ئوتومبیل )



دراجة نارية (ماتۆڕ )



دراَجَة ( پاسکیل )



الهاتف الجوال

(موبایل )



مجففة (قژ وشك کەرەوە )



آلَة فوتوغرافية (ئامێری
وێنەگرتن ـ کامیرە )



غَسّالَة (جل شۆر)



أبو جلمبو ـ سَرَطان (قرژاڵ)



أبو يَقْظان ـ ديك (كەڵەشێر)



أبوجُعْرانَة ـ جُعَل (قالۆنچە)



أبو دَقيق ـ فَراشَة (پەپوولە)



أبو كِرْش ـ أكْرَش (ورگزل)



أبو بَيض ـ عَنْكَبوت (جاڵجاڵۆكە)

# ② حرف البَاء

# ب

**ب**

دووەم پیتی زمانی عەرەبی یەو بەم مانایانە هاتووە:

1) **الإلْصَاق: أمْسَكْتُ بِالرَّجُل**

پێوەلکان وەك: پیاوەکەم گرت

2) **الإسْتِعَانَة: كَتَبْتُ بِالْقَلَم**

بەکارهێنان وەك: بەپێنووس نووسیم

3) **المُصَاحَبَة: إذْهَبْ بِسَلَام**

هاوەلایەتی وەك: بەئاشتی برۆ

4) **الظَّرْفِيَة: سَارَ بِالليْل**

دەم و کات وەك: بەشەو رۆیی

5) **البَدَل: بَاعَ الكُفْرَ بِالإيمَان**

لەجیاتی (گۆڕینەوە) وەك: بێباوەڕیی فرۆشت بەباوەڕو ئیمان

6) **التَّعْدِيَة: ذَهَبْتُ بِهِ إلَى البَيْت**

گوزەران (پەڕاندن) وەك: بردم بۆ ماڵەوە

7) **القَسَم: بِالله** : سوێند وەك: توخوا

8) **النِسْبَة: لَقِيتُ بِزَيْدٍ الأهْوَال ؛ أي بِسَبَبِهِ**

هۆ (هۆکار) وەك: بەهۆی زەیدەوە تووشی نەهامەتی بووم

9) **التَّوْكِيد وَهِيَ زَائِدَة: وَتَكُونُ الزِّيَادَة وَاجِبَة: كَأحْسَنْ بِزَيْدٍ: أي حَسَنَ زَيْدٌ : أي صَارَ ذَاحُسْنٍ**

بۆ دووپات و دڵنیایی کەبەزیادە بەکاردەهێنرێ ئەو زیادەیەش پێویستە وەك: چاکبە لەگەڵ زەید: بەمانای زەید باش بوو ـ واتە ڕەوشتی باش بوو

10) **وَقَدْ تَأتِي بِمَعْنَى (عن) و(عَلَى) و (إلَى)**

بەماناکانی (لە)و (لەسەر)و (هەتا)ش دێت

**ب ؤ**

**بُؤْبُوَة العَيْن (مُقْلَة)**: بیلبیلەی چاو ، گلێنەی چاو

**بُؤْرَة (مَرْكَز التَّجَمُّع)**: چاڵ ، بنکەی کۆبوونەوە، تیشکۆ

**بُؤْس (شَقَاء)**: هەژاری ، نەگبەتی، کەساسی ، کوێرەوەری کلۆڵی ، بێچارەیی

**بِئْر**: بیری ئاو ، قوڵکەی ئاوین

**بِئْسَ المَصِير**: بەدبەخت بیت

**ب ا ب ا**

**بَائِدْ**: دوابڕاو، سەرنگون، لەناوبەر

**بَائِر**: وێران ، کاول ، خاپور

**بَائِعْ**: فرۆشیار ، فرۆش

**بَائِن**: روون و ئاشکرا

**بَاب**: دەرگا ، دەروازە ، دەرگە

**بَابَا**: پاپای ڤاتیکان

**بَابَارِي**: بیبەری توون

**بَابِل**: ئەو شارەیە کەدەکەوێتە سەر رۆخی فورات و لەدێرزەماندا نەمردوود دروستی کردووە

**بَابُوجْ:** پاپووج ، سۆڵ

**بَـــابُونَجْ:** بەیبوونــــە، چاوەپشـــیلە ، بابوونە

**بَاتَ:** مایەوە

**بَاتِرْ:** برندە ، برەڕ

**بَاثِر:** حەسوود، ئێرەیی

**بَاحَ:** دركاندی،دەریخست،ئاشكرای كرد

**بَاحِثْ:** لێكۆڵەر، توێژەر

**بَاحَثَ:** گفتوگۆو لێكۆڵینەوەی‌كرد

**بَاخُور:** مانگی ئاسمان

**بَاخُورَاء:** چلەی هاوین

**بَاخِرَة:** كەشتی ، پاپۆڕ

**بَاخِعْ:** خۆكوژ لەداخ و خەفەتا

**بَـــاخِلْ:** ڕەزیـــل ، دەســـت قونجـــاو ، رژد

**بَــادَرَ:** دەستپێشكــەری كــرد، دەســتی پێكرد، سەرەتای خولقاند

**بَادِرَة:** دەستپێشخەری، پێشنوێن

**بَادَلَــــهُ:** گۆڕیـــــیەوە لەگــــەڵیدا، ئاڵوگۆڕیكرد

**بَادِنْ:** قەڵەو، تەن گەورە

**بَادِيْ:** سەرەتا

**بَادِيَة:** بیابان ، سارا ، چۆڵ

**بَاذِلْ:** بەخشندە، دەست گوشاد

**بَاذِنْجَان:** باینجان،باینجانە رەشە

**بَار:** مەیخانە، مەستخانە

**بَارِحَة:** دوێنێ، شەوی رابردوو

**البَارِحَة الأُولَى:** پێرێ

**بَارِدْ:** سارد ، سۆڵە

**بَارِزْ:** دیار ، ئاشكرا ، بەرچاو ، قیت

**بَـارَزَ:** بـۆ یـەكتر هاتنـە مـەیدان، بـوار لەیەك گرتن

**بَارِعْ:** لێهاتوو، بەتوانا ، شارەزا

**بَارِقَة:** هەوری تروسكەدار ، شمشێر

**بَارَكْ:** پیرۆزبێت ، فەڕداربێت

**بَارَكَ اللهُ:** خوا پیرۆزی بكات

**بَارُود:** بارووت

**بَارُودَة:** جۆرێكە لەتفەنگ

**بَارُومَتْر:** پەستان پێو

**بَارِئْ:** پەروەردگار، خوا، یەزدان

**بَازْ:** باز ، هەڵۆ

**بَاز المُلُوك:** شاباز

**بَازِغْ:** هەڵاتوو، دەركەوتوو

**بَازِلْيَا:** پاقلەی كێوی

**بَأْس:** سام ، هەیبەت ، باك ، زات

**بَاسِطْ:** راخەر ، فراوانكەر

**بَاسِلْ:** ئازا، دلێر، شێر دڵ

**بَاسِمْ:** دەم بەپێكەنین ، رووخۆش

**بَاسُور:** مایەسیری

**بَاشَا:** پادشا ، خاوەن شكۆ

**بَاشَرَ:** راستەوخۆ دەست بەكاربوو

**بَاشِق:** واشە ، سووچەر

**بَاص:** پاس ، ئۆتوبیس

**بَاصِرْ:** بینا،بینەر،دیتن ، چاوساغ

**بَاصِرَة:** چاو ،دیيە، چاڤ ، بینایی

**بَاصُورَة:** چەقالە

**بَاضَ:** هێلكەكردن

**بَاطِش:** ستەمكار، زۆردار

**بَاطِل:** نارەوا ، پرووپووچ

**بَـاطِن:** نـــاو،نێــو،ژوورەوە، نـــاواخنی هەموو شتێك

**بَاطِنِيّ:** هەناوی، ناوەكی

**بَاعْ:** باڵ ، دەست ، پەل

**بَاعَ ـ بَيْعَاً:** فرۆشتی،كڕین‌وفرۆشتنی‌كرد

بَاعِثْ: هۆ ، دۆز ، مایە
بَاغٍ: زۆردار،ستەمکار،زاڵم ، ملهوڕ
بَاقَة: دەستە، چەپکە، دەسك
بَاقِرْ: پیاوی زۆرزانو دەوڵەمەند
بَاقِعَة: دنیادیدە، ئـەوەی ئـەزموونو ڕووداوی زۆری بینیوە
بَاقِلاَء: پاقلە
بَاقِيْ: هەمیشەیی، نـەمر ، هـەردەمی، پاشماوە
بَاكِرْ: بەیانی، سبەینێ ، زوو
بَاكِرَة: کچێنی ، کچ ، مۆرنەشکاو
بَـاكُور: پەڵـە،یەکـەم، بـارانی بـەهارو پایزە کەزەوی دەبوژێتەوە پێی
بَاكُورَة: نۆبەرە ، نوخشە ، پێشەبەرە
بَاكِيْ: گرینۆك ، گرۆز (بۆ نێرینە)
بَاكِيَة: گرینۆك ، گرۆز (بۆ مێینە)
بَال: فیکر ، دەروون ، هەست ، دڵ
بَالَغَ: زیادەڕەویکرد، ڕۆچوو، گەیوو
بَـالَغَ فِـي الأَمْـر: ڕۆچـوو لەمەســەلەدا زیادەڕەویکرد لەویاسەدا
بَالِغ: باڵغ، گەیشتنە پلەی ئەرکو داوا، پێگەیشتنی عەقڵو ژیری
بَالُوعَة: ژێراو
بَالُونْ: باڵۆن
بَامْيا: بامیە، بامێ
بَـانِي: دامەزرێنـــەر، دروســـتکەر، بنیاتنەر
بَاغِض: ڕقاوی ، قیناوی
بَانْطُولْ:پانتۆڵ، شەرواڵ ، دەرپێ
بَاهِتْ: کاڵ ، کرچ ، پێنەگەیشتوو
بَاهِرْ: ڕۆشن ،درەخشان ، ئاشکرا
بَاهَرَ: شانازیکرد، بەخۆی نازیی

بَايَنَ: لێك ترازان، لێك پچڕان
بَاهِظ: گران ، نرخ بەرز
بَاهِلَة: ژنی بێشوو ، بێوەژن
بَايِع: فرۆشیار ، فرۆش

**ب ب**

بَبْر( أَسَد هِنْدِيّ۔ نَمْرٌ مُخَطَّط ): پڵنگـی خەت خەت
بَبْغَاء: تووتی

**ب ت**

بَتَّاتَـاً: بـــەهیچ کلۆجێـك ، هــەرگیز، هـەرگیزاو هەرگیز ، ببڕای ببڕای
بَتَّار: بڕەر ، لێکەرەوە ، قرتێنەر
بَتَّةً: هەرگیز ، بەهیچ کلۆجێك
بَتَر: بڕین ، لـەرەگو ریشە دەرهێنان
بَتْرَاء: کوڵەمار ، پچڕاندن ، قرتان
بَتْرُول: نەوت ، نەوتی خام
بَتُوْل: خاوێن ، پاك ، بێگەرد
بَتُوْلَــة: پــاك دامێنــی ، ئـــافرەتی گۆشەنشین کەشوونەکات

**ب ث**

بَثٌ۔ بَثَّاً :بلاّویکردەوە،پەخشیکرد
بَثُّ السِّرّ: نهێنی بلاّوکردەوە
بَثٌّ: پەخشو بلاّوکردنەوەی هەواڵ
بَـثْرَة: زیبکـــە ، گـــرمژە ، تیـــوك ، دوومەڵی پچووك ، پورگ

**ب ج**

بَجَّ۔ بُجّ: جووجەڵەی مریشك
بَجَّار( ثَـوْبٌ مُخَطَّط ): کراسـی خـەتدار، کراسی ملدار
بَجَحَ( فَـرِحَ ): پێخۆشـحاڵبوو، خـۆش نوودبوو
بَجَحَ( قَـلَّ حَيَـاؤُهُ ):خـۆی سـووككرد، ئابڕووی چوو

**بَجَدَ (أقَامَ)**: نیشتەجێبوو، دانیشتن
**بَجْدَة (أصْل)**: بنەڕەت، سەرچاوە، نەژاد
**بَجْرَ (عَظُمَ بَطْنُهُ)**: ورگی گەورەو زلبوو
**بُجْرَة (السُرَّة)**: ناوك
**بَجَسَ المَاءُ (فَجَرَهُ)**: ئاوەکەی هەڵقولان، تەقاندی، فیچقەیکرد
**بَجَعٌ (طَيْر)**: سەقاکوژ، ماسی گرە
**بَجَلَ (عَظُمَ)**: گەورەبوو، زلبوو
**بَجَمَ (سَكَتَ مِنْ فَزَعْ)**: لەترسا بێدەنگ بوو، زەنەقی چوو
**بَجْمٌ (بَلِيد أو غَبِي)**: گەلحۆ، گەمژە، گەلۆر، کەودەن
**بُجْنُهُ (بَرْشَمَةٌ)**: چەمانیەوە، پەرچی دایەوە
**بُجُوم**: ژیربوونەوە، وەستانی گریان‌و زاری
**بَجِيلٌ**: فراوان‌و گوشاد، بواردار

**ب ح**

**بَحَاثٌ**: فرەلێور،پشکنار، لێکۆڵەر، توێژەر
**بُحَاح (إخْتِنَاق لِصَوْت)**: دەنگ نوسان، دەنگ خنکان
**بَحَّار**: کەشتیەوان، دەریاوان
**بُحَار (دُوَار البَحْر)**: سەرە خولێ، دەردەدەریا
**بَحَارَة**: دەریاوانی، کەشتیەوانی
**بَحْبُوح (كَرِيم الطَبْع)**: بەخشندە، دەست بڵاو
**بَحْبُوحَة العَيْش (رَغَدُهُ)**: خۆشگوزەرانی، خۆشحاڵی
**بَحْت (خَالِص)**: پوختە، پەتی

**بَحَّة الصَوْت**: دەنگ گرێ، دەنگ نووسان
**بَحْتَر (بُحْتُرِيّ - قَصِير وَثَخِين)**: کورتە بنە، گردەپیاو
**بَحْث**: دووا، کـۆڵایەوە، گەڕان، کنەکردن، پشکنین
**بَحْثَرَ (بَعْثَرَ)**: بلاّویکردەوە،پەرشیکرد
**بَحْر (يَم)**: دەریا
**بَحَرَ- بَحِرَ (تَحَيَّرَ وَبَهِتَ مِنَ الفَزَع)**: سەرسام ما، تۆقی، واقی وڕما
**بُحْرَان (هَذَيَان المَرَض)**: وڕێنە، بزرکاندن
**بَحْرَة (بِرْكَة مَاء)**: ئەستلّ، گۆم
**بَحْرِيَّة (القُوَة البَحْرِيَّة)**: هێزی دەریایی
**بُحَيْرَة**: دەریاچە، زرێوار

**ب خ**

**بُخَار**: هەڵم
**بَخٍ**: پرخە
**بَخٍ بَخٍ**: ئافەرین، زۆرباشە، ئافەرم
**بَخْتٌ (حَظ)**: بەخت، شانس، فاڵ، هات
**بَخْتَر- تَبَخْتَر (مَشَى مِشْيَة المُتَكَبِر)**: بەفیزەوە ڕۆیی، خۆی بائەدا
**بَخَرَ- بَخِرَ الفَم (إنْتَنَ رِيحُهُ)**: دەمی بۆگەنی کرد
**بَخَّرَ (حَوَلَ إلَى بُخَار)**: کردیبەهەڵم
**بَخْس (وَاطِئ)**: هەرزان، کەم نرخ، گەنگ، نزم
**بَخَسَ (نَقَصَ القِيمَة)**: نرخیکەمکردەوە، دایبەزاند، سووکیکرد
**بَخْس (أرْضٌ تُنْبِتُ مِنْ غَيْر سقِيٍّ)**: زەوی دێم، دێمەڕۆك

**بُخـل**: رژدی ، نـان کوێـری، دەسـت قوچاو، پیسکەیی
**بَخُل**: رژدبوو، رەزیل بوو
**بُخور**: بوخورد
**بَخیل**:رژد ، رەزیل ، نان کوێر ،لەچەڕ، مەندەبوو، قەمیتەر، چاوچنۆك، پیسکە

**ب د**

**بَدْ رِجْلَیه** : لنگی بلآوکردەوە
**بُدّ (مهرَب)**: ناچاری ، بودڕ
**بَدَا( ظَهرَ ـ لاحَ )**:دەرکـەوت ، دیاربوو ، سەریهەڵدا
**بِدَائي**: سەرەتایی
**بَدّال**: دراوگۆڕەرەوە، پارەکار
**بَدّالَة**: بگۆڕی تەلەفۆن
**بَدَانَة**: قەڵەویی
**بَـدَاوَة**: کۆچـەری، ژیـانی کۆچـەریو دەشتەکیی ، چۆڵگەرێتی
**بَدَاهَة**: راستەوخۆ، بێڕامان
**بُدَاهَة**: کوتوپڕ، لەناکاو
**بِدَایَة**: سەرەتا ، خاڵی دەستپێك
**بَدَأ**: دەستی پێکرد ، سەرەتای نواند
**بَدَّدَ( شَتَّتَ )**: هـەڵی وەشـاند،لـەناویبرد، بلآویکردەوە
**بَدْر**: مانگی چواردە
**بَدَرَ**: کوتو پڕیکرد، پەلەیکرد
**بَدْر**: پەلەکە ، خێراکە،زووکە،گورج کە
**بَـدَرَ**: دەسـت پێشـخەریکرد، پێشـی کەوت
**بَدْرَة**: هەمبانە، کیسەی زێڕ
**بَدْرَقَة**: بەڕێکردن ، بەرێخستن
**بَدَعَ**: دایهێنا ، دۆزییەوە
**بَدْع**: دروستکردن ، داهێنان

**بِدْعَة**: تازە داهـاتوو، تۆبەرە، نوخشە
**بَدَلَ ـ بَدَّلَ**: گۆڕی، گۆڕییەوە
**بَدّل ـ إبْدَال**: گۆڕینەوە
**بَدَل ـ بَدیل**: بـریکار ، لەجیاتی
**بَدَلاً مِنْ**: لەبری، لەشوێنی، لەباتی
**بَدْلَة**: جل ، بەرگ ، قات
**بَدَن**: تەن ، لاشە،داروبار، جەستە
**بَدُنَ ـ بَدَنَ**: قەڵەوبوو، گۆشتیگرت
**بَدْو**: دەشتەکی، کۆچەری
**بَدْوَر(کیس النقُود )**: تورکەی پڕ لەپارە
**بَـدَوي**: بیابـان نشـین، دەوارنشـین ، سارانشین، دەشتەکی
**بَدِیـع( عَجِیـب )**: سـەیر ، سـەمەرە، سەرسوڕمێن
**بَدِیل**: لەجیاتی، لەبری، بریتی ،بریکار
**بَدِیهَة** : راستەوخۆ، بێلێکدانەوە
**بَدِیـهي**: ئاشـکرا، دیـار ، ناسـراو ، دەرکەوتوو
**بَدِیهیـة** : بێگومـان، بەڵگەنەویسـتە، بێنیاز لەبەڵگەهێنانەوە

**ب ذ**

**بَذّ( غَلَبَ )**: سەرکەوت، شکانی، زاڵبوو
**بَـذّ( رَثّ الهَیئـة )**:پـەڕپووت، شـڕۆڵ، روتەڵ
**بَذَاءة**: زمـان پیسی، بێئابڕوویی، دەم پیسی ، جنێودان
**بَذَاخ**: لوتبەرز ، فیزن
**بَذَاذَة**: پیسی ، چەپەڵی ، پۆخڵی
**بِذَار**: تۆوچێن ، ئەوەی تۆو دەچێنـێ، تۆوکردن
**بَذّال**: دەست بلآو ، گـوشاد ، گیرفـان کراوە

**بَذَأَ:** جنێویدا، قسەی ناشیرینیکرد

**بَذَرَ ـ بَذْراً:** تۆوی کرد، تۆوی چاند

**بَذَرَ المالَ:** ماڵو ساماني بەفیڕۆدا، سامانی بەهەوانتەدا

**بَذْرَة:** تۆو ، دەنك

**بَذْرَة نابِتَة:** تۆوی رواو

**بَذْعْ:** ترسو بیم

**بَذْل:**بەخشین،پێدان، بەخشندەیی

**بَذْلَ:** بەخشی ، دای

**بُذْم:** سووربوونو هۆشیاریی

**بَذُور ـ بَذِير( نَمّام ):** دەم شڕ

**ب ر**

**بَرّ:** گوێرایەڵی کرد، ملی درێژکرد

**بِرّ:** چاکە ، ئاینخوازیی

**بَرّ:** زەوی ، وشکانی، بەژ ، چۆڵ

**بُرّ:** گەنم

**بَرَا( جعَلَ فِي أنْفِه البُرَة ):** لووتەوانەی کردە لووتی

**بَرَاء:** یەکەم شەوی مانگ

**بَـــرَاءَة:** رزگــاربوون ، پاکانـــە سەرفرازبوون

**بَـرَاحْ( أرض فَضـاء لا شـجر فيـــه وَلاَ بِنَاء ):** چۆڵو بیابان ، چۆڵەوانی

**بَـرَادْ( خـزَان التَّـبْرِيد ):** ســاردکەر، ساردکار

**بَـرَّاد( الـذي يَرکَـب الآلات المَعْدَنيَــة ):** فیتەر

**بُـرَادَة( شُـقَاطَة المِـبْرَد ):** وردە ئاســن خاکەی ئاسن

**بَرَاذعِيّ( صَانِع البَرْذَعَة ):**کورتــاندرو ، کۆپان درو

**بِرَاز:** پیسایی ، پاشەڕۆ

**بَرَاز( فَضَاء ):** چۆڵ ،دەشت، دەر

**بَرَاعَة:** لێهـاتوویی، وەستایی،سەلیقە، زانایی ، شارەزایی

**بَـــرَاق:** تروســـکدار، بریســـــکەدار، ورشــــەدار، درەوشاوە، شەوقدار

**بُرَاق( فَرَس مُجَنَّح ):** دوڵدوڵ

**بَرَّاك( طَحَان ):** ئاشەوان

**بَرَانِيّ:** کۆچەر ، چۆڵپەرست، نەناسراو

**بَرَاه:** رزگاریکرد، قوتاریکرد

**بَرَايَة:** تیژکەر، هەسان، بڕیەنگ

**بَرَأ( خَلَق ):** دروستیکرد، هێنایە بوون

**بُرء ـ بُروء( شيفاء ):** چاك بوونەوە

**بَرء( خَلَق ):** دروستیکرد

**بَرْبَـر( أكْـثَر الكَلاَم ):** چەنە بــازیکرد، زۆری وت ، زۆربلێی کرد

**بَرْبَرِيّ( هَمَجِيّ ):** کێوی ، هــار، دڕندە ، هەندێك لەدانیشتوانی ئەفەریقای ژوورو

**بَرْبَرِيَّة ( هَمَجِيَة ) :** کێویتی، دڕندەیی

**بَرْبَط:** جۆرە سازێکە لەتار دەچێ

**بُرْتُقَال:** پرتەقاڵ

**بُرْتُقَالَة:** یەك پرتەقاڵ

**بُرْث:** زەمینی نەرم ، خاکی نەرم

**بُرْثُـن الطَـائِر:** چنگی مــەل، چنــگ، چەپۆك

**بُرْج( حصْن ):** کۆشك ، قەڵا، کەلو،قوللە

**بَـرْجْ( جَمِيـل ):** جـوان،خوێــن شــیرین، ئێسك سووك

**بَـرَجَ( ظَـهَر وارْتَفَــع ):** دەرکـــەوت ، بەرزبوەوە

**بَرْجَـاس( سَــرَج مَحْشُــوّ ):** کورتــان، کۆپان

**بَرْجَل:** پەرگاڵ

**بُرْجم:** چەمۆڵە
**بُرْجُمَــة:** گرێــی پەنجــە، خــەلوول، کەشك
**بَرِجَ:** بــەجێی هێشت، چۆڵیکرد، لێی نەما، بڕایەوە
**بَرَّجَ:** هیلاکی کرد، ماندوی کرد
**بَرْج:** توندوتیژی ، توندڕەویی
**بَرَدَ:** ساردبوو، ساردیکرد
**بَرْد:** سەرما ، ساردیی
**بَرَدْ( حَبُّ الغَمَام ):** تەرزە
**بُــرد( ثــوبٌ مُخَطَط ):** کراسی ملـداری، خەت خەت
**بُرداء( برد الحُمّى ):** لەرزە لەرز لەکاتی ســەرمادا، چۆقەی دان لەسەرمایا
**بُرْدَعَة( كسَاء الدابَة ):** کورتان، کۆپان
**بَرْدَقُوس:** جاترە کێویلە
**بِرْذَون:** بارگیر، یەختە، ئێختە
**بَرَزَ:** دەرکەوت، دەرهات، هاتەدەر
**بَرْزَخ:** پەردەیەکەلەنێوان دووشتدا
**بِرسَام:** ئاوبەنگ
**بِرسْكُوب:**دووربینێکـە ئـەو دیـوو دیــوار ئەبینێ، زەوی بین
**بَرسِيم:** وێنجە، سێپەڕە
**بُرْش( ممسَحَة الأرجُل ):** پێلاو سڕە ، پێپاکەرەوە
**بَرْشَمَ الرَّجُل ( أظهَر الحُــزن ):** پەشـت و دڵتەنگ بوو
**بَرِصَ:** بەڵەك بوو
**بَرَص:**نەخۆشی بەڵەکی،دووزامی
**بِرْطَــام ( ضَخم الشَــفة ):** لچـن ، لــچ ئەستوور
**بَرْطَلَ ( رَشَا ):** بەرتیلیدا
**بَرْطَلَ ( إرْشَاء ):** بەرتیلدان
**بُرْطُل( تَــاج الأسقُف ):**کلاوی‌قەشە
**بَرْطَمَ( إنْتَفَــخ غَضَبَــاً ):** لــەتوڕەییدا پیشی خواردەوە
**بَــرَعَ:** ســەرکەوت، دەرکـەوت، چــالاکی نواند ، لێهاتوویی دەرخست
**بَرْعَمَ:** گۆپکەی کرد ، چرۆیکرد
**بُرْعُم:** چرۆ،شکۆفە ،پۆخ ،گۆپکە
**بَرْغَش:** مێشـوولە وردە، خاکە، ورە
**بُرْغُل:** ساوەر ، ساڤار، پەتلە
**بُرغُوث:** کێچ
**بُرْغِيّ( لَولَب ):** برغـو، جـەڕ، مەنگەنـە، پێچ
**بَــرَقَ ( وَمِيض السَّــحَاب ):** چەخماخــە، بروسکە، تریشقە
**بَــرَقَ ( لَمَــعَ ):** درەوشــایەوە، شــەوقی دایەوە، تیشکی لێکەوتەوە
**بَرْقَشَ( لَوَّنَ ):** بۆیەیکرد، رەنگی‌کرد
**بُرْقُع( نقَــاب ):** پەچـە، رووپـۆش، تــارا، چارەپۆش
**بَرْقُوق( خوخ ):** قۆخ
**بُــرُوز:** دەرپـــــەڕیوی، هــــەڵتۆقوی ، بەرزەکی
**بَــرُوقٌ مِــنَ الرِّجَــال( جَبَــان ):** پیــاوی ترسنۆك ، بێزات ، کەم ورە
**بَرِي ( زعرور ):** گۆیژ
**بَرْقِيَة:** بروسکە ، تەلگراف
**بَرَكَ:** چۆکی دادا، یخیدا
**بَــرَكَ المَــاءُ:** گــۆلی بەســت ، پــەنگی خواردەوە
**بِرَك:** دێوەزمە، کابووس
**بِركَار:** پرگال

**بُرْكَان:** شاخی ئاگرین، گڕکان، ئاگر پرژێن
**بِرْكَة:** ئەستێل، ئاوکۆ، گۆل، گۆم، سەراو، ئاڤزێل
**بَرَكَة:** پیرۆزیی، خۆشی،دروود، بەهرەوەری، فەڕداریی
**بَرَكَع:** بەقنگدا کەوت
**بُرْكُع:** کورتەبنە، کورتەبالآ، گولە
**بَرْلَمَان:** پەرلەمان، ئەنجومەنی نوێنەران، کۆڕی نەتەوە
**بَرَم:** بادان، لوولدان، پێچدان
**بَرِمَ:** بێزاربوو، قارس بوو، بێتاقەت بوو، جاڕس بوو
**بَرَمَ:** بایدا، لولیدا
**بُرْم:** مەردومی بەدڕەوشت
**بَرْمَائِيّ:** وشکانی
**بَرْمَة( لِيَّة ):** بایەك ، خولێك ، سووڕێك
**بُرْمَة( فَخَّار ):** گلێنە، گلێنەی سورەوەکراو
**بَرْمِيل:** بەرمیل ،بۆشکە، چەلەنگ
**بَرْنَامَج:** پرۆگرام، بەرنامە
**بُرْنَيطَة:** سەپکە، شەپقە
**بُرُنْز( مَزِيج النُّحَاس ):** زەرد،مەفرەق
**بُرْهَان:** بەڵگە، سەلماندن، بەڵسا، پازە
**بُرْهَة( حِين ):** کات، ماوە، سات، دەم، تاو
**بَرْهَنَ:** سەلماندی ، بەڵسای‌کرد
**بُرْهَى:** بۆساتێکی کەم‌و کورت
**بَرْوَاز:**چوارچێوە، چێوە، چەمەرە
**بُرُوتِسْتَانْت:** پرۆتستانت ، ئاینزایەکی دیانە
**بُرُودَة:** ساردی، سەرما
**بُرُوز:** دەرکەوتن ، سەرهەڵدان، ئاشکرابوون، دیاربوون
**بُرُوسْتَات:** پرۆستات ، لوی بن میزەڵان
**بُرُولِيتَار:** پرۆلیتار، چینی کرێکار
**بُرُومِيتَر:** بارۆمەتر، باپێو
**بَرَى:** دایدا ، تیژیکرد
**بَرَى القَلَم:** قەڵەم دادان،پێنووس دادان
**بَرِيّ:** وشکانی، بێئاو
**بَرِئ:** پاکو خاوێن، بێسووچ‌و گوناه
**بَرِيَّة:** مرۆڤ، ئادەمیزاد ، مەردوم
**بَرِيتُون:**تورەکەی ریخۆڵە، هەناو، پریتۆنیۆم
**بَرِيد:** پۆست ، پەیامبەر، نامەبەر ، پۆستەچی
**بَرِيق:** تروسکایی، درەوشە، رووناکی بریسکە
**بَرِيم ( مَفْتُول ):** بادراو، لوولدراو
**بَرَم( قَيطَان ):** کشتەك، دەزووی بادراو

**ب ز**

**بَزّ:** رووتی کردەوە ، دایماڵی
**بَزّ( سِلَاح ):** چەك ، تفەنگ
**بُزّ۔ بِزّ الْمَرْأَة۔ ثَدْيِهَا:** مەمك ، مەم ، مەمکۆڵە
**بَزَّاز( تَاجِر الأَقْمِشَة ):** بازرگان ، کوتاڵفرۆش
**بُزَاق( بُصَق ):** بەڵغەم ، تف
**بَزَّازَة الأَطْفَال :** مەمکەشووشە
**بَزَّال:** ئاوکێش ، باکێش
**بَزْبَز:** بەزین ، غاردان ، تاودان
**بَزَخ:** سنگی دەرپەڕی
**بَزَر( مَلَأَه ):** پڕیکرد، فوولیکرد
**بِزر( حَب ):** تۆو ، دەنگ

**بَـرَغ**: دەرهـات، هەڵـهات، شـەبەقیدا، سپێدەیدا
**بَـزَقَ (بَصَقَ)**: تفیکردەوە، بەڵغـەمی فڕێدا
**بَزَلَ ـ بَزِلَ (ثَقَبَ)**: کونیکرد، سمی
**بَزْل**: باکێشان ، ئاوکێشان ،دەرهێنانی باو ئاو لەناو سك
**بَزْلاء**: دنیادیدە، کارامە
**بَزْلیا**: پۆڵکە
**بَزو**: چەشن ، وێنە
**بُـــزُوغ**: بەرزبوونـــەوە، هەڵـــهاتن ، دەرکەوتن
**بَزِيّ** : برا یان خوشکی شیریی
**بَزِیخ**: قسە قوت
**ب س**
**بِسَاط (سَجَّادَة)**: مافــور ، قـــاڵی، بەڕە، ڕاخەر
**بَسَاطَة**: سادەیی، ساویلکەیی
**بَسَالَة(شَجَاعَة)**: ئـازایی، زاتکـردن، نەترسان
**بَسَام**: ڕووخۆش، دەم بەپێکەنین
**بَسْبَسَة**: پشەپش
**بَسْبِیسَة**: ناوساجی
**بُسْتَان**: باخ، بێستان، دەهل
**بُسْتَانِيّ**: باخەوان، بێستانەوان
**بَسَرَ**: ڕووی گرژکرد، خـۆی مۆنکـرد، دەمو چاوی دابەیەکا
**سبُسْـر**: فەریکـە خورمـا ، خورمـــای نەگەیو
**البُسْـر**: یەکـەم تۆبـــەرەو بەرهــەمی هەموو شتێك
**بَسَـطَ**: فراوانکـــــردن، ڕاخستـــن، هەڵخستن، پانکردنەوە
**بَسُطَ**: ئاسان بوو، سانابوو
**بَسْط**: شادی، خۆش نودی
**بَسْطَة**: پانتایی، فراوانی
**بَسْطَرْمَة**: باستورمە
**بَسْكُوِيت**: پسکیت
**بَسَلَ**: ئازابوو، نەترسا، وێرای
**بَسَلَ**: گرژبوو، مۆن بوو
**بَسَمَ**: بـزەگرتی، زەردەخەنە هاتە سەر لێوەکانی
**بَسْمَة**: بزە، زەردەخەنە ، خەندە
**بَسْمَلَ**: ناوی خوای هێنا
**بَسِیط**: ســـادە، کەمـهۆش، ســاکار، سانایی
**ب ش**
**بَـشَّ(إِبْتَسَــامَة)**: زەردەخەنـــەگرتی، پێکەنی، بزەگرتی
**بُشَارَة**: مژدەدان، مزگێنی
**بِشَارَة**: خۆشی، هەواڵی خۆشی
**بَشَارَة**: ڕووخۆشی ، جوانی
**بَشَاش**: ڕووخۆش، لێوبەخەندە
**بَشَاشَـــة**: دڵخـــۆشی، ڕووخۆشـــی، کەیفخۆشی
**بَشَاعَة(قُبح)**: ناشیرینی، نابووتی
**بَاشِق**: شاهێن ، واشە
**بَشَاك(كَذَاب)**: درۆزن
**بَشَامَة(بَشَام)**:ئەو دارەیەکەچیلکەکانی بۆ ددان پاکردنـەوە بـــەکار دێ ، دان ئاژنە
**بَشَّرَ**:هـەواڵی خۆشـی هێنـا، مـژدەی هێنا

**بَشَرَ:** دڵی خۆش بوو ،شادمان بوو
**بَشَّرَ(سَحَلَ):** وردیکرد ، هاڕی، کوتای
**بِشْر(سُرور):** خۆشی، شادی
**بَشَرٌ(إنْسَان):** مرۆڤ، ئادەمیزاد
**بُشْرَى:** مژدە،مزگێنی، دەمخۆشانە
**بَشَرَة:** ڕووی پێست، توێخ
**بَشَرِيَة:** مرۆڤ، خەڵك ، ئادەمیزاد
**بَشِعَ:** ناشیرین بوو، نابووت بوو
**بَشِعٌ:** ناشیرین، ئێسك قورس
**بَشْكِير(قطيلة):** خاولی
**بَشِمَ ـ أبْشَمَ:** تێری خوارد ، مڕبوو
**بَشِير(نَذير):** مژدەهێن، دڵخۆشکەر
**بَشِيع:** پیاوی بەد شێوە، نابووت

**ب ص**

**بَصَّ(بَرَقَ):** درەوشایەوە ،بریسکایەوە
**بَصَّارَة:** ئـەوەی فـاڵ دەگرێتـەوە، بەخت گرەوە
**بَصَارَة:** بینین ، دیتن ، هـەستپێکردن، چاوکردن
**بَصَاصَة:** چاو ، بینەر، دیدە
**بُصَاق:** تف ، بەڵغەم
**بَصْبَصَ:** زمان لووسی، چاپلووسی
**بَصَّة:** سەیرکـردنێك، نیگایـەك، تێڕوانینێك
**بَصَرَ:** بینی ، چاوی پێکەوت
**بَصَّرَ:** چاوی کردەوە، چاویپشکوت
**بَصَرَ:** چاو،بینایی، هەستی بینین
**بَصَّرَهُ:**پیشانیدا،خستیە بەر چاوی
**بَصَقَ:**تفی کردەوە، بەڵغەمی فرێدا
**بَصَل:** پیاز، پیواز
**بَصَلَة:** سەلکەپیاز

**بَصَمَ(وَسَمَ):** پەنجـەمۆریکرد، شەقڵیکرد
**بَصْمَة:** مۆر
**بَصْوَة:** پشکۆ ، سکڵ
**بَصِير:** بینـا ، چاوسـاغ، زیـرەك، کارامە، زرنگ
**بَصِيرَة:** زرنگی، چاوکراوەیی ،کارامەیی
**بَصِيص:** تروسکەدار، ورشەدار

**ب ض**

**بَضّ:** شل‌و مل ، پێست نەرم
**بِضَاعَة:** کەل‌و پـەل ، کوتـاڵ، شـت‌و مەکی بازرگانی
**بَضَعَ:** هەڵی دڕیی، هەڵی قلێشاند
**بِضْع ـ بِضْعَة:** کـەم،کـەمێك ، هـەند، چەند، هێندێك

**ب ط**

**بَطّ:** مراوی ، سۆنە
**بَطَأ:** ئـارام ، هێدی ، هێور، هێمـن، بەکاوە خۆ، دواکەوت
**بَطَائة:** سستی ، خاوی ،بەسەرداهاتن، ماتەمات
**بَطَارِيَة:** پاتری، پیل
**بَطَاطَا:** پەتاتە ، گازووله
**بِطَاقَة:** پسووڵە، بلیت ، کارت
**بَطَّال:** بێئیشی، بێکار، دەست سپی
**بَطَالَة(عُطْلَة):** پشوو، حەوانەوە
**بَطَالَة(بُطُولَة ـ شَجَاعَة):** پاڵەوانێتی ، ئازایەتی، قارەمانێتی، دلێری
**بُطَان:** قەیاسە، قایش ، تەنکە
**بِطَانَة:** بەری جل بەر، ناوپۆش
**بَطَانِيَة(دِثَار):** پـەتوو، بـەتانی ، جاجم ، پێخەف ،مەوج

**بَطَحَ:** فرێیدا، هەڵیدا، توڕیدا

**بَطَّحَ:** راكشان، بەدەماكەوتن، لەپەوڕووكەوتن

**بَطْحَاء(وَادِي):** چەم ، چەمی پڕ لەچەوو خركە، ناوی سەر زەمینی مەككەیە

**البَطَّةُ:** مراوییەك

**بَطَرَ(شَقَّ):** قلێشاندن، لێكی جیاكردەوە، شەقڵی تێخست

**بَطَرَ:** ناسوپاسیكرد، لەخۆیبایی بوو، شاكەشكەیی

**بَطْرٌ:** لەخۆبایی، لووتبەرز

**بَطِرٌ:** لەخۆبایی بوون، ناقابلی ، بێزاریی، پێنەزانین

**بَطَراً:** فیڕۆ، خۆڕایی، هەوانتە

**بِطْرِير:** زمان درێژ،بێحەیا،دەلۆ قەل ، دەم درێژ

**بِطْرِيق:** جۆرە گیاندارێكە پشتی رەشەو سكی سپییە لەهەرێمە بەستەڵەكان دەژی ، پەنگوین ، پەتریق

**بَطْش:** زەبرو زەنگ، سام ، سەختی ، دەستەلاتداریی

**بَطَشَ:** زەبرو زەنگ نواندن، سەختو رەقی خستنەگەڕ

**بَطَلَ:** هەڵوەشایەوە، پووچكرایەوە، بەتاڵكرایەوە

**بَطَلَ:** ئازابوو،بوو بەپاڵەوان،دلاوەربوو

**بَطَلٌ:** ئازا ، دلاوەر، جوان مەرد، قارەمان ، دلێر، مەیاندار

**بَطَّلَ:** وازی لێهێنا، دەستی هەڵگرت

**بُطْلٌ:** درۆ ، هەڵبەست، بێبناغە

**بُطْلاَن:** هەڵوەشانەوە، پووچ بوونەوە، بەتاڵی، پووكانەوە

**بُطْم:** قەزوان،دارقەزوان ،دارەبەن

**بَطَنَ:** ورگی زلبوو، سكی هات، ورگی داكەوت

**بَطُنَ:** شاردرایەوە، پەنهانكرا، لەبەرچاو ونكرا

**بَطَّنَ الثَّوبَ وَغَيْرَهُ:** بەرگو شتی دیكەشی شاردەوە

**بَطْن:** سك ، ورگ ، زگ ، گەدە ، ئۆچك ، لەمە

**بِطْنَة:** زۆرخۆریی، زیادەخۆریی، چڵێسی، نەوسنی

**بَطْنَاً لِظَهْرِهِ:** هەڵگەڕایەوە،لنگەو قووچ

**بُطْنُج:** پونكە ، نەعنا

**بَطِئ:** خاو ، لەسەرخۆ ، هێواش

**بَطِيخ:** كاڵەك ، گندۆرە

**بَطِين:** ورگ زل ، ورگن، سك زل ، ورگ داكەوتوو

**بُطَين:** سكۆڵە

## ب ظ

**بَظْرُ:** قیتكە ، میتكە

## ب ع

**بُعاد:** دوور ، چەپەك

**بَعَاعٌ:** هەوری بەبرشت، هەوری باراناویی

**بَعْبَعَ (ثَرْثَرَة):** چەنەبازیی، زۆری وت، چەنە بازیكرد، قسەی زۆر كرد

**بُعْبُع:** خێو ، درنج ، دێو

**بَعْبَعَة(ثَرْثَرَة):** پەلەكردن لەقسەدا، بەخێرایی قسەكردن

**بَعَثَ:** ناردی، رەوانەیكرد، خستیەڕێ

**بَعْث:** نـاردن، رەوانـەكردن ،قیامـەت خستنەڕێ، زیندوبوونەوە
**بِعْثَة:** نوێنەر، ناردە، نێرراو
**بَعْثَرَ:** بلاَویكردەوە، هەڵی رشت
**بَعَجَ(شَقَّ):** هـەڵی دڕیـی، هـەڵی قلّیشاند، لەیەكی بڕی
**بَعْجَة:** قوپاوی، چاڵ
**بَعُدَ:** دووركەوتەوە
**بُعْد:** دووریی
**بَعْدُ:** پاشان ، دوایی، دواتر، پاش
**بَعَّدَ:** دووری خستەوە
**بَعْدَ الآنَ:** دوای ئێستا ، لـەدوایدا ، لەمەودوا
**بَعْدَ أنْ:** دوای ئەوە ، پاش ئەوە
**بَعْدَ ذلكَ:** دوای ئەوە
**بَعْدَ قَلِيل:** پاش كەمێك ، پاش تۆزێك
**بَعْدَ مَا:** لەدواییدا ، پاشان
**بَعْر ـ بَعْرُور:** پشقل ، پیسایی
**بَعْزَقَ (بَدَّدَ):** بـەفیڕۆیدا، لەبـەردیدا، بەهەوانتەیدا
**بَعْض:** هـەندێك ، پارچەیـەك ، بڕێـك ، كەرتێك
**بَعُضَ:** مێشوولە گەزتی
**بَعَّضَ:** لەتیكرد، بەشیكرد
**بَعَضَـهُ:** بـەش بەشـیكرد، كـەرت كەرتیكرد، لەت لەتیكرد
**بَعْل:** مێرد ، شوو
**بَعَلَ الرَّجُل للمَرْأة:** بوو بەمێردیی، ژنـی مێنا
**بَعْنَس:** كەنیزەكی گێلو نەزان
**بَعُوضَة:** مێشوولە

**بغ**

**بُغَاء:** داوێن پیسی ، ئارەزوو ، هەوەس
**بُغَـاث:** داڵـە كـەرخۆرە، باڵندەیەكـە گۆشتی مردارەبوو دەخوات
**بَغَال:** ئێسترەوان ،قاترچی، مەیتە
**بُغَام:** دەنگی حوشترو گا، ئاهو
**بَغَـتَ:** كتوپڕیكـــرد ، خـــێرایكرد، دەستو بردیكرد
**بَغْتَة:** كتوپڕ، لەناكاو، لەپڕ
**بَغَـدَ( إسْتَحْيَا ):** شـەرمیكرد، خـۆی پەنادا، خۆی شاردەوە
**بَغَـشَ السَّـمَاءُ:** نمـــەیەك بـــاری، رشێنەی كرد
**بَغْشَة( رَذَاذ ):** نمە ، رشێنە
**البَغْشَة:** بارانێكی هێواش
**بَغَضَ ـ بَغُضَ ـ بُغِضَ:** وای لێهـــات ، كەسی خـۆش نەوێت
**بَغْضَاء:** رقو كیـن،دوژمنی سەرسەخت
**بَغْل:** هێستر ، قاتر، ئێستر، ولاَخی بار
**بَغَى:** ویستی ،حەزیكرد، نیازیكرد
**بَغْي ( ظُلْم ):** زۆرداری، جەوروستەم
**بَغْي:** سۆزانی ، داوێن پیس
**بُغْيَـة:** پێویسـتی ، نیـاز ، ویســت ، پێناو
**بَغِيض:** دوژمنی سەرسەخت

**بق**

**بَقَّ( فَم ):** دەم ، زار
**بَقَّ النَّبْتُ( طَلَعَ ):** دەرهات،ڕوا،سەوزبوو
**بَـقَّ المَـاء:** دەرپـەڕی ، فیچقـی كـرد، هەڵقوڵی
**بَقَّ مَالَهُ:** ماڵی تەخشانو پەخشانكرد
**بَقَى:** مایەوە، رەگی داكوتا

**بَقَاء:** مانــەوە، خايـاندن، جـاويدبوون، جێگیربوون
**بَقَار:** گاوان ، خاوەنی ڕەشە ولاَخ
**بَقـاق( ثرثـار ):** چـــەنەباز ، زۆربلــێ، هەڵەوەڕ ، سازندە، سازنگە
**بَقَال:** سەوزە فرۆش
**بَقبَقةَ الَماء:** بلقە بلقی ئاو
**بَقجَة ( صُرَّة ):** بوخچە ، پرياسكە
**بَقدونِس:** مەعدەنووس
**بَقرَ ( شَقَ ):** هەڵیدڕیی، دڕاندی
**بَقَر:** ڕەشەولاَخ ، گاومانگا
**بَقَرَة:** مانگا ، چێل ، مانگايەك
**بُقعَة( لَطخَة ):** پەڵە ، پینە
**بَقعَة ( مُستَنقَع الَماء ):** زەلكاو
**بَقل ( بَقلَة ):** سەوزە ، سەوزی
**بَقلاوة:** پاقلاوە ، جۆرێکە لەشیرینی
**بَقِيَ ( دَام ):** بـەردەوام بـوو، لـــەسەری ڕۆیشـت ، درێژەی هەبوو
**بَقِيَّة ( جُزء بَاق ):** ماوە ، ئەوەی ماوە، لێماوە

**ب ك**

**بُكَاء:** گرینۆك
**بُكـَاء:** گريــان ، نۆكــە، نوكــە نــوك ، شین ، شینو زاری ، شیوەن
**بَكَارَة ( عُذرَة ):** كچێنی
**بَكتِريَاء:** بەكتريا ، میكرۆب
**بَكَرَ ـ بَكَّرَ:** زوو هەستا، زوو هەڵسا
**بِكر:** نۆبەرە،یەکەم منالّ، یەکەم سك
**بُكرَة( بَاكِراً ـ غَداً ):** سبەی، سـبەينێ ، بەيانی زوو
**بَكَرَة:** كچی جوانكیلەو قەشەنگ
**بِكرِيَة الوِلاَدَة:** يەكەمجار منالّی ببێ ، نۆبەرە

**بَكل:** دەستكەوتی جەنگی
**بَكَمَ ( خَرَس ):** لالّ بـوو، زمانی بەسترا
**بَكَّمَ:** بێدەنگ بوو، خۆی لالّكرد
**بُكم ( خَرَس ):** لالّ
**بَكَى:** گريا ، فرمێسكی ڕشت
**بَكِيلَة:** سروشت ، دەستكەوت

**ب ل**

**بَـل ( حَـرف عَطـف ):** بـەڵكو، بەشـــكو، بەلاَم
**بَلَّ ( أعطَى ):** پێيیدا
**بِلَّ( شِفَاء ):** چـاك بونەوە ، ڕەوينەوەی ناساغی
**بِلاَ( بِدون ):** بەبێ ،جگە، بەدەرلەو
**بَـلاء:** تــاقیکردنەوە، ئـــەزموندارییی، ئاپۆڕە، مەینەتی
**بَلاَتِين:** كانزايەكی ڕەنگ سپی‌یە
**بُلاخ:** درەختی هنديان
**بِـلاد( قُطـر ـ إقلِيـم ):** ولاَت ، زێـــد ، نيشتمان
**بَـلاَدَة:** گێلــی ،گـەوجی ، كـەودەنی، گەلۆری
**بَلاَرج:** لەك لەكی سپی
**بَلاَس:** ڕاخەر
**بَلاَط:** كاشی،ناوفەرش ، ديوەخان
**بَلاَطَة:** شتايگەر، خشتی ناو فەرش
**بَلاَطَة الضَرِيح:** كێل ، بەردی گۆڕ
**بَلاَعَة:** بەلووعە، زێراب، گونج
**بَـــلاَغ ( خَـــبَر ):** هـــەواڵ، ڕاپـــۆرت، ڕاگەياندن، پێوتن
**بَلاَغَة ( فَصَاحَة ):** ڕەوانبێژی
**بِلاَل:** ئاو
**بُلاَل:** تاوی پڕو جوان

**بَلاَلَة:** شەونم ، ئاورنگ
**بَلاَّن:** ناتری حەمام
**بَلاَهَــة:** گێژوێــژی، کــەودەنی،وڕی، گێلی ، گەمژەیی
**بَلْبَال( مُهيج ):** وروژێنەر، هەژاندن
**بُلْبُل:** بلبل ، هەزار
**بَلْبَــلَ ( هَيَــجَ ):** وروژانــدی، هـــەژانی، جۆشیدا، سەری لێتێکدا
**بَلْبَلَــة ( قَلَــق ):** وروژان، شـــڵەژان ، سەرکردنەسەر، ئاژاوە
**بَلَــج ( أضَــاء ):** شەبەقیــــدا، بـــەیانی داهات، روناکیدا، سپێدەی دا
**بَلَجَ الحَقُّ:** راســتی دەرکــەوت، راســتی دیاریدا
**بَلَــج ـ بَلِيــج:** رووخـــۆش، رووکــراوە، دەم بەپێکەنین ، ناوچاوان شیرین
**بَلِــج:** بــرۆ بلاّویــی، یــەکێك ئــەبرۆکانی بلاّوبێ
**بُلْجَة:** شەبەق ، سپێدە ، گزنگ
**بَلَحَ ( يَبِسَ ):** وشك بوو
**بَلَخ:** درەختی سندیان
**بَلَدْ:** ولاّت ، نیشتمان ، شار ، زێد
**بَلَــدَ:** مایـــەوە، تیاژیـــا، نیشــەجیّو جێگیربوو
**بَلُدَ ـ بَلِدَ:** گێل بوو، گەوج بوو
**بَلَدان:** بەجووتە شاری بەسرەو کوفـە وتراوە
**بَلْــدَة:** شـار ، خــەڵك نشــین ، شــوێنی جێنشین
**بَلَدِيٌّ:** نیشتمانی، هاوولاّتی
**بَلَدِيــة:** شـــارەوانی، بەرێوەبەرایــەتی بــەرێوەبردنی شـــار ، ئەنجوومــــەنی شارەوانی

**بَلَــسْ:** بێکــەڵك ،بێسـوود، نــەگریس ، بەد، خراپ ، نالەبار
**بَلَسَ:** نائومێد ، بێهیوا
**بَلْسَم ـ بَلْسَمَةٌ:** خـامۆش و بێدەنگبــوو لەترسا
**بَلْسَمْ:** دەرمانێکە ئەخرێتــە ســەر زامو برین بۆساڕێژ کردنەوە
**بَلْشُون:** شینە شاهۆ
**بَلَص:** زەوتیکرد، بەزۆر لێی سەند
**بَلَّــصْ:** زەوتکــــردن، داگیرکــــردن و زەوتکردن
**بَلَّطَ:** خشتی دانا، فـەرشیکرد، خشـت ڕێژیکرد
**بَلْطَة ( فَأس ):** تەور، تەورزین
**بُلْطَة:** ناگەهان
**بَلْطَح ـ بَلْطَحَة:** خودێك كـەوا وەفــای بەپەیمانی خۆی نەکردبێ
**بَلَع:** قـوتیدا، هەڵی لووشی ، لووشیدا
**بَلْع:** قوت دان ، هەڵ لوشین، لوشدان
**بُلْعَة ( ثُبّ الرَّحَى ):** کونی دەستاڕ
**بُلْعُم ( بُلْعُوم ):** گەروو،دەروازەی خۆراك
**بَلَغَ:** گەیی ، هاتەبەر، گەیشت
**بَلَّغَ:** گەیانی، رایگەیاند، پێی وت
**بَلَــغَ أشُــدَّهُ:** پێگـــــەیشت ، فـــامی بەبەراهــات،بالّغ بوو، عەقڵی بەبەرخۆدا هات
**بَلَغَ مَبْلَغاً:** گەیی بەڕادەیــەك ، گەیشـت بەئاستێك
**بُلْغَة( كَفَاف ):** قایل ، تێر، بەرچاوتێر
**بَلْغَم( نُفَاثَة الصَّدر ):** بەڵغەم
**بَلْــف:** چـــاوبەست، هەڵخەڵــەتاندن، فریودان

**بَلَقَ ـ بَلُوقَــاً:** خــێرایکرد، پەلــەیکرد، کەوتەخۆ

**بَلِقَ ـ بَلَقَاً:** سەراسیمەوسەرگەردانبوو ، واقی ورما

**بَلَق:** پیسی ، دەروازە

**بُلْقَـة:** بەڵـەك ، مـاش‌و برنـج، بـازوو ، رەش‌و سپی

**بَلْقَع:** زەوی بێئــاوو گیــا، لانەیــەکی خاڵی

**بَلْكُون:** بەلەکۆنە

**بَلَّلَ:** تەڕیکرد، ئاوی پێداکرد

**بَلِـه:** تێکچـوو، گێژبـوو، وڕبـوو، فـامی لەدەستدا

**بَلْـه:** وازبهێنــە، بـــڕۆ دواوە، بـڕۆ ، نەکەی

**بَلُـو:** کـۆن‌و رزیـوو، دێریـن‌و لەبەریــەك هەڵوەشاو

**بَلْـوَى ـ بَلِيَـة:** بـەلا ، کـۆست ، وەی ، کارەسات

**بَلُّور:** بلوور، سپی‌و سۆڵ

**بَلُّوط:** داربەڕوو، بەڕوو

**بَلُّوطَة:** یەك بەڕوو

**بُلُـوغ:** بـاڵغ بـوون، گەیشـتن بەتەمـەنی فامدیدەو پێگەیشتن

**بَلُّوق:** زەوییەکە هیچی تێدا نەڕوێ

**بَلَى:** بەڵێ ، ئەرێ

**بَلِيَ:** کۆنیکرد، رزاندی ، تیایبرد

**بَلْيَار:** بلیار

**بَلِيَّــة:** نارەحـــەتی ، ناهـــەمواری ، ئەزموونی سەخت

**بَلِيـد:** گێــل ، نـــەزان ، ساردوســڕ، کەم فام ، کەودەن

**بَلِيج:** تابان

**بَلِيغ:** رەوانبێژ ، قسەزان، دەم پاراو

**ب م**

**بَم ـ بُمُوم:** تۆنێکی بەرز

**ب ن**

**بُن:** قاوە، قاوەیی کاڵ، دەنکی قاوە

**بِنَـاء (مبنـي ـ مَشِـيد):** خـانو ، بینـا، ساختمان ، ماڵ

**بَنَّاء:** بەنا، وەستای خانوو، خانووساز

**بِنَاءً عَلَى:** بەگوێرەی، بەپێی

**بَنَات:** کیژان ، کچان

**بَنَان:** ئەنگوشت، قامە تەپڵ

**بِنَايَة:** ساختمان ، بینا، خانوو

**بَنَـى:** دروسـتیکرد ، بینـایکرد، بـەرزی کردەوە

**بِنْت:** کچ ، کیژی ، کەنیشك

**بِنْتُ الأَرْض:** رووبار ، ئاوی زەوی

**بِنْتُ العَين:** ئەشك ، فرمێسك

**بِنْتُ الشَفَة:** وشە ، واژە

**بَنَّجَ:** بێهۆشیکرد، سڕیکرد، نوانـدی ، خەوی لێخست

**بَنْج:** بەنج، بێهۆشکەر

**بَنَجَ:** گەڕایەوە، هاتەوە، چووەوە

**بِنْج :** ریشە ، رەچەڵەك ، ئەژاد

**بَنْجر(شوندر):** چەوەندەر

**بَنْد:**ئاڵایەکی گەورە، بەیداخێکی‌گەورە

**بِنْـدَار:** ئــەو بازرگانــەی شــت‌و مــەك هەڵدەگرێت بۆ گرانیی

**بَنْـدَر:** بـەندەر، شوێنی لەنگــەرگرتنی کەشتی

**بُنْدُق:** بندق ، درەختی بوندوق

**بُنْدُقِيَة:** تفەنگ، چەك ، سیلاح

**بَنْدُول:** چرکەی سەعات ، بەندۆڵ

**بَنْدِير:** دەف ، دەهۆڵ

**بَنْزِين:** بەنزین

**بَنْطَة( مِثْقَاب ):** بونتە، سمۆ ، قەڵەم

**بَنْطَرون( سِرْوَال ):** پانتۆڵ، شەرواڵ

**بَنْطَرون تَحْتَانِي:** دەرپێ ، ئاوەڵکراس

**بَنْطَرُون قَصِير:** دەرپێ کورت، پانتۆڵی کورت

**بَنَفْسَج:** وەنەوشە، بنەوشە

**بَنَفْسَجِي:** وەنەوشەیی، مۆر، خامەکی، بنەوشەیی

**بُنْقَة ـ بَنِيقَة:** گرۆڵە، بن قۆڵ

**بَنْك ( أصل ):** بنەچە، نەژاد، رەگەز

**بَنْك( مَصرف ):** بانق ، بەنك

**بَنْكِرَيَاس:** پەنكریاس، ئالوی پەنكریاس، شیلاوگ

**بُنَي:** رۆڵە، وەچە، جگەرگۆشە

**بُنَيَات الطَرِيق:** كوڵانو شەقامە بچووكەكان، كوچە

**بُنْيَان:** ساختمان، بینا ، خانووی دروستكراو

**بُنْيَة:** سروشت ، شێوەی زگماك، شێوازی خولقێنراو

## ب هـ

**بَهَاء( حُسْن ):** جوانی، رازاوەیی، قەشەنگی ، مەزنی

**بَهَات:** درۆ، سەرسام ،واقو ورماو، سپی ، هەڵگەراو، بزركاو

**بَهَار( صَنَم ):** بت ، پەیكەر

**بَهَام:** گوێرەكەو كارو بەرخ

**بَهَتَ:** واقی ورما ، سەری سورما ، هەڵبزركاو

**بُهِتَ( حيرَة ):** سەرسوورمان ، رامان

**بَهِتَ( أدْهَش ):** سەری سورمان ، سەراسیمەیكرد

**بُهِتَ:** نیگەرانو سەرسام مایەوە

**بَهِتَ:** سەرگەردانو زیانبەخشبوو، تووشی مەینەتو ژیانهات

**بُهْتَان:** درۆ، بوختان، ناپاكی، هەڵبستنی تاوانو گوناه

**بَهَجَ ـ إبْتَهَجَ:** گەشایەوە، دڵخۆشبوو، گەشكەداربوو

**بَهْج:** شادمان ، خۆشحاڵ ، خۆشنوود

**بَهْجَة:** خۆشحاڵی، شادمانی، ئاسوودەیی، دڵشادیی ، رووخۆشی

**بَهْدَل:** ئابڕوی چوو، حەیای چوو

**بَهَرَ:** پێشكەوت ، سەركەوت

**بُهِرَ:** بەشەوا دەركەوت

**بُهْر:** هەناسەبركێ، نیخە نیخ ، تەنگەنەفەسی

**بَهْرَجَ( زَوَّقَ ):** رازاندیەوە، جوانیكرد، ئارایشتیدا

**بَهْرَج( باطل ):** قەڵب، درۆ، پووچ، بەتاڵ، ناڕاست

**بَهْرَجَان:** زرقو بریقەدار،رۆشنو رووناك

**بَهَزَ( دفع بضعف ):** پاڵی پێوەنا، بەئەسپایی پاڵی نا

**بَهَش ( أقبل مسروراً ):** بەرووخۆشی هات ، بەروویەكی گەشەوە هات

**بَهَش( بَشوش ):** رووخۆشو دەم بەخەندەو پێكەنین

**بَهَظَ:** قورسیكرد، گرانیكرد

**بَهَق:** بەڵەك ، منجڵ، پەڵەی سپی سەر پێست

بَهَلَ( لَعَنَ ):نەفـرەتی کرد، ئەفەرۆزیکرد
بَهْلَة ـ بُهْلَة : نەفرەت ، لەعنەت
بَهْلَوان: پاڵەوان، تەناف باز
بَهْلَوانيَّة : تەنافبازی
بُهْلُول ( ضَحَّاك ): قۆشمە، کۆستەبایی
بُهْمَـة : کـاری سـەختو قـورس، سـنگ بەرزو گەورە
بَهْمُوث: فێڵباز، تەڵەکەباز، شەیتان
بَـهُو ـ بَـهَاء: جـوان بـوو ، رازایـەوە، گەشایەوە، دەستی هێنا بەخۆیدا
بَهُو: ساڵۆن ، هۆڵ، دیدەنگە
بَـهِيٌ: رازاوە، روونـاك ، گەشـاوە، قەشەنگ
بَهِيج: دڵخۆشکەر، شەنگ
بَهِيمَة: چوارپێ، ئاژەڵ، رەشـە وڵاخ ، چارەوێ
بَهِيمِيَّة: ئارەزووی ئاژەڵی

**ب و**

بُوَاء( ثُعْبَـان عَظِيـم ):مـارێکی گـەورە، ئەژدیها، هەژدیها
بَوَاء: بەرانبەر، هاوتا
بَوَّاب: دەرگاوان
بَوَّابَـة: دەروازە، دەرگـای گـەورە، دوولایی
بَوَاح: بەرچاو ، لەڕوو، ئاشکرا، دیار
بَـوَار: وێـران ، کـاول ، خـاپوور، تیاچوون، فـەوتان
بَوَازِغ: ئەستێرەی رۆشنو دیار
بَوَاسِق: درەختـی دارخورمای باڵابەرزو درێژ
بَوَاطِن: کاری نهێنیو پەنهان
بَوَاق: کەرەناژەن، فووپیاکەر، شەیپور ژەن

بُوَال: نەخۆشی شەکرە ، میز
بَوَان ـ بُوَان: نیرگە، ستوون ، ئەستوون
بُؤْس: داماویی، کلۆڵی، بەدبەختی
بَوَّأ( سَدَّد ): رووی تێکرد، ئاراستەیکرد
بَوَّبَ الكِتَاب: کتێبەکەی بەش بەشکرد
بَوْح ( إِظْهَار ): خسـتنەڕوو، درکـاندن ، دەرخستن، ئاشکراکردن
بُـودْرَة( مَسْـحُوق الزِّينَـة ):بـۆدرەی ئارایشو خۆ جوانکردن
بُودقَة( إِنَاء ): قاپ ، تیان، بۆتە
بَوَّرَ: بەرەڵایکرد، نەی کێڵا
بُوْر: بێکەڵك، فەوتاو،خراپ، پواو
بُـورَة: بنکـەی کۆبوونـەوە، بنکـەی سەرەکی
بُورْجوَازِيَـة : بـورجوازیی، چینـی ناوەندی گەل
بُورْصَة: بورسـە ، کۆمـەڵگای بازرگـانی بۆ دراوەمەنی
بُورَق: بۆرەك
بُورِي: ماسی بوری
بُورِيَّة: حەسیر ، باریە
بَوَّزَ: تورەبوو، مرومۆچ بوو
بُوز: لوولەی مەسینە، لوولە
بُوسَة( قُبْلَة ): ماچ
بُوسْطَة: بەرید، مەبەستدار
بَوْش: هـەرچیوپەرچیو ناکەس بەچە
بَـوَّش القَـوم: ژاوەژاویـانکرد، هـەراو دەنگە دەنگیان نایەوە
بُوشِي ـ بَوْشِـي: هـەژاریی ، نـەداریی، نەبوونی
بُوص( قَصَب ): قامیش
بُوصَة: ئینج 54ر2سم

**بُوصلَة**: قيبلەنما، دياريكەرى ئاراستە
**بُوع**:ئيستێكى دواى پەنجە گەورەىپێ
**بُوغَادَة**: خۆلاو، تەپو تۆزاو
**بُوغَاز( مَضِيق )**: دەربەند، گەلى
**بُوقَ**: شـــەيپور، هۆڕنـى ئوتومبيـل، زورنا
**بُوقَة**: تاوەبارانى بەخوڕ
**بَوّلَ**: ميزيى كرد
**بَوْل**: ميز
**بُولَة**: ميزكەر، ميزن
**بَوْلِي**: پـــزيشكى تايبـەت بـەبوارى ميزەوە
**بُولِيس**: پۆليس ، پاسەوان
**بُوم**: پەپوو، كوندە پەپوو، بايەقوش
**بَوْن**: ماوە، بۆشايى نێوان دووشت

**ب ي**

**بَيَات**: شەبەيخونى پڕ دوژمن
**بَيَّادَة**: پيادەى لەشكر
**بَيَاض**: سپێتى
**بَيَّاضَـة**: هێلكەكـەر، بەهێلكـە ، پــڕ هێلكە
**بَيَّاضِيَـة**: نەخشـەى بيناسـازى لەسـەر شێوەى هێلكەيى
**بَيَّاع**: چەرچى ، كۆلْ گێڕ
**بَيَّاعَة**: ئەوەى ئەفرۆشرێ
**بَيَـــان**: دەرخســـتن، ئـــاشكراكردن، روونكردنەوە
**بَيَانو**: پيانۆ، ئامێرێكى مۆسيقىيە
**بِيئَة**: كەش، دەورووبەر
**بَيَّتَ**: رێكى خست،ئامادەيكرد،گێڕاى ، سازيكرد
**بَيْت**: مالْ ، خانوو ، لانە ، خانە
**بِيتْ**: خۆراكو قوتى يەك شەو
**بِيجَامَا**: بيجامە، جلو بەرگى نێومالْ
**بَيْدَاء( فَلاَة )**: چۆلْ ، بيابان ، سارا
**بَيْدر**: خەرمان، جوخێن
**بَيْدَق الشَطْرَنْج**: بەردى شەترەنج
**بِيرَة( جَعَة )**: بيرە ، ئاوى جۆ
**بَيْرَق ( رَايَة )**: ئالا ، پەرچەم
**بَيْرَقْدَار**: ئالا هەلگر
**بَيْض**: هێلكە
**بَيَّضَ**: سپىكردەوە، تيف تيفەيدا
**بَيَّضَ اللهُ وَجْهَهُ**: خوا رووى سپى بكات
**بِيض مِنَ اللَيَالِي**:شەوانى(13ـ14ـ15) ى هـەموو مـانگێكى كۆچىيـە كـەمانگ تێيدا رۆشنو بەتيشكە
**بَيْضَاء**: سپێتى
**بَيْضَة**: يەك هێلكە، تاكە هێلكەيەك
**بَيْطَار**: پزيشكى ئاژەلْ
**بَيعَ**: فرۆشرا
**بَيْع**: فرۆشتن
**بَيْعَـة**: پـەيماندان، بـەلێندان، بـاوەڕى پێكردن
**بَيْكَار**: گۆنيا
**بَيْن**: جياوازى، بوارى نێوان دووشت
**بَيَّـنَ**: دەريـــخست ، ئاشـكراى كـرد، روونىكردەوە
**بَيِّـن ( ظَـاهِر )**: ديـار، لـەڕوو، بـەرچاو، ئاشكرا
**بَيْنَ بَيْنُ**: لەنێوان ، ناوبەناو
**بَيِّنَة**: بەلگە ، بورهان، قەواڵە
**بَيْنَمَا**: لەكاتێكدا، كەچى
**بَيُوت**: چێشتى شەو كەدەمێنێتەوە



بَاز (هەڵۆ)



بُوم (كونده پەپوو)



بَجَعْ (ماسی گره)



بَبغَاء (تووتی)



ببْرْ - نَمِرٌ مُخَطَّط (پلنگی خەت خەت)



بَجُّ - بَجّ (جووجەڵەی مریشك)



بَاب (دەرگا)



بَقَر (رەشه وڵاخ)



بِنْت (کچ - کیژ)



بَطَّة (مراوی)



بَقَرَة (مانگا)



**بلكونة** ( بەر پەنجەرە )



**بالون** ( بالۆن )



**بَهَار ـ صَنَم** ( بت ـ پەیكەر )



**بَصَل** ( پیاز )



**بَطَاطَا** (پەتاتە)



**بَاذنْجَان** (باینجان)



**برتقال** (پرتەقاڵ)



**بُنْدُق** (بوندوق)



**بيتزا** ( پیتزا )



**بَيض** ( هێلکە )



بَرْجَل ـ بَرْكَال (پرگال)



بُرْغِي ـ لَوْلَب (برغو)



بَرْمِيل (بەرمیل)



بَلْطَة ـ فَأْس (تەور)



بالُوعَة (بەلوعە)



بَوَّابَة (دەروازە)



بَرَى القَلَم (قەڵەم دادان)



بَطَارِيَة (پیل)



بيانو (پیانۆ)



بطارِيَة (پاتری ئوتومبیل)



**بَطِيخ** (كاڵەك)



**بَرقُوق ـ خَوخ** (قۆخ)



**بَزَارَة الأَطفَال** ( ممكه شووشه )



**بَدّال** ( پارە گۆڕەوە)



**بَذورْ ـ كيس النقود**

(تورەكەی پڕ لەپارە )



**بُرطُل ـ تاج الأَسْقُف**

(کڵاوی قەشە)



**بُر** (گەنم )



**بازليا** (پاقلەی کێوی )



**بابُوج** ( پاپووج)



**بِسَاط ـ سَجَاد** ( مافور ، راخەر)

# ٣ حرف التّـاء

# ت

**ت**

سێیەم پیتی زمانی عەرەبی‌یە بەم مانایانە هاتووە:

1) **إسْم للحَرف الثالث من حروف المباني، مُؤنث ج تاءات والنسبة إليه [تائي وتاوي وتيوي] يُقال: ((قصيدة تائية وتيوية))**

سێیەم پیتی (مبانی)یەو : دەوترێت هۆنراوەیەکی (تائیی)و (تاویی)و (تەیەوی).

2) **ضَمير في آخر الفعل للمُتَكلم وللمُخاطب (قُمْتُ وقُمْتَ وقُمْتِ وقُمْتُمَا وقُمْتُم، وقُمْتُنَّ)**

راناوێکە لەکۆتای کرداردا دێت بۆ گوتەبێژو قسە لەگەڵ کرداردا.

3) **حَرف للتأنيث نحو ((قائمة وضَرَبَت))** پیتێکە بۆ مێیەتی.

4) **حَرف تُميز الوَاحد منَ الجنس نحو: ((شجرة واحدة)) وللمُبالغة نحو((فهّامة))**.

پیتێکە بۆ جیاکردنەوەی یەکێك لەکۆمەڵێك ، یان بۆ موبالەغەو پێ‌ی‌هەڵبرین.

5) **حَرف جَر للقَسَم فتجُر إسْمُ الله تَعالى نحو: ((تَالله)) وَرُبَّمَا جَرَّتْ سِوَاهُ نحو: ((تَربِّي))**.

پیتێکی راکێشەرە.

6) **وَقَدْ تَلحَق صيغة مُنْتَهى الجمُوع إمَا للدلالَة عَلى النَّسَب نحو: ((مَهَالِبَة)) جَمع المَنسُوب ((مَهَلبيّ)) وإمَا للتَعويض عَن حَرف مَحذُوف نحو: ((زَنَادقة)) جَمع ((زِنْدِيق))**.

دەچێتە سەر کۆتاترین دەستەواژەی کۆ ، ئەویش یان بۆ رەچەڵەکو نەسەب یان بۆ قەرەبووکردنەوەی پیتێکی سڕاوە.

7) **وَتُزَاد التَاء في أوائل الأفعَال وَأوآسطهَا نحو: ((تَقَاتَل وإقْتَتَل)) وَفي أوآخر الأسماء، كَتاء (مَلَكوت) وتُعوَض بتاء زائدة عَنْ حَرف مَحذوف من أول الكَلمة نحو: ((عظَة)) وَمِنْ آخرهَا نحو ((شفَة))**.

(تاء) زیاددەکرێت لەسەرەتاو ناوەڕاستی کرداردا هەندێك جاریش لەکۆتایی ناواو لەبری پیتێکی لابراو لەسەرەتا یان کۆتایدا.

**تآ - تآ**

**تائب (نادم):** تەوبەکار، ژیوان، پەشیمان، پاشگەز

**تائق:** تامەزرۆ، بەپەرۆش، خوازیار، عەودال

**تائه:** وێڵ ، سەرگەردان ، بەرەڵا، بێ‌سەرپەرشت، ون بوو ، گومبوو

**تَابَ:** تەوبەیکرد، پەشیمان بووەوە، پاشگەز بووەوە، ژیوان بوو

**تَابَعَ:** شوێنی کەوت،بەدویا رۆیی، دوایکەوت

**تابِعْ( لاَحِق ):** دواى ئەو، پاشكۆ، شوێنكەوتە، ڕێ هەڵگرتن
**تابِعَة:** ئەنجام ، ئاكام، دەرئەنجام
**تابِعِيّ:** شوێنكەوتوو ، ئەوەى لەرەفتارو بۆچووندا يان لەرەوييەى ژيانيدا بەدواى پێشينيدا دێت
**تابِل( تَوابِل ):** بەهارات، بۆن و بەرامە
**تابُوت:** داربازە، سندوق، سندوقى مردوو، تابووت، دارە مەيت
**تاج:** تاج ، گوڵينە
**تاجَ:** تاجى خستەسەر، تاجىنايە سەر
**تاجِرْ:** بازرگان، داناى كار
**تاجَرَ:** بازرگانيكرد ، سەوداگەريكرد
**تاحَ:** ئامادەبوو،سازا، هاتەسەريار
**تاخَمَ( جَاوَرَ ):** لەپاڵ يەكدابوو، هاوسىٚبوون، هاوسنووربوون
**تآخى:** برادەريكردن، هاورێيەتى بەستن
**تآخِيّ:** برايەتى ، هاودەمى ،هاورێيەتى
**تادَى:** بۆى جێبەجێكرد، بۆى بەدى هێنا
**تارَة:** جارێك ، يەك جار
**تارِس( مُدرع ):** زرى پۆش
**تارَكَ:** وازى هێنا ، پشوويدا
**تارِك:** وازلێهێنراو ، بەجێ هێڵراو
**تآزَى ـ تَآزَياً :** لێك نزيك بوونەوە، هاتنە پێش
**تآزَرَ:** دەوريدا،تەوقيدا، چوەپاڵى، پاڵپشتى نواند، هاوكاريكرد
**تافِه:** هيچو پووچ ، بىٚنرخ
**تاسِع:** نۆ

**تَأسَى:** نەوازشى يەكتريانكرد
**تَآصَرَ:** پشتگيرىو چوونە پاڵ يەك
**تَاقَ ( إشْتاقَ ):** ئارەزوويكرد، بيريكرد، خولياىبوو
**تَآل:** دواى ئەو، لەدوايەوە
**تَآلَف:** ڕێكەوت لەگەڵى،هاوتاىبوو
**تَالِف:** خراپ بوو، گەنيو ، ڕزيو
**تام:** تەواو ، پڕاوپڕ
**تَامَ:** گرفتاريكرد، شەيدايكرد
**تَآمَرَ:** پيلانى گێڕا ، بەپەنهان ڕێكەوت دژ بە..
**تَأمُور:** پێستى دڵ
**تَاوَى ـ تَأوَى:** كۆبوونەوەى باڵندەو يەك گرتنيان
**تَاهَ( ضَلَّ ):** ونبوو، گومبوو، ديار نەما
**تَأبَى:** ڕازى نەبوو، نكووليكرد ، بەرپەرچىدايەوە
**تَأبَّدَ:** هەتاهەتايى، هەميشەيى، جاويدانى
**تَأبَطَ:** لەبن هەنگڵدان،بەخێوكردن، هەڵگرتن
**تَأبَّه:** دەستپاكو بىٚتاوان دەرچوو
**تَأتَّى:** ئامادەبوو، حازربوو، بۆيهات، هێناى
**تَأثَّر:** كاريگەربوو، وەك ئەوى لێهات، هاوحاڵبوو
**تَأثَّر:** كاريگەربوون، هاوحاڵبوون، هەستكردن ، هەستيارى گۆڕان بەهۆى يەكێكى ديكەوە،كارتێكردن
**تَأثَّلَ:** پتەوو مەحكەم بوو
**تَأثَّمَ:** تەوبەكردن لەگوناه ، پەشيمان بوونەوە

**تَأثِير**: کارتێکردن ، هەست جووڵاندن
**تَأجَجَ( إلتَهَب )**: تاوی سەند ،گەرم بوو، بڵێسەی سەند
**تَـأجَلَ( تَـأخَر )**: دواکەوت، لەکاتی خۆیدا نەبوو
**تَـأجِيل**: دواخستن ، دواکەوتن، پاش خستن
**تَأجَمْ**: چوونی شێر بۆ لانەکەی
**تَـأخَى**: کوردی بەبرا، بەبرا ناوزەدیکرد
**تَـأخَرَ**: دواکەوت، لەکاتی خۆیدا ئامادەنەبوو
**تَـأخِير**: دواکەوتن ، دواخستن، نەبوون لەوادەی خۆیدا
**تَأدَى**: بەشی خۆی پێدا
**تَـأدَبَ**: پاك‌و بەرزبوو،فێری ئەدەب‌و رەوشت بوو
**تَأدُّق**: جوان پۆشی ، شۆخی
**تَأدِيب**: تەمێکردن، فێرکردن، راهێنان
**تَـأذَى**: ئێش‌و ئازار، وەرس بوو، کاریان تێکرد، بێزاربوو، کاریگەربوو لەژێر ژان‌و ئێشدا
**تَأدَبَ**: بەزۆر فێری رەوشتی‌کرد
**تَأدِبَة** :بەجێهێنان،جێبەجێکردن
**تَأرَجَ**: بۆنێکی خۆشی لێوەهات
**تَأرِيخ**: مێژوو ، بەسەرهاتی کۆن
**تَـأزَرَ**: خۆی داپۆشی، بەکاڵای ئاو دامان خۆی پۆشی،پەشتەماڵی گرتەوە
**تَـأزَّزَ المَجْلِس**: جمەی هات، خرۆشا بەئامادەبووان
**تَـأزَمَ القَـومُ**: تووشی بەڵاونەهامەتی هاتن، گرفت‌و نەناڕەحەتی هات بەسەریاندا

**تَأسَى**: سەرخۆشی‌و ئارام گرتن
**تَأسَدَ** :وەك شێری لێهات،هاوچەشنی شێربوو
**تَأسَس**: دایمەزراند، دروستیکرد
**تَأسَـفَ**: داخی خوارد،داخی بۆ خوارد ، خەمی خوارد
**تَأسَلَ**: لەرەوشت‌و رەفتارا لەو دەچێ، هاو رەوشت‌و رەفتار
**تَأسَنَ**: گۆڕا ، تێکچوو، وەك خۆی نەما
**تَأسِيَة** : پرسە، تەعزێ، ماتەمینی یان سەرخۆشی‌کردن، نەوازشکردن
**تَأسِيس**: دامەزراندن، بناغەدانان
**تَأشَبَ**: تێکەڵبوو، لێك ئاڵا، چوو بەناو یەکا
**تَأشِير**: ئامازەکردن، دەستنیشانکردن
**تَأشِيرَة**: رێگە نامە، مۆڵەتنامەی رابوردن
**تَأصَلَ**: بناغەی داکوتا، بنەچەی دانا
**تَأصِيلَة**: بنەچە، بناغە، رەچەڵەك
**تَأفَفَ( تَذمَر )**: سکاڵای کرد، ئاخی هەڵکێشا ، هەناسەی هەڵکێشا
**تَـأكَدَ( تَوَثـق )**: قایم بوو، چەسپا، بەسترا
**تَأكَر**: هەڵیکەند، خۆڵی لێدەردا
**تَأكَسَدَ**: مەردومی بێکارو ئیش
**تَأكَلَ**: خواردی، رزاندی ، ژەنگ لێی‌دا
**تَـأكِيد**: دڵنیایی، دڵنیابوون، دووبارەکردنەوە،سەلماندن چەسپاندن
**تَألَبَ**: کۆبوەوە، یەکی گرت،جەم بوو
**تَألَفَ**: پێکهاتوە، دروست بوە
**تَـألَقَ**: درەوشانەوە، دەرکەوتن، درەخشانەوە

**تَألَّقَت المَرْأة:** ئارايشتی خۆيدا، خۆی تاس و لووسدا
**تَألَّمَ:** ئازاری پێگەیشت، سوێی چەشت ، ژانی بەبەراهات
**تَألَّه:** خرايە رێزەی پەرستن،بوويەخوا
**تَأليَة:** بەرزكردنەوەی بێ‌رادە، بەخوا كردن
**تَأليف:** نووسەر، ئامادەكار، كۆكردنەوە
**تَأليف الحَيوَان:** ئاژەڵ راهێنان، ماڵی كردن، رامكردن
**تَأمَّرَ(شَاوَرَ):** راوێژی پێكرد، پرسی پێكرد ، رای وەرگرت
**تَأمَّرَ عَلَيه:** پيلانيان گێڕا لەدژی، كۆك بوون لەسەری
**تَأمَّلَ:** بیری لێكردەوە ، لێی وردبوەوە، لەسەری راما
**تَأمُّل:** بيركردنەوە، رامان
**تَأمَّلَهُ:** سەيريكرد، ديقەتی لێدا ، تێی روانی
**تَأمِيم:** خۆماڵی كردن، مۆڵەتدان
**تَأمِين:** دڵنياكردن، چەسپاندن، دابين كردن، مسۆگەركردن
**تَأمِينَات:** بارمتە ، لەبری دانان
**تَأنٍّ:** شێنەيی ، پەلەنەكردن، لەسەرخۆيی
**تَأنَّى:** شێنەيیكرد، پەلەی‌نەكرد، لەسەرخۆبوو
**تَأنُّث:** نەرم و نيانی ، ژنێتی
**تَأنَّسَ:** بوو بەمرۆڤ، وەك مرۆڤی‌لێهات
**تَأنُّق:** خۆجوانكردن،خۆ قۆزكردن
**تَأنَّقَ فِي عَمَلِه:** كرداری خۆی رێك و پێك كرد

**تَأنِيب:** تانوت ، سەرزەنشت ، تانوت لێدان
**تَأهَّبَ(إسْتَعَد):** ئامادەبوو ، خۆی ئامادەكرد، تەياربوو
**تَأهُّبْ(إسْتِعْدَاد):** ئامادەبوون، ئامادەيی، تێز ، خۆئامادەكردن، تەياربوون
**تَأهَّلَ(تَزَوَّجَ):** ژنی هێنا، هاوسەری گرت، شياوبوو
**تَأهِيل(إعْدَاد):** ئامادەكردن ، گونجاندن، شاياندن
**تَأوَّبَ:** گەڕايەوە، بەشەو هاتەوە
**تَأوَّدَ:** چەمايەوە، لاربووەوە، راهات
**تَأوَّتَ الطَيُور:** باڵندەكان كۆبوونەوە، پۆليان بەست
**تَأوَّهَ:** ناڵانی،مركانی، ئاخی هەڵكێشان
**تَأوُّه:** ناڵاندن، بزركاندن، ناڵە ناڵ، هەناسە هەڵكێشان
**تَأيَّدَ(ثَبَتَ):** دەركەوت، ئاشكرابوو
**تَأيِيد(تَعْضِيد):** پشتگيری، باربوو يارمەتی، ياريدە، پشتيوانی

**ت ب**

**تَبَّ(هَلَكَ ـ هَلَكَ):** وێران بوو، مرد فەوتا، لەناوچوو
**تَبَاب(هَلاك):** وێران بوون،فەوتان، لەناوچوون، كوشتن، تيابردن
**تَبَاث:** ئاشكراكردن، والآكردن، ئاوەڵاو دەرخستن
**تَبَاجَحَ:** خۆی هەڵكێشا، لەخۆی بايی بوو
**تَبَاحَثَ مَعَهُ:** لەگەڵی دوا، لێی دوان، باسيانكرد، لێيان كۆڵييەوە

**تَباخَسَ:** کەم کردن، کەلو لێکردن، داماڵین

**تَبادَّ:** زۆرانبازی، مەیدانگرتن، بەرانبەر یەك وەستان

**تَبادِيَ:** چوا بەخەڵکی دەشت نشین

**تَبادَرَ:** پێشکەوت ، دەست پێشخەری کرد، پەلەیکرد

**تَبادَلَ:** گۆڕینەوە، ئاڵوگۆڕکردن، لەباتی یەك دانان

**تَبادَلا:** نۆرەییان کرد، بەنۆرەت ئیشیان کرد

**تَبادَلُوا:** گۆڕیانەوە، ئاڵوگۆڕیانکرد

**تَبادَى بِالعَداوَة:** دوژمنایەتی دەربڕیَ

**تَبارَى:** پێشبڕکێ، بۆڕبۆڕێن

**تَبارَدَ:** سەرمای بوو

**تَبارَكَ:** پیرۆزی کرد، موبارەکی‌کرد

**تَبارِيح:** شکۆفەی درەخت

**تَبارِيح:** تەنگو چەڵەمەی ژیان، چەوسانەوە، نان پەیداکردن

**تَباشِير (أوائِل):** سەرەتا ، تۆبەرە

**تَباشِير الصَّباح:** بەرەبەیان ، سەرەتای هەموو شتێك

**تَباصَرَ:** بەیەکا هەڵیان روانی، بۆیەکتریان روانی

**تَبَطَّأَ:** دواکەوت، درەنگ هات، رۆیشتنی خاياندی ، خاوەخاویکرد

**تَباعَدَ (تَجَنَّبَ):** دوورکەوتەوە، خۆی لادا ، دوورە پەرێز وەستا

**تَباعُد:** دووریی

**تَباغَى:** ستەمیکرد، هەڵی کوتایە سەری ، مافی خوارد

**تَباغَضَ:** کینەی هەڵگرت، پیشی خواردەوە، رقو خەشمی لەدڵیەوە ئاڵاند

**تَباكَى:** بەدرۆوە گریان، زۆر لەخۆکردن بۆ گریان

**تَبالَطَ:** بەشمشێر بەرەنگار بوونی یەکتری، کوشتاری یەك بەشمشێر

**تَبالَغَ:** نواندنی رەوانبێژی، ئەوەی رەوانبێژی دەنوێنێت بەلآم توانای ئەو بوارەی نییە

**تَبالَغَ فِيهِ المَرَض:** نەخۆشیەکەی تاوی سەند، پەرێشان بوو، کاریگەربوو

**تَبالَهَ:** خۆی بەگێل دەرخست ، گێل نوێن ، نەزان نوێن

**تَبان:** کافرۆش، کاوان

**تَباهَجَ:** گەشایەوە، دڵی خۆشبوو

**تَباهِي:** شانازی ، بەرز فڕین

**تَباوَءا:** هاوسەنگ بوو، هاوتابوو، بەرانبەر وەستا

**تَبايَعَ:** فرۆشتن‌و ئاڵوگۆڕ

**تَبايُن (إختِلاف):** جیاوازی، دژواری ، ناکۆکی

**تَبايُنِي:** جیاوازیی، لەیەك نەچوویی

**تَبَّ (هَلَكَ - هَلِكَ):** وێران بوو، فەوتا، لەناوچوو ، مرد

**تَبَتَّلَ (إنقَطَعَ):** لێبڕاوازی لەژنهێنان‌و شووکردن هێنا

**تَبَشَّرَ:** خۆشحاڵبوو، رووی گەشبوو

**تَبْشِير:** مەواڵی خۆش گەیاندن، مژدە

**تَبَجَّحَ:** خۆی هەڵکێشا،لەخۆی بایی بوو

**تَبَجُّح (تَفاخُر وتَباهِي):** خۆهەڵکێشان، فیشاڵکردن، لاف لێدان، لافو گەزاف

**تَلَمَّعَ( أضَاء ):** شەوقی دایەوە،تیشکی دایەوە، بریسکایەوە، چەخماخەیدا، درەوشایەوە، پرشنگدان

**تَلْميح( إشَارَة ):** سووسە، پەنجە بۆ درێژکردن، لاپلار تێل نیشان

**تَلْميع( صَقل ):** درەوشاندن،چرساندن، سافکردن، پەرداخ کردن

**تَلَهَّى( تَسَلَّى ):** خەرك بوو، خۆی پێژیرکرد ، رای بوارد

**تَلَهَّبَ( إشْتَعَل ) :** سووتا، گڕیگرت، کڵپەی سەند ، هەڵبوون

**تَلَهَّبَت النَّار:** تاوسەندنی ئاگر، کڵپەی ئاگر

**تَلَهَّفَ:** داخی بۆ خوارد، ئاخی بۆ هەڵکێشا، خەم خواردن، بەپەرۆش بوون

**تَلَهَّمَ( إبْتَلَع ):** هەڵی لووشی، لرفیدا قووتیدا ماشیەوە

**تَلَهَّنَ( تَعَلَّلَ باللهْنَة ):** بەرکولیکرد

**تَلْهِيَة( تَسْليَة ):** رابواردن، خۆ خەریك کردن، خلافاندن

**تَلُوُّ( تبع ):** دواکەوتن ، شوێنکەوتن

**تلو( مايتبع الشئ ):** ئەوەی بەدوایادێ ، ئەوەی لەدواوەیە

**تَلَوَّى( اعوَج ):** چەمایەوە، خواربوو، نوشتایەوە

**تَلَهْوَقَ( تَزَلَقَ ):** ماستاویکرد،مەراییکرد، پشیپشیکرد

**تَلَوَّثَ( تَلطَخ ):** پیسبوو، تێوەچوو

**تَلَوَّحَ( بَانَ وَظَهر ):** دەرکەوت،بینرا، ئاشکرابوو

**تَلَوَّصَ( تَلَوى وتَقَلَّبَ ):** منجەمنجیکرد، خۆی بائەدا، نەی ئەزانی ئەڵێ چی

**تَلَوَّنَ:** رەنگی گرت ، رەنگین ، رەنگاورەنگبوو

**تَلْويث:** پیسکردن، تێوەدان، خەوشدار کردن

**تَلْويح:** مەبەستێك لەدوای ئاخاوتن و نووسینەوە

**تَلْويحَات( حَوَاش ):** پەراوێز، دامێن کۆبە ، پەرواز، شیرازەی پەرتوکان ، ئەو نووسینەی ئاماژە بەسەرچاوە یان روونکردنەوە دەکات لەخوارووی لاپەرەکانی کتێبەوە

**تَلْوين( صبْغ ):** رەنگاو رەنگکردن، رەنگاندن، بۆیەکردن

**تَليد:** ماڵو پاشماوەی کۆن

**تَلَه:** شلەژا، سەرسام ما، چاش بوو

**تَلين:** نەرم بوون، شلبوون

**تَلْيين:** نەرمکردن، ئماندن، گەلقاندن، شلکردنەوە

## ت م

**تَمّ( كمل ):** تەواو بوو، کۆتایی هات، برایەوە، پێکهات

**تَمَاثَنَ:** شەرە شیعر، وەلام نووسینی دوو شاعیر بۆیەکتر بەشیعرو هەڵبەست

**تَمَاثُل:** لەیەك چوون، وەك یەك بوون

**تَمَاجَدَ:** باسی شکۆمەندی خۆیکرد، لەدەستکەوتەکانی دوا

**تَمَاجَن:** شۆخیو گاڵتەیکرد

**تَمَاحَك:** دژایەتیکرد، دوژمنایەتی نواند

**تَمَاحَلَ:** مەکرو فێلّ لەگەلّ یەکدا

**تَمَادَ:** رایکێشا ، بەکێشیکرد

**تَمَادَى:** رۆچوو، درێژبوو، کشا

**تَمَادَى في الأمْر:** بەئـەنجامو مەبەستی گەیشت
**تَمَارَ:** هـەندێکیان بـەلای هـەندێکیاندا تێپەڕین
**تَمَّار:** خورما فرۆش
**تَمَارَى:** دەمەدەمەو گفتوگۆکردن
**تَمَارَس:** لەیەکیاندا، بەیەکا هاتن
**تَمَارَض:** خۆ نەخۆش خستن
**تَمَـازَى:** لەرەوشـتی بەرزوخەسـڵەتی جوانا بەرابەر بوون
**تَمَـازَجَ:** تێکـەڵبوو، ئاوێتـەبوو، چـوو بەناو یەکدا
**تَمَازَحَ:** گەمەو گاڵتەکردن لەگەڵ یەکدا
**تَمَـاسّ:** بەرکـەوتن، بەریـەك کـەوتن، لەیەکدان
**تَمَاسَحَ:** راستگۆیان ، سەر راست بوون لەمامەڵەدا لەگەڵ یەکتری
**تَمَاسَك:** پێوەی نووسا، پیالکا
**تَمَاسُك(إلْتِئَـام):** یـەکگرتن، پێکـەوە نووسان
**تَمَاشَى:** بەیەکەوە رۆیشتن
**تَمَاشَق:** بەربەرەکانی ، کێبەرکێ
**تَمَاشَقَ:** کێشیانکرد ، رایانکێشا
**تَمَاصَع:** برینداریی‌و جەنگ کردن
**تَمَـاكَرَ:** دەسـتی یـەکیان بـڕی، چاوبەستیان لەیەککرد، فێڵیانکرد
**تَمَاكَس:** دەمەدەمەو لەیەك گیران
**تَمَالأ:** تەگبیریانکرد، پیلانیان گێڕا
**تَمَـالَغ:** گاڵتـەی پێکـرد، سـووکایەتی پێکرد
**تَمَـالُك:** بوونـە خـاوەن، خـاوەنداری، ساحێبداریی

**تَمَالَك(تَمَاسَك):** وازی لێهێنا، دەستی لێهەڵگرت
**تَمَام:** تەواو ، گشت ، تێکڕا، سەرپاك، هەموو ، هەمی
**تَمَاماً:** بـەتەواوی ، سەرپاکی،بێ‌کەم‌و کوڕیی، بەتێکڕایی
**تَمَانَعَ:** ڕێگرییان کرد
**تَمَاوَتَ:** خـۆی مراند ، خۆیکرد بەمردوو
**تَمَاوَقَ:** خۆ بەنادان دەرخستن
**تَمَاهُل:** درێغی، سستی، ماوە ، ساری
**تَمَايَحَ:** بەلارو لەنجە، بەنازە ناز
**تَمَايَدَ:** بەلەرزی‌و جووڵە لاریوەوە
**تَمَـايَرَ:** نێـوان تێکـدان، شـێواندنی پەیوەندی
**تَمَـايَزَ:** جیـاوازی کەوتـە نێوانیـان، پەراگەندەو جیاوازی
**تَمَايَطَ:** نێوانیان تێکچوو، پـەیوەندیان شێوا
**تَمَايَلَ(تَبَخْتَرَ):** کەش‌و فش، خۆبادان
**تَمَـايُل:** ئـارەزووکردن، ویسـتن ، بەلاداهاتن
**تَمَايَنَ:** درۆ لەگەڵ یەککردن
**تَمَتَّعَ:** خۆشـی لێ بینـی،پێی‌رابـوارد، لەگەڵی رابوارد
**تَمَتَّع:** کەڵك‌و سوود وەرگرتن،رابواردن، خۆشی‌و کەڵك وەرگرتن
**تَمْتِين(تَقْوِيَة):** قایمکردن،جێگیرکردن
**تِمْثَال(صُورَة):** پەیکەر، کۆتەڵ، وێنە
**تَمَثَّل بِـه(تَشَبَّه):** لاسـاییکردەوە، وەکو ئەویکرد
**تَمْثِيـل:** نوانـدن ، لێکچوانـدن، قسـەی نەستەق ڤسانەوە

**تَمْثِيلِيَّة :** تەمسیل،چیرۆك ،تەماشانامە
**تَمَجَّدَ( تَعَظَّمَ ) :** خۆی هەڵکێشا، خۆی بەزلگرت
**تَمَجْمَجَ :** نیکاندن، رینگاندن، مینگە مینگ
**تَمَجَّنَ :** گاڵتەی ناشیرین و بێ ئابڕوویی‌کرد، لاقرتی‌کرد، رەفتاری ناشیرینی نواند
**تَمْجِيد( مَدْح ) :**پیاهەڵدان،بەرزکردنەوە، هەڵنان
**تَمَحَّى( تَلاشَى ) :** بڕایەوە، کوژایەوە
**تَمَحَّقَ( إِضْمَحَلَّ ) :** توایەوە، کەم بووەوە، ئاوابوو ، سڕایەوە، نەما
**تَمَحَّكَ( نَازَعَ فِي الكَلام ) :**شەڕی لێ ئەبووەوە
**تَمَحَّكَ ( جَادَلَ ـ رَاوَغَ ) :** بەفێڵ‌وفەرەج بوو،بەپێچ‌و پەنابوو، ساختەیکرد
**تَمَحَّلَ الشَيْءَ :** بۆفێڵ گەڕا ، بەفێڵ بردی
**تَمَخَّخَ( أَخْرَجَ مُخَهُ ) :**مۆخەکەی دەرهێنا
**تَمَخَّضَ الجَنِينُ :** بەچکە لەسکا جوولا
**تَمَخَّضَتْ الحَامِل :** ژان گرتی، هاتە سەر کاسە ، کاتی منالٚ بوونی هات
**تَمَخَّطَ :** چڵمی لەلووتی دەرهێنا، فنگی‌کرد، لووتی سڕی
**تَمْخِيط :** چڵم سڕین ، فنگ کردن
**تَمَادَى فِي الأَمْر :** بەئەنجام گەیشت
**تَمَدَّحَ( إِفْتَخَر ) :** خۆی هەڵکێشا، خۆی هەڵنا، بەخۆ هەڵگوتن
**تَمَدَّدَ( إِنْبَسَطَ ) :** کشا، درێژبووەوە، فراوانبوو، تەنیەوە
**تَمَدُّد :** کشان ، کێش هاتن ،فراوانبوون
**تَمَدَّرَ( تَلَطَّخَ ) :** قوڕاوی بوو
**تَمَدَّنَ( تَهَذَّبَ ) :**رەفتاری جوان‌و بەجێی‌کرد،راژەی شارستانیەتی فێربوو
**تَمَدُّن( حَضَارَة ـ عمران ) :**شارستانێتی، پێشکەوتن ، ئاوەدانی
**تَمْدِيد :** درێژکردنەوە، درێژەپێدان، بەدەمەوەدان
**تَمَذَّرَ( تفرَّقَ ) :** پەرشبوو، بلاوبووەوە، پەرش‌و بلاوبەوە
**تَمَذَّرَ البَيْض( فَسد ) :**هێلکەکە پیسبوو ، خراپ بوو، بۆنیکرد
**تَمْر( بَلَح ) :** خورما
**تَمَّر :** خورمای دایە بیخوا
**تَمْرُ الرُطَبَ :** خورماکەی پێگەیی
**تَمْرَاد( بُرج الحَمَام ) :** هێلانە کۆتر، لانەی کۆتر
**تَمَرَّخ بالدهن( تدلك ) :**خۆی چەورکرد، رۆنی هەڵسوو، هەنوی
**تَمَرَّدَ ( عَصَى وَعَتَى ) :** یاخی‌بوو ، مانی گرت، سەرکێشی‌کرد، سەرچڵی نواند ، نافەرمانی‌کرد
**تَمَرُّد( عَصْيَان ) :**سەرکێشی،یاخی‌بوون، مانگرتن
**تَمَرَّسَ بالشَيْء( إِحْتَكَ ) :**خۆی لێخشاند، خۆی تێهەڵسوو
**تَمَرَّضَ :** نەخۆشکەوت ، لاواز بوو، دەردەداربوو
**تَمَرَّطَ الشَعر( تَسَاقَطَ ) :**قژی هەڵوەری
**تَمَرَّغَ( تَقَلَّبَ ) :** لەقوڕو خۆڵا گەوزا، تلایەوە
**تَمَرَّغَ( تَقَلَّبَ ) :** گەوزان ، تلانەوە، گینگڵدان، پلکانەوە

**تَمَــرَّقَ الشَّــعر( تَســاقَطَ )**:وەری، هەڵوەریی، تووڵەك بوو

**تَمَرْكَز**: جێگرتن ، هاوچەقی،ئارامبوون

**تَمَــرَّنَ ( تَــدَرَّبَ )**: مەشــقیکرد، کۆششیکرد، کۆشا، هەوڵیدا، تەقەلایدا

**تَمَرُّن( تَمْرِين )**: مەشقکردن،راهـاتن، کۆششکردن

**تَمْرِيد**: داڕووتان ، لێکردنەوە

**تَمْرِيض**: نەخۆش خستن

**تَمْرِين**: مەشقکردن، ڕێنەبـەر،ڕاکۆش، ڕاهێنان ، کۆشش

**تَمَزَّقَ( تَشَقَّقَ )**:دڕا، شڕیبوو،شیبوەوە، شڕودڕبوو ، داتلێشا

**تَمَزْمَزَ( ذاقَ )**:لێی چەشت،ناخونەکیدا، خواردی

**تَمْزِيق( شَق )**:دڕاندن،پارچەپارچەکردن، هــەلا هەلاکردن، ڕیزاڵکردن

**تِمْسَاح**: تیمساح

**تَمَسَّحَ**: بڕی، پاکیکردەوە

**تَمَسَّحَ بالْمَاء( إغْتَسَلَ )**: خۆی شت

**تَمَسَّكَ**: پێــوەی نووســا، پیــا لکــا ، پیاهەڵواسرا

**تَمَسُّك( تَشَبُّث )**: تونگ گرتــن ، دەست هاوێژتن

**تَمَشَّى**: ڕۆیی، چوون ، ڕۆیشتن

**تَمَشَّى ( تَرَيَّضَ مَاشِياً )** : پیاسەی کـرد، هاتوچۆی کرد

**تَمَشَّــقَ( تَمَــزَّقَ )**: دڕا ، هەڵتلێشـــا، لەبەریەك هەڵوەشا

**تَمَشَّطَ الشَّعر( سَرَّحَه )**: قـژی داهێنـا ، شانەیکرد

**تَمْشِيَة ( سَير )**: ڕۆیین ، بەڕێکردن

**تَمْشِــيط ( تَسْــرِيح )**: شــانەکردن، داهێنان، ڕێککردن

**تَمَصَّــرَ المَكَــان**: ئــاوەدان بــوەوە، ئاوەدانی تێکەوت

**تَمَصْمَصَ ( رَشَفَ )**: قومی لێدا

**تَمَضْمَضَ**: ئاو لەدەم وەردان

**تَمَضْمَضَ النَّاسُ في عَيْنــه( دَبَّ )**: چاوی نیشت، خەوبردیەوە

**تَمْضِيَة الوَقْت**: کات بەسەربردن ،کـات بەڕێکردن

**تَمَطَّى ( تَمدد )**: خۆی کێشایەوە

**تَمْطُر**: باران بارین

**تَمَطَّطَ( تَمَدَّدَ وتَلَزَّجَ )**: کشا، پیانووسا

**تَمَطِّي**: پێدرێژکردن، لاق ڕاکێشان

**تَمَحَّجَ( تَلوَى )**: پێچیخـوارد، لوولبــوو، پێچاوپێچ بوو

**تَمَعَّرَ**: وەری، کەوت، هەڵوەریی

**تَمَعَّطَ( سَقَطَ )**: هەڵوەریی، ڕوتایەوە

**تَمَعُّــن( تَــرَوِّي۔ تفحــص )**:تــێڕوانین ، دیقەت لێکردن، بیرکردنەوە

**تَمَعَّنَ فيه** : تێبینیکرد، دیقەتیدا،بیری لێکردەوە

**تَمَخَّضَ**: ژان گرتی،تووشی ژانەسکبوو، پێچ بەسکیا هات

**تَمَخَّطَ( إمْتَد وَطال )**: درێـژبوەوە، کشا

**تَمَغْنُط( تَمَغْطُس )**:موگنـاتیس گرتـن، مەگنەتین

**تَمَكَّثَ**: مان ، منەکردن ، مانەوە

**تَمَكُّن( إقْتِدار )**: توانـین، لێـهاتوویی ، ئاوزان ، گونجان

**تَمْكِيــن**: جێنشــینکردن، خـــاوەن جێ‌وشوێن ، پلەوپایە کردن

**تَمَلأَ:** پڕبوو، لێوان بوو، لێوان لێویی
**تَمْلِئة:** پڕکردن ، داگرتن
**تَمَلَّسَ( أفْلَتَ ):** رزگــاربوو، قوتــاربوو، ترازا
**تَمَلُّص( إفْـلاَت ):** خۆدزینـه‌وه‌ ، راکـردن، رزگاربوون
**تَمَلُّق:** مه‌رایی، روپامایی، جاپلووســی، مامه‌حه‌مه‌یی
**تَمَلُّك( حِيَازَة ):** هه‌بوون ، بوونه‌ خاوه‌ن سامانو دارایی
**تَمَلَّكَ الشَّئ:** ده‌ستی به‌سه‌راگرت،کردی به‌هی خۆی
**تَمْلِيك:** کردنه‌ خاوه‌نی سامانو مـاڵو شتو مه‌ك
**تَمَمٌ:** جێبه‌جێکرد ، رایپه‌ڕاند،پێکی‌هێنا
**تمَن (رز):** برنج
**تَمَنٍّی:** ویسـتی، ئـاواتی بـۆ خواسـت ، نیاز ، هێڤی
**تَمَنَّعَ بِكَـذَا( إحْتَمَى بِـه ):** خـۆی پـێ پاراست
**تَمَنَّعَ عَنْ كَـذَا:** وازی لێـهێنا ، ده‌سـتی لێهه‌ڵگرت
**تَمَنٍّ ( إبْتِغَــاء ):** داخــوازیی ، ئاواتــه‌ خوازبوون
**تَمَنَّنَ( أضْعَـفَ ):** لاوازیکـرد، لــه‌ڕیکرد، چرووسانیه‌وه‌
**تَمَنَّنَه بِـهَا:** دایـه‌وه‌ بـه‌چاویا ، منـه‌تی به‌سه‌را کرد
**تَمَهَّدَ لَهُ (تَسَهَّلَ):** بۆی ئاسانبوو، هاته‌ پێش ، بۆی گونجا
**تَمَـهَّلَ ( لَـمْ يَعَجَـل ):** لـــه‌سه‌رخۆبوو، شێنه‌یی‌بوو، په‌له‌ی نه‌کرد، هێواش بوو

**تَمَهُّل( تَــأن ):** شـێنه‌یی، پشــوودان ، له‌سه‌رخۆبوون
**تَمْـهِيد:** رێکخســتن ، ئاســانکردن، ئاماده‌کردن
**تَمْـهِيدِي( تَحْضِــيرِي ):** ســه‌ره‌تایی، ئاماده‌یی
**تَمْهِيل:** مۆڵه‌تو ماوه‌دان
**تَمْهِيم:** لای لایه‌، لۆره‌ لۆر
**تَمْوَء:** میاواندن ، میاوه‌ میاو
**تَمُّوج( حَرَكَة وَهَيَاج المَاء ):** شه‌پۆلدان ، جلوورین ، په‌خشان ، هووژه‌
**تَمُور( تَمَوُّجِيـة ):** جووڵـه‌ی شـه‌پۆلدار ، شه‌پۆلاویی
**تَمَـوَّرَ:** ئـه‌جوولا ، سـره‌وتی نـــه‌بوو، به‌شپرزه‌یی ئه‌هاتو ئه‌چوو
**تَمُوُّرَاً( إقْبَالاً وَإدْبَاراً ):** هاتنو چـوون ، ئه‌مسه‌رو ئه‌وسه‌رکردن
**تَمُّوز:** مــانگی حــه‌وت کـه‌31 رۆژه‌ ، مــانگی خــه‌رمانان ، گــه‌رماجمان ، میوه‌گه‌نان
**تَمَوَّلَ( كَثُرَ مَالُـه ):** ده‌وڵه‌مـه‌ندبوو، بـوو بـه‌خاوه‌ن سـامان ، سـامانی زۆر بـوو، ماڵداری
**تَمَوَّلَ( أخَـذَ المَـالَ الـلازِم ):** دراوو مـاڵی برد بۆ خۆی
**تَمَوَّنَ:** ئازوخه‌ی‌خست، تفاقی‌خست
**تَمْوِين( مِـيرَة ):** تفـاق خسـت ، ئازوخـه‌ هه‌ڵگرتن ، به‌خێوکردن
**تَمْوِيه( طِلاء ):** رووکه‌ش، داپۆشین
**تَمَيَّحَ( تَمَـايَل ):** لــه‌تری‌دا، بــه‌ملاولادا که‌وت ، ره‌تیدا، لاریوه‌وه‌
**تَمَيَّدَ:** له‌رزی ، له‌ریه‌وه‌، هه‌ژی

**تَمَيَّزَ**: جیابووەوە، پالاوتن، لێککردنەوە

**تَمَيَّسَ( تَبَخْتَرَ )**: خـۆی بائـەدا، بەگەنجەف رۆیی

**تَمَيَّعَ( ذَابَ وَسَالَ )**: یەقیدایەوە،توایەوە

**تَمَيَّلَ( تَخَطَّرَ )**: لەریەوە،جوولایەوە

**تَمِيمَة**: نوشتە، چاوەزار ، تیخبەند

**تَمْيِيز( فَرْق )**: جیاکردنەوە،جیاکاری، دیاریکردن

**تن**

**تَنَأَى( إِبْتَعَدَ )**: دوورکەوتەوە

**تَنَابَثَ**: لێکۆڵینەوەیانکرد،پشکنیانکرد

**تَنَابَذَ**: دوژمنایـەتیو تێکچـوون بەرپابوو لەنێوانیاندا

**تَنَابَزَ**: ناوناتۆرە ، داهێنان

**تَنَابَلَ**: شـانازی کـردن بـەتیر ئەندازەییو جوانیەتی

**تَنَاتَفَ**: هەڵکەنرا ، دەرکێشرا

**تَنَاثَ**: بلاویانکردەوە، پەخشیانکرد

**تَنَاثَرَ**: هەڵوەرین ، وەرین ، داوەرین

**تَنَاثَرَ( تَشَتَّتَ )**: بلاوبوەوە، پەرش بوو

**تَنَاثَلَ**: هـەستان ، بەرزبوونەوە

**تَنَاجَى الصَّدِيقَان ( تَسَاوَا )**:گفتـو گۆیان ئەکرد، لەگەڵ یەك دوان

**تَنَاجَزَ( مَنَازَلَة )**:زۆرانبـازی، بەرەنگاربوون، چنگ بەیەکداکردن

**تَنَاجَشَ**: زیادکردنی پارە لەمامەڵەدا

**تَنَاجَلَ**: دژواری، شەڕوئاژاوە گێڕی

**تَنَاحَبَ**: وادەو کاتیـان دیـاریکرد بـۆ جەنگ

**تَنَاحَرَ**: تێکچوون لەسـەر مەسەلەیەكو گەیشتنە رادەیەك خەریك بێت یـەکتری سەرببڕن

**تَنَاحَسَ**: سـەرنگونکردن، دیارنـەمان ، شکست

**تَنَادَّ**: جیاوازییو پەرتەوازەبوون

**تَنَادَى**: هـەندێکیان ئـەوانی دیکـەیان بانگکرد

**تَنَادَى الْقَوم**: لەیانـە کۆبوونـەوە، لەشوێنو جێگەیـەکی تایبـەت مـۆڵو دەستە جەم بوون

**تَنَادَرَ**: بـاسو خواسـی شـتی سـەیرو سەمەری کرد

**تَنَادَمَ**: کـۆبوونەوە لەسـەر خوانـی بادەو شەراب خواردن

**تَنَاذَرَ**: هەواڵی شەڕو جـەنگیان بەیـەك راگەیاند

**تَنَازَحَ**: دوورکەوتەوە

**تَنَازَعَ**: تێکچـوون ، رێـك نەکـەوتن ، ناکۆکیان تێکەوت

**تَنَازَقَ**: قسەی ناقۆلاو ناشیرین وتن

**تَنَازَلَ**: وازی لێهێنا، دەستی لێهەڵگرت

**تَنَازَلَ**: وازهێنـان ، دابـەزین بـۆ یـەکێکیتر،سەردانەواندن، نەویستن، دەست لێهەڵگرتن

**تَنَاسَى**: وادەرخستن کـەوا لـەبیری کردووە

**تَنَاسُب**: سازان، رێژە، گونجاندن

**تَنَاسَب الرِّجْلَان**:بوون بەخزمییەکتری، بوون بەخزم ، بوونە خوێش

**تَنَاسَخَ( تَتَابَعَ )**: بەدوایـیەکدا هـاتن ، بەدوایا هاتن

**تَنَاسُخ الأَرْوَاح**: روح لەشتێکەوە بچێتە شتێکیتر

**تَنَاسَفَ**: رازو نهێنی وتن بەیەك

**تَنَاسَقَ( إِنْتَظَم ):** رێكبوو، رازایەوە، پێوە بوون
**تَنَاسَلَ:** زاوزێ ، بەچەخستنەوە
**تَنَاسَلَ القَوم:** زاوزێیانكرد، وەچەیان خستەوە
**تَنَاسُلِي( جِنس ):** زا ئەندامی،پەیوەندی هەیە بەزاوزێوە
**تَنَاشَبَ:** هەندێكیان پابەندبوون بەوانی دییەوە
**تَنَاشَدَ:** شیعر خوێندنەوە بۆ یەكتر
**تَنَاشَر:**یارمەتی یەكیاندا لەبلاوكردنەوەیدا
**تَنَاصَّ:** جەنجاڵی كردن
**تَنَاصَبَ:** بەشكردن ، بەخشین ، پشككردن
**تَنَاصَرَ:** كۆمەكو یارمەتیدانی یەك
**تَنَاصَفَ:** بەدادپەروەریی باسیان لەیەك كرد
**تَنَاصَلَ:** بەدەركەوت ، دیاریدا
**تَنَاصِيب:** نیشانەو هێمای سەر رێگە بۆ گەشتكارو ئەوانەی سەفەر دەكەن
**تَنَاضَلَ:** پێشبڕكێو شانازییانكرد لەتێكۆشاندا
**تَنَاضَلوا( تَفَاخَروا ):** خۆیان هەڵكێشا
**تَنَاطَحَ:** شەڕە قۆچیان كرد، یەكتریان دایە بەر قۆچ
**تَنَاطَقَ:** گوتەو قسەیان وت بەیەك
**تَنَاضَرا( تَجَادَلا ):** مشتو مڕیانكرد، گفتوگۆو قسە گۆڕینەوە
**تَنَاظَمَ:** رشتەو ریزبەندیی
**تَنَاعَى:** باسی كوشتارو جەنگ بۆ هاندانی لایەنگرانیان لەسەر كوشتارو شەڕكردن

**تَنَاعَسَ:** مێواش بوو، كزبوو، لاوازبوو
**تَنَاغَى:** زاڵبوو بەسەریا، سەركەوت
**تَنَافَ( تَضَاد ):** لەیەك نەچوون، دژ
**تَنَافِي:** جیاوازیی‌و بەرچاویی
**تَنَافَدَ:**دوو ناكۆك حاڵو باریان بردەبەر دەستی دادوەرو هەریەك بەڵگەو بەهانەی خستە روو
**تَنَافَذَ:** چوونە بەردەم دادگەرو بەرزكردنەوەی سكاڵاو شیكایەت
**تَنَافَرَ:** لەیەك نەچوون ،جیاواز لەیەك ، بۆ نەبوون
**تَنَافُر:** لەیەك دووركەوتنەوە
**تَنَافَروا ( تَبَادلوا الكَرَاهِيَة ):** رقیان لەیەك هەڵگرتبوو، یەكتریان نەویست
**تَنَافُس:** بەربەرەكانی یەكتر، ململانێ
**تَنَافِي:**بەپێچەوانەی یەكتریجوولانەوە
**تَنَافَتَ الأَشيَاء:** جیاوازبوون، لەیەك نەچوون
**تَنَاقَص:** كەم بووەوە، كەمی كرد ، پوكایەوە
**تَنَاقُض( تَبَاين ـ مُخَالَفَة ):**دژولر، جیاوازی،ناكۆكی،پێچەوانە ، نادروست بەیەك
**تَنَاقَل:** وتەو هەواڵی یەك گواستنەوە
**تَنَاكَث:** پەیمانو بەڵێن نەبردنە سەر
**تَنَاكَح:** هاوسەرگیری ، بەیەك گەیشتنی ژنو مێرد
**تَنَاكُد:** ناهەمواریی ، ناخۆشی
**تَنَاكَر:** خۆی لێهەڵەكرد
**تَنَاكَف:** بەتۆبە هاوەڵایەتی كردن
**تَنَاه:** سنوور بۆ دانان ، دیاری كردن
**تَنَاهَى:** خۆی گرتەوە،جڵەوی گرت

**تَنَـــاهَدَ:** هەریەکـــەیان بەخشـــیان بەئەندازی یەك هەتا خواردن بکرێن و بەشداربن لەخواردنیدا

**تَنَــاهَدَ الأَصْحَــابُ:** داكۆكیـــانكرد، كۆیانكردەوە

**تَنَــاهَزَ:** لـەدووی هـەل گـەڕان ، بـۆ فرسەت گەڕان

**تَنَـاهَضَ:** هەسـتان لەجـەنگدا بـۆ ڕوو بەڕوو بوونەوەی یەك

**تَنَـاوَبَ( تَعَـاقَبَ ):** بـەدوای یـەكدابوو، دوا بەدوای بوو ، بەنۆبە كاركردن

**تَنَاوَحَ:** بەرابەر بوونی دوو شاخ

**تَنَاوَشَ الشَّئَ:** وەری گرت ، گرتی

**تَنَاوَلَ( أَخَذَ ):** وەرگرتن ، لێك وەرگرتن

**تَنَـاوَمَ ( تَظَـاهَرَ بِـالنَومِ ):** خۆیكـــرد بەنوستوو

**تَنَبَأَ( تَكَلَّمَ بالنبوءة ):** پێش بینیكرد ، نوقلانەی لێدا ،قرانی

**تَنَبَّهَ:** هـــاتنەوە سـەرخۆ ،بێـداری، ئاگاداربوون، وریا بونەوە

**تَنَبُّؤ:** پێش بینـی كـردن ، قرانـدن ، نوقلانە لێدان

**تَنَبَّهَ( فَطَنَ - شَعَرَ ):** هەستیكرد، پێـی زانـــی ، وریـــابوەوە، ئاگـــاداربوو ، تێبینیكرد

**تَنْبِيـطُ( تَنْدِيـدٌ ):** هـەڕەشە، ڕەخنـە، هەڕەشەو گوڕەشە

**تَنْبِيـهٌ( إِيقَـاظٌ ):** هەڵسان، ڕاپـەڕاندن، خەبەركردنـــەوە، وشـــیاركردنەوە، بێداركردن

**تَنَجَّدَ( إِرْتَفَعَ ):** بەرزو بڵند بوەوە

**تَنَجَّـزَ:** داوای كۆتـایی پێـهێنانیكرد، ویستی تەواو ببێ

**تَنَجَّسَ:** گلاوبوو، پیس بوو

**تَنَجَّعَ فُلانَـاً:** پـەنای بـردە بـەر، داوای یارمەتی لێكرد

**تَنَجَّمَ:** ئەستێرە گـەڕییكرد، بەشوێن ئەستێرەدا ئەگەڕێ

**تَنْجِيَةٌ( إِنْقَاذٌ ):** ڕزگاركردن،فریاكەوتن

**تَنْجِيسٌ( تَلْوِيثٌ ):** پیسكردن، گلاوكردن

**تَنَحَّى:** لاچوو، ڕۆیشت ، ڕەوییەوە

**تَنَحَّسَ( صَامَ - جَاعَ ):** بـرسی بوو،هیچی نەخوارد

**تَنَحَّلَ التَّأليفَ:** نووسراو دانراوێكیكرد بەهی خۆی

**تَنَحْنَحَ:** كۆكە كۆك ، كۆكین

**تَنَخَّلَ:** بێژرایەوە، پوختیكرد

**تَنْخِيلٌ:** دابێژان ، پوخت كردن

**تَنَدَّى:** بەخشندەبوو، دەستلاوبوو

**تَنَـدَّحَ( إِنْتَشَـرَ وتَبَـدَّدَ ):** بلاوبـوەوە، تەنییەوە

**تَنَدَّلَ:** بەدەستەسڕ سڕی

**تَنَـدَّمَ:** پەشیمانی، داخ بـۆ خـواردن ، ژێوانی ، پاشگەز بوونەوە

**تَنْدِيَةٌ:** تەڕكردن

**تَـنَزَّلَ:** هاتنـە خـــوارەوە، دابـــەزین، سەرشۆڕكردن، سەردانەواندن

**تَنَزَّهَ( خَرَجَ لِلنُزْهَةِ ):** گەشتیكرد، چوو بۆگەڕان

**تَـنَزَّهَ عَـنْ( تَبَـاعَدَ ):** دووركەوتـەوە، پاكبوەوە

**تَنَسَّرَ( إِنْتَشَرَ ):** شی بوەوە، خاوبوەوە

**تَنَسَّقَ( إِنْتَظَمَ ):** ڕێكبوو، ڕازایەوە

**تَنَسَّكَ( تَزَهَّدَ وتَعَبَّدَ ):** بـوو بەسۆفی ، دەستی دایە خواپەرستی

**تَنَسَّمَ ( تَنَفَّسَ )**: هەناسەیدا

**تَنَسَّمَت الرِيح**: بـا هـەڵیکرد، کزەی بـا هات ، شەماڵ هات

**تَنْسِيق( تَرتِيب )**: ڕێکخستن،خشتکردن

**تَنْشئَة**: پێگەیاندن، نەش‌و نماکردن

**تَنَشَّبَ فيـه ( تَعَلَّـق )**: پیاهەڵواسـرا ، تێوەی ئالا

**تَنَشَّرَ ( إنْبَسَط )**: بلاوبـوەوە، ڕاخـرا، کرایەوە، ، زانرا

**تَنَشَّطَ( طابَت نَفسه )**:دلّی خـۆش بوو، کرایەوە، گەشایەوە، خۆش نوود بوو

**تَنَشَّفَ ( إمْتَصَه )**: هەڵی مژی

**تَنَشَّقَ**: هەناسەی وەرگـرت، بۆنیکـرد ، هەڵی مژی

**تَنْشِيط**: چالاککردن ، کاراکردن

**تَنْشِيف**: وشککردنەوە

**تَنْشِيق**: هەڵمژین ، هەڵمووسـین ، قـوم لێدان

**تَنَصَّتَ**: بەدزیەوە گوێـی گـرت، گـوێی هەڵخست

**تَنَصُّت**: گوێگرتن ، گوێ هەڵخستن

**تَنَّصَرَ**: کردنە فەلەو دیان، سەرخستن، یارمەتیدان

**تَنَصَّـفَ**: داوای دادیکـرد، دادگـەریی خوازیی

**تَنَصَّـلَ**: سـەرفرازبوو، ڕزگـاری بـوو، قوتاربوو

**تَنْصِير**: بەگاورکردن

**تَنْصِيـف ( شَـطر )**:لـەتکردن ، کـردن بەدوو بەش لەناوەڕاستدا

**تَنَطَّـعَ ( تَـأنق )**: ئارایشـتی خۆیـدا ، دەستی بەخۆیدا هێنا، خۆی ڕازاندەوە

**تَنَطُّط**: هەڵبەزاندنەوە، هەڵپەز هەڵپەز

**تَنَظَّرَ( تَأَمَّلَ )**: سەرنجی دایە، تێڕوانی

**تَنَظَّفَ الشَئ**:پاك بوەوە،خاوێن بوەوە

**تَنَظَّمَ ( تَرتَّبَ )**: ڕێکبوو ، ڕێکخرا

**تَنْظِـير( مُقَارَنَـة )**: بـەراوردکردن ، بەراورد

**تَنْظِيف( تَطهِير )**: پاککردنەوە، خاوێن کردنەوە ، پاکسازی

**تَنْظِيـم( تَرْتِيـب )**: بەرشـتەوەکردن، ڕێکخستن، ئەگڤزاندن

**تَنَعَّلَ**: پێلاوی لەپێکرد ، سۆڵیکردەپێ

**تَنَعَّـمَ ( تَرَفَه )**: گوزەرانـی بـاش بـوو، کـەوتە خۆشی‌و نازەوە ، ماڵداربوون

**تَنَغَّرَ**: پیشی خواردەوە ، ڕقی هەڵسا

**تَنَغَّشَ( تَحَـرَّك )**: لـەرزی ، لـەقی ، هەژی، جوولایەوە

**تَنَغَّصَ عَيشُه( تَكَدَّر)**: ژیانی تاڵبوو

**تَنَغَّمَ**: لەبەرخۆیەوە گۆرانی دەوت

**تَنَفَّـجَ**: بەشـتی خەڵکـەوە نـازین‌و خۆهەڵکێشان

**تَنَفُّخ**: باکردن ، هۆکردن

**تَنَفُّـر**: بـێزاریی ، وەرسـبوون، ڕووتێنەکردن

**تَنَفَّسَ( تَنَسَّمَ )**: هەناسەیدا، هەناسەی هەڵمژی

**تَنَفُّس**: هەناسەدان ، هەناسە وەرگرتن

**تَنَفَّشَ**: پشیلەکە خۆی گڤکردەوە

**تَنَفَّضَ**: چاوی بەهەموانا گێڕا، بەهەموو لایەکدا وردبوەوە

**تَنَفَّطَ( إحْتَرَق غَضَباً )**:ڕقـی هەڵسـا ، تورەبوو، ئاگری لێ ئەبوەوە

**تَنَفَّطَ( تَقَرَّع )**: بلقیکرد، تلۆقیکـرد، هەڵزڵەپی

**تَنْفيخ:** ئاوساندن ، وەرماندن، هەڵپەنماندن

**تَنْفيذ:** جێبەجێکردن، بەئەنجام گەیاندن

**تَنْفيذي(إجْرائي):** جێبەجێکاری، ئەنجامدان

**تَنْفيس:** باڵی دەرکردن، فشکردنەوە

**تَنْفيض(رَجّ):** تەکاندن، پرواندن ، - راوەشاندن

**تَنَقُّبَت:** گرتنی پەچە لەلایەن ژنانەوە

**تَنَقَّذ:** رزگاری کرد ، فریای کەوت

**تَنَقَّضَ(إنْكَسَر):** شکا ، هەڵوەشا

**تَنَقَّلَ:** زۆر ئەجوولێو جێگە ئەگۆڕێ، جێگە بەخۆی ناگرێ

**تَنَقُّل:** گواستنەوە، گوێزانەوە، هاتو چۆکردن

**تَنْقِيَة(تَصْفِيَة):** پاککردنەوە،خاوێن کردنەوە، پاکژکردن

**تَنْقيب(فَحْص):** پشکنین ،کۆڵین ، توێژینەوە

**تَنْقيح(تَهْذيب):** بژارکردن،پیاچوونەوە

**تَنْقيد:** رەخنەلێگرتن ، شەنوکەوکردن

**تَنْقيش:** شێوە نووسین

**تَنْقيص(تقليل):** کەمکردنەوە،لێداڕنین

**تَنْقيط:** نوختە دانان، خاڵبەندی

**تَنْقيل(تَبْديل المَوضع):** جێگە گۆڕین، جێ گۆڕین

**تَنَكَّبَ عَنْ(حادَ):** لایدا ،وەری گێڕا

**تَنَكَّب عَنه:** خۆی لێ پاراست ، وازی لێهێنا ، لێی دوورکەوتەوە

**تَنَكَّد(تَكَدَّر):** لێی تاڵبوو

**تَنَكَّرَ(تَخَفّى):** خۆی گۆڕی ، چوە بەرگێکی ترەوە

**تَنَكُّر(إسْتِخْفاء):** خۆگۆڕین، چوونە بەرگێکی ترەوە

**تَنَكَّس:** یاخیبوو، تەلاسابوو، ناچیزە دەرچوو

**تَنَكُّس:** یاخیتی ، تەلاسایی

**تَنْكيس:** شۆڕکردنەوە، سەرەوژێر کردنەوە

**تَنْكيل:** بەپەند بردن

**تَنَمَّر(غَضِبَ):** تورەبوو، رقی هەڵسا

**تَنْمِيَة:** گەشەسەندن، پەرەپێدان

**تَنْميق(تَحسين وتَزيين):** نەخشاندن، رازاندنەوە، رێکخستن

**تَنْميل(خَدَر):** سڕبوون، تەزین، قەسرین ، لەگۆکەوتن ، قەفلین ، کەسیرەبوون

**تَنَهَّدَ:** هەناسەی هەڵکێشا

**تَنَهُّد(تَأَوُّه- تَحَسُّر):** هەناسە هەڵکێشان ، ئاهکردن

**تَنَوُّح(تَحَرُّك):** لەریەوە، هاتوچوو

**تَنَوُّد(تَمايَل):** جوولایەوە، بەملاو لادا ئەهاتو ئەچوو، لەریەوە

**تَنَوَّر:** رووناکبوەوە، رووناکی تێکەوت، رۆشنایی تێکەوت

**تَنور:** تەنوور ، فڕن، کەندوێکی لەقوڕ دروستکراوە کەئاگری تێدا دەکرێتەوە لەزەوی یان لەدیوار دەگیرێو نانو کولێرەی پێدەکرێ

**تَنّورة:** تەندوورەی ژنان، نیوتەنە

**تَنَوَّع:** بوو بەهەمە جۆر، بابەت بابەت ، هەمە چەشن ، رەنگاو رەنگ بوون

**تَنَوَّق:** رێکو پێک بوو ، ناوازە دەرکەوت

**ثَنَوَّم (إِحْتَلَم)**: شەیتانی بوو ، ئاوی هاتەوە ، دامرکایەوە
**ثَنَوَّه (إِرتَفَع)**: بەرزبوەوە، هەڵچوو
**ثَنْوِير**: ڕووناککردن، دیارکردن، ڕەوشەنکردن
**ثَنْوِيم**: نواندن،خەواندن ، نقاندن ، ڕازاندن
**ثَنْوِيه (ذِكر)**: بەباش باسی کەسێکی کردو هەڵینا، ناوهێنان ، باسکردن ، ئاماژە بۆ کردن

**ت هـ**

**تَهَاتَر**: گێچەڵ بەیەك گرتن،بیانوو گرتن ، گەرکردن بەیەك
**تَهَاتَنَت**: باران بارین بەخوڕو بەردەوامی ، خۆش نەکردنەوەی باران
**تَهَاجَى**: قسەی ناشیرین بەیەك گوتن
**تَهَاجَرُوا**: وازیان لەیەك هێنا، لەیەك زویر بوون
**تَهَاجَم**: پەلامار بردنە سەریەکتری، هێرش بردن بۆ یەکتری
**تَهَاجَمَا**: پەلاماری یەکتریاندا ، هێرشیان بردە سەر یەك
**تَهَادَأ**: پێ بەپێ ئامادەبوون
**تَهَادَى**: دیاریاندا بەیەك، خەلاتیان گۆڕییەوە
**تَهَادَى فِي مَشْيَتِه**: لارە لار ئەڕوا،بەملاو لادا ئەکەوێ ، لەتر ئەدا
**تَهَادَرَ**: خوێنی یەك حەلالکردن، گونجاندنی خوێنرێژی
**تَهَادَنَ**: ئاشتەوایی، ڕێککەوتن ، بەستنی پەیماننامە
**تَهَاذَى**: وڕێنەیانکرد لەقسەکانیاندا
**تَهَارَب**: هەڵهاتن لەگەڵ یەکدا ، ڕاکردن
**تَهَارَشَ**: بەردانی سەگ لەیەك، شەڕە سەگ
**تَهَارَط**: جنێوو قسەی سووكو نزم بەیەك گوتن
**تَهَارَق**: ئاوپرژان بەسەر یەکا
**تَهَارَم**: خۆپیرکردن، خۆنواندن بەپیرو پەککەوتە
**تَهَاطَل**: دوا بەدوای یەك، هاتن بەدووی یەکدا
**تَهَافَت**: کەوتە خوارەوە بەدوای یەکدا
**تَهَافُت(إِنْدِفَاع ـ هُجُوم)**:بۆچوون، پەلاماردان ، ئامبازبوون، خۆ بۆکوتان
**تَهَافَتَ عَلَى**: پەلاماریدا، هەڵمەتی بۆ برد، خۆی بۆ کوتا
**تَهَاكَلَ**: بەربەرەکانیو ململانێیانکرد لەسەر شتێك
**تَهَالَك**: تێکۆشا ،بەدڵ خەریکبوو
**تَهَامَسَ**: چرپە ، نهێنی، پەنهان، شاردنەوە
**تَهَامَشَ**: چوونەسەر یەكو ئانەوەی جموجووڵ
**تَهَامَل**: کەمتەرخەمی تیاکرد، تەمەڵیکرد، فەرامۆشیکرد
**تَهَامُل(تَوَانِ)**: دەربەست نەبوون، کەمتەرخەمی
**تَهَامُوا**: بەسرپەسرپ قسەیانکرد
**تَهَاوَى**: دوا بەدوای یەك کەوتن
**تَهَاوَش**: تێکەڵبوون ، وەك یەك بوون
**تَهَاوُن(إِسْتِهَانَة)**: گاڵتەپێکردن، ئابڕوبردن، سووککردن

**تَـــهَاوَنَ**: ئاســـــانیكرد،بەســــووك سەیریكـــرد، بەنزمی تێڕوانی

**تَهَاوِیل( أَلوان مُختلفة )**:رەنگاو رەنــگ، هەمە ڕەنگ، چەند رەنگێکی جیاواز

**تَهَایَا**: سازان‌و گونجاندن

**تَهَاني**: پیرۆزبایی، پیرۆزانە

**تَــهَایَجَ**: وەســـتان بـــۆ كوشـــتار، ئامادەبوون بۆ جەنگ

**تَهَبَّبَ ( تَقَطَّع )**: دڕا ، كۆنبوو، شڕبوو

**تَــهَبَّلَ ( تَكَسب )**: پـەیدایکرد، دەســتی كەوت ، رەنجیدا

**تَهَبَلَ بِالبُخَار**: بەهەڵم كولا

**تَهَتَّكَ( تَمَزَّقَ )**: دڕا ، شڕبوو

**تَهَتَّكَ( عَدِیم الحَیَاء )**: بێئابڕوویـەتی، ڕوو هەڵماڵراو ، بەد خوو

**تَهَتَّمَ الشَئ( تَكَسر )**: شكا، لەتبوو،وردو خاشبوو، پارچە پارچە بوو

**تَهَجَأَ**: حینجەیكرد ، پیـت پیـت ناسـی پاشان بەسەریەكەوە خوێندیەوە

**تَــهَجَمَ عَلَى الشَئ**: هێرشـی بردەســەر پەلاماریدا

**تَــهْجِیر**: ڕاگوێـزان، دوورخســـتنەوە، هۆنكاندن

**تَــهْجِین**: دووڕەگ بـــوون، دووڕەگ كاریی

**تَهَدَّى**: بــۆ ڕێگەی ڕاست گەڕا، كەوتە ڕاوێژ

**تَهْدِئَة**: هێمن كردنەوە، هێوركردنەوە

**تَهَدَّجَ**: زرنگانەوەی دەنگ ، زریانەوە

**تَـــهَدَّدَ ( تَوَعَّـــد )**: هەڕەشـــەكردن، گورەشەكردن

**تَهَدَّلَ ( تَدلي واستَرخَى )**: شـۆڕبوەوە، داهێلرا

**تَـهَدَّمَ( إِنــهَدَم )**: ڕووخـــا ، تێكچـوو، هەڵوەشا

**تَــهْدِید**: ترســـاندن، هەڕەشـــەكردن، هەروگیف

**تَـــهْدِیم( تَخْرِیـــب )**: وێرانكـــــردن، روخاندن، كاولكردن

**تَهَذَّبَ ( تَعَلَّـمَ وتَرَبى )**: پـەروەردەبوو، فێربوو ، دەرسی وەرگرت

**تَـهْذِیب( إِصْلاَح )**: چاككردن، دەســت پیاهێنان، بژاركاری

**تَـهْذِیب( تَعْلِیـم )**: فـێركردن، ڕاهێنــان، دەرس دادان

**تَـهْذِیبي( تَرْبَـوي )**: پـەروەردەیی، بـۆ پەروەردە

**تَهَرَأَ اللحم**: گۆشتەكە كولا ، پوا

**تَهَرِّي**: بەكوتەك لێیدا ، شڕبوو، پوا

**تَهَرَّبَ( إِنــهَزَم )**: ڕایكـرد، دەركـەناربوو، خۆی دزیەوە

**تَهْرِیب**: دەركردن ،بردن، قوتاركردن

**تَهْرِیم( فَرْم )**: جنین ، لەت لەتكردن

**تَهَزَّأَ**: گاڵتەی پێكرد، لاقرتی پێكرد

**تَـهَزَّزَ( تحـرك )**: لـەقی، بزوا ، جـوولا، شڵەقا، ڕاوەشا

**تَهَزَّعَ** : پەلەیكرد،خێرایكرد، گورجبوو، دەستو بردی كرد

**تَـهَزَّمَ الوَتَـر( رَنَّ )**: لەریــەوە، دەنگـی دایەوە

**تَهْزِیز( تحریـك )**: جووڵانـدن، لـەرزان، شڵەقان، بزواندن

**تَهْزِیم**: ڕاونان، كۆڵ پێدان، هەڵبڕین

**تَـهَزْهَزَ( تَحَـرَّكَ )**: جـوولا، لەریــەوە، بزووت، لەقی، لەرزی

**تَهَشَّمَ:** تێکشـکا ، وردبـوو ، پـارچە پارچە، وردوخاشبوو

**تَهْشِيم( كَسر ):** شـکاندن ، هـاڕین ، تێکشکاندن ،پارچە پارچەکردن

**تَـهَطَّلَ( نَـزَل ):** باران بـارین، داکردنــی باران

**تَهَفْهَفَ( نَحَل ):** لاوازبـوو، بـاریکبوو، لەڕبوو، چرووسایەوە

**تَـهَكُّم( سُـخْرِيَّة ):** گاڵتــە ، قەشمــەری، لۆترەوانی

**تَهَكَّمَ البناءُ( تَهَدَّم ):** ڕووخا، تەپی،ڕما

**تَـهَكُّمِي( إسْـتِهزَائِي ):**گاڵتـــەچێتی، قەشمەری، لۆترەوانێتی، تیزەجاڕیی

**تَهْلُكَة:** مەترسی، لەناوچوون

**تَـهَلَّلَ( إبْتَـهَاج ):** خۆشــی ، شــادی، شادمانی، دڵشادیی، گەشاوەیی

**تَـهَلَّلَ الوجــهُ( تَــلأْلأ ):**بزەگرتـــــی، شاگەشکەبوو، گەشایەوە

**تَـهْليل:** (لا الـه الا اللـه)وتــن، هــاواری خۆشی، بانگەوازی شادمانی

**تُهْمَة:** بوختــان، دەس هەڵبـەس، درۆو دەلەسە

**تَـهَنَّأَ بـه( فَـرِح ):** پێشخــۆشحاڵبوو، دڵخۆشبوو، خێری لێ بینی

**تَهَنَّأَ بالطعام( ساغَ لـه ):** پێـی کـەوت، بەدڵی بوو

**تَهْنِئَة:** پیرۆزبایی ، پیرۆزە کردن

**تَهَنْدَم:** دەستی بـەخۆیدا هێنـا، خـۆی ڕێکخست

**تَهَوَّدَ:** گەڕایەوە ، تەوبەیکرد

**تَهَوَّرَ( إنْهَدم ):** ڕووخا ،داڕووخا،کەوت ، تەپی، هەرەسی هێنا

**تَـهَوَّرَ( إنْدَفَع بـلا مبـالاة ):**هەڵپـەیکرد، هەڵەشەیی‌کرد

**تَهَوُّر( إنْدِفَاع وتَسَرُّع ):**هــــەڵەشــەیی هەڵچوو، پەلەکردن، خۆدانان

**تَـهَوَّسَ:** تێکچــوو، ئــەقڵی ســووکبوو، گەوجبوو، سەرشێتبوو

**تَـهَوَّعَ( تَكَلُّفَ القَئ ):** خۆرِشــاندنەوە، هێڵنجیدا، دڵـی تێکەڵهات ، دڵ بەیـەکا هاتن

**تَهَوَّمَ( نامَ قليـلاً ):** سـەرخەوی شـکاند، چاوی گەرم کرد، کەمێك نوست، سەری گەرمکرد

**تَهْوِيَــة:** بــاگۆڕین ، هــــەواگۆڕکێ، هەڵخستن

**تَـهْوِيد الأطفَــال( تَرنِيــم للأطفــال ):** گورگانە شەوێ ، لای لایە، پشە سورێ

**تَهْوِير:** ڕۆچواندن، تەیف کردن

**تَهْوِيل( إرهَاب ):** مەترسیخستنەوە

**تَهْوِين:** ساناو ئاسانکردن

**تَــهَيَّأَ:** ئــامادەبوو، ســـازاندن، ڕەخساندن ، ڕاپێچان

**تَهْيِئَة( إعْدَاد ):** ئامـادەکردن، تــەیار، پێکهێنان، خستنە بەردەست

**تَهَيَّبَ( أفزَع ):** ترساندی ، تۆقاندی

**تَـهَيَّبَ الرَّجُل أوْ الشَّئَ( خافَـه ):**لێـی تـرسا،سڵی لێکردەوە

**تَـهَيَّجَ (ثَــار):** هــەژی ، یــاخیبوو، هــــەڵچوو،بەلەســــەبوو، وروژا، ئاشوبی‌نایەوە

**تَـهَيُّج( ثَــوران ـ جنــون ):**شــێتی، شێتگیربوون، خرۆشان

**تَهَيَّضَ( إنْكَسر ):** شکایەوە، لەت بوو

**تهييج( إثارة )**: جوولاندن ، ورووژاندن، هەڵسـاندن، ئـارەزوو خرۆشـاندن، هـاندان، هەژاندن

**تو**

**توائم**: گونجانو شیان

**توّاب**: بەخشندە، تەوبە وەرگر

**تواتر( تتابع )**: بەدوای یەکدا هـات، ناوبەناو بوو

**تواثب**: هێرشو هەڵمەت بردنەسەریەك

**تواجد( تظاهر بالحب )**: خۆشەویستی نیشاندا

**تواجه**: رووتێکردن، رووبەرووکردن

**تواجه الرجلان**: یەکتریان بینی،بەرەو روبوونەوە

**تواحي**: پەلەیان لەیەك کرد

**توادّ( تحابا )**:یەکتریان خۆش ویست ، برایەتیانگرت

**توادع**: رێکەوتن ، پێکهاتن

**تـواری**:خـۆی شـاردەوە،خـۆی پەنهانکرد، شاردرایەوە

**توارث**: میرات لێگرتن

**توارثوا الشئ**: لەیەکەوە بۆیان مایەوە

**توارد**: هاتنو گەیشـتن بەدوای یەکدا، لەیەك کاتدا گەیشتن

**توادرت الخواطر**: وەك یەك روانین، دڵ لەدڵ روانی

**تـواردوا**: بـەدوای یـەکدا هـاتن ، رشتەبوونی یەك

**توارك**: پاڵی پێوەدا، پشتی پێبەست

**توازِ( محاذاة )**: تـەریب بـوون، جـووت، بەرامبەر بوون

**تـوازی**: هـاورێکی ، تـەریب بـوون ، بەرامبەر یەکتر بوون

**توازن**: وەك یـەك بـوون، هـاوکێش بوون، لەترازوودا بوون

**توازن( موازنة )**:هـاوکێشی،هاوسەنگی ، جووتە تەرازوو ، یەکسان

**تواشج**: تێکەڵو بەیەکا چوونی لـقو پۆپی درەخت

**تواشق**: دوژمنیـان بەشـیرەکانیان تـوێ توێکرد، دوژمنـەکانیان پارچـە پارچەکرد

**تواصی**: مـۆچیاری یـەکیانکرد، ئامۆژگاری یەکتریان کرد

**تواصف**: پیاهـەڵدان ، وەسـفکردن، باسکردن

**تواصل**: ئاڵو گۆڕ، لەسەر رۆیین

**تواصل**: بەیەك گەیشتن، پەیوەنداریی

**تواصم**: رەخنـەیان لەیـەك گـرت، یەکتریان عەیبدارکرد

**تواضع**: بێفیزبوو، رۆح سووکبوو

**تواضع**: بێفـیزی ، خۆبەکـەم زانـین، خاکیتی ، خۆ بەزل نەگرتن ، دڵزامی

**تواطأ**: لـەگەڵی رێکـەوت، پێکـهات لەگەڵی

**تواطؤ**: رێـك کـەوتن ، بەنـهێنی، پیلانگێران

**تواطس**: هەڵسانی شەپۆلەکانی دەریا

**تواعد**: بـەڵێنیاندا بەیـەك، پـەیماندان بەیەکتری

**تواغم**: بەتوندی جەنگانو شەڕیانکرد

**توافر**: زۆربوو، فرەبوو، لێی مایەوە

**توافق**: رێککـەوتن ، لێك نزیکبوونـەوە، کۆك بوون

**توافه**: هیچو پووچی، پڕوپووچی

**تَوَافِي:** ئەمەکداری،نواندن، دەربڕینی دڵسۆزی
**تَوَّاقٌ:** ئارەزوومەند، عەودالْ، شەیدا
**تَوَاقَحَ:** بێحەیاو بێئابڕوویی کرد
**تَوَاقَصَ:** خۆ بەگەردن کورت نیشاندان
**تَوَاقَعَ:** دژبەیەك وەستان، یەخەو گیرمانەوە
**تَوَاقَفَ:** لەجەنگدا بەڕیزو لەپاڵ یەکدا وەستان
**تَوَاكَفَ:** لایدا، سەری لێشێوا،بەلایەکی دیکەیا کەوت
**تَوَاكُل:** پشت بەخەڵك بەستن
**تَوَاكَلَ:** پشت بەیەك بەستن
**تَوَالَى( تَتَابَعَ ):** بەدوای یەکداهاتن، یەك لەدوای یەك بوون
**تَوَالُد:** سكو زاکردن، زاوزێکردن، لەیەك بوون
**تَوَالَدوا( كَثُروا ):** زۆر بوون ، زاوو زێیانکرد
**تَوَالُس:** چاوبەستکردن لەیەك، زاڵبوون بەسەر یەکدا بەخیانەتوناپاکی
**تَوَالَيت:** سەرپێشاو ، ئاودەست، ئابخانە
**تَوَامَق:** یەکتریان خۆشویست، خۆشەویستی هەڵگرتن بۆ یەك
**تَوَان:** دواکەوتن، ساردی، هێواشی
**تَوَانِي:** کەمتەرخەمیکرد، لەشی ساردبوەوە
**تَوَاهَبَ:** بەخشیان بەیەك ، دایان بەیەکتر
**تَوَاهَقَ:** بەرابەربوون، یەکسان ، تەریب بوون

**تَوَايَل:** دوعای خراپەیان لەیەككرد
**تَوَأَدَ:** شێنەیی کرد، لەسەرخۆبوو
**تَوْأَم:** هاوسك، هاوزێ، دوان بەیەك سك بوون
**تُؤَدَة( تَأَن ):** شێنەیی، لەسەرخۆیی، ئەسپایی
**تَوَّب:** تەوبەی پێکرد، پەشیمانی کردەوە، ژیوانی کردەوە
**تَوْبَه( نَدَامَة ):** تەوبە، پەشیمانی، ژیوانی
**تَوْبِيخ( زَجْر ):** سەرزەنشت کردن، سەرکۆنە ، پێکردن
**تُوت( فرصاد ):** دار توو، توو
**تَوَتُّر( شد ـ مط ):** راکێشان، کرژبوون، توندبوون، ئاڵۆزیی ، پێکدادان
**تَوَتُّر الحَبل:** پەتەکە گرژبوو، جەڕی
**تَوَثَّبَ عليه:** هەڵی کوتایە سەری، هێرشی بردەسەر، بەزۆر لێی داگیرکرد
**تَوَثَّق:** جێگیربوو، پتەوبوو، قایمبوو
**تَوْثِيق:** قایم کردن، مەحکەم کردن، داگیرکردن
**تَوَّجَ:** تاج خرایە سەری، لەسەر تەخت دانیشت
**تَوَجَّد بِه:** زۆری خۆش ویست، مۆگری‌بوو
**تَوَجَّسَ شراً:** هەستی بەخراپەکرد، پێش بینی خراپەی‌کرد پێشەکی زانی خراپ روو ئەدات
**تَوَجَّسَ الصَوْتَ:** بەترسەوە بیستی
**تَوَجَّعَ( تَأَلم ):** ئێشی پێگەیی، ئازاری هەبوو، ئێشی هەبوو
**تَوَجَّه ( ذَهَب ):** رۆیی، رۆیشت ، چوو .

**تَوَجَّه إلَى:** رۆیی بۆ ، چوو بۆ
**تَوْجِيه( تَصْوِيب ):** ئاڕاستەکردن، رابەری ، رووپێ لەشتێك کردن
**تَوْجِيهي:** ڕێ نوێنی، ڕێنشیاندەریی
**تَوَحَّدَ( بقي وحده ):** بەتەنیا مایەوە، هەر خۆی مایەوە
**تَوَحُّد( عُزْلَة ):** تەنیایی، تەنهایی، هەر خۆیی ، تاکی
**تَوَحَّش:** وەك درندەی لێهات، بوو بەکێوی
**تَوَحُّش( قَسَاوَة - هَمَجِيَّة ):** درندەیی، دڵڕەقی ، بێ ویژدانی
**تَوَحَّلَ( تلوث بالوحل ):** قوڕاوی‌بوو، قوڕی بەرکەوت
**تَوَحُّم:** بێزوو ، هەوەس، ئارەزوو، بەوحاڵە دەگوترێت کەئافرەتی دووگیانی تێدەکەوێت بەحەزکردن لەخواردنێك لەماوەی هەڵگرتنی مناڵەکەیدا
**تَوْحِيد:** کردنە یەك، بەتاكو تەنیا زانین، یەك خستن، یەك بوون
**تَوَخَّى( قصد ):** ویستی، نیازی‌بوو، مەبەستی‌بوو، بۆیچوو
**تَوَدَّدَ( طلب مودته ):** ویستی دڵی ڕاگرێ، ویستی برایەتی لەگەڵ ببەستێ
**تَوْدِيع:** ماڵئاوایی، ڕەوانەکردن، ئەسپاردن، سپاردە
**تَوْرَاة:** تەورات ، پەرتوکی پیرۆزی جوولەکەیە کەبۆ موسا پێغەمبەر هاتووە (سەلامی خوای‌لێبێت)
**تَوَرَّدَ( إحْمَر ):** سووربوو، سووربووەوە، سوور هەڵگەڕا

**تَوَرَّطَ:** تووش بوو، پێوەبوو، تێوەی گلا
**تَوَرُّط:** تووش بوون، پێوەبوون، تێوە گلان
**تَوَرُّع:** پارێزگاری، پارێزیی
**تَوَرَّعَ ( تعفف وتجنب عن ):** خۆی پاراست، دوورکەوتەوە، دەستی لێهەڵگرت، تەوبەی‌کرد
**تَوَرَّم( إنْتَفَخ ):** ئاوسا، کیسی‌کرد
**تَوَرُّم( إنتفاخ ):** ئاوسان، ئاوساوی، کێشکردن
**تَوْرِيَة( إخفاء ):** شاردنەوە، توانج ، لێگۆڕین، بەپێچەوانەی ڕاستی نواندن
**تَوْرِيث:** کردنە میراتگر
**تَوْرِيط:** تێوەگلان ، پێوەکردن
**تَوْرِيح:** هەڵاسان ، پەنمان، هەڵپەنماندن
**تَوَزَّرَ( صار وزيراً ):** بوو بەوەزیر، بوو بەشالیار
**تَوَزَّعَ( تفرق ):** بڵاوبووەوە، دابەشبوو، پەرش بوو
**تَوْزِيع( تفريق ):** دابەشکردن، بڵاوکردنەوە
**تَوْزِين:** هەڵسەنگاندن ، سەنگاندن
**تَوَسَّخ:** پیس‌و چڵکنبوو، لەکەداربوو
**تَوَسَّد:** سەری خستەسەر سەرین
**تَوَسَّطَ:** دامانگرتن ، ناوبژیوانی، نێونجیەتی
**تَوَسَّط المَكَان أوْ القَوم:** لەناوەڕاستیانا دانیشت
**تَوَسَّط بين مُتَخَاصِمَين:** ناوبژی‌کردن، کەوتنە بەینەوە، ڕێکخستن ، ئاشت کردنەوەی دوو نەیارو ناکۆك

**تَوَسَّع:** فراوان بوون، گوشادبوون

**تَوَسُّــــل:** پاڕانـــــەوە، تکـــاکردن، دەستەوداوێن بوون

**تَوَسَّلَ إلَيـه:** لێی پاڕایەوە، لالآیەوە، تکای لێکرد، خۆی لێبردە پێش

**تَوَسَّل (إلْتَمَاس):** پاڕانەوە، داواکـردن، تکاکردن، لالآنەوە

**تَوَسَّمَ الشَئ(تفرسه):** تێـبڕوانی ، لێـی وردبوەوە، لێی راما

**تَوْسِيط:** نـاوبژیوانی، کردنە نێوبژیکار

**تَوْسِيع:** گوشادو فراوانکردن، پەرەپێدان رووبەر فراوانکردن

**تَوْسِيم:** نیشانکردن ، دیاریکردن

**تَوَشَّحَ(لبسه):** مل پێچی کردە ملی ، دای بەشانیا

**تَوَشَّخَت:** لقەکان چوون بەناویەکدا، بوو بەچڕە

**تَوَشْوَشوا(تهامسوا):** سرپەسرپیان بوو، چرپە چرپیان بوو

**تَوْشِيَة(تزيين بـالنقوش):** رازاندنـەوە، نەخشاندن

**تَوَصَّبَ(مرض):** نەخۆشکەوت،ناساغبوو

**تَوَصَّلَ:** پێیگەیشت، گەیشتەئەوەی

**تَوْصِيَة(نصــح وَإرْشَــاد):** ئامۆژگـاریی کردن ، رێنمایی، راسپێری ، راسپاردن

**تَوْصِيف:** چاکە وتن ، راناندن، هەڵدان

**تَوْصِيل:** گەیاندن، بەیەکەوە گرێدان

**تَوَضَّأَ(إغتَسَل):** دەستنوێژی گرت

**تَوَضُّؤ:** دەستنوێژ گرتن

**تَوَضَّحَ(إنْجَلَـى):** ئاشـکرابوو، زانـرا، روون بوەوە

**تَوْضِيـــب(تَرتِيــب):** رێکخـــستن، گونجاندن

**تَوْضِيح(تَفسير):** لێکـدانەوە،توێژینەوە روونکـردنەوە، رەوشەنکردنەوە

**تَوْطِئَة(خفض):** نزم، نەوی، راخسـتن، ئامادەکردن

**تَوَطَّدَ(تثبت):** قـایمبوو، جێگـیربوو، پتەوبوو، بەهێزبوو

**تَوَطَّن:** جێنشـین بـوو، جێگـیربوون، نیشتمان گرتن

**تَوْطِين(إسْكَان):** نیشتەجێبوون

**تَوَظَّـف(تَعَيُّــن):** دامـــەزرا، دانــرا، جێگیربوو

**تَوْظِيف(تَعيين):** دامەزراندن، دانان

**تَوَعَى منه:** خۆی لیّ پاراست

**تَوَعُّـد(مـا تـهدد بـه):**هەڕەشـــەو گوڕەشە، ترساندن

**تَوَعَّـدَ (تـهديد):** هەڕەشـــەکردن، ترساندن

**تَوَعَّر:** سەخت بوو، رەق بوو

**تَوَغَّـرَ:** تورەبـوو، رقـی لیّ هەڵسـا، پیشی خواردەوە

**تَوَغَّلَ(دخل فيه):** چوە ناوی

**تَوَغُّل:** رۆچوون، نقوم بوون تێیدا

**تَوَفَّـى(إسْـتَوفى حقـه):**مـافی خـۆی وەرگرت

**تَوَفَّـاهُ الله(مـات):** مـــرد ، عـــەمری خوایکرد، گیانی سپارد

**تَوَفَّـرَ:** خـۆی بـۆ تـــەرخانکرد ، خـۆی رامکرد بۆی

**تَوَفُّر:** زۆربوون، فرەکردن

**تَوَفَّقَ(نجح):** سەرکەوت، زاڵبوو

**تَوْفِير(تكثير):** زۆرکـردن، پـترکردن، پاشە کەوتکردن

**تَوْفِيق( تكييف ):** گونجان، سازندن، پیرۆزیی .

**تَوَقَّحَ( قَلَّ حياؤه ):** بێحەیا ، بێئابڕوو ، چوختی ، چەقاسووبوو

**تَوَقَّدَ( إشْتَعَل ):** داگیرسا ، گڕیگرت، ئاگری گرت، کلّپەی سەند

**تَوَقَّعَ( إنْتَظَره ):** چاوەڕوان بوو، بەتەمابوو

**تَوَقُّع( إنْتِظَار ):** چاوەڕوانبوون، بەتەمابوون، هیوابوون

**تَوَقَّفَ( تمَكَّث ):** وەستا ، راوەستا ، وچانیدا، پشوویدا، هەڵوێست

**تَوْقِيت:** دیاریکردنی کات،دەستنیشانی کات

**تَوْقِيع( إمْضَاء ):** ئیمزا ، شەقل، واژۆ

**تَوْقِيف( حبس ):** بەندکردن، گرتن، دەبست بەسەراگرتن

**تَوَكَّأَ:** پاڵیدایەوە، شانیدایا،خۆی دا بەسەریا

**تَوَكُّؤ:** پاڵدانەوە، شان دادان، خۆی بەسەردادان

**تَوَكَّد( توثيق ):** سەلمێنرا، چەسپی، سەلمی

**تَوَكَّلَ:** بوو بەبریکار، بوو بەوەکیل

**تَوَكُّل:** پشت بەستن، یاوەری

**تَوْكِيد( إثبات ):** سەلماندن، دوپات کردنەوە، دڵنیایی

**تَوْكِيل( تعين الوكيل ):** دانانی بریکار، وەکیل دانان، لەجیّدانان، کار پێ سپاردن

**تَوَلَّى:** گرتنە ئەستۆی کارێك، فەرمانبەرداری

**تَوَلَّى عَنْه:** وازی لیٚهێنا، پشتی لێهەڵکرد

**تَوَلَّى الأَمْر( قام به ):** گرتیە دەستی خۆی، بەجێیهێنا

**تَوَلُّع:** هۆگربوون، ئالوودەیی، سۆزی بەتین، خۆشەویستی، پەرۆشی

**تَوَلُّد:** منداڵبوون، رەگ دانان، نەوە، وەچە، زاوزێ

**تَوَلَّدَ مِن( نتج ):** لێی پێکهات، لەئەنجامو بەرهەمی

**تَوَلَّتْ وِلَادَتَهَا:** مامانیکرد، یارمەتیدا لەمناڵ بونیا

**تَوْلِيَة:** سپاردنی کاروبار بەیەکێك، پێدانی سەرپەرشتی بەیەکێك

**تَوْلِيَة الحُكم:** بوون بەفەرمانڕەوا

**تَوْلِيد:** لیٚپەیداکردن، مامانی

**تَوَهَّجَ( توقد ):** گەشایەوە، هەڵگیرسا ، گڕی گرت ، کلّپەی سەند، بلّێسەی سەند

**تَوَهَّجَ الحَر( إشْتَدَّ ):** گەرمایکرد، تاوی سەند

**تَوَهَّرَه في الكلام:** بەقسە شێوانی، بێدەنگی کرد، دەمکوتیکرد

**تَوَهَّش:** پێخاوس، ، بیٚکەوش

**تَوَهُّم( إشْتِبَاه ):** لیٚتێکچوون، گومان کردن، بەهەڵەدا چوون، سەهوکردن

**تَوَهَّمَ الأَمْرَ( تخيل وجوده ):** بەهەڵەداچوو، وای هات بەبیردا

## تي

**تَيَّار( مجرى ):** تەوژم ، تەزوو، شەپۆل، لووزەو

**تَيَّاس( صاحب التيس ):** بزندار، ئەوەی خاوەن بزنە

**تَيَاسَر:** سانايكرد، ئاسانىكرد
**تَيَاسَر القَوم:** لاى چەپى گرت
**تَيَامَنَ:** لاى راستى گرت
**تَيَّان:** هەنجير فرۆش
**تَيَّاه:** گومرا ، سەرلێشێواو
**تَيَبَّس( جَفاف ):** وشك بوونەوە، رەق هەلاتن
**تَيَتَّمَ( صار يتيماً ):** هەتيوكەوت
**تَيس( ذكر الماعز ):** بزن ، سابرێن
**تَيَسَّرَ( سهل ):** ئاسان بوو، سانابوو، بەئاسانى بۆى هات
**تَيَسَّرَت أُمُوره( تسهلّت ):** كاروبارى ئاسان بوو
**تَيْسِير( تَسْهيل ):** ئاسان كردن
**تَيَفَّعَ:** بوو بەهەرزەكار، پێگەيشت
**تَيْفوئيد:** گرانەتا، كەوتويى، گرانەتىٚ، تيفۆ
**تَيفُوس( الحمى المُحْرِقَة ):** رەشە گرانەتا
**تَيَقُّظ( إنْتِبَاه ):** ئاگا، ئاگادارى، هۆشيارى، وشيارى
**تَيَقَّظَ:** ئاگاداربوو، بەئاگاهات، وريابوەوە
**تَيَقَّنَ( تحققه ):** دەريخست،خستيەروو، ئاشكرايكرد
**تَيل:** تالٚ ، ريشالٚ، تەزووله
**تَيْم( مُسْتَعْبَد ):** بەند، گرفتار، شەيدا، پەرۆش
**تيم( جَمَاعة اللاعبين بالكرة ):** تيپ ، دەستە ، تيم
**تَيمَة:** دەرمالە، دابەستە، پەرداو
**تَيَمَّمَ للصَلاة:** تەيەمومى كرد بۆ نوێژ
**تَيَمَّمَ ( الأمْرتعمَدَهُ ):** بەمەوەس كردى، بەئەنقەست كردى، بەويستى خۆى پێى هەستا
**تَيَمَّنَ( مات ):** مرد، فەوتبوو، تياچوو، گيانى سپارد، روحى تيا نەما
**تين:** هەنجير
**تَيَه( تَوَه ـ أضَلّ ):** ونى كرد، وێلّىكرد
**تيه( كبر ):** لووت بەرزى ، شانازيى، خۆ نواندن ، خۆ دەرخستن



**تَيس** ( سابرێن - بزن )



**تَصْفِيق** (چەپڵەلێدان)



**تَقَنَّعَ** ( دەمامك بەست)



**تَصْوِير** ( وێنەگرتن)



**تَطَوَّقَت الحَيية** ( مارەكە
پەپكەی بەست )



**ثَرْموستان** (گەرما پێو)



**تَمْشِيط** ( قژداهێنان)



**تل الناموسيات**
( پەردەو كوللە)



**تَمْرِين** ( مەشقكردن)

٤

# حرف الثّاء

**ث**

چوارەم پیتی زمانی عەرەبی‌یە

**ثَا ـ ثَأ**

**ثائِبْ**: ئەو بایەی لەسەرەتای باراندا هەڵدەکات

**ثائِرْ**: شۆڕشگێڕ، تووڕە، بەلەسە، هەڵچوو، هەڵگیرسێنەر

**ثائِرَةٌ**: گێرەشێوێنی،ئاژاوەنانەوە، ژاوەژاو، ئاژاوە، ئاشوب نانەوە

**ثابَ( عَاد )**: گەڕایەوە، هاتەوە

**ثابِت( راسِخ ـ مُسْتَقِر )**:جێگیر، وەستاو، ناجوڵێنریٚ، گیر، نەگۆڕ

**ثابِتَة**: زەویو زارێك کەموڵکیەتی نەگوێزرێتەوە

**ثابَرَ( وَاضَب )**: بەردەوام لەسەری ڕۆیی بوو

**ثارَ( هَاج )**: هەڵسا،هەژی،تەقیەوە، یاخی‌بوو، جوولاٚ، وروژا

**ثاغِي**: کەس ، یەکێك

**ثاقِب**: کونکەر، کاریگەر، بڕەڕ

**ثَاقَف**: شەڕەشیری‌کرد، یاری بەشمشێر ئەکا

**ثاقَلَ**: خواردنی قورسی خوارد

**ثاكِل( ثَكلَى )**: کوڕ مردوو ، ڕۆڵە جوانە مەرگ، ئەوەی کوڕی دەمریٚ

**ثالِث**: سیٚ ، سێیەم

**ثالَم(كليل )**: کۆڵ ، دەمەڕێزە

**ثالُوث**:سیانە، سیٚ خشتەکی،سیانەکی

**ثامِرْ**: بەردار ، بەبەرهەم

**ثامِر( لوبياء )**: لۆبیا، ماشەسپی

**ثامَن**: هەشتەم ، هەشتەمین

**ثَاوِي**: گرنگ نییە، لاوەکی، دواناوەندی

**ثانِّي**: دووەم ، دوو

**ثانِي عَشَرَ**: دوانزەیەم ، دوانزەیەمین

**ثانِيَة**: چرکە ، 60/1 ی خولەکێك

**ثانِيَاً**: دوەمین ، سەر لەنویٚ، دیسان ، هەم ، دیسان

**ثاهِث**: کەروو، هەوك ، قورگ، بین ، کەرووی ، قوڕقوڕاگی

**ثاوَرَه**: هێرشی بردەسەر

**ثَأَى**: بریندارکردن، زامدارکردن

**ثَأَب**: باوێشکدان

**ثَأَرَ( إنتِقَام )**: تۆڵە سەندن، تۆڵە کردنەوە

**ثَارِيٌ( إنتِقَامِي )**: تۆڵەسێن، بەرگری کەر

**ثَأيٌ( فَسَاد )**: خراپە ، ناباشی، نالەباریی، ناڕەسەنی

**ثَئِب ـ تَثَاءب**: باوێشکیدا

**ث ب**

**ثَبَات ( إسْتِقرَار )**:جێگیری،قایمی، بەردەوامی، هەمیشەیی، هەردەمی

**ثَبَان( حجر )**: کۆش ، ئامێز

**ثَبَتَ**:قایمی‌کرد،جێگیری‌کرد، چەسپانی

**ثَبَتْ (بُرهان):** بەڵگە ، قەواڵە، سەلماندن، دەستاویژ، رابەر، رێنیشاندەر، بەڵگەو گۆشی

**ثَبَتَهُ:** جێگیریکرد، چەسپاندی ، قایمو مەحکەمیکرد

**ثَبَجَ:** ناوەڕاستو گازەرای هەموو شتێك ، نێوانی پشتو ناوشان

**ثَبَرَ( طرد ):** دەریکرد، هەڵی فڕیواند، دەریپەڕاند، پاڵی پێوەنا

**ثَبَرَهُ( لعنه ):** نەفرەتی لێکرد،دەریکرد، پاڵی پێوەنا

**ثَبَطَهُ:** دوایخست ، کۆسپی بۆ وەبەرهێنا، رێگری لێکرد

**ثَبَنَ الثَوبَ:** دامێنی دانوشتانەوە، دامێنی داگرتەوە

**ثُبُور( هَلاَك ):** وێرانکردن، کاولکاری، خاپوورکردن

**ثَبِيت:** مەردومی دلاوەرو دلێر، جوامێر، باشەکار، مەرد

## ث ج

**ثَجَّ:** لەبەرڕۆیشتنی ئاو

**ثَجَّاج:** لەبەر رۆیشتنێکی بەخوڕو خێرا

**ثَجَمَتْ:** ئاسمان بەخێرایی بارانی لێوە باری

**ثَجُوج:** کانیاوی پڕئاو، سەرچاوەی پڕ ئاو

## ث خ

**ثَخُنَ( غَلُظ ):** خەست بووەوە، چڕبووەوە

**ثَخُنَ( كَثافَة ):** خەستی، پەیتی، توندی

**ثَخِين( غليظ ):** خەست، تیر، پەیت ، توند، چڕ ، بەپێچەوانەی ئەوەی کەشل بێت

## ث د

**ثُداهُ:** تێریکرد، خواردنی دایە

**ثَدْى:** شیری مەمکە دایە، شیری دایە

**ثَدي( نَهد ):** مەمك ، سنگ، مەم ، چیچیلە، چۆرت ، مەمێ، یزی

**ثَدْيَاء( كَبِير الثَدْي ):** مەمك زل ، بەگوان ، گوان زل

**ثَدِيَيات( الحَيْوَانَات اللبُونَة ):** گیانەوەری شیردەر

## ث ر

**ثَرَّ( كَثِيرالكَلاَم ):** زۆربلێ ، چەنەباز ، هەڵەوەڕ ، فرەواچ ، لاترقەوچ، لۆترەوان ، قەرەچەناخ، چەنەهەراش، زۆردوو، بەزۆك ، بلبلە

**ثَرَّ الشَئ( إتَسَع ):** کشا،فراوان بوو،کرایەوە، گوشادبوو، والآبوو

**ثَرَاء( كَثْرَة المَال ):** دەوڵەمەندی، سامانداری، زۆری ماڵو دارایی

**ثَرَى( ندى ):** تەڕی ، شێ، نەرمی

**ثَرَى:** خاك ، خۆڵ

**ثَرَبَ ـ ثَرَّبَ ( لاَمَ ):** سەرزەنشتیکرد، لۆمەیکرد

**ثَرْب:** بەزی ناوسك ، چەوری

**ثَرثَار( كَثِير الكلام ):** زۆر بلێ ،چەنەباز، هەڵەوەڕ، دەمدرێژ، سازندە، سزنگە، درێژدادڕ، دەم هەراش

**ثَرْثَرَ( كَثْرَة الكَلاَم ):** زۆر وتن ، زۆر قسەیکرد، چەنە هەراش، زۆربلێ

**ثَرْثَرَة:** زۆر وتن،زۆر بلێی، هەڵەوەڕیی، چەنەدان، هەرزەگۆیی

**ثَرَدَ( فَتَّهُ في المَرق ):** تێی گوشی، تریتی کرد

**الثَّرد:** نەرمە باران، بارانی هێواش و لەسەرخۆ
**الثَّرَد:** قلّیشی لێو ، لێو قلّیشان
**ثرغل:** مێینەی
**ثُرْغُلَة:** پەرەکانی دەوری گەردنی کەڵەشێر
**ثُرغُول:** گیایەکە
**ثَرِم(كسر سنه):** دانی شکاند
**ثُرمَان:** دارێکی بێگەڵا، داری روت و بێگەڵا
**ثَري(غني):** دەوڵەمەند، ماڵدار،خاوەن سامان
**ثُريَّاء:** چل چرا ، کۆمەڵە هەسارەیەکی تۆکمەو رشتەبەند
**ثَريد(فَتيت):** تریت ، تێکوشراو، تلّیت، تێکوشین ، نانێکە کوشرابێتە شتی شلەوە

ث ع

**ثُعْبَان(حيَّة):** مار، ئەژدیها
**ثَعَبٌ(مسيل المَاء):** ئاوەڕۆ
**ثَعَبُ المَاء(أجْرَاه):** ئاوی هەڵگرت، جۆگەی بەست
**ثَعْلَب(حيَوان):** رێوی
**ثُعْلُبَان:** بۆ نێرو مێی رێوی بەکاردەهێنرێ

ث غ

**ثُغَاء(صَوت الشَاة):**باعە باع ، دەنگی مەڕو بزن
**ثَغَى الخَروف والشَاة:** باعانی، باڕانی
**ثَغَام:** دارێکەگوڵێکی سپی دەردەکات
**ثَغَرَ(فَتح ثغرَة):** کونی تێکرد ، دەلاقەی تێخست
**ثَغْرْ(فَم):** دەم ، پێشی دەمو ددان، زار، دەم، دەو ، دەف
**ثَغرَة(فَتْحَة):** کون ، دەلاقە ، شەبەق ، کەلێن ، دەلاقەیەکی بچووك یان گەورەیە لەشتێکدا

ث ف

**ثَفَافيد:** گەواڵە هەوری سپی لەسەر یەك نیشتوو
**ثَفَال:** کەوڵێکە لەژێر بەردی ئاشا دادەنرێ
**ثُفَال:** بەردی ژێرەوەی دەستاڕ
**ثُفل(راسب):** نیشتوو، تڵپە ، پەگر، نیشتك، هەڵنیشتوو
**ثَفَنَت:** دەستی چرچ و قلّیشا بەهۆی کارکردنەوە

ث ق

**ثَقَاب:** شقارتە، دەنکە شقارتە، زلۆك، شەمچە، لێخرێنە
**ثَقَاف:** ناکۆکی، دژواری، شەڕو ئاژاوە
**ثَقَافٌ:** ژنێکی زیرەك و دانا
**ثَقَافَة(علم وتهذيب):** رۆشنبیری، زیری، زانیاری، روونـاك بیری، رەوشەنبیری
**ثَقَافِي(تهذيبي):** فەرهەنگی، رۆشنبیریەتی
**ثِقَال:** گران ، قورس،سەنگین ، کێشدار، نرخدار، بەبەها ، بەنرخ
**ثَقَبَ(خرق):** کونیکرد، هەڵیکۆڵی، سمی
**ثَقَبٌ(خرق):** کون بوون،تێپەڕین، هەڵکۆڵین، سمین
**ثِقَة:** متمانە ، پشت بەستن

**ثقفَ( صار حاذقاً ):** ژیربوو، وشیاربوو، تێگەیشت
**ثقّفَ( هَذَّب ):** پەروەردەیکرد، پێی گەیاند
**ثقُلَ( صعب ):** قورسبوو، گرانبوو
**ثقُل المَريض:** نەخۆشیەکەی لێگران بوو
**ثقَّلَ:** هەڵی سەنگاند، تاوتوێیکرد
**ثقّلَ:** قورسیکرد، گرانیکرد
**ثِقْل( وزن ):** قورس ، گران، کێش ، سەنگ
**ثقَلْ( مَتاع المُسَافر ):** کەل‌و پەلی رەوتەنی
**ثقَلْ:** قورس ، گران ، سەخت
**ثقْلَة( أمْتعَة ):** کەل‌و پەل ، شت‌و مەك
**ثقيف:** مەردومی چالاك‌و زیرەك
**ثقيل:** گران،قورس، بەکێش، سەنگین، نرخدار، بەبەها
**ثقيل الدَم:** رەزا قورس، عەبووس، رەزا تاڵ ، تووك تاڵ

## ث ك

**ثَكْلى:** جەرگ سووتاو ، جەرگ براو
**ثكنَة( معسكر ):** سپاگا، سەربازگە، بارەگای سەرباز، قشڵە
**ثكُول:** بیابانی فرە نارەحەتی‌و دەردەسەری

## ث ل

**ثَلَّ البِئر( أخرَج ترابها ):** خۆڵی بیرەکەی دەردا، بیرەکەی دەردا
**ثلاثاء:** سێ شەممە
**ثلاّج:** بەفر فرۆش
**ثلاجي:** زۆر سپی، وەك بەفر سپییە
**ثلاجَة:** یەخچاڵ، سەلاجە
**ثلاثَة:** سیان
**ثلاثَة عَشَر:** سیازدە، سیانزە
**ثلاثون:** سی، سیەم
**ثلاثي:** سیانە
**ثلَبَ( طَرد ):** دەریکرد، هەڵی فریواند
**ثلَبَ( سب ):** قسەی پێوتن، تانوت لێدان ، ناو زڕاندن، سووککردن
**ثلبَ الجلد( تقبض ):** کرژبوو، هاتەوە یەك
**ثَلَّة:** رانەمەڕ، کۆمەڵە مەڕ
**ثُلَّة:** کۆمەڵێك ،تاقمێك ، گرۆهێك، چەند کەسێك
**ثلَث ( الولد الثالث ):** منداڵی سێیەم
**ثلث( جزء من ثلاثة أيام ):** سێ رۆژ جارێ ئاودان
**ثلَث الشئ:** سێیەکی برد
**ثَلْج:** بەفر ، سەهۆڵ
**ثلَج( بَرد أو جَهَد ):** بەستی ، ساردی کردەوە، بەستانی
**ثلْج( مُجمَّد ):** بەفراو، بەستوو، زۆرسارد
**ثلجَت ( نزل منها الثلج ):** بەفرباریی
**ثلَل:** وێرانکاری
**ثلَمَ:** کەل بوو، قەراغەکەی شکا، درزی تێبوو، قرنجا، رووشا
**ثلمَ( خلل ):** کەلێن، درز، قڵیش ، قرنجاوی، کەلی ، رووشاوی
**ثلَمَ الصَيت أو السمعَة:** ناوی زڕان ، قسەی شوێن خست
**ثلَم الإناء:** کەلی کرد، لێوارەکەی قرنجاند
**ثلمَ منْ ماله:** لەپارەکەی کەم بووەوە
**ثلمَة:** ناتەواوی ، کەلێن، دەلاقە، دەروازە

**ث م**

**ثُمَّ( حينئذ ):** پاشان، ئەوسا،بەوپىێيە، لەوكاتەوە
**ثَمَّ( هناك ):** ئەوێ
**ثَمار:** بەروبووم ، بەرهەم
**ثَمام:** وردە گيا
**ثَمان( ثَمانيَة ):** هەشت
**ثَمانون:** هەشتا
**ثَمَر:** بەر ، بەرهەم ، دەستكەوت
**ثَمَرَ( طلع ثمره ):** بەريگرت، هاتەبەر
**ثَمْراء:** درەختــی پرمیـوە، زەمینـی بەروبوومدار
**ثَمَرَة( فائدَة ):** سوود، كەلك، قازانج
**ثَمِلَ( شَكَرَ ):** مەست بـوو،كـەيل بـوو، سەرخۆش بوو، سەرگەرم بوو
**ثَمَلَ( سُكر ):** مەسـتی، سەرخۆشـی، كەيل
**ثَمَنَ:** هەشت يەكی برد
**ثُمُنْ:** هەشت يەك 8/1
**ثَمَن( قيمَة ـ سعْر ):** نرخ ، بەها
**ثَمَّنَ الشَّئ( قَدَّرَ قيمَتَه ):**نرخی بۆ دانا، نرخەكەی قەبلاند، نرخاندی
**ثَمِين:** گرانبـەها، نرخـدار، زۆر نايـاب، بەنرخ

**ث ن**

**ثَنَاء( مَدح ):** پياهەڵدان
**ثَنَائِي( مُزدَوَج ):** دوان ، دوانە
**ثَنَايَا:** ناخ، نێو جەرگە، ناوەڕاست
**ثَنَى( طوى ):** چەمايـەوە، نوشـتايەوە، قەدیكرد، پەچیدا
**ثَنَّى العَدد( ضعفه ):**كردی بە بـەدوو ئەوەندە، دووجارەی كرد
**ثَنِيَّات:** جێگر، پلەداری دووەم
**ثَني( عَطف ):** لادان، پێچ كردنـەوە، وەرچەرخان، نوشتانەوە، پەچ دان
**ثَنِيَّة( سـن قَاطعَـة ):** دانـی برنـدە، دانەكانی پێشەوە

**ث و**

**ثَـواب( جَـزَاء ):** خـەلات ، پاداشـت، دەستكەوت، خێر گەيشتن
**ثَوَابِت:** پێكهاتەجێگیرو نەگۆڕەكان
**ثَوَى( أقَام ):** نيشتەجێبوو، تيادانيشت
**ثَوَّبَ:** راوەشانی كراس بۆ بينين
**ثَوْب( رِدَاء ):** كراس، بەرگ
**ثَـوَّة( آثَـاث البَيت ):** كـەلوپەلی نـاو ماڵ
**ثَور( ذكَر البَقَر ):** گا ،كەڵەگا، كەڵ
**ثَـوَرَان( هَيَجَـان ):** هـەژين، بـەرپابوون، تەقينەوە، جمو جووڵو نەسرەوتن
**ثَوْرَة:** شۆڕش ، ياخێتی، ئاشوب
**ثَوري:** شۆڕشگێڕيی، ئاشوب گێڕيی
**ثَوْل( جَمَاعَة النَحل ):** پورە هەنگ
**ثَـوَل( حَمَـق ):** گێـل بــوو، گـەمژەبوو، نەزان بوو
**ثُوم:** سير
**ثُومَة:** يەك سەلك سير
**ثَوِيَ( دُفن ):** نێژرا، بەخاك سپێرا
**ثَوِي( أسِـير ):** ديـل ، ديوەخـان، بـەند، ميوانخانە
**ثَوِيَّة( المَرأة ):** ژن ، ئافرەت

**ث ي**

**ثِيَاب:** جلو بەرگ ، پۆشاك
**ثَيِّـب:** بـوو بـە بێـوەژن بـەمێرد مـردن يان جيابوونەوە
**ثَيِّـب( نَقيـض البِكـر ):** ژن ، ئـەو ئافرەتەی كچ نييە
**ثِيل:** چيمەن ، هەرێز



ثَوْر ( گا )



ثَلّة ( رانه‌مه‌ڕ)



ثوم ( سیر )



ثلاجة ( سه‌لاجه )



ثعلب ( ڕێوی)

ثِيل

( چیمه‌ن -

مه‌رێز)









ثَوْب ( جل‌و به‌رگ )



بقَرَة (مانگا)



ضَأن (مەڕ)



جمل (حوشتر)



فيل (فیل)



خنزير (بەراز)



كنغر (کەنغەر)



سِنجَاب (سمۆرە)



فهد (پڵنگ)

# ٥ حرف الجيم

# ج

ج

پێنجەم پیتی زمانی عەرەبی‌یە

**ج ا ج ا**

**جَاءَ:** هات ، ئامادەبوو،حازربوو، کەوتەڕوو

**جَاءَ( آتَ ):** هاتوو ، یەت ، دێت

**جَائِحَةٌ:** کارەسات،مەینەت، ڕووداو

**جَائِر:** ستەمکار، زۆردار، دیکتاتۆر

**جَائِز:** ڕێدراو، گونجاو، شیاو

**جَائِزَة( مُكَافَأة ):** خەلات، بەخشش

**جَائِش( مُضطَرِب ):** پەشۆکاو، شپرزە

**جَائِشَة:** دڵ، نەفس، دەروون، هەستی نێو ناخ

**جَابَ( شَقَّ ):** دڕی،دای دڕی،هەڵی دڕی

**جَابِر( مُجبِر ):** ئێسك گرەوە

**جَابَل:** چوو بۆ شاخ، ڕوەو چیا ڕۆیی

**جَابَهُ:** ڕوو بەڕوو بوو، بەرانبەری ڕاوەستا

**جَابِي( محَل الظرائب ):** باج گر، باج سێن، پەتەبڕ

**جَابِيَة:** ئەو ئەستێڵ و حەوزانەی کەبۆ ئاودێری وشتر پڕ ئاو دەکرێت

**جَاثَلِيق:** پێشەنگی قەشەکان

**جَاثِم( مُتَلبِد بالأرض ):** هەڵنیشتوو ، لەپەوڕووکەوتوو

**جَاثَ( رَاكَع ):** چەماوەتەوە، نوشتاوەتەوە

**جَاثِي:** بەجۆرێك دانیشتووە لەپاڵیدا کەئەژنۆیان بەیەکەوە نووساوە

**جَاحَ( إستَأصَل وَأهلَكَ ):** لەڕیشە دەری هێنا، لەناوی برد، وێرانی‌کرد، فەوتانی

**جَاحِر:** نمەك بەد، نا حەقی ، ئەوەی ئینکاری ڕاستی دەکات ، دواکەوتوو

**جَاحِظ:** چاو دەرتۆقیو

**جَاحِم:** کەڵە پشکۆ

**جَاحَة:** کارەسات و بەلای هێنا بەسەرا

**جَاجِم:** جاجم ، مەوج

**جَاد:** ڕاست ، بێ‌پێچ و شۆخی

**جَاد( مُجتَهِد ):** هەولدەر، چالاك، تێکۆشەر، دڵکار

**جَادَّة( طَرِيق ):** ڕێ، شەقام، جادە، ڕێڕەو، ڕێگە

**جَادَع:** قسەی ناشیرین و بەدگۆیی

**جَادَل:** مشتومڕی‌کرد، دەمە دەمەیکرد

**جَادِي:** لەبەر ڕۆیشتوو

**جَاذِب:** ڕاکێشەر، کێشەر، ڕاکێش

**جَاذِب:** هێزی موگناتیسی

**جَاذِبِيَة:** هێزی ڕاکێشان، کێشەنی

**جَار( صَاحِب ):** هاوەڵ، دراوسێ ، پەنا، تەك و پشت ، سایە

**جَارَ( ظَلَم ):** ستەمی کرد، چەوساندیەوە

**جَارَى:** پێشبڕکێ‌ی‌کرد، بۆربۆرێنی لەگەڵکرد

**جَارَة:** ژنی پیاو، هاوسەری پیاو
**جَارِح:** درندە،کەڵبەدار، مەترسیدار
**جَارِحــة:** ئەنــــدامی مــرۆڤ، پــەل، هــەستیارەکانی، ئەندامەکانی لاشەی ئاژەڵی درنـدە لەگشت جۆرەکان
**جَارَزَهُ:** جۆرە گـاڵتەیەکی لەگـەلا کـرد وەك جنێوو قسە پێوتن وەهابوو
**جَارِف( طَاعُون ):** تاعون ، رشانەوە
**جَارُود:** ساڵی سەختو گرانـی ، وشـکە ساڵ
**جَارُور( دُرج ):** چەکمەجە، چاو
**جَــارِي( لاَ يَجِــف ):** لــەبەری ئــەڕوا، وشك ناکا
**جَارِيَة( أَمَة ):** کەنیزەك
**جَازَ( مَرَّ فِيه ):** پیاتێپەڕی ، پیا ڕۆیی
**جَــازَ الأَمــر:** کــارێکی گونجـاوو شـیاو، کارێکی لەبار
**جَــازَى( كَافَــأ ):** پاداشـــتی دایـــەوە، خەلاتی‌کرد، بەشیدا، پێی‌دا، دایە
**جَــازِع:** بێئــارام ،پەشــۆکاو،شـڵەژاو، ئۆقرە لەبەر براو
**جَــازَفَ:** بێبـاکی، هــەوڵی نامسـۆگەر، تەقەلای ئەستەم
**جَازَفَــه فِــي البَيــع:** کۆتــرە فرۆشــی ، بێکێشانە فرۆشتن
**جَازِم:** لێواو لێو، پڕ ، لێوان
**جَاس( اِسْتَقْصَى ):** پشکنی، گەڕا
**جَاسِر:** ئازا، دلێر، بەجەرگ ، نەبەرد
**جَاسُوس( رَقِيــب ):**سـیخوڕ، جاسـووس، چاودێر
**جَاسُوسِــيَة:** سـیخوڕی، جاسووســی، چاودێری

**جَاشَ( اِضطَرَب ):** پەشۆکا، هەژی
**جَــاشَ الصــدر:** سـنگی هاتـە جـۆش لەغەم‌و خەفەتدا
**جَاشَ البَحْر:** شـەپۆل‌وهەڵچوونی دەریا
**جَاشَــت العَيــن:** فرمێســك‌و ئـــەشك بەچاودا هـاتنە خوارەوە
**جَاعَ:**برسی‌بوو،گەدەی خاڵی‌و بەتاڵبوو
**جَــاف( تَعَفَّــن ):** بۆگـەنی‌کرد، گـەنی، رزی، لەبەریەك هەڵوەشا
**جَافّ:** وشك ، رەق، سەخت، چکووس
**جَافِي:** وشك‌و دڵرەق،تورە، دەم‌و چاو بەیەکا دراو
**جَــال( طَــاف ):** گـەڕا ، گەشـــتی‌کرد، سەیرانی‌کرد، سووڕایەوە
**جَال الدَّمْع فِي عَيْنِه:** ئەشك‌و فرمێسـك لەچاوەکانی دەرپەڕی
**جَال:** قەدی گۆڕ، دیواری بیر
**جَالَى:** ئاشکرای‌کرد، پێی وت
**جَــالِب( مُحضِــر ):** هێنــەر، ئامادەکــەر، پێکهێنەر
**جَالَــة:** دابــــڕان‌و ئاوارەکــــەوتنی کۆمەڵێك لەنیشتمان‌و ماڵی خۆیان
**جَالِحَة:**وشکە ساڵ،ساڵی قڕوقاتی
**جَالَد( صَارَع ):** زۆرانی گرت
**جَــالَدَهُ:** بەشــیر رووبــەرووی بــوەوە، بەرەنگاری بوو بەشمشێر
**جَــالِس( قَــاعِد ):** دانیشــتوو، ئــەوەی دانیشتووە
**جَالَسَــهُ:** لەگەڵی دانیشت، دانیشـتنی لەگەڵکرد
**جَالِع:** بێشەرم، بێئابڕو،روو هەڵماڵراو
**جَالِيَة:**ئاوارە،نیشتەجێ لەنیشتمانێکی تردا

**جَام(كَأس):** جام ، كاسه، قاپ،زەرك، دەفرى قووڵى چكۆلە لەكانزا، تاس
**جَامِح:** سەرسەخت ، گەردن كەچ، مێشك داخراو
**جَامِد(صَلب):** رەق ، وشك، سەخت، رەبەق
**جَامِعْ(مَسْجِد):** مزگەوت ، شوێنى خواپەرستى و كۆبوونەوەى موسوڵمانان
**جَامِعَة:** دانيشگا، زانكۆ، كۆمەڵە، پەيوەندگە
**جَامَل(عامله بالجَميل):** رووى خۆش بوو لەگەڵى، چاكەى لەگەڵكرد
**جَامِلْ:** رەوگە وشتر
**جَامَلَهُ:** ميهرەبان و نەرم بوو لەگەڵى
**جَامُوس:** گامێش ، گامووش
**جَانّ:** جنۆكە ، خێو
**جَانِي:** تاوانيكرد بەرانبەر ئەو
**جَانِب(جِهَة ـ ناحِيَة):** لا ، تەنيشت
**جَانِبَان:** دوولا ، دوو لاتەنيشت ، جووت لا
**جَانِح:** لا ، تەنيشت ، كەنار
**جَانِحَة:** پەراسووى تەنيشت
**جَانَس(ماثَل):** چوون بەيەك بوون، لەيەك چوون ، وەك يەكيان لێهات
**جَانِف:** بەرق و كينەوە لەكەس وكارى دوور كەوتەوە
**جَانِي(مُقْتَرِف):** تاوانكار، تاوانبار
**جَانِيَة:** ژنى تاوانبار
**جَاه:** شان و شەوكەت ، شكۆمەندى
**جَاهَدَ(حَارَب):** جەنگى، تێكۆشا، تێئالا
**جَاهَرَ(كَاشَف):** خستيەڕوو ،دەريخست، رايگەياند، دياريكرد، ئاشكرايكرد

**جَاهَرَه:** ئاشكرايكرد، دەريخست، خستيەڕوو
**جَاهِز(مُعَد):** ئامادە، حازر، حازر بەدەست
**جَاهِشَة:** كۆمەڵێك لەخەڵكى،تاقمە خەڵكێك
**جَاهِل(ضد عالم):** نەزان، نەفام ، تێنەگەيشتوو
**جَاهِل:** نەزانى ، نەفامى ، جاهيلى
**جَاهِلِيَّة:** نەزانى ، نەخوێندەوارى، نەفاميەت
**جَاوَب(إسْتَجَاب):** چوو بەدەنگيەوە ، رەزامەندى نيشاندا، قايل بوو
**جَاوَبَه:** وەلأمى دايەوە
**جَاوَدَه:** لەبەخشندەييدا شانازيكرد، نازين بەنمەك دان
**جَاوَرَ(أقام قرب مَسْكَنَه):** بوو بە دراوسێيان، دراوسێيەتى
**جَاوَرَ المَسْجِد:** لەمزگەوتدا مايەوە، ئيعتكافى بەست، نەهاتە دەرەوە
**جَاوَزَ(تَخَطَّى):** بەسەريا تێپەڕى، سەريكرد ، تێپەڕيكرد، پەڕاندى
**جَاوَلَهُ:** شوێنىكەوت و لێيدا، زەبرى لێوەشاند، دەستى بۆ برد
**جَأَب:** مالّ پەيداكردن، دەستكەوتنى مالّ
**جَأَرَ(زَئِير):** نەڕاندن ، نەڕە
**جَأَرَ إلى الله(تَضَرَّع):** پاڕايەوە ، لالأيەوە، لاڤە لاڤى كرد
**جَأَش(إضطَرَب):** شێوا، شپرزەبوو، پەشۆكا، شڵقوا
**جَأْش(إضْطِرَاب):** شێوان، شپرزەيى، پەشۆكاوى

**جُؤجُؤ**: سینه ، ناوەڕاست، میانه

**ج ب**

**جَبَّ( قَطَعَ )**: بڕی، دایبڕی، لەیەکی‌کرد
**جُبّ( بِئْر عَمیق )**: بیری قوول،قووڵە بیر
**جَبَأَ المَاءَ في الحَوْض**: ئاوەکە لەحەوزەکەدا کۆ بوەوە
**جَبَى الضَرائِب وَالأَمْوال**: باجی کۆکردەوە، چانی سەند
**جَبَّار( مِنْ صِفات الله تعالى )**: گەورەیی خوا ، مەزنی پەروەردگار
**جُبْر( هَدَر )**: بەفیڕۆ، بەهەوانته
**جَبَّارَة**: جۆرێک لەداری کاش یان سنەوبەره
**جَبَان**: ترسنۆك، تۆقیو
**جَبَّان** : دروسکەر یان فرۆشیاری پەنیر
**جِبَايَة**: باج کۆکردنەوە، پەتەبڕین
**جُبَّة( رداء معروف )**: جبه ، کەوڵ
**جُبْجُبَة**: زەمیلەی چەرم
**جَبَر المَكسُور( أصْلَحَه )**: چاکی‌کردەوە، وەکوخۆی لێکردەوە
**جَبَرَ العَظْم( أصْلَحَه )**: گرتیەوە، خستیەوە شوێن خۆی
**جَبَر الخَاطِر**: ئاشتی‌کردەوە، دڵی‌دایەوە، بەسەریا هات
**جَبَر( إجْبَار- قَهر )**: زۆرداری، زۆرکردن، ناچارکردن
**جَبْرِي( مُخْتَص علم الجَبر )**: جەبر زان
**جَبَرُوت**: هێز ، گەورەیی، توانایی، جەورو ستەم
**جِبْرِيل**: جبرائیل، ناوی فریشتەیەکه
**جَبَزَ( قَطَعَ )**: لەتیکرد ، بڕی
**جَبُزَ الخُبْزُ (يبس )**: نانەکە وشکبوەوە

**جَبْزَة( قِطْعَة )**: لەت ، کەرت
**جِبْس( جُص )**: گەچ ، سپیکار
**جَبُس في مَشْيَته( تَبَخْتَرَ )**: لەرۆیشتندا بەفیزەوە دەڕوات‌و خۆی بادەدا
**جَبَّسَ الحَائِط( طَلاهُ بالجبس )**: گەچکاریکرد، سپیکاری کرد
**جَبَلَ( صاغ )**: دای ڕشت
**جَبَلَ( عَجَنَ )**: شێلای ، گرتیەوە، دایڕشت
**جَبَل( طُور )**: شاخ ، چیا ، کێو، کەژ
**جُبُلَّة**: بەرچاوە، هەمووشتێك
**جَبَلي**: شاخەوان ، کەژەوان، شاخ زان
**جِبِلّي**: سروشتی ، کێویی
**جَبُنَ**: ترسا،تۆقی ،ترسی لێنیشت
**جَبَّنَ** : مەیی ، بوو بەپەنیر
**جُبْن( جُبنَة )**: پەنیر
**جَبَه( فَاجَأ )**: کت‌و پڕی‌کرد، لەپڕبوو
**جَبْهَة( جَبين )**: تەوێڵ ، ناوچەوان
**جَبِيرَة العِظَام**: کەرەستەی ئێسك گرتنەوە
**جَبِيز( الخُبْز اليَابِس )**: نانه ڕەقه
**جَبِيس( وَلَد الدُب )**: بەچکە ورچ ، توولە ،ورچ ، بێوڵه
**جَبِيل**: خوو یا شێوە ناشیرین، ئەرژەنگ
**جَبِين( جَبْهَة )**: ناوچەوان ، تەوێڵ

**ج ث**

**جَثَّ( قَلَعَ )**: هەڵی کەند، لەریشەی هەڵکێشا
**جُثّ( غِلاَف الثَمْرَة )**: توێکڵی خورما یان کوڵلەو هەنگی مردوو
**جَثَأَ**: لەرەگ هەڵی کێشا، لەبن دەری هێنا

**جُثالَة**: گەلای هەڵوەریووی درەخت
**جَثامَة**: خەواڵوو، چاو لەخەو
**جُثَّة( جسم )**: تەن ،لەش ، جەستە
**جَثِيل**: گـەڵەکو زۆر بوونی موو یان گەلای درەخت
**جَثْلَة**: درەختی گەورەو فـرە گـەلاو لقو پۆپ
**جَثْلِيق**: گەورەی قەشـەکان، پێشەنگی گەورە پیاوانی کەنیسە
**جُثـام( کَـابُوس )**: خــەوی نــاخۆش، مێردە زمە، مۆتەکە
**جَثْم( قَبَع )**: هەڵنیشت ، دانیشت
**جُثْمَان**: جەستە ، لاشە ، لەش، تەن
**جُثُوّ( رُكُوع )**: کڕنووش، کڕنووش بردن ، چەمانەوە، بەچۆکدا هاتن چۆك دادان
**جُثْوَة( کَومـة تُـرَاب فـوق القَبر )**:خۆڵی سەر گۆڕ
**جُثُوم**: هەڵنیشتن،دانیشتن ، نیشتنەوە
**جَثِيث**: خورمای تازە پێگەیشتوو
**جَثِيل**: بەیـەکاچوونی گـەلاو لقـەکانی درەخت

**ج ح**

**جُحَـاف**: لێشــاوێك کەهــەموو شـتێك رابماڵێ
**جِحَاف**: کێشانی دۆڵچەی ئاو دەرهێنان بەسەرچاوەکەدا
**جُحَام( وَرَم العَين )**: ئاوساوی چاو
**جُحَال( سم )**: ژەهر ، ژار
**جَحَـدَ( أنكَــر )**: نکوولیکــرد، دانــی پیانەنان، نەچوە ژێری
**جَحْد( إنكَـار )**: دان پیانــەنان،نکـوولی کردن، نەچوونە ژێر
**جَحَرَ( دَخَلَ جُحْرَة )**:چوە کـونەکەیەوە، خۆی کرد بەکونەکەیا
**جُحْر**: کون ، ئەشکەوتی قووڵ
**جَحْـش( ولـد الحِمَـار )**: جاشــەکەر، جاشولکە
**جَحَظَ**: چاوی دەرتۆقی
**جَحَـفَ( جَـرف )**:رایمـاڵی،رایـدا ،بـردی راپێچیدا، فەوتانی
**جَحْفَل( جَيش عَظِيم )**:سوپایەکی مەزن، لەشکرێکی بێ‌شومار
**جَحَـمَ( کَـفَّ )**: وازی هێنــا، دەســتی لێبەردا، لێی هاتە دواوە
**جَحَــم النَّــار( أوقَدَهَــا )**:ئــاگری هەڵگیرساند، ئاگری کردەوە
**جُحْمَة( توقد النَّار )**:کڵپەونـرکەی ئاگر، دەنگی ئاگر کاتێ بڵێسە
**جَحمَـت( إضطَرَمَـت )**: ئــاگرکەوتەوە، ئاگر بەربوەوە
**جَحَـنَ**: رژدبـوو بەرانبــەر بەمناڵــەکانی پێی نەدان
**جَحِــنَ الصَّــبي**:خواردنــی مناڵەکــە خراپبوو بۆیە جەستەی لاوازبوو
**جُحُود( إنْكَار )**: دان پیانەنان، ئینکار
**جَحِيم( کُل نـار شَدِيدَة التَّأجُج )**: ئـاگری کڵپەدار، ئاگری بەتینو بڵێسە ، خۆشە ئاگر ، ئاگری بەتاو
**جَحِيمِي ( جَهَنَّمِي )**:دۆزەخی،جەهەنەمی

**ج خ**

**جَخّ**: گێلی بێ عەقڵ ،بێ ژیریو هۆش
**جَخِيف**: خـۆ بەزلـزان ، سوپای گەورە

**ج د**

**جَدّ**: کۆشش ، هەوڵ ، تەقەلا،هەوڵدان، تێکۆشان

جَدّ( حَظ ):بەخت،شانس، بۆهاتە،چارە
جِدّ: راستی ، پێچەوانەی شۆخی
جُـدّ: مـــەردومی خۆشـــبەخت، لای هەرشتێك ، بیری پڕ لەئاو
جَدّ: باپیر ، باوکی باوك یان دایك
جَـداء( عَطَـاء ): بەخشـش، ســوود، بیابانی وشكو بێئاو
جُداد: هەڵبەســتراو، پێکـەوەگرێدراو، رشتەی دەمی یەك ،زنجیرەی دوا بەدوا
جِدار( حَائط ): دیوار ، تیکار، کۆسەر
جَدارة( أهْلِيَّـة ): لێهاتوویی، توانـایی، توانست، پێزەوابوون
جِـدال( مُجَادَلَـة ):مشـتو مڕ،گفتوگـۆ، وتو وێژ، دەمە تەقێ
جَدَّال: زەمبیلە فرۆش
جَدَالة: زەمین ، خاك ، خۆڵ
جَدْب: وشکەوەبوو، بێپێزی، بێپیتی، قاتی ، گرانی
جَدَبَ المَكَان: وشكوبێگیابوونی زەوی
جَدْبَــاء: ســوێرەلاو ، وشــكو قلێــش قلێشو بێگیاو سەوزایی
جَـدّة: نـەنك ، نەنــە ، دایــە گــەورە ، داپیرە
جِـدَّة( شَـاطِئ النَّـهْر ): رۆخــی رووبـار، گۆی ئاو، کەنار ، لێواری ئاو
جَدَث( قَبر ): گۆڕ ، قەبر
جَدْجَد: خاکی ناهەموارو سەخت
جُدْجُد( صُرار اللیل ): سیسرك ، مێشـە سەگانە
جَـدَح: تێکـەڵبوون ، ئاوێتـە، پێکـەوە شێلان ، لێك ئالآن
جَـدَّدَ: تــازەیکردەوە، نوێیکــردەوە، لەنوکـەوە کردیـەوە، دەسـتی دایـەوە، دووبارەی کردەوە

جَدَدُ( الأرْض المسْتَوِيَة ):تەختـە زەوی ، زەمینی تەختو رێك
جَدَّدَ الشَّبَاب: لاو بوەوە ، گەنج بوەوە
جَـدَرَ ( بَنَـى الجِـدَار ): دیوارەکــەی هەڵچنی
جَدُرَ: دەیهێنا ، لێی هات، شایانی بوو
جُدِرَ( طَلَع فیه الجَدَري ): ئاوڵەی دەردا، تووشی ئاوڵەبوو
جُدْرَانِيَــة: ئەوانــــەی بــــەدیوارا هەڵدەواسرێن
جُدْرَة: شـوێنەواری لێـدانو زامـداری کەلەسەر جەستە بەدەر دەکەوێت
جُدَرِي: ئاوڵـە،خورووێلکـە، خوریکـە ، هاوڵە
جَـدَعَ( قَطَـع ): بـــڕی ، لێــی بــڕی، هەڵیکێشا، لەبنی دەرهێنا
جَدَع: گـەنج ،لاو، تــازە پێگەیشـتوو، مرۆڤ ، کەس ، وریـا
جَدِع: بـەد خۆراکـی، خراپــی ژەمـە خۆراکەکانی یەکێك
جَدْعَة: پاشماوەی ئەندامی بڕاو
جَـدَفَ الطَّـير: بـاڵی شـەکانەوە، باڵــە فڕێیکرد
جَدَّفَ عَلَی الله: کفری کرد، بێبـــڕوایی نوانـد، ناسـپاس گــوزاری دەربـــڕی، پێنەزانینی خستەڕوو
جَدَل( مُجَادَلَة ): مشتو مـڕ ، زۆر بڵـێ، وتو وێژخواز
جَـدَّل الشَّـعْر: هۆنــراوەو شــیعری هۆنیەوە، رێکی خست
جَدَل الحَبْـل( فَتَلَـهُ ): بـایدا، هۆنیـەوە، لوولیکرد
جَدْلَـة( مِدَقَّـة الهَـاون ): دەســکی دەسکەوان

**جَدَلِي( شَدِيد الجِدَال )**: مشتو مڕكەر، زۆر بلێ، وتو وێژخواز
**جَـدَم**: هـەرچیو پـەرچی ، كەجـەرو گوجەر ، هیچو پووچ
**جَدَمَة**: كورتە بنە، قەزەم ، كورتە
**جَدْوَى( فائدة )**: كەڵك ، سوود، قازانج
**جُـدُوب**: خـاكی وشـكو بیٚگیـا، وشـكە خاك
**جَدْوَة( قَطِيع )**: پۆل ، گەلە ، ران
**جَـدْوَل( نَـهْر صَغِير )**: جۆگـە ، چـەم، جۆگەلە، جۆبار
**جَـدْوَل( قَـائِمَـة )**: خشتـــە ، لیســتە، كارنامە
**جَدّي**: دڵكار ، هەواڵدار
**جَدِيَة**: راخەری ژێر زین
**جَدِيد**: نویٚ ، تازە
**جَدِيـر( خَلِيـق بِـه )**: بـەتوانا،لێـهاتوو ، شایان ، گونجاو
**جَدِيل( الحَبْل المَفْتُـول )**: پـەتی بـادراو، لولدراو، پێچ دراو
**جَدِيلَـة( ضَفِـيرَة )**: پـرچ ، پەیكـەر ، قژی درێژ

**ج ذ**

**جَـذّ( قَطَـع )**: بـڕی، شـكانی،لـەتیكرد، قلیشاندی
**جَذَّ فِي سَيرِه**: خێرایكرد، پەلەیكرد
**جَـذّاب**: راكێشـەر، راكێش ، سـەرنج ، راكێش
**جُذَاذ**: شكاو ، لەتبوو، پارچـە پارچـە، لەبەریەك بچڕاو
**جُذَاذَات**: پارچـەی لـەتو شـكاو، وردە پارچەو بەشی لەتبوو
**جُـذَام**: كـەڕیی، هــەڵوەرینی گۆشــتو پارچەكانی لاشە
**جُذَامَـة**: ئــەوەی دەمێنێتــەوە دوای دروێنە
**جَــذَبَ**: رایكێشـــا ، بەكێشـــیكرد، لەخۆی نزیك كردەوە
**جَـذْب( سَحْب )**: راكێشـان، كێشــكردن، بەكێشكردن
**جَذْبَة**: ماوەی دوورو درێژ
**جُذّة**: پارچە ، لەت، بەش ، كەرت
**جَــذَرَ( إِقْتَلَــع )**: هەڵیكــەند، ریشـــە كێشیكرد، هەڵیكێشا
**جَـذْر( أصْـل )**: رەگـو ریشــە، بنەچــە، رەچەڵەك
**جَذْرَة**: لەبن دەرمێنان، هەڵكێشان
**جِذْع ( سَاق الشَجَر )**: قەدی دار
**جَذَاع**: گیانداری بچووك
**جَذَّعَ مِذَع**: بلاوبلاو ، جیاجیـا، پـەرتو بلاو
**جَذَف الطَائِر**: خێرایكرد، فرتەیكرد
**جَذَفَ القَارِب**: سەوڵی لێدا
**جَذَفَــتِ المَــرْأة**: هــــەنگاوەكانی كورتكردەوە، هەنگاوی خاوی نا
**جَذِلَ( فَرِحَ )**: دڵی خۆشكرد،شادی كرد، خـۆشی بەبەرا هێنا
**جَـذِلْ( فَرْحَــان )**: دڵخـۆش، شــادمان، پێخـۆشحاڵ ، رووخۆش
**جَذَلَ( فَرَح )**: خۆشی، شادی، كامەرانی
**جِـذْل الشَجَرَة**: كۆتــەرە،بنەكۆتــەرە، تەتە
**جَـذَم( قَطَـعَ )**: بــڕی،لـەتیكرد، كـردی بەدوو بەشەوە

**جُذِمَ( أصَابَـه دَاء الجُـذَام )**:گولبـوو، تــووشی گولیبوو، گولی گرت
**جَذَمَ**: دەستو پەنجەبراو
**جِذْم**: بنەڕەت ، رەچەڵەك
**جِذْمَـةُ الشَّـجَرَةِ**: كــۆتەرە ، تەتــە بنەكۆتەرە
**جُذْوَةٌ( جَمْرَةٌ )**: پشكۆ ، سكلٚ
**جُذَيْر**: ریشە ، رەگ، رەگـۆلٚ ،دەمـار، چـەند لولەيـەك لەجەسـتەی گيـاندار خوێنی پێدا هاتووچۆ دەكات ، دەمارە باریكــەكان ، ریشـــەو دەمـــاری دارو گژوگیاكان

**جر**

**جَرَّ( سَحَبَ )**: رای كێشا، بەكێشیكرد
**جَرّ( سَحْب )**: راكێشان، بەكێشكردن
**جَرَى**: لەبەری رۆیی، لێی رۆیشت
**جَرَى**: ئاوەكەی كردەوە
**جَرَّاء**: لەمیانەی ، بەهۆی ، لەبەر
**جُرَاب**: كەشتی خاڵی لەشتو مەك
**جِـرَاب**: كـەلانی شمشـێر، كیفـی شـیر، ناوجەرگەی بیر
**جَـرَّاح( طَبِيـب جَـرَّاح )**: برینكـار، بریـن ساز، پزیشكی برینكار
**جِرَاحَــةٌ**: نەشـــتەكاری، برینكــــاری، برینگەری
**جَـرَّاد( جَـلاَّء النُّحَـاس )**:مـس سـپی كەرەوە، مسگەر
**جَرَاد( جَرَارَة )**: كولله
**جَــرَّار**: گــۆزە دروســتكەر، لەشـكری بیٚشومار
**جَرَّارَة( عقرب صَفْرَاء )**: دووپشكی زەرد
**جَرَّارَة( سَاحِبَة )**: راكێشەر

**جَرَّارَة( آلَة الجَر الزراعية )**: تراكتۆر
**جُـرَاز**: شمـــشێری بــڕەر، شمشــێری تیژ
**جُرَاشَـة**: ئـەو موانـەی لــەكاتی قــژ داهێناندا لێدەبێتەوە
**جَرَاض**: غەمبار، غەمگین، خەفەتبار
**جُرَاف**: ئەوەی هەموو شتیٚ رادەماڵیٚ
**جِرَايــة**: وەكالـــەت ، راســـپاردن، پیٚسپاردن، خستنە ئەستۆ
**جَرَايَــة**: ئــەوەی رۆژانـــــە ســــەرباز وەریدەگرێــت ، ئـــــەركو وەزیفـــــەی فەرمانداریی
**جَرُءَ( جَسَرَ )**: وێرای، نەترسا، زاتیكرد
**جَرَأ**: هانیدا،پاڵی پێوەنا،كەلكەڵەیدا ، دنەیدا
**جُـرْأَة( جَسَــارَة )**: وێــران ، نەترســان، ئازایی ، زاتكردن، چاو نەترسی، بوێری
**جَـرِبَ**: گـــەڕبوو، تووشــی نەخۆشــی گەڕی بوو، گەرۆڵبوو
**جَــــرَّبَ( إِخْتَـــبَرَ )**: تــــاقییكردەوە، ئەزموونیدا
**جَرِبٌ( جَرْبَان )**: گەڕ، گول ، گروٚی
**جَـرَبَ( مَـرَض جِلْدِي )**:گـەڕی ، گــولی ، گرگە،گەرۆلٚ ، خورولكە
**جَرَبَ السَّيفَ**: شمشێرەكەی هەڵسوڕاند
**جَرَبَــــاء**: زەوی وشــــك ،زەوی بـــیٚ بەروبووم
**جُرُبَان( غمد السيف )**: كێلان، كالان
**جَرْبُوع**: كۆڕ هەڵكەنە
**جِرْبِيَاء**: باو سەرمای باكوور
**جُرَّة**: دارێكە بۆ راوی ئاسك
**جَرَّة**: یەك جار، تەنیا جووڵەیەك

**جُرثوم:** میکرۆب ، خۆره
**جَرجار:** موشەك ، فیشەکە هەواییی
**جَرجارَة:** ئاش، دەستاڕ
**جَرجَر:** جەنجەڕ
**جِرجِر(فول):** پاقلە
**جَرجیر(نَبات قُرَّة العَین):** کوزەڵـە، گیایەکە لەئاوا دەڕوێ‌و تامی تیژە
**جَرَحَ:** بریندار‌بوو، زامداربوو
**جُـرح(کَلـم):** بریـن ، زام ، براویـی، زەخم
**جَرَّحَ:** برینداریکرد، زامداریکرد
**جَرَدَ ـ جَرَّدَ(نَـزَعَ القشـر):** توێکڵەکەی لێکردەوە
**جَـرد ـ جَـرِد(لا نَبـتَ فیـه):** ڕووت ، ڕووتەن، بێ‌گژوگیا
**جَرَّدَ السَّیفَ(سَلَّهُ):** لەکالان دەریهێنا، شمشێری هەڵکێشا
**جُـرَذ(فَـأر):** مشـك ، جـرج ، جـۆرە مشکێکی بیابانی
**جَرذَة(مکان یُکثر فیه الجرذ):** شـوێنێ کەمشکی زۆربێ
**جَـرَزَهُ:** بـڕی،لـەتیکرد، پارەپـارەیکرد، کوت کوتیکرد
**جَـرُزَ ـ جَـرازَة:** زۆر خـــۆر،وزگ دڕاو، ئـەوەی هیچ لەسەرخوان‌و سفرە بەجێ ناهێڵێ
**جَـرز:** زەمینـی گیـاخوراو یـان وشـك‌و بێ‌گیا
**جَـرَز:** وشـکە سـاڵ، جەسـتە، سـینەی مرۆڤ ، گۆشتی سەر پشتی وشتر
**جَرَزَة:** تیاچوون ، فەوتان، لەناوچوون
**جُرزَة:** دەستەیەك ، چەپکێ
**جَـرَسَ:** دەنگێکـی لێبـوەوە ، دەنگـی لێوە هات
**جَرَس(آلَة تُقرَع للتَّنبیه):** زیل،زەنگ ، زەنگۆڵە ، شوتە
**جَرَسَ بِه(هَتَکَهُ):** ئابڕوی برد،ناوبانگی زڕاند
**جَرس:** ئاواز ، دەنگ
**جُرسَة:** ڕسـوایی،بـەدناویی، نـابوتی، ناقۆڵایی
**جَرَشَ:** کوتای، هاڕی ، گڕەی کرد
**جَـرش(طَحن):** کوتـان ، هـاڕین، پـەل خوردکردن
**جَـرش:** دەنگـی هاتنـە دەرەوەی مـار لەکاژەکەی کاتێ بەریەك دەکەوێت
**جَـرَضَ(خَنَقَ):** خنکـانی، لـەبینی‌گیرا، هەناسەی لەبەر بڕا
**جَرِضَ(اِختَنَقَ):** خنکا ، لەبینی‌گیرا
**جَرَض:** لەبین گیران، لەقوڕگ گیران
**جَرَضَهُ(خَنَقَه):** خنکاندی ،بینی‌گـرت ، هەناسەی لێبڕی
**جَرَعَ(اِبتَلَع ـ شَرِبَ):** خـــواردیـــــەوە ، قـوتیدا، هەڵی لووشی، هەڵی قوڕان
**جُرعَة(شَربَة):** قوم ، مژ ، دەمێك
**جَرعَهُ الماء:** قوم قوم پێی خواردەوە
**جَرَفَ(کَسَحَ):** گسکیدا، ڕایدا، ڕایماڵی
**جُرف ـ جُرُف:** کەند ، لاپاڵ ، کەندەڵان
**جَرف:** ماڵ‌و سامان لەئاژەڵ‌و ئاڵتوون‌و زیو
**جُرم(ذَنب ـ جِنایَة):** گوناه ، تاوان
**جِـرم(جسم):** لـەش ، تـەن، قـاڵب ، جەستە ، ڕەنگ
**جَرَم:** گوناهیکرد، تاوانیکرد

**جَرِمَه( إتِهَمَه بِجُرم ):** تاوانباریكرد، گوناهباریكرد
**جُرمُوز:** لانەی پچووك، حەوز
**جُرمُوق( ما يُلبس فوق الحذاء ):** كالۆش، سەرپێلاو
**جُرن( حَوض ):** حەوز ، جورنە
**جَرَنَ عَلَى الأمر:** راهات، تیاقالبوو، شارەزابوو تێیدا
**جَرَنَ الحَصِيد( كَوَّمَه ):** كۆیكردەوە، كۆمەڵیكرد
**جِرو:** بێچوو، بەچكە، توولە، جاش، جوانو، بێوڵە، بزەڵە،كار،بەرخ، زەرنەقوتە، توتك، جوجكو ساوا، بەرسیلە، تازە پێگەیشتوو ، نۆبەرە
**جِروَة( صَغِير الكَلب والأسَد ):** توولە یا تووتكە سەگ، تێژك ، بەچكەشێر
**جَري( سَرَيان ):** رۆیین ، رۆیشتن، لەبەر رۆیشتن، دەو رەوت
**جِرياض:** غەمو پەژارەی گەورە
**جِرّيث:** مار ماسی
**جَرِيح:** بریندار، زامدار
**جَرِيدَة( صَحِيفَة ):** رۆژنامە، هەواڵنامە، نووسراوێكە رۆژانە هەواڵی ناوخۆی ولاتو دەرەوە بلاو دەكاتەوە
**جَرِيرَة:** گوناهو تاوان، ستەم ، سووچ
**جَرِيس:** كوتراو، هاڕراو، پەل خورد
**جُرَيسَة:** گوڵە زەنگ، گەزیزە
**جَرِيض:** لەبین گیران، قورگ گیران
**جَرِيم:** گوناهكار ،زەبەللاح ، زلە، تاوانبار ، قەبە
**جَرِيمَة( ذَنب ):** گوناه ، تاوان، سووچ
**جَرِين:** خەرمان، كۆگە، شوێنی میوە هەڵخستن بۆ وشككردنەوە، جۆخێن ، شتاغ

**جز**

**جَزّ( قَص ):** بڕینەوە، مەڕبڕینەوە، خوری بڕینەوە
**جَزّ الصَوف( قصه ):** بڕییەوە،هەڵیكێشا
**جَزَى:** پاداشت ، خەلات
**جَزَاء( مُكَافَاة ):** خەلات ، بەشدان، پێدان، پاداشت دانەوە
**جَزّار:** قەساب ، گۆشت فرۆش، سەربڕ
**جَزّاز( قصاص الصوف ):** مەربڕەوە، برینگكار
**جَزاز- جِزاز:** مەڕبڕینەوە، كاتی مەڕ بڕینەوە
**جُزاز- جُزازَة:** ئەوەی دەكەوێتە سەر زەوی لەكاتی بڕیندا
**جِزارَة:** پیشەی قەسابی ، گۆشت فرۆشی وەك پیشە
**جَزّاع:** بێتاقەتی ، ئارام لەبەربڕان
**جُزَاف:** فرۆشتن بەگۆترە، كوێرانە، گۆترەكاری
**جَزّاف:** راوكەر ، شكار
**جُزَافاً( صُدفَة ):** رێكەوت، بەرێكەوت لەخۆیەوە، كوێرانە بێهیچ پرەنسیپێك
**جَزّال:** راباشی ، بۆچوونی باش
**جَزَالَة( وَفرَة ):** زۆریی، فرەیی، مەزنی
**جَزَأ( قَسَم ):** كەرتیكرد، لەتیكرد، دابەشیكرد
**جَزَأ( قَنَعَ ):** قایل بوو، رازیبوو، پێی باشبوو
**جَزء( بَعض ):** بەش، هەندێك، كەمێك
**جُزء:** هەندێك لەشتێك ، كەمێك لە..
**جُزئِي:** بەشی ، نەك هەموو
**جُزئِياً:** كەمێك ، تۆزێك، هەندێك

**جُزئِيَة:** پێچەوانەی گشت ، بەشی

**جِـزَّة:** ئـەو تووکـەی لەمەڕدەڕنێتـەوە لەساڵێکدا

**جِـزْدَان:** جـزدان، جزدانـی، هـەڵگرتنی پارەو پوول

**جَزَرَ:** سەری بڕی ، خوێنی ڕشت

**جَـزَرَ۔ جَـزْراً البَحـر:** ئـاوی دەریـا نیشتەوە

**جَـزَرَ:** سـەربڕینی ئـەو ئاژەڵانـەی حەلاڵکراون

**جَزَرَ( نبات جزرة يُؤكل ):** گێزەر

**جَـزِعَ:** ئـارامی نـەگرت، سـەبری لەدەستدا

**جَـزَعَ:** پـارچەیەکی لێکـردەوە، لێـی دابڕی، لێی جیاکردەوە

**جَـزَعٌ( عـدم الصبر ):** بێئـارامی ، ئـارام لەبەربڕان ، شپرزەیی

**جُزعٌ( محور ):** تەوەرە ، بەش

**جزع( خلية النحل ):** پورەی هەنگ

**جَزْعَة( قليل ):** کەمێك ، تۆزێك

**جَزَفَ:** گۆترە فرۆشی، هەوانتە فرۆشی

**جَـزَلَ:** کـردی بەدووکەرتـەوە، کـردی بەدووبەشەوە

**جَزْلٌ( جَزيل ):** زۆر ، فرە، گەلێك

**جَزْلَة( قطعَة۔ شرحَة ):** پارچە ،کەرت، توێژاڵ ، بەش ، کوت

**جَزَم( قطـع ):** بـڕی، بڕیـەوە، لـەتیکرد، بڕیاریدا ، نیازیکرد

**جَزَم( بَتَّ ):** بڕیار، بڕیاردان ، بڕانەوە

**جَزَم( مَلَأَ ):** پڕیکرد، لێوان لێوی کرد تاسەرقاپی کرد

**جَزْمَـة:** پۆتـین ، جزمـە ، یـەك ژەم لەخواردن شەوبێت یان ڕۆژ

**جَزُوع:** بێئارام، بێسەبریو تێکچوون

**جَـزُوف:** ئـەو دووگیانـەی مـاوەی ئاسایی تێدەپەڕێت

**جُزِيئَة( جُزَئ ):** گەردیلە ، گەرد

**جِزْيَة( أتَـاوَة ):** سەرانە، بـاج، خـەراج ، قوربـانی سـەر ، باجێکـە لـەمو لـەو دەسەنرێ لەجیاتی سەری خۆی

**جَزِيرَة( أرض يُحيط بها المَاء ):** دورگـە، زەوییەك چوارلای بەئاو گیرابێ

**جَزِيل( وَافِر۔ كَثِير ):** زۆر، فرە، گەلێك

**جَزِيل الإحْتِرَام:** ڕێزێکی بێ پایان

## ج س

**جَس( وَطِئَها ):** پێی تێخشت ، چـوە ناو زەویـەکەوە، بەریکەوت،لێیکەوت

**جَس نَبْضَه( إسْتَطْلَعَه ):** دەمو دوانـی تاقی کردەوە، ویستی شتێکی لێ تێبگا

**جَسّ الأخبَـار:** گفتوگۆکـردن سـەبارەت بەدەنگو باس

**جَسَأ( تَصَلَّبَ ):** ڕەقبـوو، تۆکمـەبوو، وشکبوەوە، سەخت بوو

**جُسَاد:** ژانە سك ، ئێشی سك

**جِسَاد:** زافەران، زافران ، زەعفەران

**جَسَّار:** دلێرو ئازا، شێر دڵ، بێپەروا ، بێبیم

**جَسَارَة:** ئازایـەتی، بێبـاکی ،دلـێری، زاتکردن

**جَسَامَة( عَظَمَة ):** گەورەیی، گرنگی

**جَسَدٌ( جسم ):** لەش،تەن،قالب، جەستە

**جَسَدَ( صبغ ):** ڕەنگیکرد بەزافەران

**جَسَـد( الـدم إذا يبـس ):** خوێنـی وشکەوەبوو، وشکە خوێن

**جَسَرَ:** هـەنگاوینا، چـوە پێشـەوە، لێی هاتەبەر

**جَسَرَ المَفَازَة:** گوزەرا ، رابورد
**جَسَرَ الرَّجُل:** پیاوەکە ئازایەتیو دلێری نواند
**جَسَرَ ( شَجُعَ ):** هانیدا ، دنەیدا
**جِسْر( قَنْطَرَة ):** پرد ، رێگە لەسەر ئاو
**جَسَرَ ـ جِسْراً:** پردێکی دروستکرد
**جَسْر:** وشتری گەورە ، پیاوی کەتەولَو زلە
**جَسْرَة:** ئازایەتیو لێهاتوویی، بەتوانایی
**جَسُمَ( عَظُمَ ):** گەورەبوو، زلبوو
**جَسَّمَ( عَظَّمَ ):** گەورەیکرد، زلیکرد، پایانو مەزنیکرد
**جَسَّمَ الأمْرَ:** گەورەیکرد،پێوەی نا، لەئاستی ئاسایی بردیە دەرەوە
**جِسْم( بَدَن ):** تەن ، لەش ،جەستە ، داروبار
**جُسْمَان( جُثْمَان ):** تەن ، لەش، جەستە، شێوە، دیمەن
**جِسْمَانِي:** لاشەیی، جەستەیی
**جَسُور( شُجَاع ):** ئازا ،بەزات، بەتوانا، بەجەرگ، بێپەروا، گوستاخ
**جَسِيد:** خوێنی مەیو، وشکە خوێن، قەتماغە، بەستوو
**جَسِيس:** جاسووس، بەدگۆیی، ئەوەی گوێ هەڵدەخاتو هەواڵ دەگوێزێتەوە
**جَسِيم( عَظِيم ):** گەورە ، زل

**ج ش**

**جَش ( دق وكسر ):** تێکی شکان، هاڕی
**جَشَأ:** قرقێنەی دایەوە
**جَشَأَ مِنَ المَكَان:** لەشوێنەکە چوە دەرەوە
**جُشَاء:** قرقێنە، قرپێنە ، بایەکە لەگەدەوە هەڵدەقوڵێو بەدەنگەوە لەدەم دێتە دەرەوە
**جُشَّة:** دەنگی زبرو رەق
**جَشِع( طَمَّاع ):** چلێس ، نەوسن، چاوچنۆك، چاوبرسی
**جَشِعَ( طَمِعَ ):** چلێسیکرد، نەوسنی، چاوچنۆکی
**جَشَم:** چێژت، سزای چەشت
**جُشَم:**فرمانی قورسو گران، داوای قورس
**جَشَّمَ:** سزا ، تۆڵە، گونجە ، ئاقدین، تۆلاف ، قەرەوی
**جَشِيش:** جۆرە خۆراکێکە

**ج ص**

**جِص ـ جَص( جبس ):** گەچ ، سپیکەر
**جَصَّاص( بائِع الجَص ):** گەچ فرۆش
**جَصَّاصَة( مَعْمَل الجَص ):** کورەی گەچ ، کارگەی گەچ
**جِصَاصَة:** گەچکاریی
**جَصَّصَ:** گەچکاریکرد، سپیکاریکرد
**جَصَّصَ الجَرْوُ:** چاوی پشکوت ، دییەی کرایەوە

**ج ع**

**جَعَّاب:** هەگبە دروستکەر
**جَعَار( ضَبع ):** کەمتیار، هەفتیار ، دەعبایەکی کێوییە یاڵو سمی لەهی کەر دەچێ
**جِعَار:** گوریس ، گوریسێکە لەپشت ئەگیرێ لەکاتی خۆ شۆڕکردنەوەدا
**جَعَال:** دەسگرە ،دەزگرە
**جَعَالَة:** کرێ ، مزە ، رۆژانە
**جَعْبَاء:** پیرە ژن
**جَعْبَة( كِنَانَة ):** تورەکەی تیر،تیرەوان ، هەگبە، خورج

**جِعَّة**: شەرابی جۆ ، بیرە، سەرخۆشکار
**جَعْجَعَ( أصْلَبَ )**: ژاوەژاویکرد، دەنگە دەنگی کرد
**جَعْجَعَ البَعِيرُ**: جوولاّندی بۆ هەستان و دانیشتن
**جَعْجَعَة( صوت الرحى )**:کرەی دەستاڕ، هارەی دەستاڕ
**جَعُدَ( تَغَضَّنَ )**: چرچبوو، کرژبوو، لۆچبوو، ژاکا، هەلّقرچا
**جَعُدَ الجِلد والثوب وغيرهما**: لۆچیکرد، چرچیکرد، ژاکانی
**جَعْد من الشَعر ( مُتَمَوِّج )**:لوول، بادراو ، پێچ پێچ
**جَعَرَ( جَأَرَ )**: نەڕانی، زریکانی
**جَعْر**: پیسایی شێر
**جَعَرَ السَبُعُ( تَغَوَّطَ )**: پیسایی‌کرد
**جَعْفَر**: دەریا ، وشتری پڕ شیر
**جَعَلَ( صَنَعَ )**: دروستی‌کرد، پێکی‌هێنا، بەدی هێنا
**جُعْل( أجْرَة )**: کرێ ، مز ، رۆژانە ، خەلاّت ، بەخشش
**جُعَل( أبُو جَعْرَانَة )**:خلێنکە، گوخلێنکە، گارۆلّك ، قالۆنچە
**جَعِيلَة**: پاداشت ، مز ، خەلاّت

**ج غ**

**جُغْرَافيا( جغرَافية )**:جوگرافیا، زانیاری باسی زەوی‌و بەشەکانی

**ج ف**

**جَفَّ( يَبَس )**: وشك‌و کزر بوەوە
**جُفّ**: پیری کۆنەساڵ
**جَفّ**: کۆمەلّی مەردوم
**جَفَا** :فەرامۆشی‌کرد، گوێی نەدایە، کەمتەرخەمی‌کرد، بێزاریی
**جَفَاء**: لاوولوتی، دلّڕەقی ، سزادان ، بەتەنگەوە نەهاتن
**جَفَاء( غَلاظَة )**: دلّڕەقی ، سزادان
**جُفَاف**: وشکەوەبوونی هەموو شتێك
**جَفَاف**: بێ‌ئاوی ، وشکی
**جُفَال( رَغْوَة )**: کەف ،کەفی شیری وسپی
**جُفَالَة** : کۆمەلّی مرۆڤ، گەلە خەلّکیّ
**جُفَّة** : کۆمەلّە مرۆڤێك ، تاقمێك، دەستەیەك
**جَفْجَفَة**: ورشە، بریسکە ، رووناکی
**جَفْر**: بیری قولّ ، زانیاری هێماو ژمارە
**جُفْرَة**: نیشانەی نهێنی، جفرە
**جَفَّفَ( يَبَّس )**: وشکی کردەوە، هەلّی خست
**جَفَلَ( شَرَد )**: هەلّی‌تیزان، بەلەسەبوو یاخی‌بوو
**جَفَلَ( جُفُول )**: راچەنین ،راچلّەکی، راپەڕین، سلّەمینەوە
**جَفْلَة**: داری فرە گەلاّو لق‌و پۆپ
**جَفْن( غطاء العَين )**: پێلّوی چاو، پەلّك
**جَفْنَة**: مرۆڤی سەخی‌و دلّفراوان، قابلەمەی گەورە
**جَفُول**: بای خێرا کە گەواڵە هەور پالّ پێوە دەنێت
**جَفِيف**: گژوگیای وشك بوەوە، وشککراوە

**ج ل**

**جَلَّ( تَقَدَّم في السن )**: چوە ساڵەوە ، پیربوو،بەتەمەن بوو
**جَلَّ قَدره( عظَمَتهُ )**: گەورەی‌کرد، شکۆداری کرد، ڕێزی لێنا

**جَلَّ الشَيْ( أخَـذَ مُعْظَمَـه )**: بەشـی زۆری برد ، زۆرەکەی برد

**جَلَّ عَنْ الحَصْر**: لەژماردن نایەت

**جِـل**: شـکۆمەند ،خـاوەن پلەوپایـەی بەرزو بڵند

**جُـل( وَرد )**: گوڵـەباخ، داریـك بـەژنێك بڵندتر دەبێ لكو پۆپی زۆرە گوڵەکـەی زەردو سورێکە سـپی دەڕوانـێ گـوڵاوی هەرە باش‌و بۆندار لەو دروستدەکرێ

**جَلا( وُضُوح )**: روون‌و ئاشکـرا،دیار

**جَـلا( صَقَـل )**: تیژیکـرد،لەهەسـانیدا، سـاف‌و لووسی‌کرد، ساویەوە

**جِـلاء( کُحل )**: کـل، سـورمەی چـاو ، چاورێژ

**جُلاب**: گوڵاو

**جَلاّب( تـاجر )**: بازرگان ، هێنەر

**جَلابِيَـة( رِدَاء عريـض )**: کراسـی پـان‌و پۆڕ، دیزداشە

**جَلاجِـل**: زەنگۆڵـە، دێژامـوو ، زەنگـی بچووکە بەملی ئاژەڵانیـەوە دەکـەن تـا مـاری لێ برەوێننـەوەو لـەپێ‌و ملـی منداڵیش دەکرێ

**جَلاَّد**: پێستە فرۆش ، ئەوەی بەقامچی لەخەڵکی ئەدا

**جِلاز**: گرێی سەری قامچی

**جِلاف**: گلّ ، زەوی ، خاك‌و خۆڵ

**جَـلال( سَـنـاء )**: سـەربەرزی، مـەزنی، گەورەیی

**جُـلال( المَنزلـة الرفيعـة )**: پلەوپایـەی بەرز، شکۆمەندی

**جَلالَة**: شکۆ ، مەزنی، پایەداریی

**جُلامَة**: ئەو خورییەی دەبڕێتەوە

**جُلاهِق**: تۆپێکی خر لەقوڕ

**جَلَبَ( أحضَر )**: ئامادەیکرد، هێنای

**جَلْب( إحْضَـار )**: ئـامـادەکردن، هێنـان، هاوردن

**جَلَبْ ـ جَلِيـب**: هێـنراو ، ئامـادەکراو، هاوردراو

**جَلَّبَ القَـوم**: هـاواریان کـرد، دەنگـە دەنگیان نایەوە

**جَلَب( جِنَايَة )**: تاوان ، گوناه ، سووچ

**جُلَب**: تـاریکی شـەو ،گەواڵـە هـەوری بێ باران

**جِلبَاب( ثَوب وَاسِع )**: دیزداشـە، کراسـی پان‌و پۆڕ

**جُلُبَّـان**: روەکێکـــە دەنکێکـی هەیـە وەك دەنکی ماش وایە

**جَلَبَبَ**: لــەبەریکرد، پۆشـی، کردیـە بەری

**جُلبَـة**: توێژاڵـی سـەر بریـن ، زوخـم قەتماغە

**جَلَبَة( غَوغَـاء )**: ژاوەژاو ، دەنگەدەنگ، هەراو هوریا

**جُلَّة ـ جِلَّة ( بَعَـر )**: پشـقل ،پیسـایی، ریـخ ، پەیین ، تەرسە قول

**جَلجَل**: قیژاندی ، هـاواریکرد، نەڕاندی

**جُلجُل( جرس صغير )**: زەنگـۆڵە،زەنگی بچووك

**جُلجُلان( سمسم أو كُزبَـرَة )**: کونجی یا گژنیژە

**جَلِـحَ( سَقَط شَعْرَه )**: سـەری روتایـەوە، قژی سەری هەڵوەری

**جَلحَـاء**: زەوی بێدرەخـت‌و گژوگیـا، مانگاو گای بێ شاخ

**جَلَحَـة**: شـوێنی رووتانـەوەی قـژ لەهەردوولای سەر

**جَلَّخَ الموس عَلَى الحجر**: لەهەسانیدا ، تیژی کرد

**جَلَّخَ على الجلد**: لەقایشیدا، تیژیکرد

**جَلَدَ**: بەقامچی لێدا ، فەلاقەیکرد

**جُلِدَ**: پتەو بوو، بەرگەی گرت، بەئارام بوو

**جَلُدَ**: بەستی ، کرژبوو، مەیی

**جَلَّدَ**: بەستانی، هێنایەوەیەك

**جِلد( غشاء كل جسم )**: پێست ، چەرم، توێکلّ، بەرگ، کاژ

**جَلْد**: بەقامچی لێدان، فەلاقەکردن، جەڵدە لێدان

**جَلَد( صَبر )**: ئارام گرتن ، تاقەت

**جِلْدَة( العَشيرَة وَالأقرباء )**: خزم و خوێش ، کەس وکار

**جَلْدَة( سَوط )**: قامچی، شاڵاتك، چەرمێکی هۆنراوەیە بۆ لێدانی ولاخی سواری و مرۆڤان بەکار دەبری و لەتەلیش دروست دەکرێت

**جِلْدي**: نەخۆشی پێست

**جُلْذ( خُلد )**: مشکه کوێرە

**جَلَزَ( شَدَّ طَرَفَه )**: سەرەکەی گرێدا

**جَلَزَ( ذَهَب مُسْرِعاً )**: بەخێرایی رۆیی، بەجابوکانه بۆیدەرچوو

**جَلَسَ( قَعَدَ )**: دانیشت

**جَلَّسَ( أقْعَدَ )**: داینا، داینیشاند

**جَلْسَة**: دانیشتنێك

**جِلْسَة**: چۆنیەتی دانیشتن

**جُلَسَة( كَثير الجُلوس )**: زۆر دادەنیشێ، نیشتەك، نیشۆك

**جَلَطَ( حَلَفَ وَكَذَب )**: سوێندی خواردو درۆیکرد، بەدرۆ سوێندی خوارد

**جَلَطَ( خَدَش )**: روشاندن و پێست دامالین

**جُلْطَة**: ماستی بزرکاو مەیو ، یان مەینی خوێن

**جُلطَة دَمَوِيَة**: خوێن مەیین، جەڵدە

**جَلَعَ( قليل التربية )**: بێحەیابوو، بێپەروەردەبوو

**جَلَعَ**: دەم کراوە، ئەوەی دەمی جووت نابێت

**جُلَعَة**: ئەوەی ددانی بەئاشکرا دەردەکەوێت کاتی پێکەنین

**جَلَفَ( نَظَف )**: پاکی کردەوە، ساویەوە، شەوقی پێ هەڵهێنا

**جَلَّفَ**: بردی ، تیایبرد ، لەناوی برد

**جِلْف**: گەمژەی مێشك وشك، جەستەی بێ سەر، تێنەگەیشتوو

**جِلفاط - جِلفاظ**: کەسێکە درزی کەشتی چاك بکات

**جُلْفَة**: تاشین، لێکردنەوە، سافکردن

**جَلْفَط**: گرتنی درزو کونی کەشتی

**جَلَق**: بەمەنجەنیق یەکیان ئاگر بارانکرد

**جَلَكي - جُلَكي**: جۆرێك لەمار ماسی

**جَلَّل( غَطى )**: داپۆشی، پەنهانیکرد، شاردیەوە

**جَلَل( عَظيم )**: گەورە ، مەزن، شکۆدار

**جَلَم**: برینگ ، هەورێنگ، چلم ، برینگ

**جَلَمَ الصوف( جَزَّه )**: خوریەکەی بریەوە، خوریەکەی لێکردەوە

**جَلْمَد - جُلْمود( صخر )**: بەرد،زۆر رەق، حەلان

**جُلَّنار**: گوڵە هەنار

**جَلَّهُ**: دەریخست ، خستیە بەرچاو

**جِلْوَاز**: بەردەست ، کاسەلێس، ئیشکەر

**جَلُوبَة**: وشترێکە کەلوپەلی هەڵگرتبێ

**جِلْوَة ( هَدِيَّة الزَوَاج ):** دیاری دوای شەوی پەردە
**جُلُوْدَة:** بەهێزو ئارام ، پتەوو هێمن
**جَلْوَز:** بەهێواشی دەهاتو دەچوو لەبەردەم میرو پاشا
**جَلْوَزَة:** هێواش هێواش هاتن و رۆیشتن ، لەش سووکی لەهاتوو چۆدا
**جُلُوس:** دانیشتن ، نیشتنەوە
**جَلُوط:** ئافرەتی روو هەڵماڵراو،بێحەیاو شەرم
**جَلِي( واضح ):** دیارو ئاشکرا، بەرچاو
**جَلِيّاً ( بوضوح ):** بەئاشکرایی، بەروونی
**جَلِيَة:** ئاشکرا ، دیار ، روون، بەرچاو
**جَلِيَّة الأمْر:** هەواڵی راست،راستە هەواڵ
**جَلِيد:** سەهۆڵ، بەستوو، وریا، ژیر
**جَلِيس( رفيق ):** هاوڕێ، هاودەم ، یاوەر
**جَلِيف:** دڵرەق و بێ بەزەیی، زۆر وشك ، وشكە ساڵ
**جَلِيل( عظيم ):** گەورە ، مەزن، شكۆدار، پایەدار، خاوەن پلەوپایە
**جَلِيدي:** بەستوو، بەستەڵەکی

**ج م**

**جَمَّ:** زۆربوو، فرەبوو ، زیادیکرد
**جَمّ ـ جَمَم:** زۆری، زۆر لە هەر شتێك
**جُمَاح :** یاخی، فیرار، راکردوان لەجەنگ
**جِمَاح( هَوَى ):** ئارەزوو، هەوەس ، خەیاڵ
**جَمَاد:** بێروح و گیان، رەق ، وشك
**جَمَاد( أرض ):** زەوی ، خاك
**جَمَادَى:** چاوی بێ فرمێسك
**جُمَّار:** کرۆك، ناوکرۆکی دار خورما
**جِمَار( جَمَاعَة ):** کۆمەڵ ، تاقم ، گرۆهێك
**جِمَار الحَج:** بەردی رەجم کردن لەحەجدا
**جَمَارَى:** سەراپا،هەمووی، گشتی، سەرجەم
**جَمَّاز:** گاڵتەی پێکرد، پێی رابوارد
**جِمَاع( وَطء ):** پەڕین ، لاقەکردن، پەڕاندن، جووت بوون، یەکگرتن ، کاری شەرعی
**جَمَاعَات:** کۆمەڵ و تاقمی مەردوم
**جَمَاعَة( زُمْرَة ):** کۆمەڵ، کۆڕ،تاقم، برادەران، دەستە
**جَمَاعِي( مُشْتَرَك ):**بەکۆمەڵ، پێکەوەیی، بەگشتی، بەهاوبەشی
**جَمَال( حُسْن ):** جوانی، قەشەنگی، رازاوەیی
**جَمَّال:** وشترەوان ، خاوەن وشتر یان سەرقافڵەچی وشتر
**جَمَالِيَة:** زانیاری جوانناسی، جوانناسی
**جُمَام:** لێوان لێو، زۆر پڕ، لێوان
**جُمَان( لُؤلُؤ ):** مرواری، مەرواری
**جُمَانِي:** سەرقژن ، قژ زۆر
**جُمَّة:** زوربەی ، زۆرینەی
**جَمْجَمَ:** پچڕ پچڕقسەی کرد،ئەیبزرکان، لەبەر خۆیەوە ئەدوا
**جُمْجُمَة( قَحَف ):** کاسەی سەر، کۆچەکەی سەر، کاپۆل
**جَمَحَ الحِصَان:** یاخیبوو، بەلەسەبوو سەرکێشی کرد، هەڵی تیزان

**جَمَحَتِ المَرْأةُ زَوْجَهَا :** تـۆرا ، مێردەکەی بەجێهێشت، وازی لـەماڵو مێردەکـەی هێنا، رۆیی
**جَمَدَ المَاءُ :** بەستی ، بوو بەسەهۆڵ
**جَمَدَ( يَبَس ) :** وشـك بـوەوە، رەقبـوو، رەق هەڵات
**جَمَدٌ :** ئاوی بەستوو
**جَمَّرَ :** کۆبونەوەو یەکیان گرت
**جَمْـر( نـار مُتقـدة ) :** پشکـــۆ ، ســکڵ، ئاگری گەش
**جَمْرَة :** یـەکیەتی ، کۆبونەوەو یەکیەتی
**جُمْرك( دائرَةَ المكوس ) :** گومرگ ، ڕێژی
**جَمَزَ( أسْرَعَ ) :** پەلەیکرد، خێرایکرد
**جَمْـزَة :** گاڵتــەی پێکـرد، ســووکایەتی بەرانبەر نواند
**جَمَعَ( لمَّ ـ ضَمَّ ) :** کـۆی کـردەوە،گـردی کردەوە، گرتیە خۆ
**جَمْـع :** کۆکردنـەوە، خســتنە پاڵیــەك، گرتنەخۆ
**جَمْـع ـ جُمُـوع :** ڕۆژی عـەرەفــە، ڕۆژی قیامەت
**جُمْع( القبضة من الشئ ) :** چنگێـك، پڕ مشت
**جُمُعَة( إسْبُوع ) :** هەفتە ، حەوتەیی
**جَمْعِيَـة( إتحَــاد ) :** کۆمــەڵ ، کۆمەڵــە، کۆرگە
**جَمُـلَ( حَسُـنَت خلقـاً ) :** جـوان بـــوو، قەشەنگ بوو
**جَمَلُ( بَعير ) :** وشتر ، حوشتر
**جَمَّلَ :** جوانیکرد، ئارایشتی دایە
**جُمْلَة( عبـارَة ) :** ڕستە، چـەن وشـەیەك کـەمانا بـدەن بەدەســتەوە یــا مانــا بگەیەنن
**جُمْلَـةُ( الكُـل ) :** ســـەراپا ، هـــەمووی، گشتی ، سەرجەم
**جَمَلُون :** جەمەلۆن
**جَمَّلَـهُ( صـيره جميــلاً ) :** جوانیکـــرد، ڕازاندیەوە، دەستی پیاهێنا
**جَمَّ( كثُر ) :** زۆربوو ، فرە بوو
**جَمَّ( الكثير مـن كـل شئ ) :** زۆری ، زۆر لەهەموو شتێك
**جِمْنَاســتِك :** جومناســـتیك، جــۆرە وەرزشێکە
**جَمْهَرَ( جَمَعَ ) :** کـۆی کـردەوە، کۆمـەڵی بەست
**جُمْـهُور( حشـد ) :** زۆریـــی ، کـــۆمەڵ، خەڵکێکی زۆر، گەلەکەسێ
**جُمْهُوري :** کۆمـاری ، دامو دەســتووری ژیانی مەردوم بەهەڵبژاردنی سەر کۆمار لەجیاتی پادشایەتی
**جُمْهُورية :** کۆمار، حەشامات ، کۆمەڵ ، گەل
**جُمْـهُوريون :** کـۆمار ویســت ، کۆمــار ویستان
**جُمُـود( عــدم حركـــة ) :** بێجوڵــەیی، نەبزێوی، سستی، خاویی
**جُمُودَة( صلابة ) :** ڕەقی، پتەویی
**جَمُوم :** چاڵی پڕ ئاو
**جُمَـيْز :** بەروبومێکـــــە لەبـــەروبومی هەنجیر دەچێت
**جَمِيـع( كُـل ) :** هـەموو، گشـت، سـەراپا، سـەرجەم ، سەرپاك ، دوایەك ، تێکڕا
**جَمِيعَـاً( الكُــل ) :** ســەراپا، ســەرجەم، پـەیاپەی ، دوایەك، سەرانسەر، تێکڕا
**جَمِيـل( حَسَـن ) :** جــوان، ڕازاوە، ڕەزا سووك ، ئێسك سووك

**جن**

**جُنَّ( ذَهَب عقله )**: شێتبوو،هاربوو، کەللەیی‌بوو، عەقڵی لەدەستدا
**جنَّ( ظَلام )**: تاریکایی، بێتروسکی
**جَنَّ عَليه**: تاریکایی داهات بەسەریا
**جِنّ**: جنۆکە، خێو، دێوەڵۆکە، جۆرە گیانداڕێکی نادیارو روونە کەوا نابینرێ
**جِنُّ النَّاس**: زوربەیان
**جَنَّى( حَصَد )**: دوریەوە، کۆیکردەوە، دورینەیکرد
**جَنَائزي**: خوێنەر لەسەر مردوو
**جَنَائي**: تاوانکەر ، گوناهکەر
**جَنَاب( لقب تبجيلي )**: گەورە، پیاو ماقوڵ
**جُنَاب**: هەوکردنی پەردەی سی بەهۆشیەوە مرۆڤ تووشی‌کۆکە دەبێت
**جَنَاب**: ئەسپێکی گوێڕایەڵو خۆش ڕەو
**جُنَاح( إثم )**: تاوان ،گوناه، سووچ
**جَنَاح**: باڵ ، پەل ، لا
**جَنَاز( الصَلاة على الميت )**: نوێژی مردوو
**جَنَازَة**: تابوت ، تەرم
**جِنَاس**: وشەسازی، واتاسازی
**جَنَان**: دڵو روح، رووداوی نهێنیو هەموو شتێك
**جِنَايَة( إقْتراف )**: تاوانکردن، دەستدرێژکردن
**جَنَبَ**: خستیەلاوە، لایدا، کەلای خست
**جَنْب**: لا ، تەنیشت ، کەلەکە، لاقەد
**جُنُبٌ( بَعيد )**: دوور ، چەپەك
**جَنْبَة**: لا ، تەنیشت

**جُنبَة**: ئەوەی خۆتی لێدەپارێزی
**جُنَّة( ستر )**: پەناگە، پارێزگە
**جَنَّة( فِردوس )**: بەهەشت، لانەو شوێنی چاکەکاران لە رۆژی قیامەتدا
**جِنَّة( فَساد العقل )**: عەقڵ تێکچوون، شێتی ، هاری ، کەللەیی
**جَنَح**: هەواداری‌بوو، حەزی پێکرد
**جَنَحَ الطَائر**: لەباڵیدا، باڵی برینداركرد
**جَنَّحَ( جَعَل له جَنَاحَاً )**: باڵی بۆ دروستکرد
**جُنَح( نَاحِيَة )**: لا ، تەنیشت
**جِنْح( جَانِب )**: لا ، تەنیشت، ئەملاو لا
**جِنْحَة**: هەڵە ، سوکە تاوان، تاوانی بچووك
**جُنْحَة**: کەمو کوڕی، جیاوازیی
**جَنَّدَ الجنُود( جَمَعها )**: سەربازی گرت، سەربازی کۆکردەوە، سوپای خڕکردەوە
**جُنْد( عَسْكَر )**: سەرباز، هەر جۆرە هێزێکی بەرگری
**جَنْدَارَة**: پاسەوانی پادشا
**جُنْدُب**: کوولە مسکە
**جَنْدَرَ( الثوب أو القماش )**: سافی‌کرد، لووسی‌کرد، دەقی پێکرت
**جَنْدَرَة( مصقَلَة )**: سافکەر، لوسکەر، دەق پێگر
**جَنْدَل( الصخر العظيم )**: تاشەبەرد ، گابەرد ، تاش
**جُنْدِي**: سەربازێك
**جُنْدِيَّة**: سەربازیی
**جَنَّزَ( صلّى عليه )**: نوێژی‌لەسەرکرد
**جُنِزَ**: خرایە تابوتەوە

**جِنْزِير( سلسلة ):** زنجیر ، زریزە

**جَنَّسَ( أدْخَل في الجنسية ):** رەگەز نوسکرا

**جِنْس( نوع ):** جۆر ، چەشن، شێوە، لف ، وەك

**جِنْسي( نوعي ):** رەگەزپەرست، نەژاد پەرست، توند رەو بۆ رەگەزو نەژادی خۆی

**جِنْسِيَة( قومية ):** رەگەز ، نەتەوە

**جَنَفَ:** ستەم ، لادان، ماف خواردن

**جَنَفَ عليه:** ستەمی لێکرد، کەمێك مافی پێدا ، مافی خوارد

**جُنفيص:** پارچەیەك لەکەتان

**جَنَّقَ الحَجَر:** بەمەنجەنیق بەردە بارانیکرد

**جُنْك:** ئامێری شاییو خۆشی

**جَنَّنَ( صَيَّرَه مجنوناً ):** شێتیکرد، هاری کرد، عەقڵی لەدەستدا

**جَنَّن( القبر۔ الميت۔ الكفن ):** گۆڕ ، مردو ، کفن

**جُنُن:** شێتیو تێکچوونی عەقڵ

**جَنُوب:** باشوور، خواروو

**جَنُوباً:** رووەو باشوور ، بەرەو باشوور

**جُنُون:** شێتی ، هاری ، عەقڵ لەدەستدان

**جَنِيّ:** بەروبوومی دوراوە

**جِنّي۔ جِنِّيَّة:** جنۆکە، خێو

**جَنِيب:** غەریب ، دوور، هەموو گوێڕایەڵێك

**جَنِيبَة:** بەکێشکردنی ئاژەڵ بۆ لای خۆت

**جَنِين:** کۆرپەلە، منالی نێو رەحم

**جـه**

**جِهَاد:** جەنگین، شەڕکردن، کوشتار، بەربەرەکانی، فشارخستنە سەر نەفس

**جَهَاد:** زەوی رەقو بێبەروبووم، رەقە زەوی، سەختە خاك

**جُهَادَى:** مەبەستو مەرام

**جِهَار:** دیار ، ئاشکرا ، بەرچاو

**جَهَارَة:** قەدوبالاّ رێكو جوان

**جِهَاراً( علانية ):** ئاشکرایی، دیارو بەرچاویی

**جِهَاز( آلة ):** ئامراز، ئامێر

**جَهَالَة:** نەزانین،نەفامی، کەودەنی

**جَهَامَة( عبوسة ):** گرژی، مۆنی، رووی گرژو مۆن

**جِهْبَذ:** دانا، لێهاتوو، رەخنەگرێکی بەتوانا کەچاكو خراپ لەیەك جیا بکاتەوە

**جِهَة:** لا ، تەنیشت ، روو ، بار

**جَهَدَ( تَعَبَ ):** ماندوبوو ، خۆی شەکەتو میلاککرد، هەوڵ بەگەڕخستن

**جَهِدَ عَيْشُهُ( صعب واشْتَدّ ):** ژیانی گرانبوو

**جَهْد( مَشَقَّة ):** رەنجدان، هەوڵدان ، کۆششکردن، ناڕەحەتی

**جُهْد( جَدّ ):** درێخینەکردن، هەوڵدان تێکۆشان ، تەقەلاکردن

**جَهْدَان:** ئەوەی ناڕەحەتیو ماندوبوونی بەسەر هاتووە

**جَهَرَ( عَلَن وانْتَشَر ):** بلاوبووەوە، ئاشکرابوو

**جَهَرَ الأمر:** ئاشکرایکرد، دەری بڕی

**جَهَرَ الصوت:** دەنگی بەرزکردەوە

**جَهْرَ الصَوتُ( إِرْتَفَعَ )**:دەنگ بەرزبووەوە، زلبوو

**جَهْر( عَلَن )**: ئاشکرا، دیار، بەرچاو

**جُهْر( هَيئَة )**: دیمەن ، رواڵەت، شێوە ، رووخسار

**جَهَر**: بەشی رۆژگار، ساڵ

**جَهِر**: دەنگی بڵندو بەرز

**جَهَزَ**: هەڵی کوتایە سەریو کوشتی

**جَهَّزَ( أَعَدَّ )**: ئامادەیکرد، حازریکرد

**جَهَّزَهُ**: ئامادەیکرد، پێکی هێنا

**جَهَشَ**: بەهەنسکەوە چوو بۆ لای، بەدەم گریانەوە رۆیی

**جَهْشَة( عَبْرَة )**: هەنسك ، نزگەرەی بەگریانەوە

**جَهَضَ( أَبْعَدَ )**: دووری خستەوە،لای‌برد، فرێیدا

**جَهِضَ**: لەبارچوو، فەوت بوو، نەما ، تیاچوو

**جَهَضَ( إِسْقَاط الحَمْل )**:لەبارچوون، بەرفرێدان، بەراویتە

**جَهِلَ( حَمُق )**: گێل بوو، گەوجبوو، نەیزانی، نادانی

**جَهْل**: نەزانین ، نادانیی، نەفامی

**جَهَمَ( عَبَس )**: گرژبوو، مۆن بوو،خۆی گرژکرد، مۆربووەوە

**جَهِم( عَابِس )**: گرژ، مۆن ، لچ هەڵقورچاو

**جَهْم**: رووی گرژو عەبوس ، دەموچاو تاڵ ، روو گرژ

**جُهْمَة ـ جَهْمَة** :بەشی کۆتایی شەو

**جَهَنَّم( دار العقاب )**: دۆزەخ ، لانەی سزاو تۆڵە

**جَهَنَّمِي( جَحيمِي )**: دۆزەخی

**جَهَنَّمِيَّة( نبات مُتَسلق )**:گوڵەجەهەنەمی

**جَهْوَر**: دلاوەر، دلێر، مەرد ، لێهاتوو

**جَهْوَر الصَوت**: دەنگ زوڵاڵ ، دەنگ زل

**جَهُوري**: دەنگی زۆر گەورە

**جَهُول**: نەزان ، نەدان

**جُهُومَة( عبوسَة )**: گرژی ، مۆنی

**جَهِير**: پیاوی مەزن و شکۆمەند لەچاوی بینەردا

**جَهِير( الجَمِيل )**: جوان، رەوشت بەرز

**جَهِيرَة**: ژنی رەوشت بەرزی داوێن پاك

**جَهِيز ـ مُجَهَز**: مەرگی کتوپڕ، مردنی ناکاو

**جَهِيض**: لەبارچوو، فەوتاو، تیاچوو

## ج و

**جَو( ماحول الأرض من الهَواء )**:بەرگە هەوا، زەوی پۆش، بەرگە با ، حەوا

**جَوَى**: پەرێشانی ، زۆر بۆهاتن، تەنگ پێهەڵچنین

**جَوَائِز**: خەلات ، دیاری ، بەخشش

**جَوَاب( رَدّ )**: وەلام ، وەرام

**جَوَّاب**: موسافیر، گەشتکار، گەرۆك ، گەڕیدە

**جَوَاحِر**:پاشماوەی درندەو کەڵبەدارەکان

**جَوَاد**: بەخشندە، چاوتێر، دەستکراوە، دەست بڵاو

**جِوَار( قُرب )**: دراوسێیەتی ، نزیکی هاوسێیەتی

**جَوَار**: ئاوی لەبەر رۆیشتوو

**جَوارِح( الطيور المفترسة ):** مەلی گۆشت خۆر

**جَواز( سَمَاح ):** لێبوردن ، ڕێپێدان

**جَواز السَّفر:** ڕێنامە، تێپەڕنامەی سەفەر، جەواز

**جَواس:** شێری هێلانە ، هەر پێنج ئەندامەکەی مرۆڤ

**جَوَّال:** جیهانگێر، دەربەدەر، ئاوارە

**جَوالِق:** جەواڵ ، تورەکەیەکە وەك گونیە وایە

**جَوانب:** لا کان ، چەند لایەك

**جَوانح( ضِلع ):** پەراسووی تەنیشت

**جَواني:** هەوایی ، بۆشایی

**جَواهر:** گەوهەر ، خشڵ

**جَوب( رود ):** پشکنین ، گەڕان،گەڕۆکی

**جَوبَة( حُفرَة ):** چاڵ ، قووڵایی

**جَوت( قِنَّب هندي ):** گوش ، پەت

**جُوخ:** چنراوی خوریو پەشم، چۆخە

**جُوخَة:** پارچەیەکی چنراو لەخوری

**جَوَّد( حَسَّن ):** چاکیکرد، باشیکرد

**جُود( كَرَم ):** بەخشندەیی، دەست بلاوی

**جَوْد( المَطر الغَزير ):** رەهێڵە، بارانی بەخوڕ، شەست ، لێزمە

**جَوْدَة:** باشی ، چاکی، نایابی

**جَور:** ستەمکار، بیدادیی

**جَورَب:** گۆرەوی، گۆرەوی ، گۆریە، داپۆشەری قاچی مەردومان

**جَوز( سمع ):** ڕێی‌دا ، هێشتی، ماوەیدا

**جَوز( شَجَر وَخَشَب وَثَمَر ):**گوێز ، دارگوێز

**جَوز هندي:** گوێزی هندی

**جَوز الشئ:** ناوەڕاستی یان زوریەی

**جَوزاء:** مەڕێك رەش بێتو ناوچەوانی سپی بێت

**جَوزَة:** یەك جام ئاو ،یەك جار ئاو، هەسارەیەکە لەئاسمان

**جَوزَة القُطن:** قۆزاخە، کەلووی پەمۆ، گاڵ، گۆزك ، کەلوو تۆرەو تێکۆڵی پەمۆیە

**جَوزَل( فَرخ الحَمَام ):** زەڕنەقوتەی کۆتر، بێچوی کۆتر

**جَوس:** پشکنین ، گەڕان

**جَوسَق:** کۆشك ، تەلار ، ئەپارتما

**جَوش:** سینە ، ناوەڕاست، میانە

**جَوشَن:** قەڵغان ، بەرگە، سنگ، سوپەر

**جَوَّعَ( أجَاع ):** برسیکرد،گەدەی خاڵیکرد

**جُوع:** برسیەتی، خورێن

**جَوعَان( جَائع ):** برسی ، بێنان

**جَوِفَ:** بۆش بوو، هەڵۆڵ بوو

**جَوَّفَ:** بۆشیکرد، هەڵۆڵیکرد، مەڵی کۆڵی

**جَوف:** ناو ، بۆشایی، خاڵیەتی

**جَوفاء:** درەختێ کە ناوەڕۆکی بۆشو خوراوبێ

**جَوفي:** لا خاڵی ، ناو بۆش

**جَوق - جَوقَة:** کۆمەڵە خەڵکێك

**جَوَّل( جال فيها ):** پیاگەڕا،تیایا گەڕا ، گەشتی تیاکرد

**جَول - جَولان( تطواف ):** گەڕان ، گەشتکردن، هاتو چۆکردن ، گەشت

**جُول:** گەردو تەپو تۆزی خاك ، گۆڕ یان بیر

**جَوْلاَن ـ جُولان** : ئــەو تەپو تــۆزەی بەدەم رەشەباوە دێت

**جَوْلَة( سفْرَة )**: گەشت ، سەیران‌و سەفا

**جَوْمَك**: موچــەی پیــاوانی دەوڵـــەت لــەسەربازو فەرمانبەرانی ئەو نێوەندە

**جَوْن**: رەش ، سیاه، گـژوگیایەك کــە سەوزاییەکەی گۆڕابێ‌و رەش بووبێت

**جَوْنَة** : رۆژ لەکاتی ئاوابوونیدا

**جُوني**: جۆرێکە لە پشیلـە کەژێر سکی رەشە لەگەڵ سەردەستەکانی

**جَوَّه**: گەورە پلەو پایەدار

**جَوْهَر( خُلاَصَة ـ لُب )**: کرۆك ، ناوەڕۆك، پوخت، مایە، گەوهەر

**جَوْهَرِي( رئيسي )**: سەرەکی، بنەڕەتی

**جَوِي**: هەوایی، بەهەوادا، ئاسمانی

**جَوِيَ( إكْتَوَى بالحُبِّ والحَزَن )**: پەرێشان بوو، زەبونکەوت، داخ کرا

**ج ي**

**جِيَار**: کارگەچی

**جِيَارَة**: کورەی قسڵ

**جِيئَة**: هــات ،ئامــادەبوو، حــازربوو، هاتەڕوو

**جَيَّبَ**:گیرفانی بۆ کراسەکەی دروستکرد

**جَيب**: گیرفان ، باخەڵ

**جَيد**: باش ، چاك ، خاس

**جِيدْ( عُنق )**: مل ، گەردن ، ئەستۆ

**جِيدَاء**: ژنی گەردن بڵندو جوان

**جَيَّر**: گـەچکاری کـرد، سپیکاری‌کرد

**جِيرْ**: گەچ ، قسڵ، تەباشیر

**جِيرَة**: نـزیکی ، قەرە ، یەك قوم ئــاو ، کۆڕ

**جَيَّش**: لەشکری کۆکـردەوە، لەشـکری ئامادەکرد

**جَيْش**: لەشکر ، سوپا ، سپا

**جَيْشَة**: یەك جار جۆش خواردن

**جَيَّفَ( تَعَفَّن )**: بۆگـەنی‌کرد، گـەنی، رزی

**جِيفَة( جُثّـة )**: لاشـەی بـۆ گـەن، لاکـی بۆنکردو، لاك ، رمە

**جِيل**: هاوتەمـەن ، بـەرە ، هاوچــەرخ، هـاوژین ، نـەوە ، رۆژگـار ، سـەردەم ، رەچەڵەك‌و هۆزو تیرە

**جِيلاتين( هلام )**: وکۆڵە ، جەلاتین

**جِيم**: پێنجـەم پیتی زمانی عەرەبییە

**جِيُولُوجيا** : زانیــاری زەمــین ناســی، زانیاری ناسینی چینەکانی زەوی

**جِيُولُوجِي**: زەمــین نــاس، شــارەزا لەزانیاری زەمیندا ، زەوی ناس



جَرَّارَة ( تراكتۆر )



جَارور ـ دُرْج ( چەکمەجە )



جَذَفَ الطَّيرِ ( باڵی شەکانەوە )



جَزَر ( گێزەر )



جِسْر ( پرد )



جَزْمَة ( پۆتین ـ جزمە )



جُرَذ ( مشك )



جَرَس( زەنگۆڵە )



دُب ( ورچ )



أسَد ( شێر)



نمِر ( پڵنگ)



تِمسَاح ( تیمساح )



حَرِش ( کەرکەدەن)



نَسْر ( باز)



ذِئب ( گورگ)

# ٦ حرف الحَاء

# ح

**ح**

شەشەم پیتی زمانی عەرەبی‌یە

**حا**

**حَائِر**: سەرسام ، راماو، دوو دڵ ، رارا

**حَائِط**: دیوار ، وارش

**حَائِف( ظَالِم )**: زۆردار ، ستەمکار

**حَائِك( نَسَّاج )**: جۆلاً،کۆرسکە، کەسێکە کەبەدەست شت بتەنێ لەپێچالأندا

**حَائِل**: بێبار، سپڵە، رەنگ گۆڕاو

**حَائِم**: تینوو ، تەژنە، تاوونی

**حَائِن**: گـەمژە ، گێـل ، سـاویلکە ، نەزان ، کەودەن

**حَائِنَـة**: بـەلاً ، ئافـات ، گرفـت، دەردەسەری ، مەینەت

**حَابَ( أَثِم ـ أَذْنَبَ )**: گوناهو تاوانی‌کرد

**حَابَى**: لایەنگیری‌کرد، پشتگیری نواند بۆی

**حَابَسَ**: زیندانی‌کرد، بەندی‌کرد، گرتی

**حَابِل**: راوکەرێك تۆڕی نابێتەوە

**حَابُول**: پەتێکـە بەهۆیەوە هـەڵدەزنرێ بەقەدی دارخورمادا

**حَاتَ( حَام حَوْلَه )**: دەورو خولیدا

**حَاتِمْ**: دادوەر، رەش ، قەلە رەشە

**حَاتَّهُ( راوَغَه وَخَادَعَه )**: دەورو خولیداو مەڵی خەڵەتان ، دەستی بڕی

**حَاجَ( إفْتَقَـر )**: هـەژار کەوت نـەدارو دەست کورت بوو

**حَاجَّ**: بەڵگەی هێنایەوە، دەمە دەمەی بەرپاکرد

**حَاجْ**: جۆرە روەکێکە

**حَـاجَى**: بـەپێچو پـەنا قسـەیکرد، قسەکانی تەماوی بوو

**حَاجِب**: پەنا ، پەردەوا، برۆ ، برژانگ ، موژکان

**حَاجِيَة**: چاویلکەی بەرخۆر

**حَاجَـة**: ویسـتن ، ئـەوەی پێویسـتە، خواست

**حَاجِز**: کۆسپ ، تەگەرە ،بارو، راخەر، بەربەستکار، دەست بەسەراگەر

**حَاجِزَة**: رێگری هەورە بروسکە

**حَاجِمْ( حَجَّام )**: خوێنگر، کەڵەشاخ گر

**حَادّ**: تیژ ، بڕندە، توند، چاپوك

**حَادَ عَنْهُ**: لایدا ، لێی لادا، ترازا لێی‌ی

**حَادَى**: وشتر لێخوڕین بەگۆرانیەوە

**حَادَت أرْضـه أرْضِـي**: زەوی ئـەو لـەپاڵ زەوییەکەی مندایە

**حَـادَثَ( جَلَـى )**: دەمـەزەری‌کرد، لەمەسانیدا ، تیژی‌کرد

**حَادِثَة( وَاقِعَة ـ كَارِثَة )**: بەلاً،کارەسات، چورتم ، ئافات ، دەردەسەری

**حَـادِر( سَـمِين )**: قـەڵەو ، تێکسـمڕاو، گۆشتن ، بەخۆوە

**حَادُور**: بەرچاوە ، دیار ، ئاشکرا

**حَاذ:** لێی خوڕی بەخێرایی، پاراستی
**حَاذی:** بەرامبەر یەك بوون، هاوتابوون
**حَــاذَر:** ئاگـاداریکرد، بێداریکــرد، وریایکرد، زرنگیکردەوە
**حَــاذر:** ئامـادە ، ســازندە ، بێـدار، لەسەربار ، هوشیار
**حَـاذِق:** زیــرەك ، لـێزان ، شـارەزا ، بەسەلیقە ، وریا، کارامە
**حَاذُورَة:** وریاو بێدار، ئاگاداریی وریا
**حَارَ:** شپرزەبوو، شلەژا ، تیاما
**حَارٍ:** توندوتیژ ، کاری دژوار
**حَـارَب:** جـەنگا ، چـوو بـەگژیا ، دژی وەستا
**حَارَة:** گـەڕەك ، خانە، کوچەك ، مالآن
**حَارِث:** جوتیار،چێنەر،ئەوەی کشتوکاڵ دەکات
**حَارِد:** توندو تورە ، بەد خویی
**حَارِز:** پارێزگاریی‌و پەنادان
**حَـارِس (خَفِير):** پاســەوان، پاســاوڵ، دیدەوان
**حَارَفَ:** وەك ئەویکرد، هاوشانیبوو
**حَارَفَ الرَّجُل:** پاداشتی دایەوە بەچاکە یان خراپە
**حَـارِق مُتَعَمـِـد:** ئـاگر هەلگرسـێن ، ئاژاوە گێڕ
**حَارِك:** سەرووی ناوشان
**حَازَّ (سَاق):** لێی خوڕی
**حَازَّت الحَيَّة (تَلَوَّت):** پەیکەی خـوارد، گرمۆڵە بوو
**حَــازَب (صَــار مِــنْ حِزْبِــه):** چـوە پارتەکەیەوە
**حَازِب:** کاری سەخت‌و دژوار

**حَازَّة:** دڵسۆزی ، ئەمەکداری
**حَازَز:** رووگرژو مۆن ، ئاردی جۆ
**حَـازِم (حَصِيـف الـرَّأي):** یــەك بـاوەڕ، دووربین
**حَازِي (الذي يتكَهَن):** پێش بین ، ئەوەی رووداوەکان هەست پێدەکات
**حَـاسَ:** گــورگ کەوتنــە نێـو مــەڕو پەرتەوازە کردنیان
**حَاسَبَ:** لێی پرسیەوە ، هێنایە ژێــر پرسیار
**حَاسِب:** ژمێرەزان، زانا بەژمێریاری
**حَاسَبَه:** حسابی لەگەلآکرد
**حَاسَّة:** دانایی ، ژیری، توانایی،پێزانین
**حَاسِد:** رژد ، بەغیل ، ئـەوەی ئێرەیی دەبات بەیـەکێك لەسـەر نـازو نیعمـەتی خوایی، چاوچنۆك ، رەشکن
**حَاسِر:** سەر رووت ، قۆتی ، قۆتین
**حَاسِم (بَات):** کـۆتایی پـێ هێـن، یـەك لایی کەر، دوایی هێنەر
**حَاسَن:** رەفتـاری چـاکیکرد، بەباشـی هەلسووکەتیکرد
**حَاسِن:** جـوان ، قەشـەنگ ، ســەرنج راکێش
**حَـــاشَ (جَمَـــع):** کۆیکـــردەوە، پاشەکەوتیکرد
**حَاشَا (سِوَى):** بێجگە، بەبێ ، جگە
**حَاشَى (إستَثْنَى):** پـــەڕانی، بـــواردی، جیای کردەوە
**حَاشِد:** ئامادە ،ساز ، مۆڵ بەستوو
**حَاشِم:** تورەبوو، رق‌و قین گرتی
**حَاشِيَة:** پەراوێز ، کەنار ، لێوار، زێوار، تۆبە

**حَاصَ**: كۆكیكرد، بەتەقەڵی درشت دوورییەوە

**حَاصَ**: بەش بەشیانكرد، دابەشیانكرد

**حَاصِبٌ**: بایەكی توند وردە زیخی هەڵگرتبێ

**حَاصَّةٌ**: نەخۆشییەكە قژە سەر دەروتێنێتەوە

**حَاصِدٌ( جَانٍ )**: ئەوانەی بەروبووم لێدەكەنەوەو كۆیدەكەنەوە

**حَاصَرَ**: گەمارۆیدا ، تەوقیدا، دەوری گرت، تەنگی پێ هەڵچنی

**حَاصِلٌ( نَتِيجَةٌ )**: ئەنجام، دەرئەنجام، سەرئەنجام

**حَاصِنٌ**: ژنانی داوێن پاكو رەوشت بەرز

**حَاضَ**: پەنگی خواردەوە، كۆبووەوە، مۆڵ بوو

**حَاضَرَ( غَالَبَ )**: پێشكەوتنی كرد، پێش بڕكێیكرد، بۆربۆڕێنی كرد

**حَاضِرٌ**: لەوێیە ، هەیە ، ئامادەیە، شارنشین ، هەرئێستە

**حَاضِرَةٌ( حَضَرٌ )**: شارنشین

**حَاضَرَهُ**: رایكرد لەگەڵی، سەركەوت بەسەریا ، وەڵامی پرسیارەكانی دایەوە

**حَاضِنَةٌ**: دایەن ، پەروەرشیاری منالان

**حَاطَ**: پاراستی ، بایەخی پێدا

**حَاطِمَةٌ**: كەشتی سەهۆڵ شكێن

**حَاطُومٌ**: دەرمانێكە هەرس كردن ئاسان دەكات

**حَافَّ**: خستیە سەر كەنار

**حَافٌّ**: نان بەوشكی، نان بەپێخۆر

**حَافَةٌ**: كەنار، لێوار، گوێ ، ڕۆخ

**حَافِدٌ**: خزمەتكار ، شوێنكەوتوو، پێشخزمەت

**حَافِرٌ**: زەوی هەڵكەن

**حَافِرُ الدَّابَّةِ( قَدَمُهَا )**: سم، پاقووڵاخ، شتێكی رەش و رەقە بەژێر چوارپەلی ئاژەڵ و ولاخی بەرزەوەیە وەكو نینۆكی مرۆڤ

**حَافِرَةٌ**: زەوی هەڵكەنراو، چاڵ، قوڵە زەوی

**حَافِزٌ( تَشْجِيعٌ )**: هاندان، بەخشیش هاندەر

**حَافِشَةٌ**: ناوەڕۆ ، جۆگە، جەمۆك، هێڵێكی گەورە یا بچووكی قووڵەكەئاوی پێدا دەڕوات بۆ سەر كشتوكاڵ

**حَافِظٌ( وَاقٍ )**: پارێزەر، بەرگریكار

**حَافَظَ عَلَى الأَمْرِ**: بەردەوام بوو، لەسەری ڕۆیی

**حَافِظَةٌ( ذَاكِرَةٌ )**: بیر، یاد، بیرەوەری

**حَافِلٌ( كَثِيرٌ )**: زۆر ، فرە

**حَافِلَةٌ**: فار گۆن ،بازاڕی قەرەباڵغ

**حَافِي**: پێخاوس ، پێپەتی ،بێپێڵاوو كاڵا

**حَاقَ( أَحَاطَ )**: ئابڵۆقەیدا، دەوریدا، دەوری گرت

**حَاقَ بِهِمُ العَذَابُ**: سزاو ئەشكەنجە دەوری گرتن، سزاو ئەشكەنجە لێی دان

**حَاقَّةٌ**: ناوێكی ڕۆژی قیامەتە، هاتەخوار، دابەزی،ڕۆژیزیندوو بوونەوە

**حَاقِدٌ**: رقاوی ، قیناوی، كیناوی، دڵ پیس ، ئەرناف ، ئەرنو

**حَاقِلٌ**: بەسەوزی كڕی

**حَاقِنٌ**: ئەوەی میزی پەنگ دەخوات لەمیزەلانیدا

**حَاقِنَة:** گەدە، هارەر، هەڵشێلەر
**حَاكَ:** چنی، رستی
**حَاكَ- حيكَاً:** بەفیزەوە رۆیی بەسەر زەویدا
**حَاكَ القَول:** کاریگەری گەرمی لێکرد
**حَاكَى:** هاوشێوەی بوو، وەك ئەو بوو، لێکی چوو
**حَاكَم:** دادگەریی‌کرد، حوکمی‌کرد، سەرگەورە
**حَاكِمْ( وال ):** میر، فەرمانڕەوا
**حَاكُورَة:** پارچە زەوییەکە تایبەت دەکرێت لەنزیك ماڵان بۆ ناشتنی دارو درەخت
**حَاكِ( نَاقِل الخَبَر ):** گەیەنەر،راگەیەنەر
**حَالَ:** بار، دۆخ، باودان، چاوایی
**حَالَ( تَغَيَّر ):** گۆڕا، تێکچوو
**حَالَ إلَى مَكَان آخَر:** چوە جێیەکی‌تر، گواستیەوە
**حَالَ بَيْنَهُمَا:** کەوتە نێوانیانەوە
**حَالَ عَلَيه الحَول:** ساڵێکی بەسەرا تێپەڕی، ساڵێك گوزەرا
**حَالِب:** بۆری میز، میزکێش
**حَالِبَان:** دوو بۆرییە میزیان پێدا دەڕوات
**حَالَت الشَجَرَة:** ساڵێك بەری گرت و ساڵێك بێ‌بەر
**حَالَتْ الأُنْثَى:** سکی پڕ نەبوو،دوو گیان نەبوو
**حَالَة:** بار،حاڵەت، دۆخ، بارودۆخ
**حَالَف( عَاهَد وَنَاصَر ):** پەیمانی بەست، ڕێکەوت لەگەڵی، گونجا لەگەڵی
**حَالِق:** شاخ و چیای بلندی رووتەن

**حَالِقَة:** سەختە ساڵ، پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی، بەسەر نەبردنی سیلەی رەحم
**حَالِك:** رەشی تێر، زۆر رەش
**حَالَما:** هەرکە، لەکاتی
**حَالُوق:** مەرگ، تیاچوون، فەوتان، مردن
**حَالِي- حَالِيَاً:** ئێستا، لەم کاتەدا، ئەم دەمە
**حَالاً:** هەر ئێستە، دەست بەجێ، یەکسەر، هەنوکە، دەمو دەست، گەرماو گەرم
**حَامَ:** بەدەوریا گەڕا،بەدوویا هەڵسوڕا
**حَام( حَارِس ):** ئێشکگر، پارێزەر، بەرگر، گەرم، گوڕ
**حَامَى عَنْ( دَافَع ):** بەرگری‌کرد، پارێزگاری لێکرد
**حَامِز:** ئەوەی زمان ئەچوزێنێتەوە
**حَامِض:** ترش، ترشاو، لیمۆ، دڵەکزێ
**حَامِضَة:** ئارەزووی شتێك، گڕان بۆ شتێك، خراپ بوونی خواردن لەگەدەدا
**حَامِل( رَافِع ):** هەڵگر، بەرزکەرەوە، بڵندکەر
**حَامِلَة:** زەمیلە، کەشتی فڕۆکە هەڵگر
**حَامُولَة:** ناوێکە لەسەرچاوەکەیەوە بەخوڕ دێت کاتی رەهێڵە باران
**حَامِي:** بەرگریکار، پارێزکار
**حَامِيَة( واقِيَة ):** پارێزەر، قەڵغان، سوپەر
**حَانَ الشَئ:** نزیك بوەوە، هاتە بەر
**حَانَ الوَقْت:** کات نزیك بوەوە
**حَانَ( بَار ):** بار، مەیخانە، مەستخانە

**حَمَسَه اللَّحْم:** سووری کردەوە

**حَمَسَه:** ورووژاندی ، هانیدا

**حَمَشَ:** سەری کردە سەر، هانیدا، توڕەیکرد، جارسیکرد

**حَمَشَ الطَّبْخ:** سووتا، چێشتەکە سووتا

**حَمَشَ الشَّحْم:**توانیەوە هەتا بوو بە چزڵێك

**حَمَّصَ:** برژاندی

**حَمَّص( مَشْوِي ):** برژاو

**حَمَصَ الوَرَم( إِنفَش ):** ئاوساویەکە نیشتەوە، دامرکایەوە

**حُمَّص ـ حُمَص ـ حِمَّص:** نۆك، نخە ، نووەی

**حَمَضَ:** ترشبوو، ترشا ، مزربوو

**حَمَّضَ:** ترشیکرد، ترشانی، مزریکرد

**حَمْضَة:** ئیشتیهاو ئارەزووی خواردن کردن

**حَمْضِيَات:** مزرەمەنی ، میوە ترشەمەنیەکان لەبابەتی لیمۆو نارنج‌و

**حَمِقَ:** گێل بوو، گەوجبوو، کەودەن بوو

**حَمَقَ:** ریش تەنك

**حُمْق:** گێلی ، گەوجی ، کەودەنی

**حَمِقَ:** توڕەو ریسواو سووك

**حَمْقَاء:** ژنی گێل‌و بێ ژیریی

**حُمَاق ـ حَمَاق :** نەخۆشیەکە لەئاولە دەچێت

**حَمَلَ الشَّيْ( رفَعَه ):** هەڵی گرت، بەرزی کردەوە

**حَمَلَ عَلَى ظَهْرِه:** بەکۆڵ هەڵی گرت دای بەکۆڵیا

**حَمَلَ عَلَى نَفْسِه أَوْ عَلَى عَاتِقِه:** خۆی هیلاك کرد، گرتیە ئەستۆی

**حَمَلَ الحِقْد:** کینەی هەڵگرت، رقی لێهەڵگرت، خەشمی لێگرت

**حَمَلَ القُرآن:** قورئانی لەبەرکرد، رەوانی کرد

**حَمَلَ العِلْم:** زانستی گواستەوە، زانیاری بڵاوکردەوە

**حِمْل:** بار ، کۆڵ

**حَمَّلَ:** هەڵی گرت،خستیە ئەستۆی

**حَمْل:** بەروبوومی درەخت ، ئەوەی لەنێو سکدایە

**حَمَل:** بەرخ ، گەواڵە هەوری قورس‌و باران هەڵگر

**حُمْلاق:** سپێنەی چاو

**حُمْلان:** ئەوەی دەنرێ لەئاژەڵ لەدیاری تایبەت ، کرێ بار

**حُمْلَة ـ حَمْلَة:**گواستیەوە لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە

**حَمْلَة:** هێرش، پەلامار ، هەڵمەت، تاودان

**حَمْلَقَ:** چاوی زەقکردەوە، تێیڕوانی ، چاوی تێبڕی

**حَمْلَقَة( تَفَرُّس ):** چاو زەق کردنەوە تێڕوانین ، چاو تێبڕین

**حَمَّمَ( غَسَل ):** خۆی شت ، شتی

**حُمَم:**سوتاو، قەقنەز،خۆڵەمێش،خەڵوز

**حَمُو:** خەزوور

**حَمُود( حَامد ):** سوپاسکار،سوپاسگوزار

**حُمُوضَة:** ترشی ، ترشەڵۆك

**حُمُوضَة المَعِدَة:** دڵەکزێ ، ترخە

**حَمُوقَة:** گێلی ، گەوجی

**حُمُول:** وشترێکە کەژاوەی بەسەرەوە بێت

**حَمُولَة**: بار ، تواناى هەڵگرتن
**حَمِيَ**: گەرم بوو
**حَمِيَ النَّار**: گەرم بوو، تاوى سەند
**حَمِيَ الشَّمْس**: تيشك و گەرماى خۆر
**حُمَيّا**: ئەوپەڕى تورەيى،سەرەتاى هەمووشتێك ، گەرمەى
**حَمِيَّة**: توندوتيژى، هەڵەشەيى، توندڕەويى، دەمارگيرى
**حَمِيَّة( حَماس )**: پەرۆشى، پەرۆشبوون
**حُمَيَّة**: پاريزكردن ، پاراستن
**حَمِيد**: شايانى پياهەڵدانە، شايانى سوپاس ، ناوێكى پەروەردگارە
**حُمَيراء**: ژنى سپى و سوڵ، ژنى سپى پێست
**حَمِيس**: ئازا ، دلاوەر، مەرد ، بوێر
**حَمِيش ( الشَّحم المُذاب )**: چزڵيك
**حُمَيِّض**: مزر ، ترشۆكە
**حُمَيضَة**: زۆر نەزان ، يەكجار گێل
**حَمِيل**: غەريب،منداڵ لەسكى دايكيدا، كەفيل ، بەڵێندەر
**حَمِيم**: خزم،خوێش،كەسى نزيك، گەرم ، بەكوڵ
**حَمِيمَة**: ئاوى لەكوڵ و گەرم

**ح ن**

**حَنَّ**: ئارەزوويكرد، بەپەرۆشبوو، بەزەيى پياهاتەوە، دەنگى ليوەهات
**حَنَّ إليه**: بيرىكرد، سۆزى بۆ هاتە جۆش
**حَنَّ عليه**: بەزەيى پێداهاتەوە
**حَنا ـ حَنْواً**: چەمايەوە، لاربووەوە، خواربووەوە
**حَنى رَأسَه**: سەرى دانەواند، سەرى نەويكرد، سەرى شۆڕكرد
**حَنى ـ حَنو**: چەمانەوە، لاربوونەوە، خواربونەوە، نوشتانەوە
**حَنّاء**: خەنە، خەنێ، خنە، گيايەكى سەوزە دەهاڕێ ژنان بۆ جوانى لەسەردەست و پێيانى دەگرن و سوربيەكى كاڵ دەگات بەپێستيان بۆ ماوەيەك
**حَنادِس**: سێشەوى تاريكى كۆتايى مانگ
**حَناط**: بۆنى خۆش ، كافور
**حَنَّاط**: مەڵو مرۆڤ مۆمياكەر
**حَنّاطي( بائع الحِنْطَة )**: گەنم فرۆش ، عەلاف
**حَناك**: تێگەيشتوو ، ژير، فاميدە
**حَنان**: دڵنەرمى،دڵسۆزى ،تاسە، رزق ، سامان، پيت، بەزەيى ، پەرۆش
**حَنّان**:ميهرەبانى،بەسۆزيى، پەرۆشى ، يەكێكە لەناوە جوانەكانى پەروەردگار
**حَنأَ المَكان**: سەوزبوو، گياى لێڕوا
**حَنّأَهُ**: خەناوى كرد
**حَنْبَلَ**: لۆبياى خوارد
**حُنْبُل( لوبياء )**: لۆبيا، ماشە سپى
**حَنْبَل**: سۆل ، كورتە بالاّى ورگن
**حَنِثَ ـ حِنْثاً**:روويكردە نارەواوناحەقى
**حَنَثَ في يَمينه** : سوێندى بەدرۆخوارد
**حِنْث**: سوێندى درۆ، گوناه، تاوان، عەقلْ پێ شكان
**حَنَّج**: خوارى كردەوە، لارىكردەوە، بايدايەوە
**حَنْجَرة ـ حُنْجُور( حُلقُوم )**:قورگ ، قورگوڕاگە، بين ، گەروو
**حَنْجَل**: سپێتى دەست و قاچى ئەسپ

**حَنْدَسَ الليل:** تاريكبوو، تاريكداهات
**حِنْـدِس:** تاريشـــكە شـــەو ، شـــەوى تاريك‌ونوتەك، ئەموستەچاو، تاريكايى
**حَنَش:** جۆرە مارێكە ، شلّەمار
**حَنَش الصَيد:** راوى‌كرد، شكاريكرد
**حَنَشَت الحَيَّة:** گەزتى ، لێيدا
**حَنَط الزَّرْع:** كاتى دروێنەى هات
**حَنَطَ الجلد:** سوربوەوە، سووورداگيرسا
**حَنَطَ الشَجَر:** پێگەيشت، وادەى هات
**حَنَّط الميت:** مۆمياى كرد
**حِنْطَة( قَمْح ):** گەنم ، باراش
**حِنْطِي:** گەنم رەنگ، ئاوساو، گەنخۆر
**حَنْظَل( نَبـات مُر ):** گوژالّك ، گـوژاك، گيايەكى كێوى‌و هاوينيە بەبڕكەو گەلاو بـەرەوەو هــەر لەشــووتى دەچــێو بەرەكـەى هێنـدەى نـارنجێكى لێـدێو زەردە
**حَنْظَلَــت الشَــجَرَةُ:** بەروبوومەكـــەى تالّبوو
**حَنَـــفَ( مَـــالَ ):** لاربـــوو، گـــێڕبوو، چەمايەوە
**حَنِفَ:** قاچى گێڕبوو
**حُنَفَاء:** راستگۆ ، راست، راستالّ
**حَنَفِيَّة( صُنْبُور ):** بەلوعە
**حِنْفِشْ:** مارى كەللە زل ، هەژديها
**حَنِقَ مِنْهُ وَعَلَيه :** لێى بێزاربـــوو، لێـى وەرس بوو
**حَنِقَ مِنَ الأمر( غَضِبَ ):** تورەبوو، رقـى هەلّسا
**حَنَــقْ( غَيــظ ):** رق ، قــين ، بــێزارى، وەرسبوون، پيش خواردن
**حَنَـك ـ حَنْكـــاً :** تێگـەيى ، حـــالّى‌بوو، فاميدەبوو

**حَنَّك:** قالّبوو ، ژير بوو، دانابوو
**حَنَك:** مەلاشوو، گۆشەك ، شلكە سەرە لەسەر نێو چاوانە ، ئاسمانەى دەم
**حُنَـك:** هەلّس‌وكـــەوتى زەمانــە قـــالّو ژيرى كرد
**حنّك:** قالّبوون ، تێگەيشتن
**حُنْكَة :** تــەپى بچـووك كەبــەردەكانى سپى‌يە
**حَنْكَلِيس( ثُعْبَان المَاء ):** مارماسى،مارى ئاويى
**حَنَّنَ الشَجَر:** شكۆفەو خونچەى‌دەركرد
**حنُو ـ حَنْو:** هەر بـەشێك لەجەستە لارو لــەوێرى تێدابێــت وەك پــــەراسوو ، تەنيشت ، دوو لاى شتێك
**حنُو منْ الشَئ:** قەلّبوسى زين، بەركۆ
**حُنُو:** دلّســۆزيى، سۆزو بـەزەيى، هەم دەرديى، ئەمەكداريى، هاوخەمى
**حَنُوط:** بۆنى خۆش ، كافور
**حَنُون:** خەمخوار، ميهرەبان، دلّسۆز
**حنيَّة ـ حَنْيَة( قوس ):** چەماوە ، كەوانە
**حَنِيَّة:** بەبەزەيى ، بەسۆز
**حَنِيف:** راست ، راستگۆ، راستالّ
**حَنِيك:** مـــەردومى ئەزموندار،دنيا ديدە
**حَنِين:** تاسەكردن، بيركردن، پەرۆشى

## ح و

**حَوَى الشَئ:** كۆى كـــردەوە ، گـــردى كردەوە ، جـەميكرد، تيايەتى
**حَوَاء ـ حَوَائة:** ئاواز ، دەنگ
**حَـوَار ـ حـوَار:** ئاخـافتن ، گفــت‌و گــۆ، قــسە ، وەلاّم ، وت‌ووێژ ، مشت‌و مڕ
**حُوَّارى:** ئاردى سپى
**حَـوَارِيّ( نـاصر ):** پەيامبــەر، هـــاودەم، ياريدەدەر، پشتگير

**حَوَاريــون**:يــارانى حـــەزرەتى عيســا (سەلامى خواى لێبێت)
**حَوَارِيَــة**: ســپى ،بەبــەزەيى،بەسـۆز ، پشتگيرى پێغەمبەران (د.خ)
**حَـوَاس**: پێنـج هەســتيارەكەى مـرۆڤ (بيستن ، بينـين ، چەشـتن، بۆنكـردن، بەركەوتن)
**حُوَاشَـة**: خزمايــەتى،ئــەوەى شــەرمى لێدەكرێ
**حَوَاشك**: باى هەمەچەشنو جياواز
**حَوَاص**: سوژنى دار
**حُوَّاط**: بناغەى كار
**حُوَّاطَة**: گەنجينە، شـوێنێكە خواردنـى تێدا هەڵدەگيرێ
**حَوَال**: مابەينى نێوان دووشت، كۆسپ، رێگر ، نێوان
**حَوَالَة**: گواستنەوەى قـەرز لەئەسـتۆى يەكێكەوە بۆ يەكێكى ديكە
**حَوَالِي**: نزيكەى ، ئەوەندەى
**حَوَامِض**: ترشەمەنى
**حَوَامِل**: پەل ، پا ، لك
**حَوَانـي**: درێژتريـن پەراســو لەهــەردوو لاوە كە دووانە
**حُوب**: گوناھ ، بەلاَ ، تاوان
**حَـوْب**: خوشـك ، كـچ ، دايـكو بـاوك، خەمو خەفەت ، خاڵوان، بار
**حَوْبَاء**: دڵ ، روح ، جەستە
**حُوْبَة**: مەردى لاواز ، گونـاھ ، تـاوان ، خراپە
**حَوْبَة**: خاڵوان ، خزمانى دايك
**حُوْت**: حوت ،نەھەنگ ، سالمون
**حوتَة**: يەكێك لەھەسارەكانى ئاسمانە

**حَـوَّجَ بِـهِ عَـنْ الشَـئ**: لێـى لادا، دوورى خستەوە، لاريكردەوە
**حَـوْج**: پێويستى، ويســت، هــەژاريى، نەبوونى، دەستكورتى
**حَوْجَـاء( حَاجَـة )**: پێويستى، ويسـت ، خواست
**حَوْذَان**: روەكێكى تام خۆشـە،گوڵێكى سووره بەلاَم لەبنەڕەتا زەردە
**حَـوْذِي( سَـائِق العَرَبَـة )**: عەرەبانـەچى، گاليسكەوان
**حَوَر**: پێستى سپىو سۆڵ، دارێكـە بـەو ناوەوە ناسراوە، مێشن ، گەلاسى
**حَوْر**: قولاَيى ، ناوجەرگە، ناوەوە
**حَوَّر**: گۆڕى، خولانيەوە، سپىكردەوە، گازرىكرد
**حَوَّرَ الثَوْب**: سپى كردەوە
**حُور**: تياچوون ، كەمو كورتى
**حَـوَر**: چــاوێك ســپێنەكەى زۆرسـپىو رەشێنەكەى زۆر رەش بێت
**حَوْرَاء**: ئەوكەسانەى سـپێنەى چاويـان زۆر سپى بێتورەشێنەكەشى رەشێكى تێربێت
**حُوْرِيَة**: پەرى ، روو زۆر جوان ، ناسـك بەدەن
**حَوْر**: كۆكردنەوە، لـەلابوون، پىٚبـوون، دەستكەوتن
**حَـوْرُ الـدَار**: ئـەوەى لەسـەر نەخشـەى ماڵە لەسەرپێشاوو ..
**حَوْزَة**: حەوزە ، ناحيە ، دەڤەر
**حَـــوَّش**: كۆىكـــردەوە، جـــەميكرد، پاشەكەوتىكرد
**حَوْش**: حەوشە، گۆڕەپان، پەرژينكراو

**خُوشِي** : نامۆ، ئەوەی تێکەڵ بەخەڵکی نابێت ، شەوی تاریك، گۆشەگیر، دابڕاو
**خَوص**: چاوکونە سوژن، چاو بچووك
**خَوص**: کۆك ، تەقەڵی درشت، شاشو شەش پیّ
**خَوصَل ـ خَوصَلَة الطَائر** :جیکڵدانـە ، سیقەتۆرە ، گورجو، سەقاکوژ
**خَوصلاء ـ خَوصَلَة**: جیقڵدانە، سیکڵدان
**خَوض الأَرْض**: گۆل ، گۆلی کرد
**خَوّضَ حَوْلَ الأمْر**: لەدەوری هەڵسووڕا
**خَوض**: پەنگاو ، حەوز ، ئاوگە، تـانکی ئاو ، ئاوکۆ ، دوکانچەی باخ، ئاوگیر
**خوط**: پەرژینیکرد، شورەیکرد
**خوط**: میلالێك لەزیو دروستکرابێت
**حوط**: تەواوکاری ناتەواویی درهەم
**خَوّف( جَعَلَه عَلَى الحَافَة )**: خستیە سەر کەنارو رۆخ
**خَوْف**: لا ، تەنیشت
**خُوق**: چوارچێوە ، پەرژین ، چێوە
**خَوقَل ـ خَوْقَلَة**: وتەی (لا حول ولا قوة الا بـالله) هیـچ هـێزو پەنایـەك نییـە پەروەردگار نەبێت
**خَوك**: چنین
**خَول**: خێل بوو ، چاوی تێکچوو، ژێرەو ژوور تەماشایکرد
**حَـوّل**: لایبرد، نـەی هێشت، سـڕیەوە، ناردی ، وەرگەڕا
**حَـوّل الأَرْض**: بـەدوو سـاڵ جـارێك کشتوکاڵی تیاکرد
**حَوْل**: توانا،هێز ،توانین ،وریایی، ساڵ
**حَوْل**: دەور،چوارلا ، ئەملاو لا،نزیکەی، لەدەوروپشتی

**حـوَل**: جوانـی تـێڕوانین ، توانـای هەڵسوکـەوت، گواسـتنەوە، نـەمان، فەوتان
**حَـوَل ـ حَوْلاء**: خێـل ،خێلی ، تیلـی، چاولار
**حُوْلَـة**: بـەخۆنازین، کـارێکی خراپـی ناشیاو
**حَوْلَة**: توانایی، هێزداریی
**حَوْلَقَة**: وتنـی دەستەواژەی (لا حـولَ وَلا قُوَّةَ الاّ بالله)
**حَوْلي**: ساڵە وەخت، بەرخ
**حُولي**: گوێرەکە
**حَوْلِيَات**: ساڵنامە ، ئـەو نووسـراوانەی ساڵێکی خایاندوە
**حَوَّمَ فِي الأَمْر تَحْوِيمَاً**: بەردەوامیەتدان بەکارێك
**حَوْمَة**: مەیدانی جەنگ، گۆرەپانی شەڕ
**حَوِيّ**: رەشێکی مەیلەو سەوز، سورێکی رەشباو
**حُوِيَّـة( حبـل ـ لَفَّـة )**: گلۆفــە ، پــەت، حەبل

## حي

**حَي**: گـەرەك ، مـاڵان،ناوێکـە لـەناوە جوانەکانی پەروەردگار، ئەژی
**حَيَا ـ تَحِيَّة**: سلاویکرد، سەلامیکرد
**حَيَــاء**: شـــەرم ، تـــەریقی، بـــەخۆدا رۆچوون
**حَيَا**: باران ، حاڵ
**حَيَـاة**: ژیــان ، بــوون ، زیندەگــانی ، چالاکی ،چابوکی، جووڵە، نەوەستان
**حِيَاد**: بێلایەنی، سەربەخۆیی
**حِيَــازَة**: هـــەبوون، خـــاوەنداری، بەدەستهێنان

**حِيَاصَة الثّــوب:** دوورینــی ، چنینــی بەیەکەوە
**حَيَاك:** بەفیزەوە رۆیشتن
**حِيَال:** هاوتا، بەرانبەر ، رووبەروو
**حَيَّــــال:** فێڵبــــاز ، تەڵەکــــەباز، چاوبەستکار، لف لێدەر
**حِيبَة:** خزمو کەسی دایك، پێویستی
**حَيَّة :** مار ، ئەژدیها
**حَيْث:** لەکوێ
**حَيْثمَا( أينَمَا ):** لەهەر کوێیەك
**حَيْثمَا اِتّفَــق:** هــەر چۆنێــك گونجــاو رێکەوت
**حَيْــد( وَضَعَــه جَانبَــاً ):** خســتیە لاوە، کەناری گرت ، لایخست
**حَيْــد:** چرکە ژمــێری کــاتژمێر، لادان، دوورکەوتنەوە
**حِيد:** وەك یەك ، چوون یەك
**حَيْر:** شپرزەیکرد، شڵەژانی، تێکیدا
**حَيْرَان:** سەرسام ، سەرگەردان
**حَيْرَة:** رامان، دۆش دامــان ، شــڵەژان ، شپرزەبوون، واق ورمان،گومان،دوودڵی
**حِيز ـ حَيِّز:** شوێن ، جێگــە، سنووری شوێن
**حَيْزَبُور ـ حَيْزَبُون:** پیرەژن، ژنــی پــیرو پەککەوتە
**حَيْزُوم:** ناوەڕاستی سنگ، میانی سینە
**حَيص ـ حَيصَة ( هــروب ):** هــەڵهاتن ، راکردن، خۆپاراستن ، لادان، قوچاندی
**حَيص بَيص( الشدّة والضّعف ):** تــەنگانە، کۆسپ ، چورتم ، چەتاڵی ، ناڕەحەتی، مەینەتی ، دەردەسەری ، ناخۆشی
**حَيــض( طَمــث ):** بێنوێــژی ، حــەیز، لــەخوێنابوون، مــەهك ، ئــەو عــادە مانگانەیەیە کە ژنان تێی دەکەون
**حَيضي( طَمْثي ):** خوێنــاوی، بێنوێــژی، خوێنین
**حيطة :** ژنی داوێن پاکی رێزدار

**حَيطَة :** پێشبیــن، دووربین،ئاگــاداریی ، پەرێز، پاراستن، هۆشیاریی‌و شارەزایی سەبارەت بەکارێك
**حَيق:** ســەرئەنجام ، ئــەنجام ، دوایــین کۆتا
**حَيقَة الطعَام:** ترشو خوێی تێکرد
**حَيقــر:** بچــووکو ریســوایی‌کرد، هــات بەسەریا رەزیلی‌کرد
**حَيك:** چنی
**حَيكَى:** بەفیزەوە رۆیی
**حَيل:** هێز ،ئاوی پەنگ خــواردووی نێــو دۆڵو شیوو
**حَيلَة:** تیژڕوانی ، مامۆستایی
**حِيلَة:** توانین ، وریایی ، چاوڕاو فێڵ ، تەڵەکــە، کەڵــەك، کــەف ، ســاختە ، مــف خۆریی، لف لێدان، فریودان
**حَيّن:** کاتی داهات ، وادەی هات
**حَيّنَــه الله :** پــەروەردگار رێنومــایی‌و سەرکەوتوویی نەکرد
**حِين( وَقْت ـ زَمَن ):** کــات ، مــاوە، دەم، جار ، سات
**حِينَئذ( إذْ ذاك ):** لەوکاتەدا
**حِينَمَا( لمّا ):** کەی ، کە ، کاتێ
**حَيّهَلاً( أقبل وعَجل ):** خێراکە، پەلەبکە
**حَيّ( هَلُم ):** وەرە، خێراکە، بکەوە خۆ
**حَيّ هلاً بفلان:** بانگی بکە ، گازی بکە
**حَيَــوَان:** گیــاندار،گیانــەوەر، ئــاژەڵ ، زیندەوەر
**حَيَوَاني:** ئاژەڵزان، وابەستەی ئاژەڵ
**حَيَوَانيَة :** سروشتی ئاژەڵی
**حَيَوِي( لازم للحَيَاة ):** پێویست ، گرنــگ، زیندەگی ، زیندەکاری
**حَيَوِيّة :** گرنگێتی، زیندویەتی،زیندەگی
**حَيِي:** ژیا ، ژینی بەسەر برد



حَقِيبة (جانتا)



حَبّ (مەركانە)



حِبْر (مەرەكەب)



حَلَزون (هێلكە شەیتانۆكە)



حِمار الوَحْش (كەرەكێوی)



حَسِيكة (ژیشك)



حِصان( ئەسپ ـ رەخت)



حِذاء (پێلاو)



حَبِيسة( زریزەی ملو گەردن)



حَجْلة (گوارە)



حَوْذِي ( گالیسەوان )



حَمَلٌ ( بەرخ )



حِصن ( قەلا )



حَافِر ( زەوی هەلکەن)



حَامِلٌ ( هەلگر)



حَلَّة - قِدْر الطَبْخ ( مەنجەل)



حَرِيش( کەرکەدەن)



حُقَّة ( جامۆلکە)



حُقْنَة ( شرینقە)

# (٧) حرف الخاء

# خ

## خ

حەوتەم پیتی زمانی عەرەبی‌یە

### خ ا - خ أ

**خَائِب**: نائومێد، بێهیوا، هیچ دەستگیر نەبوو

**خَائِف**: ترساو، تۆقیو، زنۆق چوو

**خَائِل**: کۆیلە، کەنیزەك، ئەوانەی تەیان و پێشخزمەت و بەردەستن

**خَائِن**: ناپاك، بەدکار، دەست پیس، ستەمکار

**خَابَ**: هەژارو نەدار کەوت، شکستی خوارد، سەرنەکەوت، تێکشکا

**خَابَرَ**: نامەی نارد، قسەی لەگەڵاکرد، گفتوگۆی‌کرد، وتوێژی کرد

**خَابَرَه**: نامەی بۆ نووسی، ئاخافتن و قسەی لەگەڵا کرد

**خَابِز**: نانەوا، نانکەر، نانفرۆش

**خَابِل**: شەیتان، جنۆکە، تێکدەر، گێرەشێوێن

**خَابِلان**: داهاتنی شەوو رۆژ پەی دەرپەی، بەدوای یەکدا، دوا بەدوا

**خَابُور**: دارێکە

**خَابِئَة - خَابِيَة**: گۆزە، کوپە،مەرکانە، ئاقلینە، دەفری ئاو لەسواڵەت

**خَاتَام**: مۆر، شەقڵ

**خَاتِر (غَدَّار)**: ناپاك، گزیکەر، فێڵباز، دەستبڕ، ساختەچی

**خَاتَل (إِختَبَأَ)**: خۆی مەلاسدا، خۆی حەشاردا، خۆی شاردەوە

**خَاتَل الصَّيَاد**: خۆی حەشاردا، خۆی شاردەوە

**خَاتَم - خَاتِم**: مۆر، ئەنگوستیلە،ئەڵقە،ئەموستیلە، شەقڵ، پارچە مسێکی داڕژاوە بەتایبەتی بۆئەوەی ناوی کەسێکی لەسەر هەڵبکەنرێ، کۆتا، دوایین

**خَاتِمَة (نِهَايَة - آخِر)**:کۆتایی،ئەنجام، دوایی هاتن، کۆتا بوون

**خَاتُون**: خاتوون، خانم، ئافرەتێکی خاوەن رەچەڵەك و کەسایەتی دیارو بەرچاو، بانوو، یای، ناوی ئافرەتە

**خَاثِر**: خەست، توند، بەستوو، مەیوو، بزرکاو، تیر، پەیت، چڕ، بەپێچەوانەوە کەشل بێت

**خَاثِرَة**: خوێن مەیین، کۆمەڵە خەڵکێك

**خَادِج**: ناتەواو، کەم و کوڕ، چوارپێیەکە ناتەواو بێت

**خَادِر**: تەمەڵ، خاوخلیچك، سەرسام

**خَادَعَ**: فێڵی‌کرد، گزی‌کرد، هەڵی فریوان، خەڵەتاندن، دەستخەڕۆیی‌کرد

**خَادِع**: نادیار، شاراوە، پەنهان، چاوبەست، داپۆشراو

**خادعة**: دەرگایەكی بچووك لەنێو دەرگایەكی گەورەدا، ماڵ لەنێوماڵدا
**خادم**: نۆكەر، كارەكەر، راگرتە، بەردەست، دەستو پێوەند، شاگرد، تەیان، پێشخزمەت
**خادمة**: نۆكەریی، تەیانی، بەردەستی، خزمەتكاریی، ئیشكەریی، پێشخزمەتی
**خادن**: برادەرییكرد، بووبە هاوڕێی، هاوەڵایەتی كرد
**خاذل**: دەستبەرداربوو، وازیهێنا، دەستی لێهەڵگرت، دواكەوت، بەجێما
**خاذل**: وازی لێهێن، دەستبەردار، بێباكبوون، دواكەوتوو، بەجێماو
**خار**: لاوازبوو، شكستی خوارد، نوشوست هات بەسەریا
**خار البقر**: هاواری لێبەرز بووەوە، لاوازو سست بوو
**خار المريض**: كەوت ، تلیسایەوە، پان بووەوە
**خار ـ خيراً**: خێرداربوو، خێرۆمەندبوو
**خارب** :خراپكار، دز ، جەردە،وێرانكار، دەستبڕ، قۆڵ بڕ
**خارج**: رێكەوتن لەسەر بڕێك باج
**خارج**: رووكەش، دیار ، ئەوەی لەدەرەوەیە، هەندەران، بەرچاو
**خارجة**: گرۆهێكە لەزۆرینەی نەتەوەی ئیسلام یاخی بوونو رایەكی تایبەتیان هەبوو
**خارجي**:دەرەكی،سەربەدەرەوە،بێگانە
**خارش**: خوێندن لەیەك، بەرانبەریی
**خارصين**: تۆتیا، رووح تۆتیا ، شتی زۆر ورد

**خارف**: مامەڵەی لەگەڵاكرد لەوەرزی پایزدا
**خارق**: كونكەر، تێپەڕ، سەیر،سەمەرە، بەدەر لەسروشت، نائاسایی، لەڕادە بەدەر
**خارم**: تێكدەر، شێوێنەر، گێرەشێوێن
**خازر**: داخرا، پیاوی زیرەكو كارامە
**خازم**: هەریەك رێگەیەكی گرتەبەرو دوایی لەیەك شوێن یەكیانگرت
**خازن**: گەنجینەوان ، خەزنەدار، بەرپرسی گەنجینە
**خازق**: سەرەنێزە ، نووكەڕم، سەری رم
**خازوق**: چوارمێخ ، داری لەسێدارەدان
**خاس البيع**: شكستی هێنا لەمامەڵەدا
**خاس به**: ناپاكیكرد، چاوبەستی لێكرد
**خاس العهد**: پەیمانی شكاند، بەڵێنی نەبردە سەر
**خاسئ**: دەركراو، دوورەپەرێزكراو، ئەو بەرازو سەگانەی خەڵكی لەخۆیان دوور دەخەنەوەو رێگە نادەن نزیكیان بكەون
**خاست الجيفة**: بۆگەنیكرد، گەنی
**خاسر**: دۆڕاو ، شكست خواردوو ، زیانكار ، زەرەر مەند
**خاسف**: چاڵ ، قوپاو، تەپیو، رۆچوو، داڕوخاو،سووكی، پوكاوە،بێهێز، رسوایی
**خاش**: دەریدا،خاڵیكردەوە، هیچی تیا نەهێشت ، بەتاڵیكرد
**خاشع**: ملكەچ ، سەرشۆڕ، قایل، رازی

**خَاشَنَ**: زبربوو، رەق بوو
**خَاشي**: ترسناك، هەراسان، مەترسیدار
**خَاصْ**: تایبەت، دانستە، بژاردە، دەستندە، خاسما، نەخازم
**خَاصَّة**: تایبەتمەند، تایبەت، خاس
**خَاصَّة من النَاس**: ریزدارو پلەدارانی خەڵك
**خَاصَرَ**: دەستی گرت لەرۆینا، ناوقەدی گرت
**خَاصِرَة**: کەنار، رۆخ، قەراغ، پەڕ، رۆخ، سیلە، لەوچك، هیش، دەم، گوێ، زریە پەڕ
**خَاصَمَ( تَنَازَع )**: چوو بەگژیا دوژمنایەتی لەگەڵکرد، بەرەنگاری بوو
**خَاصَمَه**: ناکۆکی لەگەلا بەرپاکرد، دوژمنایەتی لەگەڵ کرد
**خَاضَ**: چوە ناوی، لێی رۆیی، خۆی خستە ئاوەکەوە
**خَاضَ فِي الحَدِيث**: رۆچووله‌گفتوگۆو قسە کردندا، قووڵی کردەوە
**خَاضَرَ**: بەسەوزی میوەکەی بەدرەختەوە پێ فرۆشت
**خَاضَعَ**: قسەی نەرموهێواشی لەگەلاکرد
**خَاضِع**: ملکەچ، سەرشۆڕ، گەردن کەچ، رام، گوێ دێر، سەردانان، فەرمانبەر
**خَاضِلْ**: تەڕیی، شێداریی
**خَاطَ**: دووریی، بەستی بەیەکەوە، گرێیدا بەیەکەوە
**خَاطَت الحَيَّة**: خشا بەسەر زەویدا
**خَاطِئ**: گوناهکار، تاوانبار، هەڵەکار، سوچدار

**خَاطَب**: لەگەڵی دوا، قسەی بۆکرد، گفتوگۆی لەگەڵ کرد
**خَاطِب**: وتارزان، مرۆڤی داناو لێزان بەوتار، دەم پاراو
**خَاطَرَ**: گرەویی‌کرد، خۆی خستە مەترسیەوە، سەرەڕۆیی‌کرد
**خَاطِر**: یاد، بیر، خولیا، ئەندێشە، خەیاڵ
**خَاطِف**: ئەو تیرەی دەدات بەزەویداو پاشان روەو شوێنی مەبەست دەچێت
**خَافَ**: ترسا، تۆقی، زنۆقی چوو
**خَافِت**: دەنگی کز، دەنگێکی‌نەبیستراو
**خَافِض**: ناوێکی پەروەردگارە، دابەزێنەری ستەمکاران
**خَافِق**: پووچ و بەتاڵ لەمایەی دڵخۆشی
**خَافِقَات( أعْلام )**: ئالا، ئالاکان
**خَافِقَان( المَشْرِق وَالمَغْرِب )**: خۆرهەلاتو خۆرئاوا، رۆژهەلاتو رۆژئاوا
**خَافِقِي**: سپیکار، گەچکار، ئەوەی ئیش و پیشەی گەچکاری دەکات
**خَافِي- خَافِيَة**: پەنهان، نێن، راز، نادیار، چرپە، سرپە
**خَالَ( سَاسَ )**: هەڵی سووڕاند، بەڕێوەی برد، خستیەگەڕ
**خَالَ فُلان عَنْ أهْلِيه**: کاروبارو بژێوی رێکخستن
**خَالَ**: خێزانی دروستکرد دوای رەبەنی
**خَالَ الشَيْ**: گومانی‌برد، واپەی برد
**خَالَّ- مُخَالَّة وخِلالاً**: دۆستایەتی و برادەرایەتی‌کرد، هاوڕێیەتی
**خَالْ**: برای دایك، خاڵ، خالۆ، لالە، لالۆ

**خَال ـ خِيلاَن:** گومان بردن، هەوری بـێ باران‌و بروسکە، خۆبـەزلزان، مـەردومی دڵ‌و جەستە لاواز

**خَالَة (أخت الأم والأب):** پـوور، پلـك، تیتك، میمك، خوشكی دایك‌و باوك

**خَالَج:** چەواشـەبوو،سەری لێتێکچوو، هۆشی بەلای خۆیەوە نـەما،جووڵانی، شڵەقانی، بـزوانی، چاوی لێداگرت

**خَالَجَة (شك):** گومانی‌کرد،دڵی پیسکرد

**خَـالِد:** نـەمر، جـاوید، تیـانەچوو بەردەوام ، ئەزەلی، هەتا هەتایی

**خَالِدَة:** گیایەکە بۆ جوانی دادەنرێت

**خَالَس:** پەلەیکرد، خێرایکرد، دەسـت‌و بردیکرد، گورج‌و گۆڵی کرد

**خَالَص:** بەپاکی دۆستایەتی کرد

**خَالِص:** پوخت ، پاك ، بێ‌غەل‌و غەش، روون ، بێگەرد، خاوێن، رێك‌و پێك

**خَالَط:** تێکەڵی‌کرد، لەگەڵی ژیا

**خَالَطَه الـدَّاء:** تێکـەڵی‌بوو، زاڵبـوو بەسەریا

**خَالَع:** دەسـتی لێهـەڵگرت، حاشـای لێکـرد، دەسـتبەرداری‌بوو، بێ‌بـاکبوو لێی

**خَـالَف:** پێچـەوانەی‌کرد، نـاجۆربوو، بەرپەرچی‌دایەوە،ناڕازی‌بوو، ناقایلبوو، دژی بوو، لاساریی‌کرد

**خَالِف:** نـەزان ، گێل ،خـراپ، گەراوە، کەودەن

**خَالِفَـة:** چینـی جێنشـینی پێشـوو، یەکێك لەکۆڵەکەکانی چادر

**خَالِق (بَـارِئ):** پـەروەردگار، خـوا ، دروستکار، داهێنەر، بەدیهێنەر

**خَـالَق:** بەرەوشـتی جـوان تێکـەڵبوو لەگەڵیدا

**خَام (نَسيج من القُطن):** خـام، جـاو، جانگ

**خَـام (نَتن):** بۆگـەن، بـۆن نـاخۆش، بۆندار

**خَام:** کەرەستەی خاو ، خاکە

**خَامَات:** کەرەستەی خاو

**خَامِد (سَاكِن):** بێدەنـگ، کپ، هێمن، دامرکاو، خەفە، داکراو

**خَامَرَ (ارْتَاب ، شك):** گومانی کرد، دڵی پیسکرد، سووسەی کرد، بەدگومان بوو

**خَامَرَ القَلْب:** تێکەڵبوو، داغڵ بوو

**خَـامَرَ الـدَّاء:** ئاوێتـەبوو،چـوە نێـوی، داغڵ بوو

**خَامَرَ بَيْتَه:** جێنشینی ماڵی خۆیبوو

**خَامَرَ بِه:** پەنهان بوو، شاراوە بوو

**خَامِس:** پێنجەم، پێنج هەمین

**خَامِس عَشَرَ:** پانزەیـەم، پانزەیەمین

**خَـامِل:** سـووك ، ریسـوا ، بێ‌بنەچـە، بێ‌بناغە

**خَـامِل الذِّكْـر:** نەناسـراو، نادیـار، بیرەوەچوو،لەبیرکراو

**خَـانَ:** ناپـاك بـوو، لەکـەداربوو، گەندەڵبوو، پیس بوو

**خَانَ الرَّجُل:** ناپاکی لەگەڵکرد،خیانەتی لێکرد

**خَـانَ العَهْد (نَقَضَـه):** بـەڵێنی شـکاند، وازی لێهێنا، پەیمان شکێنی کرد

**خَـانَ الأَمَانَـة:** ناپـاکی کـرد لەگـەڵی، نـەیپاراست، دەستدرێژی بۆ کرد

**خَانْ( حَانوت ـ دكان ):** دوكان، فرۆشگا، كۆگـا، كۆمـا، ئـەنبار، كۆگـە دوكانێكـە هەموو جۆرە شتێكی لێ دانرابێ

**خَانْ( فندق ):** میوانخانە، ئوتێل، خـان، میوانگـە، میڤانخانـە، چـەقرە، قۆنـاخ، بنەگە ، میمانخانە

**خَانَة( عَمُـود ـ حقـل ):** خانـە، سـتوون، كۆڵەكە، ئەستوندە

**خَانِع:** داوێن پیس، بێبار، ریاییكار

**خَانِق:** خنكێنەر، خنكێن، بینگر

**خَـانُوق:** باڵــە شــۆڕێ ، نەخۆشــیەكە تووشی پەلەوەر دەبێت

**خَـــاوَص:** بــــەچاوی وەك نوقـــاوەوە تەماشایكرد

**خَاوَصَه البَیع:** دژی وەستا لەمامەڵەدا

**خَاوِي:** چـۆڵ ، بـەتاڵ ، بـۆش، خـاڵی، پـووچ، حـەتاڵ، فـش، ڤـالا، هۆڵـۆڵ، هێسا

**خَاوِیَة:** زەمینی خاڵیو چۆڵ

**خَایَرَ:** سـەرپشكیكرد، ئازادیكرد

**خَایَرَه فِي الأمْر:** كردی بەسەر پشك

**خَایَل:** خـۆی هەڵكێشا، خۆی هەڵنا

**خَایَلَهُ:** شانازی كرد بەسەریەوە

**خ ب**

**خَبَّ ـ خَبَـأ وخِبَـأ:** خیانـەتكارو ناپـاكی لێدەرچوو

**خَبَّ النَّبَاتُ:** درێـژو بەرزبوو، بـاڵایكرد، گەورەبوو

**خَبَّ البَحْر:** هاتو چوو، بەرزو نزمیكرد

**خَـبَّ الفَـرَسُ فـي عَـدْوِهِ:** لۆقــەیكرد، سۆرتمەی كرد، بەلۆقە رۆیی

**خُبّ:** فێڵ ، تەڵەكە، چاوبەسـت، زەوی پەسێنراو

**خَبُّ السَمَاء:** باراندی، دایباراند

**خَبّ:** زەمینی نـزم لـەنێوان دوو زەویـدا كـەقـارچكی تێدا دەروێت

**خِبّ:** فێـلـو تەڵەكـەبازیی، شـەپۆلو هەڵچوونی دەریا

**خَبَاء( خَیمَة ):** چـادر، دەوار، خێـوەت، رەشمـاڵو خێـوەت لـەخوریو تـووك دروست دەكرێن

**خِبَـاء:** مـاڵ، لانـە،شـوێنی جێنشـین، تایبەتمەندییەكە لەوشترێكدا نـەجیبیو رەسەنی دەردەخات

**خَبَائِب:** جلی پارە پارە، پارچەپارچە، لەت لەت

**خَبَائِث:** كرداره ناپاكو دروستەكان

**خَبَّـاب:** دەسـتبڕ، قۆڵـبڕ ، فێڵبـــاز، چاوبەستكار

**خَبَّـــاز:** نانــەوا ، نانكــەر، ئـــەوەی نانده‌كات

**خُبَّـاز ـ خُبَّـازَة ( نبـــات ):** تۆڵەكــە، گیایەكی بەهارییەو دەخورێ بەچێشت یا بەكاڵیو گەر بكوڵێنرێ ئاوەكـەی بـۆ سك ئێشە باشە

**خِبَازَة:** نانەوایی، پیشەی نانەوایی

**خَبَّاش:** بـەدەستهێنراو، بەدی هێـنراو، دەستكەوتوو

**خُبَاشَات العَیـش:** ئـەوەی دەیخـوات لەخواردنو شتی دیكە

**خُبَاشَات النَّـاس:** كۆمـــەڵە خـەڵكێك كەهەریەكەیان لەهـۆزو تیرەیەكن

**خُبَاط:** نەخۆشیەكە وەك شێتی وایە

**خِبَاط:** تایبەتمەندیو سیفەتێك لەروودا

**خَبَال:** خراپە، ناتەواویی، ژەهری بكوژ

**خَبَأَ ـ خَبّأَ**: شادریەوە، خستیە پەناوە، داپۆشی

**خَبّبَ**: هەڵی خەڵەتاند، فریویدا، چاوبەستی لێکرد

**خَبَب**: جلی لەت و پەتً، جلی لەت لەتکراو

**خَبَتْ ذِكْرَه خَبْتًا**: یادی ئەو دیار نەما، باسی ونبوو

**خَبَتِ النَّارُ أَوْ الجَدْةُ**: کوژایەوە، دامرکایەوە، هێواش بوەوە، خەفە بوو

**خُبّة**: گۆماوی ئاو، ئاوەندی دۆڵً، پارچەکانی گۆشت

**خُبْثَة ـ خِبْثَة**: خۆ بەکەم زانین

**خَبُثَ ـ خُبْثًا**: خراپ و فێڵباس بوو

**خُبُثَ ـ خُبَاثَة**: زیان گەیاندن، بەدی، نەگریسی، نەگبەتی، چوختی

**خَبُثَ الطَعَام**: ناخۆشیکرد، تامی تیا نەهێشت

**خَبَثٌ**: ئەوەی خێری تیا نییە، بێخێر

**خَبَرَ الأمرَ**: تاقیکردەوە، تێگەیشت بەتاقیکردنەوە زانی، ڕاستیەکەی بۆ دەرکەوت

**خَبّرَ**: رایگەیاند، بڵاوی کردەوە، گەیاندی، پێی وت

**خَبَر(نَبأَ)**: هەواڵً، پەیام، ئاواڵً، دەنگ و باس

**خُبْرَة ـ خِبْرَة**: قاڵبوون، بەسەرهاتن، پسپۆری، زانیاری، ڕۆچوون

**خَبَزَ**: نانیکرد، نانی دانً

**خَبْز**: نانکردن

**خُبْز**: نان، کولێرە، نانی دەستی، مادە، شام، شیف، سەوکی ساجی

**خَبْزَة(كَمِيَة المَخْبُوز)**: دەستەوارە، چەن نان یان چەن کولێرەیەکە کەلەسەر یەك دانرابن

**خَبَش الأشْياء مِن هَاهُنَا**: تێکەڵی کرد، دای بەسەریەکدا، ئاوێتەیکرد

**خَبَصَ بَينَهُم(أفْسَد)**: تێکیدان، نێوانی شێواندن، مابەینی تێکدان

**خَبَصَ عَلَيه(اِفْترَى)**: لەپاشملە قسەی پێوت، قسەی بەدەمەوە هەڵبەست

**خَبَص ـ خَبِيصَة**: تێکەڵً، چێشتی مجەور، نانی سواڵکەر

**خَبَطَ(ضَرَب)**: لێی دا، دایگرتەوە

**خَبَطَ البَاب**: لەدەرگایدا

**خَبَطَ اللَيل**: بەبێ ڕێنمایی ڕۆیی

**خَبَطَ الشَجَرَة**: ڕایوەشاندو پاشان گەڵاکانی هەڵوەرین

**خَبَطَ بِخَير**: پێی بەخشی بێئەوەی بیناسێت

**خَبَطَ عَشْوَاء**: بێسەروبەر، کوێرانە بەڕێکەوت، دای بەیەکا

**خَبْط**: لێدان، پیاکێشان، داگرتنەوە

**خَبْطَة**: لێدانێك، تەقەی دەرگایەك

**خَبْطَة بِخَبْطَة**: یەك بەیەك، داش بەداش، سەر بەسەر، پێبەپێً

**خَبّلَ ـ خَبَّلَ**: شپرزەیکرد، شڵەژانی، سەری سوڕمان، شێتیکرد

**خَبِلَ**: شێت بوو، تێکچوو

**خَبَل ـ خَبْل**: شپرزەبوون، شڵەژان، سەرلێتێکچوون، شێتی

**خَبَل**: قەرز، خواستن، فیتنەو ئاشووب

**خَبَل**: باڵندەیەکە دەنگی لەدەنگی بلبل دەچێت

**خَبلَت اليَدُ:** ئيفليج بوو ، لەكار كەوت

**خَبَلَه:** تێكيدا ، شێواندى، داى بەسەر يەكا

**خَبَلَه الحُزن:** غەم‌و خەفەت شێتی‌كرد

**خَبَن الثَوب:** دووری‌و بەیەكیەوە نووساند

**خَبَنَ الشَاعِر:** شاعیرەكە پیتی زەنەداری هەڵگرت (حەزفكرد)

**خَبَنَ الطَعَام:** شاردیەوە، پەنهانی‌كرد

**خَبئ:** شاردیەوە، پەنهانی‌كرد

**خَبيث( شَرير ):** دەروون رەش،نەگریس، دڵ پیس، بەد، مارِس، گومڕا، چەپخون

**خَبير:** ناوێكی پەروەردگارە، پسپۆڕ، كارامە، تێگەیشتوو، شارەزا

**خَبيز:** تریت، تلێت، تێكوشین، تێكوشیو ، نانێكە گوشرابێتە شتی شلەوە

**خَبيص:** حەلوا ، شیرینی، هەلوا، خواردەمەنیەكە لەئاردو رۆن‌و شەكر یا دۆشاو دروست دەكرێ

**خَبيط:** ئەو حەوزەی وشتر دەچێتە سەری بۆ ئاو خواردنەوەوتێكی دەدات

**خ ت**

**خَتَّار( غَدَّار ):** ناپاك ، گزی‌كەر، فێڵباز، خیانەتكار

**خَتَّال:** فێڵباز ، حیلەگر، چاوبەستكار

**خِتَام( خَاتِمَة ، نِهَايَة ،آخر ):** ئەنجام ، كۆتایی ، دوایی

**خِتَامي( نِهَائي ):** كۆتایی پێهاتوو،دوایی هاتوو

**خِتَان( خَتَن ):** خەتەنەكردن،سونەتكردن، خروسەبڕان، گون بڕین ، بڕینی پێستە پترەكەی سەری چووی منالان

**خِتَانَة:** پیشەی خەتەنەكردن، خەتەنەكار

**خَتَر( غَدَر ):** ناپاكی، گزی، فێڵ‌و تەڵەكە بازیی، چاوبەستی‌كرد

**خَتَرَت نَفسُه خُتُوراً:** خراپ‌و ناباریكرد

**خَتَّرَه:** ناپاكی لەگەڵ كرد، گزی لێكرد، فێڵی لێكرد، هەڵی خەڵەتاند

**خَتَلَ( خَدَع ):** فێڵی كرد، گزی‌كرد، ساختەی‌كرد

**خَتْل:** كونە كەروێشك

**خَتَل ـ مُخَاتَلَة( خَدَع ):** فێڵكردن ، ناپاكی، ساختەكردن، تەڵەكەبازیی

**خَتَم ـ خَتماً وَختَاماً:** مۆری كرد

**خَتَمَ العَمَل:** كارەكەی كۆتایی‌كرد، كارەی دوایی پێ هێنا

**خَتَمَ الكِتَاب:** كتێبەكەی تەواوكرد، لەخوێندنەوەی تەواوبوو

**خَتَمَ عَلَى قَلبِه:** مۆری دا لەدڵی

**خَتَمَ الشَئ وَعَلَيه:** مۆری كرد

**خَتَم الإنَاء:** سەرەكەی گرت

**خَتَمَ الجُرح:** سارێژبوو، چاك بووەوە

**خَتم:** مۆر،مۆركردن، بەروار،پەنجەمۆر

**خَتَنَ الشَئ:** بڕی، لەتی‌كرد، كەرتی كرد

**خَتَنَ الصَبي:** خەتەنەی‌كرد،سونەتی‌كرد

**خَتَن ( زَوج الإبنَة ):** زاوا، مێردی كچ، شووی كچ

**خَتَن:** باوك‌و براو مێردی كچ بۆ ژن

**خَتُور:** پیس‌و گەندەڵ، تێكچوو

**خَتِين:** خەتەنەكراو ، سونەتكراو

**خ ث**

**خَثَارَة:** تڵپە ، نیشتوو، تێكوڵ‌و تفرو تڵتەی ئەو میوەو تەماتەو شتانەیە كەئاویان گیرابێ

**خَثْر اللبَن:** مەیانی، کردی بەماست

**خَثَرَ ـ خَثِرَ:** مەیی

**خ ج**

**خَجَلَ:** شەرمی کرد، تەریق بووەوە، سووربووەوە

**خَجَلٌ:** شەرم، تەریقی، شوورەیی، ئابڕوچوون

**خَجِلٌ:** شەرمەزار، فەریکار، چاولەبەر، پۆتخستن، چاوشۆڕ، چاو بەرەوژێر، تەریق، چاوەخووار، بێڕوو، شەرمەسار

**خَجِلَ البَعِير بالحَمْل:** قورسبوو لەسەری، گران بوو

**خَجِلَ النَّبات:** زۆر و چڕبوو

**خَجِلَ بِأَمْرِه:** لێی ئالۆزو تێکەڵبوو

**خَجِلَ فِي طَلَب الرِزْق:** پەلەی نەکرد، لەسەر خۆبوو، هێواش بوو

**خَجْلان:** شەرمەندە، چاولەبەری

**خَجُول:** کەم ڕوو، شەرمن، تەریق، شەرمێوون، بێڕوویی، شەرمندەیی، کەسێکە بەشەرم بێ

**خ د**

**خَدّ الأرض:** هێڵی کێشا، کەندەڵی لێدا، کرژبوو، لۆچبوو، هێڵ هێڵ بوو

**خَدّ (وَجْنَة):** ڕوومەت، کوڵم، گۆنا، ئەلیك، سوومەت، تەختاییەکی بێمووە لەژێر چاوان و تەنیشت کەپۆوە

**خِدَاج:** گشت ناتەواویەك، کەم و کوڕی، ناتەواویی

**خُدَار:** هێلانەی زێڕ

**خُدَارِيّ:** شەوی تاریك، گەواڵە هەوری تاریك و ڕەش

**خُدَارِيَّة:** قەلەڕەش، قرك، ڕەشەداڵ

**خِدَاع:** فێڵ، تەڵەکە، فریودان، چاوبەستکردن

**خَدّاع:** فێڵباز، تەڵەکەباز، دەستبڕ، گزیکەر، چاوبەستکار

**خَدّاعَة:** وشکە ساڵ، ساڵی بێباران

**خُدّام:** نۆکەر، دەست و پێوەند، تەیان، پێشخزمەت، کارەکەر، ڕاگرتە

**خُدَّة:** کەندەك، خەنەق، چاڵی درێژ

**خَدَجَت ـ خَدَّجَت:** منالێکی نابەکامی بوو

**خَدَّدَ لَحْمَه:** کەم و لاوازبوو، کەم گۆشتبوو، لەڕبوو

**خَدَرَ بالمَكان:** نیشتەجێبوو، مایەوە

**خَدَرَ الأَسَد:** لەمێلانەی خۆی مایەوە

**خَدِرَ الحَرّ أو البَرْد:** توندبوو، سەختبوو

**خَدِرَ العُضْو تخديراً:** بێهۆش وهەستکرا

**خَدَرَ البِنْتُ:** ماڵی بۆ جیاکرایەوە

**خَدِرَ:** سڕبوو، بێهۆش بوو، سڕپەی نەما، کش بوو، مات بوو

**خَدَّرَ:** سڕیکرد، بەنجیکرد، بێهۆشیکرد

**خَدَرٌ ـ خُدْرَة:** سڕی، سڕبوون، بێهۆشی، تەمەڵی، تەوەزەلی، ساردی

**خِدْر:** ماڵیجیا، لانەی تەنیا

**خُدْرَة:** تاریکی چەتوون، تاریکی بێسرووت

**خَدَشَ ـ خَدْشاً:** عەیبداریکرد، لەکەداریکرد، ئەنگداری کرد

**خَدْش ـ خُدُوش:** ڕوشانی، چنگیلێدا، درانی، شێوانی

**خَدَشَ السُمْعَة:** ناوی زڕان، ئابڕوی‌برد، شەرمەزاریکرد

**خَدْش (أَثَر الخَدْش):** ڕوشاو، ڕوشاوی، شوێن چنگ

**خَـدَعَ:** فێڵی‌کـــرد، گزی‌کـــرد، هــه‌ڵی فریوان، یـاری پێکرد، پێـی رابـــوارد، هه‌ڵی خه‌ڵه‌تان ، ده‌ستخه‌رۆی کرد
**خَدَعَ الضَّبُّ فِي جُحْرِهِ:** چوه ناویه‌وه
**خَدَعَ المَطَر:** که‌م بـوو، لاوازبوو، کزبوو
**خَدَعَ الرَّجُل:** مـاڵی کـه‌مبوه‌وه، چیدی نه‌یبه‌خشی
**خَـدَعَ السُّـوق:** ســاردبوو، نوشســـتی به‌خۆوه بینی
**خُدْعَـة:** فێـــڵ ، ته‌ڵه‌کـــه، گێچـــه‌ڵ، فرۆفێـڵ، ته‌شـخه‌ڵه، چاچوولـــه، گـــه‌ڕ، ده‌به
**خُدَعَـة:** ئــــه‌وه‌ی خـــه‌ڵکی هـــه‌ڵی ده‌خه‌ڵه‌تێنێ
**خُدَعَة:** ئه‌وه‌ی زۆر فێڵبازه
**خَـدَمَ:** خزمـه‌تی‌کرد، بـــه‌ده‌وروو خولیـا هات
**خَدَمَ الأَرْض:** کێڵای، چاندی، خـــزمه‌تی زه‌ویه‌که‌ی‌کرد، کشتوکاڵی‌کرد
**خَدَّمَ:** به‌کاری هێنا ، به‌گه‌ڕی خست
**خَدَّمَ الرَّجُل إِمْرَأَتَه:** پاوانه‌ی له‌پێکرد
**خَدَّمَ الخَشَب:** سافیکرد، ڕێکی‌کرد
**خَـدَم:** ئیشـکه‌ران ،نۆکـــه‌ر، کاره‌کـــه‌ر، ده‌ستو پـێوه‌ند، ته‌یان، پێشخزمه‌ت
**خِدْمَة:** کـــار، ئیـش، خزمـــه‌ت، راژه، یارمه‌تیدان، کارگوزاری
**خَدْمَة:** یه‌ك کاتژمێر له‌شه‌وو رۆژ
**خَدَمَة:** پاوانه ، ساق ، لاق
**خِدْن:** هاوڕێ، براده‌ر، هاوڕێی گیـانی بـه‌گیانی، دۆسـتی سه‌رانســـه‌ر ، یـار ، دۆست
**خُدْنَـة:** ئـه‌وه‌ی دۆسـتایه‌تی‌و بـراده‌ری ده‌به‌ستێ له‌گـه‌ڵ خه‌ڵکدا

**خَـدُوج:** نـــاته‌واو، نابـــه‌کام ، ناکـــام ، نه‌به‌کام ، نوقسان
**خَدُوش:** یه‌کێك زۆر روشا بێت
**خَدُوع:** فێڵاوی، فرۆفێڵاوی
**خَدِيج:** کـه‌لکردن ، ناته‌واویی، نوقسان کردن
**خَدِيعَـــة:** فێڵکـــردن، گزی‌کـــــردن، له‌خشته‌بردن ،فریودان، هه‌ڵخه‌ڵه‌تاندن
**خَدِيـن:** هـــاوڕێ ، بـــراده‌ر، دۆســـــت ، خۆشه‌ویست
**خُدَيوي:** نازناوی پادشـاکانی میسـره ، ئـه‌م وشه‌یه فارسی‌یه بـه‌مانای پادشـاو وه‌زیرو گه‌وره هاتووه

**خ ذ**

**خَذَف:** په‌له پیتکه یا بـه‌دارو لاسـتیك به‌ردی هاویشت
**خَذَّفَ بِالسَّيف:** خێرایکرد، په‌لـــه‌کانی قرتاندو بڕی
**خُذْرُوف:** خێرا رۆیشتـــــوو، ره‌وگه‌وشتر
**خَذَلَ:** ده‌ستی لێهـه‌ڵگرت،وازی لێـهێنا، دواکه‌وت ، شکانی
**خَذَلَ فُلانـاً وَعَنْـه:** وازی له‌پشـتگیری‌و هاوکاریی هێنا
**خَـــذَّلَ عَنْـــه أَصْحَابَـــه:** شکســـت‌و ســــه‌رنه‌که‌وتنی خســـته ئه‌ســـــتۆی هاوڕێکانی
**خَذَلَت الظَّبِيَة:** له‌هاوڕێکانی دواکـه‌وت ، لێیان جێما ، له‌ره‌وگه‌که‌ی جیابوه‌وه
**خَذُول:** دواکه‌وتوو،به‌جێماو، پاشه‌به‌ره

**خ ر**

**خَرَ المَاء:** خوره‌ی هات ، هـاژه‌ی هـات، ده‌نگێکی لێهات

**خَرَّ النَّـائِم(شَـخَر):** پرخـەی هـات، دەنگێکە لەخەوتوو بەرزدەبێتەوە

**خَـرَّ لله سَـاجِداً:** کڕنوشـی‌برد بـۆ پەروەردگار

**خَرَّ الرَّجُل(مَـات):** مـرد ، بـەلادا هـات، گیانی سپارد

**خَرَّ لوَجْهِ:** بەروودا کەوت، بەدەما کەوت

**خَـرَّ عَلَيـه:** هێرشـی بـرد لەجێگـەو شوێنێکی نادیارەوە

**خُـرّ:** گوێچکە ،ئـەو جۆگەیـەی لافـاو دروستی دەکات

**خَرَاب:** روخـان ، وێران بوو، کاولبوون، رمان

**خَرَابَـة:** کـەلاوە ، وێرانـە، خەرابـە، خۆڵەکەوان، قافی، کەمیل، کەیلـەکۆن، کەلین، خانووی رووخاوو وێران

**خُرَابَة:** چالآیی ، کلۆتەی سمت

**خَرَابِيش الخَط:** تێکچوون، شێوان

**خَـرَاج:** بـاج، دەسکەوتانە ، سـەرانە، زێرەسـەر، خـووك، باجێکە لـەمو لـەو دەسێنرێ لەجیاتی سەری خۆی

**خُرَاج:** دومەڵ، زوخم، قوونێر

**خَرَادِل:** کوتەگوش ، گوشی پارە،پارە

**خَرَادِيل:** گۆشتی پارە پارەکراو

**خَرَار:** هاژە هاژ

**خَرَارَة:** یاری منالآنە

**خَـرَّازَة:** پیشـەی موروکون کـردن یـان نقێمو پـیرۆزە پێوەکردن

**خَرَاس:** خواردنی کاتی منالبوون

**خُرَاشَة:** تەراش ، لێکردنەوە، تاشین

**خَرَّاص:** درۆزن ، درۆکار

**خَرَّاط:** تۆڕنەچی ، خەڕات

**خَرَاطَـة:** تـەلاش ، وردە، هـەوول، تۆلاش، تۆلاشە، تەڵەزمی تـەنك لـەدارو شتی‌تر

**خَرَاعَة(فَزَّاعَـة):** داهـۆڵ، داوەڵـە، هەراسە، مەترەس، شتێکە وەك مـرۆڤ لـەدار دروست دەکرێو پـەڕۆو جـلو بەرگی پێدا دەکرێو لـەنێو کشتوکاڵدا دەچەقێنرێ بـۆ سـڵەمینەوەی باڵندەو پەلەوەر

**خُرَافَة:** پروپـووچ ، بـاوەڕی پـووچ، ئەفسانە

**خَرَاف:** چینینەوەی بەروبووم

**خَـرِبَ:** وێران بـوو، کـاولبوو، رووخـا، رما،تێکچوو، سمی، کونی‌کرد

**خُرْب ـ خُرْبَة:** قولآیی،کلۆتـەی سمـت ، چالآیی، کونە سوژن

**خَرِب:** روخاو ، وێران ،کاول ، رماو

**خَرِبَ:** وێران بوو، کاولبوو، تێکچوو

**خَـرِبَ البَيـت:** روخـانی، تێکیـدا، هەڵیوەشاند

**خَرِبَـة ـ خَرَبَـة:** کـەلاوە ، وێرانـە، خەرابە،خۆڵەکەوان، کەمیل ، کەیلەکۆن

**خُرْبَـة:** مێڵـەك ، عـەیب، ناتـەواویی، پی‌هەڵخلیسکان، خراپەکاری لەئایندا

**خَرْبَش الكِتَـاب أو العَمَـل:** تێکیـدا، شێواندی، دای بەسەر یەکدا

**خَرْبَق أسْوَد:** خەربەند، گیایەکی بـەرزە تووێکـی وردی هەیـەو دووکەڵەکـەی بـۆ ئەندامی قڵیشاو باشە

**خَرْت الأذُن:** کونی‌تێکرد، سمی

**خَرْت الأرض:** زانی رێگەی لێ‌ون نەبوو

**خَـرْت ـ خُـرْت:** کونـە دەرزی، پەراسوویەکی بچووکە لای سنگەوە

**خَرَجَ:** چوه دەرەوە، دەرچـوو،سەری دەرهێنا ، دەرپەڕی
**خَرَجَ بِه:** دەرپەڕاند ، دەریکرد
**خَرَجَ عَلَيه:** بۆی دەرپەڕی، بۆی هاتـە دەرەوە
**خَـرَجَ عَنْـهُم:** لێیـان جیـابوەوە، بەرەیەکی لێکردنەوە
**خَرَجَ فِي العِلْم:** بەهێزبوو، بەتوانابوو
**خَـرَّجَ:** دەریهێنـا، خسـتیەدەرەوە، دەریکرد، لای برد، بواردی، پەڕانی
**خَرْج:** خەرج کردن، دان، سەرفکردن
**خَرْج( كَشْكَش ):** دوگمەو قـەیتانی جلو بەرگی ژنان
**خُرْج( كِيس ):** تورەکە، گونیە، جـەوالْ، خەرار
**خَرْجَاء:** ئـاژەلی سپیو رەش، ماشو برنجی
**خَرْجَة:** دەرچوونێك، یـەکجار هاتنـە دەرەوە، ریو رەسم،ناشتن ، نمایشو دەرخستن
**خُرْجَـة:** زۆر هاتـەدەر، دەرتۆقیـوو، دەرپەڕیوو
**خَرْخَرَ النَائِم:** پرخە پرخیکرد
**خَـرِد:** بێدەنـگو کـەم دوو، نقـەی لێنەهاتوو
**خَـرِدَت البِنْتُ:** کچیـوو، دەسـتی بـۆ نەبرابوو، کچێنی نەپەڕێنرابوو
**خُرْدَة:** وشـەیەکی فارسـیە مەبەسـت وردە یان پارچەو کەرتە
**خُرْدَجِي:** وردەوالـە فـرۆش، فرۆشـتنی وردەواڵە
**خُرْدُق:** ساچمە گلۆلە، تۆپینەی بچووك

**خَـرْدَلَ اللحْم:** کوت کـوتیکرد، پـارە پارەیکرد، جنی
**خَرْدَل( نَبَات ):** خەرتەلە ، گولە زەردە، هێرۆ، هەلمەلە ، گولێکی هەمە ڕەنگەو بێبۆنی کەویو کێوانییە بـۆ چاوئێشە بەکاردێو بنکەکەی دەنرێ لـەبرینو زوو دەری دەکات
**خَرَزَ( ثَقَب ):** کونیکرد، سمی
**خَـرَزٌ:** مـوروو ، مـتو مـوروو، نقێـم ، پیرۆزە
**خَرْز:** ئێش‌وژانی چەقینی شتێك بەگیانا
**خَرَزَ- خَرْزاً:** بەهێزی کرد دوای لاوازی
**خَرْزَة:** مورویی ریزکراو، رشتە موروو
**خَرْزَة البِئْر:** دیواری بیر، قەراخی بیر
**خُرْزَة الظَهْر:** بڕبڕەی پشت، بڕبڕاگە
**خَرِس:** لالبوو، بێدەنگ بـوو، زمـانی بەسترا، ورتەی نەهات، نوتقی نەما
**خَـرُس عَلَى النُفَسَاء:** خواردنـی پێـدا لەکاتی منالْ بووندا
**خَـرَس:** لالـی، گوتـەو قسـە بۆنـەهاتن بەهۆی گرفتو نەخۆشـیەك کەلـەزگماك یان بارێکەوە دێت بەسەر مرۆڤدا
**خِـرْس:** ئـەو زەوییـەی بـۆ کشـتوکالْ ناشێت
**خَرْسَاء:** بـەلا، گرفت، ئافـات، هـەوری بێ بروسکە
**خَرَسَـانَة:** کۆنکرێـت ، چیمـەنتۆ، چەمـەنتۆ، جـۆرە لمێکـی شـینکارە لەگـەلْ لمو خـز تێکـەلْ دەکرێـتو دەگیرێتـەوەو لەقسلْ بـەهێزترە بۆنـاو ئاوو بۆ سواخی دیوارو سەربانان
**خُرْسَة:** خواردنی ژنی زەیستان،ئەوەی تازە منالی بوە

**خَرَش:** روشاندی، بریندارى كرد

**خَرَشٌ( ذُبَابٌ ):** مێش، مەگەز، مێشووله

**خَرَش الغُصن:** رایكێشا، هێنای بەلای خۆیەوە

**خَرَش لِعِيَالِه:** بژێوی بۆ پەیداكردن

**خَرْش:** شتومەكی ناو ماڵ

**خَرْشَاء:** توێكڵی مێلكە

**خَرْشَاف:** ئەو زەوییەی كەسەختەو رۆیشتن ناكرێ بەسەریدا، سەختە زەوی

**خَرْشَة:** شتومەكی ناوماڵ، كەل و پەلی ناوماڵ

**خَرْشَفَة:** قسەی تێكەڵو پێكەڵ

**خَرْشُوف( نَبَات ):** كەرتەشی، گیایەكی بەهاریی دڕكاوییە نێركێكی باریكی بەرزی هەیە لەسەرەوە ئەیكا بەتۆپزێكی دڕكاویی، تووی كنگر

**خَرَصَ:** درۆی كرد، راستی نەكرد

**خَرَصَ فِي الأَمْر:** قەبلانی، بەگومان قسەی تێداكرد، خەملاندی، بەهەوانتە داینا

**خَرَصَ الشَّئ:** چاكیكردەوە، باشی كرد

**خُرْص:** ئەندازەیەكی خەملێراو،كورتە تیر ، زەمبیله

**خَرَطَ الخَشَب وَالمَعْدَن:** تۆرنەیكرد، خەڕانی كرد

**خَرَطَ الوَرَق:** بەراكێشان لەدارەكەی داماڵی

**خَرَطَ العُود:** رێكیكرد،ئەندازەگیری كرد

**خَرَطَ العَمُود:** درێژی كرد هەروەك عەمود

**خَرَطَ الرَّجُل:** درۆیكرد، راستی نەكرد

**خَرَطَ الجَوَاهِر:** كۆیكردەوە لەقوتو یان هەگبەكەیدا

**خَرَطَ( قَطَعَ ):** بڕیەوە، لەت لەتیكرد، لەخرتیدا

**خَرْط:** تۆرنەچێتی ، خەڕاتی

**خَرْطَم ـ خَرْطَمَة:** كێشای بەلمۆزیدا، كێشای بەدەمو پلیدا

**خُرْطُم ـ خُرْطُوم:** لمۆز، لەمبووز، لەوچە، كەپیلەف، شرنە، پۆز، دەمو لێوی ولاخو ئاژەلانە ، لمۆزی فیل

**خَرْطُوش( طَلْقَة ):** فیشەك

**خُرْطُون( دِيدَان الأَرْض ):** كرمی زەوی

**خَـرِعَ ـ خَـرُعَ:** لەشی خاوبوەوە، جەستەی شلو هێواش بوو

**خَرَعَ الشَّئ:** لەتیكرد، دروستیكرد

**خَرُوع( نَاعِم ):** نەرم ، نەرمو شل، شله پەتە، نیانه

**خِـرْوَع( نَبَـات الخُـرُوع ):** گەرچەك، گەنەك، گیایەكی گەلاپانی لاسك بۆشه بەرێكی چەور ئەگرێ رۆنەكەی بۆ رەوانی ئەخورێو دەدرێت بەئافرەتی دووگیان بۆ پێشخستنی بەرەژانیو نزیك بوونەوەی وادەی منالبوونی

**خَرِيع ـ خَـرُوع مِنَ النِّسَاء:** شلەپەتی، شلو شێواو

**خَرِيع مِنَ الرِّجَال( ضَعِيف ):** لاواز ، بێهێز ، بێ ورە، سیس

**خَرِفَ ـ خَـرَّفَ الشَّيخ:** خەلەفا ، عەقلی تێكچوو ، لێی قەوما

**خَـرَفَ( هَـتَر ):** خەلەفان، خەرفان، شێوان لەبەر پیری

**خَـرَفَ الثَّمَـر:** چنیەوە، كۆیكردەوە، هەڵی گرت

**خُرِفَتِ الأَرْض**: بارانی پایز لێیدا
**خَرَّفَ الشَيّ**: تێکەڵیکرد، ئاوێتەیکرد
**خَرْفِيّ ـ خَرَفِيّ**: بارانی پایز
**خَرَقَ الثَّوبَ خَرْقاً**: لەتو پەتیکرد درِاندی، پارچە پارچەی کرد
**خَرَقَ فُلاناً بِالرُمْح**: بریندارییکرد،پێکای
**خَرَقَ الكَذِب**: دروستیکرد، هەڵیبەست
**خَرَقَ المَفَازَة**: بڕی تاگەیە ئەوپەڕی
**خَرَقَ الرِيح**: هەڵیکرد، گێژەڵوکە داهات
**خَرَقَ النِسَاء وَفِي البِنَاء**: کونیکرد، دەروازەو دەلاقەی تێخست
**خَرَقَ العَادَة**: یاسای کۆمەڵایەتی خستە لاوە، دەستوورو باوی شکاند
**خَرِقَ ـ خَرُقَ**: گەوج بوو، گێل بوو، کەودەن بوو
**خَرْق( ثَقب )**: کون کردن ، سمین
**خَرَق( حَمَاقَة )**: گەوجی، کەودەنی
**خَرْقَاء( أحمَق )**: گەوج ، کەودەن، گێل، زلحۆ ، سەپۆلە، گەمژە، ژنی گەمژەو گێل ، زەوی پانو بەرین ، رەشەبای توندو بەهێز
**خِرْقَة**: پینە،سیپاڵ، پەرۆشڕ، چەپاڵ، ریزاڵ
**خَرِمَ ـ خَرْماً**: کونیکرد، سمی
**خَـرِمَ ـ خَرَامَة**: خاوەن خراپەو نارِەواییبوو
**خَرْم**: هەڵکۆڵین ، کوشین
**خَرَمَ عَنْ الطَّرِيق**: لایدا ، ترازا، دەرچوو لەرێ
**خَرْمَاء**: گوێ سمراو
**خَرَمَة**: لوتەوانە، خەزێم ، قوڵفەیەکی زێڕینە ژنان ئەیکەنە لووتیان بۆ جوانی

**خَرْمَشَ الكِتَاب**: سرِیەوە، لایبرد
**خَرْمَشَة**: تێکدەر ، گێرە شێوێن
**خُرُوب**: بوو بە دز ، بوو بەجەردە
**خَرُّوب( نَبَات )**: خرِنوك، گیایەکە بەبەرەکەشی هەردەڵێن خرِنووك بەڵان، بەرەکەی درێژکۆلەو تفتەو بەشێوەی گورچیلە ئەچێ ئەگەر بەتازەیی بکوترێ لەگەڵ زەردێنەی هێلکەدا بشلەقێ وەك رۆنی لێدێو بۆ چاوئێشە بەکاردێو بۆ چەندین نەخۆشی تریش بەشێوازی تر بەکاردێت بەئاوێتەکردنی لەگەڵ شتیتردا
**خُرُوج**: چونە دەرەوە، سەرهەڵدان، رۆژی زیندوبوونەوە
**خُرُود**: کچ ، دەست بۆ نەبراو، سەرمۆر، نەژاکێنراو
**خُرُور**: کەوتنە خوار لەسەرەوە بۆ خوارەوە
**خَرُوس**: یەکەم سکی ژنی دووگیان، ژنی کەم شیر، تۆبەرە
**خَرُوع**: شلەپەتە، رۆن گەرچەك
**خَرُوف**: بەرخ ، بەران ، شەك
**خِرِّيت**: رێنوێنی شارەزاو زانا
**خِرِّيج**: دەرچوو، تەواوکار
**خَرِيد ـ خَرِيدَة**: کچ ،دەست بۆ نەبراو ، ژنی بەشەرمو حەیا
**خَرِير**: خورەی ئاو ، هاژە، هاژە هاژ، خورە خور
**خَرِيطَة**: نەخشە، خەریتە ، شکڵی وڵاتو سەرزەمینیان لەسەر کاغەز
**خَرِيع**: لاواز ، کەم توانا ، بێهێز
**خَرِيف**: پایز ،خەزان ، گەڵارێزان

**خَرِيفِيٌّ**: پایزه ، پایزیی
**خَرِيم**: بێباك ، بێحەیاو شەرم
**خز**
**خَزَّ الحَائِط**: درکەزێی دانا لەسەری تا سەر نەکەون پێیدا
**خَزٌّ**: ئاوریشم، ئارمووش، هەفرووشم، شتێکی جوانی نەرمی بریسکەدارە لەجۆرە کرمێك پەیدا ئەبێو تەنراوەو پارچەی نایابو بەنرخی لێ پەیدا ئەبێ
**خَزَى**: شەرمەزاربوو، تەریق بوەوە
**خَزَّاف(بَائِع الخَزَف)**: گلێنە فرۆش
**خِزَام ـ خِزَامَة**: ئەلقەی لوت لغاوی پێوە ئەبەسترێ، لوتەوانە، خەزێم
**خُزَام ـ خُزَامِي**: سمڵ ، هەلاڵە، سۆتکە سونبول ، گەردەشەبەندی کچانە لەمێخەكو شتیتر دروست دەکرێ
**خَزَّان**: حەوز ، عەنبارە ئاو
**خَزَّانَة**: شوێنی هەڵگرتنی ئاو
**خَزَرَ ـ خَزِرَ**: بەلاتیرە سەیریکرد، مۆربوەوە،خێسەیکرد،چاوی لێمۆرکرد
**خَزَرَ الشَّئَ**: تەسککار،بواری لێهێنایەوە یەك
**خَزَر**: چاو بچووك ،چاو کونە سوژن
**خُزْرَة**: هەڵگەڕانەوەی چاو،شێواوی لەتێڕوانیندا
**خُزَعْبِل ـ خُزَعْبِل**: قسەو گوتەی پڕوپووچ، قسەی بێتام ، قسەی بێماناو بەتاڵ
**خُزَعْبَلَة**: میوە، گاڵتەو گەپ، خەندە هەڵگر ، دڵخۆشکەر
**خَزَف(فُخَّار)**: گلێنە، گۆزەو دیزە، چینیو فەخفوری
**خَزَفَ في مَشْيَتِه**: دەستی راوەشان
**خَزَفَ الثَّوب**: دڕانی، دایدڕی، پیاکرد، پیاچەقان
**خَزَفِي(صَانِع الخَزَف)**:گۆزەکەر، گلێنە دروستکەر
**خَزَق**: دڕین ، شقڵکردن، شقڵ تێخستن
**خَزَلَ خَزْلاً**: پشتی شکا، پردی هەناوی بچڕا
**خَزَّلَ الشَّئَ**: شکاندی، کەرتیکرد، لەتیکرد، پارچە پارچەیکرد
**خَزَمَ الآلي**: ڕێکیخست، هەڵیبەست، کردی بەپەتەوە
**خَزَمَ الأَنْفَ**: لوتەوانەی کردەلووتی
**خَزَم**: درەختێکە پەت لەگەڵاکانی دروست دەکرێت
**خَزَنَ المَال**: کۆیکردەوە، جەمیکرد، پەسمەندی کرد
**خَزَنَ السِّر**: پاراستی، پارێزگاری لێکرد، پەسیسەی کرد
**خَزَنَ اللِّسَان**: وتەو قسەی لێ قەدەغەکرد
**خَزَنَ اللَّحْمُ خَزْناً وَخُزُوناً**: بۆگەنیکرد، گەنی
**خَزَنَ الجُرحُ( تَقَيَّح)**: کێمی تێزا
**خَزْن( حِفْظ الشَّئ في المَخْزَن)**: عەمارکردن،پەسیسەکردن، هەڵگرتنی شتێك
**خَزْن( إِخْفَاء وَإِدْخَار)**: کۆکردنەوە، شاردنەوە،پەسمەندەکردن، خەزنکردن
**خَزِنَة**: دۆلاب ، کەنتۆر ،جلبەند، کتێبخانە، قاسە ، گەنجینە
**خَزِيَ**: سووكو ریسوابوو، ئابڕوی چوو

**خَزِيَ مِنْهُ**: شەرمیلێکرد، تەریق بووەوە
**خَزِيَ( عَار )**: ئابڕوچوون، ئابڕوبردن
**خَزِيَ( خَجِلَ )**: شەرم،تەریق بونەوە، بەسەر خۆدا هاتن، بەخۆدا ڕۆچوون
**خِزْيَة ـ خَزْيَة**: بەلا ،ریسوای سزا، دووریی
**خَزِن**: گۆشتی بۆنکردوو، گۆشتێك بۆگەنی کردبێت
**خَزِينَة**: سامان، گەنج، سامانگەر، گەنجینە

**خ س**

**خَسَّ**: رسوابوو، سووك بوو، کەمبووەوە
**خَسَّ نَصِيبَه**: کردی بە چاوچنۆك و ریسوا
**خَس( نَبَات )**: کاهو، کاهی، گیایەکی گەڵاپان و ناوەڕۆك چەورو سەلکدارە زۆرتر بەسرکەوە ئەخورێ
**خَسُّ الحِمَار ـ خَسُّ البَقَر**: دووگیان
**خَسَارَة**: دۆڕاندن ، لەکیس چوون، تێنان، لەدەستدان، زیان پێگەیشتن ، فەوتان
**خَسَاسَة**: رسوایی، سووکی ، نزمی
**خُسَاسَة**: ماڵکەمی، لاوازیی دارایی، نەختێك ماڵ و سامان
**خَسَالَة ـ خُسَالَة**: خراپی هەموو شتێك
**خَسَان**: ئەو ئەستێرانەی ئاوا نابن یان ون نابن
**خَسَأَ الكَلْبُ**: دەریکرد ، دووریخستەوە
**خَسَأَ البَصَرُ**: لاوازو نابینابوو، کەم حوکم بوو
**خَسِرَ ـ خَسَرَ**: دۆڕاندی، ونیکرد، فەوتاندی، لەدەستی چوو، تێی نا،فەوتا، زیانیکرد، وێڵ بوو،خراپبوو

**خَسَّرَ**: پێی دۆڕان ، لەکیسیدا، زیانی پێگەیاند، زەرەری لێدا
**خُسْر**: دۆڕاندن،لەکیس چوون، فەوتان ، تیاچوون، بەهەدەر ڕۆیین
**خَسَفَ القَمَر**: گیرا ، مانگ گیرا
**خَسَفَ ( غَار ـ هَبَط )**: دا تەپی، قوپا، چوو بەناوا، ڕۆچوو
**خَسَفَ المَكَان**: ڕۆچوو بەناخی زەویدا
**خَسَفَ العَيْن**: ونبوو، دیار نەما
**خَسَفَ السَّقْف**: رما ، رووخا، تەپی
**خَسَفَ الشَّئ**: کەم بوو، کزبوو
**خَسَفَ الرَّجُل**: لاوازبوو، سیس بوو
**خَسْف**: قوپان ، تەپین، ڕۆچوون، نەوین،داڕوخان، سووکی، ناتەواویی و کەم و کوڕی
**خَسَلَه ـ خَسْلاً**: ریسواو دووری خستەوە
**خُسُوف**: مانگ گیران ، گیران
**خَسُوف**: ئەو بیرانەی لەناوچەی بەردەلان هەڵکەنراون و ئاویان وشك ناکات
**خَسِيّ**: پێستەی خراپ، خراپە پێستە
**خَسِير**: گومڕا ، تێکچوو، فەوتاو، بەدبەخت، سەرگەردان، وێڵ
**خَسِيس( دَنِئ )**: سووك، رسوا، ناپیاو، نامەرد، بێنرخ ، قەمترە
**خَسِيف**: بیری پڕ لەئاو ، وشتری تیژ ڕەوی خێرا لەزستاندا، ئەو هەورانەی ئاوێکی یەکجار زۆریان هەڵگرتووە
**خَسِيل**: سووك ، رسوا ، نزم ، کەم نرخ

**خ ش**

**خَشَّ**: چوە ناو ، داغڵ بوو
**خَشَّ البَعِير**: دەمەوانەی کردە دەم

**خَشَّ زَيْداً :** برینداریکرد،زامداریکرد
**خَشّ :** بارانیکەم، شەقڵکردنی شتێك
**خَشِيَ :** ترسا ، تۆقی ، زتۆقی چوو
**خَشِيَ عَلَيْه :**بـۆی ترسـا،لەچارەنووسی ترسا
**خُشَّاء :** ئێسکی پشت گوێ
**خَشَّاب :** دارفرۆش
**خُشَار ـ خُشَارَة :**خراپـی هەمووشـتێك، پاشمـاوەی سـەر خـوانو سـفرە ، خراپترین جۆری خەڵك
**خُشَاش :** ئاژا ، خرپا ، نابار
**خَشَـاش :** مـێروو پەلـــەوەری ســەر زەوی ، ماری سەر شاخ
**خُشَاف( خُفَاش ) :** شەمشـەمە کوێـرە، مێژونـك ، چەکچەکیلــە، باڵندەیەکــە سكو زادەکاو لاقی بەباڵەکانیەوەیەتی
**خَشَــاف :** جــۆرە شـیرینیەکە لـەمێوژ دروست دەکرێت
**خُشَّام :** لوت زل، لووت فش
**خَشَـبَ الشَّـئَ بِالشَّـئ :** تێکــەڵیکرد، ئاوێتەی کرد
**خَشَــــبَ الشَّـــئ :**هـــــەڵیبژارد، دەستنیشانیکرد
**خَشَــبَ السَّـــيْف :** دروســـتیکرد، وەبەریهێنا
**خَشَبَ الشِّـعْر :** بـــێبیرکردنەوە وتــی، بۆیهات
**خَشُبَ :** بوو بەدار، رەق بوو
**خَشَبْ :** دار ، تەختــە، نـەرد، مردیــاك، دەبك، دیبەگ، دارێکی پانو تەنکە سا درێژبێ یان کورت
**خَشْبَاء :** زەوییـــەکی ســـفتو ســـاف کەلەبەردو زیـــخو قورِ پێکهاتبێت

**خَشَبَة :** دار ، بڕەدار، تەختە
**خَشَبِي :** دارین ، لەدار دروستکراو
**خَشْـخَاش :** روەکێکــی بێهۆشــکەرە، خەشخاش
**خَشْخَش :** خشەی هـات ، ورشـەی لێـوە هات، سرپەی هات
**خَشْخَشَــة ـ شَخْشَــخَة :** ورشــە،خشــە، تەقە ،شەقە، شەپە، تەپە
**خَشَرَ :** لەسەر سفرەو خوان مایەوە
**خَشْرَم :** کۆمەڵە هەنگێك، شا هەنگ
**خَشَعَ :** سەری شۆڕکرد، ملـی کـەچکرد، خۆی دا بەدەستەوە
**خَشَعَ بَصَرَه :** چـاوی شـۆڕبوو، سـەری نەویکرد
**خَشَـعَ الصَّـوْت :** بێدەنگبـــوو، ورتـــەی لێوە نەهات
**خَشَعَ الشَّمْس :** نزیك بوو ئاوابوونی
**خَشَـعَ الـوَرَق :** هــەڵوەریی ، وەریــی، کەوتەخوارەوە
**خَشَعَ الأَرْض :** وشکبوو، باران نەباریی
**خُشْعَة :** تەپۆڵکە ، زەوی نزم
**خَشْعَة :**مردنی ژنێکی سکپڕ،پاش مەرگە
**خُشَـف :** بەچــەی ئاسـك کەیەکــەمجار لەدایك دەبێت
**خَشْف :** دەنگ، جووڵەو هەستی پەنهان
**خَشَف :** بەفری زبر ، بەستوی رەق
**خَشَفَة :**دەنگی رۆیشتنیمار،خشـەخشی مار، زەوی بەرزو نزم
**خَشَمَ :** لووتی کرایەوە،لووتی فشبو
**خَشَمَ الأَنْف :** بۆگەنیکرد، بۆنیهات
**خَشَّمَ :** بۆگەنیکرد، بۆنی بڵاوبوەوە
**خَشْم :** لووت، کەپوو، پت ، لویت،کەپ، بێڤل، بێفل

**خَشُنَ**: زبربوو، رەقبوو، سەختبوو

**خَشَّنَ( جَعَلَه خَشِناً )**: زبریکرد، سەختیکرد، رەقیکرد، توندیکرد

**خَشِنٌ**: درشت، رەق، هەراش، زبر ، وشك

**خَشِنُ الأَخْلاق**: بیٚشەرمو حەیا

**خَشْنَاء**: گیایەکی زبرە، زلە ژن،سوپای پڕ چەك

**خُشُوع**: کڕنووش بردن، ڕێز

**خُشُونَة**: زبری ، رەقی، سەختی، درشتی

**خَشِيَ**: ترسا ، تۆقی، بارێکی نائاسایی رووی تێکرد

**خَشْيَاء**: ترسناك ، هەراسان

**خَشِيب**: کەم گۆشتی، بەهێز ، ئەو شمشێرەی سەرەتا دروستی کرد

**خَشْيَة**: ترسو بیم، زات ، بیم

**خَشِيف**: زبرە بەفر، زافەرانی وشك

## خ ص

**خَصَّ**: پەسەندی کرد، گونجانی، بەشیاوی دانا

**خَصَّ فُلاناً بالشَيْ**: ئەوی تایبەتکرد پێی

**خَصَّ الشَيْ لِنَفْسِه**: بۆ خۆی هەڵبژارد

**خَصَّ بِه**: وابەستەی بوو

**خَصَّ ـ خَصَاصَةً وَخَصَاصاً**: هەژارکەوت ، بیٚدارایی مایەوە

**خُصّ**: کوڵە مانگ، ئەو مانگەی سی رۆژ تەواو ناکات

**خُصّ**: دوکانی مەیفرۆش، ماڵە دارینە ، کەپر، قوڵخ. کوخته

**خَصَى ـ خِصَاء**: خەساندی، یەختەی کرد، گونی دەرهێنا

**خِصَار( إِزَار )**: شەرواڵ ، پانتۆڵ، جل و بەرگ

**خَصَاص**: کون ، درز ، دەلاقە، پینە، هەر ناتەواویەك لەدەرگاو هەرشتێکی دیکەدا بێت

**خُصَاصَة**: ئەو ترێیەی بەدارمێوەوە دەمێنێتەوە دوای چنینەوەی ترێکەی

**خَصَّاف**: درۆزن ، کەوش درو

**خِصَام** : ناکۆکی ،دوژمنایەتی،مشتو مڕ، شکاتو شکاتکاری

**خُصَان ـ خِصَان**: گەورە، پیاوماقوڵان، سەردار، سەروەر

**خَصِبَ**: بەپیت بوو، بەپێز بوو

**خَصَّبَ**: بەپیتیکرد، پەینی تێکرد

**خِصْب**: پیت،بژوێن،بەرهەم زۆری، بوم

**خَصِرَ اليَوم**: ساردی کرد، سەرما داهات

**خَصِرَ الرَّجُل**: سەرما ئێشو ئازاری پێگەیاند، رەق بووەوە

**خَصَر**: سەرما، سەرد، ساردی هەوا، سۆڵە، بەرواژی گەرمایە

**خَصِرٌ**: سارد، ساردی هەوا ، چەییك، سەهۆڵو بەفر ، دژی گەرمییە

**خَصْر( وَسَط الإِنْسَان )**: ناوقەد، کەمەر

**خَصَّصَ**: تەرخانیکرد،بۆ مەبەستێك ئامادەیکرد

**خَصَّصَ الشَيْ**: تایبەتمەندیکرد

**خَصَّصَ بالشَيْ**: تایبەت بەو بوو

**خَصَفَ الشَيْ عَلَى الشَيْ**: چەسپاندی ، نوساندی، لکاندی

**خَصْف**: نەعل

**خُصْفَة**: کون ، درز، شەقڵ ، دەلاقە

**خَصَفَة:** جلو بەرگی رەق و زبر
**خَصَلَ الشَّئ:** بچڕانـــدی، لەیــەکی جیاکردەوە
**خَصَلَ القَوم خَصْلاً وَخِصَــالاً:** زاڵبــوو بەسەریاندا لەئەندازە گیریدا
**خُصَل:** شۆڕە پەلی دارو درەخت
**خَصْل:** تیری نزیك مەبەستونیشان
**خُصْلَة:** قژی کۆبوەوە، ئەندام،چەپـــك، قول، هێشوو، پەلکە
**خَصْلَة:** خوو ، رەوشت، پیشە، رەفتار، جر، بانەك، نەریت، پرەنگ، کەنشت
**خَصَمَ:** زاڵبــوو، ســەرکەوت ، بــەزانی، شــکانی ، دایشـــکان ، لێیدەرکـــرد ، نرخەکەی کەمکردەوە
**خَصْم:** دوژمن ، دژیار، نەیار، یەکێك لە نەیاران، ناحەز، نەیار
**خُصْم:** لا ، تەنیشت ، گۆشە
**خُصُوبَة:** ساڵی پڕ خێرو بەرەکەت
**خُصُوص:** بۆنــە ، بــارە ، دەربــارەی، بە بۆنەی..
**خُصُوصاً ـ خَاصَةً( لاسِيَمَا ):** نەخوازەلا ، بەتایبـــەتی، نـــەمازە، وتەیەکــــە بــــەکاردەهێنرێ لــــەجێی وتــــەی بەتایبەتی
**خُصُوصِــــي:** تایبــــەت، تایبـــەتی، تەرخانکراوە
**خُصُوصِيَّــة:** چۆنیــەتیو شــێوەیەکی تایبەتی، شێوازێکی جیاواز
**خُصُومَة:** ناکۆکی ، دوژمنایەتی، مشتو مڕ، داواکەری، شکاتو شکاتکاری
**خَصِّي:** ئــــەوەی ئێـشو ژان لــەگونی دەداتو لەئەنجامدا دەری دەهێنێت

**خَصِيــب:** بــەپیت، بەفــەڕ ، بەبرشــت، بەپێز
**خُصْيَة:** گون ، باتوو، گونەویلە، هێلك، رەتل
**خَصِيف:** خۆڵەمێش، شیرێکە بۆ ماست دادەنرێت
**خَصِيلَة:** ئەو گۆشتەی رەگی تێدایە
**خَصِيم:** دوژمن ، دژیار ، نەیار

**خ ض**

**خَضّ:** شڵەقانی ، رایـوەشان، ترسـانی، تۆقانی، دای خورپان ، رای چڵەکان
**خَضَّ اللبَن:** ژەنی، رایوەشان، هێنایی و بردی
**خَضَّ الإنَـاء:** تێی وەردا ، ئاوی تێوەردا
**خِضَاب:** بۆیە، رەنگ، خەنەو وسمە
**خَضَــاد:** لـەش داهــێزران ، تێکشـکانی جەستە
**خَضَار:** فەریکە پاقلە، شیرێك ئاوی زۆر تێبکرێت
**خَضَّار:** سەوزە فرۆش، پنجار فرۆش
**خُضَــار ـ خَضْـرَاوات:** ســەوزە، پنجـار ، گیا
**خَضَارَة:** پاقلەی سەوز
**خُضَــارِم:** گــەورەی ڕێــزداری خــاوەن شکۆمەندیی
**خُضَارِيّ:** مراوی کێوی
**خُضَامَة:** ئەوەی بەکاکیلەکان دەخورێت
**خَضَــبَ ـ خَضَّــبَ( لَــوّنَ ):** بۆیـــەیکرد، رەنگیکرد
**خَضَّــبَ( تَلَــوَّنَ ):** خەنـــەی تێگـــرت، خەناویبوو
**خَضِبَ ( خَضَــرَةَ الشَّجَر ):** گەلا ، چـرۆ ، سەوزایی رووەك، پەلك ، لك

**خَضَب( المادّة الخضْـراء في النبـات ):** كلۆرۆفیل
**خَضَـدَ العُـود:** چەمانیـەوە، خـواری كردەوە،لاری كردەوە
**خَضَدَ الشّجَر:** دڕكەكانی بڕییەوە
**خَضَدَ الرّجُل:** شتێكی تـەڕی خـوارد وەك گێزەر
**خَضَـد تَخْضِيـداً:** بڕییـەوە، كـەرتو لەتیكرد، پچڕی
**خَضَدُ البَـدَن:** شـكانو ئـێشو ئـازار پێگەیاندن
**خَضَدُ السَّفَر:** میلاكیو ماندوبوونی
**خَضْـدٌ:** ئـەوەی نـاتوانێت هەڵبسـێ، لاواز، كەم توانا
**خَضَـدٌ:** ئێـشو ژانێكــە دەگـات بەئەندامەكانو ناگاتە ئاستی شكاندن
**خَضِرَ:** سەوز بوو
**خَضَّرَ الشّئ:** سەوزی كرد
**خَضَّرَ الأرْض:** چاندی ، تیا ڕواند
**خَضِـرٌ( أخْضَـر اللـون ):** سـەوز، جـۆرە ڕەنگێكە وەك ڕەنگی گیا
**خَضْرَاء ـ خَضْـرَوَات:** میـوەی كـاڵو پێنەگەیشتوو، سەوزە
**خَضْرَاء:** ئاسمان
**خَضْرَاء القَوم:** زوربەیان، زۆرینەیان
**خُضْرَة:** سەوزی ، سەوزە
**خُضْرَة في ألـوان الحَيـوَان:** خـۆڵاوی ، دێز
**خَضْـرَم الأُذُن:** لـــەلاوە بـڕی پاشـان وازی لێهێنا
**خِضْرِم:** بیـری فرە ئاو ، بیری پڕ لەئاو
**خَضَـعَ:** ملـی كــەچكرد ، خــۆیدا بەدەستەوە، ڕامبوو

**خَضَّعَ:** ملـی پێكـەچكرد، دایمركانـەوە، ڕامیكرد
**خَضِعَ الرَّجُل:** چەمانــەوەی تێدابـوو، بــەشێوەیەك خوارو لاربوەوە
**خَضْعَاء:** كۆماوە، پشـت چـەماوە، مـل خـوارو مـل شـۆڕ، ئـەوەی ڕازییــە بەسەرشۆڕیو ملكەچی
**خَضْعَـة:** دەنگـی شمشـێرو قـامچی لەكاتی وەشاندنیاندا
**خُضْعَة:** ملكەچی گشت كەس
**خَضِلَ خَضْلاً:** تەڕبوو ، تێی هێنا
**خَضَّلَ الشّئ:** تەڕیكرد، شێداریكرد
**خَضَلْ ـ خَضْل:** دوڕو مـەرجانی پوخت
**خَضِل( نَد ):** تەڕ ، شێدار ، پاراو
**خُضُلَّة:** بەخشش، خۆشـحاڵی، بـەپیت، ئاودان
**خَضَمَ الشّئ:** بڕی ، لەتیكرد
**خَضَـم الطّعَــام :** خـــواردیو جویـــی بەكەڵبەكانی
**خِضَـمّ:** ئۆقیـانوس، زەریـا، گـەورە، بەخشندەی پیاوچاك،زۆرێكی بێشومار
**خَضُوب:** ئـەو ڕووەكـەی بـەباران نـەشو نما دەكاتو سەوز دەبێت
**خَضُور:** سەوز، وەك ڕەنگی گیا
**خَضُوع:** سەرشۆڕ، ملكەچ ، گەردن كەچ
**خُضُـوع:**ملكـەچی، ملـدان، سەرشـۆڕی خۆبەدەستەوەدان، پاڕانەوە
**خَضِيب:** دەست ڕەنگكردن بەخەنە
**خَضِير:** گیای سەوز ، سەوزە
**خُضَيْرِيّ( طَائِر )**:كەندەسمە،هەنگخۆر ، سەرسەوز
**خَضِيعَـة:** خـــوڕەی لافـــاوو ســێڵاو، دەنگێكە لەناوسكی ئاژەڵەوە دێت

**خَضِيلَة**: باخچەی سەوز
**خَضِيمَة**: گیای سەوز، زەوی بەپیت و فەردار

**خ ط**

**خطَّ بالقَلَم**: نووسی
**خطَّ الشئ**: بە قەڵەم و شتی دی نووسی
**خطَّ عَلَى الشئ**: هێماو نیشانەی لەسەر کێشا
**خطَّ الأرض**: هێڵی کێشا بەسەر زەویدا
**خطَّ القَبْر**: هەڵیکەند
**خطَّ الطَعَام**: هەندێکی خوارد
**خطَّ في نَوْمه**: ڕۆچوو، ونبوو
**خطّ(سَطْر)**: دێڕ، هێڵ، ڕیز
**خطّ(كتَابَة)**: نووسین، نقیسین
**خطّ(علم الخَط)**: خۆش نووسی
**خَطّ الإستِوَاء**: کەمەری زەوی، هێڵی پشتێنی
**خطُّ الطُول**: هێڵی درێژایی
**خطُّ العَرْض**: هێڵی پانایی
**خطُّ الحَدِيد( سِكَّة الحَدِيد )**: هێڵی ئاسن، ڕێگەی ئاسن
**خطٌّ مُسْتَقِيم**: هێڵی ڕاست، ڕاستەهێڵ
**خطٌّ مُنْحَنِي**: هێڵی چەماوە
**خطٌّ مُنْكَسِر**: هێڵی شکاوە
**خُطّ ـ خُطَطَ**: ڕێگە، کۆڵان، شوێنی گەڕەك
**خِطَّ**: ئەو زەوییەی یەکەم مرۆڤ پێی دەنێتە سەر، زەوی نەخشەکراوی مرۆڤ
**خَطَأ**: هەنگاوی نا، دەستی پێکرد، چوە پێشەوە
**خَطَا الرَّجُل**: مانیدا هەنگاو بنێت، پاڵی پێوەنا هەنگاو هەڵبگرێت

**خَطَّاء**: هەڵەکار، تاوانبار
**خِطَاب**: پەیام، نامە، وتار، باوەڕنامە، ڕاسپاردە
**خَطَّاب**: وتاربێژ، ئەوەی زۆر وتار دەدات
**خَطَابَة**: وتاربێژیی، وتارخوێندنەوە
**خَطَار**: عەتار،برینداركردن بەتیر،ڕۆنی زەیتون
**خُطَّار( ضَيف )**: میوان، میڤان، مێمان، مەهوان، مهڤان
**خُطَّار السَّاعَة**: بەندۆڵ، پانتۆڵی سەعات، زەنبەلەك، فەنەری کاتژمێر
**خَطَّاط**: خۆش نووس
**خَطَّاف**: دز، جەردە، شەیتان، فێڵباز
**خُطَّاف**: پەڕەسێلکە، پەڕەسلێرکە
**خِطَام**: هەوسار ،لغاو، جڵەو، هەفسار، لڤان، هەفسار، قەوچە، قەڕاسە، سەرکەللە، ئەوەی دەکرێتە ملی وشترو ئەسپ بۆ ڕاکێشانی
**خَطَأ**: هەڵەی لێدۆزییەوە،گوناهباریکرد
**خَطِئَ**: هەڵەیکرد، چەوتیکرد، گوناهیکرد
**خَطِئَ فِي دِينِه**: ڕێگەیەکی چەوتی بە زانین یان نەزانین گرتەبەر
**خَطَّأَه**: بەهەڵەیزانی، بەچەوتی دانا
**خِطْء**: تاوان، گوناه، سوچ
**خَطَأ**: تاوان، ئەو گوناهەی بەدەستی ئەنقەست نەبێت، پێچەوانەی ڕاستی
**خَطَبَ**: وتاری خوێندەوە، وتاریدا
**خَطَبَ الفَتَاة**: خوازبێنیکرد، داوایکرد، نیشانەیکرد
**خَطَبَ ـ خَطَابَة**: بوو بە وتاربێژ

**خَطْب**: کاروبار ، کێشە، بەلا
**خُطبَة ـ خطَابَة**: وتار، دوان، ئاخافتن، گفتوگۆ قسە، ئامۆژگاری ئاینی
**خُطبَة الكتَـاب**: سـەرەتاکەی‌و دەست پێکەکەی، پێشەکیەکەی
**خِطبَة** :داوای ئافرەت بۆ هاوسەرگیری ، ژنی دەستنیشانکراو، دەزگیراندار
**خَطَّـة ـ خطَّـة**: پــیلان، نەخشــە، شێوەکارکردن
**خَطَر الأَمْر لَه**: بـۆی هەڵکـەوت، هـات بەبیریدا
**خَطَر بِبَالِـه**: کەوتـەوە بـیری، هاتـەوە یادی
**خَطَـرَ فــي مَشْـيَتِه** :رۆیــی بـــەرێوە لـەکاتێکدا دەستێکی بـەرزدەکردەوەو ئەوی دیکەی دادەنا
**خَطَرَ بِسَيفِه** :شمشێرەکەی رادەوەشاند
**خَطَرَ بِيَدِه**: دەستی رائەوەشان
**خَطَرَ بِذَنَبِه**: کلکی رائەوەشان
**خَطُرَ( صَار رَفِيـع المَنْزِلَـة )**:پایـەداربوو، گەورەبوو، پلەوپایەی بەربووەوە
**خَطِـر**: شـیرێك ئـاوی زۆر تێبکرێـت، لۆو پۆپ، پەل‌و پۆ
**خَطِـرْ**: مەترسیدار، تیابـەر، جێترس، سامناك، خۆراوەشێن، بەفیزو دەمار
**خَطَـرْ**: نـــزیك لـەتیاچوون‌و فـەوتان، بەرزبوونـــەوەی پلەوپایـــەو ئـــەوەی گرەوی لەسەر دەکرێ
**خَطَر**: پێوانەیەکی گەورەیە
**خَطرَة**: جار ، کەرەت، نۆرە
**خَطَرَفَ المَرِيض**: بزرکـانی، ورێنـەیکرد، لەبەرخۆیەوە ورتەی لێوەهات

**خَطْرَفَة**: بزرکان، ورێنـە، لەبـەر خـۆوە قسەکردن
**خَطَّطَ( سَطَّر )**: هێڵی‌کێشا، هێڵێکی‌کرد
**خَطَّـــطَ الأَرْض**: زەویەکـــەی پێـــوا، زەویـەکەی نیشانەکردو هێڵی تیا لێدا
**خَطَّطَ الأَرْض بِـالمِحْرَاث**: بەگاسـن هێڵـی لێدا، هێڵ هێڵی‌کرد، خەت خەتی‌کرد
**خَطَّطَ الحَوَاجِب**: برۆی رێککرد
**خَطِـفَ الشَّـئ**: رفـانی، زەوتی‌کـرد، بەخێرایی پڕی پیاکرد
**خَطِفَ البَرْقُ البَصَر**:چـاوی بـرد، ئـاوی چاوی رۆیی
**خَطِـفَ السَمْع**: گـوێی گـرت، گــوێی هەڵخست
**خَطِفَ شَخْصَاً أوْشَيئَاً**: بـردی، رفـانی، هەڵیگرت
**خَطَفَ( مَشَى سَرِيعَاً )**: فـرکەی‌کرد،خێرا تێپەڕی
**خَطْـفٌ( إسْتِلاب )**: رفــاندن،هــەڵگرتن، تالأنکردن
**خَطْفَـة**: ئـــەندامێکە درنـدەو مرۆڤـی نادان تیای دەبات ، خۆ مەلأسدان
**خَطَـلْ**: زۆری وت ، قســـەی بێســـەرو بەری کرد، وتەی هیچ‌و پووچی وت
**خَطِلَ فِي مَنْطقه أَوْرَأْيه**: مەڵەیکرد
**خَطَل( كَلام فَاسِد )**: قسـەی بێجـێ، قسەی بێ سەرو بەر، قسەی ناشیرین
**خَطَل**: خێرایی تیژی ، درێژی
**خَطِل( أحْمَق )**: گـەوج، کەودەن، گێل
**خَطْلاء**: گـوێ بیسـتن سسـت، یـەکێك بیستنی گران‌و قورس بێت

**خَطَمَ ـ خَطِـم:** هەوسـاریکرد، دەمـی بەستەوە، دەمکوتیکرد، بێدەنگیکرد، لغاویدا

**خَطْم:** قەپۆز ، لوت ، دەنوك

**خَطْم الرَّجُل:** کێشای بەلووتیدا

**خَطَمَـه بِـالكَلام:** دەمکوتیکـرد، بێدەنگیکرد

**خِطْمي:** گیایەکە بۆ تـەداویو سـارێژی برین بەکار دێت

**خُطُوبَة:** داواکردن، خوازبێنیکردن

**خَطْوَة ـ خُطْوَة:** هەنگاو، شـەقاو، لۆق، هەنگام، پێنگاف، پێنگاو

**خُطُـورَة:** گرنگـیو پتـەویی، بـوون بەخاوەن پلەوپایە

**خُطُوط الكَف:** خەتەکانی بەری دەست، هێڵەکانی بەری دەست

**خَطِّي:** ئەوتیرانـەی لەسەر کەناری(خط) دەفرۆشـرێت کەدەکەوێتـە ولاتـی (بەحرەین)ەوە

**خَطِيئَة:** گوناه ، تاوان ، هەڵە ، سووچ

**خَطِيب:** وتـاربێژ، دانـا، زانـا، دوانبێـژ، خوازبێنیکار

**خَطِيبَة( مَخْطُوبَة ):** کچیدەستگیراندار

**خَطِيَّة:** گوناه ، تاوان ، هەڵە

**خَطِير:** جەربەزەییکرد،سەرەڕۆییکرد، پایەبەرزبوو

**خَطِيف:** وشتری خێراو تیژ ڕەو

**خَطِيفَـة:** خواردنێکـە لـەئاردو شـیر دروست دەکرێت

## خ ف

**خَفَّ:** سووکبوو، ئـاسانبوو، تاویدایـە، خێرایکرد، هێواش بوەوە

**خَفَّ المَطَر:** هێواشی کردەوە

**خَفَّ مَالُه:** کەم بوەوە

**خَفَّ القَـوم:** بـەخێرایی ڕۆیشـتنو کـەم بوونەوە

**خَفّ:** سووك، ناسەنگین

**خُفّ:** سۆل ، پێڵاو ، جیَپیّ، سم

**خَفّ:** سووكو ئاسان، کۆمەڵێکی کەم

**خَفَـا الـبَرق:** درەوشـایەوە، تیشـکی دایەوە

**خَفَـا الشَّـئ:** دەرکـەوت، ئاشـکرابوو، دیاریدا

**خَفِي الشَّـئ:** شـاردیەوە، داپۆشـی، پەنهانیکرد

**خَفَا:** نادیار ، پەنهان، شاراوە

**خَفَاء:** نهێنی، شاراوە ، پەنهانی

**خَفَارَة ـ خِفَارَة:** پاسـەوانی، دیدەوانـی، ئێشکگرتن، بەدیارەوەبوون

**خُفَّاش( وَطْوَاط ):** شەمشەمەکوێرە

**خِفَاف:** کەوشو پێڵاو فـرۆشوبەرهەم هێنەری

**خُفَاف:** دڵ سووك، روح سووك

**خُفَّـاق:** فێڵبـاز،حیلـەگر، تەڵەکـەباز، چاوبەستکار

**خَفَـتَ ـ خُفُوتـاً:** بێدەنگبـوو، کرپـوو، ورتەی لێبڕا

**خَفَتَ ـ خُفَاتـاً:** کوتو پڕ مرد

**خَفَتَ بِكَلامِه وَبِصَوْتِـه:** پەنـهانیکرد، نهێنیکرد، هێواشـیکرد، دەنگی نـزم کردەوە

**خَفَتَ بِالقِرَاءة:** بەچاو خوێندیەوە

**خِفَّـة:** سـووکی،هێواشـی، چـابوکی، زیرەکی، سانایی

**خفَّةُ العقْل**: گەوجی، گەمژەیی، گێلی
**خفَّةُ الحَرَكَة**: بزێوی، جمووجوولاویی
**خفَّةُ اليَد**: دەست سووکی
**خَفـر ـ خَفَـر**: پاسـیکرد، ئاگـاداریکرد، ئێشکیگرت،پاسەوانیکرد،چاودێریکرد
**خَفـر بالعـهْد**: بـەڵێنی بـردە سـەر، بەجیّی گەیاند
**خَفرَ( إستَحَى )**: شەرمی کرد
**خَفرَ**: شەرم ، ئێشکگر ، نۆبەچی
**خَفرَت الجاريَة**: فرە شەرمیکرد، هـەر زۆر تەریق بوەوە
**خُفرَة**: پەیمانو بەڵێن
**خَفَس( هَزَأَ )**: گـاڵتەی پێکـرد، پێـی رابوارد
**خَفَسَ( هَدَم )**: رووخـانی، تێکیـدا،دای بەسەر یەکا
**خَفَشَ**: کزبوو، لاوازبوو، سیس بوو
**خَفَشَ ـ أخْفَش**:بەشـەوئەبینیّ،رۆژ کوێر
**خَفْش**: رۆژکوێری، ئەوەی بـەرۆژ بـاش نابینیّ
**خَفَضَ ـ خَفْضاً**: ئاسانیکرد، سووکیکرد
**خَفَـضَ**: نـزمیکردەوە، دای نـەواند، هێنایە خوارەوە
**خَفَضَ الصَوْت**: نزمیکـردەوە، هێواشـی کردەوە
**خَفَضَ الكَلمَة**: ژێری بۆدانا(کەسرە)
**خَفَضَ بالْمَكَان**: نیشتەجیّبوو، مایەوە
**خَفَضَ العَيش**: خۆشگوزەران ژیا
**خَفَضَ الرَّجُل**: مرد، تیاچوو،لەناوچوو ، نەما
**خَفَضَ الإبْل**: بەهێواشـی رۆیی،هێواش هێواش رۆیی بەرێوە

**خَفَّضَ الشَئ**: ئاسانو سانایکرد
**خَفَّـضَ**: نـزم کردنـەوە، دابـەزین، نەویکردن
**خَفَّـضَ السـعْر**: داشـکانی، هێنانـە خوارەوە، نرخ شکاندن
**خَفَّفَ**: سووکیکرد، ئاسانیکرد
**خَفَّفَ الثوْب**: ناسکیکرد، ناوازەیکرد
**خَفَّفَ السُرْعَة**: هێواشی کردەوە
**خَفَّفَ الـوَزن**:سـووکی کـرد، کـەمی کردەوە
**خَفَّفَ العُقُوبَة**: سزاکەی کەمکردەوە
**خَفَّفَ كَثَافَـة المَزِيـج**: روونـی کـردەوە، خاوی کردەوە
**خَفَّـفَ الشَّـعْر**: کورتـی کـردەوە، سووکیکرد، کەمی کردەوە
**خَفَقَ النَجْم**: ئاوابوو، دیار نەما، ونبوو
**خَفَـقَ الليـل**: زوربـەی بەسـەرچوو، زۆربەی رۆیی
**خَفَقَ الطَـائر**: فـری ، هـەڵفڕی، بـاڵی گرت، رۆیی
**خَفَقَ الرَّجُل في البِـلاد**: رۆیـی، بـەجێی هێشت
**خَفَقَ المَكَان**: چۆڵیکرد، بەتاڵیکرد
**خَفَقَ العَلَم**: دای بەیەکا، شەکایەوە
**خَفَقَ القَلْب**: تـرپە ترپـی کـرد، دڵـە کوتێی کرد، پلیدا
**خَفَقَ البَرْق( لَمَع )**: چەخماخەیدا
**خَفَقَ البَيض**: شڵەقانی، هێنایو بردی
**خُفـق ـ خَفَـق ـ خفَـاق**: ئەسپی کەمـەر باریک
**خُفُوق**: لاوازی، کزی ، لەرپی
**خَفيِّ**: ون بوو، شاراوە

**خَفيّ:** شاراوه، نادیار، کەنارگیر لەخەڵکی
**خَفِيئَة:** بیری پڕ لەئاو، دارستانی چڕ
**خُفْيَة:** لەژێرەوە، بەنهێنی، پەنهانی
**خَفير:** پاسەوان، دیدەوان، ئێشکگر
**خَفيف:** سووك، ئاسان، سانا، کەم کێش، ترنگاو
**خَفيف الروح:** روح سوك
**خَفيف الحَرَكَة:** لەش سووك، گورج و گۆڵ
**خَفيف اليَد:** دەست سووك، ئیش راپەڕێن
**خَفيف الظَهْر:** کەم خێزان
**خَفيف العَقْل:** عەقڵ سووك، گێل، گەمژە، گەوج، کەودەن

**خ ل**

**خَلّ:** لەڕیوو، لاوازبوو
**خَلَّ الشَئ:** کونیکرد، سمی
**خَلَّ الفَصيل:** زمانی لەتکرد بۆ ئەوەی شیر نەخوات
**خَلَّ لَحْمَه:** گۆشتەکەی لەڕو لاوازبو
**خَلَّ فِي دُعائِه:** نزاو پارانەوەی تایبەتیکرد، لاڤە لاڤیکرد بەتایبەت
**خِلّ - خُلّ:** هاوڕێی گیانی بەگیانی، دۆستی سەروماڵی
**خَلّ - خَلَّة:** لەڕ، لاواز، سرکە، قەڵەو، جلو بەرگی شڕو دڕاو، کون لەجلو بەرگدا
**خُلّ:** دۆستایەتی و برایەتی، خۆشەویستی
**خَلا الإناء:** خاڵی کردەوە، بەتاڵی کردەوە
**خَلا المَكان:** گواستیانەوە، چۆڵیانکرد
**خَلا الرَجُل:** بەتەنیابوو، تەنیاکەوت، هەرخۆیبوو
**خَلا عَلى الشَئ:** مۆڵبوو، جەم بوو، کۆبوو
**خَلا عَلى فُلان:** پشتی پێبەست، پاڵی پێوەنا
**خَلا بِه وَمَعَه إلَيه:** کۆبوەوە لەگەڵی بەتەنیا، بەتەنیا دانیشتن
**خَلا للأمْر:** یەکلابوەوە بۆی دەست بەتاڵ بوو
**خَلا بالمَكان:** لەوێ مایەوە، هەڵیدا، نیشتەجێبوو
**خَلا بَالُه:** دڵنیابوو، ئارام بوو، دڵسافبوو
**خَلا الحَزن:** باریکرد، لەناوبرد
**خَلا - ما خَلا (إلاّ):** جگە لە، بەبێ، بێجگە
**خَلى النَبات:** بڕیو هەڵیکەند
**خَلى الفَرَس:** لغاوی کرد
**خَلى اللِجام مِنْ الفَرَس:** لغاوەکەی لێکردەوە
**خَلى القِدر:** ئاگری مەنجەڵەکەی خۆشکرد
**خَلا الشَعير فِي المِخلاة:** کۆیکردەوە لەئاخوڕەکەدا
**خَلى - أخْلاء:** گژوگیای تەڕ، تەڕەگیا
**خَلاء:** چۆڵەوانی، دوور لەئاوەدانی
**خَلاّب:** دڵڕفێن، دڵبەر، دڵکێش
**خَلاة:** گیایەکی تازە
**خَلاسِي:** کوڕێك لەدایكو باوکێك بێت کەیەکێکیان سپیو ئەوی دییان رەش بێت

**خلاص**: ئەوەی لەناتەواوی‌و غەش پاك بوەتەوە لەئالتوون یان زیوو رۆن

**خَلاص**: رزگاربوون، سەرفرازبوون

**خُلاصَة ـ خلاصَة**: کورتـه، ناوەڕۆك، پوختە، نویشك

**خلاط**: تێکەڵبوونی خەڵکی‌و ئاژەڵ

**خَلاطَة**: عەقڵ تێکچوون، گێلـی، گەوجی، کەودەنی

**خُلاع**: نیمچە شێتی، جۆرێکە لەشێتی

**خَلاعَة**: بێئابڕوی، بێشەرمی، بەرەڵایی، بێعاریی

**خلاف**: جیاوازیی، ناکۆکی، ناتەبایی

**خِلافَة**: گەورەیی، سەرداریی، پێشەوایی، پێشەنگی، لەبریی

**خَلافَة( عُقُوب )**: بەدوادا هاتن، لەدوا هاتن

**خُلاق**: لووسی، ترش‌و شیرین

**خَلاق**: پشك‌و بەشی زۆرو بێشومار لەخێر

**خلاق**: بۆنی خۆش

**خِلال**: سیواك، دان ئاژنە، شیش، سیخ، سمۆ، میانە، ماوە، کات

**خلال الدیار**:چواردەوری سنوورەکەی یان نێوان ماڵەکانی

**خَلال**: سرکە فرۆش‌و دروستکەری

**خَلالَة ـ خِلالَة ـ خُلالَة**: هاوڕێیەتی راستەقینە، دۆستایەتی راست

**خُلالَة**: پاشماوەی خۆراك لەنێوان دانەکاندا

**خَلَبَ ( خَدَشَ وجَرَح )**: بەنینۆك روشانی، چنگی لێدا

**خَلَبَ الفَرِیسَة**: راوی‌کردو کەوتە بەرچنگی

**خَلَبَ الفَتَی**: دڵبەندوشەیدای کرد

**خَلِبَت المَرأة**: بێعەقڵ‌و ژیری بوو

**خُلبَ ـ خُلُب**: پەت‌و ریشاڵ، قەدی دارخورما

**خُلَّب**: هەوری بێ باران، وشکە هەور

**خلب**: گەلامێو، پەردەی جگەر

**خَلباء**: ئافرەتی بێ ژیری، گەوج، ساویلکە

**خلبَة ـ خُلبُون**: بەگوتەو قسەی شیرین هەڵی خەڵەتاند

**خُلَّة**: خەلیل، دۆست، یار

**خَلَّة**: سیفەتی تایبەت، شەرابی ترش، هەژاریی‌و نەداریی، خوو داب‌و نەریت

**خلَّة**: دۆستایەتی‌و برایەتی، کێلان

**خَلَجَ ـ خالَجَ**: چەواشەبوو، سەری لێتێکچوو، هۆشی بەسەر خۆیەوە نەما

**خَلَجَ( حَرك )**: جووڵانی، بزوانی، شڵەقانی

**خَلَجَ بعَینه( غَمَزَه )**: چاوی لێداگرت

**خَلَجَ الوَلَد**: شیری پێدا

**خَلَجَ الأمر**: سەرقاڵی‌کرد، خەریکی‌کرد

**خَلَجَت العَین**: جووڵەیەکی کتوپڕو ناچاری کرد

**خَلجَ ـ خَلجاً**: ئەندامەکانی بەهۆی رۆیین‌و ماندوبوونەوە ژانیان کرد

**خُلَج**: گەلێکی رەچەڵەك گومانـاوی، قاپ‌و کاسەی گەورە

**خَلخال**: پاوانە، خرخاڵ، شتێکی زەنگوڵەدارە لەزێڕ یا زیو دەکرێتە پێی منال بۆ جوانی

**خَلخال الرَّجُل**: قولەپێ، قولاپە

**خَلخَل:** جوولانی ، بزوانی ، ترازانی
**خَلخَـلَ العَظـم:** گۆشـتی لێکـردەوە، گۆشتی لێداماڵی
**خَلخَلَ المرأة:** پاوانەی لەپێکرد
**خُلخُل( رَقيق ):** تەنك ، ناسك، ئاوەکی
**خَلَدَ ـ خُلوداً:** مایەوە، درێژەی کێشا ، نەمر بوو
**خَلَدَ بالمَكان:** مایەوە، جێنشینبوو
**خَلَدَ إلَى الأرْض:** پیای نووسا
**خَلَـدَ إلَـى الرَّاحَـة:** پشـوویدا، هیلاکـی دەرکرد
**خَلَـدَ تَخْليـداً:** جـاویدانبوو، هـەتا هەتاییبوو، مایەوە، هەتا هەتا
**خُلْدٌ:** مانـەوە، هـەتا هـەتایی،نـەمریی، هەمیشـەیی، نـەمردن، مشـکە کوێـرە، سوچەڕ
**خَلَد:** دڵ ، روح ، نەفس ، هۆش‌و بیر
**خَلَس:** دزی ، رفانی ، ناخونەکیدا
**خَلَس:** سەرماش‌و برنجی
**خُلسَة:** هەل، رێکەوت، ناکاو، لەپڕ
**خُلسَة( خُفيَـة ):** بەدیزیـەوە، بەنـهێنی ، بەراسوێ، بەپەنهان‌و نادیاریی
**خَلَصَ:** پاك بوو، پوخت بوو، پاڵفتەبوو
**خَلَـصَ مِـنَ الهَـلاك:** سـەرفرازبوو، قوتاربوو، رزگاربوو
**خَلَصَ الماءُ مِنَ الكَدَر:** پاك‌و پوخت بوو، لیڵی نەما
**خَلَـصَ إلَـى المَكَـان وَبِالمَكَـان:**گـەیی، گەشتەجێ
**خَلَـصَ مِـنَ القَـوْم:** کـەنارگیربوو، دووركەوتەوە لێیان
**خَلَّـصَ:** رزگـاریکرد، خـاوێنیکرد، بژاریکـرد، پوختیکرد، تـەواوی کـرد، بەدەستی خۆی تۆڵەی سەندەوە

**خَلص:** دۆستی گیانی بەگیانی
**خُلَص:** هەموو سپێتیەك
**خَلَصْ:** پیچەك، شـتی کـەم، شـتێکە کەشتی تری پێ بپێچرێتەوە ، گیایەکە
**خَلَطَ:** تێکەڵ‌و ئاوێتەی کرد
**خَلَـطَ فـي الكَـلام:** دای بەسـەریەکا، تێکەڵ‌و پێکەڵ قسەیکرد
**خَلَـط( مَزَج ):** تێکـەڵکردن، تێکـەڵبوون لەگەڵ خەڵکیدا
**خَلط:** گەوج ، نـەزان ، کـەوان، هـەموو ئاوێتەیەك
**خُلطَة:** کۆمپانیا ، شەریکە
**خَلَعَ:** دایکەند، دای ڕنی، دایماڵی
**خَلَعَ ثِيَابَـه:** خـۆی رووت کـردەوە، جلەکانی داکەند
**خَلَعَ سِنّاً:** دانی کێشا
**خَلَعَ المَفصَل:** لـەجێ‌چوو، لەخرتکە چوو
**خَلَعَ القَائد:** دایگرت ، لایبرد
**خَلَـعَ عَلَيـه ثَوْبَـاً:** لەبـەریکرد ، کـردی بەبەریا
**خَلَعَ القَلب:** دڵی داخورپا، تۆقی، ترسا
**خَلَعَ العِذار:** حەیاو شەرمی خستە لاوە
**خَلَـعَ إبْنَـه:** دەسـتبەرداری بـوو، ئەفەرۆزیکرد، دەستی لێهەڵگرت
**خَلُعَ:** شـوێن ئـارەزووی خـۆی کـەوت، تا ئەهل دەرچوو، سووك بوو
**خَلَّعَ:** هەڵیوەشان ، تێکیدا
**خَلَـعَ إمْرَأتَـه:** تـەلاقیدا، دەسـتی لێهەڵگرت، دەستبەرداریبوو
**خَلَـعُ الثَـوب:** داکـەندن، لابـردن ، خـۆ رووتکردنەوە
**خُلع:** وازلێهێنانی ژن‌و وابـەستە کردنی پارە پێوەی

**خُلِعَ المَيِّت**: كفنی لێکردەوە
**خِلْعَة**: ئـەو جل‌و بەرگـەی بـەدیاری دەبەخشرێ،هـەر جل‌وبەرگێ دابکەنرێ
**خُلْعَة**: لاوازیی، باشترین ماڵ‌و دارایی
**خَلَفَ**: لەدواییدا هات،چوە جێگەکـەی، جێگەی گرتەوە
**خَلَـفَ الرَّجُـلَ**: لـەدوای خـۆی دانـا، لەشوێنی خۆی دانا
**خَلَفَ الغُلام**: گێل بوو، نەزان بوو
**خَلَفَ فَمُ الصَائِم**: بۆنی دەمی گۆڕا
**خَلَفَ عَنْ خُلقِ أبِيه**: گـۆڕا، وەك بـاوکی نەبوو
**خَلَفَ الثوب**: چاکی کرد ، باشیکرد
**خَلَـفَ لَـهُ وَعَلَيـه**: پاداشـتی دایـەوە، بژاردی
**خَلَفَ عَنْ أصْحَابِه**: دواکەوت، بەجێما
**خَلَفَ فُلاناً**: لەپشتەوە گرتـی،لـەدواوە پەلاماریدا
**خَلَـفَ لَـهُ بِخَيرٍ أوْ بِشَـر**: لـەپاش ملـە باسی‌کرد
**خَلَفَ البَيت**: دوایین کـوڵەکەو کاریتەی ماڵ
**خَلفَ خَلفاً**: (خێل، نەزان، گێل) بوو
**خَلَّـفَ**: مـیراتی بەجێ‌هێشـت، لەپاشـی بەجێما
**خَلَّفَ وَلَداً**: ئەوەی خسـتەوە، وەچـەی خستەوە
**خَلَّـفَ الشَئ**: لـەدوای خـۆی بـەجێی هێشت
**خَلَـف**: هـاتوو، ئـــەوەی کـــەدێت، وەجـاخ ، نـــەوە ، بریکـار، لـەجێی ، کوڕی چاك‌و باش

**خَلف**: پشت، ئەودیو، پاش، دواوە
**خِلف**: جیاواز، ناکۆك، گژوگیاو لەوەڕی هاوینە، گۆی گوان
**خُلْـــف**: بەجێگـــەیاندنی پـــەیمان لەداهاتوودا
**خِلفَان**:ئەو دوانەی لەسیفەتێدا جیاوازن
**خُلفَة**: گێلی، ناتەواویی، دوایین، تـامی خواردن
**خَلفَـة**: نـەبوونی تـام‌وچێژی خـواردن لەدەمدا بەهۆی نەخۆشیەوە
**خِلفَة**:دوو دڵی ، چینە ، ئەوەی لەدوای سوارییەوە دادەنرێت
**خَلَقَ**: دروستی‌کرد، بـەدی‌هێنا، هێنایـە بوون ، دایهێنا
**خَلَقَ الإفْك**: درۆی بۆ هەڵبەست
**خَلَقَ الشَئ**: ڕێکی‌خست، ئاسانی‌کرد
**خَلَقَ الأدِيم**: ئـەندازەگیری کـردو پێش بڕینی
**خَلِقَ ـ خَلُقَ**: کۆن بوو، زۆر لەبەرکرا
**خَلُقَ بِكَذَا**: لەخۆی هات، لێی هات
**خُلُق ـ خُلْق**:خوو، بەدڕەوشت، بێ‌ئابڕو، پیاوەتی
**خَلَق(بـالِ)**: شڕ ، کۆن، دڕین
**خَلْق**: خەڵك ، ئادەمیزاد، مەردوم
**خَلْـــق ـ خِلقَـــة**: سروشـــت ، نیـــهاد، پێکهاتە، بونـەوەر ، بـوون ، گیـاندار ، روحدار ، دروستکراو، بەدی هێنراو
**خَلَقَاني**: کۆنە فرۆش
**خِلقَـة**: دیمـەن ، رواڵـەت، سیمـــا، قیافەت، شێوە
**خُلقِي**:سکماکی، سروشتی، سکماك
**خَلّلَ العَصِيرَ**: کردی بەسرکە

**خَلَلَ العَصِيرُ:** ترش‌و خراپ بوو
**خَلَلَ الإِنْسَانُ:** ئه‌وه‌ی كه‌وتبوه نێوانی ده‌ری هێنا
**خَلَّلَ أَصَابِعَهُ:** په‌نجه‌كانی‌كرد به‌نێویه‌كدا
**خَلَل:** خراپه‌و جیاوازی، شێواندن، ناته‌بایی، خه‌وش
**خِلَل:** پاشماوه‌ی خواردن له‌نێوان ددانه‌كاندا
**خِلْو ـ أَخْلاء:** ته‌نیا، تاك ، خالّی، بۆش، به‌تالّ
**خَلُوب:** فێڵباز، كه‌ڵه‌كه‌چی، ته‌ڵه‌كه‌باز
**خَلْوَة:** په‌ناگه، شوێنی كۆبونه‌وه، دووره‌په‌رێزی ، به‌ته‌نیا دانیشتنی ئافره‌ت‌و پیاو
**خُلُود:**مانه‌وه،هه‌تاهه‌تایی،هه‌میشه‌یی ، جاویدانی، ئه‌زه‌لی
**خُلُوص:** روونی، پوختی، بێگه‌ردی، له‌رووبی، ئاشكرایی پاكی
**خَلُوق:** ره‌وشت به‌رز، خۆش ره‌فتار، ره‌فتار جوان
**خَلِيّ:** به‌تالّ ، بێ‌غه‌م‌و په‌ژاره، ئه‌وه‌ی هاوسه‌ری نییه
**خَلِيَّة:** شانه، شانه‌ی هه‌نگ، یه‌كه‌ی رێكخراو
**خَلِيج:** كه‌نداو،ئاوكه‌ند، كه‌شتیه‌كی بچووك ، په‌ت ، ئه‌وه‌ی له‌ره‌چه‌ڵه‌كیدا گومان هه‌یه
**خَلِيس:** سه‌رماش‌و برنجی، به‌یه‌كێك ده‌گوترێت سه‌ری تالّی سپی‌و ره‌شی تێدابێت وه‌ك یه‌ك
**خَلِيط:** تێكه‌ڵ ، هه‌ره‌مه‌، ئاوێته‌، ئه‌و نه‌ته‌وه‌یه‌ی یه‌ك كێشه‌و مه‌سه‌له‌یان هه‌ڵگرتوه
**خَلِيع:** بێ‌ئابرو، چه‌قاوه‌سوو، بێ‌شه‌رم، به‌ره‌لاّ، مه‌ردی نائه‌هل ، قومار بازو به‌دره‌وشت
**خَلِيعَة:** ژنی بێ سه‌ره‌رشت
**خَلِيف:** جێگر، جێنشین ، رابه‌ر
**خَلِيفَة:** جێنشین، جێنشینی په‌روه‌ردگار له‌سه‌ر زه‌وی
**خَلِيق:** گونجاو ، شایان ، ره‌وشت به‌رز،ره‌فتار به‌رزو دروست
**خَلِيقَة:** دروستكراو،خواكرد،جیهان ، سروشت، زینده‌وه‌ران، پێكهاتوو
**خَلِيل:** دۆست‌و براده‌ری گیانی‌به‌گیانی، نازناوی حه‌زره‌تی (ئیبراهیم)(سه‌لامی خوای لێبێت)، هاورێ، هه‌ژارو گه‌دا
**خَلِيلَة:** ژن ، خێزان، دۆست، شه‌یدا

## خ م

**خَمَّ اللَّحْم:** بۆگه‌نی‌كرد، بۆنی‌كرد
**خَمَّ البِئْر:** ده‌ریدا ، پاكی كرده‌وه
**خَمَّ اللَّبَن:** تێكچوو، بزركاو
**خُمّ الدَّجَاج:** كولانه ، هێلانه، رۆچنه، جێگایه‌كی پچووكه‌و سه‌ری گیراوه مریشكی تێدا هه‌ڵده‌نیشێ
**خُم:** كێڵگه‌ی چۆڵ‌و وێرانه
**خِمَار:** رووپۆش ، په‌چه، رووبه‌ندی ئافره‌تانه
**خُمَار:** سه‌رخۆشی، گێژی دوای خواردنه‌وه، سه‌رپه‌شی ، باده
**خَمَّار:** مه‌ی فرۆش، عاره‌ق فرۆش، باده فرۆش

**خَمَّارَة**: مەیخانە ، مەیستان، مەیبانگ، مەیگەریین، شوێنی ئارەق‌و بادە خواردن

**خُماس**: پێنج پێنج

**خُماسِي**: پێنج گۆشە، پێنج لا، پێنج روو

**خُماشَة**: برینێکی سووك‌و ئاسان

**خُماع**: خوارو خێچیەکی زکماکی

**خَمائل( الشَّجَر الكَثِير )**:چرە، بێشە ، دارستان

**خُمال**: دەردە جومگە ، شلەپەتێ

**خُمالَة**: پەڕی حوشتر مورخ

**خَمَّة**: بۆگەنی ، بۆنی ناخۆش

**خَمْخَمَ الماء**: بۆنی‌کرد ، بۆگەنی‌کرد

**خَمَدَ ـ خَمِدَ**: هێمن بووەوە، هێواش بووەوە، دامرکایەوە،بێدەنگبوو، خاوبووەوە، دامردەوە ، مرد

**خَمَد المَرِيض**: بێهۆش بوو مرد،هۆشی بەسەر خۆیەوە نەماوگیانی دەرچوو

**خَمدَت النار**: دامرکایەوە، نیشتەوە، بڵێسەی دامرکایەوە

**خَمدَت الحُمى**: تاکەی نیشتەوە، دامرکایەوە

**خَمَرَ ـ خَمَّرَ**: پۆشی، رووپۆشی، داپۆشی، پەچەی گرتەوە، ترشانی

**خَمَرَ الشَّهادَة**: شاردیەوە، گیریدا، پەنهانی‌کرد

**خَمَرَ فُلاناً**: شەرمی لێکرد، تەریق بووەوە لای ئەو

**خَمَرَ الرَّجُل**: مەی بۆ تێکرد

**خَمَرَ العَجِين**: خومرەی تێکرد، هەویری ترشی تێکرد، هەڵی هێنا

**خَمرَ الشَّئ**: گۆڕا وەك خۆی نەمایەوە

**خَمرَ عَنه الخَبَر**: لێی شاردەوە، پەنهانی‌کرد

**خَمَّرَ وَجْهَهُ تَخْمِيراً**: رووی داپۆشی

**خَمَّرَ العَجِين**:خومرەی تێکرد،ترشاندی

**خَمْر**: شەراب، بادە، مەی، هەر شتێك سەرخۆشکەر بێت

**خَمَر**: ئەوەی دەبێتە هۆی داپۆشین‌و پەنهان لەدارو درەخت‌و هەرشتێکی دی

**خَمر**: شوێن‌و جێگەی شەراب‌و مەی

**خُمْرَة**: هەوێن، ئێش ، سەرئێشەی بادە نۆشی

**خُمْرِيّ**: رەنگی دەستێك کەنزیکە لەسورەوە

**خَمَسَ القَوم**: پێنجەمیانبوو،پێنج یەکی ماڵەکەی بردن

**خَمَّسَ الشَّئ**: کردی بەپێنج لا

**خَمَّسَ العَدَد**: پێنج جارەی کرد

**خُمْس**: پێنج یەك ، 5/1

**خَمْسَة**: پێنج ، پێنجەم

**خَمْسُون**: پەنجا

**خَمَشَ( خَدَشَ )**: روشانی، چنگی لێدا، چنگی لێگرت

**خَمَصَ الجُرحُ**:نیشتەوە، ئاوساوییەکەی نیشتەوە

**خَمِصَ البَطن( فَرَغَ )**: بەتاڵبووەوە، هیچی نەما

**خُمصان ـ خَمْصان**: سك بەتاڵ، سك بە قوڵاچوو

**خَمْصَة**: برسێتی ، خاڵی بوونی گەدە

**خَمَلَ ذِكْرَه أوْ صَوْتَه**: ونبوو، دەنگ‌و سەنگی نەما

**خَمِلَ:** نەخۆشیەکە تووشی جومگـەکان دەبێت

**خَمـل:** پـەڕی وشـتر مـورخ ، جـۆرە ماسیەکە

**خَمْلَة:** قەیفە، قەدیفە ، پارچەیـەکی چنراوی لووس و پووسی تووکنە

**خَمَنَ الشـئَ:** قـەبلاَندی، خـەملاَندی، بەگومان دیاریکرد

**خَمَّنَ:** قەبلاَندی، خەملاَندی

**خَمود:** شوێنێکە ئاگری تێدا دادەپۆشن هەتا بکوژێتەوە

**خُمـود:** بێدەنگـی، کپـی، هێمنـی، دامرکاویی

**خَمُوش( بَعُوض ):** مێشوولە

**خَمِیر:** هـەوێن، هـاڤێن، هـامێن، مایـە، ئاڤێن، فرسك، شتێکە ئەکرێتە شیرەوە بۆئەوەی ببێ بەپەنیر یا شیر

**خَمـیرُ:** هــەڵهاتوو ، ئـەو هـەویرەی هەڵهاتوە

**خَمِّیر:** مەیخۆر، مەی نۆش، بادە نۆش

**خَمـیرَة:** هـەوێن، هـاڤێن ، هــامێن ، فرسك

**خَمِیـس:** سـوپا کـەپێنج تیپـە، پێنـج شەممە

**خَمِیص الحَشَی:** برسی، سك بەقولاَچوو، سك برسی

**خَمِیصَة:** جلێکـی رەشی چوار گۆشەیە

**خَمِیـل:** جل و بـەرگی قەیفـە، شـوێنێك دار و درەختی زۆربێت

**خَمِیلَة:** توکـی وشـترمورخ، دارسـتان، چـڕە ، بێشـــەلاَن، زەوی داتـەپیو، خم خۆرك

**خ ن**

**خَـنَ ـ خَنِینَـاً :** بـەلووت قســـەیکرد، مینگەی هات، مینگانی

**خَنَـا عَلَیـه فِـي الکَـلام:** خراپـی گـوت ، زمان پیسیکرد، بەدگۆیی کرد، قسـەی ناشیرینی بـەدەما هات

**خَنَی:** قسەی ناشیرین و نابەجێ

**خَنَــی الدَهْــر:** بـــەلاَکانی رۆژگــــار، نەهامەتیەکانی،رووداوەهەڵتۆقیوەکانی

**خَنَّـاس:** شـەیتان، ئەهریمـەن، دێـو، هـێزێکی خراپـە لـەئادەمیدا بـیری خراپی بەدلاَ ئەهێنێ

**خُنَاق:** وەناق، دەردێکە دەدات لـەبینە قاقا، گەروە خڕە ، دووشاخە

**خِنَـاق:** پـەتی خنکان، یەخـەی کـراس مل، بینە قاقا، گەردن، کۆلاَن

**خَنَاقَـة ( عـرَاك ):** شـەڕ، بـەگژاچوون، پیاهەڵشاخان

**خُنَاقِیَة:** نەخۆشیەکە دەدات لەگەرووی بـاڵندەو ئەسـپ و زیـاتریش لـــەکۆترا دیاری دەدات

**خُنَّان:** هەلاَمەتی وشتر

**خَنَان ـ خَنَان:** خۆشحاڵی، خۆشبەختی

**خَنَّـة:** مینگـە مینـگ کـردن، بـەلووت قسەکردن

**خَنَث:** ژنانی بوو، نامەرد، ژنانی

**خُنْثَی:** نـێرە مـووك، نـێرەمۆ، چەچە، نەمێرد، بێبەر، رەنگ مـەییك، کەسێك کەنیشانەی نێریش و مێشی پیوەبێ

**خَنجَـر:** خەنجــەر ، قەمــە، خەنجــەر، شینەتیغ، تیغێکـی تیـژی کەوانــەداری دەمپـانی لـــووت بـــاریکی دووخــداری مشـتووداره ئەخرێتـە کێلانەوەوئـەکرێ بەبەر پشتێنا

**خَنْخَنَ:** بەلووت قسەی کرد، مینگە مینگی‌کرد
**خُنْذُب(سَئ الخُلق):** بێئابرو، رەوشت خراپ
**خُنذُع:** ناپیاو ، نامەرد، بەد، خراپ
**خَنْدَق:** خەندەق ، کەندر، سپێر، کەندەك ، خەرەند
**خَنْدَق:** هەڵیکەند، چاڵی‌کرد، کاڵی دەردا
**خَنِزَ اللحْم:** بۆنیکرد، بۆگەنی‌کرد
**خَنْزَرَة:** کەتەوڵ ، زلە
**خَنْزَوَان:** مەیمون، نێرەی بەراز، یەکانە
**خُنْزُوَان:** خۆبەزلزانین، خۆبەگەورە دانان
**خِنْزِير:** بەراز، خوگ، وەراز وراز، گوراز، وەراز
**خِنْزِير البَحْر:** جۆرە نەهەنگێکە لەدۆلفین بچووکترە
**خِنْزِير الهِنْد:** ئاژەڵێکە لەکەروێشك دەچێت بەڵام لەو بچووکترەپێستەکەی بەڵەك بەڵەکە
**خَنْزِيرَة:** مالوس، دەر ، شەکە
**خِنْزِيرَة البِئْر:** جەنجەر ، چەرخی ئاو پێ‌هەڵهێنجان لەبیر
**خَنَسَ عَنْهُ:** دواکەوت، هاتەوەیەك، دوورکەوتەوە، رۆیی
**خَنَسَ إبْهَامَهُ:** کۆیکردەوە، هێنایەوەیەك
**خُنَّس:** لانەی مامز، ئاسك، مانگای کێوی
**خُنَّس:** سەرجەم هەسارەکان یان بەتەنیا هەسارە گەڕۆکەکان (زوحەل ، موشتەری، مەریخ ، زوهرە، عەتارد)
**خَنْسَاء:** مانگای کێوی
**خَنْشَار:** گژوگیایەکە
**خَنْصِر ـ خِنْصَر:** پەنجە تووتە
**خَنَعَ ـ خُنُوعَاً:** ملکەچ بوو،سەرشۆڕبوو
**خَنَعَ لَهُ وَإلَيهِ:** جاپلوسی بۆ کرد سەرشۆڕبوو بۆی
**خَنَعَ إلَى الله:** پاڕایەوە لەپەروەردگار بەبێ کردار
**خَنَعَ إلَى الأمْرِ السَئ:** حەزی پێکرد، روویەکرداری‌خراپەبوو،ئارەزوومەندبوو، هیواداربوو، دڵی بۆی لێدەدا
**خَنَعَ (ذُل):**سەرشۆڕی، نۆکەری، کارەکەریی، خزمەتکاریی، پێشخزمەتی
**خُنْعَة(رِيبَة وَعَار):** رسوایی، نزمی، سووکی، بێ‌نرخی
**خَنَفَ صَدْرَهُ أو ظَهْرَهُ:**یەکێك لەلاکانی پێچەوانەی ئەوی دیکە بوو
**خُنْفُس ـ خِنْفِس ـ خُنْفَس ـ خُنْفُسَاء:** کازۆلك، سفرەبرە،قالۆنچە،گوخلێنکە
**خَنَقَ ـ خَنَّقَ:** دەستی نایە بینی، تاسانی، هەناسەی‌بڕی،پەنگەموسی‌کرد
**خَنَقَ الرَايَة:** ئاڵای هێنایە ناوەڕاست بۆ پرسە، ئاڵای دانەواند
**خَنَقَ الإنَاء(مَلأه):**پڕیکرد، خەفەی‌کرد، لێوان لێوی کرد، سەر لێوی کرد
**خَنَقَ السَرَابُ الجَبَل:** خەریك بوو لوتکەکەی داپۆشێ
**خَنَقَ زَبِدُ الأرْبَعِين:** خەریکە دەبێت بەچل ساڵ ، کەیی بەچل ساڵی

**خَنِقْ:** خنكاو، هەناسە لێبڕاو، تاساو ، پەنگە مووس، خەفە
**خَنْقْ:** خنكاندن، تاساندن
**خُنْقَةُ اليَد:** مەچەك، بازندە ، زەند، فەرشك
**خَنوص ـ خَنوصَة:** پەڵخ ، بەچكەبەراز، تولە بەراز، كودەڵە
**خُنُوع:** سەرشۆڕكردن، نۆكەری كردن
**خَنُوع:** بەدكاریی گوماندار
**خَنيق:** خنكاو، تاساو، هەناسە لێبڕاو

**خ و**

**خَوَى:** چۆڵ بوو، بەتاڵبوو، هیچی تیا نەما، خاڵیبوو
**خَوَى البَيتُ خَواءً:** رووخاو وێرانبوو، چۆڵو بەتاڵبوو
**خَوَى رَأسَهُ:** خوێنی تیا نەما بەهۆی لووت پڕانەوە
**خَوَى الرَّجُل خَوىً وَخَواءً:** برسی بوو، سكی خاڵی بوو
**خَواء:** سك بەتاڵبوون لەخواردن، برسێتی، میان، بەتاڵ، خاڵی
**خَواجَة:** گەورە ، ئاغا، گەورە پیاوانی جوولەكە
**خُوار:** بۆڕە ، بۆڕە بۆڕ
**خُوار العَزم:** رووخان، ئارەزوونەمان، ویستو ئیرادە لەدەستدان
**خُوار القُوَى:** لاوازبوون، هێز نەمان
**خَوّار:** رووخاو، رماو، داتەپیو، دەستەمۆ ، كەوی
**خُوارات:** وشتری سستو لاواز
**خَوارِج:** گرۆهێكە لەكۆمەڵیموسوڵمانان دەرچوونو خاوەن راوبۆچوونی تایبەت بوون
**خَوّاص:** پیاو ماقوڵو گەورەیانی نەتەوەو كۆمەڵێك، تایبەت ، پوختە، پاڵفتە، یەكی یەكی
**خَوّاض:** لێكۆڵەر ، پشكێنەر
**خَوّاف:** ترسنۆك ، دڵ لاواز ، نەوێر
**خَوافق:** چوار لا
**خَوافق السَماء:** چوارلای هەڵكردنی رەشە با
**خَوالد:** شاخەكان، چیاكان ، بەرد
**خَوالق:** ئەو زەمینەی گژوگیای بەرچاو دیارە
**خُوان ـ خِوان:** خوان، سفرە، سینی
**خَوّان:** ناپاكو دەست پیسی بەردەوام
**خُؤُولَة:** خاڵوان، كەسو كارو خزمو خوێشی دایك
**خَؤُون:** ناپاك ، خیانەتكار، بەد
**خُوِيَة:** وشكە زەوی، رەقە زەوی ، سەختە زەوی
**خَوْخ:** قۆخ ، میوەیەكی خڕی مزری تووكنی سپاتی ناوك رەقە لەقەیسی گەورەترە
**خَوْخاء ـ خَوْخاة:** گێل ، گەمژە
**خَوْخَة:** قۆخێك، كلاو رۆژنە، دەرگای ناو دوو دەری، كونێكە لەناوەراستی بانا بۆ رووناكیو دوكەڵ لێوە دەرچوون ئەهێڵرێتەوە
**خَوَّدَ( سَارَ مُسْرِعًا ):** خێرا رۆیشت، بەپەلە چوو بەرێوە
**خَوْد:** ژنی جوانو جەحێل یان ئەندامو قەڵەم رێك
**خُوذان النّاس:** خزمەتكار، تەیان، پێشخزمەت

**خُوذة:** كلاو ئاسن

**خَوَرَ خَوَرًا:** لاوازو ساردبووەوە، شكا

**خَوْر:** كەنداوێكی بچووك، زەوی نەرم‌و چاڵ

**خَوِرَ:** لاواز بوو، بێ‌هێزبوو

**خَوِرَ الأرْض:** فش‌و نەرم بوو گڵو خۆڵەكەی بلاو بووەوە

**خُورُس:** شوێنی پەرستنی جوولەكەكان، پلەوپایەی خزمەتكاران

**خُوري:** كەشیش ، پیاوی ئاین، قەشە

**خُوَرْنَق:** نەقیزەیان پیاكردو كوژرا

**خَوَرْلَسي:** رۆیشتنێك بەچەشنی خۆبەزلزانین‌و خاوە خاوی پێوە دیارە، رەفتارێكی خۆ بەگەورە زانینانە

**خَوَّسَ الشَيء:** كەلی‌كرد، ناتەواوی‌كرد، لێی كەم كردەوە

**خُوشان:** گیایەكی ترشەڵۆكە

**خُوص:** گەڵای دارخورما، پەلكی دارخورما

**خَوْصاء:** چاوێكی رەش ئەوی دی سپی‌و جەستەشی سپی‌بوو

**خَوَّضَ الماء:** خۆی خستە ئاوەكەوە خۆی تێخست

**خَوْض:** رۆچوون لە گفتوگۆدا

**خَوْضة:** یەك دوورو مرواریی

**خُوط:** پەلكی ناسك، لكی ئاویی

**خَوَّفَ:** ترسانی، روحی برد، تۆقانی

**خَوْف:** ترس ، بیم ، سام پەروا، تۆقان، روح بردن، باك، ساف، هەراس، ئەنیش، بارێكە دڵی مرۆڤان دەخاتە لەرزەو كورپە كورپ بەهۆی دیتن یا بیستنی شتێكی وا كەگیان لێی برەوێتەوە.

**خَوَّلَ:** دەستەلاتی پێدا، مافی هەڵس‌وكەوتی دایە

**خَوَّلَ الشَيء:** پێی بەخشی، پێیدا

**خَوَّلَ حَقًا:** مافی پێدا، مافی پێ رەوابینی

**خَوَل(الحاشِيَة):** دەست‌و پێوەند، داردەست، بەردەست، ژێردەست، وەچ، منالی پچووك یان دەستەی نۆكەرو تەیان

**خَوْلَع:** ساوەر، گێل نەزان ، گورگ

**خُولَط:** شێت، تێكچوو ، ناتەواو

**خَوَّنَ:** خیانەتی‌كرد، ناپاكی نواند

**خَوَّنَهُ:** بوختانی بۆ كرد، بەدەست پیسی دانا

**خَوِيَ المَكان:** چۆڵو بەتاڵ بوو

**خَواء:** خاڵی، میانەی نێوان دووشت

## خ ي

**خَيَاب:** ئەو فنجانەی جادووگەر نیشانی نادات چونكە بەد و خراپە

**خِيَار:** هەڵبژاردن، مافی هەڵبژاردن، ماڵ بەرەهایی، خێرێكی زۆر باشترینی

**خِيَار(نَبات):** خەیار،ئارو ، ترۆزی، هاروو، هاروێ

**خَيَاس:** رزین ، بۆگەن كردن، داڕزان

**خَيَاش:** گونیە فرۆش

**خَيَاط:** درومان كردن ، درومان

**خِيَاط:** بەرگ دروو

**خِيَاطة:** دروون ، بەرگ دروون، بەرگ دروو

**خَيَال:** خەیاڵ، ئەندێشە، خەیاڵ پلاو، تارمایی، شێوە، زەلام ، سێبەر

**خَيّال:** سوار، ئەسپ سوار

**خَيَّالَة:** سواره، سوارچاكی
**خَيَالِي:** خه‌یالْ په‌رست، ئه‌فسانه‌یی
**خِيَــام( هَــوَادِج ):** كــه‌ژاوه، دووژووری پچووكه كه‌له‌سه‌ر پشـتی ولآخ دائـه‌نریْ بۆ ئه‌وه‌ی له‌ریْو رۆینا له‌هه‌ر ژوره‌یاندا یه‌كیْك تیایدا دابنیشیْ
**خَيَّــام:** ده‌وار نشـین، ئـه‌وه‌ی لــه‌ژیْر ده‌وارو چادرا ده‌ژی
**خِيَانَـة:** ناپــاكی، خیانــه‌ت ، پــه‌یمان شكیْنی
**خَيَّــب:** نــائومیْدیكرد، دلْـی شـكاند، ده‌ستبه‌تالْیكرد، هیوای بڕی
**خَيْبَــة:** هیــوا بــڕان ، ســه‌رنه‌كه‌وتن، بــه‌ده‌ست نه‌هیْنانی هیواو ئاوات
**خَيْـدَع:** ئــه‌وه‌ی متمانــه‌ی پیْنــاكریْت هاوڕیْیه‌تی له‌گه‌لا بیه‌ستریْ
**خَيَّر:** به‌باشی زانی، په‌سه‌ندیكرد
**خَيْر:** چاكه، باشه، فه‌ڕ، كه‌لْك، پیـت ، به‌خشنده‌یی، ئابرو
**خَيِّر:** پیاوچاك، خیْره‌ومه‌ند، به‌خشنده
**خَيِر:** به‌خشش‌و دلْفراوانی
**خَيَّرَ الشَّئ:** ریْـزو فــــه‌زلْی دا به‌ســه‌ر شتیْكی دیكه‌دا
**خَـيْرَة:** خـیْری بـــه‌رفراوان ، بـاش‌و چاكه‌ی هه‌موو شتیْك
**خِيْرَة ـ خِـيَرَة:** باشـترین، چاكـترین، نایابترین
**خَيْرِيٌ:** بۆ چاكه، بۆ خیْر
**خَيْرِيَّة:** چاكیْتی، باشی، نایابی
**خَيْزُرَان:** حه‌یزه‌ران، داریْكی هندیيه
**خَيْزَلِي:** ره‌فتاریْكی كه‌سانی خۆبه‌زلزانه
**خَيْس:** په‌ژاره، غه‌م ، تاریكی، درۆ

**خِيــسْ:** دارســتان، جه‌نگــه‌لْ، شــیْری بیْشه
**خَيَّشَ:** قامیش به‌ندی كرد
**خَيْـش:** پیـاوی خـراپ، رسـوا، ســووك، نزم
**خَيْشَـــة:** چــادرو ده‌وار، ره‌شمـــالْ، جه‌والْ، تیْرك، مۆڕ، گونیه
**خَيْشُوم( أَنْف ):** لووت، كه‌پو
**خَيْطُ الشَّيب:** سه‌ر سپی تیْكه‌وت
**خَيْطَ:** په‌ت ، ده‌زوو،به‌ن، كـنز،به‌كره، كشته‌ك، زی
**خَيط:** په‌ڕی وشتر مورخ
**خَيْطَل:** سه‌گ،عه‌تار،كۆمه‌لْه كولله‌یه‌ك
**خَيف:** ئــه‌وه‌ی چاویْكی شینه‌و ئـه‌وی دی ره‌شــه، چـاو تاكـه‌و تــاك ، چــاو دووڕه‌نگ
**خَيَّـف عَـنْ القِتَـال:** پشتــی هــه‌لْكرد، كشایه‌وه، په‌كی كه‌وت
**خَيَّفَ القَوم:** دابه‌زین ، لایاندا
**خِيفَة:** ترس‌و بیم، تۆقاندن، ترسان
**خَيَّلَ السَّحَاب:** هه‌وره‌كه چه‌خماخه‌یداو كه‌وته باران بارین
**خَيَّلَ فِيــه الخَـير:** چـاوه‌ڕیْبوو، خـیْری لیْره‌چاوكرد
**خُيِّلَ عَنْ القَوم:** لاوازو ترسنۆكبوو
**خَيَّل:** غاریدا، تاویدا، رمبازیكرد
**خُيِّلَ إِلَيه وَلَه كَـذَا:** وایـهات به‌خـه‌یالْدا، خۆی به‌شت زانی
**خَيَلَ:** به‌شه‌واره‌كه‌وت، چاوی ریْشكــه‌و پیْشكه‌یكرد،گیْژیكرد،شلْه‌ژانی،سه‌ری لیْ تیْكدا

**خُيَـلاء ـ خِيَـلاء:** لــه‌خۆبایی بــوون، خۆپه‌سه‌ندی

**خَيْلان:** په‌ری ده‌ریا

**خَيْلَــع:** تــرس‌و بیمێکــه لــــه‌دلا ده‌مێنێتـه‌وه‌و ده‌بێتـه مایـه‌ی دروســت بوونی وه‌سوه‌سه

**خَيَّمَ:** چادر یان ده‌واری هه‌ڵدا

**خَيَّم بِالمَكَان:** مایــه‌وه ، هــه‌ڵیدا، لایدا، دابه‌زی

**خِيَم:** سروشت‌و خوو، داب‌و نه‌ریت

**خُيَّمَت البَقَــر:** لــه‌په‌چه‌كه‌یدا خۆیـدا به‌زه‌ویداو جووڵه‌ی نه‌كرد

**خَيمَـــة:** چــادر، ده‌وار، ره‌شمــــاڵ، سه‌یوان، خێوه‌ت ، هــه‌ر ماڵێك له‌به‌رد یان شتی دیكه دروستكرابێت

**خِيَمِيٌ:** فــرۆش‌و دروســتكاری چــادرو ده‌وار



**خابئة. خابية** (گۆزە، کوپە )



**خس** (کاهو )



**خوخ** (قۆخ)



**حَصَف** (نەعل)



**خُدَارِيَة** (قەلەرەش)



**خيط** (بەکرە)



**خرُوف** (بەرخ)



**خيار** (خەیار)



**خرِيطَة** (نەخشە)



**خيمَة** (چادر ، خێمە )



**خرَز** (مت و مووروو)



**خطُ بِالقَلَم** (بەقەلەم نووسی )



**خِنْزِير** (به‌راز )



**خَنْجَر** (خه‌نجه‌ر)



**خُم** (كولانه )



**خَيَّال** (ئه‌سپ سوار)



**خَشَبَة** (دار ـ ته‌خته)



**خُزَاعَة ـ فُزَاعَة** (داهۆڵ)



**خَاتَمْ ـ خَاتِم** (ئه‌موستيله)



**خزف** (چينی‌و فه‌خفوری)



غُرْفَة النَوم (ژووری نوستن)



غُرْفَة الأكل (ژووری نانخواردن )



أمزَك (دار جگەرە)



أريكة خشبية (قەنەفەیەکی دارین)



عُلبَة خَشَبِيَة (قوتوویەکی دارین)



عَرَبة خَشَبِيَة(عارەبانەیەکی داریی)



برميل خشبي (بەرمیلێکی دارین)



قفص خشبي

(قەفەزێکی دارین)

# ٨ حرف الدّال

# د

**د**
هەشتەم پیتی زمانی عەرەبی‌یە

**دآ - دا**

**دَآءُ (مـرَض)**: نەخۆشـی ، ناسـاغی، ژەهری
**دَآءٌ**: نـەخۆش، دەردەدار، ناسـاغ، ناتەواو، ناساز، نەساخ، نەوەش بـوون، لەش بەبار
**دآئِب**: تێکۆشەر، رەنجدەر، کۆڵنەدەر، بەردەوام، هەوڵدەر، خەباتکار
**دَائِبَان**: شەو رۆژ
**دَائِحَةٌ**: درەختی گەورەو بڵند
**دَائِـرْ**: نەخولێتـەوە، ئەسـوڕێتەوە، کارئەکا، خڕ، دووبارە ئەبێتەوە
**دَائِرَةٌ**: بـازنە، ئەڵقە، ئاخلە، چەمەرە ، ناوچـە، هـەرێم، بەڕێوەبەرایـەتی، فەرمانگە
**دَائِري**: خڕ ، چەمەری، هەمی ، گردە
**دَائِفٌ**: هەڵچوو ، تواوە، ئاوێتەبوو
**دَائِـم**: بـەردەوام، هەمیشـەیی، جـاوید، سیفەتێکی پەروەردگارە
**دَائِمَاً**: هـەموو کـات ، هـەردەم، گشـت کات
**دَائِمي**: هەمیشـەیی، جـاویدانی، گشـت کاتی ، سەراپایی
**دَائِن**: خاوەن ، وام ، قەرزدەر
**دَائِي**: ناساغ ، نەخۆش، ناساز

**داب**: خشـۆك ، خشـندە ، گیاندارێکـە لەسەر سك بڕوا وەك کرمو مار
**دَابَّـةٌ**: ئـاژەڵ، وڵاخ، گیـــانەوەر، زیندەوەر، دەعبا، جانەوەر
**دَابِـرْ**: کۆتـایی ، بنـەڕەت، بنەچـە، رەگ، سـەرچاوە، ئەوپەڕ، رابوردوو
**دَابُوق**:کەتیرەی سەوز، غرێ،دەموکانە
**دَاثـر**: تیـاچوو، فەوتـاو، لـەناوچوو، نەماو
**دَاجّ**: بەحەماڵو بار هەڵگران دەوترێـت چونکە بەسەرزەویدا دەڕۆنو دەچن
**دَاجي**: ریاییکرد، دڕۆیکرد،مەراییکرد
**دَاجَن**: مەراییکرد، ماسـتاویکرد،مامـە حەمەییکرد
**دَاجِنْ( أَلِيف )**: ماڵی، هۆگر، ڕام، کەوی
**دَاجِنَـةٌ**: هـەوری بارانـاویی، بارانـی بەردەوام
**دَاجِيّ**: خۆشگوزەرانیو خۆشحاڵی
**دَاحَ**: کشا، فراوانبوو، گەورەبوو
**دَاحَت الشَّجَرَةُ**: گەورەبوو، پـەلو پـۆی دەردا
**دَاحُ**: نـەخشێکە دەخرێتـە بـەرچاوی منالان، جۆرە بۆنێکی خۆشە
**دَاحَةٌ**: دنیـا، دنیـای رۆشـن، ئـەوەی هەستی پێدەکەین لـەژینو دەسـتووری گەردوون
**دَاحِرْ**: دووری خستەوە،پەراگەندەیکرد

**دَاحِسْ ـ دَاحُــوس**: مــوو ، دوومــەلّ، بزمارە

**دَاحَــلَ**: هەڵیخەڵــەتاند، فریــوی‌دا، چاوبەستی لێکرد

**دَاحُــول**: ئــەو داوەی راوچــی مــامز دەینێتەوە

**دَاخَ**: ملی‌کەچککرد،خۆی دابەدەستەوە

**دَاخَ البِــلادَ**:دەســتی بەســــەراگرت، خستیە ژێر دەستەڵاتی خۆیەوە

**دَاخَ الرَّجُل**: گــێژی خــوارد، گێژبــوو، وڕبوو،تـاس بردیـەوە، ســەرە خولێــی توش هات، بورایەوە، لەهۆش چوو

**دَاخَلَ**: خـۆی تــێ هــەڵقورتان، خــۆی تێ هاویشت

**دَاخِلْ**: ناوەوە، ناوەکەی ،ژورەوە

**دَاخِلَةُ الإنْسَان**: نیەتی، ناخ‌و دەروونی، بیرو باوەڕی

**دَاخِلَــةُ الإِزَار**: ئـەوەی دێـت بــەدوای جەستەدا

**دَاخِلَةُ الأَرْض**: نـادیارو نهێنیەکانی نێـو ناخی زەوی

**دَاخِلِيّ**: ناوەکی، ناوخۆیی، لـەناوخۆدا، شتی ناوە

**دَاخِلِيَّة**: ناوخۆیی ، ناوەکی

**دَاخِلِيًّا**: لەناوخۆدا، لەناوەوە

**دَادَ الطَّعَــام**: کرمــی هەڵــهێنا، کرمــی تێدا

**دَارَ**: خولایــەوە، ســوڕایەوە، خــولی خوارد، وەرچەرخا، گەڕانی

**دَارَ بِالشَّــئ**: پێوەســــوڕا، پێــوەی وەرچەرخاو گەڕا

**دَارَ الدَّهْــــر**: رۆژگـــار وەرگــــەڕا، هەڵگەڕایەوە، رۆیی‌و بەسەرچوو

**دَارَ مَعَ الزَّمَن**: لەگـەلّ کاتـابوو، کـوڕی رۆژ بوو

**دَارَ فِــي الشَّــوَارِع**: کۆلگــێڕی‌کرد، سوڕایەوە

**دَارْ**: مالّ ، خانوو ، لانە، خنیك، موڵك

**دَارُ الآثَار**: مۆزەخانە، عەنتیکە خانــە، ئـەو لانەیەــە کــەپاشماوە دێریــن‌و کۆنەکانی تێدایە

**دَارُ البَقَاء**: قیامەت ، ئـەو دنیـا، رۆژی دوایی ، پاشە رۆژ

**دَارُ الفَنّ**: خانەی هونەر، لانەی هونەر

**دَارُ التَّمْثِيل**: شـانۆ، شـوێنێکی بـەرزە لەتەختــە دروســت ئــەکرێ نمــایش‌و شـانۆگەریی یـاخود ســەمای لەســـەر دەکرێ

**دَارْصِينِي( قِرْفَة )**: دارچینی، داچیــن ، توێکڵــە دارێکـی سـوورکاری بۆنخۆشـی گەرمیانی‌یە لێدەنرێ بەچایی لەگــەلّ بەهاراتیشا بەکار دەهێنرێ

**دَارُ الفَنَاء**: دنیای تیاچوو

**دَارُ القَضَــاء**: دادگـا، دادگــە ، دیوانــی دادو هاوارو گلەیی پرسین

**دَارُ القَمَر**: خەرمانەی مانگ

**دَارُ المُعَلمِين**: لانەی مامۆستایان

**دَارَ ـ دَرور ( كَثْرَةَ اللبَن )**: ئاژەڵێك شیری زۆر بێت

**دَارَان**: دنیـاو قیامـەت ، هـەردوو دنیـا، ئەم دنیاو ئەو دنیا

**دَارَى**: دڵنەوایی‌کرد، دڵی برد بەڕێوە

**دَارِب**: پشت سوورو دلێر

**دَارَة**: خەرمانەی مانگ، قیبلە، رووگە، بەلای سەخت، زەوی بەر فراوان

**دارِجْ:** باو ، ناسراو، ئاسایی، ئەوەی تێدایە
**دارِس:** کۆششیکرد، تەقەلایدا،خوێندی
**دارِع:** زرێ پۆش ، زرێدار، کەسێکە زرێ لەبەر بکات
**دارِعَة:** کەشتیەکی جەنگی لەپۆلا دروستکراو
**دارِك (تَبِعَ ـ لاحَقَ):** شوێنیکەوت، بەدوایا رۆیی، پێبەپێ رۆیی
**دارِم:** درەختێکی بیابانییە
**دارِي:** خاوەن بەخشش و نیعمەت، ئەوەی لەماڵدایە ، ماڵی، کەوی ، دەستەمۆ
**داسَ الشَّئ:** سووك و رسوای‌کرد، پانیکردەوە، پێی پیانا، پلیشانیەوە
**داسَ الطَرِيق:** کوتایەوە، هاتەوە بەسەریا
**داسَ السَيفَ:** تیژیکرد، ساویدا
**داسَ الزَّرْعَ:** دوورییەوە،هاتەوە بەسەریا
**داسُوس:** جاسووس، سیخور، کەسێکە کەبەدزییەوە هەواڵ و باسی یەکێك یاخود شوێنێك بەلایەن و دەزگاو یەکێك بگەیەنێ
**داشِن:** تازە ، نوێ
**داشِن مِنْ الثِياب:** جل و بەرگی نوێ
**داشِن مِنَ الدُور:** ئەو ماڵانەی هێشتا کەس تیایاندا جێنشین نەبوە
**داعَى:** شکاتیکرد، سکاڵایکرد
**داعَى الحائِط:** وێرانیکرد، روخاندی، رماندی
**داعَبَ (مازَح):** یاریکرد، گاڵتەیکرد، گەمەی کرد، شۆخیکرد
**داعَبَ المَرْأة:** یاری و دەستبازی لەگەڵکرد
**داعِبْ:** گاڵتەچی، تیزەجاڕ ، گاڵتەباز
**داعِرْ:** سۆزانی، داوێن پیس، بێئابرو
**داعَسَهُ:** بریندارێکرد، زامداریکرد
**داعَكَ:** بەتوندی دژایەتیکرد، ناکۆکی نواند، دژی وەستا
**داعِمْ:** پیاکێشەر، لێدەر
**داعِي ـ داعِيَة:** بانگخواز، هۆ، هاندەر، ئەوەی خەڵکی بانگدەکات بۆ رێبازو بیروباوەڕێك
**داغِر:** بەدرەوشت، بەدخوو، ریسوا، سوك، نزم
**داغَشَه:** لەسەر ئاوەکە دەوریداوتەنگی پێهەڵچنی
**داغِصَة (اللحم المُكْتَنِز):** تێکسمڕاو ، قەڵەوی شیشمان
**داغِصَة (صَابُونَة الرُكْبَة):** کلاوەی ئەژنۆ، کەشکەژنۆ
**داغِل (فاسد):** ناپاك، بەدخوو، بەد رەوشت، تێکدەر، نزم، سووك
**داغِلَة:** کینەی نێو دەروون، کۆمەڵێك ناتەواوی و عەیبی یەکێکیان بەردەست بکەوێت
**دافَ:** شلەقانی، تێکیدا، تێکەڵیکرد، توانیەوە، ئاوێتەیکرد
**دافَّ:** خێرایکرد، پەلەیکرد، دەست و بردیکرد
**دافَّ عَلَيه:** مەلمەتی کردە سەری و تەواو کوشتی
**دافَّة:** کۆمەڵە خەڵکێك لەشارێکەوە بچن بۆ شارێکی دی

**دَافَعَ عَنْهُ الأَذَى:** پاراستی، بەرگری لێکرد
**دَافَعَ عَنْه:** پاراستی، بەرگری لێکرد
**دَافِع:** دوور خەرەوە،دەستپێوەنەر، مۆ ، هاندەر، پاڵنەر
**دَافِق:** بەلێشاو ، بەپچڕ پچڕ دێت بەدوای یەکدا
**دَافَعَه:** پاڵی پێوەنا ، ئەمرۆ بەسبەینیێی کرد، بەرێیکرد
**دَافِن الأمر:** نهێنییەکەی،ناوکرۆکەکەی ، ناوەکەی، ناوەوەی
**دَاقَ الطَّعَام:** چەشتی ، تامیکرد، چێژتی
**دَاكَ القَوم:** شڵەژان، شپرزەبوون، ئاژاوەیان تێکەوت
**دَاكَ الشَّئ:** کوتای، شێلای، وردو خاشیکرد
**دَالَ دَولاً وَدُولَة:** زانرا، ناسرا، ناوی دەرکرد، ناوبانگی پەیاکرد
**دَالَ الزَّمَان:** رۆژگار گۆڕا ، رۆژگار وەرچەرخا
**دَالَ الرَّجُل فِي مَشْيَتِه:** خێرایکردو لەکاتی نزیك بونەوەدا هێواشی کردەوە
**دَالَ الثَّوب:** پروا، رزا، کۆتبوو، داوەشا
**دَالَ بَطْنُه:** ئاوسا، کشا، بەرزبوەوە
**دَالِي:** نەرمیو دڵراگرتنی بۆ نواند
**دَالَّة:** ناوبانگ، ناسراو، دیار، ئاشکرا، بەرچاو، نیشانە
**دَالِح:** دەرهێنانی ئاو لەبیرو بەتاڵکردنەوەی لەحەوزێکدا
**دَالِح:** هەوری باران هەڵگر، هەوری پڕ باران، هەوری بەباران

**دَالَسَه:** هەڵی خەڵەتاند، فێڵیلێکرد، فریویدا، چاوبەستی لێکرد
**دَالِف:** تیرێکە نزیك نیشانە پاشان لەشوێنی خۆی دەترازێ
**دَالِي:** بەکێشکردنی دۆڵچە لەبیردا
**دَالِيَة:** جەنجەر،ئاوسەرخەر، گەردونی، ناعور ، چەرمێکی دوو فلیقانەیە ئاوی پێ هەڵدەگۆزرێ لەبیر
**دَام:** مایەوە، بەردەوامبوو، یەك بینە مایەوە، چەسپا، جێگیربوو
**دَامَت الدَّلو:** پڕئاوبوو، سەرلێوبوو
**دَامَا:** یارییەکە خانەی کێشراوی هەیە وەك خانەکانی شەترەنج ، دامە
**دَامِج(لَيل دَامِج):** شەوی تاریك، نوتەك، بێتروسك، تاریکە شەو
**دَامِجَانَة ـ دَمْلَجَانَة وَدَمَجَانَة:** کوپەی گەورە کەبۆسرکە نانەوە دروستکراوە
**دَامِس:** تاریك ، نوتەك، چەتوون
**دَامِع:** تەڕ ، پاراو ، ئاو لێ تکاو
**دَامِغَة:** ئەو لێدانەی کەدەگات بەمێشکو سەر، لێدەر ، بڕەڕ، تەواو
**دَامِكَة:** سەختیو بەلا، نەهامەتی
**دَامَلَهُ:** دڵی راگرت، دڵی برد بەڕێوە، سەغڵەتیکرد
**دَامُوس:** ئەو رەوگەو جێگەیەی راوچی خۆی تێدا حەشار دەدات کاتی راوکردن
**دَامِي:** خوێنی لێدێ ، خوێن لێهاتوو
**دَامِيَة:** ئەولێدانەی خوێن دەردەپەڕێنێ، خوێناوی ، خوێنین
**دَانَ:** لاوازو کزو سەرشۆڕو نزم بوو
**دَانَ الرَّجُل:** ملکەچ بوو، گوێڕایەڵبوو

**دَانَ**:قـەرزى پێدا ، فەرمانى دابەسەريا، كردى بەئاينى خۆى
**دَانِي**: نزيك ، پێشەوە، نزم
**دَاهَى**: بەلاّو نەهامەتى هات بەسەرياندا
**دَاهَنَ**: پێچەوانـەى نێوناخو دەروونـى بەدەرخست، چاپلوسىكرد
**دَاهِيَة**: موسيبەت، بـەلاّ، نەهامـەتى، نارەحـەتى، كارەسـات، چـورتم، گێـژى رۆژگار، بەدبەختى دنيا
**دَاوَى**: چارەسـەريكرد، باشـيكرد، تيماريكرد
**دَاوَرَ**: لەگـەڵى هەڵسـوڕاو خولايـەوە، لەپاڵيا چەرخا
**دَاوَرَ عَلَى الأَمْر**: چارەسەريكرد
**دَاوَلَ اللهُ الأَيَام بَيْنَ النَاس**:پەروەردگار رۆژگارى لەنێوان خەڵكيدا وەرچەرخان جـارێك بـۆ ئـەوان جـارێكى ديكـە بـۆ ئەوانى دى
**دَاوَمَ**: مايـەوە، بـەردەوام بـوو، لەسەررەوييەى بەردەوام بوو
**دَاوَمَ الأَمْرَ**: لەسەر كار بەردەوامبوو
**دَايَة**: مامان ، دايەن
**دَايِغ**: ور ، گێـژ، كـاس، دۆش، هـێڕ، حۆل، هوڕكردن
**دَايَنَه**: مامەڵـەى لەگەڵكردو يـەكێكيان قەرزيدا بـەوى ديكەيان ، لێى پرسيەوە
**دَأَبَ فِي العَمَل**: رەنجيـدا، تێكۆشـا، ماندوبوو
**دَأَبَ فِي الشَر**: خراپـەو شـەڕى كـردە پيشەو خوى پێوەگرت
**دَأْب( عَـادَة )**: خـوو ، رەوشـتو دەق پێوەگرتن

**دَأْب**: كۆڵنەدان، بەردەوامى، تێكۆشان، شەكەتىو هەوڵدان

**دب**

**دَبَّ**: بەسـەر سـنگ رۆيـى، خشـا، گاگۆڵكێى كرد
**دَبَّ الشِقَاق بَيْنَهُم**: ئاژاوەيـان تێكەوت، ناكۆكى كەوتە ناويانەوە
**دَبَّ فِيه الفَسَاد**: خراپـەى تێكـەوت، بۆنىكرد
**دُبّ**: ورچ، درندەيەكى تووكنى گەورەى كێوييـە بەئـەندازەى جاشـەكەرێك دەبێتو دەستوپێى وەك دەستو پێـى مرۆڤ وايە
**دُبّ الأَكْـبَر وَالأَصْغَـر**: حەوتەوانـەى گەورەو بچووك
**دَبَى ـ دَبَاة**: كوللە مسكە، پىَكـوڕە، فەرخە كوللـە كەهێشتا باڵى نـەگرتبىَ تازە خەريكى پىَ هەڵگرتن بێت
**دُبَّاء**: كوولەكە
**دَبَّـاب**: ئـەوەى زۆر دەڕوات، لاوازێـك كەكوتە كوت دەڕوات
**دَبَّابَة**: تانك ، دەبابە ، خشۆك
**دَبَّاج**: فرۆشى پارچە ئاوريشم
**دُبَّـاخ(لُعْبَـة النَـطّ )**: سـنگەوباز، دايماسـۆن، سـنگەو بـازد، هـەڵچوون بەسەر يەكێكدا لەگەمـەى كەوشـەكێندا تێكەوتبىَ
**دَبَـار**: تيـاچوون ، فـەوتان، نـەمان ، دوابران
**دَبَـار**: گژوگيـاى نێـو كێڵگـە، رووداو، شكستو دۆڕان
**دَبَّاس**: دۆشاوگر، دۆشاو فرۆش

**دَبّاغ:** پێستە خۆشکەر، دەباخچی
**دِباغَة:** دەباخچێتی، پێستەخۆشکەر
**دُبَال:** پەیین ، سەنێر ، تەرسی وشك
**دَبَبَ:** قـژی زۆر ، یەكەم بەچكەی نێری مانگا
**دَبَّة:** دەبە، دۆلكەیەك بۆ زەیت، شوێنێك بەردی زۆربێت، كوولەكە
**دَبَجَ ـ دَبْجَة:** رازاندیەوە، جوانیكرد، ئارایشتیدا
**دَبَجَ الطَّيلَسان:** رازاندیەوە بەپارچە ئاوریشم
**دِبْدَان:** تەپڵ ، دەهۆڵ
**دَبْدَبَ الحَافِر:** سمكۆڵیكرد، تەپەو دەنگی سمی هات
**دَبْدَبَ بِرِجْلِه:** تەپەی پێی هات
**دَبْدَبَة:** تەپەی پێ، خشەی پێ
**دَبَر:** پشتی هەڵكرد،رۆیی، تێپەڕیی
**دَبَرَ الرَّجُل:** مرد ، گیانی سپارد
**دَبَّرَ:** رێكیخست، ئامادەیكرد، پێكیهێنا، جێبەجێیكرد، بەڕێوەیبرد، پاشەكەوتیكرد
**دَبَّرَ تُهْمَة:** بۆی هەڵبەست ، دایەپاڵی
**دَبَّرَ خطَّة:** نەخشەی كێشا،تەگبیریكرد
**دَبَّرَ مَكِيدَة:** پیلانیگێڕا ، بۆسەی نایەوە
**دُبُر:** كـۆم ، كـون ، قنگ ، قـاش، كۆتایی، بن، پندۆك، ئەندامی شەرم
**دَبْر:** مـردن ، تیـاچوون ، فـەوتان ، نەمان
**دَبْر:** كۆمەڵە هەنگو زەردەواڵەیەك
**دِبْر:** ئـەوەی زەردەواڵـە یـان هـەنگ پێوەی داوە

**دِبْرَة:** پێچەوانەی رووگەو قیبلە
**دِبْسَ العِنَب:** باش گەیی،شیرین بوو
**دَبْسَ العَصِير المَغْلِي:** خەست بـوەوە، بوو بەدۆشاو
**دَبْسَ الشَّيْ:** شاردیەوە، بۆسەیدا
**دَبْس:** زۆر ، مشە، فـرە ، زەبـەندە، زیاد
**دِبْس( عَسَل العِنَب وَاالتَّمْر ):** دۆشـاو، دۆشاوی خورماو ترێ
**دِبْس:** شیرینی هەنگ، شیرینی خورماو شتی دیكە
**دُبْسَة:** سـووری تـێر كـە رووەو رەش دەردەكەوێت
**دَبَغَ الجِلْد:** پێستەی خـۆشكرد، دەباخیكرد، تاڵاویكرد
**دَبْغ:** پێستەی خۆشكراو، تاڵدراو
**دِبْغ ـ دِبْغَة:** كەرەستەی پێستە خۆشكردن
**دَبْغ الجُلُود:** پێستە خۆشكردن، تاڵاوكردن
**دَبَقَ الصَّائِد:** راویكرد بەقاچ پیالكان
**دَبَقَ بِه:** پیانوسا ، پیالكا
**دِبْق( لَزِج ):** الینج، لكێنەر،پیانووسێنەر، لیچق، چەسپ وەكو چەسپی چریش و ئیدی
**دِبْق ـ دَابُوق:** كەتیەرەی سەوز، غرێ
**دَبْكَة:** سەمایەكی بەناوبانگە، شایی ، هەڵپەركێ
**دَبَلَ الأَرْض:** بەهێزیكرد بە پەیین
**دَبَلَ الشَّيْ:** بەشێوەیەكی گشتی چاكی كرد
**دَبَلَ ( سَمَّدَ ):** پەیینیكرد

**دَبْل:** رشانەوە، حەوز ، روباری بچووك

**دَبْلَة:** دومەڵی نادیارو ناوەکی، کونی تەور

**دُبْلَة( اللقمَة الكَبيرَة ):** پارووی زل

**دِبْلَة:** ئەڵقە ، ئەموستیلە ، ئەڵقەی بێنقێم‌و پیرۆزە

**دِبلوم:** دبلۆم ، ئاستێکی ئەکادیمیە لەخوێندن

**دِبْلُومَاسي:** دبلۆماسی، نوێنەری دەوڵەت لەوڵاتان

**دَبُوب:** قسەهێنەرو قسەبەر، ئەوەی نێوانی خەڵکی تێکدەدات،بوختانکەر، فیتنە، ئاشوبگێڕ

**دَبُوب ـ دِيبُوب:** قەڵەو ، خرپن، گۆشتن ، تێکسمڕاو، قەڵەویچکە

**دَبُور:** بای خۆرنشین

**دَبُور( زُنْبُور ):** زەردەواڵە، سیرەمۆزە، گیاندارێکە رەنگ زەردو باڵدارو چزوداره لەهەنگو مێش زۆر گەورەترەو هەندێکیان کوشندەن

**دَبُورَة:** ئامێرێکە بەردی پێ رێکدەکرێ

**دَبُوس:** دەرزی سەرخڕ، دەمبوس، دەرزی سنجاق

**دَبُوس الفَسِيل:** مێکوت،دارێکەسەرێکی خڕی پێوەیەو جلو بەرگی پێدەکوترێ لەکاتی شتندا

**دَبُوقَاء:** کەتیرەی سەوز ، غرێ

**دَبُول:** جەرگ سوتاو، لەناوچوون، سەختی‌و نارەحەتی

**دَبِيب:** هەموو رەویندەیەك بەسەر زەویدا ، زیندەوارانی دەریایی

**دُبَيت الأرْض:** کوللەمسکە یا کوللە پێکورە هەمووی خوارد

**دَبِيغ:** پێستەی خۆشکراو، دەباغ کراو

**دُبَيلَة:** دومەڵ، سەختی، نارەحەتی، ناسۆری

**دث**

**دِثَار( غِطَاء ):** داپۆشەر، سەرەخەر، لێفە، بەتانی، جاجم

**دَثَرَ الرَّسْم:** فەوتا، سڕایەوە، تیاچوو، کوژایەوە، پوکایەوە

**دَثَّرَ:** لەناوی برد، کوژاندیەوە،سڕیەوە، پوکانیەوە، دای پۆشی

**دج**

**دَجَّ القَوم:** لەسەرخۆ تێپەڕین، بەهێواشی رۆیشتن

**دَجَّ البَيت:** دڵۆپەی کرد، تنۆك تنۆك ئاوی لێچۆڕا

**دَجَّ السِتَر:** دایدایەوە، هێنایە خوارەوە

**دَجَا اللَيل:** تاریکی‌کرد، تاریکداهات

**دَجَا الثَوب:** فراوانبوو، گوشادبوو

**دَجَاج ـ دُجَاج:** مریشك ،مامر، مر، باڵندەی ماڵی، مرەباخی

**دجَاج الهِنْد والحَبَش والتركي والرومي:** قەلەمون ، عەلە شیش

**دُجَاج فِرْعَون:** مریشکی شاخدار

**دَجَاجَة:** مریشکێك ، یەك مریشك

**دَجَاجِي:** مریشك فرۆش، پسپۆڕی باڵندە

**دَجَّال( مَاء الذَهَب ):** زێڕپڕۆش، رووکەش، زەرکەفت، زەرکفت

**دَجَّال( كَذَّاب ـ عَرَّاف ):** درۆزن ، جامباز، دەستبڕ، جادووگەر ، فاڵچی

**دَجَّال( سَرْجِين ـ الزِّبْل ):** پەیین،تەپاڵە، رجین، زبڵ

**دُجَالَة**: قەتران، تار، رۆنی هەندێ درەخت

**دَجَّالَة**: کۆمەڵێکی گەورە

**دُجَّة**: تاریکیەکی چەتوون، تاریکایی بێتروسك، شەوەزەنگ، ئەموستەچاو

**دَجَّجَ (لَبِسَ السِّلاحَ)**: چەکی لەخۆیدا، چەکی بەست، خۆی پڕ چەك کرد

**دَجَّجَتِ السَّمَاءُ**: هەوریکرد، بەری ئاسمان بەهەور گیرا، بوو بەهەور

**دَجِرَ**: تیاما ، سەری سوڕما

**دُجْرَان**: داری ڕێککراوی سەردەوار یان ماڵ

**دَجَلَ (كَذَبَ)**: درۆیکرد، راستی‌نەکرد

**دَجَلَ (طَلاهُ بالدُّجَيل)**: چەوری کرد، تاری تێهەڵسوو، بەقەتران هەنوی کرد

**دَجَّلَ**: زێڕپۆشی‌کرد

**دَجَّلَ الأَرْضَ**: پەینی تێکرد

**دَجَّلَ عَلَيهِ**: هەڵی خەڵەتاند، فێڵی لێکرد، جادووی لێکرد،چاوبەستی لێکرد

**دِجْلَة**: یەکێکە لەدوو روبارە مەزنەکەی عێراق

**دَجَنَ القَومُ**: هەورو بارانی تێدابوو

**دَجَنَ الليلُ**: تاریکبوو، رەشبوو

**دَجَنَ بِالمَكَانِ**: مایەوە،هەڵیدا، جێنشینبوو

**دَجَنَ (أَلِفَ وَاسْتَأنَسَ)**: ماڵیبوو، هۆگربوو، کەویبوو

**دَجَّنَ الحَيوَانَ**: ماڵی‌کرد، کەوی‌کرد

**دُجْنَة**: تاریکی ، رەشی ، بێترووسك

**دُجْنَة فِي أَلوَانِ الإبِل**: ناشیرین ترین جۆری رەش ، تاریکترین

**دُجُنَّة ـ دَجِنَّة ـ دِجِنَّة**: هەوری رەشی باراندار

**دَجُوجِيّ**: شەوەزەنگ، تار، شەوی تاریك

**دَجِيّ**: شەوی تاریك‌و نوتەك

**دُجْيَة**: تاریکی یان لەگەڵ هەورو هاڵ

**دُجَيل**: تار، قەتران ، رۆنی هەندێ درەخت

## د ح

**دَحَـا اللهُ الأَرْضَ**: فراوانی‌کرد، گوشادی‌کرد

**دَحَا البَطْنُ**: ئاوسا ، گەورە زلبوو

**دَحَّاس ـ دُحَّاس**: کرمێکی زەردە لەژێر خۆڵدا

**دَحَّال**: راوچیەك راو بەداو بکات

**دَحَى الشَّيءَ**: فراووان‌و گوشادی کرد

**دَحَرَ (هَزَمَ)**: شکانی، بەزانی، بۆڕیدا

**دَحْر**: شکاندن ، بەزین، تێشکان، بۆڕخواردن

**دَحْرَجَ**: تل بووەوە، گلۆربووەوە، هاتەخوارەوە

**دُحْرُوجَة**: ئەو تەرسەقولەی کەقالۆنچە تلی ئەدا، خلێنکە

**دَحَسَ بَيْنَ القَومِ**: ئاژاوەو گێچەڵی نایەوە، فیتنەیکرد لەنێوانیاندا

**دَحَسَ الشَّيءَ**: پڕیکرد، سەرلێوی‌کرد

**دَحَسَ يَدَهُ**: دەستی تێخست، چنگی پیاکرد

**دَحِسَ الأُصْبُعُ**: مووی لێهات

**دَحَضَ ـ دَحْضَ**: بەتاڵی‌کردەوە، بەدرۆی خستەوە، بیانوی بڕی

**دَحَضَ عَنِ الأمْرِ**: لێی کۆڵیەوە، بۆی کەڕا

**دَحَضَ الحُجَةَ:** هەڵیوەشاند، بەتاڵی کردەوە
**دَحَضَ الشَمْس:** بەرەوئاوابوون چوو
**دَحَضَ رجْلَه:** پێی هەڵخلیسکا
**دَحْض( تَفْنيد وَإِبْطَال ):** بەتاڵکردنەوە، بەدرۆ خستنەوە
**دَحَض( المَكَان الزَلَق ):** خلیسك، لووس، پێهەڵخلیسکێنەر
**دَحِل:** سکی زلو گەورەبوو، ورگی گەورەبوو
**دَحْل ـ دُحْل:** چاڵێکە کونەکەی تەنگو لەژێریشەوە فراوانە
**دَحِل:** قەڵەویچکەی کورتە بنەو ورگ زل، فریودەر، هەڵخەڵەتێنەر
**دَحْلاء:** بیرێك دەمەکەی تەنك بێتو ئەملاو لاکەی فراوان بێت
**دَحُور:** دوورخراوە، پەراگەندەکراو
**دَحُول:** بیری دەم تەسكو ناوفراوان

## د خ

**دِخَال:** کلکی ئەسپ، چوون بەنێویەکی جومگەکان
**دُخَان ـ دُخَان:** دووکەڵ، هەڵم، ژەنگار، تەم، دووکێل، کاروو، کاری، دومان
**دَخسَ الشَئ فِي الرَمَاد:** کردی بەژێر خۆڵە مێشەوە
**دَخَسْ:** دەردێکە لەسمی ولاخدا، سم گەنین ،ئارنگ، شەلکە
**دُخس( دُلْفِين ):** دۆلفین
**دَخَلَ:** چوەناوی، تێیچوو، خۆی پیاکرد، دەستی پێکرد
**دَخَلَ فِي:** پیاچوو، پیاتێپەڕی،کونیکرد
**دَخَلَ عَلَيه:** سەریدا، چوە لای
**دَخَلَ بِلا إستئذان:** بێپرس خۆیپیاکرد
**دَخَلَ عَلَى زَوْجَتِه:** چوە پەردەوە، چوە لای خێزانەکەی
**دَخَّلَ:** پیاکرد ، خستیە ناوی، تێی ئاخنی ، تێی فرێدا ، کردیە ژورەوە
**دَخَلَ فِي عَقْله أوجَسَده:** تێکچوو، شێت بوو، لێی شێوا، هۆشی نەما
**دُخِلَ أمْرُ فُلان:** لەناوەوە تێکچوو، لەناوەوە بۆگەن بوو
**دَخْل( رِيبَة ـ شَك ):** گومان ، دوودڵی، سووسەکردن
**دَخَل( فَسَاد العَقْل ):** تێکچوون ، شێتی، عەقڵ بارکردن ، هۆش نەمان
**دُخْلَة( زَفَاف ):** شەوی پەردە، شەوی زاواییو بوکێنی، چوونە پەردە
**دَخْمَس( خَدَع ):** هەڵی خەڵەتان، فێڵیکرد، خەڵەتانی
**دَخْمَسَة( خِدَاع ):** هەڵخەڵەتان،فێڵکردن، خەڵەتان، چاوبەست
**دَخَنَ:** دوکەڵی لێهەڵسا ، ئاگرەکە دوکەڵیکرد
**دَخِنَ الطَعَام:** بۆنی دووکەڵی گرت
**دَخَن (دُخَان):** دوکەڵ ، هەڵم، دووکێل
**دَخَن( فَسَاد ):** خراپەو دڵ پیسی، بەدخویی، بەدڕەوشتی
**دُخْن( نَبَات ):** هەرزن، گاڵی، گارپس ، ئەرزن، گارس، گاڵ، دانەوێڵەیەکی وردی لووسی بێپیزە ئەکرێ بەنان
**دَخَنَ الشَئ:** دوکەڵی لێ بەرزبوەوە
**دَخَّنَ التِبغ:** توتنی بەکارهێنا، توتنی کێشا
**دَخْناء:** رەنگ ڕەشی وەك دوکەڵ

# ١٠ حرف الرَّاء

ر

دەیەم پیتی زمانی عەرەبی‌یە

**رآ ـ رأ**

**رَائب( مُخَثَّرْ ):** مەییو ، بزرکاو، پیچکاو، تێکچوون، بۆشیر بەکاردێت

**رَائِجْ:** خواستو داوا لەسەر،ئەوشتەی داوای دەکەن،دەیانەوێت ، ویستراوە ، برەو، خوازراو

**رَائِحَة:** بۆنی خۆش ناخۆش، هەربۆنێك

**رَائَدْ( كَشّاف ):** دیدەوان،گەڕیدە،گەڕۆك، گەشتەوان، پلەیەكی سەربازییە

**رَائِدْ:** ئەستێرەی سەرشان، سیخوڕ، پێشەنگ، دەسكی دەستاڕ

**رَائِشْ:** ئەوەی دەكەوێتە نێوان بەرتیلدەرو ئەوەی وەریدەگرێت

**رَائِضْ( مُرَوِضْ الخَيِل ):** رامێنەر، چەڵدكار، رامێنەری ئەسپ

**رَائِعْ:** پەسەند،گونجاو، شاد، بەدڵ ، نایاب، ناوازە، ترساو ، تۆقاو

**رَائِعَة النَّهَار:** درێژایی رۆژ، سەراپای رۆژ، رۆژی نیوەڕۆ

**رَائِفْ:** نەرمو نیان، میهرەبان، بەسۆز

**رَائَق:** روون، ساف، سازگار، سافو گەش، رۆشن، پاڵێوراو، پاڵفتە ، زرنگ

**رَائِمْ ـ رَائِمَة:** سۆزو بەزەیی وشترە دایكانەبۆ بەچكەكانی

**رَابَ:** ناپەسەندی بەدیكرد، گومانی هەبوو بەدگومان بوو

**رَابَ اللبَنْ( خَثُر ):** مەیی، بزرکا،تێکچوو، پیچکاو

**رَآبَ الرَّجُل( تَحَيَّرَ ):** سەری سوڕما، سەرسام ما، سەراسیمەبوو

**رَابَى ( أعْطَى مَالَهُ بِالرِبَا ):** پارەیدا بەسوود، سوود خۆری كرد

**رَابَى الرَّجُل:** چاودێری‌کرد، دڵی راگرت، دڵی برد بەڕێوە

**رَابّ:** باوە پیارە ، زڕباوك، مێردی دایك

**رَابَة:** باوەژن، ژنی باوك

**رَابَحَ:** سوودو قازانجی پێدا

**رَابِحْ:** قازانج ، بەخشش، بەسوود، بەكەڵك، بەدەسكەوت، پڕسوود

**رَابِضْ:** جێگیرو جێنشین، شێری بێشەلان

**رَابِضَة:** مرۆڤی بێدەستەڵاتو دەستەوەستان لەبەردەم گشت كردارو هەڵوێستێكدا

**رَابَطَ الأمْر:** رێكی خست، باشو چاكی‌كرد، گونجاندی، بەردەوام بوو لەسەری

**رَابَطَ الجَيش:** دامەزراندن، جێنشین كردن، دانان

**رَابِطْ:** بەستەر ،بەندكار ، گەیەنەر

**رَابِطْ الجَأش:** نەترس ئازا، جەربەزە ، دڵ قایم،بەغیرەت، لێهاتوو، چاونەترس

**رَابِطَــــة**: پــــەیوەندی، بەســــتران، پەیوەستی، یەکگرتن

**رَابِعْ**: چوارەم،چوارەمین ، چوار هەمین

**رَابِعْ عَشَرْ**: چواردەیەم

**رَابِعاً**: چوارەم ، چوارهەم

**رَابِــي**: برنووتــی، دەرمانێکــە لەگــەڵ تۆزی توتن لەلووت دەکرێ بۆ پژمین

**رَابِيَــة**: ســەنگەر، کــەلات، بســتوو، تەپۆلکە، بلّندی، بەرزی

**رَاتِبْ**: مووچە، مانگانە، دەقن ، جیرە، بەرات، کرێ

**رَاتِعْ**: ئەوەی دەم دەخاتە ماڵیخەڵكو بێگوێدان دەیخوات، جانـەوەری چـوار پێ کەهەمیشە لەهەوڵدایە

**رَاتِقْ**: پـەیوەست کردن، پابەندکردن

**رَاثَ الفَــرَسُ ( تَغَــوَّطَ )**: پیســـاییکرد، تەرسی کرد

**رَاثَ رِيْثاً**: درەنگی کرد، دواکەوت

**رَاجَ الأَمْــرَ( إِنْتَشَــرَ )**: بلاوبـــوەوە، پەخشبوو، داکەوت، قاوی داخست

**رَاجَ الدَرَاهِم**: خەڵکی مامەڵەیان پێکرد

**رَاجَ الطَعَام**: پێگەیی‌و ئامادەکرا

**رَاجِبَــة( مَفَــاصِلْ )**: بنەچــەی بەیــەك گەیاندنی پەنجەکان

**رَاجَتِ السِلْعَة**: فرۆشـرا ، نـەما، بـرەوی سەند

**رَاجَــتِ السُــوقُ**: بـــازارگەرمبوو، بـازاڕ لەبرەودابوو

**رَاجَتِ الرِيحُ**: تێکەڵبوو،نەزانرا لەکوێوە هەڵیکرد

**رَاجِــحْ**: قــورستر، لاســەنگ، شـــیاو، رێتێچوو، پەسەند، باشتر

**رَاجِــزَ صَاحِبَـــهُ**: وەك هاوەڵەکـــەی هۆنراوەیەکی گوت لەسەر کێشـییەکێك لە بەحرەکانی شیعری عەرەبی

**رَاجِز**: هۆنراوەو شیعر خوێنەوە

**رَاجَــعَ**: پشــکنی، گــەڕا، پیــاچووەوە، دووبارەی کردەوە

**رَاجَعَ فِي الأَمْر**: پرسی پێکـرد، راوێـژی پێکرد

**رَاجَـــعَ الحِسَــــابَات**: پیـــاچووەوە، بۆیدەرکەوت

**رَاجَعَ الطَبِيب**: چوە لای پزیشك

**رَاجِعْ**: باوەخون، ئەوژنــەی مێردەکـەی دەمرێتو دەگەڕێتەوە بۆ ماڵی باوکی

**رَاجَعَهُ فِي الأَمْر**: گەڕایەوە بۆ لای

**رَاجَعَـهُ الكَــلام**: دووبــارەی کــردەوە، پێیدا چوەوە

**رَاجِفْ**: لەرزیوو ، لەرە لەر، لەرزە لەرز

**رَاجِفَة**: فووی یەکەم کـردن بەکـەرەندا لەرۆژی قیامەتدا

**رَاجِلْ**: پیادە ، بەپێ رۆیوو

**رَاجِم**: بەرد گرتنــە یــەك ، بــەردەبارانی یەك

**رَاجَمَ فِي الحَرْب وَالكَلام**:زاڵبووبەسەریا

**رَاجَمَ عَنْ قَوْمِه**: بەرگری لێکرد

**رَاحَ( ذَهَبَ ـ مَضَى )**:رۆیی، چوو،رۆیشت، تێپەڕی، گوزەریکرد

**رَاحَ إِلَيهِم وَعِنْدَهُم**: چوو بۆ لایان

**رَاحَ البَيتُ**: با چوە ژوورێ

**رَاحَ لِلمَعْرُوف**: چوو بۆ چاکە کردن

**رَاحَ الشَيء**: بۆنی هات

**رَاحْ( خَمْر )**: ئارەق ، مەی ، بادە

**رَاحَــة( رَوَاح )**: پشــوو، حەوانـــەوە، سرەوتن، ئارام گرتن

**رَاحَةُ الْيَدْ( بَاطِنُهَا )**:بەری لەپ، بەری دەست، شەپ
**رَاحِل**: پارمەتیدا کۆچ بکات
**رَاحِلْ( ذَاهِب )**: کۆچ کردوو، ڕۆییو، ڕۆیشتوو
**رَاحِلَة**: وشتری بارهەلگری بەهێز، چوار پێیان ولأخی بەرزەووشترو ئەسپ
**رَاحِمْ**: بەسۆز،میهرەبان ، دڵناسك
**رَاخَى**: دووری خستەوە ،بەڕاگەندی کرد
**رَاخَى الْعُقْدَةَ**: کردیەوە، والأیکرد
**رَاخِفْ**: هەڵهاتوو، بۆ هەویر بەکار دێ
**رَاخِمْ( حَاضِنَةٌ )**: مریشکی کڕکەوتوو
**رَادَ الشَّيءِ( طَلَبَه )**: داوایکرد، ویستی، خوازیاریبوو
**رَادَ الأَرْض**: گەڕا بەنێو کێڵگەو قەراخ ئاوەکانیدا هەتا بزانێ کام شوێن گونجاوە بۆ لادان و نیشتەجێ بوون
**رَادَ الْبِلَاد**: پیاگەڕا، گەشتی پێداکرد، تاوتوێی کرد
**رَادَار**: ئامێرێکی هەستیارە بەهۆی شەپۆلە کارەباییە موگناتیسیەکانەوە هەست بە تەنە دوورو جولأوەکان دەکات و شوێن و دەنگی دیاری دەکات و دەتوانرێت گوللە باران بکرێت
**رَادَتِ الرِّيحُ**: کزەی هات، بایەکی هێواشی هات
**رَادَتِ الْمَاشِيَةُ**: لەوەڕاندی، تێریکرد
**رَادَّةٌ**: ئەو ژنەی هەمیشە دەگەڕێت بەماڵی دراوسێکانیەوە
**رَادَّةٌ**: سوود، بەخشش ، قازانج، کەڵك
**رَآدِفُ**: هاوپشت و هاودەم، پشتگیر، پاڵپشت

**رَادِن**: زافەران، زەعفەران ، گوڵێکی زەردی بۆنخۆشی سووربارە زۆر بەنرخ و بەکەڵکە
**رَادِيكَال**: رادیکال ، پەیوەنداری
**رَادِيكَالِي**: ئازادیخوازی، بنەچەیی
**رَادِيو**: رادیۆ ، ئیزگە، ئیستگە، شوێنێکە دەنگو باسی گێتی تێدا بلأو دەکرێتەوە
**رَادِيوم**: توخمێکی کیمیاوی گرانبەهایە لەساڵی 1889 دۆزراوەتەوە
**رَازَ مَاعِنْدَه**: خواستی، داوایکرد
**رَازَ الْحَجَر**: هەڵی سەنگان
**رَازَ الرَّجُل**: تاقیکردەوە
**رَازَ الأَرْض**: چاکی کرد ، باشی کرد
**رَازْ**:وەستاباشی،سەرۆکی وەستاکان ، ساختمان
**رَازِقْ**: ڕۆزیدەر، بەخشندە، بەتەنیا بۆ پەروەردگار بەکاردێت
**رَازِقِي**: لاواز ،ئارەق، بادە، جۆرە ترێیەکە
**رَازِقِيَة**: جلو بەرگێکی کەتانی سپییە
**رَازَمَ بَيْنَهُمَا**: کۆکردنەوەی دوو راو بۆچوون و گونجاندنیان لەگەڵ یەکدا
**رَازِمَ الدَّار**: زۆر لەو ماڵەدا مایەوە
**رَازِي**:دانە پاڵی یەکێکە بۆ شاری(ری)، نازناوی زانای پایەبەرز (فەخری رازی)و (ابو الفتوح)ە
**رَازِيَانَج**: رازیانە، ڕەزنە، هەپۆسان، گیایەکیبۆنخۆشە
**رَاسَاهُ**: لەمەلەدا پێشی کەوت
**رَاسَهُ بِالأَمْر**: باسیکرد لەگەڵیدا، باسەکەی کردەوە لەلای

**رَاسِبْ:** کەوتوو، خڵتە، نیشتوو، پەگر، دەرنەچوو، ملّتە
**رَاسِخْ:** جێگیر ، چەسپاو ،دامەزراو
**رَاسِخٌ فِي كَذَا:** بەتوانا لە..، دانا لە..
**رَاسِخٌ فِي العلم:** شارەزا لەزانیاریدا، ڕۆچوو،تێگەیشتوو، زانیار ، دانا
**رَاسَلَ:** نامەی نارد ، پەیامێکی نارد
**رَاسِمْ:** ئاوی لەبەر ڕۆیشتوو، ئاوی ڕەوان، ئاوی ڕۆشن و سازگار
**رَاسِي:** وەستاو، وەستاو لەبەندەر، جێگیر، چەسپاو، نەجووڵاو
**رَاسِيَات:** شاخ و کەژی پتەوو جێگیر
**رَاشَ:** بەرتیلیدا، دەمی چەورکرد
**رَاشِحْ:**ئەو ئاوەی دەڕوات بەنێو بەردا ، جانەوەرو مێرووی بەسەر زەویدا ڕۆیوو، بەهێزو توانای ڕۆیو بەسەر زەویدا
**رَاشِدْ:** هوشیار، هەستیار، بەخەبەر، ئاگادار، ژیر، زرنگ، ڕابەر، پێشەنگ ، هەرزەکار ، بێدار
**رَاشَقَ:** یەکتریان داگرتەوە، یەکیان دایە بەر بەرد
**رَاشِنْ:** مشەخۆر، شاگردانە، بەخشش
**رَاشُوم:** تەختەیەکی نەخشدار
**رَاصِدْ:** چاودێریکار، پاسەوان
**رَاصَدَهُ:** چاودێریکرد، پاسەوانیکرد، پارێزگاریکرد
**رَاضَى:** ڕەزامەندی خواست، داوای ڕازی بوونی لێکرد، ئاشتی کردەوە
**رَاضِب:** لێزمە باران، بارانێکی بەخوڕ
**رَاضَخَ:** بەزۆر ملکەچیکرد، سەری پێ دانەواند
**رَاضَخَهُ:** بەردەبارانی کرد

**رَاضَعَ ـ رِضَاعَاً وَمُرَاضَعَةً:** لەگەڵیدا شیری خوارد
**رَاضَعَ إبْنَهُ:** کوڕەکەیدا بەشیر دەرێکی دیکە
**رَاضَعَ الطفلُ:** دایکی شیری پێداو دایکیشی دووگیانبوو
**رَاضِعَتَان:** دوو مەمکی دایك بۆ منداڵ کەشیری لێدەخوات
**رَاضِي:** ڕازی، قایل، پەسەندیی، گونجاوی
**رَاطَلَ:** بەکێشانە کڕیو فرۆشتی
**رَاطَنَ:**بەزبانێك بەدەر لەزبانیعەرەبی ئاخاوتن و قسەیکرد
**رَاعَ ( نَمَا وَزَادَ ):** گەشەی سەند، ڕوا ، پەرەی سەند، زۆر بوو، گەورەبوو
**رَاعَ الـزَّرْعَ:** گەشەو پەرەی سەند، پێگەیشت
**رَاعَ السَرَابْ:** تێکچوو ، شێوا
**رَاعَ مِنْهُ:** ترسا لێی
**رَاعَ عَنْهُ وَإلَيه:** گەڕایەوە، هاتەوە
**رَاعَ جَانِبَهُ:**ئارەزووی کرد، حەزیپێکرد
**رَاعَى:** پارێزگاریکرد، پاراستی، چاودێریکرد
**رَاعَى النجُوم:** چاودێری ئاوابوونیکرد
**رَاعَى الرَّجُل:** ئاوڕی لێدایەوە، یارمەتیدا، گوێی دایە
**رَاعَى الخَوَاطِر:** ڕێزی لێگرت،هەستی ڕاگرت
**رَاعَت الأرْض:** لەوەڕگای زۆرو فرەبوو
**رَاعِدَة:** هەوری فرەهەورە تریشقە، هەوری ناڵەداری بێباران
**رَاعِفْ:** سەری لووت، لوتکەی شاخ

**رَاعِي:** شوان، شڤان،بەرپرس،خاوەن ، میر ، سەردار
**رَاعُوف( صَخْرَة عِنْدَ رَأس البِئْر ):** بەردی سەر بیر
**رَاغ:** رێگـەی پێـچو پـەنای گـرت، فێڵیکرد
**رَاغ الرَّجُل :** لایدا، ترازا،رووی لێوەرگێڕا
**رَاغِب( مُتَشَوِّق ):** ئارەزوومەند،مەیلدار، ئارەزوودار، شەیدا، بەخواست
**رَاغِم:** ملکەچو رسوا، زەبوونو داماو
**رَاغَم مُرَاغَمَةً:** بەئاشکرا جەنگیلەگەڵ بەرپاکرد، دژایەتیکرد، دژومنایەتی هەڵگیرساند
**رَاغِيَة:** وشتر ، حوشتر
**رَافَ:** گەیی بەزەوییەکی سەوز، چوو بۆ گوندو لادێ
**رَافٌ:** مەیی ، بادە ، ئارەق
**رَافِخ:** ژینێکی خۆشـگوزەران، ژینێکی خۆشنوود
**رَافِد:** زێ ، چـەم، چـاو ، چـۆم، رووخانە، چڕخوڕ
**رَافِدَان:** بەهـەردوو رووبـاری دیجلـەو فورات دەگوترێت
**رَافِدَة:** کۆمەك، پشـتگیری، بـەودارە رایە دەگوترێت کەلەسەر پردێك بـۆ پەرینەوە دادەنرێت
**رَافِض:** قایل نەبوو، نکوول رازی نەبوو
**رَافِضَة:** ئەوانـەی پشـت هـەڵدەکەن لەسـەر کردەکـەیان لەجـەنگدا یـان لەکاتی هەڵوێست وەرگرتندا
**رَافِضِي:**گومڕا،لەرێی راست لاداو، سەر لێشێواو، سەرگەردان ، وێڵ

**رَافَعَ إلَى الحَاكِم:** شـکاتی لێکـردو هێنایە بەردەمی دادیار هـەتا دادگایی بکات
**رَافِعَة:** بەرزکـەرەوە، توێـڵ ، ئـامێری بەرزکردنەوە
**رَافِغ:** ژینێکی پڕخۆشگوزەرانیو نازو نیعمەت
**رَافَقَ:** هاوەڵایـەتی لەگەڵاکرد، لەگەڵی رۆیشت
**رَافِهٌ:** کەسـێکە ژینیخۆشـگوزەرانو باش بەسەر بەرێت
**رَافِهَة:** شـەوێك بـەهێمنیو ئاسـانی بگوزەرێت
**رَافِي:** دروومانو چاکەری جلوبەرگ
**رَاقَ:** بریسکایەوە، درەوشایەوە،رژانی، رۆیکرد، رشتی
**رَاقَ الأمْـرَ:** پەسـەندبوو لای، شـیاوو گونجاو بوو
**رَاقَ السَّـرَاب:** رۆیـی لەسـەر زەویـی بەشێواوییو ئەوجا داکەوت
**رَاقَـبَ:** پاسـیکرد، ئێشـکی گـرت، پاراستی، ئاگاداری کرد
**رَاقَبَ اللهَ:** لەخوا ترسا
**رَاقَـبَ العَمَـلَ:** سـەرەو کـاریکرد، چاودێریکرد، بەرێوەی برد
**رَاقِد:** نوستوو ، خەوتوو
**رَاقِدَة:** کڕ ، هەڵنیشتوو، خامۆش
**رَاقَصَ:** لەگەڵی سەمای کـرد، چـوە دەستیەوە، لەشانیەوە هەڵپەڕی
**رَاقِص:** سەماکار، هەڵپەڕیین
**رَاقِصَة:** سەماکەر ، هەڵپەڕیوو
**رَافُود:** کوپەیەکی گەورە

**رَاقِي**: بالاَ ،بەرز، مەزن، شکۆدار، زۆر چاك ، پەروەردەكراو، پێشكەوتوو

**رَاقِيَة**: جادووگەر، چاوبەست كار، ئەفسوونكار

**رَاكَبَ**: سواربوو، نیشتە سەری

**رَاكِبْ**: سوار، بەرانبەری پیادە، كەسێ كەبەسەر بارەبەر یا هەرشتێكی ترەوە سەفەر دەكا، زالْ، باوخۆش، بڵندتر ، بەرز

**رَاكِبَة**: تولێكە لەسەرووی دارخورماوە شۆڕبوەتەوە بەلاَم ناگاتە سەر زەوی

**رَاكِدْ**: راوەستاو، وەستاو، لەبزاو كەوتوو، جێگیر ، مەنگ

**رَاكَض**: راكردنو پێشبڕكێی كرد

**رَاكِع**: چەماو، سەرشۆڕ، نەوی، نزم

**رَاكَلَ صَاحِبَه**: پێشبڕكێیانكرد، بۆربۆرێنیانكرد

**رَاكُوبْ**: ئەو چلە دارخورمایەی بەرزەو وێڕای شۆڕبوونەوەی ناگاتە سەر زەوی

**رَالَ(سَالَ لُعَابُه)**: دەمی ئاویكرد، لیك بەدەمیا هاتە خوارەوە

**رَامَ - رِيَم بِالْمَكَان**: نیشتەجێ بوو

**رَامَ حَمَلَ الْبَعِير**: خواربوو، لاربوو، داكەوت

**رَامَ الْمَكَان وَمِنْه**: لایدا، لاچوو، رۆیی، بەجێی هێشت، گواستیەوە

**رَامَ بِالْمَكَان**: مایەوە، جێگیر بوو

**رَامَ عَنْه**: دووركەوتەوە

**رَامَى**: تیری تێگرت ، تیربارانی كرد

**رَامَى عَنْ قَوْمِه**: بەرگری لێكرد

**رَامَةُ**:ئافرەتی چاكەكاری خۆش رەفتار

**رَامَح**: بەتیر برینداری كرد

**رَامِحْ**: تیر ئەنداز ، تیرەنان، تیراوێژ، تفەنگچی، كەسێكە بزانێ تیر بهاوێژێ

**رَامِسْ - رَوَامِسْ**: ئەو باڵندەیەی شەوان دەفرێ ، هەر جانەوەرێك بەشەو بێتە دەرەوە

**رَامِسَاتْ**: ئەو بایەی شوێنەواری مالآن دادەپۆشێ بەخۆڵو گڵی هەڵگرتوو

**رَامَقَ الرَّجُل مُرَامَقَة**: لەترسا دڵی برد بەرێوە

**رَامَقَ الْعَمَل**: بەباشی كارەكەی نەكرد، شارەزاو لێزان نەبوو تێیدا

**رَامِقَةُ**: چاوی لێنەتروكان

**رَامُوز ( نَمُوذَج )**: نموونە ، نمانا، ئۆرناگ، سەرمەشق، كەمێك لەزۆر نیشاندان

**رَامُوس( قَبْر )**: گۆڕ ، گڵكۆ، قەبر

**رَامِي**: نیشانەچی ، دەست راست

**رَانَ الأَمْر**: قورسیكرد، گرانی كرد، سەختیكرد

**رَانْ**: پێلاوێكە وەك خوف وایە بەلاَم لەو درێژ ترە

**رَانِي**: نەرمو نیانیو خۆش رەفتاركردن لەگەڵ یەك

**رَاهِبْ**: قەشە، كەشیش،زیوار،رەبەن ، ترساو، تۆقیو، ئەترسێ، لێبڕاو بۆ ژینی دوایی

**رَاهِبَة**: قەشە ژن، ئافرەتی پەرستار، گۆشەنشین

**رَاهَقَ الْغُلاَم**: بالغ بوو،بوو بەهەرزەكار، وادەی شەیتانی بوونی هات

**رَاهَنَ** : گرەویكرد، پێشبڕكێی كرد

**رَاهِنْ**: جێگیر، بەردەوام، هەمیشەیی، بارمتە دانان، ئێستا ، ئەم كاتە

**رَاهْنَــامَجْ:** ئـەو كتێبەی‌دەریاوانــەكان تێیــدا بــەندەرو شــوێنی لادان دیــاری دەكەن
**رَاهِي مِنَ العَيْش:** خۆشــگوزەران،ژیـانی بێدەنگی، ژینی خۆشحاڵی
**رَاهِيَة:** مەنگ
**رَاوَحَ بَيْنَ عَمَلَيْن:** نۆرەی كرد
**رَاوَحَ بَيْنَ رِجْلَيْن:** بەنۆرە لەسەر قــاچی وەستا
**رَاوَدَ:** فێڵی لێكرد ، تەڵەكەی كرد
**رَاوَدَ المَـــرْأَةَ:** دەورو خولیــدا، هەڵـــی خەڵەتان،ویستــی دەستی لەگەڵا تێكەڵ بكات
**رَاوَدَهُ:** خواستی‌كرد،ویستی هەبوو بۆی
**رَاوَضَ( خَـاتَلَ ):** غـافڵی‌كرد،چاوبەســت‌و فێڵی لێكرد
**رَاوَغَ( خَادَعَ ):** فێڵی‌كرد، پشی پشی بۆ كرد، دنەیدا
**رَاوَغَ فـي الكَـــلام:** قســەی بەتــوێكڵ‌و پێچ‌و پەنای‌كــرد، بــەئاین‌و ئۆیــن دوا، بەپێچ‌و پەنا كەوتە قسەو گوتە
**رَاوَنْد( رونـد ):** رێواس
**رَاوُوق:** پاك ، پوخت، پاڵفتە، بێگەرد
**رَاوِي:** گێرەرەوی فــەرموودەوهۆنراوە ، میراو
**رَاوِيَـة:** چــیرۆك بێــژ ، داســتان بێــژ، ئەوەی چیرۆك‌و بەسەرهات دەگێرێتەوە
**رَايَـة:** ئــالا ، بــەیداخ ، بــەیاخ، ئالــە، درەوش
**رَأى:** بینــی،دیتــی، بــەچاو بــەدیكرد، وایزانی
**رَاءى( تَظَــاهَر ):** خــــۆی وایپیشـــاندا، خۆی‌وادانا

**رَأَيْتُه:** بینیم ، چاوم كرد ، دیتم
**رَائِي:** بینەر ، تێبینیار ، چاودێر
**رِئَـاء( رِيَـاء ):** دوڕوویــی،مــەرایی،ماســتاو كــردن، ڕووپامــایی، رواڵــەتكاری، مامــە حەمەیی
**رِئَاسَــة:** ســـەرۆكایەتی، ســــەرگەلەیی، فەرمانڕەوایی
**رَأَب:** چاكی‌كرد ، باشی كرد
**رَأَبَ الشَّيء:** كۆیكردەوەو بەستی
**رَأَبَ بَيْنَـــهُم:** نێوانــــی باشـــــكردن، چاكسازی‌كرد لەنێوانیاندا
**رِئْبَال:** شێر ، گورگ
**رِئَة ـ رِيَة:** سی، كۆئەندامی هەناسە
**رَأْس:** سەر، كەللە، لوتكە، بۆپــە،ملـە ، را ، هۆش ، سەرەتا ، یەكەم
**رَأس مَال:** مایە ، سەرمایە
**رَأسـاً( مُبَاشَــرَة ):** راســـتەوخۆ ، دەم‌و دەست، یەكەندەردوو، گــەرماو گــەرم ، یەكسەر
**رَأساً عَلَى عَقِبْ:** ســەرەوخوار، سـەرەو ژێر
**رَأَفَ:** میهرەبان بوو، نــەرم‌و نیـان بـوو، بەزەیی پیاهاتەوە، بەسۆزبوو
**رَأفَــة ( رَحْمَـــة ):** بــەزەیی، دڵســۆزی، میهرەبانی
**رَأْل:** وشتر مورخی یەكساڵە
**رَأَمَ الحَبْلُ:** توندی‌كردو رێسای
**رَئِـمَ الشَّـيء:** ئولفـەتی پێـوە بەسـت، ئالوودەی بوو، عەوداڵی بوو
**رَأي:** را ، بۆچــوون، بـــیروڕا ، دەم‌و دوان، هەڵوێست، پێشنیار

**رَؤوف:** ناوێکی جوانی پەروەردگارە، بەسۆزو بەزەیی بۆ بەندەکانی، میهرەبان، بەبەزەیی ، دڵسۆز
**رُؤیا:** خەو ، خەون
**رُؤیَة:** بینایی، سۆما، هانا، چاو پێکەوتن، دیتن، دیدار
**رَئِیسْ ـ رِیس:** سەرۆك، سەرگەورە، سەرەك، میر، پێشەوا ، فەرمانڕەوا، سەروەر
**رَئِیسي:** سەرەکی، سەرەتایی، گرنگ، بنەچەیی، بنەڕەتی

**رب**

**رَبَّ القَوم:** سەرۆکایەتی‌کرد،سەرکردەیی نواند
**رَبَّ الشَيء:** بوو بەخاوەنی، بوو بە هی خۆی
**رَبَّ الوَلَد:** پەروەردەیکرد هەتا گەورەبوو
**رَبَّ الأمْر:** چاکی کرد ، باشی کرد
**رَبَّ الدّهن:** بۆنخۆش‌و جوانی کرد
**رَبَّ بالمَکان:** مایەوە ، جێگیربوو
**رُبَّ( رُبَمَا ـ لَعَلَّ ):** لەوانەیە، ڕەنگە، تەقا ، تەقو، بەشکو، ئەشێ، ئەگونجێ
**رُبَّ( عَصِیر الثِمَار المُخَثر بِالطَبْخ ):** خۆشاو ، دۆشاو، خۆشاف، لەئاوی هەرمێ‌و قۆخ‌و لەتکە هەرمێ‌و گەلێك میوەی‌تر دروستدەکرێت
**رُبَّ الرُمَان:** ربەهەنار، دۆشاوی هەناری گوشراو
**رَبْ( سَید ):** گەورە ، سەرەك
**رَبْ العَائلَة:** سەرگەورەی ماڵ
**رَبْ( مَالك ):** خاوەن ، پەروەردگار

**رَبَا المَال:** زیادبوو
**رَبَا الرَابِیَة:** بەرزی کردەوە،بڵندی کرد
**رَبَا الوَلَد:** پێگەیی، گەورەبوو، پەروەردەبوو
**رِبَا ( رِبَاء ـ فَائدَة ):** قازانجی سوو، کەلك ، کرێی پارەیەکە بەساڵ یا بەمانگ بدرێ بەیەکێك
**رَبَى الوَلَد:**بەخێوی‌کرد، ژیانی، پەروەردەیکرد، تەمێی‌کرد
**رَبَى التُفَاح بِالسُکَر:** مرەبای سێوی دروستکرد
**رَبَاب:** هەوری سپی، مەملەکەت، ئامێرێکی مۆسیقاو گۆرانی‌یە، ڕەبابە
**رِبَاب:** پەیمان، هاوڕێ، دۆست، خۆشەویست، یاران
**رَبَابَة:** مەملکەت، پەیمان
**رُبَّاح:** مەیموونی نێرینە
**رَبَّاض:** شێر
**رِبَّاط:** هەموو شت کەبۆ بەستن بەکاربهێنرێ،بەستەنی، سارغی ، برین پێچ، پێچەك ،قەیتان،بۆینباخ،مل پێچ ، گوریس، پەت، پێوەند ، دەس بەند
**رَبَّاط:** ئەوەی تاڵەکانی ئالەتە مۆسیقاییەکان دەبەستێ
**رِبَاطَات:** بەو پەیمانە دەوترێت کەسەبارەت بە هەژاران دەبەسترێ
**رِبَاطَة:** خۆمەڵاسدان لەبۆسەداو چاوەڕوانکردنی دوژمن
**رُبَاع:** چوارچوار
**رَبَّاع( حُسْن الحَال ):** خۆشگوزەرانی، باشحاڵی

**رَبَّاعة ـ رِبَاعَة:** ئەو بارە باشەی مرۆڤ لەسەری دەبێت، سەرۆکایەتی ئەوەی مرۆڤ هەیەتی و بەهۆیەوە ژینی باش و خۆشحاڵی دەستەبەرکردوە،جێگیربوون بار ، حاڵ

**رُبَاعِيّ:** هەموو شتێك کەلەچوارلا پێکهاتبێ

**رُبَاعِيّ الأرْجُل وَالأقْدَام:** چوارپێ، چوارپا

**رُبَاعِيّ الأضْلاع:** چوار لا

**رُبَاعِيَّة:** چواردانی ناوەڕاست کەدەکەوێتە نێوان ددانی بڕندەو کەڵبەوە

**رَبَالَة (إمْتلأ الجِسْم):** تێکسمڕاوی، گۆشتنی، قەڵەوی ، شیشمانی

**رُبَّان ـ رُبَّانِيّ:** ئەوەی کەشتی لێدەخوڕێ، کەشتیەوان

**رَبَّانِيّ:** مەردومی خواناس و زانا، خودایی، شارەزا بەپلەوپایەکانی بەندایەتی

**رَبَّانِيَّة:** پلەوپایەیەکی بەدیهێنراوە لەلایەن مەسیحیەکانەوە

**رَبَأ (عَلَى وَارْتَفَع):** بەرزبووەوە، بڵندبوەوە

**رَبَأ القَوم:** پێشیان کەوت، بوو بەسووری بەر لەشکر

**رَبَأ المَال:** چاك و پاراستی، پارێزگاری لێکرد

**رَبأ عَلَى (أشْرَف):** بەسەریا ئەڕوانێ

**رَبَّبَ الوَلَد:** پێی گەیاند، بەخێویکرد

**رَبَتَ الصَّبِيَّ رَبْتاً:** نەوازشی کرد، پەروەردەیکرد، دڵنەوایی کرد

**رَبَّة:** خانم، کەیبانوی ماڵ، ئافرەتی ماڵ، ژنی ماڵی

**رَبِحَ (كَسَب):** قازانجی کرد،بردیەوە، دەستی کەوت

**رَبَّحَ:** قازانجی پێگەیاند، سوودی پێگەیاند، قازانجی دایە

**رِبْح:** سوود، قازانج، دەستکەوت، بردنەوە

**رَبْحَة:** بردیەوە، سەرکەوت، دەستی کەوت

**رَبَدَ:** جێگیربوو، مایەوە

**رَبَدَ بالمَكَان:** تیامایەوە، تیا ژیا

**رِبْد (خَشَبَة المَسْحَاة وَغيرها):** سالیس، دەسك، تێلای لووسی بێ گرێ

**رَبْدَاء:** ناقۆلا، نارێك، نابووت ، ناساز

**رُبْدَة:** خۆڵ ، خاك، زەوی

**رَبِذَ:** دەستو قاچی لەکارکردندا هێواش و سووکبوو

**رَبَذَة:** راخەرێکی نەرم و شلە لەسەر پشتی وشتر دادەنرێت

**رَبْرَبَ:** جڵەوە مانگای کێوی

**رَبَصَ:** خۆی نایەوە،خۆی مەلاسدا، ماتە ماتی کرد، چاوەڕێی کرد

**رُبْصَة:** خۆنانەوە، خۆمەلاسدان

**رَبَضَ (بَرَكَ):** چۆکی دایا، ئەژنۆی دایا، هاتە سەر ئەژنۆ

**رَبَضَ فلاناً أوْ المَكَان:** چوو بۆی، رووی تێکرد

**رَبَضْ:** لانەی خەڵکی، شوێنی گاوگۆلك، ماڵانی دەوروبەری شار، سنووری دەرەوەی شار ، ریخۆڵە

**رَبَضَتِ الدَّابَة:** چۆکی دایا

**رَبِضَهُ بِالْمَكَانِ:** جێگیریکرد، چەسپاندی
**رَبَطَ( أَوْثَقَ وَشَدَّ ):** بەستی، بەستیەوە، توندیکرد، گرێیدا
**رَبَطَ( وَصَلَ ):** گەیانی بەیەك، بەیەكەوە بەستیەوە
**رَبَطَ الجَرحَ:** پێچای، پێچایەوە، برینەكەی پێچا
**رَبَطَ اللسَانَ:** زمانی بەست
**رَبط:** بەستن، بەستنەوە، بەیەك گەیاندن، بەندكردن، پەیوەندی، پەیوەستی
**رِبطَة:** دەسك، چەپك، گورزە، پێچراو، سەرپێچ، مل پێچ
**رَبَعَ:** چواریەكیبرد، چوار لۆیكرد، بەچوار لۆ بایی‌دایەوە
**رَبَعَ( تَوَقَّفَ وَانتَظَرَ ):** چاوەڕێیكرد، وەستا، ئیستیكرد
**رَبَعَ بِالمَكَانِ:** مایەوە، هەڵیدا
**رَبَعَ عَنهُ:** وازی لێهێنا،لێیدووركەوتەوە، دەستبەرداری بوو
**رَبَعَ عَلَيهِ:** بەزەیی پیاهاتەوە، سۆزی بۆی جوولا
**رَبَعَ الرَّجُل:** بەردەكەی بەرزكردەوە بۆ تاقیكردنەوەی تواناو هێزی
**رَبَعَ بِعَيشَه:** رازی بوو بەبژێوی ژیانی
**رُبِعَ القَومُ:** بارانی بەهار لێیدان لەمرۆڤەكان یان زەوی
**رَبَعَ الرَّجُل:** هەرچوار رۆژێك تووشی تا هات
**رَبَّعَ البَيتَ أَوْ الحَوضَ:** بەشێوەی چوار گۆشەی لێكرد
**رَبَّعَ العَدَدَ:** ژمارەكەی دووجاكرد،كردن بەچوار ئەوەندە

**رُبْع ـ رُبُع:** چوار یەك ¼
**رَبِّعَ:** لەگیای بەهار لەوەڕا، بەگیای بەهارا هەڵتوڕا
**رَبْع:** مالْ، خانوو، پلەوپایە، ئەو شوێنەی لێی دەژین، كۆمەڵی خەڵكی، خانوی فرە ماڵو خێزان
**رُبَعْ:** یەكەم بەرهەم لەبەهاردا
**رِبْع:** گرتنو مۆڵدانی وشتر بۆ ماوەی سێ رۆژو ئاودانی بۆ رۆژی چوارەم
**رَبَعَ القَومُ فِي النَّعِيمِ:** رۆچوون، پێیان هەڵگرت
**رَبْعَة:** پیاوو ژنی بالاّ مام ناوەند، نەدرێژو نەكورت، مێزی وردە بابەت فرۆش
**رَبْغْ:** فراوانی بژێویو دەرامەت
**رَبَقَ فِي الأَمْرِ:** خستیە ناویەوە
**رِبقْ:** پەتێكە چەند گرێیەكی تێدا بێت
**رِبقَة:** گرێیەك
**رَبَكَ:** تەگەرەی تێخست، ئالۆزیكرد، كۆسپیخستەبەردەم،شپرزەیكرد شلەژانی، سەری لیّ تێكدا
**رَبَكَ الشَيءِ:** تێكەڵی كرد
**رَبِكَ:** گرفتار، داماو، تووشیار
**رِبْل:** جۆرە درەختێكە لەكۆتاییهاویندا شەقو درز دەبات بەهۆی ساردبوونی شەوەوە
**رَبَلَ:** روەكێكی یەكجار سەوزە
**رَبِلَ:** بەپیاوێكی گەورەو زلەدەوترێت، تێكسمراو، شیشمان، گۆشتن
**رَبلَة ـ رَبَلَة:** پوز، بەلەك، لەتەر، نێوان قولە قاپەونەژنۆ
**رَبو:** نەخۆشی تەنگەنەفەسی، هەناسە سواری

رَبُوب: پەیمان و بەڵێن، زڕکوڕ، کوڕی ژنی پیاوێك لەپیاوێکی‌تر
رَبْوَة: سەنگەر ، کەلات ، قەلا
رَبْوَة( مليون ): یەك ملیۆن
رَبْوَة( عَشْرَة الاف ): دە هەزار
رَبْوَة ـ رَبْوَة ـ رِبْوَة: تەپۆلکە، بەرزە زەوی، گردی چکۆلە ، تەپە، کۆسپایی ناو زەوی ، تەپ ، گردۆڵك، گووپك، هەرەم، ترۆپکە
رِبَوِي: ئەوەی سوو خۆری پیشەیەتی، سوو خۆر
رَبِيب: کوڕی ژن لەمێردێکی تری، کوڕی مێرد لەژنێکی تری،باوە پیارە ، هەنەزا، زڕکوڕ
رَبِيبَة: دایەن، باوەژن، هەنەزا، زڕکچ، کچی مێرد لەژنێکی‌تر کچی ژن لەپیاوێکی‌تر
رُبَيَّة: گوربە ، جۆرە جانەوەرێکە
رَبِيح: بازرگانی بەسوود
رَبِيض: مەڕوماڵات لەپەرژین‌وپەچەکەیدا
رَبِيط: ئەوەی دەستبەرداری خۆشیەکانی دنیا بوە
رَبِيطَة: بەسراوە، پەیوەند، پەیوەست
رَبِيع: بەهار ، خوێن جمان
رَبِيعَة: مێرگ،باخچە، خودە، ئەو کلاوە ئاسنینەی جەنگاوەر لەجەنگدا دەیکاتە سەری
رَبِيق: گرفتار، تووشیار، دووچار
رَبِيك: لاواز لەکاروبارو نەخشەو پلاندا
رَبِيكَة: ئاوی تێکەڵ لەگەڵ قوڕدا، کەرەی نێو دۆ

**رت**

رَتَّ: توندوتیژ بوو، بەرازی نێرینە، بەرازی کێوی
رِتَاج: دوودەوری، دەرگای گەورە
رَتَّاع: ئەوەی بەوشتر لەوەڕگەکان تەی دەکات
رِتَاق: دوو پۆشاك کەبەیەکەوە دووراین
رَتَّبَ( وَضَّبَ ): ڕێکی‌خست، چاکی‌کرد
رَتَّبَ( أَعَدَّ ): ئامادەیکرد، پێکی‌هێنا
رَتَبَ الشَّيء: جێگیربوو، ئەجوولا، چەسپا ، چەقی
رَتَب: توندوتیژی، گرانی، نارەحەتی ئەوبەردانەی لەیەکەوە نزیکن‌و هەندێکیان بەرزترن لەهەندێکی تریان، بەرزە زەوی
رَتَبا: یەك جۆر ، یەك شێوە
رُتْبَة: پۆل،خانە، پایە، پلە،جۆر ، رادە،گەورەیی، نیشان
رَتَبَة: مابەینی نێوان پەنجەکان
رَتَجَ: دایخست ، پێوەیدا، بەندی کرد
رَتَجَ البَابَ: دایخست
رَتِجَ الخَطِيبُ: قسەی بۆ نەمایەوە، خەفەوبێدەنگی‌کرد، زمانی بەسترا، نوتقی لێبڕا
رَتَع: دەرگای گەورە، گەورە دەرگا
رَثْرَتَ: زوبانی گرتی‌و پیتی (را)و(تا)ی بۆ نەهات
رَتَعَ: ئاسودە ژیا، بەخۆشی‌و تێرو تەسەلی ژینی بردە سەر
رَتَعَ فِي المَكَان: تێیدا مایەوەو نان‌و ئاوی خواردەوەو حەوایەوەو پشوویدا
رَتَعَ الدَّابَةَ: لەوەڕا، چەری ، چەرا

**رَتِعَ** :بوەی بێ پێویست،خۆشگوزەران، بێپێویست

**رَتْعَة** : ڕۆچوون لەنازو نیعمەتا

**رَتَقَ الثَّوبَ**: درویەوە، پینەی‌کرد، چنیەوە

**رَتْق**: درونەوە، چنینەوە، پینەکردن

**رَتَقَة**: نێوانی پەنجەکان، پایە، پایەگا

**رَتِلَ الشَّيءُ**: گونجا لەگەڵیدا، ڕێك‌و شیاوبوو لەگەڵی، ڕێك‌وپێكبوو

**رَتَّلَ الكَلامَ**: باشی وت، بەگۆبوو، خاسی وت

**رَتَّلَ الكِتابَ**: نوێی نووسی، تازەی نووسی

**رَتَّلَ القُرآنَ**: قورئانی بەجوانی‌و ڕێك‌و پێكی خوێندەوە، باش خوێندیەوە

**رَتَل( صف )**: ریز، ڕێچکە، ژمارەیەکی زۆر

**رَتَل**: قسەی باش‌و بەجێ،وتەی جوان‌و شیرین

**رَتَل**: تازەو نوێی هەموو شتێك

**رَتَمَ**: شکاندی ،کوتایی، شکستی پێهێنا

**رَتَمَ فِي بَنِي فُلانٍ**: پێکەیی، نەش‌و نمایکرد

**رَتَمْ**: قسەی پەنهان،شەرمن‌و بەحەیا ، جۆرە گیایەکی باریکە

**رَتَمَ بِكَلِمَة( فاه )**: وشەیەکی بەدەما هات،وشەیەکی وت

**رَتْمَة** : پەتێك بەپەنجەوە ئەبەسترێ بۆ بیرکەوتنەوە

**رَتِيب**: ژین‌و گوزەرانێکی یەك تەرزو شێوە بێ گۆڕان

**رُتَيلاء( عَنكَبوت مُؤذٍ )**: جاڵجاڵۆکەی زیانبەخش

**رَتِيمَة**: پەتێکە دەبەسترێ بەپەنجەوە بۆ بیرکردنەوە

## رث

**رَثَّ الثَّوبُ**: شڕبوو، کۆنبوو، ڕزی ، هەڕوون هەڕوون بوو

**رَثُّ الهَيئَة**: شڕۆڵ، پەڕپووت، ناقۆڵاو ناشیرین

**رَثٌّ**: کۆنە ، شڕە ، ڕزیبوو، پرواو

**رَثَا**: شیوەنی بۆ کرد، لاواندیەوە، بەسەریا گریا، هۆنراوەی بەسەرا هەڵدا

**رَثَا المَيِّتَ**:بۆی گریاو چاکەکانی‌باسکرد، هۆنراوەی بۆ وت

**رَثَا عَنْهُ حَدِيثاً**: لەبەریکردو گێڕایەوە، لەسەر پەڕەی دڵ گێڕایەوە

**رَثِيَ المَيِّتَ**: بۆی گریا ، شیوەنی بۆ کرد

**رَثِيَ لَهُ**: دڵی بۆ نەرم بوو، دڵی پێ سووتا ، بەزەیی‌و سۆزی بۆ هاتە جۆش

**رِثَاء**: لاواندنەوە، پیاهەڵدان، شیوەن

**رَثَاثَة** :پەڕپووتی،شڕۆڵی ، ڕزیوی

**رَثَّالَة**: ئەو ژنەی شیوەن‌و لاواندنەوە دەکات

**رَثَأَ اللبَنَ**: مەیی ، بەستی، بزڕکا

**رَثَأَ الشَّيءَ بِالشَّيءِ**: تێکەڵی‌کرد

**رَثَأَ غَضَبَهُ**: نیشتەوە، دامرکایەوە

**رَثَبَ**: سەنگەوباز، هەڵچوون بەسەر یەکێکا

**رِثَّة** :شت‌ومەکی ڕزیووشڕۆڵی ناومال، مەردومی لاوازو پەست

**رَثَمَ الأنفَ**: شکاندی هەتا خوێنی لێهات

**رَثِمَ الفَرَسُ:** لەلایەکی لووتیدا سپێتی تێدابوو
**رَثْم ـ رُثْمَة:** ئەوسپێتیەی لەیەکێك لەلاکانی لووتی ئەسپدایە
**رَثْمَاء:** لووت سپی، ئەو مەڕەی هەموو گیانی ڕەشەو بەتەنیا لووتی سپی‌یە
**رَثِيئَة:** ماست، تێکەڵکردنی ماستی شیرین بەماستی ترش
**رَثْيَة:** ساردیو لاوازی، نێشانیجومگە، کەودەن، گێلی
**رَثِيث:** کۆنە، شڕە ، ڕزیوو، بریندار
**رَثِيم:** لووت شکانو خوێن لێهاتنی

**رج**

**رَجّ:** شلەقاندی، جوولاندی، لەرانیەوە، رایوەشان، هێنایی‌و بردی
**رُجَّ:** شلەقا ، جوولا ، هاتو چوو، لەریەوە
**رَجَا:** ئومێدی نەبڕی ، کۆڵی نەدا، بەردەوام بوو،بەهیوابوو،چاوەڕوان بوو، پاڕایەوە،لالآیەوە،تکای‌کرد، نزای‌کرد
**رَجَا الرَّجُل:** بەهیوای بوو،ئومێدی پێی هەبوو
**رَجَا ـ رَجَاء:** لا، تەنیشت ، قەراغ، ناوچە
**رَجَا ـ رَجَاة:** هیوا، ئاوات، ئومێد، خواست، داخوازی، ویست، حەز، ئارەزوو
**رَجِّي الشَّيء:** ئومێدبوون بەشتێك، بەهیوا
**رَجَاج:** مەڕو مالآت یان خەڵکی لاوازو لەڕ
**رَجَاذ:** گواستنەوەی تۆو بۆ سەر خەرمان

**رَجَّاز:** ئەوەی شیعرێك دەنووسێت لەسەر کێشی بەحری(رجز)، هۆنراوە خوان
**رَجَّازَة:** شوێنێکە ئامادە دەکرێت بۆ ژنان لەسەر پشتی وشتر بەدەر لەکەژاوە،جوانکارییەکانی کەژاوە، توێشە بەرەیەکە بەردی تێدەخرێ لەبەرانبەر کەژاوەدا بۆ راگرتنی هاوسەنگی
**رَجَّاس( بحر ):** دەریا
**رَجَاسَة:** کارو پیشەیەکی قێزەونی ئەنجامدا
**رَجَّاف:** لەرزۆك، کەسێك زۆر بلەرزێ
**رِجَام:** ئەوەی لەسەر بیر جەنجەڕی لەسەر دەبەسترێ
**رِجَامَان:** هەردوو کۆڵەکەی دارین کەجەنجەڕی لەسەر دەبەسترێ
**رَجَبَ مِنْه:** شەرمی لێکرد، شورەیی‌کرد، تەریق بوەوە
**رَجَّبَ الرَّجُل:** بەگەورەومەزنی دانا
**رَجِبَ مِنْهُ:** لێی ترسا، تۆقی لێی‌ی
**رَجَّبَ النَّخْلَة:** دڕکە زێی دانا هەتا کەس دەستی پێی نەگات
**رَجَب:** مانگی رەجەبی کۆچی کەدەکەوێتە نێوان مانگی(جمادی الاخرة)و(شەعبان)ەوە
**رُجْبَة:** بینایەکە دروست دەکرێت بۆ راو، کۆڵەکە، سایە، ئەوەی کە دارخورمای پاڵپێوە دەنرێ
**رَجَّة:** لەراندیەوە، بزواندی،جوولآنی ، هێنایە لەرزین
**رَجَّةُ القَوم:** تێکەڵبوونی دەنگەکانیان

رَجَحَ المِيزَان: لاریوەوە ، لاسەنگبوو
رَجَحَ الـرَأي: زاڵبـوو بەسـەر بەرانبەرەکـەیدا، سـەرکەوت بەسـەر بەرانبـەریدا، قسـەکەی سـەری گـرت و پەسەند کرا
رَجَحَ الشَيء بِيَدِه: بەدەسـتی هـەڵی سەنگان و مەزەنەی کێشەکەی کرد
رَجَّحَ: لاسەنگی کرد
رَجَّحَ لَه: کەوت بەلای ئەودا
رُجُح: مەنجەڵی پڕ، دەفری لێوان لێو
رُجْحَـان (مَيـلان): لاری، لاسـەنگی، پەسەندیی
رَجَد: گواسـتنەوەی تـۆوو بـۆ سـەر خەرمان
رَجْرَاج: لاوازو لەرزەی هەموو شتێك
رَجْرَجَة: پاشماوەی ئـەو ئـاوەی لـە حەوزێکدایە کـەخۆڵی تێکـەڵ بـووە ، کۆمەڵێکی بێ شومار لەجەنگدا
رَجَز: یەکێکە لەکێشـەکانی هۆنـراوە کەبەبەحری (رجز) ناسـراوە، دەردێکە تووشی وشتردەبێت
رَجَزَ بِه: هـۆنراوەیەکی لەسـەر کێشی بەحری (رجز) نووسی
رِجْز: سزا، بـەڵا ، پیسـی، نـاپوختی، بتپەرستن
رِجْـز: گونـاهو تـاوان، سـووچ و قەباعەتکاریی
رُجْز: ناپاکی ، گەندەڵی ، پیسی
رَجَس ـ رِجْس: کـردەوەیەکی ناشـیرین و بەدی لێوەشایەوە، رەفتاری ناقۆڵای لێ دیاریدا
رِجْس (دَنَـس): پیـس، چەپـەڵ، گـلاو، گەند
رِجْس (العَمَل القَبِيح): کردەو رەفتـاری ناشیرین ، نەنگی، ناتەواویی، بەدیی ، وەسوەسەی شەیتان ، بزاوتی پەنهانی
رَجَس: پیسی، ناپوختی، گەندەڵی
رَجَسَ البَعِير: دەنگی لێوە هات
رَجَسَ السَمَاء: گـرمەو ناڵـەی هـەورە بروسکەی پەخشکرد
رَجَسَ فُلاناً عَنْ الأمْر: رێگـری لێکرد، پەکی خست ، دەستی هێنایە ڕوی
رَجَـعَ (عَـادَ): گەڕایـەوە، هاتـەوە، ڕۆیشتـەوە، داهاتـەوە، جـارێکی دی سەری هەڵدایەوە
رَجَـعَ إلَـى الأمْـر: دیسـان گەڕایـەوە سـەری، دەسـتی پێکـردەوە، تـێ هەڵچوەوە
رَجَعَ إلَيه فِي الأمْر: پـەنای بردە بـەر ، راوێژی پێکرد، راپرسی کرد
رَجَعَ عَنْ الأمْر: وازیلێهێنا، دەسـتی لێهەڵگرت، دەستبەرداری بوو
رَجَـعَ فِـي كَلامِـه: پاشـگەزبوەوە، پەشیمان بوەوە، ژیوان بوو
رَجَعَ عَلَيه: داوای لێکـردەوە، داخوازی لێکردەوە، سوودی پێگەیاند
رَجَعَ فِي المُصِيبَة تَرْجِيعاً: گوتنی (إِنَّا لله وَإِنَّا إِلَيه رَاجِعُون)
رَجَّعَ: گەڕانیەوە، دایەوە، پێیدایەوە
رَجَّعَ فِي صَوْتِه: دەنگـی لەگـەروودا خەفەکرد
رَجْـع (عَـود): گەڕانـەوە، هاتنـەوە، داهاتنەوە
رَجْع الصَدَى: دەنگدانەوە
رَجْـع المَطَـر بَعْـدَ المَطَـر: بـاران بـەدوای بارانا

**رَجْع**: باران بەدوای بارانا،بەسەرچوونی رۆژانی وەرزی بەھار
**رُجْحَان**: وەلأمی نامە، وەلأمی نوسراو
**رَجْعَة**: گەڕانەوە، ھاتنەوە
**رَجْعَة( وَصْل )**: بەلگەنامە، وەرگرتنی نامە، پسوولە
**رَجْعِي**: کۆنە پەرست، کۆن ویست، کۆنخواز ، بەرەو دوا
**رَجَفَ( هَزَّ )**: لەرزانی، لەرانیەوە، شلەقانی، ھەژانی
**رَجَفَ القَوْمُ**:خۆیان ئامادەکرد بۆجەنگ
**رَجَفَ الرَّجُل**: شلەژا، تێکچوو، شێوا، ھەلس‌وکەوتی نائاسایی نواند
**رَجَفَ الأَرْض**: تووشی زەمین لەرزین ھات ، کەوتە لەرزین
**رَجَفَ الرَّعْدُ**: دەنگی دایەوە
**رَجَفَ الأَسْنَان**: ددانەکانی کەوت
**رَجَف الرِيح الشَجَر**:جولأندی ،بزواندی، ھێنایە لەرزین، لەرەلەری پێکرد
**رَجْفَة**:لەرە، لەرزین، ھاتن‌و چوون، لەرە لەر، موچرك، لەرینەوە
**رَجَلَ الفَصِيل**:لەگەل دایکی ناردی ھەتا چەن شیر دەخوات بیخوات
**رَجَلَ الشَّاةُ**: بەقاچییەوە بەستیەوە بەپایەو سنگێکەوە
**رَجِلَ( سَارَ عَلَى رِجْلَيه )**: بەپێ رۆیی ، بەپیادە چوو
**رَجِلَ الدَّابَة**:یەکێك لەقاچەکانی سپی‌بوو
**رَجَّلَ شَعْرَه**: شانەیکرد، خاوی‌کردەوە
**رِجْل**: پێ ، لاق ، کۆمەلە شتێك
**رِجْلُ البَحْر**: کەنداو
**رِجْلُ السَهْم**: ھەردوو سەری، سەروبنی
**رِجْلُ الغُرَاب ورِجْلُ الجَرَاد**:دوو رووەکە
**رِجْلُ الجَبَّار ورِجْلُ الجَوْزَاء ورِجْلُ قَنْطُورس**: چەن ھەسارەیەکن
**رَجُل**: پیاو، مرۆڤ ، مەردوم، ئینسان، کەلەپیاو ، ناودار
**رَجِل- رَاجِل**: پیادە ، بەپێ ھاتوو
**رَجُل- رَجَل- رَجِل**: قژە سەر نەخاوی‌و نە لوول
**رُجْلَة**: تواناو ھێزی رۆیشتن، بوونی تواناو ھێز لەسەر رۆیشتن، سپێتی لەیەکێك لەقاچەکانی ئاژەلدا ، پیاوەتی
**رَجَمَ**: بەردی ھاویشت، بەردی ھەلدا، بەرد بارانی کرد، بەردی تێگرت، بەردی‌خست جنێویدا،نەفرەتی لێکرد، ئەفەرۆزی کرد ، دەریکرد
**رَجَمَ القَبْر**: کێلی بۆ دانا ھەتادیارو ناسراو بێت
**رَجَمَ الرَّجُل**: بەگومانەوە قسەیکرد
**رَجَمَ**: بەدگومان بوو ، دوو دل بوو
**رُجْمَة - رَجْمَة**: کێل، بلند، بەرز،بەردی سەرین‌و پاینی قەبر
**رَجَوان**: قەراخی ھەرشتێك چال‌و..
**رَجُوس**: وشترێك دەنگی گەورە زلە بێت
**رُجُوعَة**: وەلأمی نامە، وەلأمی نووسراو
**رُجُولَة - رُجُولِيَّة**: پیاوێتی، نێرێتی، پیاوەتی، مەردیی جوامێری، دلاوەریی
**رَجِيَّة**: ئومێد، ھیوا، ئاوات، خواست ، حەز ، ویست، ھومێ
**رَجِيج - رُجُخ**: گیایەکی بەھارییە، خواردنێکی ساردە کەوا گەرم بکرێتەوە، مەنجەلی پڕ

**رَجِيعْ:** تەرس، تەرسە قول، ئەو گوتەیەی دەدرێتە پاڵ خاوەنەکەی

**رَجِيلْ - رَاجِلْ:** ئەوەی دەتوانێت زۆر بەپیادە بڕوات

**رَجِيمْ:** نەفرەت لێکراو، مەلعون، بەردتێگیراو، بەردبارانکراو، دەرکراو لەسۆزو بەزەیی

**رح**

**رَحَا - رَحَى:** لوولبوو، پەیکەی بەست، گرمۆڵە بوو

**رَحَا الرَّحَى:** دەستاڕی کرد

**رَحَى:** دەستاڕ، خڕێ

**رَحَائِبُ التُّخُومِ:** بۆشایی لایەکانی زەمین، ولاتە رووبەردارەکان

**رُحَابْ:** بۆشایی هەرشتێك

**رُحَاضْ:** تادار، بەتا

**رُحَاضَةْ:** جل شۆر

**رُحَاقْ:** بادە، مەیی، ئاوی کەوسەر لەبەهەشتدا

**رَحَالْ - رَحَّالَةْ:** موسافیر، رەوەند، جیهانگەڕ، کۆچەر، دنیادیدە

**رِحَالَةْ:** زینێك لەچەرم دروستکرابێ و وردە پوش و داری تیا نەبێت

**رَحَّالَةْ:** گەڕیدە، گەڕۆك، گەڕندە، گەڕانۆ، بگەڕ، ئەوەی زۆر کۆچ دەکات، ئەوەی هەمیشە لەسەفەردایە

**رَحُبَ (إِتَّسَعَ):** فراوانبوو، گوشادبوو

**رَحْبْ (وَاسِعْ):** فراوان، گوشاد، پان، بەرین، وەڕاق

**رَحْبُ الْبَاعْ:** دەست بلاو، بەخشندە

**رَحْبُ الصَّدْرْ:** میهرەبان، پیاوچاك، سینە فراوان

**رَحْبَ الْفَهْمْ:** تێگەیشتوو، زرنگ، فامیدە

**رَحْبَةْ:** زەوی پان و بەرین، کۆلان، کەلەبەر، بۆشایی نێوان مالان

**رَحْبَةُ الدَّارْ:** حەوشە، گۆڕەپان، ساحە

**رَحْبَةُ السَّيَارَاتْ:** وێستگەی ئوتومبیل، شوێنی وەستانی

**رَحَّبَ:** پێشوازی لێکرد، پێخۆشحالی بەهاتنی دەربڕی

**رَخْرَاحْ:** خۆشگوزەرانی، خۆشحالی، دەست رۆیشتوو

**رَخْرَحَ:** نەگەیشت بەناخ و ناوەڕۆکی ئەوەی دەیویست

**رَخْرَحَ الشَّيْءَ عَنْ فُلَانْ:** شاردیەوە لێی، پەنهانیکرد، داپۆشی

**رَخْرَحَ بِالْكَلَامْ:** واتاو مانای دەرنەخست

**رَخْرَحْ:** فراوان، گوشاد، بەرین

**رَحَضَ:** شتی، لەئاوی هەڵکێشا، تێی وەردا

**رُحِضَ الْمَهْمُومْ:** تاکەی تاوی سەندو ئارەقی کردەوە

**رُحَضَاءْ:** ئارەقکردنەوە بەهۆی تاوە بەتایبەت کاتێ رێژەی تاکەی دەنیشێتەوە

**رَحَلَ إِلَى الْمَكَانْ:** گواستیەوە

**رَحَلَ عَلَى الدَّابَةْ:** سواری بوو

**رَحَلَ الْبِلَادْ (طَافَهَا):** پیاگەڕا، گەشتیکرد

**رَحَلَ الْبَعِيرْ:** بارو بارگەی لەسەری بەست و سواری بوو

**رَحَّلَ:** راگوێزیکرد، گوێزایەوە، دووری خستەوە، ناردی، رەوانەیکرد

**رَحْلٌ:** کۆچکردن ، دوورکەوتنەوە

**رَحْلٌ(سَرَج البَعِير):** کۆپانی وشتر

**رَحْلٌ:** کەلو پەل ، تفاق ، شتو مەك ، مالّ ، جێو رێ، رێو شوێن

**رُحْلَة:** ئـەولایەی کۆچکـارو موسـافیر رووی تێدەکات، یەك سەردانو گەشت

**رِحْلَة:** گـەشت، سـەفەر، چـیرۆکی گەشـتیار دەربـارەی رووەکـانی گەشتەکەیـەوەو ئـەو رووداوانـەی هاتوون بەسەریا

**رِحْلَة قَصِيرَة:** سەیران، گەشتێکیکورت

**رَحِمَ:** دڵی نەرم بوو، بەزەییپیاهاتەوە، لێـی بـورد، رەحمـی پێکـرد، سـۆزو بەزەیی بۆ جوولاّ

**رَحِمَ عَلَيه:** داوای لێخشـبوونی بـۆ کـرد وتـی پـەروەردگارا لێـی ببـورە، بـۆی پاڕایەوە لەخوای گەورە

**رُحْم:** بەخشـش، میـهرەبانی، سـۆز، بەزەیی، شەفەقە

**رَحِم ـ رَحْم:** منـاڵدان، زارۆك، پـزدان، خزمایەتی

**رُحْمَى:** میهرەبانی ، بەسۆزیی

**رَحْمَان:** یەکێکـە لـەناوە جوانـەکانی خوای گەورەو میهرەبان، بەخشندە

**رَحْمَـة(رِقَّـة القَلـب):** دڵنـەرمی ، لێبوردی، سۆزداریی ، بەخشندەیی

**رَحُـول:** ئـەوەی زۆر گەشـتو گـوزار دەکات، وشتری بەهێزو پتەو

**رَحُوم:** بەبـەزەیی، دڵنـەرم، بـەڕەحم، میهرەبان

**رَحِيب:** فراوان، گوشاد، پان، بەرین

**رَحِيـضْ(مَغْسُـول):** شـۆراو،لـەئاو هەڵکێشراو

**رَحِيقْ:** گـولاّو، رینگـاو، شـیلە، جـۆرە بۆنێکی خۆشە

**رَحِيـلْ:** رۆیشـتن ،چـوون، کۆچکـردن، رەوکردن ، دوور کەوتنەوە، پەڕاگەندە کەوتن

**رَحِيمْ:** ناوێکی جوانی خـوای گەورەیـە، بەبەزەیی، دڵنەرم، میهرەبان، بەسۆز ، بەڕەحم

## رخ

**رَخَّ:** خاوی کردەوە، شلی کردەوە

**رَخَّ الشَّرَاب:** ئاوی تێکرد، روتیکردەوە، خاویکردەوە

**رَخَّ العَجِينَ:** شل بوو، ئاوی زۆربوو

**رَخَّ السَّمَاء:** رشـێنەی کـرد، نمەیـەك باری

**رُخّ:** سمرخ، باڵندەیـەکی ئەفسـانەیە، قەلاّ، داشتی شەترەنج

**رَخّ:** نمەباران ، رەشێنە

**رَخَا العَيش:** خۆشگوزەران بـوو، بـاری ژینی باش بوو

**رَخِيَ العَيـشُ رَخَـاءً:** ژینـی پڕنـازو نیعمـەتی بەسـەر بـرد، ژینـی خۆشگوزەرانی بەڕێکرد

**رَخِيَ:** خاوو شلی کردەوە، رەوانیـەوە، لەقیکرد

**رَخِيَ الزِّمَام:** جڵەوی شلکرد

**رَخَاء:** خۆشـگوزەرانی، نـازو نیعمـەت، نـەوا ، هـەرزانی، شـتومەك زۆریـی ، بژێوی ئاسان

**رُخَاء:** ئەو بایەی سستو هێواشەو هیچ شتێك نالەرێنێتەوە

**رَخَـاخ:** زەوی نـەرمو شـل، ئاسـوودە، خۆشحالّ، نەرمە زەوی فشەلّ، ژینـی خۆشگوزەرانیو پڕنازو نیعمەت
**رُخام( حَجَـرٌ مَعْرُوف ):** مەڕمەڕ، خـارا، کەلا، بەردە مەڕ مەڕ
**رُخامَى:** کزەبا،نەرمەبا،جۆرە روەکێکە
**رُخامَة:** پارچەیەك مەڕمەڕ، گژوگیایەکە
**رَخاوَة:** نەرمو سستی، ئاسانو سانا
**رَخُصَ:** هەرزانبوو، نەرم بوو
**رَخُصَ السِّعْر:** هەرزانیکرد، دابەزاند
**رَخَّصَ لَهُ كَذَا:** ڕێی‌دا، مۆڵەتی پێدا
**رَخص( لَيِن ):** نەرم ، شل ، نیان
**رُخْصَة:** مۆڵەت،ڕێدان،ڕێ بۆخۆشکردن، ئاسانکردن، روخسەت
**رَخَفَ:** هەڵهات ، بەرزبووەوە
**رَخِف ـ رَخْفَة:** کـەفی ناسـك، هـەویری هەڵهاتوو
**رَخَمَ ـ رَخـمُ الصَوت أوْ الكَلاَم:** دەنگـی نـەرم بـوو، بـاریکی کـردەوە، وشـەو قسەکانی ناسك بوو
**رَخَّمَ الصَـوت:** دەنگەکـەی خۆشـکرد، ئاوازی دەنگی خۆش بوو
**رَخَّمَ الأرْضَ:** مەڕمەڕ ڕێژی کرد
**رَخَّمَ تَرْخِيماً:** کلکی قـرتاند ، هەڵگرتنو حەزفی پیتـی کۆتـایی لـە(نداء)وکـاتی پێویستدا
**رَخِمَ ( عَذبَ ):** بەسۆز، خۆش ئاواز
**رَخَم ـ رَخَمَة:** مریشکی کرکەوتوو
**رَخَّمَ الدُجَاجَة:** لەسەر هێلکەهەڵنیشت، کرکەوتن
**رَخَمَ:** باڵندەیەکی دڕنـدەو گۆشـتخۆری گەورەیە

**رَخَمَتْ الدَجَاجَة البَيض وَعَلَـى البَيـض:** هەڵنیشتو کرکەوت لەسەریا
**رَخُوَ:** خاویەوە، شل بووەوە، لەق بوو
**رَخـوْ( لَيـن ):** ڕملّ، نـەرم، شـل، لـەق، خاو،شل‌و شێواو،سستەك، نەرمەفشەلّ
**رَخِيص:** هەرزان ، کەم نرخ‌و بەها
**رَخِيم:** ئاوازو دەنگـی خـۆش،ئاهـەنگو ئاوازی خۆش

## رد

**رَدَّ:** گەڕانیـەوە، هێنایـەوە، بردیـەوە، دەستی پێوەنا، پاڵی پێوەنـا، وەڵامـی دایەوە، بەرگری لێکرد
**رَدَّ عَنْ كَذَا:** دووری خستەوە
**رَدَّ فُلاناً:** بەهەڵەی زانی
**رَدَّ البَـــاب:** دایخســـت، پێوەیـــدا، جووتی‌کرد
**رَدَّ إلَيه جَوَاباً:** وەڵامی بۆ نارد
**رَدَّ الشَّـيء:** لەبـارێکەوە بـردی بـۆ بارێکی‌تر
**رَدَّ الدَّين( سَدَّدَ ):** قەرزەکەی دایەوە
**رَدَّ الزِيَارَة:** چوەوە بـۆ لای، سـەردانی کردەوە
**رَدَّ عَلَـى القَـوْل:** بەرپـەرچی دایـەوە، بەدرۆی خستەوە
**رَدَّ الإعْتِبَار:** مافی دایەوە، حـەقی بۆ گەڕانەوە
**رَدَّ إلَيه حَيَاتَه:** ژیایەوە، بەهۆش خـۆ هاتەوە
**رَدّ:** گـێڕانەوە، هێنانەوە،وەڵامدانەوە، پاسـوخ، ڕووناکی‌دانـەوە، بەرهەڵسـتی کردن
**رَدّ الإعْتِبَار:** مافـو ئابڕو وەرگرتنەوە

**رَدْ الفِعْل:** كاردانەوە، هەڵوێست گرتن
**رِدْ:** پایە، ستوون، كۆڵەكەی هەرشتێك
**رَدَى الشَــيء:** كــەوت، لــەناوچوو، تیاچوو، فەوتا
**رَدَّى( أرْدَى ):** خستی، كوتای بەزەویدا
**رَدَّى ( قَتَلَ ):** كوشتی ، لەناویبرد
**رَدَّى الخَمْسِينَ( زَادَ ـ تَجَاوَزَ ):** لەپەنجا تێپەڕی
**رَدَى ( مَوْت ـ مَنِيَّة ):** مــردن ، نــەمان ، گیــان دەرچــوون، مــەرگ، فــەوتان، فەوت بوون
**رِدَاء:** عەبا، بالاپۆش، كراس،شمشێر ، كەوان ، نەزانین و گێلی،جوانی ، ژیری و نەزانی
**رِدَاء الشَمْس:** تیشك و رووناكی رۆژ
**رِدَاء الشَاب:** هەڕەتی لاوی و هەرزەكاری، شێرەی گەنجی
**رَدَاة:** بەرد، تاشەبەرد، بەردی گەورە
**رَدَاد ـ رِدَاة:** بەرێیكرد، دەستی‌پێوەنا
**رُدَاغ:** شــوێنەواری بۆنخۆشــی لەســەر جەســتە، گەڕانــەوەی نەخۆشــی، سەرهەڵدانــەوەی پەتاو نەخۆشی
**رِدَاغ:** قوڕاو ، ئاو
**رِدَاف:** پاشەڵی ئاژەڵ، سمت و كلۆتی
**رُدَافِي:** پاڵپشت، پشتگیر، پەنا
**رُدَام:** مەردومی بێخێرو بێر، بێخێر
**رَدُءَ:** خراپ و نابار بوو
**رِدَّة:** ناشیرینی لەشتێكدا وێڕای جوانی ئەو شتە
**رِدَّة:** زایەڵە، دەنگدانــەوە،گەڕانــەوە بــۆ ســەرچاوەو بنــەڕەت، هەڵگەڕانــەوە، پاشگەزبوونەوە

**رَدَحَ:** توانیی و جێگیربوو
**رَدَحَ:** پانی كردەوە، پلیشانەوە
**رَدَحَ لَهُ ( وَبَخَه ):** سەرزەنشتی كرد
**رَدَحَ( مُـدَّةً طَوِيلَـةً ):** ماوەیــەكی دوورو درێژ
**رَدَحَ ( ألَـم خَفِيـف ):** ئێــش و ئــازارێكی كەم
**رَدَّدَ:** دووبــارەی كــردەوە، وتیــەوە، دووپاتی كردەوە
**رَدَعَ:** دایمركانەوە، دابینیكرد، خەفـەی كـرد، هەڵسڵەمیەوە، وازی هێنا
**رَدَعَ عَنْ كَـذَا:** گرتیـەوە، رێگـەی نـەدا، بەربەستی دانا لەبەردەمیدا
**رَدَعَ السَهْم:** كێشــای بــەزەویدا تــا چەسپاوی بكات
**رُدِعَ ـ رَدْعَة:** رەنگی گۆڕا بۆ زەرد
**رُدِعَ بِهِ:** تیاچوو، فەوتا ، لەناوچوو
**رَدَّعَ بِالزَعْفَرَان:** بەزافەران رەنگیكرد، لەكەداریكرد
**رَدْع:** زافــەران ، گــەردن ، گــەروو، شوێنـەواری نەخۆشی لەسەر جەستە
**رَدَعَهُ بِالشَيء:** لەكـەداریكرد، رەنگـی گۆڕی
**رَدِفَ ـ رَدَفَ:** دواكـەوت، شـوێنی كـەوت بەدویاهات، دوویكەوت
**رِدْفَان:** شەوو رۆژ
**رَدَم الثَلْمَةَ أوْ البَاب:** دایخست، پێوەی
**رَدَمَ القَوْس:** ئاراستەی كرد، تێی گرت
**رَدَمَ البَعِيرُ:** پەلی پـیكوتا، جوولاندی
**رَدَمَ الحُفْرَةَ( مَلأهَا ):** پڕیكردەوە
**رَدَمَ الشَيءِ:** لەبـەری رۆیی، لێی رۆیی
**رَدَمَ البَاب:** پێوەیدا ، دایخست

**رَدَمَ السَحَاب**: بەردەوام بوو ، هەر هەوربوو
**رَدَمَ الحُمَى عَلَيه**: تاكەی تەشەنەی سەند ، هەر بەردەوام بوو
**رَدَمَ الشَجَرَة**: سەوز بووەوە پاش وشكبوونی
**رَدَمَ الثَوب**: پینەی كرد
**رَدَمَ النَاقَة عَلَى وَلَدِهَا**: سۆزو بەزەیی پێدا هاتەوە
**رَدَمَ**: پڕكردنەوە،چلۆپێو، داروپەردوو
**رَدَمَ**: دایخست ، پێوەیدا، گرتی
**رَدَنَ ( غَزَلَ عَلَى المِرْدَن )**: تەشی رست ، بەتەشی رستی
**رَدَنَ الأَشْيَاء**: پاكی كردەوە
**رَدَنَ النَار**: دوكەڵی كرد
**رَدَنَ القَمِيص**: قۆڵی بۆ كرد
**رَدْن**: دەنگی لێكخشانی چەند پارچە چەكێك لەیەك
**رَدْن**: رستن
**رَدَهَ ـ بِحَجَر رَدهَاً**: بەردی تێگرت، بەردی بۆ خست
**رَدَهَ البَيت**: گەورەو فراوانی كرد
**رَدَهَ الرَجُل**: بەجوامێری‌و بەخشندەیی‌و ئازایەتیەوەسەرۆكایەتی نەتەوەكەیكرد
**رَدْهَة**: چاڵ، كلۆریی، كون، بۆشایی كەلە شاخ یان بەردێكدا هەبێت‌و ئاوی تێدا كۆ دەبێتەوە
**رَدْهَة الدَار**: هۆڵ، شوێنی فراوان‌و گوشاد، ساڵۆن
**رَدِيَ**: تیاچوو ، فەوتا ، كەوت
**رَدِيع**: ئەو تیرەی سەرەكەی كەوتووە
**رَدِيف**: یەدەگ ، سوارێك لەدوای سوارەوە
**رَدِيم**: جل‌و بەرگی كۆنە
**رُدَيْنِي**: تیرێك كەدەدرێتە پاڵ(ردین)ی ئاماژەیەكیشە بۆ ئافرەتێك كە بەناوبانگبووە بەڕاستكردنەوەی تیر

**رذ**

**رَذَت السَمَاء**: نمەیەك باری،رشێنەیكرد
**رَذَت القِرْبَة**: مەشكەكە لێی چوو، لێی تكا، دەلاَنی
**رَذَاذ( مَطَر خَفِيف )**: نمەباران،رشێنە، پریشك، گوڵ نم ، پرژێن ، پرژێنە
**رُذَال ـ رُذَالَة**: ئەوشتە خراپەی دوای هەڵبژاردن دەمێنێتەوە، گەنگە، خراپ، پاشماوە
**رَذَالَة( سَفَالَة )**: رسوایی، سووكی، بیْئابرویی، نزمی ، بیْ كەسێتی
**رَذُلَ ـ رَذَلَ**: شایانی رق لێبوون بوو، ناقۆڵاو ناشیرین بوو
**رَذَلَ( إحتَقَرَ )**: بێزی لێكردەوە،بەسووك تەماشایكرد، بەنزم بۆی روانی
**رَذَلَ( أَهَان )**: شكانی،ئابرویبرد، قسەی ناشیرینی پێوت، سەرزەنشتیكرد
**رَذِل( سَافِل )**: سووك، نزم، بیْئابرو
**رَذِيّ**: لاوازو كز، كەم توانا ، بیْتوانا
**رَذِيّ**: ئەوەی نەخۆشی كەنەفت‌و لەش بەباری كردووە
**رَذِيل**: سووك، رسوا ، نزم ، بیْئابرو
**رَذِيلَة**: خراپە، كرداری ناشیرین‌و بیْجیْ، بەد رەفتاری، پێچەوانەی چاكەیە

**رز**

**رُز( أُرُز )**: چەڵتوك ، برنج
**رُزْ بِلَبَن**: دۆكولیو، چێشتێكە برنج یا ساوەر لەناو دۆ یاخود ماستاوابیْ دەبێت، دۆخەوا

**رُزْ مَطْبُوخ:** قوبولّی ، چێشتی برنج
**رِزْ:** دەنگیدوور، دووره دەنگ، خوڕەی ناوسك، دەنگی هەوره تریشقه ، هەر دەنگێك
**رَزَأَ ورَزِيَ الرَّجُل:** خێری لیٚ بینی، چاكەی لیٚدی
**رَزَأَ الرَّجُل مَالَهُ:** كەمیكرد، كەلێنی تێكەوت
**رُزْء:** بەلاّ ، نەهامەتی ، كارەسات، چوړتم
**رَزَاحَى:** لەڕو لاواز ، پەك كەوتوو،كەم توانا
**رَزَّاز:** برنج فرۆش
**رَزَاز:** فیشەك
**رَزَّاق:** رۆزیدەر،خوای بالاّدەست،بەتەنیا بۆ خوای گەوره دەگوترێ
**رَزَام:** پیاوی توندو سەخت، رەقە پیاو
**رَزَّام:** شێری بێشە
**رَزَان:** ئافرەتی خاوەن كەسایەتیو بەهێز ، ئاغر، هێمن، لەسەرخۆ، ئارام
**رَزَّتِ الجَرَادَة:** كوللەكە گەرای نا،گەرای خست
**رَزَّة:** ئەڵقەڕێز، سنگ یا بزماری ئەڵقە بەست
**رَزَّة:** بەدبەختی، بەلاّ، ئافات،موسیبەت
**رَزَحَ الجَمَل:** كەوت لەبەر لاوازیو كفتی
**رَزَحَ الرَّجُل:** پەكی كەوت، نەیتوانی، لێبوەوه، هیچی نەما
**رَزَحَ العِنَب:** بەرزی كردەوه لەكاتی شۆڕبوونو كەوتندا
**رَزَّح:** وشتری لاوازو پەككەوتوو
**رَزَّحَ النَّاقَة:** لاوازیكرد، لەڕو لاوازیكرد
**رَزْحَى:** وشتری لەڕو لاواز
**رَزَّزَ (صَقَلَ):** سافو لووسی كرد
**رَزَّزَ الأَمْر:** ئامادەیكرد، حازریكرد
**رَزَقَ:** رزقیدا،دایە، پێیدا، پێیبەخشی، رزقی بۆ نارد
**رُزِقَ (نَالَ الرِزْق):** رزقی بۆ هات، پێی گەیشت
**رِزْق:** رزق، باران، گوزەران، بژێوی، رۆزی ،سامان ، بوم، شانس ، بەخت ، دەرامەت، هۆی ژیانو بژێوی ، میراتی
**رَزْقَة:** ئەوەی بۆ سەرباز دەردەچێت سەری مانگان
**رَزَمَ (حَزَمَ):** پێچایەوه، بەستی، گورزەی كرد
**رَزَمَ الشَيء:** بەستیو پێچایەوه
**رَزَمَ بالشَيء:** وەریگرت لێی
**رَزَمَ عَلَى عَدُوه:** سەركەوت بەسەریاو چۆكی پێدایا
**رَزَمَ الشِتَاء:** ساردبوو
**رَزَمَ البَعِير:** نەیتوانی بەرگری بكات بەهۆی لاوازییەوه
**رَزَمَ الثِيَاب:** كۆیكردەوەو بەستی
**رِزْمَة:** پێچراو ، بەستراو ، گورزه
**رِزْمَة كَبِيرَة:** فەردە ، بالە، تایەكە لەبارێك
**رِزْمَة وَرَق:** بەستە كاغەز ، بەند
**رَزَمَة:** دەنگی منالٚ،دەنگێكی گەورەیە، دەنگی وشتر
**رَزْمَة:** یەك جار خواردن لەرۆژێكدا
**رَزَنَ بالمَكَان:** جێگیربوو، مایەوه، نیشتەجێبوو
**رَزَنَ الشَيء:** هەڵیسەنگان،تاوتوێی كرد

**رَزُنَ(وَقُرَ):** ئاغر بوەوە، هێمن بـوەوە، لەسەر خۆ بوەوە، ئارام بوو، هێـواش‌و لەسەرخۆبوو
**رَزْن - رِزْن:** شوێنێکی بەرز کـەئاو تێیـدا کۆببێتەوە، ناوچە ، ناحیە
**رِزْنَة:** شوێنی کۆبوونەوەی ئاو
**رَزِيئَة:** بەلاَ ، بەدبەختی ، ئافات
**رَزِيَّة:** بەلاَو موسیبەی گەورە
**رَزِيز:** گیایەکە رەنگی پێدەکرێت
**رَزِيز الرَّعْد:** دەنگی هەورەبروسکە
**رَزِيـزِي:** دەنگێکـە لـەدوورەوە دێـت، دەنگی نهێنی‌و پەنهان
**رَزِيـن(وَقُـور):** هێمـــن، لەســەرخۆ، سەنگین، مەنگ، ئاغر،هێـور، بـەئارام ، قورس ، سەلار
**رَزِيـن الـرَّأْيِ:** بیرکـار، خـاوەن رایـەکی سەنگین‌و قورس
**رَزِينَـة:** ســەلارە، ئــافرەتی هێمـــن‌و لەسەرخـــۆو خـــاوەن کەســـایەتی سەنگین

**رس**

**رَسَّ البِئْر:** هـەڵیکەند ، چاڵی‌کرد
**رَسَّ الشَّيءِ:** بـەپەنهـانکردی، بەنـهێنی کردی، بەدزییەوە کردی
**رَسَّ لَهُ الخَبَر:** بۆی گێڕایـەوە، پـێی وت ، پێی راگەیاند
**رَسَّ المَيـت:** شـاردیەوە ، دفنی‌کـرد، بەخاکی سپارد، ناشتی
**رَسَّ السُقْم فِـي جَسَدِه:** جێگیـــریوو، چوە نێو جەستەی چەسپاو جێگیربوو
**رَسّ:** کۆنـە بـیر، بـیرێکی چـەن ســاڵە، کانزا،سەرەتای هەموو شتێك
**رَسّ الحَـب:** ســەرەتای ، شـــوێنەوارو پاشماوە
**رَسَا(ثَبُتَ وَرَسَخَ):** جێگیربوو، چەسپا
**رَسَـا السَّـفِينَة:** لـەگوێی بەندەرەکـە وەستا
**رَسَـا بَيـنَ القَـوم:**چـاکخوازی‌کرد، جێنشین بوو
**رَسَـا عَنْـهُ حَدِيثـاً:** لەوەوەگێڕایـەوە، لێوەی باسیکرد
**رَسَا لَهُ الحَدِيث:** چمکێکی بۆگێڕایەوە، بەشێکی بۆ باسکرد
**رَسَـا المَرْكَـب:** کەشـتیەکە لەنگـــەری هاویشت
**رَسَـا المَرْكَـبُ(وَقَـفَ فِـي المَرْسَـى):** کەشتیەکە لەبەندەر وەستا
**رَسَـا المَـزَاد أَوْ العَطَـاء:** مـــەزاد یــا مەزادەکە وەستاو گیرسایەوە
**رَسَائِع:** گولَنگ، پلپلە، گـێزو گولنگ
**رِسَاغ:** ئەو پەتەی دەست‌و قاچی چوار پێی پێدەبەسترێتەوە تا نەڕوات
**رِسَال:** دەست‌و پـێی چوار پایان
**رِسَالَة:** نامە، پەیام، نامیلکە، نێرراو
**رَسَّام (مُصَوِّر):** وێنەگر، نیگار کێش
**رَسَـبَ:** نیـــشت، کەوتـــەبنی، کەوتـــە ژێرەوەی
**رَسَبَ فِي الإِمْتِحَان:** دەرنەچوو، کەوت
**رَسَّبَ:** نوقمی‌کرد، خسـتیە بنـی، دەری نەچوان
**رَسَبَت العَينُ:** بەئاگابوو، بێداربوو
**رَسَغ:** کۆڵەکەی قایم‌و پتەو
**رُسْع:** گۆشتی دواوەی رانی لەڕ
**رَسْخَاء:** ناقۆلاَ ، ناشیرین

**رَسَخَ:** جێگیربوو، چەسپا، قایم بوو، ڕەگی داکوتا ، چەقی
**رَسَّخَ( أَثْبَتَ ):** جێگیری کرد،داگیریکرد، چەسپاندی
**رَسَّخَ فِي الذِهْن:** خستیە مێشکیەوە
**رَسَعَ العضو:** خراپو شل بوو
**رَسَّعَ عَيْنَهُ:** پێڵوەکانی نووسا بەیەکا
**رَسَعَ الصَبِي وَغَيرُهُ:** پەتو مووری چاوە زاری کردە دەستو پێی
**رَسِعَ:** برژانگەکانی شکانوتێکچوون
**رَسَّعَ( فَسَدَ ):** شوێنەکەی تێکچوو، شێوا
**رَسْعَاء:** یەکێك چاوو برژانگەکانی بەسەریەکا شێواو تێکچوو بێت
**رَسَغَ البَعِير:** خرتگەو قولەپێ بەپەتێکەوە بەستەوە
**رَسَّغَ المَطَر:** بەزۆریی باریی هەتا قولەپێو خرتگەی ئاژەڵ لەزەوی چەقیو ڕۆچوو
**رَسَّغَ العَيش:** فراوان بوو، گوشادبوو
**رَسَّغَ الكَلام:** قسەی هەڵبەست لەنێویدا
**رُسْغ ـ رُسُغ:** خرکە، خرتکە، مەچەك، قولەپێ
**رَسَغ:** خاویو سستی لەجووڵەی دەست پێی چوارپێیاندا
**رَسَفَ:** بەچەشنی یەکێکی کۆتکراورۆیی بەرێوە
**رَسِلَ الشَعر:** داهات، خاوبووەوە، هاتەخوارەوە، شۆڕو پەخشان بوو
**رَسِلَ البَعِيرُ:** بەهێواشی دەڕۆیی
**رَسَّلَ فِي القرآءة:** لەسەرخۆو بەهێواشی خوێندیەوە
**رَسَلَ( سَهل ):** ئاسان، سانا، زمان ڕەوانی

**رَسَلٌ مِنَ السَير:** ڕۆیشتنی ئاسانوسانا
**رَسَلٌ مِنَ الشَعر:** پرچو قژی خاو
**رَسَلٌ مِنَ الإبل:** وشتری هێواش
**رِسْل:** خۆشگوزەرانی، نەوا، بەپیتو فەرداریی
**رَسَلَ:** کۆمەڵ، تاقم ، گرۆه، تاقمو کۆمەڵی هەموو شتێك
**رَسْلَة:** تەمبەڵی، تەوەزەلی، نەرمی
**رِسْلَة:** گرانباری ، بار قورسی
**رَسَمَ( صَوَّرَ ):** وێنەی کێشا
**رَسَمَ بِالألوان( نَقَشَ ):** نەخشەی کێشا، نیگاری دروستکرد
**رَسَمَ المَطَر الدِّيَار:** سڕیەوەو تیایبردو بەتەنیا شوێنەواری بەزەوییەوە هێشتەوە
**رَسَمَ لَهُ كذا:** فەرمانی پێدا، بۆی دانا، بۆی دەستنیشانکرد
**رَسَمَ عَلَى كذا:** نووسیو ڕەنگ ڕێژیکرد
**رَسَمَ الكتاب:** نووسی
**رَسَمَ نَحْوَهُ:** بەخێرایی چوو بۆ لای
**رَسَمَ الأسْقف:** پلەیەکی کەنیسەی پێدا
**رَسَمَ البَعِير:** ڕۆیشتنی بەسەر زەویداو بەچەشنێ شوێنەواری بەجێ هێشت، بەتوندی ڕۆیی
**رَسَمَ الثوب:** نەخشەی کێشا
**رَسَمَ الشيء:** بیری خستەوە، بەیادی هێنایەوە
**رَسَمَ البَانِي أوْ الحَافِر:** تەماشایکرد بۆ ئەوەی بزانێ لەکوێدا بینا دروست بکات یان چاڵ هەڵبکەنێ

**رَسْم:** نيشانو شوێنەواری بیناو خانوی وێرانە لەسەر زەوی، نیشانە ، بەڵگـە ، شوێنەوار
**رَسْم:** وێنە ، نیگار ، باج ، میرانە
**رَسْمي:** میری ،یاسایی، ڕێـكو پێـك، دروست ، شیاو ، گونجاو، ڕێ پێدراو، دیاریكراو
**رَسَنَ الدَابَةَ:** ڕەشمـەیكردە ملـی، ڕەشمەی ئاڵاند لەملیەوە
**رَسَن:** ڕەشمـە ، هەوسـارێ كەدەسـەر كەللە دەخرێ
**رَسْو:** لەنگەر گرتن
**رُسُوع:** گوڵنگە كەدەكەوێتە ناوەڕاستی تیرو كەوانەوە
**رَسُول:** پێغەمبەر، پەیام هێنەر، نـێراو، نوێنـەر، پـەیك، مژدەهێـن، سـەفیر ، ڕابەر
**رَسِي:** جێگـیر، چەسـپاو، نـەجووڵاو، كۆڵەكەی ناوەڕاستی چادر
**رَسِيس:** جێگیرو چەسـپاو، مـەردومی عـاقڵو ژیـر ، هـەواڵێكی ناڕاسـتو دروست، سەرەتای دۆستایەتی
**رَسِيغ:** بۆشـایی‌وبواری هـەموو شـتێك ، خۆراكی زۆرو بێ‌شومار
**رَسِيل:** پـەیامنێر، نامـە ، پـەیام، ڕاسپـاردە ،هـاوڕێی قۆنـاغو خـەبات ، فراوانی، ئاوی خۆشو پاكیزە

**رش**

**رَشَّ المَاء:** ڕشتی، ڕژانی، قلپی‌كردەوە
**رَشَّ الأرْض بالمَاء:** ئاوڕشێنی كرد
**رَشَّ الشَيء:** شتی، شۆردی
**رَشَّ الحَائِط بالجَص:** گەچكاریكرد
**رَشّ:** نمەبـاران، ڕەشـێنەباران، ئاوپرژێن، لێدانێكی بەسوێ
**رَشَا:** بەرتیلیدا
**رِشَاء:** كەژاڵ، یەكێكە لەپلەكانی مانگ، پەت بەشێوەیەكی گشتی یـان ئـەو پەتەی بەستراوە بەدۆڵچەوە
**رَشَاد (نَبَات):** تـەرەتیزە، تـەرەتوورە، گیایەكی كەلا وردی توندە بەگۆشـتەوە دەخورێ
**رَشَادَة:** تاشەبەرد ، بەردی گەورە
**رَشَاش:** نمـەباران، شەسـتیر، ڕشـێنە، ئەوەی لەئاووخوێن دەپرژێ
**رَشَاشَة:** ئاوپرژێن
**رَشَاف:** زۆرپرژێنەر
**رَشَاقَة:** قـەشەنگی، شـۆخی ، بـالا ، نەمامی، خەرامانی
**رَشَأ الظَبي:** بـەهێزو پتـەوبوو پاشـان شان بەشان لەگەڵ دایكیدا ڕۆیی
**رَشَأ:** بەچكە ئاسك، بچكۆلی مامز
**رِشْتَة:** خواردنێكە لەتۆكو وردە هەویری لوولو بادراو
**رَشَحَ:** پاڵێورا، پاڵفتەكرا
**رَشَحَ الإنَاء:** لێی تكـا، پـالاوتی، ئـاوی دزی، دەلانی
**رَشَحَ الجَسَد (عَرَق):** ئـارەقی كردەوە، ئارەقی دەردا
**رَشَحَ الظَبي رُشُوحَاً:** قەڵەمبازی‌دا،بازیدا
**رَشَحَ المَال:** بەباشی دەستی‌بەسەراگرتو بـەڕێوەی برد
**رَشَحَ الوَلَد:** پەروەردەیكرد، بۆ كارێكی ئامادەكرد، سازیكرد، بەباری هێنا
**رَشَحَ الغَيثُ النَبتَ:** پـەروەردەی‌كرد، گەورەی‌كرد، نەشو نمایی پێكرد

**رَشَحَ:** ئارەقی جەستە
**رَشَّحَ:** پالاوتن، ئاودزكردن، لیٚتكان ، ئارەق
**رَشَدَ ـ رَشِدَ:** ریٚی راستی گرت، هۆشی هاتەوە، فامیكردەوە، هەستی جوولاو بەهۆش خۆی هاتەوە، بالّغ بوو پیٚی نایە تەمەنی هەرزەكاری
**رَشَدَ أمرَه:** ریٚنومایی كرا
**رَشَّدَ( دَلَّ وَهَدَى ):** رابەریكرد، ریٚی راستی نیشاندا
**رُشِّدَ( يَقَظَة ):** بیركردنەوە، هەست جوولان، گرتنەبەری ریٚگەی راست
**رَشَّدَهُ اللهُ:** خوای گەورە ریٚنوماییكرد
**رَشَفَ المَاء:** مژی، بەهەردوو لیٚوی هەلیمژی، هەلّی قوراند ، زیادەرەوی كرد لەهەلّمژینی
**رَشَفَ الإناء:** هەمووی خواردەوە، گشتی نۆشكرد
**رَشْف ـ رَشَف:** ئاویٚكی كەم لەحەوزدا بمیٚنیٚتەوە
**رَشَقَ بِحَجَر:** بەردی هەلّدا ، بەردی هاویشت
**رَشَقَ الغُلامُ:** قەدو بالآی ریٚكو جوان بوو، شۆخ بوو
**رَشْق ـ رِشْق:** دەنگی پیٚنووس، خشپەی پیٚنووس
**رَشَقَ:** تیروكەوانیٚكی دوور هاویٚژ
**رَشْقَةٌ:** تەقاندی بۆمبا لەیەك ساتو كاتدا
**رَشَقَهُ بِبَصَرِهِ:** چاوی تیٚبری، چاوی لەسەر هەلّنەبری
**رَشَقَهُ بِلِسَانِه:** قسەی پیٚوت، قسەی ناشیرینیكرد بەرانبەری

**رَشَمَ:** نووسی ، مۆریكرد
**رَشَمَ:** بۆنی خواردنی دەكردو بۆیدەگەرا
**رَشْم:** شویٚنەواری باران بەسەر زەوییەوە، یەكەم گژوگیای لەوەرگا كەدەرویٚت
**رَشَنَ:** وەك منالّ وركی بەست بۆخواردن
**رَشَنَ الكَلبُ فِي الإِنَاءِ:** سەری تیٚكرد، سەری تیٚهاویشت
**رَشْن ـ رَشَن:** ئەو كەلیٚنەی ئاوی لیٚدیٚتە دەرەوە
**رَشْوَة ـ رِشْوَة ـ رُشْوَة:** بەرتیل، دەمچەوركردن، ریشوەت، خاوە بۆ كارپیٚكهیٚنان
**رَشِيح:** ئارەق ، تەرایی لەش لەگەرمان یان لەشەرما یان لەتۆبەتیٚو یان لەماندبوونەوە، شلی لەهەلّم تكاو
**رَشِيد:** سیفەتو ناویٚكی پەروەردگاری مەزنە، هەستیار، خەبەردار، بیٚدارو ئاگادار ، ریٚنومایی دەر
**رَشِيش:** رەشاشی گەورە، پرژیٚنەری گەورە، چەكیٚكی گەورە كەدەستریٚژی بەردەوام بەدوای یەكدا بكات
**رَشِيشَة:** رەشاشی دەستی، چەكیٚك گوللەو فیشەك یەك لەدوای یەك بتەقیٚنیٚو بەدەست هەلّبگیریٚ
**رَشِيق:** شۆخو شەنگ ، قەشەنگ، شوش ، خەرامان، قەدو بالآ ریٚك
**رُشَيم:** گیایەكە

**رص**

**رَصَّ الشَيء:** كردی بەناو یەكا، تیٚكی ئاخنی، پەستایەوە،كوتایەوە، ریٚكی خست

**رَيْعَان:** نۆبەرە ، سەرەتا، تاف، هەرەت ، ئەوەڵ
**رَيْعَان الشَبَاب:** هەرەتی لاوی، تافی لاوی
**رَيْعَانَة:** وشتری پڕ شیر
**رِيعَة:** کۆمەڵێکی کۆو دەستە، زەوی بەرزو بڵند
**رِيف:** لادێ ، گوند هەر زەوییەك نزیك بەئاو بێت
**رَيَّفْ - رَيْفَة:** شوێن و جێگەی بەفەڕو پیت
**رِيفِيٌّ:** گوند نشین، لادێی ، ئەوەی جێنشینی گوندە
**رَيِّق السَراب:** جوولاو لەسەر زەوی بەلەرزۆکی هاتەپێش
**رَيِّق:** بەتاڵ ، نارەوا ، ناحەق، نادروست
**رِيق:** لیك ، تفی دەم ، تف
**رَيِّقْ:** نۆبەرەو سەرەتای هەر شتێك
**رِيْل (سَالَ لُعَابُه):** لیك بەدەمیا هاتە خوارەوە، دەمی ئاوی کرد
**رَيَّم بِالمَكَان:** نیشتەجێبوو، هەڵیدا ، لایدا
**رَيَّمَ المَكَان وَمِنْهُ:** بەجێی‌هێشت،چۆڵی کرد، گواستیەوە، ڕۆیشت
**رَيَّمَ السَحَابَة:** هەورەکە بەردەوامبوو نەڕەوییەوە
**رَيَّم عَلَى:** هەڕەشەی لێکرد، چاوی لێ سوورکردەوە
**رَيْم:** زیادە ، چیای بچووك، گۆڕ ، ناوەڕاست ، کۆتایی ڕۆژ هەتا داهاتنی تاریکایی، کاتژمێرێکی دوورو درێژ ، نمرە، زورگ

**رِيْم:** ئاسکی سپی
**رِيَّنَ بِه:** کەوتە نێو بارودۆخێکەوە کەناتوانێت لێی دەرباز ببێت وتواناشی نییە بمێنێتەوە
**رِيهُقَان:** زافەران ، زەعفەران
**رَيِّ:** ئاڵا ، بەیداخ ، عەلەم
**رَيِّي الرَايَة:** ئاڵای دروستکرد،بەیداخی دروستکرد



**رقي** (شووتی)



**رَكْوَة** (بەلەمێکی بچووک)



**رُقْعَة الشطرَنج**

(تەختەی شەترەنج)



**راهِب**

(قەشە)



**رادار**

(رادار)



**راديو** (رادیۆ)



**رَقْطاء**

(پڵنگی پێست خاڵخاڵاویی)



**رَفش** (خاکەناز)



كُرَة قَدَم (تۆپی پێ)



كُرَة قَدَم أمرِيكِيّ (تۆپی پێی ئەمریکی)



الفروسية (زۆرانبازی)



هوكي (هۆکی)





جودو (جۆدۆ)



تنس (تێنس)



**قيادة السفن الشراعية** (لێخوڕینی بەلەمی چارۆکەدار)



**التزلج على الجليد** (خلیسکێنە بەسەر فەردا)



**كُرَة السّلة** (باسکە)



**بليارد** (بلیار)



**ركوب الدّرّاجة** (پاسکیل سواریی)



**بايسبول** (بایسبۆل)



**رَفْعُ الأثقال** (بەرزکردنەوەی ئاسن)



**كي بوكس** (كى بۆكس)



**قِيادة العَرَبات** (عارەبانە لێخوڕین)



**غولف** (گۆلف)



**ساحة وميدان** (ڕاکردن)



**رماية** (نیشانە گرتنەوە)

# ١١ حرف الزّاء

# ز

**ز**

**ز**: يانزەيەم پيتى زمانى عەرەبىيە

**زا - زا**

**زَائِدٌ**: زۆر ، لەرادەبەدەر، لێزيادبوون، زياتر لەپێويست

**زَائِر**: ميوان ، دەيدەوان ، هامشۆو بەسەركردنەوە ، سەرلێدان

**زَائِغٌ( مُنحَرِف )**: خوار ، لار ، چەماوە ، نارێك

**زَائِف( مَغْشُوش )**: قەڵب ، ساختە ، پارەى قەڵبو تەزوير

**زَائِلٌ**: تياچوو ، نەماو ، فەوتاو ، زووتێپەڕ، لاچوو، ناجێگير، ناسەقامگير، ڕۆيندە

**زَائِنٌ**: ئافرەتێك ئارايشتى خۆى دابێتو خۆى رازاندبێتەوە

**زَابَنَ**: گۆڕينەوە، ئالوگۆڕكردنى خورماى تەڕ كەهێشتا بەدارەوەيە بەخورماىتر

**زَاتَ( جَعَلَ فِيهِ زَيْتاً )**: ڕۆنى تێكرد ، زەيتى تێكرد

**زَاتَ الشَّيء**: هەنوىكرد، چەورى كرد

**زَاتَ القَوم**: زەيتى دەرخوارد دان

**زَاجَ بَينَهُم**: نێوانى تێكدان ، ميانى شێواندن

**زَاجٌ**: زاج ، خوێيەكە بەكاردەهێنرێ لە بۆيەدا

**زَاجِرٌ**: دەروون ، ويژدان ، قەدەغەكەر، بەربەست، دابينكەر

**زَاجَل**: سەركردەو فەرماندەى لەشكر، پارچە دارێكە وەك ئەڵقەوايە لەلايەكيەوە پەتى پێوە دەبەسترێ

**زَاجَل الحَمَام**: پەيك ، كۆترى نامەبەر

**زَاحَ**:لاچوو، ڕۆيى، جووڵا، لايبرد، بزوانى، هەژانى

**زَاحَ عَنْ المَكَان**: دووركەوتەوە لەو شوێنە، ڕۆيشتو بەجىٚى هێشت

**زَاحَ العِلَّة**: نەخۆشيەكە رەوييەوە، نەما

**زَاحَ الإبِل**: پەراگەندەو جياجياى كردن

**زَاحَرَةً**: دژايەتىو دوژمنايەتى كرد بەرانبەرىى

**زَاحَفَ**: كشان بەرەو يەك لەجەنگدا ، نزيك بوونەوەى دوو هێزو كشانيان بەرەو يەك

**زَاحِف**: خۆشك ، خشەك،تيرێك لەنيشانەكەى سەربكاتو نەى پێكێ

**زَاحِلٌ**: دووركەوتە، پەراگەندە، دوورەپەرێز

**زَاحَم**:فشارى خستەسەر، تەنگى پىٚهەڵچنى، زۆرى بۆ هێنا

**زَاحَمَ الخَمسِين**: نزيك بە پەنجا ساڵ بوەوە

**زَاخِـرْ**: پـڕ ، لێـوان لێـو، هەڵســاو، بەخشندە، ڕێزدارو شکۆمەند، مەردومی شادمان

**زَادَ**: توێشووی هەڵگرتو ئامادەیکرد

**زَادَ**: زیادیکرد، پتری کرد

**زَادْ**: توێشـوو ، خواردەمـەنی ڕێگـە ، ئازوخە ، خواردەمەنی ، خۆراك

**زَارَ**: سەری لێدا، دیدەنیکرد، چـوو بـۆ لای ، سەردانی کرد، بەسەری کردەوە

**زَارَ الفَرَسَ**: دەمی چارەواکەی بەست

**زَارَةْ**: ڕەوگـە وشــترێك، چینــەکردنی مریشك

**زَارَةْ**: چیکڵدانە ، سیکڵدانە

**زَارَعَ**: کشتوکاڵیکرد، چاندی

**زَارَعَ فُلانَــــاً**: بەگــــەڕی خســــتن لەزەوییەکـەیدا لـەبری بەشــێك لــەو دەستکەوتانەی ئەو کشتوکاڵەو دەبێـت تۆویش لەسەر خاوەن زەوی بێت

**زَرّاعْ**: ئـەوەی زۆر کشـتوکاڵ دەکـات ، قســەهێنەرو قســەبەر چونکــە وەك چێنەری ڕقو کینە لەدڵاندا

**زَارِعْ - زَرّاعْ**: جوتیار ، کشتیار ، وەرزێر

**زَاعَبْ**: لێشاو یا لافاو دۆڵ پڕ بکات

**زَاعِمْ**: داواکار ، بەگومان

**زَاغَ**: لاربوەوە، چەمیەوە، خواربوەوە

**زَاغَ البَصَرَ**: ڕێشکەو پێشکەی کرد

**زَاغْ**: قەلەڕەشێکی بچووکەو ژێر سنگی سپیە، قەل

**زَافَ الدَّرَاهِمَ عَلَيـهِ**: بۆیـان گـەڕاندەوە بەهۆی ئەوەی تەزویر بوو

**زَافَ الحَائِطُ**: بازیداو بەسەریا ڕۆیشت

**زَافَ البَعِيرَ**: خێراو پەلەیکرد

**زَافَ زَيْفَـاً وَزِيفَانَــاً**: بەچەشـنی خـۆ بەزلزان ڕۆیشت بەڕێوە

**زَافِـرَةْ**: کۆمـەڵ، تـاقم ، دەستەسـوار ، پارچەیـەك، بـەڵا، نەهامـەتی، پشـتو ئـەوەی دێـت بـەدوایدا، کـــەوان ، سەرداری گەورە

**زَافِرَةُ الرَّجُلِ**: مۆزو تیرەو لایەنگرانی

**زَافِرَةُ البِنَاءِ**: کۆڵەکە ، پاڵپشت ، ڕاگر

**زَافِنَــةْ**:وشـتری شـەلو لـەنگ،ژنـــی سەماکەر

**زَاكِيٍّ**: کەشەسەندوی پـاکیزەو پـاك، پیاوی پاكو پوختو بێگەرد

**زَالَ**: بەجێی هێشـت ، چۆڵیکـرد، لێـی نـەما، تیـاچوو، فـەوتا، نـەما ، دوایـی هات

**زَالَ عَـنْ مَكَانِـهِ**: لـەجێیخۆی لایـبردو جووڵاندی

**زَالَ**: درهـەمێکی وەرنـەگیراوی ناتـەواو لەکێشدا

**زَالَتِ الشَّمْسُ**: لەناوەڕاستی ئاسمـان تێپەڕی

**زَالَتِ الخَيْـلُ بِرُكْبَانِـهَا**: کۆچیکـرد، هەستا، جووڵا

**زَالِـجْ**: ئـەوەی قوتـارو ڕزگـار دەبێـت لەنەهامـەتیو نارەحـەتی، ئـەوەی ئـاو بەنارەحەتی دەخواتەوە

**زَامٌ مُزَامَّةً**: خۆی بەزلزانی

**زَامَتْ فُلانَاً**: نکوولیو بەربەرەکانیم کرد

**زَامِرْ**:شمشـاڵ ژەن، نـەی ژەن،زوڕنـا ژەن

**زَامَلَ الرَّفِيـقَ**: دووکـەس سواری یـەك ئـاژەڵ بـوون ، هاوڕێیــەتی کـــرد، لەگەڵیبوو

**زَامِلْ**: شوێنکەوتوو ، پەیڕەو

**زَامِلَةٌ**: وشـتروشـتی دیکـە کـەباری لێبنرێ، بارهەڵگر

**زَامِنْ**:ڕۆژگـارو سـەردەمێکی سـەختو گران

**زَانَ**: نەخشـاندی ،جوانیکـرد، ڕازاندیەوە، ئارایشتی دایا ، شۆخیکرد

**زَانَ( خَشَبُ زَان )**: درەختـی زان ، دارەوەن

**زَانِي( فَاسِق )**: داوێن پیس ، گوناهکـار، زیناکار، فریودەر

**زَانِيَةٌ( فَاسِقَةٌ )**: ژنـی داوێـن پیـسو بێحـەیا، داوێـن تـەڕ، بەدڕەوشـت ، قەپاتمە، سۆزانی، سۆتە

**زَاهِدْ( نَاسِك )**: سـۆفی ، دەروێـش ، خواناس، دنیا نەویست

**زَاهِدٌ فِي الشَّيءِ**: کەمتەرخـەم ، گوێنەدەر

**زَاهِرْ**: بریقـەدار، بەشـەوق، ڕوونـاك، خـۆش ڕەنـگ، پـڕ لـەگوڵ، گوڵـدار، ڕووناك، ڕوون، بێخەوش

**زَاهِرِيَّةٌ**:بەفیزو خۆ بەزلزان

**زَاهَقَ الحَقُّ البَاطِل**: حـەقو ڕاسـتی نـا حەقی تیابردو نابووتی کرد

**زَاهِقْ( هَالِك )**:لـەناوچوو، فـەوتاو، تیـاچوو، بـەتاڵ، نـاڕەوا ، مـەردی ویستو ئیرادە لاوازو کز

**زَاهِيٌ**: تابـان ، ورشـەدار، گـەش ، درەخشان، ڕوونا، بەشەوق

**زَاوَجَ**: هاوسەریان کرد، جوتیـان گـرت، بوون بەیەك

**زَاوَرَةٌ**: چینەکردنی مریشك

**زَاوَلَ( مَارَس )**:کـردی، ئـەنجامیدا، ڕەنجیدا لەکارەکەیدا ، کۆشا ، هەوڵیدا

**زَاوُورَةٌ**: چینەکردنی مریشك

**زَاوِيَةٌ**: گۆشە ، سووچ ، قوژبن

**زَاوِيَةٌ حَادَّةٌ**: گۆشەی تیژ

**زَاوِيَةٌ خَارِجِيَةٌ**: گۆشەی دەرەکی

**زَاوِيَةٌ دَاخِلِيَّةٌ**: گۆشەی نارەکی

**زَاوِيَةٌ قَائِمَةٌ**: گۆشەی وەستاو

**زَاوِيَةٌ مُنْفَرِجَةٌ**: گۆشەی کراوە

**زَاوِيَةٌ مُسْتَقِيمَةٌ**: گۆشەی ڕاست

**زَاوِيَةٌ مُنْعَكِسَةٌ**: گۆشەی پێچەوانە

**زَاوِيَةٌ مَرْكَزِيَةٌ**: چێوە گۆشە

**زَاوِيَةٌ الإِنْعِكَاسْ**: گۆشەی دانەوە

**زَاوِيَةٌ الإِنْكِسَار**: گۆشەی شکانەوە

**زَايَدَ**: زیاتریدا ، زۆرتریدا

**زَايَدَ فُلانَاً**: زەمی کرد بەسەریەوە

**زَايَلَ**: لەیەکی دابڕیو جیای کردەوە

**زَايَلَهُ**: جیـایکردەوە، نێوانـی خسـتن، دابڕین لەیەك

**زُؤَام**: مەرگی کتوپڕ ، مەرگی ناکاو

**زُؤَان**: گیایەکـە لـەنێو دەغڵـی گـەنمدا دەڕوێو دەنکـەکانی لەگـەنم دەچێـتو بەخواردنی خەو دێنێت بەسەر بخۆریدا

**زَأبَرَ الثُوبُ**: تەقـەڵی لێدا ، درومـانی کرد

**زَأبَقَ**: ڕوپۆشی کرد بەجیوە

**زَأرَ ( زَمْجَرَ )**: نەڕاندی ، نەڕەی شێر

**زَأمَ**: دەستبەجێ مـرد،کتوپـڕ گیـانی دەرچـوو، هـەر زوو ڕوحـی دەرچـوو ، بەخێرایی خواردی

**زَأمَ لِي كَلِمَةً**: فـڕێیدا بـۆی نـازانێت ڕاسـتە یـان هەڵـە یـان ڕەوایـە یـاخود ناڕەوا

**زَأمَةٌ:** پێویستی ، زۆر خۆری ، با ، دەنگێکی توند، وشەیەك

**زَأمَهُ:** ترساندی ، تۆقاندی، روحی برد، ترس‌و بیمی وەبەرهێنا

**زَأمَهُ البَرد:** سەرما زۆری بۆ هێنا هەتا لەرزی لێهات

**زَئبَق (فَرَار):** جیوە ، زیوە ، دەرمانێکی شلی جوولە جوولکەرو بزۆززە بۆگەڵ شت بەکار دەهێنرێو بەتایبەت بۆ دروستکردنی گەرمی پێو نایبەستێ لەپلەی (40)ی ژێر سفردا نەبێت

**زَئبَقٌ حُلو:** جیوەی سپی

**زِئبَقيٌ:** جیوەیی ، بەچەشنی جیوە

**زَئير (زَمجَرَة):** نەرِە نەرِە، نەرِەو دەنگی شێر

**ز ب**

**زَب ـ زُبَبأ:** زۆری مووی سەرو دەمووچاوو گوێچکەی

**زَبى ـ زُبيَةٌ:** چاڵێکی قووڵی هەڵکەند بۆ راوکردنی درندەو کەڵبەدارەکان

**زَبّاء:** ژنی توکن‌و پڕ موو

**زَبّاب:** فرۆشتنی مێوژ

**زَبّابَةٌ:** جرجێکی گەورەو زلە کەمەسەلەی لەسەر دەهێننەوە بۆ دزی، قسە هێنەرو قسەبەر، باجگر

**زَبّاد:** ماددەیەکی بۆ نخۆشە

**زُبّاد:** کەفی شیر ، روەکێکە

**زَبّال (كَنّاس):** خۆڵ رێژ،گسکدەر،زبڵ رێژ

**زِبال ـ زُبال:** ئەوەی مێرووله بەدەمیەوە هەڵی دەگرێت ، شتی پیس‌و پۆخڵ

**زُبالَةٌ:** خۆڵ ، پیسی ، کەمێك ئاو

**زَبّان:** هەڵپاچین

**زُباني العَقرَب:** چزوی دوپشك

**زُبانَيا العَقرَب (قَرناها):** شاخە دوپشك

**زَبانِيَةٌ:** کارگوزاری دۆزەخ ، ئاگر خۆشکەر ، زەبانیە

**زَبَّبَ:** ئاوی‌کرد، کەف بەلمۆزو دەمیا هاتە خوارەوە

**زَبَّبَ العِنَبَ:** کردی بەمێوژ ، وشکی کردەوەو کردی بەمێوژ

**زَبَّبَ الرَجُلَ:** زۆر قسەی‌کردو کەفی سپی لەلاشەویلگەکانی دەرپەڕی

**زَبِبَ:** توکنی ، قژن، زۆری قژو موو

**زَبَدَ السَّويقَ:** کەرەی تێکەڵ بەئارد کرد

**زَبَدَ لَهُ:** کەرەی پێدا

**زَبَدَ اللَبَنَ:** کەرەی لێدەرهێنا ، ژەنیو کەرەی لێکەوتەوەو دەری هێنا

**زَبَدَ اللَبَنَ(عَلاهُ الزَبَدَة):** سەر توێژی کرد

**زَبّدَ شَدقَهُ:** کەف لەلاشەویلگەی دەرپەڕی

**زَبَّدَ القُطنَ:** شی کردەوە هەتا بیرێسێت

**زُبد:** کەرە ،سەرتوێژ

**زَبَد:** کەفی سەرئاو ، کەفی شیر ، پیسی

**زُبدَةٌ:** کەرە ، سەرتوێژ

**زُبدَةُ الشَيء:** باشەکەی ، سەرگوڵەکەی، هەڵبژاردە، چاکترین ، باشترین، پوختەکەی ، کرۆکەکەی

**زُبدِيَّةٌ:** کەرەی پێستە

**زَبَرَ البِئر:** بیرەکەی بەبەرد هەڵچنی

زَبَرَ الكِتَابَ: نوسيەوە
زَبَـــرَ السَّـــائِلَ: نـــائومێد بـــوو لەپرسیارەکەی
زِبْرٌ(كِتَاب): نوسراو ، نامە، نوشتە
زِبْرٌ: بەهێزو توانا
زُبْرٌ: بەرد ، نوسین ، ئاخاوتن
زَبْرَجَ الشَّيْءَ: جوانیکرد، رازاندیەوە، دەستی پیا هێنا
زِبْرِجٌ: زینـەو جوانـی، هـەموو شـتێکی باش‌و جوان ، ئاڵتوون ، هەورێکی سپی ناسك کەسوراییەکی تێکەوتبێت
زَبَرْجَدٌ: بەردێکی جوانی ناسـك رەنگـی سەوزێکی روو لەزەردە
زَبَقَ شَعْرَهُ(نَتَفَهُ): قـژی هـەڵ کێشـا هـەڵی گرت ، دەسـکەنەی کـرد، لـەبن دەری هێنا
زَبَلَ الأَرْضَ: پەینی پێوەکرد
زِبْل ـ زَبْل ـ زِبْلَة(سَرْجِين): پـەیین ، خۆڵ، تەرسەقول
زَبَـنَ(دَفَـعَ): پـاڵی پێوەنـا ، دووری خستەوە، نەیهێشت ، لایبرد
زَبَـنَ الثَّمَـرَ: هـەر بەدارەکـەوە بەروبومەکەی فرۆشت
زَبَنَتِ النَّاقَةُ: قـاچی کێشـا بـەزەویدا لەکاتی دۆشیندا
زَبُون(غَبِي): گێل ، نەزان ، کـەودەن ، کەساس ، داماو
زُبُـون(مُشْـتَرِي): کڕیـار ، مـەعمیل ، بسێن، ئاشنا
زَبُونَة: خۆبەزلزانین، گەردن بەرزی
زَبِيـبٌ:مێـوژ ، کشـمیش ، مـەویژ ، مـەڤیژە، کـەفی سـەر ئـاو ، ژەهـری ناودەمی مار
زَبِيبَـة: مـوو ، دوومەڵێکـە لەدەسـت دێت، کەفێکە لەلاشـەویلگەی ئەوانـە دێتە دەرەوە کەزۆر قسەدەکەن ، یـەك دەنك مێوژ
زَبِيبَتَان: دوو خاڵی رەشـن لەسـەرووی چـاوی مـارەوە، ئـاوو کـەفی ددانـی مەردومی زۆربڵێ‌و قسەکەر
زُبْيَـــة:چاڵێکـــە بـــۆ راوی دڕندەوکەڵبەداران، چاڵێکی بچووکە بـۆ ســـوورکردنەوەی گۆشـــت‌و نـــان دروستکردن ئامادە ئـەکرێ، تەپێکـە ئاوی بۆ نەچێ
زَبِيل: قاپ ، زەمیلە ، دەفر ، بەرگ

**زج**

زَجَّ: رایکرد ، هەڵهات ،قوچانی
زَجَّ بِالشَّيْءِ: تێی گرت ، تێی هاویشت
زَجَّ بِفُلاَنٍ فِي السِّجْنِ:فلانەکەســی توندکرد لە زیندان
زُجٌّ: ئاسنی بن رم ، بنکە رم
زُجُّ العَصَا: دەسـك ، ئاسـنی بـن داردەست
زُجُّ الشَّرِيطِ: ئەم سەرو سەری قەیتان
زَجَا(سَاقَ): لێـی خـوڕی ، بـردی بەڕێوە، پاڵی پێوەنـا، بەهێواشـی لێـی خوڕی
زَجَا الأَمْرُ: سـەرکەوت‌و ئاسـان بـوو ئەنجامدانی
زَجَا الخَرَاجُ: بەئاسانی ماڵاتەکەی گرد کردبووەوە
زَجَا فُلاَنٌ: پێکەنینی براو دوایـی هـات، خەندەو پێکەنینی تەواو بوو
زَجَّـــى:لێـــی خـــوڕی،بـــردی بەڕێوە،بەڕێی‌کرد

**زَجَــــاء**: پێداچـــــوەوەو بـــــەرەوانی ئەنجامیدا

**زُجَاج**: شووشە

**زَجَّاج**: شووشە فرۆش

**زُجَاجَة (قَنِينَـة)**: شووشـە ، قـاپ ، بوتڵ

**زُجَاجِيّ**: شووشە فرۆش

**زَجَّال**: كۆتری نامەبـەر ، ئـەو كۆتـرەی توانـای ڕۆیشـــتنی ماوەیـــەكی دوورو درێژی هەیە ، پەیكان

**زَجَّجَ الحَاجِبَ**: بـرۆی بـاریك كـردەوە، برۆی هەڵگرت

**زَجَّجَ المَوْضِعَ**: چاكو باشـیكرد، ڕێكو باشی كرد

**زَجَرَ (مَنَعَ وَنَهَى)**: یاسـاغو قەدەغـەی كرد، ڕێگری كرد

**زَجَرَ الكَلْبَ وَبِالكَلْبِ**: وەڕانـدی ، پێـی وەڕاند

**زَجَرَ الرَّجُلَ**: كاهینیو جادووكەریی كرد

**زَجَرَ الطَّيرَ**: هەڵی فڕاندو گـەش بینـیو ڕەشبینی پیّ دیاریكرد

**زَجْـــر**: قەدەغـــەكردن ، دابینكـــردن، مسۆگەركردن

**زَجَر**: ماسیەكی زۆر گەورەیە

**زَجَــرَتِ الرِّيــحُ السَّــحَابَ**: هـــەژاندی، جووڵاندی، با هەورەكەی لابرد

**زَجَــرَهُ عَــنْ كَــذَا**: ڕێگـــری لێكـــرد ، یاسـاغیكرد لێـیی، بەدەنگە دەنـگو هەرا دەریكرد

**زَجَلَ (رَمَى)**: فڕێیدا ، دەستی پێوەنا ، پـاڵی پێوەنـا ، دەسـت بـەرداری بـوو، بیّباك بوو لێی

**زَجَلَ بِالرُّمْحِ**: برینداریكرد

**زَجَلَ الحَمَــامَ**: كۆترەكـەی نـارد بـۆ شوێنو جێگەیەكی دوور

**زَجِلَ (طَرِبَ وَتَغَنَّى)**: هەڵپەڕیو گۆرانی وت ، شادو دڵخۆش بوو، دەنگی ئاوازی گۆرانی بەرزكردەوە

**زَجِلَ القَوْمُ**: یاریو گەمەیان كرد

**زَجِلَ**: مەردومی دەنگو ئاواز بڵند

**زَجَلُ الجِنِّ**: ئاوازو ورتەی جنۆكە

**زَجَــلٌ (نَــوْعٌ مِــنَ الشِّــعْر)**: جۆرێكـــە لەهۆنراوە

**زَجَلَة**: دەنگی خـەڵكیو هـەراو دەنـگ بەرز كردنەوە

**زُجْلَــة**: گـــرۆهو تـــاقمێك لەخـــەڵكی، پارچەیـەك لەهەمووشـــتێك ، نێوانـــی هەردوو چاو

**زَجُوْر**: وشترێكە شیر نادات هـەتا زۆری لێنەكریّ

**زَجُوْل**: شوێنێكی دوور، ماوەیەكی زۆرو دوور

**زح**

**زُحَاء**: ئاه ، نقە ، ناڵە ، نقاندن، هاوارو نۆیكە نـرك ، سـك چـوون ، زەحـــیری ، سـكە شـۆری، دیزانـتری ، بەلـــەفیرە ، دایەریا

**زُحَارِيرُزد** ، بەخیل ، بـەرچاو تـەنگ ، قەپتەر لەدەم

**زُحَاف**: گۆرانێكە دێت بەسـەر دووەمـی (سبب)ی سووكو قورسدا

**زُحَاف**: خشۆك ، خشەك ، خزندە

**زَحَافَة**: گیـانداری خشـۆك ، خزنـە ، تاخورك ، مێروو

**زَحْافَــةُ الأَرْض:** زەوی ســـافكەر ، حادیله
**زَحْافات:**خشـۆكەكان ، ئـەو ئاژەڵانـەی بەسـەر زەویــدا بەخشــكە دەڕۆن وەك كیسەڵۆ..
**زَحْالف:** كرمو جانەوەری بچــووك وەك مێروله وایه
**زَحَـــــام:** ڕۆژی قیامـــــــەت ، ڕۆژی ڕەستاخێز
**زَحَــرَ:** زەحــیر بــوو، سكەشــۆریی توشبوو، بەلەفیرەی كـرد، ئـاهو ناڵـەی لێبەرز بوەوە ، نقەنقی كرد
**زُحِــرَ (أَصَابَــهُ الزُّحَــار):** تووشــی زەحیری بوو، بەلەفیرەی كرد
**زَحِرٌ:** بەخیل ، ڕژد ، بەرچاو تەنگ
**زَحْرَان:** پیسكە ، چرووك ، ڕژد
**زَحَرَتْ بِهِ أُمُّهُ:** لێی بوو ، بوو لـەدایك ، هاته بوون
**زَحَرَهُ بِالرُّمْح:** سەری شكاند بەنێزە
**زَحْزَحَ:** دووریی ، پەڕاگەندەیی
**زَحْزَحَهُ عَـنْ مَكَانـه:** دووری خسـتەوە، پەڕاگەندەی كرد
**زَحَـفَ:** خشا ، كشا ، لەســەر ســنگ ڕۆیی ، گاگۆلكێی كرد
**زَحَفَ إِلَيهِ:** چوو بۆ لای ، لەسەر سنگ خۆی بۆ كشان
**زَحَــفَ الشَّــيء:** بـــەلاوازیوگرانی بەكێشیكرد، ڕای كێشا
**زَحَـفَ السَهْم:** نـەیپێكا ، لەمەبەسـتی نەدا، سەریكرد ، ترازا
**زَحَفَ الجَيش(سَارَ):** لەشكرەكە كشا ، چوە پێشەوە ، پێشكەوت

**زَحَــفَ البَعِــيرُ:**شـــەكەتوماندوبوو، كفتبوو، هیلاك بوو
**زَحْف:** كشان ، بۆچوون ، پەلاماردان ، چوونــە پێشــەوە ،خشــــان ، ئــەو لەشكرەی خۆی بۆ دوژمن ئامادەكردوە
**زَحْفَة:** یەكێك سەفەر بۆ شـوێنی نزیـك بكات نەك بۆ شوێنی دوور
**زَحَلَ:** لاچوو ، جوولا ، دووركەوتــەوە ، پەڕاگەندەبوو، ڕۆیی
**زَحَلَ عَنْ مَكَانه:** لەشوێنی خۆی لاچـوو ڕۆییو دوور كەوتەوە
**زَحَّــل:**لای بـــرد،جوولانـــی ، دووری خستەوە
**زُحَلٌ( إِسْم كَوْكَب):** زوحـەل ، كـەیوان ، ناوی هەسارەیەكی دوورە كـەبۆ دووری بەنموونە دەهێنرێتەوە
**زَحَلَ:** مـاندوو، هیـلاك بــوو، لەپـەلو پۆكەوتوو
**زُحَلٌ:** وشترێك لەڕۆیشتندا دوا بكەوێت
**زَحِلٌ:** وشترێك پالْ بەوشترێكی دیكەوە بنێت بۆ ئەوەی خۆی ئاو بخواتەوە
**زَحْلَـــة :**پیـــاوێك لــــەكاروبار دوور بكەوێتەوەو دەست بكێشتەوە، ئەوەی دەچێـت بـۆ شـوێنی نزیـك نــەك دوور، جانەوەرێكــە كــاتێ دەچێتــە نێـــو كونەكەیــەوە پشــتی پێــش ســەری دەخات
**زَحْلَفَ الشَّيء:** تیاپرد ، لـەناوی بـرد ، فەوتاندی
**زَحْلَـفَ الإِنَـاءَ:** پڕیكـرد ، لێوان لێـوی كرد، سەر لێوی كرد
**زَحْلَفَ فِي الكَلاَم:** خێرایكرد ، پەلەیكرد

**زَحْلَقَ**: خل بووەوە، گلۆر بووەوە، خلیسکا، خزا، ترازا

**زَحْلَقَة**: خلیسکە، فیسقە

**زُحْلُوقَة**: جۆلانێ، هێفرۆك، دیلانە، دنگهەڤا، شتێکە لەدارو تەختە یا لەگوریسو پەرۆ دروست دەکرێو منالی تێدا رادەژێنرێ

**زُحْلُوكَة**: جۆلانەی منالان

**زَحَمَ**: تەنگی پێ هەڵچنی، زۆری بۆ هێنا، پێش برکێی کرد، خستیە ئاقارێکی سەختو گرانەوە

**زَحْم**: گرۆهو کۆمەڵێکی تەنگ پێ هەڵچنیوو، خەڵکی قەرەباڵغی دروست بکەن

**زَحْمَة**: جەنجاڵ، قەڵەباڵغی، جمە، جمەهاتن

**زَحُوف**: وشتری ماندوو شەکەت

**زَحِير**: ئاهو ناڵە، نقە نق، ناڵە ناڵ

**زخ**

**زَخّ**: رقو خەشم گرتی، کینەی هەستا

**زَخّ بِالإِبِل**: بەتوندی لێی خوڕی

**زَخّ الجَمْرُ**: گەشایەوە، پشکۆکە درەوشایەوە، شەوقی دایەوە

**زَخّ المَطَر**: بەخوڕ دایکرد، کردی بەلێزمە

**زَخّ**: کینە، خەشم، قین، تورەیی، رق هەستان

**زَخَّار**: روەکێکە

**زَخَارِف**: رەنگو بۆی زەوی، جوانکارییەکانی

**زَخَارِف الدُّنْيَا**: رواڵەت، خۆهەڵنان، شانازیکردن، خۆشیو جوانیەکانی دنیا

**زُخَارَى النَّبَات**: شکۆفەی گیای تەڕو تازە

**زَخَّة (دَفْعَةٌ مِنَ المَطَرِ الشَّدِيدَة)**: تاو بارانی بەخوڕو لێزمە، تاوە باران، لێزمە باران، کینەو خەشمو قین

**زَخَرَ البَحْرُ**: هەڵسا، پڕیوو، هەڵچوو، شەپۆلیدا، مەوجیدا

**زَخَرَ الوَادِي**: چەمەکە ئاوەکەی هەڵساو پڕیوو

**زَخَرَ النَّبَاتُ (طَالَ)**: روەکەکە بەرزبووەوە، هەڵچوو

**زَخَرَ القَوْمُ**: هەڵسان، بەجۆشو خرۆشەوە ئامادەبوون بۆ بەرەکانی جەنگ

**زَخَرَ الحَرْبُ أَوِ القِدْرُ**: کولا، جۆشی سەند، تاوی سەند

**زَخَرَ بِمَا عِنْدَهُ**: شانازیکرد، خۆی هەڵکێشا بەوەی هەیەتی

**زَخَرَ الشَّيْءُ**: پڕیکرد، لێوان لێوی کرد، سەر لێوی کرد

**زَخْرَفَ**: رازاندیەوە، نەخشانی، ئارایشتیدا

**زَخْرَفَ الكَلَامَ**: فیشاڵو درۆیکرد، زمان لووسی کرد

**زُخْرُف (زِينَة)**: نەخش، رازاندنەوە، خشڵ

**زُخْرُفُ الكَلَامِ**: درۆو دەلەسە، هەڵات، زمان لووسی، درۆو دەلەسەی گەرمو گوڕ

**زَخْرَفَة (زِينَة)**: نەخش، خشڵ، مت و مورووو، ئاڵاو واڵا

**زَخْرَفِيّ**: خشڵ فرۆش، نەخش دروستکەر

**زَخَمَ:** توند پاڵی پێوەنا، بەقایم پاڵی پێوەنا
**زَخَمَ اللحَمُ:** بۆگەنیکرد، خراپ بوو ، بۆگەنی کرد
**زَخِمَ:** بۆن کردوو، بۆندار
**زَخْم ـ زِخْم:** تەوژم ، هێز، خوڕ، گف ، تەوسم ، تین ، تیندار، بەزەبر ، ماندەر
**زَخْمَة (رَائحَةٌ كَرِيهَةٌ):** بۆنی ناخۆش ، بۆگەنی ، گەندەڵی
**زَخِيمٌ(القَوِيُّ الشَدِيدُ):** بەمێز ، بەتەوژم، بەزەبرو زەنگ، بەتوانا
**زَخُور:** گیایەك تازە لێکرابێتەوە
**زَخُورِيٌّ:** عەلەفی تازە ئامادەکراو، تەواو چڕ
**زَخِيرَة:** توێشەو پێویستی لەشکرو سوپا، زەخیرە ، تفاق

**ز د**

**زَدَا الصَبِيُّ:** یاریکرد بە گوێزو فڕێیدا بەنێو ئەو چاڵۆکانەی دروستیان کردبوو بۆ یاری

**ز ر**

**زَرَّ القَمِيصَ:** قۆپچەی لێیا، دوگمەی لێنا
**زَرَّ الشَيءَ:** کۆیکردەوەو بەستی
**زَرَّ عَينَهُ:** چاوی هێنایەوە یەك، چاوی بچووك کردەوە
**زَرَّ الرَجُلَ:** دەریکرد ، گازی لێگرت
**زَرَّ المَتَاعَ:** تیایبرد ، لەناوی برد، نەی هێشت
**زَرَّ سَنَانَ الرمَحِ:** درەوشایەوە، شەوقی دایەوە
**زَرَّ العَينُ:** شەوقی دایەوە ، داگیرسا ، بریسکەی لێوەهات

**زَرَّ الرَّجُلُ:** هەڵمەتی برد بۆ دوژمنو نەیارەکەی ، ژیریو ئەزموونەکانی زیادیانکرد
**زِرّ:** دوگمە ، قۆپچە ، سەرقۆڵ ، بزمارو دەرزی سەرپان ، خونچە ، گوڵونکە، سویچ ، دان، تیژی تیغ
**زِرُّ السَيفِ:** تیژیەتی ، بڕندەیی ، بڕەڕیی
**زِرُّ الشَيءِ:** ئەوەی پێی هەڵدەستێ
**زَرَّى عَلَيهِ بِعَمَلِهِ:** رەخنەو نکوولی لێگرت لەسەر کردارەکانی ، عەیبداریکرد، تەنگی خستە پاڵی
**زَرَابِيّ:** راخەر ، ئەوەی رادەخرێو پاڵی لەسەر دەدرێتەوە
**زَرَّاد:** خنکێنەر ، قەڵفان ، سوپەر
**زِرَاد:** پەتێکە ئاژەڵی پێ دەبەسترێتەوە هەتا خاوەنەکەی پیس نەکات
**زِرَادَة:** پیشەی قەڵغان دروستکردن
**زُرَار:** زیرەکی سووکو سانا
**زُرَارَة:** ئەوەی دەگیرێتە دیوارو پێوەی دەنووسێ
**زَرَّاع:** جوتیار ، کشتیار ، چێنەر ، وەرزێر، ئەوەی زۆر دەچێنێ
**زِرَاعَة:** کشتوکاڵ ، پیشەی کشتوکاڵی
**زَرَاعَة:** شوێنی کشتوکاڵ
**زِرَاعِي:** کشتوکاڵی ، پسپۆڕو ئەندازیاری کشتوکاڵی
**زَرَافَات:** کۆمەڵ کۆمەڵی خەڵك نزیکەی (10) یان (20) کەس بن
**زَرَافَة ـ زُرَافَة:** کۆمەڵ ، بەش ، زەڕافە، گیاندارێکی مل درێژی باڵابەرزە

**زُرَّافَة:** درۆزن ، ناڕاست ، کەڵەکچی
**زَرَبَ المَوَاشِي:** مالاٌتەکـەی خستـە پشتێرەوە
**زَرَبَ لِلغَنَمْ:** گەوڕی بۆ دروستکرد
**زَرَبَ المَاء:** ئاوەکە لەبەری ڕۆیشت ، لەبەری ڕۆیی ، ڕژا ، ڕۆیی ، تکا
**زَرْب:** ڕاڕەو ، حەشارگەی ڕاوچی
**زَرْب:** ئاوەڕۆ ، ئاوڕۆکە
**زَرِّيبَة:** ئەوەی ڕادەخرێتو پـاڵی پێوە دەنرێتەوە
**زَرَّة:** شوێنەواری گاز
**زَرَّة العَضَة:** نەشتەرگەریی بەشمشێر
**زَرَدَ (خَنَقَ):** خنکانی، هەناسەی لەبەر بڕی ، بینی توند گرت
**زَرَدَ الدِّرْع:** قەڵغانەکەی کونکرد
**زَرَدَ العُقْدَة:** گرێ کوێرەی لێدا
**زَرَدَ اللُّقْمَة:** پارووی قوتـداو خـواردی ، هەڵی لووشی ، لرفی کرد، لووشیدا
**زَرْد:** خێرا قوتدەر، ئەوەی خێرا قووتی دەدات، خێرا هەڵدەر
**زَرَدْ (دِرْع):** زری، قـەڵغان ، مـەتاڵ ، سوپەر
**زَرْدَة:** خواردنێك ، ئەڵقە ، زنجیر
**زَرَّر ثَوْبَه:** دامێنی بۆ دانا ، دامێنەکەی هەڵکرد
**زَرْزَرَ العُصْفُورُ:** جریوانی، خوێندی
**زَرْزَرَ الرَّجُل:** بەردەوام بـوو لەسـەر خواردنی ریشۆڵە
**زَرْزَرَ بالمَكَان:** مایـەوە لـەو شـوێنە، هەڵیکرد، نیشتەجێبوو
**زُرْزُور:** ریشـۆڵە ، سـێروو، باڵندەیـەکی ڕەشی کونجـی دەنـووك بـاریكو درێـژە لەچۆلەکە گەورەترەو بەگـەلێ جـۆرە دەخوێنێ
**زُرْزُورِيّ:** ئـەوەی بـەڕەنگی ریشـۆڵەیە ، ڕەنگ سەوز
**زَرَطَ اللُّقْمَة:** قوتیدا، هـەڵی لووشـی، ڕەوانەی کرد
**زَرَعَ:** چـاندی ، تۆوی‌کـرد، هـەڵیداو ناشتی
**زَرَعَ الأرْضَ:** زەوییەکەی کێلا
**زَرَعَ اللهُ النَّبَاتَ:** خوای گەورە ڕوانـدی‌و سەری دەرهێنا،سەوزبوو
**زَرْع:** کێـڵان ، ڕوانـدن ، وەشـاندن ، چەقاندن، تۆوکـردن، چاندن، شـاندن، وەنەی، فەرك، تۆڤکـردن ، داچکاندن، شانای
**زُرْعَة:** تۆو ، توخم ، تۆڤ ، تۆم
**زِرْعَة ـ زَرْعَة ـ زَرَعَة:** ئـەو شـوێنەی تـۆوی تێـدا دەچێـنرێ ، شـوێنی کشتوکاڵ
**زَرَفَ:** بازیدا
**زَرَفَ إلَيه:** پێشکەوت ، پێشی دایـەوە، پێشی کەوت
**زَرَفَ فِي الكَلَام:** زۆری وتو درۆیکـرد ، زیادەڕەویی کرد
**زَرَّفَ القَومَ:** بـەش بەشـی کـردن ، جیاجیای کردنەوە
**زَرَفَ الرُّمْحَ فِيه:** بڕی ، کونیکرد
**زَرْف:** سمین ، کونکردن ، بڕین
**زَرَقَ الطَّائِر:** ڕیقنەی کرد
**زَرَقَ الرَّجُلُ بِبَصَرِه:** چـاوی تێـبڕی ، چاوی‌لێ نەتروکاند، دیدەی خستە سەر، بەتیلەی چاو ڕوانیو تەماشایکرد

**زَرَقَ النَّاقَةَ الرَّحْلَ**: گەڕاندیەوە بۆ دواوە
**زَرِقَ**: شین بوو، شین هەڵگەڕا
**زَرِقَ الرَّجُلُ**: کوێربوو، نابینابوو
**زَرِقَ عَيْنُهُ**: چاوی شین بوو
**زَرِقَ الشَّيء**: شین هەڵگەڕا ، شین بوو
**زَرَّقَ**: شین ، شینی ئاسمانی
**زَرَقُ الطُّيُور**: ریقنە ، ساق
**زُرَّقَ**: باڵندەیەکی راوکەرە وەك باز، سپێتیەکە لەنێوچاوانی ئەسپدایە
**زَرْقَاء**: شین ، ئاسمان ، ئاسمانی، مەی، بادە
**زُرْقَة**: شینی ئاسمانی
**زُرْقَة**: مووروویەك بۆ پیرۆزبایی دەکرێتە مل
**زَرْكَشَ( زَخرفَ )**:رازاندیەوە،دەستی پیا هێنا، جوانیکرد، نەخشاندی
**زَرْكَشَ الحَرِيرَ**:دوری بە بەکرەی ئاڵتوونی
**زَرَنب**: زافەران ، گیایەکی بۆنخۆشە بەقاچە کوللەش ناو دەبرێت
**زَرْنَقَ الأَرْضَ زَرْنَقَةً**: ئاوکێشان بۆ زەوییەك لەروبارێکی بچووکەوە
**زَرْنِيخ( عَقَارُ سَامٌ )**: مەرگە مووش، ژاری کوشندە
**زِرنِيق**: بەردێکە چەن رەنگێکی هەیەو ئەگەر لەگەڵ کلسدا تێکەڵ بکرێ ئەوا موو لا دەبات ، موو لابەر
**زَرِيّ**: سووك ، ریسوا ، نزم ، بێئابروو، ناقۆڵا ، نابووت ، بەد رەوشت
**زَرِيبَة( إصطَبل )**: پشتیر ، گەوڕ ، گەلەخان ، تەویلە ، هۆڵی مەڕان

**زَرِير**: بیر تیژە ، گیایەکە بۆ رەنگ کردن بەکاردەهێنرێ
**زَرِيع**: ئەو تۆوەی لەرۆژانی دورینەوەدا کەوتوەتە سەر زەویو رواوە
**زَرِيع**: ئەو کشتوکاڵەی بەئاوی باران وەبەردێت ، کشتوکاڵی دێمی
**زَرِيعَة**: کشتوکاڵ ، زەوییەك تۆو کشتوکاڵی تێدا کرابێت
**زُرَيق**: باڵندەیەك هەندێك لەچۆلەکە گەورەترە ، جقە
**زَرَيقَاء**: ئاژەڵێکە لە پشیلە ئەچێو دەستو پێی کورتەو جەستەی درێژە ، تریتی شیرو رۆنی زەیتون

**زز**

**زَزّ**: ئەوەی زۆرینەی نوسەران پشتگوێیان خستوە
**زَزَّهُ - يَزُزُّهُ - زَزّاً**: لێیدا ، کێشای بەدەموچاویدا، خستیە پشتگوێ

**زط**

**زَطّ الذُّبَابُ**: دەنگی لێوەهات ، ویزە ویزی هات

**زع**

**زَعَارَة**: بەدخویی ، بەدرەوشتی، سووکیو ریسوایی
**زُعَارِير**: کەمێڵ، چڵکو قەتماغەی چڵکو ئەسپێ، گنجی، کەمێڵە
**زَعَازِع**: نارەحەتی رۆژگار ، دەردەسەری
**زُعَازِع**: بای توند، رەشە با
**زُعَاف**: ژەهری کوشندە، مەرگە مووش، ژاری بکوژ
**زُعَاق**: ئاوی سوێرو تاڵ کە ئەخورێتەوە، سوێراو

**زَعّاق مِنَ الخَيل:** ئەسپی خێراو بەتوانا لەرۆیشتندا ، ئەوەی ئاژەڵان دەردەکاتو هاواری لیّ بەرز دەبێتەوە

**زَعَامَة:** سەرکردایەتی ، پێشەوایەتی، رابەری، سالاری ، رێزداری ، چەك ، قەڵغان ، باشترین ماڵ یان زۆرینەی

**زَعَانِق:** باڵو پەرە ماسی ، هەر کۆمەڵێك یەك بنەچەو رەگەزیان نەبێت

**زَعَانِقُ القَوم:** هەرچیو پەرچی ، دەم رووتو بیّ ئابروو

**زَعَبَ الإنَاء:** پڕیکرد، سەر لێوی کرد

**زَعَبَ القِرْبَة:** مەشکەکەی هەڵگرت بە پڕی

**زَعَبَ السَيلُ:** لێشاوە ئاو لەچەمەکەیا هەستاو پڕیکرد

**زَعَبَ الوَادِي:** پڕیکرد

**زَعَبَ الشَيء:** پارچە پارچەی کرد، لەت لەتیکرد ، پارە پارەی کرد، کەرتیکرد

**زَعَبَ لَهُ مِنَ المَال:** بەشێکی پێدا ، هەندێکی بۆ بڕیو پێیدا

**زَعَبَ الغُرَابُ:** قەلەرەشەکە خوێندی

**زَعْبَرِيٌ:** جۆرە رمێکی تایبەتە

**زَعْبَقَ القَومُ وَالشَيءُ:** پەرتەوازەو جیاجیای کردن

**زَعْبَلٌ:** گرگن ، ورگنو مل باریك ، مار ، قۆری ، بزن مژە ، داری پەموو

**زَعْبَلَ:** بەخشی بەخشینێکی مەزنو شکۆدارانە

**زَعْبَلَةُ:** ئەوەی جەستەی قەڵەو دەکاتو ملی باریكو درێژ

**زَعَجَ( أَزْعَجَ ):** وەرسی کرد، جارسو بێزاریکرد ، بۆزۆی کرد، نیگەرانیکرد

**زَعَجَ الرَّجُل:** هاواریکرد ، دەنگی لیّ بەرز بوەوە

**زَعْج :** وەڕسی ، بێزاریی ، نیگەرانی ، جاڕسی ، بۆزۆ بوون ، جەرگاوس بوون

**زَعْجَلَة:** بەدڕەوشتی ، نزمی

**زَعِرَ شَعْرَهُ أَورِيشُه:** روتایەوە، کەمیکردو پێستەکەی بەدەرکەوت

**زَعِرَ الرَّجُلُ:** خێرو چاکەی کەمیکرد

**زِعِرْ( خَفِيف الشَعْر ):** کۆستە ، کۆسە ، کەم تووك ، تووك تەنك ، کەسێکە مووی ریشی نەبیّ یان زۆر تەنك بیّ

**زَعْرَاء:** جۆرە قۆخێکە ، زەوی کەم گیا ، ژنی کەم موو

**زُعْرَان :** رووداو ، نێربازیی ، مەردومی بیّشەرمو حەیا

**زُعْرَة:** باڵندەیەکە هەمیشە شپرزەیەو ترس بەسەریا زاڵەو لەرزۆكو ترسنۆك بەدەر دەکەوێت

**زُعِرَة:** زەوییەکی کەم گیا ، رووتە زەوی، رەقە زەوی

**زُعْرُور:** تورە ، گوێژ، دارێکە بەرهەمەکەی سوورەو ناوکەکەشی زوربەی داگیر کردوە، پیاوی کەم خێری تورەو کەللە شەق

**زَعْزَعَ:** بەتوندی جوولاندی ، لەراندیەوە، هێنایە جونبووشو بزاوتن

**زَعْزَعَ الإبِلُ فِي السَيرِ:** مانیدا، جوولاندی، پالی پێوەنا ، لێی خوڕی

**زَعْزَعٌ:** توند، قایم ، پتەو، بەتەوژمو گوڕ

**زَعْزَعَة:** جوولاندن،بزواندن، هێنانە جۆش

**زَعَطَهُ:** خنكاندى ، هەناسەی لەبەر بڕی
**زَعَفَ:** هەر لەجێی خۆیا کوشتی‌و لەناوی برد
**زَعَفَ عَلَى الجَرِيحِ:** بریندارەکەی کوشت، هەڵی کوتایە سەری‌و بەبرینداری کوشتی
**زَعْفَرَ زَعْفَرَةً:** رەنگی کرد بەرەنگی زافەران
**زَعْفَرَ الطَعَامَ:** زافەرانی تێکرد
**زَعْفَرَان:** زافەران ، گوڵێکی زەردی بۆنخۆشی زەردەو زۆر بەنرخ‌و بەکەڵکە بۆ بەهێزکردنی جەستەو ژانی سەر دڵ باشەو رەگەکەشی وەك رەگی پیاز وایە
**زَعْفَرَانُ الحَدِيدِ:** ژەنگ‌و ژاری ئاسن
**زَعَقَ:** قیژاندی ، هاواریکرد ، بانگی فریاگوزاری‌و ئاگاداری لێ پەیدابوو
**زَعَقَ بِهِ:** ترساندی ، ترسی هێنا بەسەریا ، تۆقاندی ، زنۆقی برد
**زَعَقَ بِالدَابَّةِ:** بەهاوارێکی زۆربەکێشی‌کرد
**زَعَقَ الرِيحُ التُرَابَ:** رەشەبا خاك‌و خۆڵی هەڵگرت‌و بڵاوی کردەوە
**زَعَقَ القِدْرَ:** پڕخوێی کرد، خوێی زۆر تێکرد
**زُعِقَ المَاءُ:** سوێرو تاڵبوو نەدەخورایەوە
**زَعِقَ:** چوست‌و چالاك بوو، گورج‌و گۆڵبوو، چابووك بوو
**زُعِقَ الرَجُلُ(خَافَ بِالليلِ):** بەشەو ترسا
**زَعِقٌ(الخَائِفُ بِالليلِ):** شەو ترسنۆك ، ئەوەی بەشەو ترسی لێدەنیشێ

**زَعِقَتِ العَقْرَبُ:** دوپشکەکە پێوەیدا، گەزتی
**زَعْقَةٌ:** هاوار ، قیژە ، قڕە، بانگین ، چریکە ، فەریاد، ئامان ئامان، دادو فوغان‌و رۆ رۆ ، چڕین ، نەڕە ، فریاد
**زُعْقُوقَةٌ:** باڕەکەو
**زُعْكُوكٌ:** وشتری قەڵەو ، کورتەبنەی سپلە
**زَعِلَ:** بێزاربوو، وەرس بوو، شپرزەبوو، زویربوو، نیگەران بوو، جارس بوو، دڵگیربوو
**زَعِلَ مِنْ مَكَانِهِ:** بێزاریکرد ، وەرسی کرد
**زَعِلٌ:** چوست‌و چالاك ، بێزار ، وەرس، چابووك ، بەورە ، ئەوەی لەبرسا ئەتلێتەوە
**زَعَلَ(كَدَرَ):** زویرو دڵگیری‌کرد
**زَعَلَ(ضَجَرَ):** بێزاری ، وەرس بوون ، شپرزەیی‌و نائارامی ، دڵگیری، تورەبوون‌و نیگەرانی ، ناڕەحەتی ، رەنجاندن
**زَعْلَانُ:** نیگەران ، عاجز ، غەمگین ، چالاك
**زَعْلَجَةٌ:** بەدڕەوشتی ، رەوشت نزمی
**زَعَمَ:** وای وت ، وای دەرخست ، وای نیشاندا، وای راگەیاند ، بوو بەسەر گەورەو سەرۆکایەتی گرتە دەست ، وتەی حەق یان بەتاڵی گوت
**زَعَمَ بِالمَالِ:** کەفالەتی‌کرد، گرەنتی‌دا
**زَعَمَ فِيهِ:** چاوی تێبڕی ، تەماعی تێکرد
**زَعْم:** واوتن ، بانگەشەکردن ، وادەرخستن ، واپیشاندان ، واڕاگەیاندن

**زَعِمٌ مِنَ الشّوَاءِ:** بریانی چەور کە زوو دەبرژێ لەسەر ئاگر
**زَعَمَاتٌ:** هەواڵو دەنگو باسێکە جێگەی متمانەو باوەڕ نییە
**زُعْمِيٌّ:** درۆزن ، راستگۆ (دژە یەکن)
**زَعْنَفَ العَرُوسَ:** ئارایشتیدا ، جوانیکرد، رازاندیەوە، دەستی پیا هێنا
**زَعْنَفَةٌ ـ زِعْنِفَةٌ:** پەڕەکە ، باڵە ماسی ، پەڕەکەی ماسی ، کورتە بالاّ ، قەزەم، گرگن ، گرۆهو کۆمەڵێك لەهەموو شتێك، بەشێك لەخێڵو هۆز بەجیا بچنە پاڵ یەکدی، گیرو گرفت ، بەلاّو نەهامەتی
**زَعُوبٌ:** لێشاوێك کەچەمێك پڕ بکات
**زَعِيقٌ:** ترساو ، تۆقیو
**زَعِيمٌ (السَيِّد وَالرَئِيس):** گەورە ، سەرۆك ، سەرکردە ، سەردار، پێشەوا، سالار ، فەرمانڕەوا ، خاوەن بڕیار ، بڕیار بەدەست ، رابەر ، سەر تیپ ، سەردەستە ، کەفیل

**زغ**

**زَغَبٌ:** گەنکە موو ، گەنکە پەڕ
**زَغَبَ الصَبِي أَوْ الفَرْخُ:** گەنکە مووی دەرهات
**زَغْبَاءُ:** وشتری خۆڵەمێشی ، ئەسپی بەڵەك بەڵەك
**زُغْبَةٌ:** گیاندارێکە لەمشك دەچێت بەلاّم لەمشك گەورەترەو لەنێو دارا دەژیو زستانان خۆی دەشارێتەوە
**زُغْبَجٌ:** بەروبوومی زەیتونی کێوی کەهێشتا سەوزەو دوایی دەگات
**زَغْبَرٌ:** گەنکە موو ، کوڵك ، پەرەموچ
**زَغْبَرَ الثَوبُ:** کوڵکی هەبوو
**زَغْبَر ـ زِغْبِر ـ زِغْبَرٌ:** ئەو تاڵە درێژانەی کە دەردەپەڕن لە جلو بەرگی نوێدا ، کوڵکە تاڵی سەر جلو بەرگ ، رەشوو
**زَغْرَبٌ:** ئاوی زۆر ، میزی زۆر
**زَغْرَدَ البَعِيرُ:** دەنگی چەند جارێك لەگەرویدا هێناوبردو دووبارەی کردەوە
**زَغْرَدَةُ النِسَاءِ:** هەلهەلەی ژنان لەئاهەنگو شاییدا
**زَغْرَدَتِ المَرْأَةُ:** شادمانیو خۆشی دەربڕی بە هەلهەلە
**زُغْزُغٌ:** باڵندەیەکە کورتە بنەو بچووك، منالّی بچووك
**زَغْفٌ:** ئەو هەورەی ئاوی تێدا نەماوە، زۆر بوونی ئاوی بیر ، زیادەکردن لەفەرموودەیاو پێوەنانی بەدرۆ
**زَغْفَةٌ:** قەڵغانی مەحکەمو پتەو
**زَغْفَلَ:** درۆیکرد ، راستی نەوت
**زَغَلَ المَاءُ:** بەیەکجار ئاوەکەی رۆکردو رژاندی
**زَغَلَ الشَرَابُ:** فرێیدا ، تفیکردەوە، رژاندی
**زَغَلَ الصَبِي أُمَّهُ:** شیری پێدا
**زَغَلَ الذَهَبُ وَغَيرَهُ:** سکەی تەزویری لێداو دروستیکرد
**زَغَلٌ:** گزی ، فێڵ ، چاوبەست ، ناپاکی
**زُغْلَةٌ:** یەك جار ئاورشتن ، ئەو قومە ئارەقەی لەدەما دەهێڵرێتەوەو پاشان تف دەکرێتەوە
**زُغْلُولٌ:** منالّ ، بەچە ، بچکۆلانە ، پیاوی لەش سووکی گورجو گۆڵ ، بزێو، سوکەڵە ، چابوك

**زُغْلُولُ الحَمَام**: بەچکە کۆتر ، زەرنەقوتەی کۆتر
**زُغْلِيٌّ( غَشَّاش )**: گزیکەر ، فێڵباز ، چاوبەستکەر

**زف**

**زَفَّ**: پەلەی کرد ، خێرایکرد ، دەستو بردی کرد ، گورج و گۆڵی کرد
**زَفَّ الطَائِر**: باڵی کردەوە، باڵی فش کردەوە، باڵی والاکردو خۆی فرێدا
**زَفَّ الرِيحُ**: هەڵیکرد بەشێوەیەکی سووک
**زَفَّ العَرُوسَ إِلَى زَوْجِهَا**: بوکەکە گوێزرایەوە بۆ مێردەکەی ، بوکەکە برا بەبووکی بۆ مێردەکەی
**زَفَّ البُشْرَى**: مژدەی هێنا ، هەواڵی خۆشی گەیاند، مژدەو هەواڵی گەیاند
**زَفَّ الرَجُل**: خێراو پەلەیکرد
**زَفَّ البَرْقُ**: تیشکی دایەوە ، درەوشایەوە
**زِفٌّ**: پەڕو بۆی بچووك
**زَفَاف( عُرْس )**: شایی ، زەماوەند ، چوونە پەردەوە ، ئاهەنگ، دیلان
**زُفَاف**: روح سووکی گورج و گۆڵ
**زَفَّان( رَقَّاص )**: سەماکەر ، هەڵپەڕ ، سوڕدەر
**زَفَتَ**: قیری تێهەڵسوو ، لەقیری هەڵسوو، قیرتاوی کرد
**زَفَّتَ الطَرِيقَ**: قیرتاوی کرد ، قیر ڕێژی کرد
**زِفْت( قَار )**:قیر ، زفت ، قاقب ، قیری خۆشکراو ، زەوت
**زَفَّة**: شایی ، ئاهەنگ، زەماوەند ، مژدە، دیلان ، جوولەی دەستەو کۆمەڵ

**زَفَّةُ العُرْس**: هاو رایانی زاوا
**زُفَّة ( زُمْرَة )**: کۆمەڵ ، تاقم ، گرۆه ، دەستە
**زَفَرَ الرَجُل**: هەناسەی قوڵی دایەوە
**زَفَرَ الحِمَارُ**: کەوتە زەڕین
**زَفَرَ الشَيءِ زَفْراً**: هەڵیگرت
**زَفَرَ المَاءُ**: هەڵی گۆزی ، دەری هێنا
**زِفْر**: باری قورس و گران ، مەشکە ، پێداویستی سەفەرو گەشت ، کۆمەڵ یان دەستەیەك
**زُفَر**: پیاوی دلێرو لێهاتوو، جوامێر ، مەرد ، شێر ، ئازا ، دەریا ، روبارێك ئاوی زۆر بێت ، مەزن ، دەستەو تاقم ، لەشکر، سوپا
**زَفَّرَ**: هەنوی کرد ، چەوری کرد، رۆنی تێهەڵسوو
**زَفْر**: بۆگەن ، بۆ دڕن ، بۆچەوری ، پیس، پۆخڵ ، گەندەڵ ، گەنیو ، کفکۆ، گەنان ، کف
**زَفْرَة ـ زُفْرَة**: هەناسەدان لەگەڵ درێژکردنەوەیدا ، بەگەرمی هەناسەدان
**زَفْرَةُ الدَابَةِ وَزُفْرَتُهَا**: ورگی هەڵئاوساویی
**زَفْرَةُ الشَيءِ**: میانی ، ناوەڕاستی
**زَفْرَفَ الرَجُل**: بەتوندی رایکرد ، بەپرتاو رایکرد ، بەباشی رۆیشت بە رێوە
**زَفْرَفَ الطَائِر**: باڵەکانی بلاوکردەوەو خۆی هاویشت
**زَفْرَفَ المَرْكَب**: ویزەو دەنگی لێوەهات ، دەنگی بیسترا
**زَفْزَف**: بای توند، رەشەبا ، وشتر مورخ، سووك و ئاسان

**زَفَفَ:** پەرِوگـەندە مـووی بـاڵندە کەدەچێت بەناو یەکدا
**زَفْقَلَةٌ:** خێرایی ، تیـژ رەویـی، تونـدی، گورج و گۆڵی
**زَفَنَ:** هەڵپەڕی ، سەمایکرد ، سوڕیدا ، لەقەی وەشاند، بەقاچ لێیدا
**زَفْنٌ:** یاریکردن بەچەك
**زِفْنٌ:** ئەو کەپرەی کەلەسەر بانی ماڵان دروست دەکرێت
**زَفُوفٌ:** وشتر مورخ ، وشتری تیژ رەوی خێرا
**زَفُونٌ:** وشتری شەل
**زَفَيَانٌ:** سـووکی ، نزمـی ، ژنـی کورتـە باڵا
**زَفِيرٌ:** هەناسە بڕکە ، هەناسە دانـەوە، بـەلاو نەهامـەتی، بەسـەختی و گرانـی هەناسەدان
**زَفِيقٌ:** تیژ تێپەڕو گورج و گۆڵ

**زق**

**زَقَّ الطَّائِرُ:** ریقنەی کرد
**زَقَّ الطَّائِرُ فَرْخَهُ:** بـەدەنووکی نـانی کرد بەدەمیەوە
**زَقَّ الكَبْشَ:** لەسـەریەوە پێسـتەکەی داماڵی هەتا قاچەکانی
**زَقَّ:** دابەستن ، قەڵەو کردن
**زِقُّ الْمَاءِ(قِرْبَةٌ):** کونـدە ، جـەوەندە ، کونە
**زُقٌّ:**مەی ، بادە ، ئارەق ، شەراب
**زَقَا الطَّائِرُ:** دەنگـی لێوەهـات ، هاواریکرد
**زَقَا الصَّبِيُّ:** بـەتوندی گریـا ، دایـە پرمەی گریان

**زُقَاقٌ :** کۆلان ، باریکە رێ ، گوزەر ، کوچـە، کـووە ، کـەلیان ، راڕەو ، تەنگەرێ
**زَقَّاقٌ:** ئەوەی کوندەو مەشکە دروسـت دەکات
**زُقَّةٌ:** مەلێکی ئاوییە ، قیرنە گولە
**زَقْـزَاقٌ:** زیقاولـە، زیقـن ، هێـواش و لەسـەرخۆ لەرۆیشـتندا،جـۆرە مێروولەیەکە
**زَقْـزَقَ الطَّـائِرُ:**جریوانـی،جوکـانی، خوێندی، قوقانی، گارانی، قیڕاندی
**زَقْزَقَ الصَّبِيُّ:** منالەکەی هەڵپەڕاند
**زَقْزَقَ الرَّجُلُ:** خەندەو پێکەنینی لاوازو کزیکرد، زەردەخەنـەو بـزە گرتـی ، سووکی و نزمی
**زَقْزَقَةٌ:** دەنگی باڵندە لەبەرەبـەیاندا ، جریوە ، زاق و زیق ، جریوە جریوو
**زَقَفَ الشَّيْءَ:** پڕیپیاکرد ، رفـاندی ، بردی ، هەڵیکرت
**زُقْفَةٌ:** بردن ، پڕپیاکردن ، هەلگرتن
**زُقَّيْـفَةٌ:** کۆتـر کـەخواردن دەدات بەبەچکەکانی
**زُقَلٌ:** دز ،جـەردە ، ئـەوەی دەسـت دەبات بۆ شت و مەکی خەڵکی و دەیبات
**زَقَمَ:** قوتیدا ، هەڵی لووشی ، هەڵیدا
**زَقَمَ تَزْقِيمَاً:** ژەهرێکـی کوشـندەی دەرخوارد دا
**زُقْمَةٌ:** تاعون
**زُقَمَةٌ:** زەقومی دەرخوارد دا
**زَقُّومٌ:** کوژەر ، ژار خواردنی کوشندە، دارێکـە لـە دۆزەخدایـەو بـەرێکی کوشندەو ژاردارییی هەیـەو دەرخـواردی دۆزەخیەکان دەدرێت ، هەر خۆراکێکی کوشندە
**زَقْيَةٌ:** هاوار ، بانگو فریاد

**زك**

**زَكَا الزَرْعُ**:كشتوكاڵەكە نەش‌و نمایكرد، پێگەیشت، وەبەرهات

**زَكَا الرَجُلُ**: چاكبوو لەخۆشگوزەرانی‌و نازو نیعمەتدا بوو

**زَكَا الأرضَ**: چاكبوو ، باش بوو، خاسبوو

**زَكَابِه**: بۆی گونجا ، پرپەپری بوو

**زَكّى ( نَمَا وَزَادَ )**:گەشایەوە ، بوژایەوە، پەرەی سەند،نەش‌ونمایكرد، پێگەیشت، پاكی كردەوە، خاوێنی كردەوە

**زَكّى نَفسَهُ**: خۆی پەڕانەوە ، پاكانەی بۆ نەفسی خۆی كرد

**زَكّى مَالَهُ**: زەكاتی دەركرد

**زَكّي**: بێتاوان‌و گوناه ، خێرەومەند، پیاوچاك

**زَكَاة**: خاوێنی ، پاكێتی ، پاكیزەیی، بەخشین ، بەخشندەیی، هەڵبژاردنی شت ، ئەوەی لەماڵەكەت پێشكەشی دەكەیت هەتا پاكی بكەیتەوە

**زَكَاةُ المَالِ( عُشُور)**: زەكاتی ماڵ‌و دارایی، دەیەكی

**زُكَام**:هەلامەت ، درم ، پەتا، پەرسیف، ئارسم

**زَكَانَة**: بۆچوون ، تێگەیشتن ، حاڵی بوون ، رای گونجاوو پێكێنراو

**زُكْبَة**: نوتفە ، توخم ، رەگەز

**زَكَرَ الإِنَاءَ**: پڕیكرد ، سەرلێوی كرد

**زَكَرَ**: پڕبوو ، لێوان لێو بوو

**زُكْرَة**: دەفرێكە لەپێستە دروست دەكرێت بۆ مەیی‌و بادەو شتی دیكە

**زَكَمَ القِربَةَ**: مەشكەی پڕكرد

**زُكِمَ**: تووشی هەلامەت بوو

**زَكَمَ**: تووشی هەلامەتی كرد

**زُكْمَة**: هەلامەت ، درم ، پەتا ، پەرسیف ، ئارسم

**زُكْمَة**: یەكێك رەزا گران‌و قورس بێت‌و لەجموجوڵیشدا خاوخلیچك بێت ، دواین كوڕی باوك‌و دایك ، پاشە بەرە

**زَكَمَهُ**: تووشی درم‌و هەلامەتی كرد

**زَكَنَ الأمرَ**: تێی گەیشت ، حاڵی بوو ، هەستی پێكرد ، هاتە بەری ، پەی پێ برد، بۆی چوو

**زَكِنَ مِنْهُ عَدَاوَةً**: ناسیی ، لێی حاڵی‌بوو

**زَكَنَ إِلَيهِ زُكُوناً**: پشتی پێ بەست

**زَكَّنَ**: گومانی برد

**زَكَّنَ عَلَيهِ**: گومانی بردو لێی تێكەڵبوو

**زِكْنُ**: یەكێك وریاو زرنگ‌و خاوەن هەستێكی ناسك بێت‌و زوو حاڵی ببێت

**زَكِيٌّ**: خۆشحاڵ‌و گوزەران ، پاكیزەو خاوێن ، بێگوناهو تاوان ، چاكەخواز، گەشەسەندوو

**زل**

**زَلَّ**: هەڵخلیسكا ، كەوت ، ساتمەی‌كرد، خلیسكا

**زَلَّ عَنِ الحَقِ أو الصَوَابِ**: لایدا لەراستی‌و دروستی

**زَلَّ عُمْرُهُ**:بەهەدەر چوو ، هەروا رۆیشت

**زَلَّ زَلِيلاً وَزُلُولاً**: بەخێرایی رۆیشت ، تیژ تێپەڕی

**زَلَّ الدِرْهَمُ**: كەم كێش‌و تەزوێر بوو ، ناتەواو بوو

**زُلُّ**: ئەو شوێنەی لێی هەڵدەخلیسكێ، جێگەو شوێنی پێ هەڵخلیسكان

**زُلاَء:** جـۆره كەمانێكـه ، ژنــی لاوازو باریك
**زُلاَبِيَة:** جۆره شیرینیەكه ، زلوبیا
**زُلاَج:** كلۆم ، ئەڵقەرێز ، سورگی
**زَلاَجَـة:** تەختـەو ئاسـنێكی لووسـه كەبەسەر بەفردا خلیسكێنەی پێدەكرێ
**زُلاَزِل:** نارەحەتیو مەینەتی
**زَلاَزَل:** زەمین لەرزه ، بومه لەرزه
**زَلاَقَة:** لووسی ، سافی ، سفتی
**زُلاَل:** ئـاوی پـاكو سـازگار ، ئـاوی پاكیزه ، سپێنەی هێلكه
**زَلَبَ بِه:** پێوەی لكاو لێی جیانەبوەوه
**زُلْبَة:** تیكه ، پارو پێمەرە ، ئەوەندەی خواردنێك كەبەجارێك بتوانـرێ لـەزار بنرێ
**زَلَّـة:** هەڵخلیســكان ، ســاتمەكردن، سەهو ، هەڵە، تاوانو گوناه، زەڵله
**زُلَّـة :**پێكـداداان،بشـێوی ، هەناسـه توندی، بێ مەیلی
**زِلَّة:** بەردی سفتو لووس
**زَلَجَ:** بەخێراییو نەرمی بەســەر زەویـدا رۆیشت
**زَلَجَ البَابَ:** بەكلۆم دەرگای داخست
**زَلَجَ فُلاَنـاً:**پێشی كەوت، بەرلەو رۆیشت
**زَلَجَ الكَلاَمُ مِنْ فِيهِ:** لەدەمی دەرچـوو ، لەدەمی ترازا
**زَلَجَ المَاءُ عَنْ الحُنْجَرَة:** لێوەی رۆیشـت بۆ ناوەوه ، لەگەرووی تێپەڕی
**زَلَّـجَ الكَـلاَم:** لـەنێوان خـەڵكیدا بـڵاوی كردەوه
**زَلَّجَ عَيْشَهُ :**بەتێرو تەسەلی ژینی بەسەر برد ، بەخۆشگوزەرانی ژیانی بەڕێكرد
**زَلِجٌ ـ زَلَجٌ ـ زَلِيجٌ:** شوێنی خزو لووس
**زُلُجٌ:** بەردی لووسو ساف
**زَلَـحَ:** چێژتــی ، چەشــتی ، ســەری روتایەوه
**زَلَحٌ:** بەتاڵ ، نارەوا ، ناحەق
**زَلَحٌ( أَصْلَع ) :** روتــاوه ، سـەر روتـاوه ، نەمانی قژە سەر
**زَلْحَفَ:** دووری خستەوە، لایدا
**زَلْحَفَة:** گۆڕان ، دەستكاری كردن
**زَلَحْلَحُ:** جەستە بچووك ، چەمێك قــووڵ نەبێت
**زَلَخٌ:** شوێنێك پێی لێ بخلیسكێ بەهۆی سفتیو لوسیيەوه
**زَلْدَبَ اللُّقْمَةَ:** پاروەكەی قوتدا
**زِلْـزَال:** جونبــوشو جووڵــەو تــەكانی زەوی
**زَلْـزَلَ اللهُ الأَرْضَ:** پــەروەردگار زەوی هێنایە جووڵەو لەرزه
**زَلْزَلَ الإِبِلُ:** بەتوندو تیژی وشـترەكەی لێخوڕی
**زَلْــــزَلَ:** لەرانيـــەوه ، لەريــــەوە، جووڵانیەوە، لەرەلەری كرد
**زَلْزَلَة:** بومەلەرزه ، زەمین لەرزه
**زَلْزَلَهُ :** ترساندیو ئاگاداریكرد
**زَلَطَ اللُّقْمَةَ:** پاروەكـەی خـێرا هــەڵدا ، پاروەكەی هەر زوو قوتدا
**زَلَـعٌ:** قلێشـاوییەكه لەقولـەپێو بــەرو پشــتی دەســتدا دروســت دەبێــت، قلێشانی پێست
**زَلْعُومٌ:** گەروو ، بین ، قورگ

**زَلَفَ الشَيء:** پێشی کەوت
**زَلَّفَ فِي الكَلاَم:** زیادی کرد، پێوەی‌نا، زۆری وت
**زَلْف ـ زَلَفْ ـ زُلْفى:** نزیکی ، پلەوپایە، ئاستو مەرتەبە
**زَلْف:** مەرایی کردن ، ڕواڵەت ، مامە حەمەیی ، کلکە لەقێ ، ماستاو ساردکردنەوە ، خۆ بردنە پێشەوە
**زَلَفَة:** حەوزی پڕ ئاو، فنجان ، لاپەڕە، بەردی سفتو لووس ، کاسەی گەورە
**زُلْفَة:** نزیکی ، پلەوپایە، بەشێك لەشەو ، لاپەڕە، پێشڕەویی
**زَلَقَ:** خلیسکا ، خزا ، کەوت
**زَلَقَ القَدَم:** پێی هەڵخلیسکا
**زَلَقَ بِمَكَانه:** خلیسکاو جێگیر نەبوو
**زَلِقَ:** خزانی ، خستی
**زَلَّقَ بِمَكَانه:** بێزاربوووو لێی دوور کەوتەوە
**زَلَقَ رَأسَهُ:** سەری تاشی ، قژی بڕی
**زَلَّقَ بَدَنَهُ:** جەستەی چەورکرد ، هەنوی کرد
**زَلْق:** خز ، خلیسك ، لووس ، خزگە ، لێژ ، سوڕ ، سەربەرەو خوار
**زَلَق:** ئەوەی زوو تووڕە دەبێت ، زوو هەڵچوو
**زَلَقَة:** هەڵخلیسکان ، ئاوێنە
**زَلَل:** گوناه ، تاوان ، سووچو لادان ، یاخی بوون ، کاری نادروستو هەڵە ، شوێنێك لێی هەڵ بخلیسکێ
**زَلَم:** هەڵەیکرد ، خەتای کرد ، پڕی‌کرد، بڕی ، کەمی کردەوە ، ڕوەکێکە نەتۆوی هەیەو نەگوڵ بەلاّم لەرەگەکانیدا دەنك هەیەو تامێکی شیرینو خۆشی هەیە

**زَلْمَاء:** وشتری گوێ بڕاو ، بازی مێچکە، تەوار
**زَلْمَة:** هەندام ، ئەندام ، بالاّ ، شێوە ، ڕووخسار ، دیمەن ، لەشو لار
**زَلَنْطَح:** مێلکە شەیتانۆکە
**زَلُوج:** توند ، خێرا ، تیژ ڕەو ، گورجو گۆل
**زَلُوف:** کۆسپو تەگەرەیەکی دوور
**زَلُوق:** وشترێك خێراو گورجو گۆڵ بێت، دوور
**زَلِيج:** شوێنی خزو لووس
**زَلِيجَة:** خێرا ، گورج ، ڕاستەوخۆ
**زَلِيق:** قۆخێکی لووسو ساف ، جۆرە ماسیەکە

**زم**

**زَمَّ:** گرێیدا ، شەتەکیدا ، بەستی ، توندی کرد
**زَمَّ النَّعْل:** قەیتانی بۆ کرد
**زَمَّ القِرْبَة:** مەشکەکەی پڕ کرد
**زَمَّ البَعِيرُ بِأنْفه:** سەری بەرزکردەوە بەهۆی ئێشو ژانێکەوە
**زَمَّ الرَّجُلُ بِرَأسه:** سەری بەرزکردەوە ، سەری بڵندکردەوە ، سەری هەڵبڕی
**زَمَّ القَومَ:** لەڕۆیشتندا پێشیان کەوت
**زَمَّ الذِئْبُ السَخْلَة:** بەدەمیەوە گرتیو بەرزی کردەوە
**زَمَار:** ئەوەی پێی توندو شەتەك دەدرێت ، دەنگو ئاوازی وشتر مورخ ، جلەو ، دەستەڕەشمە ، دانەلغاو ، هەوسار ، قەوچە ، قەیتان ، بەنەك
**زَمَّار:** بلوێر ژەن ، نەی ژەن

**زُمَّارَة**: شمشالْ ، مۆسيقا ، بلوێر ، ناي، زوڕنا ، فلوت
**زَمَّارَة الرَّاعِي**: روەكێكە
**زِمَّارَة**: پیشەی بلوێرژەنی ، نەی ژەنی
**زَمَازِم**: بیری زەمزەم كەلە شاری مەككەیە ، ئاوێكی زۆر ، ئاوێك لەنێوان سوێرو شیریندا بێت
**زَمَاعٌ**: بەردەوام بوون لەسەر كارێكو نەوەستان لێی ، ئیرادە جێگیرو پتەو
**زُمَّالٌ**: گوێدرێژ ، گەوجە ، گێل ، گەودەن
**زَمَالَة**: هاورێیەتی، هاوەڵی ، برادەریی، لەگەڵبوون ، هاومەشرەبی
**زِمَام الأمْر**: بەڕێوە بردن ، جڵەوی كار، سەرۆكاریی
**زِمَامُ القَوم**: دەم راست ، ریش سپی ، كارگێڕ ، جڵەو بەدەست ، دەم سپی
**زَمَانٌ**: رۆژگار ، چەرخ ، كات ، ماوە ، دەم ، پێل ، سەدە ، تەمەن
**زَمَانَة**: ناتەواوی جەستەو لەش ، ناساغی
**زَمَتَ ـ زَمُتَ**: سالاروسەنگین بوو، بەرێزبوو ، بەویقاربوو، شانو شەوكەوتداربوو
**زَمَجَ( مَلأَ )**: پڕیكرد ، سەرلێوی كرد
**زَمِجَ ( غَضِبَ )**: توڕەبوو ، هەڵچوو، گڕی گرت
**زُمَّجٌ**: تیتلەكەناچە ، گیاندارێكی ئاویەو پێشی دەگوترێت(نەورەس)و رەنگێكی سپی هەیەو بەئەندازەی كۆترێك دەبێتو بەتەنیا ماسی دەخوات
**زَمْجَرَ**: قیژاندی ، نەڕاندی ، كردی بەهەراو قاوقیژ ، هاواری كرد

**زَمْجَرَة**: زوڕنا ، مۆزیقە ، دەنگ ، ئاواز، ئاوازی نەی ، ژنی بەدكار
**زَمْجِير( فَهْد )**: پڵنگ
**زَمْخَرَ النَّمِرُ**: خەشمو قین گرتیو نەڕاندی
**زَمْخَرَ العُشْبُ**: شكۆفەی كرد ، خونچەیكرد
**زَمْخَرَ الصَّوْتُ**: توندبوو، پەرەی سەند
**زَمْخَرْ**: دارێكی گەورەی چڕو پڕ لقو پۆپو گەلا ، نەی گەورەو زلە
**زَمْخَرَة الشَّبَاب**: هەرەتی لاوی ، پێگەیشتنی
**زَمْخَرَة الشَّجَرْ**: چڕوپڕیو زۆربوونی
**زَمَرَ ـ زَمَّرَ**: بلوێری ژەن، شمشاڵی لێدا، نای لێدا
**زَمَرَ بِالحَدِيث**: بلاویكردەوە، رایگەیاند
**زَمَرَ القِرْبَةَ**: پڕیكرد ، سەرلێوی كرد
**زَمَرَ فُلاَنَاً بِفُلاَن**: فریوی‌دا پێی ، هەڵی خەڵەتاند پێی
**زَمَرَ الظَّبِيُّ**: هەڵهات ، رایكرد ، دووركەوتەوە
**زَمِرَ ـ زَمِرْ**: كەم موو ، بێ تووك ، كەم پیاوەتیو لێهاتوویی
**زَمِرَ الشَّاةُ**: مەرەكە خوری كەم بوو ، كەم خوری بوو
**زَمْر**: دەنگ ، ئاواز ، سەدا
**زُمْرَة**: كۆمەڵ ، گرۆه ، تاقم ، فەوجێك، گەلە خەڵكێكی جیاواز جیاواز
**زُمُرُد( حَجَرٌ كَرِيم )**: زمڕوت ، بەردێكی بەنرخە
**زَمْزَام** : ئاوێكی زۆر ، بیری زەمزەم كەلەشاری مەككەیە

**زَمْزَمَ الشيءُ**: دەنگی لەدوور بیستراو دەنگدانەوەی هەبوو

**زَمْزَمَ النَّارُ**: لقە لقی بڵێسەی هات ، دەنگی بڵێسەی هات

**زَمْزَمَ المُغَنِّيْ**: بەدەنگەوە ئاوازەکەی وتەوە

**زَمْزَمَ الشَّيءَ**: پاراستی ، پارێزگاری لێکرد

**زَمْزَم**: ئاوێکی زۆری لەبەر ڕۆیشتوو ، بیری زەمزەم کەلەشاری مەککەیە

**زَمْزَمَة**: دەنگی هەورە بروسکە، ناڵەی هەور

**زَمْزَمَة**: کۆمەڵە خەڵک و گەلە وشترێك

**زَمْزَمِيَّة**: جەوەندە ، مەتارە

**زُمْزُوم**: باشترین وشتر ، ڕەوگە وشترێکی باش

**زَمِعَ مِنْهُ**: سەرسام بوو، تووشی سەراسیمە هات ، سەری سوڕما

**زَمَعَ الأرنَب**: خێرایکرد ، پەلەیکرد

**زَمَعَ الأمرَ عَلَيه وَبِه**: سووربوو لەسەری، بەردەوامو چەسپاوبوو لەسەری

**زَمَعَ الزُّنْبُورُ**: زەردەواڵەکە گیزەی هات، دەنگی لێهات

**زَمَع**: جۆگەلەی بچووك ، جۆگەلەی لاواز، پەنجەی زیادە ، خەڵکی سووك و نزم، نائارامی، لەرزۆکی و نائارامیەك روو دەکاتە مرۆڤ کاتێ دەیەوێت کارێك ئەنجام بدات ، بڕیاردان بێ پەشیمان بوونەوە

**زَمَّعَ (عَزَمَ)**: بڕیاریدا، نیازی کرد

**زُمَّع**: زەردەواڵەی بێ چزو ، یەکێك گورج و گۆڵ نەبێت بۆ پێداویستی خۆی

**زُمْعَة**: پارچە ، پارە ، بەش ، کەرت

**زَمَعَة**: ئەو مووەی لەکۆتایی قاچی مەڕو بزندا شۆڕبووەتەوە ، تەپ ، قوڵە ، ڕاڕەوی ئاو ، جۆگەلە

**زَمَكَ**: قارسکردن ، کورت کردنەوە

**زِمِك**: قنگە جوڕە ، کلکی باڵندە

**زَمَكَ الثَّوبَ**: جل تەسك کردن یان قارس کردنی

**زَمِكَ**: تووڕەیی ، ڕق ، قین ، تووڕەبوون بەسەختی

**زِمِكَّة**: ئەوەی خێراو زوو تووڕە دەبێت

**زَمَكَهُ عَلَى**: سەری کردە سەر هەتا تووڕەیکرد

**زَمَلَ**: هاوڕێیەتی کرد، هاوەڵی کرد، لەگەڵی بوو

**زَمَلَ الأعْرَج**: کەوت بەلایەکداو لایەکی دیکەی بەرز کردبووەوە

**زَمَلَ الشَّيءَ**: هەڵی گرت ، بەرزی کردەوە

**زَمَلَ الرَّفيقَ**: لەدوای خۆیەوە سواری کرد، لەپشتی خۆیەوە سواری کرد

**زَمَلَ الرَّجُلَ**: شوێنی کەوت، دوایکەوت

**زَمَلَ الشَّيءَ**: شاردیەوە، پەنهانی کرد، دەری نەخست

**زَمَلَ الشَّيءَ بِثَوبِهِ أوْ فِي ثَوبِهِ**: پێچایەوە بەجل و بەرگەکەیەوە ، لوولی دا پێوەی

**زِمْل**: یەدەك ، سپێر ، ئەوەی لەدواوە سوار دەکرێ ، بار ، بار پشت

**زُمْلَة (رُفْقَة)**: هاوڕێیەتی ، هاوەڵی، برادەریی ، لەگەڵ بوون

**زَمَمَ**: بەرانبەرو نزیك

**زَمِنَ**: گرفتاربوو، توشیارو گرفتاری ناتەواوی لەش بوو
**زَمَنْ**: رۆژگار ، سەردەم ، چەرخ ، تەمەن ، سەدە ، پێل
**زَمِنْ**: گرفتار ، تووشیار ، دەردەدار ، ناتەواو ، ناساغ
**زَمَنَةٌ**: كاتو دەم درێژبێت یان كورت ، رۆژگار ، سەردەم
**زَمَنِيٌ**: دنیایی ، نا روحانی ، جیهانی
**زَمَهَ الحَرُ( إشْتَدَ)**: تاوی سەند ، گەرمای كرد
**زَمْهَرَ** : سوربوەوە، سوور هەلگەڕا
**زَمْهَرَت العَيْنُ**: سوربوەوە لەتورەییدا
**زَمْهَرِيرَ(شِدْةُ البَرْد )**: سەرماو سۆلە، زوقم ، سەرمای سەخت
**زُمُورَةٌ**: ناپیاو ، كەمێتی پیاوەتیو جوامێری
**زَمُوعٌ**: خێرا ، تیژ ڕەو ، گورج و گۆلْ
**زَمِيتٌ**: هێمن ، سالار ، سەنگین ، ئاغر، لەسەرخۆ ، هێواش
**زِمِيرْ**: كورتە بنە ، كورتە بالاْ
**زِمِيرْ ـ زَمِيرْ**: جۆرە ماسیەكە دركێكی هەلْتۆقیو لەسەر پشتیەتیو بەزۆریش لەئاوی شیریندا دەژی
**زَمِيعْ**: ئازایەك بەردەوام بێت لەسەر ویستو ئیرادەی خۆی، ئەوەی راو بۆچوونی باشی هەیە
**زَمِيلْ**: هاورێ ، هاوەلْ ، برادەر ، رەفیق ، یەدەك ، هاوتا
**زَمِينْ**: ئەوەی تووشی ناتەواویو ناساغی جەستە هاتووە ، لەش بەبار

**ز ن**

**زَنَى ( فَجَرَ )**:داوێن پیسی‌كرد، زینای‌كرد
**زَنَّى**: زیناو داوێن پیسی دایە پالْ
**زِنَى ـ زِنَاء**: ناموس فرۆشی ، بەدرەوشتی، خراپەكاری
**زَنَّاءةٌ**: یەكێك زۆر داوێن پیسی بكات ، زیناكار
**زِنَادْ**: پەلەپیتكە ، چەرخ ، بەردو ئەستی ، تێزكە
**زُنَار( حِزَام )**: زیننار ، پشتێن ، كەمەربەند ، كەمەرە
**زِنْبَارٌ**: ئەوەی روح سووكەو زوو وەلاّم دەداتەوە
**زُنْبَر**:گوێدرێژی‌بار هەلگر،ئەشكەوتێكی مەزن،روح سووكو قۆشمە
**زُنْبَرك**: زەنبەلەك ، سپرینگ
**زَنْبَق**: شلێر ، مێلاخە
**زُنْبُور( دَبُور)**: زەردەوالّە ، ژەنگە سورە ، سورە بۆزە
**زُنْبُورٌ أصفَر**: زەردە زیرە
**زِنْبِيرْ**: هەنجیری حەلوانی
**زَنْبِيلْ**: بەرچنە ، زەمبیلە
**زِنَةٌ**: كێش ، قورسایی
**زَنْج ـ زِنْج**: قولە رەش ، زنجی ، زەنگی، رەش پێست
**زِنْجَار( صَدَأ )**: ژەنگ ، خوورك ، لەئاسنو پۆلاو هەموو جۆرە كانێك دەداتو رەنگیشی سورێكی كالّە
**زَنْجَبِيلْ**: زەنجەفیل ، رەگی گیایەكی گەرمیانی سپییە زۆر توندو تیژەو وشك دەكرێت بۆ چێشتو بۆ نەخۆشی بەكار دەهێنرێ ، شەراب ، مەی ، بادە

**زَنْجَرَ المَسْكُوكَاتْ**: سکەی لێدا

**زَنْجَرَهُ**: کۆت و بەندی کرد، بەستیەوە

**زَنْجُفْر ـ زِنْجِفْر**: بۆیەی ژەنگ، کانزایەکە رەنگێکی سووری هەیەو دەدرێت لەئاسن بۆئەوەی ژەنگ نەگرێت

**زَنْجِير**: زنجیر، زریزەی ئەستووری ئاسنین، شاران، جۆل، گریّو بەند

**زَنِخَ الدُّهْنْ**: خراپ بوو، بۆگەنی کرد

**زَنِخْ**: خراپ، بۆچروك، بۆکردو، گەنیو، بۆگەن

**زَنِخْ (زَهُومَةْ)**: بۆگەنی، بۆ چرۆك

**زَنْخَرَ بِمِنْخَرِهِ**: فوی تێکرد

**زَنْخَرَةْ**: پرماندن، پرخە پرخ

**زَنَدَ النَّار**: کردیەوە، دایگیرساند، هەڵی گیرساند، پێی کرد

**زَنَدَ الإِنَاءُ**: پڕیکرد، لێوان لێوی کرد

**زَنِدَ الرَّجُل**: تینووی بوو

**زَنَّدَ**: درۆیکرد، راستی نەکرد، ناراستبوو

**زَنَّدَ السِقَاءَ**: مەشکەکەی پڕ کرد

**زَنَّدَ فِي الأَمْر**: سینەی تەنگ بوو، دڵی بەیەکا هات پێی، بەرچاوی رەش بوو پێی

**زَنَّدَ عَلَى أَهْلِهِ**: فشاری خستە سەریان، توندبوو لەگەڵیان، رەق و زبربوو، نەرم و نیان نەبوو لەگەڵیان

**زَنْد**: بازو، مەچەك، قۆڵ، باسك، بازو، چەرخ، بەردو ئەستی، ئێسکی بازوو

**زَنْدَةْ**: تەرەقە

**زَنْدَقَةْ**: ئایندارێتی بەرووکەش و رواڵەت، لەناخەوە بێبڕواو بەدەرخستنی باوەڕیش بەرووکەش و بەرچاو

**زِنْدِيقْ**: بێباوەڕ، گومڕا، کافر، رەفکەر، بێئاین، یاخی، خوانەناس، ئەوەی بۆ رووپامایی گشت رەفتارێك ئەنجام دەدات و لەناخەوە بێباوەڕە

**زَرَ الغُلَامُ**: کەمەربەند یا پشتوێنی بۆ بەست

**زَنَّرَ بِعَيْنِهِ (حَدَّقَ)**: سەیریکرد، بەوردی سەرنجیدا، پیایدا هەڵیڕوانی، لێی وردبووەوە، چاوی تێبڕی

**زُنَّارَةْ**: پشتێنی کردە پشت، قایشی پێبەست

**زَنَكْ**: چینکۆ، لەوح

**زَنَمٌ مِنَ الجِمَالِ**: ئەو وشترانەی کەبەشێك لەگوێیان براوە

**زَنَمَةْ**: ئەوەی دەبڕێت لەگوێی وشتر یان مەڕو هەڵدەواسرێ ئەمەش بۆ ئاژەڵە رەسەنەکانە، گۆشتی زیادەی نێو قورگ و گەروو، نیشانە، هێما

**زَنِيمْ**: بەدخو، بەدڕەوشت، ناکەس، سپڵە، ئەوەی لەرەچەڵەك و نەسەبیدا تاوانبار دەکرێت، بیژوو

## زهـ

**زَهْ**: وشەی پێباش بوونە هەروەها بۆ گاڵتەو قەشمەریش بەکاردێ

**زَهَا**: هەڵهات، شەوقی دایەوە، رووناکی دایەوە، بریسکەی دایەوە، گەشایەوە

**زَهَا النَخْلُ**: گەورە بوو، هەڵیدا

**زَهَا الغُلَامُ**: گەورەبوو، پێگەیشت

**زَهَا البُسْرُ**: رەنگی کرد

**زَهَا النَبْتُ**: بەروبوومەکەی پێگەیشت و بەدەرکەوت

**زَهَا الشَاةُ:** شيرى تيهاتو كاتى زاينى نزيك بوەوە
**زَهَا الرِيحُ:** هەڵيكرد، داهات
**زَهَا الرَجُل:** درۆىكرد، خۆى بەزلو گەورە دانا، فيزى كرد
**زَهَا فُلاَنَاً:** بەسووك تەماشايكرد ، بەسووك دابنا، كێشى بۆ دانەنا
**زَهَا الكِبْرُ فُلاَنَاً:** خۆ بەزلزانين واى لێكرد خۆى لاپەسەند ببێت
**زَهَا السِرَاجَ:** چراكەى داگيرساند
**زَهَا الرِيحُ النَّبَاتَ:**شنەى شەماڵ روەكەى لەراندەوە
**زَهَا الأمْوَاجُ السَفِينَةَ:** شەپۆلەكان كەشتيەكەيان بڵندو بەرزكردەوە
**زَهَا بِالسَيفِ:** شەوقو بريسكەى پێدايەوە
**زَهَا فُلاَنَاً بِالعَصَا:** بەگۆچان لێىدا
**زَهَا السَرَابُ:** بەدەركەوت ، دياريدا ، هاتە روو
**زُهَا:** باشى ، چاكى، جوانى
**زُهَا الدُنْيَا:** جوانو رازاوەى كرد
**زَهَادَة( عَدَم الإهْتِمَام ):** كەمتەرخەمى، گوێنەدان، فەرامۆش كردن
**زَهَار:** درەوشاوە، بريسكەدار، گوڵفرۆش
**زَهَدَ ـ زَهِدَ:** وازى لێهێنا ، دەستى لێهەڵگرت ، كەمتەرخەمىكرد، وازى لەدنيا هێنا ، بوو بەسۆفىو دەروێش
**زَهُدَ فِي الشَيءِ وَعَنْهُ:** وازى لێهێناو دەستبەردارىبوو
**زُهْد:**خواناسى، دينداری ، ئاينگەرێتى، بىٚ پەيوەند بەدنياوە، گوێنەدان ، پشت هەڵكردن لەشتێك

**زَهَّدَهُ فِي الشَيءِ وَعَنْهُ:** نەيويستو پشتى تێكرد، نەفسى بەدوور گرت لێى
**زَهَرَ( تَلألأ ):** هەڵهات ، شەوقىدايەوە، گەشايەوە، رووناكى دايەوە
**زَهَرَ القَمَرُ أوْ الوَجْه:** مانگ يان روو گەشايەوە ، رووناكى دايەوە
**زَهَرَ الشَيءُ:** روون بوەوە
**زَهَرَ الزَنْدُ:** ئاگرەكەى رووناكى دايەوە
**زَهِرَ الرَجُل:**رووخسارى رووناكو گەشاوەبوو
**زَهَّرَ:** رووناكىدايەوە، شەوقو رووناكى دايەوە، گوڵى دەركرد
**زَهْر ـ زَهَرْ:** گوڵ ، زار ، خونچە
**زَهْرَاء:** سپىو رۆشن ، مانگى تابان
**زُهْرَة:** سپێتىو جوانى سەرنج راكێش
**زُهَرَة:** لەهەسارە گەڕۆكەكانەو لەلاى پێشينە دێرينەكان بەيەزدانى جوانيان داناوە ، زوهرە ، ناهيد ، شكۆفە
**زَهَقَ البَاطِلُ( إضْمَحَلَّ ):** لەناوچوو، فەوتا، لەناوچوو، نەما، رەويەوە ، دوايى هات
**زَهَقَ النَفْسُ:** روح لەجەستەى دەرچوو
**زَهَقَ الشَيءُ:** بەتاڵو پوچەڵ بوەوە، تياچوو ، فەوتا
**زَهَقَ الرَاحِلَةَ:**پێشكەوتوپێشڕەويىكرد
**زَهَقَ السَهْمُ:** لەنيشانەكەى دەرچوو، ترازا ، لايدا
**زَهِقَ مِنْهُ( تَضَايَقَ ):** لێى بێزاربوو، لێى وەرس بوو، لێى جارس بوو
**زَهَمَ العَظْمُ:** پڕبوو، سيخناخ بوو لەمۆخ
**زَهِمَ:** چەورىو بەزى زۆربوو
**زَهَم:** چەور ، پڕبەز ، چەڕب، رۆناوى ، تەواشە، دۆنەبوون

**سُلَاحْ:** پاشەڕۆ ، پیسایی، پشقل، ریخ، ئەوەی لەورگ دێتە دەرەوە لەرێگەی کۆمەوە

**سِلَاحْ:** چەك ، تیغ ، یەرەق، ئامرازی نێچیرو مرۆڤ کوشتن‌و شەڕو جەنگ‌و لەیەك هەڵچوون

**سِلَاح الدِّفَاع:** قەڵغان ، زرێ، چەکی بەرگری

**سِلَاحْ المِحْرَاث:** گاسن ، گا ئاسن ، گیسن ، ئاسنێکی پانە وەك بێڵ ئەکرێ بەهەوجارەوەو جووتی پێ ئەکرێ

**سِلَاحُ المَطوِی أوْ السِّكِين:** دەمەچەقۆ ، تیغەکەی

**سِلَاحْدَار:** چەکدار، چارچەك، بەچککردن، ئەوەی چەك‌و بابەتی شەڕی هەڵگرتووە

**سَلَاخْ:** ئەوەی پێستەی ئاژەڵ دادەماڵێ ، پیاوی گروار

**سَلَاخَة:** شتێك تامی نەبێت ، بێتام ، ناخۆش

**سِلَاخَة:** بێتامی ، ناخۆشی

**سَلَاسْ:** بێعەقڵی ، ناژیری ، لەدەستدانی عەقڵ‌و ژیری

**سَلَاسَة:** نەرمی ، رەوانی ، ئاسانی

**سَلَاسَة اللفظ:** ئاسانی‌و ناسکی دەستەواژەو گونجانی

**سَلَاسَة البَول:** میزڕانەگرتن ، میزەچوڕکێ، زوو زوو میزکردن لەهۆی سەرما یان ترسان یاخود نەخۆشی‌یەوە

**سَلَاسِلْ:** ئاوی سازگارو شیرین

**سَلَاسِلُ الكِتَاب:** دێرەکانی کتێب ، ریزەکانی ، خەتەکانی

**سَلَاطَة(وَقَاحَة):** بێحەیایی، بێئابڕوویی، چوختێتی، سووك‌و رسوایی، نزمی، بەدیی، تەلاسایی

**سُلَاف:** باشترین مەی ، شەرابی کۆنی چەند ساڵە، باش‌و چاك‌و پاڵفتەی هەرشتێك

**سُلَافُ العَسْكَر:** پێشەنگی سەرباز، بەرەوپێشڕەویی، سەرەتای

**سُلَافَة:** سەرگوڵی هەرشتێکی گوشراو ، شەراب‌و ئاوی هەرشتێك

**سُلَاقْ:** پیزۆکە ، زمان هەڵ زڵەپان، زیپکەیەکی پچووکە لەجەستە دەردێت

**سُلَاق:** جەژنێکی مەسیحیەکانە بەجەژنی بەرزبوونەوەی مەسیح (سەلامی خوای لێبێت)ناو دەبرێت‌و ئەم وشەیەش (سریانی)یە

**سَلَاقْ:** وتاربێژی بەتوانا ، زمانپاراوی گوتەو قسەڕەوان

**سُلَاقَة:** ئەو ئاوەی لەداوودەرمان وەردەگیرێ پاش هەڵچوونی

**سَلَاقَة:** زمان پیسی ، بەدگۆیی، قسەی ناشیرین‌و نادروت لەسەر زوبان

**سَلَاقِيّ:** سەگی راوکردن ، جۆرە سەگێکە کەقاچی درێژەو توانای راکردنی هەیە بەدوای نێچیردا لەراودا

**سُلَالْ:** نەخۆش ، تووش بوو بەدەردی سیلەوە

**سَلَالْ:** دز ، گەنگەدز ، سەبەتەچن یان سەبەتە فرۆش

**سُلَالَة:** نەوە، وەچە، رەگەز، تیرە، نەتەوە، نەژاد، بنەچە، بنەڕەت، بنەماڵە، خانەوادە، بەرەباب

**سُلاَلِيّ:** رەگـەزناس نەژادشـــوناس، یـەکێك شـارەزاو زانـابێت بەناســینی رەچەڵەکو بنەڕەت
**سَلاَم:** سڵاو، درود، سرودی نیشـتمان ، رۆژ بـاش ، سـەلام ، هـەموو کاتێکتـان بـاش ، سـەلامی خـوا لێکـردن ، خـۆ ســـــپاردن بەگوێڕایـــــــەڵیو فەرمانبـەرداریتی، هـەروەها نـــاوێکی مـەزنی خوایـە بـەمانی بێگـەردو پاکـە لەناتەواوییو تیاچوون هاتووە
**سَـــلاَم ـ سَـــلاَم:** درەختێکـــی تاڵـــە ، ئێسکەکانی پەنجە لەقاچو دەست
**سَلاَمَی:** بای باشوور
**سَلاَمَة:** بێناتەواویی، بێکەمو کوڕیی ، دوور لەنـەنگی، دروسـتی ، گونجـاویی، شیاویی، چاکی ، پاکی ، بێوەیی
**سَلاَمَةُ النِیَة:** نیەت پـاکی ، دڵسـافی ، دڵسۆزی
**سَـــــلأ:** پـــالاوتی ، پوختـــــەیکرد، پاڵفتەیکرد، دۆوکەکەی گرت
**سَلأ السَمْسَم:** ڕۆنەکەی گرت ، ڕۆنەکەی دەرهێنا
**سَلأ الجـدعَ( نَـزَعَ شَـوْکَهُ ):** دڕکـەکانی دەرهێنا، دڕکەکانی لێکردەوە
**سَلأ السَمْنَ:** ڕۆنەکەی دەرهێنا
**سَلأ فُلاَنَاً** لێیدا ، دەستی لێوەشاند
**سَلأ الدَرَاهمَ:** پەلەی کرد لەپێدانیدا
**سَلَبَ:** ڕووتیکردەوە، تالانیکرد، بـەزۆر لێی زەوتکرد
**سَـلَبَ الشَـيء:** بـــەزۆر لێـی زەوتکـرد، بەزەبری هێز لێی داگیرکرد
**سَـلَبَ القَصَبَـةَ أو الشَـجَرَة:** تاشـــی ، توێکڵی لێکردەوە، سافیکرد

**سَلَبَ السَیف:** دەریهێنـا ، رایکێشـا، لەکێلان بەدەری کرد
**سَلَبَ فُلاَنَـةَ فُـؤادَهُ أوْ عَقْلَـهُ:** عــەقڵو بیروهۆشی برد
**سَلَبَ ثَوْبَهُ:** جلوبەرگەکەی لێ زەوتکرد، جلوبەرگی لێ داگیرکرد
**سَلَبَ( لَبِـسَ السِـلاَب ):** جلـی رەشـی لەبەرکرد، جلوبەرگی ماتـەمو پرسـەی پۆشی
**سَلَب:** پـوشو پەلاشـی دار کـەگوریسو پەتی لێ دروست دەکرێ
**سَلِب:** درێژ ، سووك ، ئاسان ، سست
**سُلُب:** ژنو وشتری بەچەمردوو کەهێشتا تەواو نەبوویێت
**سَـلَب:** تـــالانی ، یـــەغما ، راووڕووت، رووتکردنەوە، نەریێ
**سُلبَة:** رووتکردنـەوە، دامـاڵینی جـلو بەرگ
**سَلبَة:** جۆرە پەتێکـــە کەلـــە پـوشو پەلاش دروست کرابێت
**سَلَبَت المَرأة:** لەباری چوو
**سَلَبُوت:** ئەوەی زۆر زۆر تالانی دەکاتو راهاتوە لەسەری ، تـالانچی ، جـەردە، حەرامخۆر، فەرهوودچی
**سَـلبِي:** نـەریێ، بێئـــەرك، نالـــەبار ، بێجێی ، سپارد
**سَلبِیَة:** نەشـــیاوی، ناباشـــی ، لـەلای فەیلەســوفەکانیش بریتیـــە لـــەحاڵو بارێکی نەفسی دەبێتـە هـۆی سسـتیو کزیی لەبزاوتو جووڵەداو خاوەنەکـەی تووشـی گرفتـی دوو دڵیو بـەدگومانی دەکات لەجموجووڵو دواتریش دەبێتە هۆی وەستانو مـەنگ بوونـی هـەروەها بەگێرەشێوێنیو نـەبوونی هاوکـاریش دەگوترێت

**سَلَتَ:** دەری‌هێنـا ، هەڵی‌کێشـا ، رای کێشا
**سَلَتَ الشَّعرَ أوْ الرَّأس:** سەری تاشی ، قژی بڕی
**سَلَتَ المَرْأةُ الخِضَابَ عَنْ يَدِهَا:** سڕی‌و لایبرد، خەنەکەی دەستی سڕیەوە
**سَلَتَ الشَّيءَ:** بڕی ، لەتیکرد، پارچەپارچەی‌کرد
**سَلَتَ بِسَلحِهِ:** ریخی کرد، پیسایی کرد، پشقلی کرد
**سَلَتَ مَلابِسَهُ:** دایکەن ، خۆی رووتکردەوە
**سَلَتَ وَإسْتَلَتَ القَصْعَةَ:** لستیەوە، پەنجەی پیاهێنا
**سُلْت:** جۆیەکی بێ توێکڵو قەلاس
**سَلَّة:** سەبەتە ، قوڵینە، سەوی ، سەوەتە، سەلە، نانەشات، دەفرێکی لەشووڵ دروستکراوە بۆ کاروباری ناومالْو پەین رژاندنو میوەی تێدا دەبەن بۆ فرۆشتن
**سَلَّةُ المُهْمَلات:** تەنەکەی خۆڵ، سەتڵی خۆڵ
**سَلَّةُ السَرْقَةِ الخَفِيفَةِ:** گەرەدزی ، ناخونەك
**سَلْتَاء:** ئەو ژنەی خەنە ناگرێتە دەستو قاچو سەر
**سَلَجَ:** قوتیدا ، لوشی‌دا ، هەڵی‌دا
**سَلجَم:** شێلم ، ریشێکی چڕو پڕ، سەرێکی درێژی ریشاویی، کۆنە بیرێکی پڕ لەئاو
**سَلِحَ ـ سَلحَاً:** ریقنەی‌کرد، ریخی‌کرد ، پیسایی‌کرد
**سَلَحَ:** چەکی‌دایە، چەکداری کرد، پێداویستی جەنگی هەڵگرت
**سَلحُ الطُيُور:** ریقنە ، جیقنە ، جیق
**سُلحُ:** رۆن یان زەیتێکە مەشکەی پێ چەور دەکرێت
**سَلَحْ:** ئاوی باران کەلە ئەستێڵ یان گۆمێکدا کۆببێتەوە
**سُلَحُ:** بێچوی پۆڕ
**سَلَحْ:** چەك ، هۆکاری جەنگو کوشتار
**سُلحَفَاة ـ سَلحَفَاة ـ سُلحَفَاء:** کیسەڵ، کووسەل ، کووسی، گوویسەل، کیسۆ ، دەعبایەکی دێمی‌یەو وەك رەقەی ناو ئاو وایە بەهێواشی دەروات بەرێوەو سەرو پەلەکانی لەنێو رەقەیەکی سروشتی خۆیدا وندەکات
**سُلحُفَاةُ البَحْر:** جلە ، رەقەی گەورەیە، سێڵە، زۆر لەرەقە گەورەترەو لەئاودا خۆی پاندەکاتەوە بۆ گرتنی مەلْو مووش‌و دواوەی خۆی لێك دێنێتەوەو ملو موشەکان قوت دەدات
**سَلَخَ الخَرُوف:** گروی ، پێستەکەی گرو
**سَلَخَ المَرْأةُ دِرْعَهَا:** زرێکەی داکەند، لەخۆی داماڵی
**سَلَخَ الحَيَّةُ:** کاژەکەی فرێدا ، پێستەکەی لەخۆکردەوە
**سَلَخَ اللهُ النَّهَارَ مِنَ اللَيل:** خوداوەند رۆژی دەرخستو لەشەوی جیاکردەوە
**سَلَخَ الشَّهر:** مانگ تەواو بوو، رابورد، کۆتایی هات ، دوایی هات
**سَلَخَ الحَرُّ جِلدَهُ:** پێستەکەی سووتان ، هەڵی کزاند، سوتانیەوە، توێکڵی پێ هەڵدا

**سَلَخ ـ سَلْخ:** كـاژی مـار ، دامـالّین ، گرون، فرێدان ، پێست گرتنـەوە، توێژ دامالّین
**سَلَخ الشَّهر:** دوایـی مـانگ، کۆتـایی مانگ، بنی مانگ
**سِلخ( جِلد الحَيوَان المَسْلُوخ ):** پێستەی گروار
**سَلخَانَة( مَسْلَخ ـ مَذْبَح ):** قەسابخانە، جێگەو شوێنی گۆشت فرۆشتن یـان سەربڕین و کوشتەی ئاژەلّ
**سَلِسَ:** گوێڕایـەلّ بـوو، نـەرم بـوو، دەستەمۆبوو، کەویبوو، بەئاسانی پێی دامەوە
**سَلِسَ:** عەقلّی ڕۆیشت ، ژیری لەدەستدا
**سَلِسَ لَهُ بِحَقِّه:** بەئاسـانی مـافی خـۆی دایە
**سَلِسْ:** ئاسان ، سانا ، نـەرم ، نیان ، گوێڕایەلّ، ملکەچ ، دەستەمۆ
**سَـلِسْ:** گوێڕایـەلّ، بەئاسـانی مـالّی کـردن و بـەڕێوەبردن ، مـیزەچوڕکێ ، میزڕانەگرتن
**سَلِسَ الحَلِيّ:** گەوهەر بەندی کرد
**سَلْسَـل ـ سَلْسَـال ـ سُلاسِـل:** ئـاوێکی شیرین و سازگار ، مەیو بادەی سووك
**سُلسُل:** جەحێل و لاوی ڕوح سووك
**سَلسَلَة:** پارچەیەکی درێژی کۆپارە
**سِلسِلَة:** زنجـیر ، زریـزە ، ملوانکـە ، گـەردن بـەند، چـەند پارچـە تـەلێکی ئـالّتوونی یـان هـەر کـانزاو شـتێکی دیکەیە کەلەیەك هەلّکێشـرابێت بەسـەر سـینەدا شـۆڕبووبێتەوە، زنجـیرە بروسکەی یەك لەدوای یەك
**سِلسِلَة أشيَاء متَتَابِعَة:** زنجـیرێکی یـەك لەدوای یەك
**سِلسِلَة أكَاذِيب:** گەلـە درۆ ، کۆمەلّـە درۆیەکی یەك لەدوای یەك
**سِلسِـلَة الجِبَـال:** زنجـیرە شـاخ ، تیغەشان ، تیرەشان
**سِلسِـلَة النَسَـب:** بنەچـە ، زنجـیرەی ڕەگـەز ، ڕەچەلّـەکی ریـز بـەندی یـەك لەدوای یەك
**سِلسِـلَة الظُـهر:** بڕبـڕەی پشـت ، مورەگـەی پشـت ، ڕشـتەو دانـەکانی پشت
**سَلِطَ ـ سَلُطَ:** زمـان ڕێـژو پیس بـوو ، بەدگۆو خراپ بوو، خراپە گۆو گەندەلّ
**سَلُطَ عَلَـى:** هـانیدا ، دنـەیدا ، پـالّی پێوەنا
**سَلِطْ:** زمـاندرێژ ، دڕ ، چەنـە سـووك ، بێئابڕوو،سووکاو ، کەسێکە لەئەندازەی خـۆی پـترو بـەرەو ژووتـر لـەبارەی مەردوم بدوێ
**سَلِطْ:** نوکـە رمێك خـواری و لاری تێـدا نەبێت
**سُلُطْ:** بالاّی بەرز ، بلند، پایان
**سُلطَان:** فـەرمانڕەوا ، سـولّتان ، شـا ، پاشـا ، دەسـتەلاّتدار، بـەتوانا، کارڕەوایی ، بەلّگە ، هۆ
**سُلطَانَة( زَوجَة السُلطَان ):** شاژن ، ژنی سـولّتان ، هاوسـەری فـەرمانڕەواو دەستەلاّتدار ، شاژنە
**سَلطَانَة ـ سِلطَانَة:** ژنێکـی بـالاّ بـەرزی زمان تیژو ڕەق
**سُلطَانِي:** شایانە ، شتێك بدرێتە پـالّ شاو دیوانی شایان

**سُلطَانِيّة :** لەگــەن ، قــاپی مــس ، دەستشۆ، دەفرێکی مسینی دەم واڵە
**سُلطَة :** دەســتەلأت ، توانــا ، هــێز ، فەرمان ، کارڕەوایی
**سُلطَة رُوحِيَة :** فـەرمانڕەوای ئــاینی ، روحی
**سُلطَة زَمَنِيَّة :** مێزو دەستەلأتی کاتی
**سُلطَة مُطلَقَة :** دەستەلاتی تەواوو رەها
**سُلطَة قَضَائِيَة :** فەرمانڕەوای یاسایی
**سُلطَة القَضَاء :** دەستەی دادوەریــی، دەستەلأتی دادوەریی
**سُلطَة التَشرِيع :** دەستەی یاسادانان ، دەستەلأتی یاسادانان
**سَلطَة( كَامِخ ):** زەلأتە ، سەلأتە، جۆرە خواردەمەنییەکە لەترۆزی یا خــەیارو تەماتــە یــا لەســرکەو کــاهوو هــەندێ شتیتر دروستدەکرێ
**سَلطَة :** رمێکی درێـژی باریك ، قاپێکـە کاو حەشیشی تێدەکرێ
**سَلطَعُون :** گیاندارێکی ئاوییە
**سَلطَنَة( مَملَكَة ):** ولأت ، سولتان نشین، میرنشین، شانشین
**سَلطَنَهُ :** کـردی بـەمیرو شـا، کردی بـە فەرمانڕەواو دەستەلأتدار
**سَـلَعَ الـرَأسَ:** شـکاندی ، لــەتیکرد، قلێشاندی
**سَلَعَ جِلدَهُ بِالنَّــار:** بـەئاگر سـووتاندیو شوێنەوارەکەی لەسەری دەرکەوت
**سَـلَعَ الأَرضَ:** قلێشــا ، درزی تێبـــوو، لەیەك ترازا
**سَلِعَ الرَّجُـلُ:** گـەڕیوو، رەنگـی پێسـتی گۆڕا بەدروست بوونی پەڵە لەسەری

**سَلِعَ قَدَمُهُ :** قاچی قلێشا
**سَـــلَع :** قلێـــش ، قلێشـــاوی ، درز قلێشاوی لەپێستدا دروست دەبێــت، پەیدابوونی درزو قلێش لەپێدا
**سَلَع:** سـوتاوی، سۆزیانی، ســۆهتان، گرانی شتێك ، ئاگر تێبەربوونی شتێكو سووتانی
**سَلَع :** دارێکی تاڵـە، پاقلەیـەکی پیسو تــام ناخۆشــە ، جــۆرە ئارامییەکــە، شوێنەواری ئاگر لەسەر پێست
**سَلِعَتْ قَدَمُهُ :** پێی قلێشا ، قاچی قلێشا
**سَـلعَة ـ سَـلَعَة ـ سِـلعَة :** زەرو ، لــوو ، چەورە لووی ژێر پێست
**سِلعَة :** کەلو پەل ، شتومەك
**سِلعَة كَاسِدَة :** کــەلو پــەلی بێبــازاڕ، کەلو پەلێك بازاڕی نەبێتو نەفرۆشرێ
**سَلَفَ الأَرضَ :**زەویچاککرد،تەختیکرد، خۆشیکرد، باشیکرد
**سَلَفَ المَزَادَة :** چەوریکرد، چەوری لێدا
**سَلَفَ :** رۆیــی ، بەســەرچوو، رابــورد، تێپەڕی
**سَلَفَ القَـومَ :** پێشیان کـەوت ، بەرلـەو رۆیی، پێش ئەوان رابورد
**سَلَفَ :** قەرزیدا ، وامیدا
**سَلَفَ الشَيءِ :** پێیدا ، خستیەبەردەمی، وەبەری هێنا
**سَلَفَ الضَيــفَ:** خواردنێکـی کــەمیدا بەمیوانەکەی
**سَــلَفْ :** باپــیران ، پێشــین ، بــاوان ، رابــوردوو، پێشــوو، دێریــن، قـــەرزی بێســوود، هەرشـتێك پێـش بکـــەوێ لــەباوانو نزیکـان لـە تەمـــەندا یـــان لەچاکەیا ، هــەر کردەوەیــەکی چاکــە پێشکەشـی بکــەیت ، پێشــەکی پــارە کەدەدرێت لەبری شتێکدا ، مامەڵـەی سەلەم

**سُلف ـ سِلفَان ـ سُلفَان:** بەچکەی کەو ، بارەکەو ، یاخود سوێسکە ، زرکەو ، قەتێ

**سَلف :** پێست ، مێردی ژن خوشك ، ئاوەڵزاوا

**سَلف ـ سُلوف ـ أسلَف:** کەلانی شمشێر، پێستەیەك بەباشی خۆش و دەباغ نەکرابێ

**سِلف( عَدِيل ):** ئاوەڵزاوا ، مێردی ژن خوشك

**سُلفَة:** قەرز ، خوازتن ، وام ، بەرکوڵێك پێش خواردن کەسێکی برسی دەیخوات، کۆمەڵێ تاقمێکی پێشین ، پارچە زەوییەك رێکدەکرێ بۆ کشتوکاڵ، ئەو پێستە زیادەیەی لەعەورەتی منداڵ دەکرێتەوە لەکاتی سونەتکردن و خەتەنەدا

**سِلفَة( زَوْجَة الأَخْ ):** براژن ، ژنی برا ، بوورا

**سَلَقَ البَيضَ أوْ البَقل:** کوڵاندی و لێی نا ، لەئاودا کوڵانی و پاشان لێی نا

**سَلَقَ بِالرمْح:** بریندارى کرد، لێیدا

**سَلَقَ بالسَوط:** بەقامچی لێدا هەتا توێخی پێستەکەی برد

**سَلَقَ اللحْمَ عَنْ العَظْم:** پاکی‌کرد، کراندیەوە، دایماڵی، لێی کردەوە

**سَلَقَ فُلاناً بِكَلامه أوْ بلسانه:** ئازاریدا ، ئەشکەنجەی‌دا، ئێشێی پێگەیاند بەقسەکانی

**سَلَقَ الطَبيبُ فُلاناً:** لەسەر گازەرای پشت پاڵی خست، بەپشتا تەختی کرد

**سَلَقَ البَردُ أوْ الحَرُ النَبات:** سەرما یان گەرما روەکەکەی برد، تیایبرد، فەوتاندی

**سَلَقَ الجلد:** پێستەکەی چەورکرد

**سَلَقَ الحَائطُ وَغَيرَهُ:** سەرکەوت بەسەریا ، چوەسەری ، هەڵزنا پیایدا

**سَلَقَ العُودُ فِي العُروَة:** بردیە ناویەوە، داغڵی‌کرد، خستیە ناوی

**سَلَقَ بِاللسَان أوْ بِالكَلام:** سەرزەنشتی‌کرد، قسەی پێگوت ، بەسەریا هات

**سَلَقَ الشَيء بِالمَاء الحَار:** تووك و پەڕەکەی لێکردەوە، هەڵی پروکان ، ئاوەڕووتی‌کرد

**سَلق ـ سَلَق:** کوڵاندن ، کوڵان

**سَلَق( أثر الجَرْح ):** جێبرین ، شوێنەواری زامداری

**سِلق( نَبَاتٌ يُؤكَل ):** سلق ، زلق ، گیایەکی گەڵاپانی بنکدارە دەکرێ بەچێشت و ...

**سِلق:** گورگ ، جۆکەلە ئاو

**سَلقَ فُلان عَلَى هَذه السَليقَة وَسَلقَهَا:** لەسەر ئەو بارو حاڵە بەبار هات ، لەسەر ئەو سروشت و شێوازە پێکهات

**سَلَق:** شا ، رێگە ، رێگەوبانێکی فراوان، چاڵێکی نەرمە خاك لەزەویدا کەهیچ روەکیکی تێدا نەبێت

**سِلقَة:** گورگ ، ژنێکی زاڵی بەدکۆ، کوللە کاتێ گەرا دادەنێ

**سَلَكَ المَكَان:** تێی چوو، چوە ناوی، پێی نایە ناویەوە

**سَلَكَ الشَيء فِي الشَيء:** تێی خست ، تێی پەڕان ، پێوەی‌کرد، هۆنیەوە

**سَلَكَ الطَرِيقَ:** پیاڕۆیی ، گوزەری‌کرد، پیا تێپەڕی ، بەسەریا رۆیی

**سَـلَكَ الخَيــطَ:** هــەڵیكرد، بــایدا ، لوولیکرد، خــاوی كــردەوە، گرێكــەی كردەوە

**سَلَكَ الأسْنَانَ:** دانـی ئـاژەنی ، پــاكی كردەوە، چیلكەی كرد بەنێویاندا

**سَلَكَ الأمْرَ المُعَقَّـدَ:** كــارێكی ئــاڵۆزی ئاسانكرد

**سِلْك:** كشتەك ، بەن ، پەت ، دەزوو

**سِلْك مَعْدَنِيّ:** تەل ، سیم ، تــولّ، تێلـی ئاسان كەباریكو درێــژە بـۆ دوورەژنـەو كارەبا بەكار دەهێنرێ

**سِلك نَبَاتِيّ:** تــەرز، توولـەی دارەمێـوو بڕكــەی خـــەیارو تـــرۆزیو كاڵـــەكو شووتیو گوژاڵكو...

**سُلَكَ:** بەچكەی سوێسكە یان قەتێ

**سِلْكَة:** بـەن ، پـەت ، گوریس ، تـەل، سیم ، تۆل، دەزوو

**سُلَكَة:** بارەكەو ، بەچكەی كەو

**سَلِمَ مِنْ عَيـبْ أوْ آفَـة:** ڕزگـاری بـوو لـە ناتەواویو بەلاّ، قوتاربوو، سەرفرازبوو، ڕوسووربوو، بەدەربوو لەناتەواویی

**سَلِمَ لَهُ المَال:** بۆی مایەوە، بۆخۆی بوو

**سَلَمَ الجِلْد:** خۆشیكرد، دەباغیكرد

**سَلَمَ الدَّلْو:** بەتاڵیكردەوەو توندی كرد

**سَلَمَ الحَيَّة:** گەزتی، پێوەیدا، ژارەكەی كردە جەستەیەوە

**سَلَّمَ:** گوێڕایەڵبوو، ڕام بــوو، ڕاهــات، هاتەســـەربار ، قـــایلو ڕازی بـــوو بەفەرمانو بڕیار

**سَـلَّمَ المُصَلـي:** لـەنوێژ چــوە دەرەوە بــەوتنی (ســـلاو ـ ســـەلام) ، دوایـــی بەنوێژەكەی هێنا بەسلاوو سەلام

**سَلَّمَ عَلَـى القَــوم:** سـلاوی لێكــردن ، سەلامی لێكردن

**سَلَّمَ الدَّعْـوَى:** دانـی نـا بەڕاستیەتیدا، قایل بوو پێی

**سَلَّمَ الجَيش لِعَدوه:** دانـی نـا بـەدۆڕانو شكستهێنان

**سَلَّمَ أمْرَهُ للهِ وَإلَيـه:** بـارو حـاڵی خـۆی دایە دەستی پەروەردگار ، خۆی بەخوا سپارد

**سَلَّمَ نَفْسَـهُ لِغَـيرِه:** ڕێگـەیدا بەكەسـانی دی فـەرمانڕەوایی بكـەن بەسـەریەوە، ڕێگەی یاریكردن بەچارەنووسی پێدان

**سَلَّمَ إلَى:** سپاردی، پێیدا

**سَلْم:** ئاشتی ، خۆسپاردن، دیل كردن ، دارێكە لەدەباغكردندا بەكاردێت

**سُـلَّم:** پلیكانـە ، قالدرمـــە، پـــەیژە، پیپلیكانە، پایە، پیپلیكە

**سِـلْم ـ سَـلْم:** ئاشـــتی ، چاكســـازی، هێمنی،بێدەنگی،ئاسایش ، ئاسوودەیی

**سَلِمَة:** ژنی ئەندام باریك ، بەرد، خڕكـە بەرد

**سَلَمُون( سَمَك بَحْرِيّ ):** ماسیە خاتوونەو لەئاوی سوێردا هەیە

**سَـلوَى:** گەمــە ، گشـــت ، ڕابوێـــرە ، خلافاندن، سەرقاڵكردن، دڵخۆشـكەرە، شـیلاقە كەباڵندەیەكـــە بەئـــەندازەی كۆتـــرە باریكەیـــەك دەبێـــتو هـــەر لەبەهارانا دەردەكەوێت

**سُلْوَان:** ئاوێكە دەڵێن گەر دڵدارو عاشق بیخواتـەوە ئـەوا دڵـی سـاڕێژ دەبێـت ، دەرمانو چارەسەرێكە غەمبارو دڵتەنگ یـان كۆسـت كـەوتوو بیخواتـەوە شـادو كەیفدار دەبێت

**سُلوَانَة**: موورویەك گەر ئاوی بارانی بەسەرا ببارێت و عاشق بیخواتەوە دڵی سارێژ دەبێت
**سُلوب**: ژن و وشتری بەچە مردوو کەهێشتا بەچکەکە تەواو نەبوبێت و پێنەگەیشتبێ
**سُلوَة ـ سَلوَة**: رابواردن ، کەیفکردن، کات کوشتن
**سَلوقِيّ**: سەگی راو ، سەگێکی خێراو تیژە لەراوکردندا بەگەڕ دەخرێ
**سَلُوقِيَّة**: جێگەو شوێنی دانیشتنی کەشتیەوان، جۆرە زرێیەکە دەدرێتە پاڵ گوندێك لە(یەمەن) بەناوی (سلوق)ەوە
**سُلوك**: کردار، رەفتار، هەڵسوکەوت ، جموجووڵ، رەوشت
**سَلِيَ الشَيءِ وَعَنهُ سَليَاً**: لەبیری چوەوە، لەبیری کرد، سەبوری خۆیدا
**سَلِيَت الشَاةُ**: وێڵاشەکەی پچڕاو بەربوو فڕێیدا
**سَلِيح**: پێغەمبەر (وشەیەکی سریانیە)
**سَلِيخ**: کەولکراو، بێتام، گروار، داماڵراو
**سَلِيخَة**: کوڕ، رۆنی روەکێکی بۆنخۆش و سەوزو بالآیە
**سَلِيط**: بێحەیا ، بێئابرو، بەزەبر، چوختی، رۆنی زەیت ، رۆنی دەنکۆڵەکان ، توندو تیژ
**سَلِيطَة**: ژنی بەدگۆی زمان درێژی زبرو رەق
**سَلِيق**: ئەو هەنگوینەی هەنگ دروستی دەکات لەباری پانی شانەکەیدا ، گەڵای کەوتووی داری پچکۆلانەیە

**سَلِيقَة**: نەژادی خۆرسك ، لەخۆوە ، کوڵاو
**سَلِيل**: لەڕەگەزی ، لەنەوەی، لەرەچەی، لەخێزانی، لەتوخمی ...، نەخۆشی سیل ، شەرابێکی تەواوی پاڵفتەکراو، جۆگەلە ، سەرەنێزە
**سَلِيلَة**: کچ ، کیژ ، ئەو گۆشتەی پەیدا دەبێت لەسەر پشت ، ماسیەکی درێژە
**سَلِيم**: تەواو ، دروست ، بێخەوش، بێگەرد، هیچی نییە بێوەیە، گازندەکراو یان برینداری لەمەرگ نزیك بوبێتەوە
**سَلِيمُ البِنْيَة**: لەش ساغ ، تەندروست
**سَلِيمُ العَقْل**: هۆشیار، هۆشمەند، عەقڵ و ژیری تەواو
**سَلِيمٌ مِنَ الآفَاتِ وَالأَمْرَاض**: بێدەرد، ساغ و تەواو، بەدوور لەبەڵاو نەخۆشی
**سَلِيمُ النِيَة**: نیەت پاك، دڵسۆز ، ئەمەكدار
**سُلَيمَان**: ناوی نەهەنگی سولەیمان ، ماسیەکی گەورەیە
**سَلِيمَانِي( عَقَارُ سَام )**: ژار ، ژارجیوە، ژەهرێکی کوشندەیە

**س م**

**سَمّ الطَعَام**: ژاراویکرد، ژاری تێکرد
**سَمّ الشَيءِ**: چاکی کردەوە، باش دروستیکرد
**سَمّ بَينَهُمَا**: ئاشتی کردنەوە، تەبایکردن، رێکی خستن
**سَمّ القَارورَة**: سەری نایەوە، دەمی گرت، سەری گرت
**سَمّ النِّعْمَة**: تایبەتمەندیکرد، پێیدا ، بەویدا

**سُمْ - سِمْ - سَمْ:** ژار ، ژەهـر، زەهـر، مەرگـەموش، ژاری هـەلایل ، میـنـاك، ئاغوو، ژەحر، هەر مادەیەك بچێتە نێو گەدەوەو مرۆڤ لەجموجوولْو چالاکی بخات

**سَمٌ:** هەرشتێك لـەدەریا دەربـهێنرێت ، قـامیش ، ژارێکـە کتومـت بخـۆری دەکوژێتو لەناوی دەبات

**سَمُّ الیَومُ:** گەرمای کرد

**سَمَّ النَّبَاتُ:** گرە سوتاندی، گرەبردی ، شەرا لێی دا

**سَمَا:** بەرزبوەوە، بلْندبوەوە

**سَمَّابِهِ:** بـەرزی کـردەوە ، بلْنـدی کردەوە، بالآیکرد

**سَمَا البَصَرُ:** چـاوی تێـبڕی ، دییـەی خستە سەر

**سَمَا القَومُ:** چـوون بـۆ راو، بۆشـکار چوون

**سُمَا:** ناوبانگباشی ، ناوداریی

**سَمَّی الرَّجُلُ:** ناوی نا ، ناوی لێنا

**سَمَّی الشَّارِعُ فِي العَمَلِ:** ناوی خوای برد لەکارو پیشەکەیدا

**سَمَاء:** ئاسمـان ، حـەوا ، بۆشـایی، ئەوەی لەسەرو خۆمانـەوە دەبیینیـن ، هەرشتێك لەسەروتەوە بێـت ئاسمانـە ، پشتی ئەسپ، سەقفو بانی هەرشتێك، باران ، هەور، گـژو گیـا، لانـەی روحـی خواناسو چاکە کاران

**سَمَائِيٌ:** بـەرزی ، روحـی ، ئاسمـانی ، شینی کالْ

**سَمَاجَة:** خراپە ، بـەدیی ، نارەسـەنی، بـەدرەفتاریی ، چەپـەڵی ، پیسـی ، نەگریسی

**سَمَاحٌ:** چاوپۆشی ، لێبوردن، بەخشین، لێخۆشبوون ، رێدان

**سَمَاحَة( سعَةُ الصَدْر ):** سـنگ فراوانـی ، میهرەبانی، لێبوردەیی ، چاوپۆشی

**سَمَادُ( سِبَاخ ):** پەیین ، سـنێر، سـەنێر، تەرسی وشك

**سَمَار:** ماستاو ، نزاو، ماسـتی روون، شیناو، ماستەوا، چەقلْە ماست

**سَمَار( نَبَاتُ كالحلفَاء ):** لـەبان ، زەل ، گیایەکـە بلْـند هـەلْدەچێ، کەتـەنیا حەسیرو کورتانی لێ دروست دەکرێ

**سِمَاطٌ:** سـفرە ، خـوان ، نانەبـەرە، هۆنراوە، ریزکراو، ریزبەند

**سِمَاطُ الطَرِيقِ:** ئەمبەراو بەری رێگـە ، هەردوو لای رێ

**سِمَاطُ القَومِ:** ریزیان ، لایان ، رشتەیان

**سَمَطَانُ:** دووریـزی دارو درەخـت ، دوو دەستە خەڵك

**سَمَاعٌ:** بیستن، گۆرانی ، باسو ناوبانگ

**سَــمَّاعٌ:** ئـــەوەی زۆر دەبیســـتێ، گوێڕایـەڵ، جاسـووس ، سـیخوڕ، گـوێ هەڵخەر

**سَمَّاعَة:** دەنگەوەرە، بیسـتەك، دەنـگ وەر

**سَـمَّاعَةُ التلفُـونِ:** دەنـگ گەیـەن ، تەلەفۆن

**سَمَّاعَةُ البَـابِ:** دەرکـوت ، دەسـك ، دەمە

**سَمَاعِيٌّ:** بەبیستن ، ژنەوتە ، ژنـەفتن ، بیستن بەگوێ

**سُمَاق:** ترش، شـۆك ، تـورش ، ترشـی سمـاق، بـەری دارێکـە بەهێشـوو دەیگـرێو وەکـو نیسـك وایـە بـۆ مزرکردنـی چێشـتو شـتیتر دەسـت دەدات

**سُمَّاقَة:** بەری داری ترش ، گیایەکی مزروترشە

**سِماك:** ستوون، کۆڵەکە ، ئەستووندە، هەستوون ، پاژەر ، دووگوێ، هاچە ، راگر

**سَمّاك:** ماسی گر، ماسی فرۆش

**سِماكَان:** دوو هەسارەی رۆشنو گەشن

**سَمَال:** کرمی نێو زەلکاوو گۆماو

**سَمّالْ:** درەختێکە ، ئەوەی لەنیگاو تێڕوانینەکان حاڵیو شارەزایە

**سَمام:** سووك ، نەرمو نیان ، خێراو تیژی هەموو شتێك، جۆرە باڵندەیەکە

**سِمام وَسُمُوم مِنَ الإنْسَان:** دەمو لووتو هەردوو گوێچکەی مرۆڤ

**سَـمَلَة(سـنونو):** پەرەسێلکە، پەرەسێلك، پەرەسلێرکە

**سَمَّانْ:** رۆنفرۆش ، بۆیەی هەمەچەشن بۆ رەنگو بۆیەکردن

**سُمَانِيٌّ:** شیلاقە ، باڵندەیەکە بەئەندازەی کۆترە باریکەیەك دەبێ هەر لەبەهارانا پەیدا ئەبێ

**سَمَاهُ:** ناوی نا ، ناوی لێنا

**سَمَاوَة:** بانی ، رووخساری، ئەوەی بەدەر دەکەوێت

**سَمَاوِيٌّ۔ سَمَائِيٌّ:** ئاسمانی ، شینی کاڵ، گیان زان ، بەرزی ، بڵندی

**سَمْتَ۔ سَمْتَ:** رێگەکەی گرت ، رێگەی داخست، پێوەیدا

**سَمَّتَ اليَومُ:** بایەکی گەرمی هەبوو، گڕەی هەڵکرد

**سَـمَّتَ فُلانـاً:** ژەهری دایە، ژاری دەرخواردا

**سَمَّتَ الطَعَـامَ وَغَـيرَهُ:** ژاری تێکرد، پیسیکرد بەژەهری کوشندە

**سَمَّتَ السُمُوم النَّبَاتَ:** گڕە روەکەکەی سوتاند

**سَـمَّتَ الإبْـرَةَ:** کونیکرد، سمی ، ئەمدیواو دیوی کرد

**سَمَّتَ الثُقْب:** چوە ناوی ، داغڵیبوو، تێی چوو

**سَمَّتَ الشَيءَ:** چاکیکرد،باشیکرد، خاسیکرد

**سَـمَّتَ بَيْنَـهُم:** ئاشتی کردنەوە، ئاشتەواییکرد لەنێوانیاندا

**سَمَّتَ النعْمَةَ:** ئەوی تایبەتمەندکرد پێی، بەتەنیا بەوی بەخشی

**سَمَّتَ فُلاَنٌ سَمَّ فُلانٍ:** هەمان مەبەستی ئەوی هەبوو، هاومەبەست بوو لەگەڵی

**سَمَّتَ عَلَى الشَيءِ:** ناوی پەروەردگاری برد لەسەری

**سَمَّتَ لِلعَـاطِسْ:** دوعای لێخۆشبوونی بۆکرد لای پەروەردگار

**سَـمْتٌ:** رێ، رێگە، بار، دۆخ، حاڵ، بارودۆخ

**سَمْتُ الرأس(في عِلم الهَيئَة):** کەشکە شانی فەلەك ، ئەوپەڕی ئاسمان

**سِمَةٌ:** نیشانە، شەقڵ، هێما

**سُمَّةٌ:** ئەو پوشەی لەژێر دارخورمادا رادەخرێ لەکاتی لێکردنەوەی خورمادا، خزمایەتی تایبەت، ناوك و کرۆکی دارخورما

**سَمُجَ(قَبُحَ):** چەپەڵ بوو، پیس بوو، نەگریس بوو، ناپاك بوو، گەندەڵ بوو

**سَمُجَ**: شیرێکی تام و بۆن ناخۆش
**سَمَجَ**: چەپەڵ و پیسی‌کرد، گەندەڵی کرد
**سَمْجٌ**: چەپەڵ، پیس ، گەندەڵ، نەگریس ، نەگبەت، سەهندە، مەردومی چوختی و گەندەڵ رەوشت و رەفتار
**سَمَحَ**: نەرم و نیان بوو، ئاسان و سانابوو، گوێڕایەڵ و ملکەچ بوو دوای سەختی و گرژی
**سَمَحَ فُلانٌ**: لەخۆشی و ناخۆشیدا بەهۆی رێزداریی و دڵفراوانی‌یەوە بەخشی
**سَمُحَ**: بەخشندەبوو، سنگ فراوانبوو، بوو بەچاکەکارو ئەوانەی دەبەخشن و چاوپۆشی لەهەڵەو کەم و کوڕی دەکەن
**سَمَحَ بِكَذا**: بەخشی، دای، کردی بەخێر، جوامێری نواند، رێی‌دا، چاوپۆشی کرد
**سَمَحَ لَهُ بالشَيءِ**: پێی‌ی بەخشی، پێیدا
**سَمَحَ النَاقَةَ**: لێی خوڕی و بەخێرایی رۆیشت ، هێمن و گوێڕایەڵ بوو ، بەخێرایی چوو بەڕێوە
**سَمَحَ**: بەخشندەیی، میهرەبانی، دلۆڤانی ، بەزەیداریی، دەفتەری ، دڵفراوانی ، بەخشەری، کەسێکە زۆر پارە یان شتومەك بدات بەخەڵك
**سَمَّحَ**: چاوپۆشی‌کرد، دڵنەرم و فراوانبوو
**سَمْحَاق**: پێستی سەر ، ئەوپێستەی بەسەرەوەیە
**سَمَدَ**: سنگی دەرپەڕان، خۆی قیتکردەوە، بەچەشنی خۆبەزلزان خۆی نواند
**سَمَّدَ الأرْضَ**: پەینی پێداکرد، پەینی پێوە کرد
**سَمَّدَ الشَعْرَ**: هەمووی تاشی ، سەرجەم قژەسەری لێکردەوەو تاشی
**سَمَرَ**: شەوکەیفی دەرکرد، رایبوارد، شەوکۆڕی گرت، شەوی رۆژکردەوە، لەگەڵ هاوەڵ کۆڕو دانیشتنی قسەی کرد بەشەو
**سَمَرَ العَيْنَ**: کوێریکرد، لەڕووناکی و بینین بێ بەشی کرد
**سَمَرَ اللَبَنَ**: کردی بە ماستاو
**سَمَرَ الخَمْرَ**: ئارەقی خواردەوە، بادەی نۆشی
**سَمَرَ البَابَ وَغَيرَهُ**: بزمار رێژی‌کرد، بەبزمار توندو قایمی کرد
**سَمَرَ السَهْمَ**: تیی گرت، ئاراستەی کرد، ناردی
**سَمَرَ المَاشِيَةَ**: چراندی، لەوەڕاندی
**سَمِرَ ـ سَمُرَ**: بۆربوو، رەنگێکە لەنێوان رەش و سپی‌دایە
**سَمَرٌ**: گفت‌وگۆی شەو، دەمەتەقێ، کەیف دەرکردن، رابواردن، شەو رۆژکردنەوە بەدەمە تەقەو قسەکردن
**سَمَرُ اللَيلِ وَسَوادُهُ**: شەوو تاریکایی‌یەکەی
**سَمُرٌ**: درەختی مۆز
**سَمْرَاءُ**: ژنی ئەسمەر، ژنی گەنم رەنگ
**سَمَرْمَرَةٌ**: باڵندەیەکە دەنەڕێنێ بەسەر کوللەداو زۆری لێدەخواو ئەویش هەڵدێت و راو دەکات
**سِمْسَار( دلاّل ـ وَسِيط )**: دەلاّڵ ، جامباز، کەسێکە کەل و پەلی نوێ و کۆنەی ئەم و ئەو بفرۆشێ یان هەر شتێکی دیکە ...

**سَمْسَرَ:** بوو بەدەلاڵو جامباز، مابەینی نێوان کڕیارو فرۆشیاری ڕێکخست

**سَمْسَرَة:** ئەندازیاری زەمین ساز، جامبازیی

**سُمْسُق ـ سُمْسَق ـ سَمْسَق ـ سَمْسَق:** یاسمین ، ئەسمین ، مەران، ئاسمین، دارێکە بەگوڵەکەشی دەڵێنو درەختێکی گەڵا وردی پچکۆلەیەو گوڵێکی وردی سپی بۆنخۆش دەگرێ

**سِمْسِم ـ سَمَاسِم:** ڕۆنێکە لەدەنکی کونجی دەردەهێنرێ

**سَمَطَ الرَّجُل:** بێدەنگ بوو، کپ بوو، سرەوتیدا

**سَمَطَ السِّكِين:** تیژیکردەوە، ساویدا

**سَمَطَ الجَدْي:** پاکی کرد موی بەرخەکە بەمەبەستی ئەوەی بیکات بەبریانی

**سَمَطَ الشَيء:** هەڵی واسی

**سَمَّطَ:** خامۆشیکرد، بێدەنگیکرد

**سَمَّطَ الشَاعِر:** هۆنراوەیەکی گوت بەچەشنێ کەهەر سەروایەکی هۆنراوەکە لەسەر کێشێك بوو لەکێشەکانی هۆنراوەی عەرەبی

**سِمْط:** کشتەك ، بەن ، پەت ، بەکرە

**سَمْط:** سوتان ، داماڵین، داپلۆخان

**سَمِعَ الصَوتَ:** بیستی ، گوێی لێبوو، چوو بە گوێیدا

**سَمِعَ إِلَيه:** گوێی بۆ گرت ، گوێی بۆ هەڵخست

**سَمِعَ لَهُ:** گوێڕایەڵی کرد، بەگوێیکرد، بەقسەی کرد

**سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ:** ستایشەکەی وەرگرتو ڕازی بوو لێی

**سَمِعَ الكَلاَم:** لەواتاکەی تێگەیشت ، حاڵیبوو لەماناکەی

**سَمِعَ مِنْهُ وَلَهُ:** پێی بەخشی ، پێیدا، دایە

**سَمَّعَ:** پێی ڕاگەیان، دای بەگوێیدا

**سَمَّعَ بِكَذَا:** بڵاویکردەوە، پەخشیکرد، ڕایگەیاند

**سَمَّعَ بِفُلاَن فِي النَّاس:** ئاماژەی پێکرد، باسیکرد، ناوی برد

**سَمَّعَ بِه (نَدَّدَ):** بەخراپ ناوی هێنا ، قسەی شوێن خست ، هەڕەشەی لێکرد، ناوی زڕاند، سووکی کرد

**سَمَّعَ الدَّرْسَ:** خوێندیەوە، وتیەوە، گوێی لێگرت

**سَمْع:** گوێ، هەستی بیستن ، بیستن ، ژنەفتن ، شنەوتن، ئەژنەفتن

**سِمْع:** نێرینەی جوانخاس، گیاندارێکی دڕندەیە، تولەی گورگ لەکەمتیار

**سُمْعَة:** ناوبانگ ، نێوبانگ، بەناوبانگ بوون، کەسێکە کەناسرابێ بەناوبانگ لێی، ناوێکەو دووی خەڵکی بکەوێ بە خۆشی یا بەناخۆشی

**سُمْعَة رَدِيئَة:** بەناتۆرە، ناوزڕاو، ناوبانگ خراپی

**سَمْعَة:** یەکجار بیستن ، جارێك گوێ لێ بوون

**سَمَعْمَع:** گورجو گۆڵ، خێرا، فێڵبازی پیس، سەرو جەستە پچووك

**سَمَقَ النَّبَات:** بەرزبووەوە، بڵندبووەوە، هەڵچوو، بالابوو، پێگەیشت

**سَمْق:** پیاوی بالا بەرز

**سَمَكَ الشَيء:** بەرزیکردەوە، بڵندیکردەوە ، گەیاندی بەپایان

**سَمَكَ - سَمْكاً:** بەرزبووەوە، بڵندبووەوە، هەڵچوو
**سَمَكَ اللهُ السَمَاءَ:** خوداوەند ئاسمانی بڵندو ڕاگرت
**سَمَّكَ:** ئەستووری کرد، قەڵەوی‌کرد
**سَمُكَ:** ئەستوربوو، قەڵەوبوو
**سُمْك:** ئەستووری، قەف ، ئەندازەی ئەستووری
**سَمْك:** بن میچ ، ساپیتە، بنەبان ، دارەڕا
**سَمَكْ:** ماسی ، ماسۆ ، پەنەما، گیانداریکی پەرەداری مەڵەوانی ئاوییە گۆشتی خۆش‌و بەسوودیشە بۆ مرۆڤ
**سَمَكٌ بَحْرِيٌّ:** ماسی دەریا
**سَمَكٌ نَهْرِيٌّ:** ماسی ڕووبار
**سَمَكٌ صَغِير:** زیتکە ، زیپکە، جۆرە ماسیەکی پچووکە بەئەندازەی قامکێکەو لەو ئەندازە گەورەتر نابێت
**سَمَكَةٌ:** یەك ماسی ، تەنیا ماسیەك
**سَمَكَرِيٌّ:** تەنەکەچی ، تەنەکەساز
**سَمَلَ عَيْنَهُ:** کوێری‌کرد، چاوی دەرهێنا، چاوی هەڵکۆڵی ، لەبینین بێ‌بەشی‌کرد
**سَمَلَ الحَوْضَ:** پاکی کردەوە لەگڵ‌و خۆڵ، لەخڵتەو پیسی پاکی کردەوە
**سَمَلَ بَيْنَهُم:** چاکسازی کرد، ئاشتەوایی‌کرد، چاکەو نێوان خۆشی بەرپاکرد
**سَمَلَ الثَوبُ:** شڕبوو، شیبووەوە، پوا، دڕا، کۆنی کرد
**سَمَّلَ الحَوْضَ:** بەتەنیا کەمێك ئاوی دەرهێنا لێی

**سَمَّلَ فُلاناً بالقَول:** نەرمی‌کرد بەقسە ، هێنایە سەربارو ڕامی کرد
**سَمَلٌ:** شڕ ، شی ، پواو ، دڕاو
**سُمْلاَن:** پاشماوەی ئاوو بادە ، ئەو ئاوەی لەبنی حەوز یان قاپ‌و جاما دەمێنێتەوە
**سَمَلَةٌ:** جل‌و بەرگی کۆنەو شڕ، جلە شڕ
**سَمَّمَ الطَعَام:** ژەهری تێکرد، ژەهری کردە نێو خواردنەوە
**سَمَّنَ الطَعَام:** بەرۆن دروستی‌کرد، چەوری‌کرد، ڕۆنی زیاد تێکرد
**سَمِنَ:** چەوربوو، ڕۆنی زۆربوو، بەزو چەوری یەکجار زۆربوو
**سَمِنَ سَمْناً:** گۆشت‌و چەوری زۆربوو، قەڵەوبوو، گۆشتی گرت
**سَمَّنَ العِجْل:** گوێرەکەکەی دابەست ، قەڵەوی کرد
**سَمْن:** ڕۆن ، چەوری، بەز، زۆم، بۆ ، پیو
**سِمَن - سِمَنَة:** قەڵەوی ، بەخۆوە بوون ، گۆشت گرتوو ، زەۆم ، چەوریی ، گۆشتنی ، غەزوبەز
**سَمَنْد:** باڵندەیەکە لەوڵاتی (هند) زۆرە، ئەسپ
**سَمَنْدَر:** قورناویلکە ، گیانداریکی درێژی پچکۆلەی ئاوییە لەبەهاراندا پەیدادەبێ‌و دەنگێکی زلی هەیە
**سَمَنْدَل:** پارچەی چنراو لەپەری هەندێك باڵندە کەپەڕەکە ناسوتێ، باڵندەیەکە لە(هند) دەڵێن ناسووتێ بەئاگر
**سَمَهَ - سَمْهاً:** سەرسام‌و حەیرانبوو، تووشی سەراسیمە هات

**سَمَّهَ اللهُ عَقْلَـهُ:** خواوەنـد عـەقڵی لیّ سەندەوە ، پەروەردگار عەقڵی هەڵگرت
**سَـمَّهَ الرَّجُـل إِبْلَـهُ:** فەرامۆشـیکرد، گوێی نەدایە، خستیە پشتگوێ
**سُـمَّهُ:** بـەتاڵ، پـووچ ، درۆ ، یـەکێك بێمەبەستو بەکوێرانە تەشەل بدات
**سُمْهَى:**رۆیشتن بەفیزو خۆبەزلزانینەوە، خۆر لەکاتی چێشتەنگاودا
**سَمْهَجَ فِـي السَّيرِ وَغَـيرِهُ:** خـێرایکرد، پەلەیکرد
**سَمْهَجَ السَّيرِ:** ناردی ، رەوانەی کـرد، بەرێیکرد
**سَمْهَجَ كَلاَمَهُ:** درۆیکرد، راستی نەکرد
**سَـمْهَجَةَ مِـنَ الإِيمَـانِ:** دڵنیاوپتـەو، بەهێزو قایم
**سَمْهَرَ الـزَّرْعُ:** نـەشو نمـای نـەکرد، بێخێرو بەرهەم بوو، زڕبوو
**سَمْهَرِي:** رمێکی پتەووقایم
**سُمُو:** بەرزی ، بالآیی ، ژوورویی، شکۆ، مەزنی، بەرزییو بلّندی
**سُمُور:** وشتری خێراو تیژرەو، رەسەن ، خـاوەن سیفەتو تایبەتمەندی بـاشو پەسەند
**سَمُور:** سموره، سمبۆره، سـەڤۆری، گیـاندارێکی چنـگ تیـژی کێوییـە لـەرێوی دەچێ بـەلام گـەلێ پچووکـترە پێستەکەی بەنرخـەو دەکـرێ بەگـەلێ شت
**سَمُول:** جلـی کۆنـەو شـڕ، شـڕکە جـل، جلو بەرگی پواو
**سُمُوم مِنَ الأَسْنَانِ:** دەمو هەردوو کونـە لووتو گوێچکەکان
**سَمُوم:** گڕە ، سەبوون ، شەرا، بای زۆر گـەرم ، تـینو هـالآو، زریـان ، هـالآوی گەرما
**سَمَوِي:** ناو دانە پالّ ، ناو پێدان
**سَمِي:** پلەوپایـە بـەرز ، خـاوەن شـکۆو مەرتەبەی بلّندو بالآ
**سَمِيُ فُلاَن:** هاونـاو، ناوەکانیـان وەك یەکە
**سَمِيخ:** چەپەلّ، پۆخلّ،گەندەلّ، پیس، نەگریس
**سَمِيح:** بەخشندە، جوامێر، میهرەبان ، سنگ فراوان
**سَمِيدْ:** ئاردی سپی ، نانی سپی
**سَـمَيدَـ سَـمَنْدَر:** قورناویلکـــە ، گیاندارێکی درێژی پچکۆلەی ئاوییە
**سَمِيند:** ئاردی سپی
**سَـمِير:** هـاورێی خـۆش مەشـرەب، ئەریاب، دۆستی گیانی بەگیانیو خۆش مامەڵە، رۆژگار، سەردەم
**سَـميطْـ سُـمَيطْ:** خشـتی لەسـەریەك هـەڵچنراو ، پیـاوێکی هـەژاری سـادەو ساکار
**سَمِيعْ:** بیسەر، بیستراو، یەکێکە لەناوە جوانـەکانی پـەروەردگار کـەوا سـرپەو خشپەی گشت بوونەوەر دەبیستێ
**سَـمِيكْ:** ئەسـتوور، سـفت ، قـەفدار، سـتوور، سـتورکوور، قـەوی، قـانع ، مەقـەتی، کلّفـت ، کولّوفـت ، کانـە، شتێك کەوا تەنك نەبێت
**سُمَيكَا:** وردەماسـی کـەوا نزیکـەی (10 سـانتیمەتر) دەبێـتو لاشـەی خـڕەو رەنگێکی زیوی مەیلەو سـەوزی هەیـەو زیـاتر لـەدەریای سـوورو رۆخـەکانی ئـەفریقاو زەریـای هنـدیو بـەحرەین هەیـەو وشـك دەکرێتـەوە ئـەوجا دەخورێت

**سَمِيتٌ:** قەڵەو ، تێكسمڕاو، شیشمان، قەڵەو، سێرروونی، گۆشتن، مەس، گلوول، پاسۆتی، زل، چەوور، تێردۆن، بەزدار، چاخ، تێربەز، گۆشتن، دژی لەڕو لاواز

**سن**

**سَنَّ السِّكِّينَ:** تیژیکرد، دەمەزەردیکرد

**سَنَّ القَلَمَ:** قەڵەمەکەی دادا، نوکی بۆکرد

**سَنَّ الأَسْنَانَ:** سیواکی کرد، پاکی کردەوە

**سَنَّ فُلاَنًا:** بەددانەکانی گازی لێگرت، ددانەکانی شکاندو هەڵی وەراند

**سَنَّ الرُّمْحَ:** تیرەکەی چەسپاند

**سَنَّ الشَّيْءَ:** وێنەی کێشا، دیمەنی کێشا، سفتو جوانی کرد

**سَنَّ الطَّرِيقَ:** ئاسانیکرد، تەختیکرد

**سَنَّ الأَمْرَ:** روونی کردەوە

**سَنَّ اللهُ سُنَّةً:** رێگەیەکی راستو رەوانی گرتەبەر

**سَنَّ المُشَرِّعُ القَانُونَ:** داینا ، نووسی ، هێنایە بەرهەم

**سَنَّ فُلاَنٌ السُّنَّةَ:** داینا ، دای رشت ، دایمەزراند، پێکی هێنا ، هەرکەسێك کارێك دایمەزرێنێو لەدوای خۆیەوە خەڵکی پێدا بچن بەڕێوە

**سَنَّ المَاءَ أَوْ التُّرَابَ عَلَى وَجْهِ الأَرْضِ:** رشتی ، قلێی کردەوە

**سَنَّ الطَّرِيقَةَ:** پەیڕەویکرد، شوێنی کەوت

**سِنّ:** دان ، ماوەی ژیان ، تەمەن ، سێرە ، نوك ، چقڵ ، پەل ، لق ددان ، دووریزە ئێسکەکانی دانەدانە یەکە لەسەر پووکی گیاندار دەڕوێو خواردەمەنی پێ ورد دەکرێو (32) دانەیە

**سِنُّ الثُّومِ:** سەلك ، فسقە، سەلە، سەوەتە، قەرتاڵە، بەسنی پیازو توورو چەوەندەرو شێلمو ...

**سِنُّ الرُّشْدِ:** تەمەنی هەرزەکاریی، سێرەی بلۆق بوون ، هەرەتی لاویی

**سِنُّ الفِيلِ أَوْ الخِنْزِيرِ (نَاب):** شفرە ، شاخ ، کەڵبە، ماهی، شەلفە، مەرقوول، شارووان، برە، دووددانە درێژو تیژەکانی بەرازییەکانەی یان فیلی لەولاولای زارێتی

**سِنُّ القَلَمِ:** نووك، نكل ، نوییك، نووکی پێنووس، دەمکە قەڵەم، سەر

**سِنُّ اللَّبَنِ:** دانی شیری ، ئەودانەی لەتاقێکی منالدا دەکەوێت

**سِنُّ اللَّوْلَبِ:** پێچی برغو، دانە، برغو

**سِنُّ المِحْرَاثِ:** گاسن ، گا ئاسن ، نووکی ئاسن ، گیسن ، ئاسنێکی پانە وەك بێڵ دەکرێ بەهەوجارەوەو جووتی پێ دەکرێ

**سَنَا السَّحَابُ الأَرْضَ:** هەورەکە زەوی ئاودا، ئاودێریکرد، بوژاندیەوە

**سَنَا الدَّابَّةُ:** بەچوار پێ یان ئاژەڵ ئاوی هێنا ، ئاوکێشی کرد

**سَنَا البَرْقُ:** رووناك بووەوە، رۆشن بووەوە، تیشکی دایەوە، درەوشایەوە

**سَنَا البَابَ:** کردیەوە، والآیکرد، خستیە سەرپشت ، ئاوەلآی کرد

**سَنَا السَّمَاءُ:** بارانی باراند

**سَنَا الدَّلْوَ:** لەبیرەکە دەریهێنا ، هەڵی گۆزی ، بەدەری کرد

**سَنَا النَّارُ وَنَحْوُهَا:** رووناکیەکەی بەرزبووەوە، بلآوبووەوە، بڵندبووەوە

**سَنَا القَومُ لأنْفُسِهِم:** ئاویان بـۆ خۆیـان هەڵگۆزت
**سَـنَـا:** رووناکی مـانگ، رووناکی پەخشکەر
**سَـنَى:** هـەورە بروسـکە، تریشـقە، ئاوریشم
**سَـنَى العُقْـدَةَ:** گرێکـەی ئـاوەڵاکرد، کردیەوە، گوشادی کرد
**سَـنَّى الأَمْـرَ:** ئاسـانو سـانای کـرد، سووکی کرد
**سَنَاء:** شکۆ ، مەزنی، بەرزی ، بڵندی ، پایـەداریی، بریقـە ، رووناکی ، درەوشانەوە، تابان ، درەخشان
**سَـنَـارْ:** ناتـەواوی لـەهۆنراوەدا ، کەرکـەدەن ، وشـتری بـەهێزو ئێسـك پتەو
**سَنَانْ:** سەرە نێزە ، تیـژی هەرشـتێك، گۆچان، گالۆك
**سَـنَّان السَـكَاكِين:** چەقۆتیژکـەر، چەقۆساز، چەقۆگەر
**سَنْبَاز:** بەردێکە شمشێری لەسەر ساو تیژ دەکرێ
**سُـنْبُك:** لێـواری سـم ، قەراغەکـەی، سەرەتای هەموو شتێك، دوورشتەبەند، پەیمانو رۆژگار
**سُنْبُك السَمَاء:** یەکەم باران
**سُنْبُك السَيف:** ئەم لاو لاکەی ، لاکانی ، قەراغو لێوارەکانی
**سُنْبُك مِن بَيضَـة الحَدِيـد:** قوتەکـەی ، سەروەکەی ، سەرەوەی
**سُنْبُك مِنَ الأَرض:** زەوییەکی رەقو کەم خێرو بێر، وشکە زەوی
**سُنْبُك مِنَ البُرْقُع:** دەزووی پەچە، ئـەو تالآنەی پێوەی شۆڕبوونەتەوە
**سَنْبَلَ الزَرْعُ:** گوڵیکرد، خونچەی کـرد، چرۆی دەرکرد
**سَـنْبَلَ الرَجُل ثَوبَـهُ:** شـۆڕیکردەوەو لەزەوی خشاند
**سُـنْبُل:** گوڵەگـەنمو جـۆ ، گیایـەکی بۆنخۆشـەو بۆنێکـی خۆشـی لێدەردەهێنرێ
**سُنْبُل بَرِيّ:** هـاس ، کـاردوو، گیایـەکی ئەستوورو کەنارییە گەڵاکانی دڕواویەو رەنگی زۆر سـەوزێکی تۆخـە لـەپاش زەردکردنی دەخورێ
**سُنْبُلَة:** یەك گوڵە گەنمو جـۆ ، یەکێکـە لـە (12) هەسـارەکەی ئاسمـانو بە(عذراء) ناو دەبرێت
**سَنْبُوسَق ـ سَنْبُوسَك:** جۆرە شیرینیەکە کەلە هەویرێکی ناسـکی بـەرۆن شـێلراو دروستدەکرێ
**سَنْبُوق:** کەشـتیەکی پچووك، کەشتیە گچکە
**سَـنَة:** سـالّ کـە(12) مانگـە، وشـکیو گرانی، زەمینی وشكو بێ گیا
**سِنَة:** وەنەوزدان، بوژانەوە، لەبیرەخەو چوون ، گورگەخەو، بەدانیشتنەوەخەو بردنـەوە، بیرەخـەو ، تۆنژیـن ، وەنـەوژە، خەوەنووچکـە، پینـۆك، خەوەکوتکە، وەنەوزە کوتە، ویژینـگ، خلماش
**سُنَّة:** فەرمان ، مێژوو، رێبـاز، رێـڕەو ، ناوبـانگ، شـەریعەت ، رێبـاز، بـاوەڕ ، ئاین ، یاسا ، یاسای سروشت

**سُنَّةُ الله**:ياساو دەستووری پەروەردگار سەبارەت بە دروستكراوەكانی
**سُنَّةُ النَّبِيِّ(ﷺ)**: ئەوەی دەدرێتە پاڵ پێغەمبەری خوا(د.خ) لەوتەو كردارو رەوش‌و رەفتارەكانی پێغەمبەر(د.خ)، هەروەها لەشەرعیشدا بریتیە لەكرداری باش لەئاییندا كەفەرز نییە بەڵكو بەویستی باوەڕدار خۆیەتی
**سَنَّةٌ**: كاسن ، گا ئاسن ، پاچ
**سَنَجَ الثَّوبُ**: پەڵەی بەركەوت ، لەكەی گرت
**سَنْجَةُ المِيزَان**: بەرد ، سەنگ ، قورسایی، ئەندازەیەكە لەبەرد یان ئاسن كەشتی پێ لەتەرازوودا دەكێشرێ
**سِنْجَابٌ ـ سُنْجَابٌ**: سمۆرە ، گیاندارێكی تیژی كێوییە لەڕێوی دەچێ بەڵام گەلێ پچووكترە پێستەكەی دەكرێ بەزۆر شت
**سِنْجَابِيُّ اللَّوْنِ**: خۆڵەمێشی
**سَنْجَقٌ**: بەڕێوەبەرایەتی ، لیوا ، یەكەیەكی نیشتەجێبوونی دانیشتوانە كەبڕی دانیشتوانی زۆر كەمترە لەشارو شارۆچكەو ئەم وشەیەش لەبنەڕەتا توركییە
**سَنَحَ الأَمْرُ أَوْ الرَّأيُ**: خستیەڕوو، دەریخست ، ئاشكرای كرد
**سَنَحَ لِي الشِّعْرُ**: هۆنراوە گوتنم بۆ فەراهەم هات
**سَنَحَ بِكَذَا**: خستیە روو بەڵام نەیدركاند
**سَنَحَ بِهِ أَوْ عَلَيهِ**: تەنگی پێ هەڵچنی یان خراپەو شەڕی پێكەیاند

**سَنَحَ فُلاَناً عَنْ كَذَا**: دووری خستەوە، پەراگەندەی كرد
**سَنَحَ الطَّيرُ أَوْ الظَّبيُ**: لەلای چەپەوە هات‌و بەرەو لای راست چوو ئەمەش سروشت‌و داب‌و نەریتێكی تافی نەفامی‌بوو لای عەرەبەكان
**سُنْحٌ**: پیرۆزیی‌و فەڕداریی، پیرۆزو فەڕدار
**سُنْحٌ مِنَ الطَّرِيقِ**: میانە ، ناوەڕاست، ناوەند
**سَنَحَتِ الفُرْصَةُ**: هەل هەڵكەوت ، دەست پەرژا
**سَنَحْتُهُ عَنْ رَأيِهِ**: وازی لەراو بۆچوونی خۆی پێهێنا
**سَنِخَ ـ زَنِخَ (نَتِنَ)**: بۆگەنی‌كرد، بۆنی‌كرد، گەنی، بۆنێكی ناخۆشی لێكەوتەوە
**سَنَخَ(سَنَاخَة ـ زَنَاخَة)**: بۆگەن ، بۆدڕ، بۆدڕن، بۆنی ناخۆش كە بەرانبەر هەراسان‌و نیگەران دەبێت پێی
**سِنْخٌ(أَصْل)**: بناغە ، بنك ، رەگ ، ریشە ، رەچەڵەك
**سِنْخٌ مِنَ الأَسْنَان**: رەگەكانی لەنێو پوك یان دەمدا
**سِنْخٌ مِنَ السَّكِين أَوْ السَّيف**: ئەملاولاكەی كەلە كێلان یان كیفدا ون دەبێت‌و رۆدەچێت
**سِنْخٌ مِنَ النَّصْلِ**: ئەو ئاسنەی كەدەكرێ بەسەری تیرو رمەوە
**سَنَدَ**: پاڵی‌پێوەدا، خۆی دا بەسەریا، فشاری خستەسەر
**سَنَدَ إلَيه**: پشتی پێ بەست ، گەڕایەوە بۆی‌و بەپاڵپشتی زانی

**سَنَدَ فِي الجَبَل**: سەرکەوت بەسەر شاخەکەدا، هەڵزنا پیایدا، پیایا سەرکەوت
**سَنَدَ للأَرْبَعين**: گەیی بەتەمەنی چل ساڵی، نزیك بوەوە لەچل ساڵی
**سَنَدَ الشَيء سَنْداً**: کردی بەپاڵپشتو گەڕایەوە بۆی، پشتی پێ بەست
**سَنَّدَ الشَيء**: پاڵپشتی کرد، پتەو تۆکمەی کرد، چەسپاندی
**سَنَدْ**: کۆڵەکە، پاڵپشت، پایە، پشتگیری، سەنەد، کۆمپیالە، بەڵگە، جۆرە جلو بەرگێکە، سەرپۆپەی شاخ، ئەوەی پشتی پێدەبەسترێ لەدیوارو پاڵپشتو ...
**سَنَدُ الحَديث**: ئەوانەی فەرموودە لەپێغەمبەری خواوە (د.خ) دەگێڕنەوە
**سَنْدَان**: دەزگا، دەزگاوبەرە، دەستگا، دەزگ، کارخانە، ئامرازێکی پانە لەئاسن یا لەدار دروست دەکرێ، سندانی ئاسنگەران یاخود درومانی لەسەر دەکرێ
**سِنْدَان**: مەردومی جەستەو لاشە بەهێزو پتەو، گورگی بەهێزو هەڵمەت
**سَنْدَانَة(أصيص)**: ئینجانە، شتێکی گڵینی سورەوەکراوە وەك بنکە گۆزە وایە گوڵی تیا دەڕوێنرێ
**سُنْدُروس**: سەندەلووس، سەندەلّ
**سُنْدُس(حَرير رَقيق)**: ئاوریشمی نەرم
**سَنْدَل**: گۆرەوی سۆلی لەپێکرد بۆ ڕاوکردن
**سَنْدَل**: گۆرەوی سۆل، باڵندە
**سِنْدِيان(بَلُوط)**: بەڕو، دەمەل، قۆپك، بەلوو، سێجۆر دار هەیە کەبەڕوو دەگرێ 1)دارەبەڕوو 2) مازوو 3)داڕوول

**سَنْسَنَ الرِيحُ**: هەڵیکرد بەساردی
**سَنْسَنْ**: تینوویەتی، لای پەراسوو
**سَنَطَ - سَنَاطَة**: کۆسە، بێ ڕیش، بێموو، لووسکە
**سَنْط**: ئەکاسیا، دارێکە لەشوێنی گەرم دەڕوێو بەزۆری لەمیسرو هەندێك وڵاتی عەرەبی هەیە
**سِنْط**: مەچەك، جومگەی نێوان لەپی دەستو مەچەك
**سُنْطُور**: سەمتور، ئامێرێکی مۆسیقیە لەقانون دەچێتو تاڵەکانی لەمسەو دەژەنرێ
**سَنُعَ - سَنَاعَة - سُنُوعاً**: بەرزبوەوە، بلندبوەوە، جوانو قەشەنگ بوو، جومگەکانی نەرم بوون
**سَنِفَ البَعير**: پێشکەوت، لەپێشەوە ڕۆیی، پێشڕەو بوو
**سِنْفُ**: پێلە، قەلاس، توێکڵی تۆو
**سَنْفَر(سَفَنَ)**: سمارتەی کرد
**سَنْفَرَة(سَفَنْ)**: سمارتەکردن
**سَنِقَ مِنَ الطَعَام أوْ الشَرَاب**: تێری خواردو، تێرتێر بوو
**سَنِقَ فُلان**: خۆشگوزەران بوو، لەنازو نیعمەتا ڕۆچوو
**سُنْقُر - سُنْقُور**: باڵندەیەکی دڕندەیە لەباز گەورەترو جوانترە
**سِنْکسَار**: کتێبێکە لەلای مەسیحیەکان باس لەژیاننامەی پیاوچاکانیان دەکات کەلەکەنیسە دەیخوێننەوە
**سَنْکسْرِيت**: زوبانی دێرینی هندیەکانە کەلە ڕشتەی زبانەکانی هیندو ئەوروپییە

**سَنِمَ البَعِيرُ:** کۆپارەی بەرزبوو

**سَنُمَ الشَّيءُ:** بەرز بووەوە، هەڵچوو، بڵندبوو ، باڵا بوو

**سَنَّمَ الشَّيءَ:** بڵاوی کردەوە لەسەر رووی زەوی

**سَنَّمَ القَبْرَ:** گۆڕەکەی بەرزکردەوە ، هەڵیبەست

**سَنَّمَ الإِنَاءَ:** پڕی کرد، لێوان لێویکرد، لێی ڕژا

**سَنَّمَ المِكْيَالَ:** پڕوقورسی کرد، هەڵی چنی لەسەری

**سَنِمٌ:** وشتری کۆپارە بڵندو بەرز ، گیای بەرزو هەڵچوو

**سِنَمَا:** وێنەی جووڵەدار لەسەر ڕوپای شاشە ، ئەو شوێنەی نمایشی فیلمی تیا دەکرێ

**سِنَمَاتوغراف:** ئامێرێکە وێنە جووڵاوەکان دەخاتە سەر شاشەو بینەر دەیبینێ

**سِنِمَّار:** مانگ، ئەوپیاوەی شەو ناخەوێت، دز ، جەردە

**سِنِمَّارُ:** بەنایەکی ڕۆمییە کەوا کۆشکێکی بۆ نوعمانی لەخەمی دروستکرد بەڵام نوعمان لەپاداشتی ئەوکارەدا لەسەرووی کۆشکەکەوە فڕێی دایە خوارەوە هەتا وێنەو هاوچەشنی ئەو کۆشکە بۆکەسی‌تر دروست نەکات ئەمەش بوو بەپەند لای عەرەبەکان‌و بۆ پاداشتی کارێکی چاك بەخراپە بەپەند دەیهێننەوەو دەڵێن: پاداشت درایەوە هاوچەشنی (سِنِمَّار)

**سَنَمَةٌ مِنَ النَّبَاتِ:** ئەو ڕووەکەی سەر دەردەهێنێ‌و هەڵدەچێ

**سَنَمَكِيٌّ (نَبَاتٌ وَرَقُهُ مُسْهِل):** سینەمەکی ، سینامەکی، گیایەکی گەرمیانی‌یە گەڵاکەی وردو درێژکۆڵەیە بۆ ڕەوانی دەخورێ

**سَنْمُورَةٌ:** جۆرە ماسیەکە

**سَنَّنَ السِّكِّينَ:** تیژیکرد ، وای لێکرد ببڕێت

**سَنَّنَ كَلاَمَهُ:** جوانی کرد، ڕێکی‌خست، دای ڕشت

**سَنَّنَ الرُّمْحَ:** سەرونوکی بۆ دانا، نێزەی تێکرد

**سَنَّنَ الرُّمْحَ إِلَيْهِ:** ڕووی تێکرد، ئاراستەی روو بەو دانا

**سَنَّنَ الشَّيءَ:** ددانی بۆ دانا وەك ددانی مشارو ...

**سَنِهَ الطَّعَامُ أَوْ الشَّرَابُ:** بۆگەنی‌کرد، گۆڕاو بۆگەنی کرد

**سَنِهَ النَّخْلَةُ:** چەندین ساڵی بەسەرا هات ، چەن ساڵ تێپەڕی بەسەریا

**سَنْهَاء:** ساڵێکە باران نەبارێت‌و گژوگیا نەبێت، دارخورمایەك ساڵێك بەرووبووم دەگرێ‌و ساڵێکی‌تر نایگرێ

**سِنَّوْر:** پشیلە ، کتك، کتە، کتتە، پشی، پسك، پسنگ، پشۆ، دەلك، پشە، گوربە، گیاندارێکە لەوێنەی پڵنگ بەڵام پچووکترەو مێملی مشك‌و جووجەڵەو ...

**سَنَوَّرٌ:** گەلەچەکێك ، جل‌و بەرگێکە وەك زرێ وایە لەبەر دەکرێ

**سَنُونٌ:** دەرمانی شتنی دەم‌و ددان ، ئەوەی سیواکی پێدەکرێ، دەم‌و ددان پاککەرەوە

**سُنُوتُو:** جۆرێکە لەپەرەسێلکە

**سَنَوِيٌّ:** سالآنە ، موچەیەکە سالەو سالٓ بدرێ بەیەکێك ، خێرێکە دەکرێ بۆ مردوو لە پاش تێپەڕینی سالێك بەسەر مردنیا

**سَنِيَ:** مەزن، بەرز، بلند، خاوەن شکۆ، رووناك،درەوشەدار، دەرەوشان، تابان، درەخشان

**سَنِيحٌ:** مرواری ، دوڕو مەرجان

**سَنِيدٌ:** زڕکوڕ، منالێك هی باوك نەبێت

**سَنِيمٌ:** پایە بەرز، پلەدار، خاوەن مەرتەبە

**سَنِينٌ:** ئەوەی لەبەرد دەبێتەوە کاتی کڕاندنی ، ئەو زەوییەی روەك و گژوگیاکەی خورا بێت

**سَنِينُ الْمَرءِ:** هاوزا ئەو منالآنەی بەیەکەوە لەدایك بوون ، هاوسالٓ ، هاوبوون

**س هـ**

**سَهَا فِي الأمْرِ وَعَنْ الأمْرِ:** لەبیری چوو، سەهوی کرد، هەڵەیکرد، دڵی باریکرد بەلایەکی تردا

**سَهَا فِي الصَلاَةِ:** بەشێکی لەبیرکرد تیایدا ، بەشێکی لەبیرکردو نەیکرد

**سَهَا عَنْهَا:** وازی لێهێناو نەیکرد، نوێژی تەرك کرد

**سَهَا إلَيْهِ:** بەهێمنییەوە تەماشایکرد

**سَهَا فِيهِ:** بەبێ هەوالٓو زانیاری بەجێی هێشت

**سُهَا:** هەسارەیەکی پچووکەو تیشکێکی کزی شاراوەی هەیە

**سُهَادٌ:** بێداریی، خەوزڕان، بێخەوی، شەونخونی

**سَهَارٌ:** بێدار ، بەخەبەر، بەئاگا ، خەولێنەکەوتوو، ئەوەی خەو ناچێتە چاوەکانیەوە

**سُهَارٌ:** بەئاگاو بێداریی بەهۆی نەخۆشی یان غەمو پەژارەوە

**سُهَافٌ( عَطَشٌ شَدِيد ):** تینوویەتی، توونیەتی،تهنی،ئارەزووی خواردنەوەی ئاو کردن

**سُهَامٌ( حَرُّ السَمُوم ):** قرچەی گەرما ، گەرمەی شەرا، گەرمای گڕە، قرچەی هاوین

**سَهَامٌ:** تەنافی شەیتان ، نەخۆشیەکە دەدات لەوشتر

**سَهَبَ الشَيءَ:** بردی ، هەڵی گرت

**سَهْبٌ:** بیابان ، سارا

**سَهْبٌ مِنَ الأرْضِ:** زەوی دوورو رێکساز

**سَهْبٌ مِنَ الخَيلِ:** ئەسپی تیژڕەوی خێراو گورج، ئەسپێك بەفراوانیو خێرا بڕوات بەڕێوە

**سُهْبٌ ـ سُهُبٌ:** زەوی دووری رێكو تەختو هەموارو لەبار

**سَهْبَةٌ:** بیرێکی قوولٓ ، قوڵە بیر

**سَهِدَ:** خەوی زڕا ، شەونخوون بوو، خەوی لێنەکەوتو هەر بەئاگابوو ، خەوی کەم بوو

**سَهَّدَ( أرَقَ ):** خەوی زڕان ، لەخەوی‌کرد، بێداری کرد

**سُهْدٌ ـ سُهَادٌ:** بێداریی ، بەئاگایی ، خەوزڕان ، بێخەوی ، شەونخوونی ، خەو دوورکەوتنەوە، خەوڕەوین

**سُهُدٌ:** کەم خەو ، بەئاگاو بێدار، خەو لێنەکەوتوو، بیر تیژ

**سَهَدَة( يَقظَة )**: بێداریی ، بەئاگایی، بەخەبەری، بێخەوی، وشیاریی، وریایی

**سَهِرَ**: شەو بەئاگابوو، نەنووستن ، شەونخوونی کرد، وریاو وشیاربوو، بێداربوو، خەوی لێنەکەوت

**سَهِرَ عَلَى**: ئێشکی گرت ، شەونخوونی کێشا ، هەر بێدارو بەئاگابوو

**سَهَّرَ**: نەیهێشت بنوێ، بەبێداریی‌و بەئاگای هێشتیەوە

**سَهَرٌ**: شەونەنوستن ، شەونخوونی، خەوزڕان،بێداریی،بەئاگایی ، هوشیاریی

**سَهْرَانُ**: بێدار، بەئاگا ، بەخەبەر، شەونخوون، نەنوستوو، هوشیار، وریا، زرنگ، چاو لێك نەنان

**سَهْرَة( حَفْلَة لَيلِيَة )**: ئاهەنگ، بەزمی شەو ، ئاهەنگی شەو ، بەزم‌و ئارەزوو دەرکردن لەشەودا ، شەو ڕۆژکردنەوە بە شایی‌و ئاهەنگ گێڕان

**سَهِفَ**: زۆری تینوو بوو، تنووی بوو

**سَهَفَ الدُّبُّ**: هاواری کرد، نەڕاندی ، دەنگی لێبەرز بووەوە

**سَهِكَ ـ سَهَكاً**: بۆنی ناخۆش بوو، بۆن ناخۆش بوو

**سَهِكَ فُلانٌ**: ئارەقی کردەوەو بۆنێکی ناخۆشی بڵاوکردەوە

**سَهَكَت الرِّيحُ**: گەردەلوولی هەڵکرد

**سَهَكَتِ الدَّابَةُ**: بەخێرایی ڕۆیشت ، تیژڕەو بوو

**سَهَكَتِ الشَّيء**: کوتی بەڵام پانی نەکردەوە، لێدا بێئەوەی بێ پلیشێنێتەوە

**سَهَكَت الرِّيحُ الأَرْضَ**: زەوی ماڵی ، رووتەنی کرد، دایماڵی

**سَهَكَت الرِّيحُ التُّرَابَ عَنْ الأَرْضَ وَغَيرَهَا**: بردی بەئاسماندا ، بەرزی کردەوە

**سَهْكَةٌ**: بۆنی ناخۆش ، بۆگەنی ، بۆدڕی

**سَهُلَ ـ سُهُولَة**: ڕووبە نەرم‌و نیانی بوو، ڕەقی‌و زبری کەم بووەوە

**سَهُلَ المَكَانُ**: شوێنێکی ئاسان بوو، سانابوو، سووك بوو

**سَهُلَ الأَمْرُ**: کارو بارەکە ئاسان‌و سانابوو، سووك بوو، بەنەرم‌و گونجاوی هاتە بەر

**سَهَّلَ الأَمْرَ لَهُ وَعَلَيهِ**: کاروبارەکەی بۆ ئاسانکرد، بۆی ئاسان بوو، بۆی سووکبوو ، بۆی رام بوو

**سَهَّلَ المَوْضِعَ**: شوێنەکەی نەرم کرد، نیانی‌کرد، ئاسانی‌کرد

**سَهْلٌ**: ئاسان ، سووك ، سادە ، ئاسایی، ڕەوان ، گونجاو ، لەبار

**سَهْلُ الإِسْتِعْمَالِ**: بەکارهێنانی ئاسانە ، بەئاسانی بەکاردێت

**سَهْلُ الهَضْمِ**: سووك هەرس ، ئاسان‌و سووك هەرس دەبێت

**سَهْلُ الوَجْهِ**: دەم‌و چاو باریك‌و کەم گۆشت

**سَهْل ـ سَهْل**: نەرم‌و نیانی هەر شتێك

**سَهْلُ الأَرْضِ**: زەوییەکی درێژو ڕێك‌و نەرم

**سِهِلٌ**: خۆڵێکی وەك لم وایە بەدەم ئاوەوە دێت

**سِهْلَة**: ليتاو ، ليبتاف، قوڕاوێكی شله
**سَهَمَ ـ سَهُمَ**: ڕەنگی گۆڕا بەهۆی لاوازییەوە
**سَهَمَ وَجْهَه**: ڕووی گرژكرد، دەموچاوی دا بەیەكا، عەبوس‌و ڕووترشاو بوو
**سُهِمَ**: گڕەو گەرمای هاوین لێیداو ڕەنگی گۆڕی ، بەزۆر برا بۆ شەڕو جەنگ
**سَهْم( نُبْلَة )**: تیر ، قوتوبان، پەرداخی قومارو لگاو، یەك تیر
**سَهْمٌ نَارِيٌ**: فیشەكە شێتە
**سَهْمُ الرَّامِـيْ**: هەسارەیەكە لەسەر شێوەی كەوان
**سُهُمْ**: هێڵەكانی تیشك‌و ڕووناكی، گەرما ، هالاو، تین ، عاقڵ‌و ژیر ، داناو زانا، تینوێتی‌و گەرمایەكی سەخت‌و گران
**سُهْمَان**: شانس ، بەش ، چارەنووس
**سُهْمَة**: خزمایەتی، خۆێشایەتی، نزیكی، دۆستایەتی
**سَهُوَ ـ سَهَاوَة**: نەرم‌و نیان‌و بەئارام بوو، كار ئاسان‌و ڕەفتار نەرم بوو، هێمنی ، خامۆشی
**سَهْوَاءٌ**: كاتژمێرێكە لەشەو یان بەشێك لەشەو یاخود سەرەتای شەو
**سَهْوَة**: تاق‌و ڕەفە كە شتیان تێدا دەنرێ، دالآن، ڕاڕەو ، بەرد، دەوارێكە عەرەب بۆ حەوانەوە دروستی دەكەن لەسەر لێواری ئاو ، گەنجینە
**سَهُول**: دەرمانی ڕەوانی
**سُهُولَة( هَـوْن )**: ئاسایی، سووكی، بێ‌ماندوبوون
**سُهَيْل**: گەلاوێژ ، ئەستێرەیەكە لەنێوەڕاستی هاویناندا پەیدا دەبێ دوا بەدوای پەیدابوونی فێنكی دادێت‌و گەرما دەڕەوێتەوە

## س و

**سَوَّى الشَّيْءَ**: ڕاست‌و بەرابەری كرد ، هاوتای‌كرد، بەرانبەر بەیەك ڕایگرتن ، ڕێكی كردەوە ، ڕاستی كردەوە
**سَوَّى بَيْنَهُمَا**: دادپەروەری كرد لەنێوانیاندا، دادو یەكسانی كرد
**سَوَّى الطَّعَامَ وَنَحْوَه**: پێی گەیاند، ئامادەی كرد
**سَوَّى الأَرْض**: تەختی‌كرد، ڕێكی كرد
**سَوَّى البِنَاءَ بِالأَرْض**: ڕووخانی، هەڵیوەشان ، تەختی‌كرد
**سِوَى( غَيْر )**: بێجگە ، جگە ، بەدەر لە، دوور لە، بێ
**سُوَى**: بەدیی ، خراپی ، نالەباریی ، ناڕەسەنی، ئاگر ، سەختی‌و بەلآ
**سِوَاء ـ سُوَاء**: هاوچەشن ، هاوشێوە، بەرابەر، وەك یەك، یەكسانی، تەخت ، میانەی هەرشتێك، مەبەست، ویست
**سَوَاءَ السَّبِيل**: ڕێگەی ڕاست ، ڕێی دروست‌و گونجاو، شەقامە ڕێ
**سِوَاء مِنَ الأَرْض**: ئەو زەوییەی خاكەكەی وەك لم وایە، ڕێك‌و تەختە زەوی
**سَوَائِل**: شلەمەنی ، پێچەوانەی كانزاو تەنە بەستوەكانە
**سَوَابِح**: ئەسپی تیژ ڕەوو خێرا
**سَوَابِغ**: ئەو وشترانەی هەفتەی یەكجار دەیانباتە سەر ئاو

**سَوَاة:** عەورەت، شوێن شەرم ، بەدیی، خراپە، نالەباریی
**سُوَاخ ـ سُوَاخِي:** ئاووگڵی تەنك ، ئاوو گڵێك قوولْ نەبێت
**سُوَاد:** نەخۆشیەکە دەدات لەددانەکان‌و زەردی دەکات
**سَوَاد:** رەشـی ، پێچەوانـەی سـپی ، زوربە، زۆرینە، زۆرێتی
**سَوَادُ العَينِ( حَدْقَتَهَا ):** گلێنـەی چاو ، رەشێنەی چاو، رەشکێنەی چاو، کانی چاڤ، کزن ، شتێکی خڕی توێتوێیە لەناو کالانەی چاوا کەبیلبیلەی تیایە
**سَوَادُ المَدِينَة:** لادێ‌و ئاوای دەوروپشتی شار ، ئەوەی لەدەوری شارە لە دەشت نشین‌و لادێکان
**سَوَادُ اللَيل:** تاریکایی شەو
**سَوَادُ الأَعْظَم:** زۆرینـەی مـەردوم ، زوربەی خەڵك
**سَوَادُ القَلْب:** لەکـەو رەشـی دڵ، دڵ پیسی
**سَوَادُ النَّاس:** رەشـە خـەڵك ، زوربـەی خەڵك ، زۆرینەی خەڵکی
**سَوَادُ البَطْن:** جگەر ، هەناو
**سُوَادِيَّة ـ سُودَانِيَة:** پەلەوەرێکە خورماو ترێ دەخوات
**سِوَار:** بازنگ،دەستەوانە، دەست بەند، بـازن ، بازبـەند، دەسـبەن ، تـەووق ، چەمەری دانەلغاو ، لەزێڕو زیـو کانـانی تر دروست دەکرێت
**سَوَار:** ئـەوەی مــەی یـاری بەعــەقڵی دەکات
**سَوَّاط:** ئـەو پۆلیسـەی دار حـەیزەران یان قامچی بەدەستەوەیە

**سُوَاع:** بەشێك یان ساتێك لەشەو
**سُوَاع:** بتێکە لە قورئانی پـیرۆزدا نـاوی هـاتووەو نەتەوەکـەی نـوح (د.خ) دەیانپەرست پاشان بۆ (هذیـل)یـان (هیمدان) مایەوە
**سِوَاغ:** ئـەوەی گـەروو یان بینـی پـێ ساف دەکرێ
**سَوَاف ـ سُوَاف:** دەردە ئـاژەڵ، نەخۆشی‌و درمە ئاژەڵ
**سَوَافِع:** بـای گـەرم‌و خنکێنـەر، گـڕە، شەرای گەرم‌و سووتێنەر
**سُوَاق:** لاق درێـژ ، ئـەو روەکـەی هەڵدەچێ‌و بەرز دەبێتەوە
**سَوَّاق:** شۆفێر، سـایەق ، فرۆشـیاری ئاردی سفر یان ئەوەی دروستی دەکات
**سِوَاك:** سـیواك ، کورتـەدارێکی باریکە سـەرەکەی دەکوتـن‌و موسـوڵمان لەدەمی دەژنێ
**سُوَام:** باڵندەیەکە
**سَوَام:** وشـتری لـەوەڕێنراو ، وشـتری چرێنراو
**سَوَّأ:** خراپی‌کرد، تێکیدا، شێواندی
**سَوَّأ عَلَيه عَمَلَه:** سەرزەنشـتی کـرد، نـەنگی کـرد، پێـی تێکـدا ، تانـەو تەشـەری لێگرت ، پـلاری گرتـە کـارو پیشەکەی
**سُوء:** خراپە ، بەدی، زیان ، نەگریسی، نەگبەتی، چوختێتی
**سُوءُ الإسْتِعْمَال:** خـراپ بـەکارهێنان، بەدیی بەکارهێنان، باش بەکارنەهێنان
**سُوءُ التَّصَرُف:** رەفتـار خراپـی، بـەد رەفتاریی

**سُوءُ التَّغْذِيَة**: بەد خۆراکی ، خراپ خۆری

**سُوءُ الخَط**: بەدبەختی، بەدنگینی، بیٚشانسی

**سُوءُ الخُلُق**: بەد رەوشتی، خراپی هەڵسوکەوتو رەوشت

**سُوءُ السلُوك**: خوو خراپی، بەد رەوشتی

**سُوءُ الظَنّ**: بەدگومانی، گومانی خراپ بردن

**سُوءُ الهَضْم**: بەد هەرسی ، ترخە ، گرفت

**سُوءُ الفَهْم**: خراپ تێگەیشتن ، بەدیی بۆ چوون، بەد ڕایی

**سُوءُ النِيَّة**: نیاز خراپی، بەدنیهاد، بەدویست

**سَوء**: خراپە، بەدی، گێرەشێوێنی، کرداری ناشیرین، بەد رەفتاریی ، نالەباریی ، نا رەسەنی

**سَوْءة**: شوێن شەرم ، عەورەت ، خوی خراپ ، نالەباریی، ناڕەسەنی

**سَوَّج**: پەرژێکی لەدەوری رەزو باخە مێوەکە دروست کرد، دەوری گرت بە پەرێز ، سنوورداری کرد

**سَوْحَر**: درەختی ، بی، دارەبی ، دارێکە بیٚبەرەو پێنج جۆرە 1)دارەبی 2)شەنگەبی ، شۆڕەبی 3)زەردەبی 4)رەشەبی 5)شۆرەبی گەلای تاڵو باریکو درێژی هەیە

**سَوِدَ ـ سَوْداً**: رەش بوو، رەش داگیرسا

**سَوَّدَ تَسْوِيداً**: رەشی کرد

**سَوَّدَ الرَّجُل**: گەورەی کرد، کردی بەسەردار ، بەسەروەر داینا

**سَوَّدَ المَكْتُوب**: نووسیەوە، رەش نووسیکرد

**سَود**: ڕوپایەکە لەزەوی کەبەردی رەشی زۆرە

**سُود**: سەرداریی، سەروەریی، گەورەیی، پێشرەویی، روەکێکە

**سَوْدَاء**: ماخۆلان ، ماخوولیا، سەوداسەریی، گراویی، دڵداریی، دێوانەیی، حەبداڵی، گێژیی، خەمخواریی، نەخۆشییەکە تووشی هەرکەسێك ببیٚ هەمیشە ئەندامی دەجووڵیٚ

**سُودَان**: زنج، رەش پێست ، قول، قولە رەش ، زەنگی

**سُودَانِيّ**: خەڵکی ولآتانی سودان ، سوودانی

**سُودَة**: پارچە زەوییەکی هەموارو لەبارە

**سُودَدَ ـ سُودَد**: پایەدار، خاوەن پلەو پایە، بەنرخ ، توانا

**سَوْذَق**: باز ، شاهێن

**سَوْذَل**: بخۆر ، ئارەق خۆر ، مەی خۆر

**سَوْذَق**:دەست بەند، بازن ، ئەڵقەدەست

**سَوْذَنِيق**: باز ، شاهێن

**سَوَّرَ الحَائط**: سەرکەوتە سەر دیوارەکە، بەدیوارەکەیا سەرکەوت، پیا هەڵزنا

**سَوَّرَ المَدِينَة**: پەرژینی بۆ دروستکرد، سنورێکی بۆ دانا ، دەوری گرت

**سَوَّرَ المَرأة**: بازنی لەدەست کرد، بازنیکردە دەست

**سُور (حَائِط ـ جِدَار):** دیوار ، تـەیمان ، شـــــوره، بندیـــــوار، پالقـــــانچك ، بارستاییەکی ئەستووری رێکی بەرزە دروست دەکرێ لەخشـتو قـوڕ یـان بەردو گەچ
**سُوْرَة:** سـوورەت ، بەشێك لـەقورئانی پیرۆز ، پلەوپایە، شکۆداریی ، نیشانە، هێمـا، ئـەوەی هـەڵدەچێ لـەبیناو.. بەرەو ئاسمان
**سُورَةُ مِنَ المَجْدِ:** تونـدی، نیشـانەی، بەرزبوونەوەی ، وێنایەك لە شكۆمەندی
**سَوْرَةُ مِنَ السُلْطَان:** ستەمو زۆرداریـی ، جەور ستەمی سوڵتان
**سُــورَنْجَان ـ سَـــورَنْجَان:** روەكێكـــە بـــەکاردەهێنرێ بـــۆ ئێـــشو ژانـــی جومگەکان
**سَوِسَ الحَبُّ وَغَيرَهُ:** خواردنەکە کـرم تێیدا
**سَوِسَ الحَيَوَان:** ئەسپێ یان گەنە تێیدا
**سَوَّسَ لَـهُ الأَمْرَ:** شـیرینی کـرد لای ، جوانیکردو بردیە دڵیەوە
**سُـوس ـ سُوسَـة:** مۆرانـە ، مۆریـــان ، خـــوورك ، خـــرك ، مرکـــە ، مۆرکـــە ، گیبوە ، مۆرانەی زەویو خاك
**سَوْسَـنْ ـ سُوسَـنْ ـ سُوسَـان ـ سوَاسِـنْ:** شـلێر، گوڵەشـلێر، گـوڵ بـزن ، هەڵاڵـە برایمە ، گوڵێکی بەهارییە گوڵـی وەکـو لاولاوو بنەکەشـی وەکـو سـەلکە پیـاز وایە
**سَوَّطَ الأَمْرَ:** تێکـەڵی کـرد، دای بەسـەر یەکا ، شێواندی بەنێو یەکدا
**سَـوْطَ الحَـرْبِ:** روو بـــەرووی چـــوو، ئەنجامیدا ، کردی

**سَوْطَ الكُــرَاتْ:** قامچیەکـەی دەرهێـنا ، لەکیفەکەی دەری هێنا
**سَــوْط (مِجْلَـدَة):** قـــامچی ، جـــەڵدە، تازیانە، تاژانك ، چـەرمێکی هۆنراوەیە بـۆ لێدانـــی ولاخـــی ســـواریو مـــرۆڤ بـــەکاردەهێنرێو لەتـــەلیش دروســـت دەکرێ
**سَوع ـ سُوَاع:** بەشێك لەشـەو ، چـەن ساتێکی شەو
**سَوْعَاء:** تونـد، نارەحـەت ، سـەخت ، گران ، نالەبار
**سَوَّعَ الأَمْرَ:** گونجاندی ، رێکیخست ، شیاندی
**سَوَّغَ لَهُ كَذَا:** پێیداو بەتەنیا بۆ ئەوی مۆڵکرد
**سَــوَّفَ:** ئــەمرۆ بەســـبەی پێکـــرد، دوایخست
**سَوَّفَ الأَمْرَ:** وتـی دەیکـەم ، دوایخست بۆ کاتێکی نادیاریکراو
**سَوْفَ (حَرْفُ إِسْتِقْبَال):** دەبـێ ، بوونـی دوایی بەمانای دواخستن دێت
**سَوْف:** ئارامگرتنو چاوە چاوەی شتێك
**سُوفَة:** زەوییەکی لماویو خڵتەو خۆڵ
**سُوفسْطَائيِ:** گرۆهێکە بەرپەرچی شـتە هەســـت پێکـــراو بەدیـــهێنراوەکان دەدەنەوە، خەیاڵگەران
**سَوَق:** لاسکی ناسكو نیان بوو
**سَــوَّكَ الأَمْــرَ:** خـاوەنداری بـوو، بـوو بەموڵکی
**سَوَّقَ النَّبْتُ:** قەدیکرد، قـەدوبالایکرد، هەڵچوو، دایە بالا
**سَوَّقَ المَاشِيَةَ:** لێی خوڕی ، تێی خوڕی

**سُوقْ:** بازاڕ ، بازێڕ، چەن دوکانێکە کەشوێنی کڕینو فرۆشتنی تێدابێ
**سُوقْ خَيرِيَة:** بازاڕی خێری، بازاڕی خێر گەیەن
**سُوقْ رَاقِدَة:** بازاڕ مردوو، بێبازاڕی، بازاڕ ساردیی
**سُوقْ مُتَّطَارَة( نَشِيطَة ):** بازاڕ گەرمی ، گەرمو گوڕی فرۆش
**سَوَقْ:** درێژی لاق ، لاق درێژ
**سَوْق:** ناردن ، ڕەوانەکردن
**سُوقَة:** خەڵك ، گەل ، نەتەوە، جەماوەر
**سَوْكَ:** پاکی کردەوە ، پروانی
**سَوْكَ الأَسْنَان ( نَظَّفَها ):** شتیو پاکی کردەوە، فڵچەی لێدا، بەسیواك پاکی کردەوە، سیواکی کرد
**سَوْكَرَة سَوْكَرَةً:** پەیمانیدا ، دەستەبەریکرد، بارمتەداریی بوو
**سَوِلَ:** سست بوو، خاوبوەوە
**سَوِلَ الظَّنْ:** ورگی شۆڕبوەوە، ورگی داکەوت
**سَوَّلَ لَهُ الشَّرُ:** بۆی جوانکردو ئاسانیکرد، هەڵی خەڵەتاند
**سَوَّلَ لَهُ الشَيطَان:** شەیتان پێی کرد، فریویدا
**سَوْلاء:** دۆڵچەیەکی گەورە، دەبەیەکی زلەو گەورە
**سُولاَر:** شلەمەنیەکە زووگڕ دەگریو لەنەوت دەردەهێنریو چڕی کەمترە لەوزەی دیزل
**سَوَّلَتْ لَهُ نَفْسُهُ:** خۆی فریودا ، خۆی بەخۆی کرد ، نەفسی پێی کرد

**سُولَة:** پرسیارکەر، ئەوەی زۆر پرسیار دەکات
**سَوْلَعْ:** ئارام گرتنێکی تاڵو ناخۆش ، گرژە ئارام
**سَوَّمَ الأَمْرَ:** پێی سپارد، خستیە ئەستۆی، سپاردی بەو
**سَوَّمَ الخَيلَ:** ناردیو ئەسپ سوارەکانیشی بەسەرەوە بوو
**سَوَّمَ فُلاَناً:** سەرپشکیکرد چی دەوێت بیبات
**سَوَّمَ فُلاَناً فِي مَالِه:** دادگایی کرد ، دادوەریی کرد
**سَوَّمَ عَلَى القَوم:** هێرشی بردە سەریان، هەڵمەتی بۆ بردن
**سَوَّمَ الشَّيء:** نرخی بۆ دانا ، نرخی بڕی، نرخی دیاریکرد
**سُومَة:** نیشانەو هێما ، نرخ ، بەها
**سَوِيّ الرَّجُل:** چەسپا ، جێگیربوو، سەقامگیربوو، کارو بارەکانی گەیشتن بەپایان
**سَوِيّ( مُمَهَد ):** تەخت ، تەختان ، سازێنراو، ئاسانکراو، لەبار، گونجاو، ڕەخساو، هەموار
**سَوِيَّة( مَعَاً ):** پێکەوە، بەیەکەوە ، وێکرا، وێرا، لەگەڵ یەك ، پێکرا ، لەسەریەك، پێکڤە، دهەڤدە، دگەل هەڤ ، بهەڤ ، پەڤ ، پشەهەڤ، بتەڤایی، ڤێکرا
**سَوِيَّة:** مۆکارێکی سواربوونی لانەوازو بێ نەوایانە، میانەڕەوی، دادپەروەریی، ڕاخەرێکە وەك ئەڵقە وایە دەکرێتە سەر پشتە کۆڵی وشتر

**سُـوَيْداء:** مـاخۆلان ، ماخوولیـان ، بێتۆقرەیـی ، نەخۆشـیەکە مـرۆڤ والێدەکات لەهیچ شوێنێك جێ بەخۆی نەگرێت

**سُوَيْداء القَلب:** نـاخی دڵ ، نـاخ ، نێو جەرگەی دڵو دەروون

**سَويط:** تێکـەڵ ، ئاوێتـە ، تێکـەڵاو، تێکڵ، بەندیواری، تێکڵهەڤ

**سُـوَيْعَة:** سـەعاتێکی پچـووك ، کاتژمێرێکی گچکەو پچووك

**سُوَيق:** ئاردی زۆر ورد ، ئاردی سفر

**سُوَيقَة:** بـازاڕی پچکۆلـە ، بازاڕۆکـە ، بازاڕێکی گچکەو خنجیلانە

**سي**

**سي:** دەشتو بیابان

**سي:** لێك چـوو، وەك یـەك ، هاوشـان ، هاوتا، هاوجۆر ، هاورەنگو شێواز

**سَيَاب ـ سَيَّاب ـ سُيَّاب (بَلح):** خورما ، دەنکە خورما

**سَيَابَة:** مەی ، بادە ، شەراب ، ئارەق، ماددەی سەرخۆشکەر

**سَيَّاح:** گەڕۆك ، گەشتیار، کەسێکە زۆر بگەڕێو ئەملاولا بکات

**سِيَاحَة:** گەشـت ، گـەڕان ، سـەیران ، گوزار، سێران ، پێگەرمۆك ، تەماشا

**سِـيَادَة:** گـەورەیی ، شـکۆمەندی، دەسـتەڵاتداریی، فـەرمانڕەوایی، حوکمداریی، سـەرکەوتن ، زاڵبـوون ، بوون بەباو

**سَيَّار:** گەشتیار ، گەڕۆك

**سَيَّارَة:** ئەسـتێرەی گـەڕۆك ، هەسـار، ئەستێرە، هەسارەی گەڕۆك ، کاروان ، ئۆتومبیل ، ماشێن ، گەڕێن، سەیارە

**سِيَاسَة:** رامیـاریی، بـەڕێوەبردن، رابەری، سەرەوکاریی ، دراوسێ داریی، رابەرایەتی کردنی خەڵکی بەڕێنومایيان بۆ رێگەی سـەرفرازی لـەدەمی ئێسـتاو داهاتوودا

**سِيَاسَة السُوق الحُرَّة:** بریتیـە لەهەڵسوکـەوتو رامیـاریی بانکـە نێوەندیەکان لەفرۆشـتنی دراوو ئـاڵو وێڵکردن پێوەی ئەمەش بۆ زیـادکردنی رێژەی دراو یان کەمکردنەوەی لەبازاڕو بەردەستی مامەڵە پێکەراندا

**سِيَاسَة المَدَنِيَة:** دابینکردنـی بژێـوی هاوکـات لەگـەڵ پارێزگـاری کـردن لەبنـەماو رێسـاکانی دادپـەروەریو جێگیربوون

**سَيَّاف:** شمشێر وەشێن

**سِـيَاق:** شـوێنکەوتن ، ریزبەسـتن ، میانە، ئاژواندن، راندن

**سِيَاق الحَديث:** بـەدەم قسـەوە، لـەنێو گفتوگۆدا، لەمیانەی قسەکاندا

**سِـيَاقَة:** لێخوڕیـن ، ئـاژۆتن ، بـردن بەڕێوە

**سَـيَّال:** ئـاوی خـوڕ، ئـاوی لەبـەر رۆیشـتوو، جـۆرە ماسـیەکە، دارێکـی چروپـڕە ئەندازەیـەکی مامنـاوەندی هەیـەو لـەدەباغکردنی پێسـتەدا توێکڵەکـەی بـەکاردەهێنرێ لـقو پۆپەکانیشـی لووسـە، لەمیسـرو حەبەشـەو چـەن ولاتێکـی عـەرەبی دەروێت

**سَيَّالَة:** ئـاوێك لەبـەری بڕوات ، ئـاوی لەبەر رۆیشتوو

**سَيَّان:** وەك يەك ، چوون يەك ، هاوشێوە ، لەيەك چوو

**سَيَّانٌ عِنْدِيَ:** هاوشێوەن لای من ، هاوتان لای من ، وەك يەكن لای من ، چوون يەكن بۆ من

**سَيِّء:** خراپ ، نابار، بەد، بەنامو نەنگ، بێ كەڵك

**سَيِّءُ التَّرْبِيَةِ:** بەد پەروەردە، بێڕەوشت ، بێ تەربیەت

**سَيِّءُ الحَظِّ:** بەدبەخت ، چارە رەش، بێشانس ، بەدنگین

**سَيِّءُ السُّمْعَةِ:** بەد ناوبانگ، يەكێك ناوبانگو كەسێتی لەكەداربێت ، ناوزڕاو، ناو خراپ

**سَيِّئَة:** گوناه ، تاوان ، بەدی، خراپە ، بەد رەوشتی ، سووچ

**سَيْب:** ڕۆيشتن ، ڕۆيين ، ڕاكردن ، خشان ، بەخشين ، بارانێكی خوڕو بەردەوام ، ماڵێكی شاراوە لەژێر زەويدا ، كلكی ئەسپ

**سَيَّبَ العَبْدُ:** ئازادی كرد ، سەربەخۆیكرد، سەربەستیكرد ، رزگاری كرد

**سَيَّبَ:** وازی هێنا ، بەجێیهێشت، دەست بەرداری بوو، كۆچیكرد، فەرامۆشیكرد، خستیە پشتگوێ، شلی كردەوە، خاوی كردەوە، ئازادیكرد

**سيب:** ئاوەڕۆ، سێو

**سِيَةُ مِنَ القَوْس:** ئەوەی چەماوەتەوە لەهەردوو لای تیروكەوان

**سَيَّجَ البُسْتَانُ:** پەرژينیكرد، تەيمانی كرد، چەپەری كرد، شورای كێشا ، سنووورداری كرد

**سِيجَارَة:** جگەرە ، جغار ، سيغار، جخارە

**سَيْجَان:** جۆرە ماسيەكە

**سَيَّحَ:** ئاوەكەی كردەوە، بەريدايەوە

**سَيْح:** بەراو، ئاوەنيا، ئاويە، ئاوپژە، پاراو، بەراف، دەراو

**سَيْخ (سَفُود):** شيش ، زرك ، كێرد، جۆرە ئاسنێكی درێژە

**سَيِّد:** گەورە ، سەرگەورە، سەرۆك ، فەرماندار، فەرمانڕەوا، سەروەر، كاك، داناو زانا ، خاوەندار

**سَيِّد (عِنْدَ المَسِيحِيِّين):** نازناوی يەسوعە (د.خ)

**سَيِّدُ (عِنْدَ المُسْلِمِين):** سەيد ، ئەوەی لەرەچەڵەكی پێغەمبەر بێت(د.خ)

**سَيِّدَة:** خانم ، بانو ، خاتوون ، ئافرەتی بەشوو، ژنی مێردار

**سَيْدَانَة:** گورگ

**سَيَّرَ الرَّجُل:** وەهای لێكرد بڕوات ، بەرێیكرد، رەوانەیكرد، پاڵی پێوەنا

**سَيَّرَ المَثَلَ أَوْ الكَلاَمَ:** بلاَویكردەوە لەنێوان خەڵكيدا، پەخشیكرد، خستيە سەرزاری خەڵكی

**سَيَّرَ فُلاَنٌ سِيرَةً:** باسی پێشينەكانیكرد، لەڕابوردو دوا

**سَيَّرَ الحَبْلَ عَنْ ظَهْرِ الدَّابَةِ:** فڕێیدا، خستی

**سَيَّرَ الثَّوْبَ:** هێڵی زۆری تيا دروست كرد، خەت خەتی كرد

**سَيْر:** ڕۆيشتن ، ڕۆيين ، چوون ، گەڕان، كار ، ڕاپەڕاندن، بەڕێوەبردنی كارو فرمانێك

**سِيرَاء:** جلی خەت خەت کە ئاوریشم یان ئاڵتوون تێکەڵ بەتاڵەکانی بوبێت، ئەو توێکڵەی نوساوە بە ناوکە خورماوە، پەردەی سەر دڵ، پوش‌و پەڵاشی دارخورما

**سِيرَة:** ژیاننامە، ناوبانگ، چیرۆک ، راز، داستان، بەسەرهات ، سەرگوزشتە، سەربوردنامە، مێژوو، باس‌و خواسی ژیانی یەکێك یان کۆمەڵ‌و گرۆهێك ، مەزهەب‌و رێگە

**سِيرَةُ رَجُل:** ژیاننامەی ، چۆنیەتی ژیانی لەنێو خەڵکیدا

**سِيرَج:** رۆنی کونجی

**سَيَسَ الحَبُّ وَغَيرَهُ:** مۆرانە تێیدا ، مۆرانە لێیدا

**سَيَسَ الشَاةُ:** گەنە دایە پێستەکەی ، گەنە تێیدا

**سَيطَرَ عَلَيهِم:** زاڵبوو بەسەریاندا ، سەرکەوت بەسەریاندا

**سَيطَرَ عَلَى المَوْقِف:** زاڵبوو بەسەربارو رووداوەکەدا، حاڵەکەی پاوانکرد

**سَيطَرَة:** بازگە ، سەیتەرە ، شوێنی پشکنین‌و لێکۆڵینەوە

**سَيطَل:** سەتڵ، رزك ، ساتل، ستل، پەقرەچ ، دەرلووف، دەفرێکی قوڵفداری گەورەیە لەکان یان لەدار دروستدەکرێ بۆ ئاوو شتی‌تر

**سَيَعَ الحَائِط:** کەچکاری کرد، سپیکاریی کرد

**سَيَعَ الجِلد:** چەوریکرد، رۆنی لێدا، هەنوی‌کرد

**سَيَع:** ئاوی لەبەررۆیشتوو بەسەر رووی زەویدا

**سَيْعَاء:** بەشێك لەشەو ، ساتێك

**سَيْغ:** نەرمە رەو ، نەرمە قوتە ، ئاوو خواردنێك کەبە گەروودا بەئاسانی بڕواتە خوارەوە

**سَيف:** شمشێر، کەرەنتۆ ، شیر ، داسی گەورە ، تیغێکی درێژو پانە لەناو کالان دەنرێ

**سَيفُ الرِيَاح:** روەکێکە

**سَيَف ـ سِيف:** رۆخ ، کەنار ، گوێ ، قەراغ ، لێوار ، ماسیەکی دەریاییە دەنوکێکی درێژی هەیە لەسەر شێوەی شمشێر یان کێرد

**سِيفَة:** دووریی ، درێژی ، ماوەی نێوان دووشت

**سِيفُون:** مژەر ، راکێشەر، مژۆك، هەڵمژ

**سِيفُون المَجْرَى:** گەلی سیفون ، وشترگەروو

**سَيَّقَ مِنَ السَحَاب:** ئەو گەواڵە هەورانەی با پاڵیان پێوە دەنێ گەر ئاویان تێدا بێت یان نا

**سِيَقَ المَرِيض:** سەرەتای گیان سپاردنی بوو، گیانەڵای هات ، سەرە مەرگو روح کێشانی داهات

**سَيِّقَة:** ئەو ئاژەڵانەی بەکێش دەکرێن یان لێدەخورێن، ئەو ئاژەڵانەی دوژمن لێیان دەخورێت

**سِيكرَان:** روەکێکی هەمیشە سەوزە

**سِيكَاه:** ئاوازێکی مۆسیقیە

**سَيكَف:** کەوش دروو

**سَيَّلَ المَاء:** رژاندی ، بەریدایەوە، رشتی، قلپی کردەوە

**سَيِّلَ الدَّمْعَ:** چاوی ئاوی کرد، ئاوی چاوی داهێنا، ئاوی لەچاوو دیی‌ەی دەرپەڕاند

**سَيِّلَ اللُعَابُ:** ئاو زایە دەمی، لیك بەدەمیا هاتە خوارەوە

**سَيْل:** لافاو ، لێشاو ، خوڕاو ، لافاوی بەخوڕ

**سَيَلَان:** لێتکان ، لەبەر ڕۆیشتن ، لێڕۆیشتن ، پالأوتن، دەلأندن، لێچوون

**سِيلَان:** دەسك ، دەسگە ، ئەوەی لەشمشێرو چەقۆ دەچێتە نێو مشت‌و دەست‌و دەگیرێت بۆ هەڵسوڕان‌و بەکارهێنان، بەردێکی پیرۆزو بەنرخە

**سَيْلَة:** ئاوەڕۆ ، ئاورێژ، ئاوەڕوێ، دەراو، جۆگەلەیەکە لەماڵدا کەباران‌و چڵکاوی پیا دەچێتە دەرەوە

**سِيَمَا ـ لاسِيَمَا ـ وَلاَ سِيَمَا:** بەتایبەتی، نەخوازەلأ

**سِيمَاء ـ سِمَة:** نیشان ، نیشانە ، هێما، دیمەن ، چارە ، ڕەزا ، ڕووخسار ، ئێسك

**سِيمَافُور:** ڕێنما ، ڕێنومایەکە لەسەرووی ویستگەکانی شەمەندەفەر هەڵدەواسرێ بۆ دەستنیشانکردنی چۆڵی‌و بەتاڵی ڕێگە

**سِيمِيَاء:** جادوو سیحر ، ئەفسوون ، ئەو شتانەی لەدەرگای هەست دەدەن‌و لەواقیع بەدوورن

**سِيمُون:** ئامازەیەکە بۆ جادووگەرێتی‌و مامەڵەگەران بەسەر ڕوحانیاتەوە دەگەڕێتەوە

**سِينَمَا:** سینەما ، ئەو دیمەنانەی لەسەر ڕوپای تەخت‌و ساف دەجووڵێن‌و گوزارشت لەڕووداو باورحاڵ دەکەن

**سِينَمَائِيّ:** ئەوەی پەیوەندی هەیە بەسینەماوە

**سَيُور:** ئەوەی زۆر دەڕوات ، گەڕیدە ، گەشتیار

**سِيُولَة:** شلێتی، پێچەوانەی بەستن‌و ڕەقیە



سِنّ (ددان)



سَرَاج (چرا)



سكِين (چەقۆ)



سَلجَم (شێلم)



سِنْدَانَة (ئينجانه)



سلم (قالدرمه - پی پلیکانه)



سساطور( كيرد )



سَمَك (ماسی)



سَنّور (پشیله)



سِوَار (بازن)



سَاخِرَة (کەشتی چارۆکەدار)



سَلَطَه (زەلاتە)



سَرَطَان (قرژاڵ)



سَلَّة (سەبەتە)



سِلسِلَة (زریزە)



سُلحَفَاة (کیسەڵ)



سَاعَة (کاتژمێر)



سَنْ القَلَمْ (قەڵەمەکەی دایا )



سفينَة (كەشتی )



سَقَر (باز)



سَيَارَة (ئوتومبێل )



سِيجَارَة (جگەرە )



سِعْدَان (مەیموون)

# ١٣ حرف الشين

ش

**ش**

**ش**: سیانزەیەم پیتی زمانی عەرەبییە

**ش ا - ش ا**

**شاء ، شَيئاً وَمَشيئَةً وَمَشَائَةً وَمَشَائيَةً :** ویستی ، خواستی ، خوازیاربوو ، داواکاربوو ، ئاواتەخوازبوو

**شَاءَ اللهُ الشَيءَ:** خواوەند ویستی ، خوا رازی لەسەر بوو

**شَائِبْ ـ شَائِبَةً (أبْيَضُ الشَعْر):** سەرسپی ، پیر ، پۆپ چەرمە، پیر بۆ ژن و پیاو

**شَائِبَة:** شتێکی نامۆ تێکەڵ بەشتێکی تربیێت، پیسی و گەندەڵی، ناپوختی ، خەوش ، شوورەیی، کەم و کوڕی، ناتەواویی، نەنگی، نام و نەنگی

**شَائِعْ:** باو ، بڵاو، ناسراو ، باووك ، باڤ، شوێن ڕەوشت ، مۆدە

**شَائِعَة:** پروپاگەندە ، دەمگۆ ، بەندوگۆ

**شَائِقْ:** بەلەزەت ، پەسەند، بەجێ، بەتام، خۆش، دخووەز، ڕاڵێبوون، سەرنج ڕاکێش

**شَائِك:** دڕکاویی، چقڵدار، دڕواوی، چقڵاویی، شتێك یان شوێنێك دڕکی زۆر بێت

**شَائِمْ:** شووم ، نەگبەت، بەدفەڕ، بەستەك، بەدوودم، دۆبڕ، دوومۆر ، سەرەخۆرە، بێوەڵەت، ناپیرۆز ، بێفەڕ، سەرشین ، قەشقە ، ئەوەی نەهامەتی و شومی هێنەرە

**شَائِنْ:** ئابروبەر، نەنگ کەر، ناوزڕێن ، حەیا بەر ، شوورەیی بەر، ڕووداوو سیفەتێك ببێتە مایەی نەنگی و عەیبە

**شَانِئْ:** حەسوود، ئێرەییبەر، چاوچنۆکی ، بەغیلی

**شَائِي:** ویست ، خواست ، داوا، خواز، ویستن

**شَابَ الشَيءَ:** تێکەڵیکرد، ئاوێتەیکرد، کردی بەنێو یەکدا

**شَابَ الرَجُل:** ناپاکی لەگەڵکرد، خیانەتیکرد، دەستی بڕی، قۆڵی بڕی

**شَابَ فِي قَوْلِه :** درۆیکرد، ڕاستی نەگوت، درۆزن بوو

**شَابَ عَنْ صَدِيقِه :** جارێك بەچوستو چالاکانە بەرگری کرد لەهاوەڵەکەیو جارێکیش بەسستو خاویی

**شَابَ الشَعْر:** مووی سەری سپی بوو، سەری سپی بوو

**شَاب:** لاو ، جەحێل، گەنج، لاف، دەلال، خوێنگەرم ،جاهێل، خورت، ڕەند، تولاز ، شۆخ، شەنگ، تەڕلان

**شَابَة:** کیژی لاوو شۆخ و شەنگ

**شَابَتْ رُؤُوس الأكَام:** سەری شاخەکان بەبەفر سپی بوو، سەری قوتەو تەپکەکان بەفر سپی کرد

**شَابَكَ بَيْنَ الأصَابِعْ:** پەنجەکانیکرد بەنێو یەکا،پەنجەکانی تێکەڵ یەکترکرد

**شـابَة** لـەوچوو، هاوشێوەبوو لەگـەڵی، وەك یـەكن ، دەڵێـی سێوێكن‌و كـراون بەدوو لەتەوە
**شاةٌ**: مەڕ، پەز، كاوڕ، بەران
**شـائي الرَّجُـلُ**: زسـتان مامەڵـــەی لەگەڵكرد
**شـائَمَ**: جنێــوو قســەی ناشــیرینیان بەیــەك گــوت ، رووبەیــەك جنێـــوو زمانپیسیان كرد
**شـاتيٌ**: رۆژی سارد، رۆژێـك سـەرماو سۆڵە بێت
**شـاجَّ القَـومُ**: قســەیان گــوت بەیــەك، جنێویان رووبەیەك لەزار هاتە دەرەوە
**شـاجِبٌ**: زمـان پیـس ، بـەدگۆ، یـەكێك خراپ بڵێت ، خراپ گۆیی، نارەوا گوتن
**شاجَرَ مُشَاجَرَةً**: شـەڕیكرد، جـەنگیی، چوو بەگژیا ، قسەی پێكوت ، گێچـەڵی پێ گێڕا
**شـاجَرَ الماشِيَةَ**: چوارپـێ‌و ئاژەڵـەكانی برد بۆ خواردنی گـەڵای درەخـت لەبـەر نەبوونی گژوگیا
**شاجَعَ ـ مُشَاجَعَةً**: لـەجوامێریدا بۆریـدا، زاڵبوو بەسەریا لە دلێری‌و نەبەردییدا
**شاجِنٌ**: دڵگیراو ، پەسـت ، خەفـەتبار، خەمناك، غەمگین، لێوبەبار
**شـاجِنَةٌ**: رێگـەی نێـو شـیوو دۆڵ یـان رێگەیەك لەسەرووی شیوو دۆڵەوەبێت
**شاحَ بِالشَّيءِ عَلَـى فُلاَنٍ**: ئێرەیی پـێ برد، گوماندار‌بوو پێــی ، دڵی پیسـكرد لێیی
**شـاحِبٌ( مُتَغَـيِّر اللـون )**: رەنـگ پــەڕیو، زەرد یــان سـپی هەڵگـەڕاو، بزڕكـاو، تێكچوو، كز، لاوازو بەناوا رۆچوو

**شاحَذَهُ**: نامەی بۆ نووسی ، نامـەی بـۆ نـارد، لـەتیژكردن‌و سـاوینی شمشـێردا پەیڕەوی‌و چاوی لێكرد
**شاحِطٌ( بَعِيد )**: دوور، دووریر ، دیر
**شـاحِمٌ**: فرۆشی بـەزو پیــوو، یـەكێك پیشەی بەز فرۆشی بێت
**شـاحِنٌ( مَشْحُون )**: بـاركراو، بـارلێنراو، پڕكراوە
**شـاحِنَةٌ**: لـۆری ، فـارگۆن ، بارهـەڵگر، باركـەر، هەرشـتێك بـۆ هـەڵگریی بـار دروستكرابێت یان بشێت
**شاحَنَهُ**: دوژمنایەتی نواند بەرانبەری ، دژی وەسـتا ، رەقەبەرایـەتی كـــرد لەبەرامبەری
**شـاخَ( صَـارَ شَـيْخَاً )**: پـیربوو، چـوە ساڵەوە، بەتەمەن بوو
**شاخَ النَّبَـاتُ أَوْ الثَّمَـر**: پیربوو، تـۆوی كرد، كەوتە تۆو
**شـادَ البِنَـاء**: سـاختمان‌و بیناكـــەی دروستكرد، بەرزی كردەوە، هەڵی سان
**شادَ الحَائِطَ**: سواخیدا، پیاهەڵسوو
**شـادَ جِلْدَهُ بِـالطِيب**: هـەنووی كـرد، چەوری كرد
**شادَ الرَّجُل**: تیاچوو، فەوتا ، لەناوچوو
**شادَ الإِبِل**: بانگی كرد
**شـادَ فـي الأَمْـر مُشَـادَّةً**: بەربـــەرەكانی كرد، بەرهەڵستی كرد
**شـادِخٌ**: ئـەوەی جوان‌و ناسك ئــەندام بێـت، جـەحێل‌و جـوان‌و قەشـــەنگ، پچووكی تەڕوبڕ
**شادِنٌ**: بەچكە ئاسك ، بێچووی مامز
**شادِي**: گۆرانی بێژ ، خوازیارو داواكاری رەوشت‌و زانیاریی

**شاذ:** نامۆبوو، ناوازەبوو، شازبوو، ناجۆربوو
**شاذ:** ناوازە ، شاز، نامۆ ، نائاسایی، هەلاویژیاری، دەگمەن ، دانسقە ، لەرێ لاداو، لەباوو ناسراو دەرچوو، وەرگەڕاو، شێواو
**شاذ الطَبْعِ أو الأطْوَار:** رەوشت ناوازە ، مێشك رەق ، تایبەت خوو
**شاذِبٌ:** ئەوەی دوورو پەڕاگەندەیە لەولاتی خۆی ، تەنیاو نائومێد
**شَارَ:** تاقی کردەوە، سواربوو بۆ تاقی کردنەوە، هەنگوینەکەی گرتو دەری هێنا
**شارَ الرَّجُل:** دیمەنی جوان بوو
**شارَ الشَيء:** دەریخست هەتا چاکەکانی دەربخات
**شارَ الدَّابَةَ:** راوراوێنی پێکرد هەتا هێزو تواناى دەربخات
**شارَ عَلَيه بِأَنْ يَفعَل سوراً:** داوای ئەنجامدانی کارێکی لێکرد
**شَارَاهُ:** مامەڵەی کڕینو فرۆشتنی لەگەڵکرد، کێشمەکێشی لەگەڵکرد
**شارَبَ:** خواردیەوە، نۆشیکرد، هەڵی قوڕاند
**شارِبٌ:** ناو خۆر ، سمێڵ ، سمبڵ، خەتدان ، تووکی سەرلێوی سەرەوەی پیاوانە
**شارِحٌ:** راڤەکەر، لێکدەرەوە، لێکۆڵەرەوە، لەسەرنووس، تەفسیرکەر، روونکەرەوە
**شارِدٌ:** هەڵهاتوو، راکردوو، ونبوو، سەرگەردان، وێڵ، عەودال
**شارِدُ الفِكْر:** خەیاڵ بردوو، خەیاڵ رۆیشتوو
**شارَسَهُ ـ مُشارَسَة وَشِراسَاً:** رەق بوو لەمامەڵەدا، زبربوو لەهەڵسوکەوت لەگەڵیدا
**شارَطَ:** گرەویانکرد، مەرجیان بەیەکدا، مەرجیان کرد، رێککەوتن ، پێکهاتن
**شارَطَهُ:** هەریەك بەمەرجی گرت لەسەر هاوەڵەکەی ، هەریەك مەرجی بۆ هاوەڵەکەی دانا
**شارِعٌ:** دانەری یاساو رێسا ، رای گشتی،لەشەریعەتدا بریتیە لەکۆڕای زانایانی موسوڵمانان لەسەرمەسەلەیەك
**شارَفَ المَكَان:** بەسەریا روانی، چووە سەرو بڵندییەکەی
**شارَفَ الشَيء:** لەسەرەوە بۆیڕوانی، چاودێریکرد، کارەکەی گێڕا ، شانازی بەئابڕووەوەکرد، سەرەوکاریکرد ، بردی بەڕێوە
**شارِفٌ:** ئەوەی بەمزوانە دەبێت بەشەریفو رێزدار
**شارِفٌ مِنَ الدَوَاب:** وشتری قەڵەوو تێکسمڕاو
**شارِفَةٌ:** وشتری بەساڵاچووی قەڵەو
**شَارَفَهُ ـ مُشَارَفَةٌ:** بەئابڕووەوە شانازیکرد، بەشەرەفو ئابڕووەوە شانازییانکرد رووبەیەك
**شَرِقٌ:** خۆر لەکاتی هەڵهاتندا
**شارِقُ الشَمْس:** لای رۆژهەڵاتی خۆر
**شَارَكَ ـ مُشَارَكَة:** بەشداریکرد، بوو بەهاوبەشی ، پێکەوەبوون بەهاوبەش
**شَارَكَهُ مَعَهُ فِي العَمَل:** پێکەوە ئیشیانکرد، بەیەکەوە ئیشو کاریانکرد

**شَارَكَهُ مَعَهُ فِي العَوَاطِف**: بەزەیی پیاهاتەوە، دڵی بۆی سووتا ، هاوبەشی خەمی بوو، دڵسۆزی لەگەڵ کرد

**شَارُوقْ(النَّوْرَة)**: تەڕاو ، سپی کردنەوەی ناومال بەلیتاوی گڵی سپی

**شَارِيً**: فرۆش ، کڕیار، ئەوەی تواناو رەنجی بەگەردەخات لەگویڕایەڵی خوای گەورەدا

**شَارِيُ الصَّوَاعِقْ(مَانِعَةُ الصَّوَاعِقْ)**: بروسکەبڕ، ئەو ئامێرەی بارگەکانی بروسکە خاڵی دەکاتەوە

**شَازِب ـ شُزَّب ـ شَوَازِب**: زبرو پەژمودە، رەق و زبر

**شَاسَ**: بەتیلەی چاو بەفیزو خۆبەزلزانینەوە بۆیڕوانی

**شَاشْ**: شاش ، مەندیل ، کەتانی تەنك، پارچە سالغیەکی نەرمە زیاتر بۆ سوتاوی بەکار دێت

**شَاشَةٌ**: بینگەر، ئەو شوێنەی رووداوو فیلمو چەندین شتی جۆراو جۆری لێوە دەبینرێت

**شَاشَةٌ بَيْضَاء**: پەردەی سینەما

**شَاشَتْ نَفْسَهُ( جَاشَتْ )**: لەشی خاوبوەوە، دڵی تێکەڵهات ، هات بەیەکا

**شَاشِيَّةٌ**: کلاوێکی سوورە بە تەڕبوش ناو دەبرێت و گوڵنگێکی بچووکی پێوەیە

**شَاصَ ـ شَوْصاً وَشَوْصَانًا**: خرۆشا ، جوولاو کەوتە لەرزە، ورووژا، هەژا

**شَاصَ بِهِ العِرقُ وَالمَرَضْ**: وروژاندی، تێکیدا، شێواندی

**شَاصَ فُلَانَ بِفُلَان**: عەودال بوو ، شەیدابوو ، ئالوودەی بوو

**شَاصَ الشَّيْء شَوْصاً**: جوولاندی لەجێی خۆیەوە

**شَاصَ الرَّجُل**: دانی ئێشا ، سکی ئێشا

**شَاصَ الجَنِينْ**: کۆرپەلەکە لەسکیا جوولا

**شَاطَ**: سووتا ، گڕی تێبەربوو، گڕی لێهەستا

**شَاطَ الفَرَسُ وَغَيْرَهُ**: چوو بۆ مەبەستێك، غارغارێنیکرد

**شَاطَ الطَّعَام**: هەندێکی سووتا ، کەمێکی سووتاوگڕی گرت

**شَاطَ فُلَانَ**: تیاچوو، فەوتا ، لەناوچوو، سەری تیاچوو

**شَاطَ القِدْرُ**: شتێکی سووتاوی نووساو بەبنەکەیەوە

**شَاطَ الزَّيت**: خەست بووەوە هەتا خەریك بوو بسووتێ

**شَاطَ الذَّبِيحَة**: گۆشتەکەیان دابەشکرد

**شَاطَ فِي الأمْر**: پەلەیکرد، خێرایکرد، گورج و گۆڵ بوو، دەستو بردی کرد

**شَاطَ دَمَهُ**: بەهەدەر خوێنی رژیی ، خوێنی بەهەوانتە رژا

**شَاطَ فُلَانَ الدِّمَاء**: تێکەڵیکرد، دای بەسەر یەکا ، وەك ئەوەی خوێنی بکوژ برژێ بەسەر خوێنی کوژراودا

**شَاطَتَ القِدر**: بنکڕی کرد، بنی گرت

**شَاطَتَ القِدْر أوْ الطَّبْخ**: دوکەڵی لێهەستا ، سووتا ، هەڵکزا

**شَاطَأَهُ**: هەریەکەیان لەسەر رۆخی دەریاچەکە رۆیشت ، بەکەناری ئاوەکەدا رۆیی

**شاطِيء النَّهر:** کەناری رووبار، موزورك

**شـاطِيء البَحْـر:** رۆخـی دەریـا ، زەریابار، رۆخ

**شاطِيء الوادي:** کـەناری دۆڵەکـە ، لای دۆڵەکە

**شاطَرَ:** لەگەڵیکرد بەدوو کەرتـەوە، بەشیکرد لەگەڵی

**شاطَرَ فُلاناً:** ماڵەکـەی نووسا بـەماڵی ئەوەوە، ماڵەکەی لەپاڵ ماڵی ئەو بوو

**شاطِرٌ:** زیـرەك ، فێڵباز، سـاختەچی، چـالاك ، چـابوك ، وریـا ، چاومـار، بلیمەت ، حیلەگر

**شاطِنٌ:** پیاوێکی پیسو گەندەڵ ، دوور لەحەقو راستی، بەدخویی

**شاطَ بِفُلانٍ:** جنێوی پێـدا ، قسـەی ناشیرینی پێگوت

**شـاطَ بِـه الغَضَبُ:** ئـاگری گـرت ، گـڕو بڵێسەی تووڕەبوون گرتی

**شـاعَ الخَبَرُ:** بلاوبـوەوە ، ئاشـکرابوو، قاو داکەوت ، راگەیەنرا

**شاعَ فِيـه الشَيبُ:** سـپی تێکـەوت ، سەری مووی سپی تێکەوت

**شاعَ الإنَاء:** پڕیکرد، لێوان لێوی کرد

**شاعَ بِالخَبَر:** هەواڵەکەی بلاوکردەوە

**شاعٌ:** بلاو ، ئاسراو ، باو، داکەوتوو

**شاعَة:** هەواڵێك بلاوبووبێتەوە

**شـاعَرَ ـ مُشَـاعَرَة:** بەشـیعرو هۆنـراوە زاڵبوو بەسەریا

**شاعِرٌ:** شاعیر، بوێژ، هۆنەر، هەستیار، هەڵبەس ، ئەوەی هۆنراوە دەنووسێت

**شـاعِرٌ رَكِيـك:** گـەرە شـاعیر ، گەنگـە هۆنەر، ماعیر

**شـاعِرِيَة:** هەسـتیاریی، شـیعری، شاعیریەتی

**شـاغَبَ ـ مُشَـاغَبَة:** ئاشـووبگێڕیو دژایەتیکرد، ناکۆكو ناحەزبوو

**شـاغَبَة:** ئاژاوەگێڕیو ناکۆکی لەگـەڵ بەرپاکرد

**شـاغِرٌ:** بـۆش ، چـۆڵ، بەتـاڵ، خـاڵی، حـەتاڵ، پـووت ، ڤـالا، هۆڵـۆل، هـۆل، هێسا، دوکان یان خانووی چۆڵو بەتاڵ

**شـاغَلَ( ألـهَى ):** ژیریکـرد، یـاری لەگەڵکرد، خلافانی، سەرقاڵیکرد

**شـاغِلٌ:** سـەرقاڵ، کـاردار، یـەکێك سەرقاڵو کارو پیشەی هەبێت

**شـاغُور:** تاڤگـەی ئـاو ، پـڕژ، شـیپ ، شیرۆ، سووڵی، ڕێژاف، ڕێلاف ، وەزەن، چیك ، بەرکەتی، قەڵبـەزە ، پلووسـك، ڕێژگـە، قەڵپـەزە، سوولاف، سـوواف، شۆش، تافە، قەڵوەزە، ئاوشار

**شافَ( صَقَل ):** سافیکرد، تیف تیفەیدا، لووسـیکرد، پێکـرتو گوێکـرت، رەونەقو درەوشاوەیی لێ پەیداکرد

**شافَ( رأى ):** بینی، دیتی ، چاویکرد

**شـافَ الجَمَـل بِـالقطرَان:** بەقـەتران رووکەشیکرد، رەنگی کرد

**شـافِيٌ:** چارەسـەر ، چـارە ، چـاك کەرەوەیـەکۆتایی پێهێـن ، یـەکلایی کار، دڵ سارێژکەر

**شاقَ إلَيه:** نەفسی بۆی جۆشا ، ئاگری تێبەربوو بۆی ، ئالوودەی بوو

**شاقَ الشَيء فُلاناً:** خرۆشا،جۆشا ، هەژا

**شـاقَ الشَـيء إلَـى آخَـر:** بەکێشـیکرد، رایکێشا، کەمەندکێشیکرد

**شـاقَ الشَـيءُ:** پەرسـارد، دایـە پـاڵ، پێوەی رایکێشا
**شـاقَ إلَـی ( حَـنَّ إلَيـه ):** بـیری کـرد، ئـارەزووی کـرد، تامـەزرۆبوو بـۆی، بەپەرۆش بوو بۆی
**شـاقَّ:** دژوار، نارەحـەت ، سـەخت ، گـران، قـورس، نابـار، نـاجۆر، پڕنارەحەتی‌و گرفت ، شەکەتکار، رەق
**شاقَّ فُلانـاً:** دەردەسەری‌و نارەحەتی هێنـا بەسـەریا ، تووشـی گرفـت‌و بەدبەختی کرد
**شاقَى ـ مُشاقَاة:** چەشتی‌وناسۆریەکانی هەڵگرت
**شاقَاهُ فِي الحَرْب:** لەجەنگدا سەرکەوت بەسەریا ، زاڵبوو بەسەریا
**شـاقُوف:** چەکوشـێکی گـەورەی بینـا کارانە
**شـاقُول:** شـاوڵ، شـاووڵ شـاقوری، تەپکە، فاقـە، ئاسنێکی خڕی قورسـە بەپەتێکـەوە وەسـتا خواریـی گـیریی دیواری پێ بەراورد دەکات
**شاكَ:** دڕکی پیاکرد، دڕکی پیا چەقان
**شاكَ الشَجَر وَغَيرَهُ:** دڕکی دەرکرد یان زۆر بوو
**شاك الرَجُل:** هێزو توانای دەرکەوت
**شـاكَ ثَـدْيُ الفَتَـاة:** مـەمکی‌کرد ، دەرکەوت، هەڵیدا، بـەرزبووەوە، لەسـەر سینگی شۆڕبووەوە
**شاكّ:** گوماندار، بەدگومان، دوودڵ، دڵ کرمێ، دڵ پیس
**شاكُ السلاح:** ئامادەی جەنگە
**شـاكَاهُ:** شـکاتی لێکـرد، نـارەزایی لێدەربڕی

**شـاكَة:** لویەکـە لەگـەرووودا دروسـت دەبێت ، لۆزەتێن
**شاكِرْ:** سوپاسگوزار، پێزان
**شاكَر الحَديث:** قسـەو وتوێژی لەگـەڵ کردەوە، باسی لەگەڵ ئاوەڵاکرد
**شاكَرَهُ:** سوپاسی کرد،پێزانینی دەربڕی
**شاكِري:** کرێ گرتە، خزمەتکار، تەیان، بەردەست، پێشخزمەت
**شـاكِرِيَة:** کـرێ‌و موچـەی کرێگرتـە، خـەڵکی گشـتیش بـەجۆرە چەقۆیـەك دەڵێن
**شـاكَسَ( خَـاصم ):** گـرۆزی کـرد، رقـی گرت، شەڕی فرۆشت
**شاكَلَ:** لەوچوو، لێی‌چوو، وەك ئەوبوو، هاوشێوەی بوو
**شاكِلْ:** هاوچەشن ، هاوشێوە، وەك ئەو
**شـاكِلَة:** جـۆر ، بابـەت ، چەشـن ، شێوە، لـق ، وەك، لا، ناحیـە، رێگـەو مەزهـەب ، دوا ، پـاش، لاتەنیشـت ، قەبرخە
**شاكُوش ـ شـكُوش:** چـەکوش، چـەکوچ، زەنـپ ، زەنـت، نقـوورە ، ئاسـنێکە دەسـکێکی دار یـا ئاسنینی تێدەخـرێ بزمارو شتی تری پێدا دەکوترێ
**شاكِي:** سکالاکەر، شکاتکەر، دادخـواز، داواکار، مەردومی گلەیی‌مـەند، ئـەوەی هاوارو دادی لێ بەرزدەبێتەوە
**شالَ:** بەرزبووەوە، هەڵبڕا، بڵندبووەوە
**شـالَ الشَـيء:** لەشـوێنی خـۆی هـەڵی کەند، بەرزی کردەوە
**شـالَ المِـيزَان:** لایـەکی تەرازووەکـەی بـەرزکرَدەوە بەسـەر ئـەوی تـردا ، لاسەنگ بوو

**شـالَ مـيزَانُ فُـلان**: لەشـانازیو بەخۆنازییدا زاڵبوو بەسەریا
**شالَ بِالشَيء**: هەڵی گرت، لێی نەوی، بەرزی کردەوە
**شـالْ**: دەسمـاڵ، شـاڵ، کۆڵوانـە، شاڵینە، چارۆکـە، چارەکە، بـەرانپیل، بەرامپیل، ماشتە
**شـالَتْ نَعَامَتُـهُ( مَـاتَ )**: مـرد، کۆچـی دواییکرد
**شالَتْ نَعَامَتُهُم**: باریانکرد، کۆچیانکرد
**شامَ فُـلان**: خـاڵو نوکتـەکانی سـەر پێستی دیاریداو دەرکەوت
**شـامَ السَحَابُ وَالـبَرقَ**: بەچەشـنێ بۆیروانی کەوا هەوری باران بارین بێت، واپەی برد ، واگومانی کـرد، سووسـەی بارانی بۆ کرد
**شامَ الشَيء**: واپەی برد ، وایدانا
**شامَ فِي الشَيء**: ئامادەبوو بۆی ، خۆی رێکخست بۆی
**شامَ الشَيء فـِي الشَـيء**: تیاشـاردەوە، تێی ئاخنی
**شـامَ الرَجُل**: بەراسـتی هێرشـی بـرد، بەراسـتگۆیانە هەڵمـەتی بـردو بەشداریکرد
**شامْ**: وڵاتی شام ، سوریا
**شامَا**: راو بۆچونیان نزیك بوو بەیەك
**شامتْ**: بەد، چاوتێبڕ، کیناوی، ئـەوەی بەخـەمو نسـکۆی یـەکێکیتر شـادو خۆشحاڵ دەبێت
**شـامَة**: چاڵ، نوختـەی رەش کوتـان، نتـك، نچـك، دەقـاندن، نوختەیـەکی رەشکارە لەسەر لەشی مرۆڤ خۆرسکە یـا بـەرەنگ لەئـەندامدا بـەدەرزی دەکوترێ
**شامِخْ**: بڵند، بەرز، حەوا ، قیت، بونـد، سەلیل، بەرەوژوور، هەوراز، بانی بەرز، قووت، ڤیت، ئەراوەند، ئـەڤرا، ئـەفراز، راسـەرین، بێنـد، ژۆروو، شـتێك بـەرزو بالآبێت
**شامِر۔ شامِرَة**: وشتر یان مەڕێك گوانـی نووسابێت بەسکیەوە
**شـامِسْ**: یـاخی ، چـەموش، هـەتاوو سایەقە، کەوەرۆژ، بێهـەور، رۆژێکـی ساف و بێهەور
**شـامِلْ**: گشـتی، گشـتگیر، هـەموان، گشتگر، سەرجەمی تیابوو، بریتیە لە
**شامِيّ**: شامی ، خەڵکی شام ، دەدرێتە پاڵ خەڵك و دانیشتوانی سوریا
**شانَ**: عەیبداریکرد، رەخنـەی لێگـرت، کەمو کوڕی دەرخست، گاڵتەی پێکرد، ئابڕوی برد
**شـانَهُ**: رەخنـەی ئاڕاسـتەکرد، نکـوولی لێگرت ، کەمو کوڕی لێدۆزییەوە
**شانِيء**: دوژمن ، بەدخوو، بەد رەفتار، رەوشت نزم ، خراپ ، نالەبار
**شانِبْ**: مەردومی ددان سپی
**شـانِفْ**: نـاڕەزایی دەربڕیـن، روو وەرچەرخان ،روو وەرگێڕان
**شـانِقَةُ**:ماڵەکەی لەگـەڵ مـاڵی ئـەو تێکەڵکرد
**شـانِيَة**: جـۆرە کەشـتیەکی تایبـەتی جەنگی گەورەیە
**شاهَ**: تێکچوو، ناشیرین بوو، شێوا
**شـاهَ نَفسُـهُ إلَـى كَـذا**: تـەمای هـەبوو، ویستی ، خوازیاربوو

**شاهَ عَينُهُ:** بەتیژی تەماشایکرد، تیژ بۆیپروانی
**شاهَ الأسْنَان:** بەچاو بەدیکرد
**شاه:** پادشا، شا ، شای یاری شەترەنج
**شاه بَنْدَر:** سەرۆکی بازرگان
**شاه بَلُوط:** شابەڕوو ، کەستەنە ، بەڕوو
**شاهِبْ:** ئەسپی سپی ، ئەسپە سپی
**شاهِدْ:** شایەت ، گەواه، ئەستێرەی چڵ چرا ، بەچاوبینین ، بینەر، وەرگرتن ، فریشتە، زمان
**شاهِدَة:** زەوی ، خاك، زەمین، کێلی گۆڕ
**شاهَدَهُ:** بینی ، دیتی، چاوی کرد
**شاهَرَ:** بەمانگانە گرتی
**شاهِقْ:** بەرز، بڵند، گەردن کەش، بالا، هەڵچوو بەرەوژوور، شاخ و بیناو ساختمانی بەرزو بڵند
**شاهَنْشاة:** پادشا ، پادشای پادشایان، میری میران ، شای مەزن ، زیاتر بە شایەکانی ئێران دەگوترا
**شاهِيْ:** مەڕدار، یەکێك مەڕوماڵاتی هەبێت
**شاهِيَّة:** ئارەزوو ، شەهوەت، حەز
**شاهِينْ:** باز، هەڵۆ، شووتی کێشانە
**شاوَرَ:** راوێژی پێکرد، رای وەرگرت
**شاوَرَ نَفْسَهُ:** لەگەل خۆی راوێژی کرد، لەگەڵ خۆی دوا ، سووسەی دڵی کرد، بیری لێکردەوە، سیّ و دویەکی خۆیکرد
**شاوَرَهُ فِي الأمْر:** وتوێژی لەگەڵکرد لەکاروبارەکانیدا، داوای گفتوگۆو وتوێژی لەگەڵ کرد

**شاوِيٌ:** خاوەن مەڕو ماڵات
**شاي:** چا ، چایی، چایە، چای لێنراوو دەمکراوە کەبەئیستیکان بەتاڵی یا بەشیرینی دەخورێتەوە بنەڕەتی ئەم گیایە لەوڵاتی چینەوە سەریهەڵداوەو بڵاو بوەتەوە
**شَئِفَ أَصَابِعُهُ:** سەرپەنجەکانی قڵیشا ، درزیکرد، خاش خاش بوو
**شَأَفُ الجَرح:** کیم تێزانی برین ، هەوکردنی برین ، کێم زاخی برین
**شَئِفَ:** ترسا ، تۆقی، ترس و بیم گرتی
**شَأَفَة:** رەگ، ریشە ، بنەڕەت ، رەچەڵەك ، بنەچە، برین و کێمی بنی پێ
**شَأَمَ:** بەدیهێنا، بەدبەختی و شومی گرتی، نەگبەتی هات بەسەرا
**شَأمَ القَوم:** بەدبەختی و بەلاو دەردەسەری بەسەرا هێنان
**شَأْمَة:** چەپ ، چۆپ ، چۆپە، لای باکوور، بەرانبەری راست لەلەش یا لەشتداو یان واژی لای راست
**شَئمَة ـ شُئمَة:** خوو، سروشت، عادەت، دەق پێوەگرتن، رەوشت، رەفتار
**شَأَمَهُم:** بەدبەختی و شومی بۆهێنان
**شَأنَ ـ شَأنَا:** پلەوپایەداربوو، کەسێتی و پلەوپایەی بۆ دروست بوو، پایەداربوو، شکۆمەندبوو
**شَأنَ فُلان:** شوێن دەستوورو رێسای ئەوکەوت، پەیرەوی یاساو شێوازی ئەوی کرد
**شَأن:** کار، چاڵ ، بار، کێشە، پێویستی، کاروبار، ئارەزوو، مەبەست، چۆنیەتی، پەیوەندی، بایەخ، گرنگی، رەگی نێوکرۆکی دارخومار یان روەك، فرمێسك رژەکان

**شـأو:** مەبەست ، ئامانج، ئـاوات ، ویست، خواز، حەز، کۆتاو دوایی، ماوە

**شـأوتُ القـوم:** پێشیان کـەوتم ، بـەر لەوان ڕۆیشتم

## ش ب

**شَبَّ الغُلاَمُ:** بوو بەلاو، پێگەیی، هەڵیدا، نەشو نمایکرد

**شَبَّ الفَـرَسُ:** دەستی بەرز کـردەوە، چوستو چالاك بوو، چابوك بـوو، هـەڵ سڵەمیەوە

**شَبَّ النَّـار:** ئـاگری کـردەوە، هـەڵی گیرسان، دایگیرسـان ، گەش بـوەوە ، سووتا

**شَبَّ الشَّيء:** ڕازاندیەوە، جوانی کـرد، دەستی پیاهێناو قەشەنگی کرد

**شَبَّ الخِمَارُ وَالشَّعْرُ لَونَ المَرْأة:** جوانی دەرخست ، جوانی خستە ڕوو

**شَبَّ لَـهُ الشَّيء:** مۆڵـەت دراو خـوای گەورە بۆی ئاسان کرد

**شَـبَّ:** گـەنج ، لاو ، جـەحێل، تـازە پێگەیشتوو

**شَبَّا النَّـارُ:** ئـاگری کـردەوە، هـەڵی گیرساند

**شَبَا الوَجْه:** درەوشایەوە دوای گۆڕانی، روون بوەوە

**شَـبَائك:** دوژمنایـەتی، دژواری، دژایەتی، ڕکە بەرایەتی

**شَبَاب:** لاوێتی، گەنجێتی، سێرە، تافی لاوێتـی، تەمـەنی لاوی‌و جـەحێلی، سەرەتای باڵق بوون هەتا سی ساڵی

**شَبَاب:** ئەوەی ئاگری پێ هەڵدەگیرسێ، شادمانی‌و چوستو چالاکی

**شَـبَاة:** تیـژی هەرشـتێك، ئەسـپێکی گەردن نەرم

**شَبَارِق:** پارچە، لەت ، کوت ، کارتك، سـاد، کووزی، چێنـی، برکە، کـەرتك، تیلمە، ژەنیك، پچ ، فـەقل ، لەهـ ، زۆلا، چزال، کولك، پـەترۆك، هەرشـتێك لەت لەت کرابێ

**شُـبَاط(الشَّـهْر الثَّـاني المِيـلاَدي):** ڕەشـەمێ ، مـانگی ڕەشـەمێ، چلـە، سبات ، سیاو مانگ، مانگی هەرە دوای زستانە، مانگی دووەمی زاینییەو (28) ڕۆژە

**شَبَاعَة:** زیادەخۆری دوای فێربوون

**شُبَاك:** پەنجەرە، دەلاقـە ، مـەرەد، ڕەواقـە، بەرکاز، چوارچێوەیەکی پـڕ لەشووشـە بەندە بۆ ڕووناکی ژووران لەناو دیوار دەخرێت

**شِبَاك:** تۆڕی ڕاوکردن، ڕاوچی، ئەوەی پەنجەرەو دەلاقە دروستدەکات

**شِـبَام:** ئـەو دەمەوانەیـەی دەکرێتـە دەمـی بێچـوە ئـاژەڵ هـەتا دایکیـان نەمژن

**شَبَّبَ:** یـاری ڕۆژانـی جـەحێلی‌و لاوی کردەوە کەوا گاڵتـەو ڕابواردن‌و کەیف دەرکردنی تیایە

**شَبَّبَ الشَّاعِرُ الفَتَاة:** جوانی کیژەکـەی دەرخست ، هۆنراوەی پیا هەڵدا

**شَـبَّبَ قَصِيدَتَـهُ:** جوانیکـردو تیـایدا باسی جوانی ژنانی کرد

**شَبَّبَ الكِتَابَ:** دەستی پێکرد

**شَبَّتِ النَّارُ وَالحَرْبُ:** هەڵگیرسا، ڕوویدا، دەستی پێکرد

**شَبَتَ فِيهِ النَّار(إحتَرَقَ):** ئـاگری تێبەربوو، ئاگری گرت ، گڕی گرت
**شَبَت ـ شِبِت(إسمُ نَبَات):** شـویت ، دەستچێنە، شیووت، چوویـت ، دۆراخ، گیایـەکی گـەڵاوردی تـامو بۆنخۆشـە دەکرێتـە چێشتی دۆڵمەو دۆوماسـتاو تۆراخەوە
**شَبِثَ بِكَذا:** پێوەی نووسا ، پێـوەی لکا، پیا نووسا
**شَبَث(عَنكَبُوت):** قژقـژە، جاڵجاڵۆکـە ، پیرعەڤۆك، تەڤ پیرك، هەزارپێ، بلۆ ، پـیر هـەلالووك، پەسپەسـکلێ، سەسپەسەکۆلێ، داپیرۆچك، ماماڵـە، کاکڵەمووشـان، پنـد، پندەپـیر، دەعبایەیـەکی چنـگ چنگـە لـەکونو قوژبنـی دیـوارو بنمیچایـە داوێکـی زۆباریك هێلانـە دەتـەنێو بـۆ گرتنـی مێش و مەرۆش
**شَبِث:** چنـۆك، داواکـەر، چلێـس، خۆهـەڵواس، کاسـەلێس، ماسـتاوکەر، ئەوەی خـۆی بەیـەکێکدا هەڵدەواسێو لەبـەر بـەرژەوەندی مامەحەمـەیی و مەرایی بۆ دەکات
**شَبَث:** سەوزە ، سەوزەوات
**شَبَثَة:** یەکێك لەهاورێی نەبێتەوەو بـۆ بەرژەوەندی لەگەڵیا بێت
**شَبَحَ الشَيء:** درێژی کرد، رایکێشا، رای کشان، پاڵی خست ، تەختی کرد
**شَبَحَ الجِلد:** پێستی کشان ، کشـاندی، درێژی کرد
**شَبَحَ الرَّجُل(مَدَّ يَدَيه):** دەسـتی درێژکرد، دەستی پان کردەوە

**شَبَحَ الرَّجُل(مَدَّ):** پـاڵی خسـت بـۆ دارکاریی
**شَبَحَ الدَّاعي:** دەستی هەڵبڕێ بـۆ نـزاو پاڕانەوە، دەستی پانکردەوە بۆ دوعاو نزا
**شَبَحَ فُلان:** دەرکەوتو خـۆی نوانـد، خۆی بەدەرخست
**شَبُحَ الرَّجُل ـ شَبَاحَة:** هـەردوو دەستی بلاو بوەوە، دەست بلاوو گوشادبوو
**شَبَحَ فُلانٌ:** بەهۆی پیریەوە شتی لێکۆڕا بۆ دوان ، زۆر پرسیاری کرد
**شَبَّحَ الشَيء:** بـاڵی بلاوکردەوە، بـاڵی راخست،پاکی کرد، پێستو توێکڵەکەی لێکردەوە
**شَبح ـ شَبَحَ:** کـەس ، زەلام ، تارمـایی، خێو،سێبەر،دەرگا ، دەروازە، دەرگای بەرزی بینا
**شَبَحُ الحَـرب:** مەترسـی جـەنگ ، دەرئەنجامە خراپەکانی جەنگو شەڕ
**شَبَحُ الخَوف:**ترس لێنیشتن ، مەترسی، ترسان لەشتێك کەهێشتا رووی نەدابێ
**شَبَحَان:** درێـژ ، کشـاو ، کێشـدار، بەپێچەوانەی کورتەوەیە
**شَبَحَانُ:** دوو دارەی گواسـتنەوە، دوو لای ئامرازی گواستنەوە
**شَبحَة(قَيد):** کۆت ، قـۆت ، پـەتی، کۆل ، پێوەنـد، پابـەند، دەسـتبەند، خـەلیلی، سندم ، جـۆرە پێوەندێکـە لەدەستو پێ دەکرێ
**شَبر ـ شَبَرَ(قَاسَ بَالشِبر):** بەبسـت پێوای ، ئەندازەی بەبست گرت
**شَبَرَ الشَـيء:** ئـەندازەی گـرت ، وای خەملاند، وای دانا

**شَبَّرَ فُلاناً:** بەمەزنی دانا ، بەگەورەو شکۆمەندی دانا

**شِبْر:** بست ، بنگوست، بنست ، بنگس، بهۆست، بۆست، پانی دەستی کراوەیە لەسەری قامکە تووتەڵەوە هەتا سەری قامکە گەورە

**شَبَر:** بەخشین ، بەخشیش، خێرکردن، چاکە، باشە

**شَبْر:** مارەیی، هاوسەرگیریی، ژنهێنان و شووکردن

**شِبْرَاق** توندو تیژی هەرشتێك، لەت لەت و کۆنەی قوماش

**شُبْرَة:** پەنجە درێژ یان کورت بێت

**شُبْرَة:** بەخشین ، بەخشیش ، پێدان

**شَبْرَقَ( قَطَعَ وَمَزَّقَ ):** لەت لەتی کرد، لەت و کوتی کرد، پارەپارەی کرد، ونجڕونجڕی کرد

**شَبْرَقَ اللَحْم:** گۆشتەکەی کوت کوتکرد، پارە پارەی کرد ، لەت لەتی کرد

**شَبْرَقَ البَازِيُّ الصَيْد:** لووشیداو لەت و پەتی کرد، لەت و پەتی کرد، پارچە پارچەی کرد

**شِبْرِق:** بەچکەنێرەی پشیلە، گوربە، گیایەکە

**شِبْرِقَة:** پارچەیەك لەجل و بەرگ، کوتە جل و بەرگێك، کورتە گیای بەرین و بڵاو بڵاو

**شَبَطَ فِيهِ( لَزِقَ ):** پێوەی نووسا، پیالکا، تێوەی ئالا

**شَبِعَ:** تێربوو، گەدەی پڕبوو لەخواردن

**شَبِعَ الجِسْم:** تێکسمڕا ، قەڵەوبوو، گۆشتی گرت

**شَبِعَ مِنَ الأَمْر:** بێزاربوو لێی ، جارسبوو، بێتاقەت بوو، نیگەران و سەغڵەتبوو

**شَبُعَ عَقْلُهُ:** عەقڵ و بیری فراوان و پتەوبوو، عەقڵی گەورەو گوشاد بوو

**شِبْع - شِبَع:** ئەوەی تێر دەبێت ، تێربوو، پڕ ، تێرە خۆرە

**شَبَعَ( إِكْتَفَى ):** بەسی بوو، تێربوو

**شَبِعَ مِنْهُ:** پڕبوو، لێی پڕبوو، لێی تێربوو

**شَبَّعَ ( جَعَلَهُ يَشْبَع ):** تێری کرد، پڕی کرد

**شَبَّعَ بِالكَهْرَبَاء:** بەهۆی هەورەتریشقەوە پڕ هێزو بارگەی کرد

**شَبِعَتْ غَنَمُهُ:** خەریکبوو تێر ببێت بەڵام تێر نەبوو

**شَبْعَان:** تێر، مڕ، تەسەل، سێر ، تێرو پڕ، دژی برسی

**شَبْعَى:** ژنی بەهێزو بازو پتەو ، تێکسمڕاو، قەڵەو ، گۆشتن

**شَبِقَ - شَبَقاً:** ئارەزووی هەڵسا ، حەزی جۆشا ، ئارەزووی هاتە هەژان ، ئارەزووی جووت بوونی هەبوو، ئارەزووی مێینەی کرد

**شَبَق:** ئارەزوو هەڵسان ، ئارەزوو حەز کردن

**شَبَقُ الأُنْثَى:** ئارەزووی جووت بوون ، حەز بەتکەگرتن

**شَبِق:** بەئالۆش ، چلێس، بەزەوق، ئارەزوو پەرست ، هەوەس باز

**شَبَك - شَبْك:** ئالۆزکانی، تێکی ئالاَن ، کردی بەناو یەکا

**شَبَكَ الأُمُور:** تێك ئالاَ، لەیەك ئالاَ ، تێکەڵبوو، کەوت بەسەر یەکا ، شێوا بەناو یەکا

**شَبَكَ الشَيءِ بِغَيرِه:** گەیاندی بەیەك
**شَبَكَ الفَتَاةُ ( خَطَبَهَا ):** خوازبێنی کرد، داوایکرد،نیشانەیکرد،دەستنیشانیکرد، دیاری کرد
**شَـبَكَةَ( قَرَابَـــة ):** خزمایـــەتی، خوێشـایەتی، تێکـەڵاوی ، خنـامی، لـێزمی ، نزیکـیو کەسـایەتی یـەکێك لەگەڵ کەسێکدا
**شَبَكَة:** تـۆڕ، داو، شـەبەك، تەڵـە، تەشـقەڵە، شـتێکە وەکـو رەشـکەی کاوایە راوی ماسیو باڵندەی پێدەکەن
**شَبَكَة( هَدِيَـة الخُطُوبَـة ):** نیشـانە ، دەست نیشانکردن ، تات ، تەهت کرن
**شَبَكَة العَين:** تۆڕی چاو ، تۆڕە
**شَبَلَ الغُلاَمُ:** بـەنازداری گـەورە بـوو، بەناز بەخێوکرا
**شَبَلَ عِنْـدَ الغُـلاَم:** لای ئـەو پێگـەیی ، بەخێوی کرد
**شِـبْل:** بەچکەشـێر، بێچـوە شـێر، شێرکوڵ، شێرکۆڵە
**شَبِمَ الجَدِيُ:** دەمەوانـەی کـردە دەمـی بێچوە ئاژەڵەکـە هـەتا مـەمکی دایکـی نەخوات
**شَبِمَ المَاء:** ساردبوو
**شَبِمَ - شَـبَمَاً:** ساردیکرد، هەسـتی بـە برسێتیو سەرمای کرد
**شَـبَم:** برسـێتی ، سـەرماو برســێتی بەیەکەوە
**شَبَنَ الغُلاَم:** بەنازداری گەورەبوو، بەناز بەخێوکرا
**شَبَنَ الغُلاَمُ:** خڕو خەپان بوو، پێگەیی
**شَبَنَ الشَيء:** نزیك بوەوە، هاتەبەر

**شَبَّه بِكَذَا:** لەئەو دەچێ ، بەوی زانـی، شێوەی ئەوی لێکرد
**شَبَّهَ بِـهِ( قَــارَنَ بَينَــهُمَا ):** بــەراوردی کردن، بەراوردی کرد لەنێوانیاندا
**شَبِّهَ عَلَيهِ الأَمْـر:** بـەگومان بـوو لێـی ، گومانی لەسەر بوو
**شَــبَّهَ الشَــيءَ بِالشَــيء:** چوانــدی، لەشتێکی دیکەی کرد، لەبری ئەو داینـا بەهۆی سیفەتێکی هاوبەشەوە
**شِبْهُ( مِثْل ):** وەکـو ، هـاو ، واکینـۆ، چەشن ، وەکە هەڤ ، وەکەتە ، فەنا
**شِــبْه:** لێکچـــوون ، هاوشـــێوەیی ، هاوچەشنی ، وێنە
**شِبْه جَرِيمَة:** کەنگـە تـاوان ، سـوکە تاوان ، نیمچە تاوان
**شِبْهُ جَزِيـرَة:** نیمچـە دوورگـە ، نیــوە دوورگە
**شِبه رَسْمِي:** نیمچە رەسمی
**شِـبْهُ مُنْحَـرِف:** نیمچـە لار، نیمچـە لا تەریب
**شِبْه وَشَبَه:** زەرد، براس
**شَبَهُ:** لێکچوون ، گیایـەکی هـەڵچوەو گوڵێکی سووری هەیە
**شُبْهَة:** گومان ، گومان کـردن ، گومـان لێکـــردن ، دوودڵـــی ، دڵاو دڵـــی، سـووکردن ، بـەدگومانی ، تێکـەڵبوونی حەقو ناحەق یان حەلاڵو حەرام
**شُــبُوب:** هــەڵچوون ، هەڵگیرســان ، پێداچوون ، هۆرشین ، پەروازە
**شَبُوب:** ئەوەی شتێك بەباش دابنێ
**شَبُور:** کەرەنە، فیکە ، کەرەنا ، بووق

**شبُوط:** سووره ماسی، جۆره ماسیەکی سوورەو گۆشتی زۆر خۆشە
**شَبِيَّة:** جوانخـاس ، لاو ، هـەرەتی لاوێتـی کەلـە بـالّغ بـوون هـەتا سـی ساڵیە، سەرەتای هەموو شتێك
**شَبِعْ:** زۆر ، تێر، فرە ، یەکجار
**شَبِينْ:** بـرازاوا ، برازاڤـە، بـرا یـا برادەرێکـی زاوایـە کەلـەرۆژی بـووك گواسـتنەوەدا پشـتوێنەی بـووك دەبەستێ
**شَبِينَة ـ إشْبِينَة:** بەربووك ، پۆرِ سپی ، باخەسوو ، پێخەسوو، ژنێکە لەگـەڵ بووك دەچێت بۆ ماڵی زاواو کاتی هاتنە دەرەوەی جوتـە هاوسـەر لەپـەردە دەگەرێتەوە بۆ ماڵی بووك
**شَبِيهْ:** هاووێنە ، وەکو ، هاوچەشـن ، هاوشێواز، هاو وێنە ، لەوچوو، وێکچوو

**ش ت**

**شَتَّ:** بلاوبـووەوە، پـەرش بـوو، پەراگەندەبوو ، جیابووەوە، تونـابوو، تەفروتونا بوو
**شَتَّا بِالْمَكَان:** زستان لـەوێ مایـەوە، زستان تیای هەڵیدا
**شَتَّا الْيَوم:** سەرماکەی سەخت بـوو، زیادی کرد ، فرە بوو
**شَتَّا السَّمَاءُ:** ئاسمان بارانی باراند
**شَتَّا بِالْبَلَدْ:** رۆژانی سەختی سەرما لـە ولات بوو
**شَتَّى فُلاَنـاً:** بـۆ زسـتان بەشـی کـرد، بەسی بوو لەزستاندا
**شَتِّي:** بارانی زستان
**شَتَّى:** هەمەجۆر، هەمـەرەنگ، جیـاواز، گۆنا گۆن

**شـتَـاء:** زسـتان ، زسـان ، زمسـتان، جسـتان ، زڤسـتان، سـێ مانگـەکانی نێوانی پاییزو بەهارەو لە 21ی کـانونی یەکەم بۆ 21 ئـازار دەست پێدەکات ، هەروەها ئەم وشەیە بەمانای برسـێتیو قاتو قریش هاتووە
**شَتَات:** پەراگەندەو جیـاواز، جیاجیـا، بلاوو پەرەوازە، تەفروتونا
**شـتَّـام:** دەم پیـس ، جنێوفـرۆش ، دەمشڕ ، یـەکێك زۆر جنێـوو قسـەی ناشیرین لەزاریا بێتە دەرەوە
**شَتَّام(سَيِء الخُلُق):** بێئـابروو، بـەد رەوشت، سووكو رسوا، نزم
**شـتَّامَة:** بەدرەوشـت،بێئـابرویی، سووكو رسوایی ، نزمی
**شَتَّانَ (بُعْدَ):** زۆر جیـاوازن، یـەکجار دوورن لەیـەك، هەرناگـەن بەیـەك ، نێوانیان مابەینی ئاسمانو رێسمانە
**شَتَّرَ الشَّيءَ:** بری ، پارچەپارچەیکرد، کوت کوتیکـرد، لـەت لـەتیکرد، لـەتو پەتیکرد
**شـتَّـرَ الرَّجُـل:** بریـنـداری کـرد، زامداریکرد
**شَتَّرَ العَينْ:** پێڵوەکانی هێناو برد
**شَتَرَ ـ شَتَرَاَ:** برا ، پچرا ، لەیـەك بـرا ، لەبەر یـەك هەڵوەشـا، لێوی ژێـرەوەی قڵیش قڵیش بووبوو
**شَـتَرَ بِـه:** قسـەی ناشـیرینی پێگـوت ، جنێوی پێدا ، بەدگۆیی کرد بەرانبەری
**شَتَّرَ بِه:** جنێـوی پێداو قسـەو گوتـەی نـاقۆڵاو خراپـی دا بـەگوێدا ، سووکایەتی کرد بەرانبەری

**شَـــتَرْ:** پچــڕان ، لەیـــەك بـــڕان ، هەڵگەڕانەوە، دژواریی

**شَتْرَة:** مابـەینی دوو پـەنجـە ، نێـوان پەنجەو قامکەکان

**شَتَلَ الـزَّرْعَ:** گواسـتیەوە، چـاندی، چەقاندی، هەڵیکەند هـەتا یـەکێکی دی لەشوێنی بنێژێت

**شَتْلَة:** شەتڵ، نەمام ، شـتل ، نەشـتر، بنتـاو، سـەوزاییەکە لەشـوێنی خـۆی هەڵکەنرابێ بەڕیشەوە بۆ چەقاندنەوەی لەشوێنێکی تردا

**شَـتَمَ(سَـبَّ):** جنێـوی‌دا، جوێنـی‌دا، دژوێنی‌دا

**شَتُمَ - شَتَامَةً:** رووگرژو ناشیرین بوو

**شَـتَّمَ تَشْـتِيماً:** زیـادەڕەوی کـرد لەدژواری‌و دژایەتیدا

**شَتَمَهُ:** پێـی داگرت لـەجنێوو قسـەی ناشیرین پێکوتنیـدا ، تونـد دابەزییـە سـەری بـەجنێوو قسـەی نـاقۆلاو نادروست

**شُتُوتْ:** خەڵکانێك کەسەر بەیـەك هـۆزو تیرە نەبن ، خەڵکی فرە هۆزو تیرە

**شَتْوَة:** زستان ، زمستان

**شَـتَوِيّ:** زسـتانە، زسـتانی، میـوەو بەروبوومێك یان هەر شتێك تایبەت بێت بەوەرزی زستانەوە

**شَتِيّ:** بارانی زستان

**شِتِّرْ:** مەردومی خراپەکارو بەد، مرۆڤـی زۆر خراپ‌و بەدکار

**شَتِيمْ:** جنێوپێدراو، رووگرژو ناشیرین ، عەبوسی رەزاتاڵ‌و ناشیرین

**ش ث**

**شَثْ:** دارێکـە وەك داری سـێو وەهایـەو تامێکی تاڵی هەیەو هیچ دڕکێکی نییەو گەڵاکانی لەدەباغ‌و پێستە خۆشـکردندا بەکار دەهێنرێت ، گوێزی دەشت ، ئەو پارچەیـەی کەلەسـەرو قوتکـەی شـاخ دابـڕاوەو وەك پەنجـەرەو بەلەکۆنـە وەهایە، هەنگێك زۆر هـەنگوین بەرهـەم بهێنێت

**شَثُنَتْ أَصَابِعُـهُ:** رەق بـوو، توندبـوو، زبربوو

**شَثُنَتْ كَفُّهُ:** رەق‌و زبر بوو

**ش ج**

**شَـجَّ الـرَّأْسَ(كَسَـرَ):** شـکاندی ، قرنجاندی ، بریندار کرد، زامداری کرد

**شَـجَّ المَفَـازَةَ:** بـڕی، تێـی پـەڕاند، گوزەراندی، رابورد بەسەریا

**شَجَّ المَرْكَبُ البَحْرَ:** بـڕی ، لـەتیکرد، ڕێگەی بەنێو دەریا گرتە بەر

**شَجَّ الشَّـرَابَ بِالمَـاءِ:** تێکـەڵی کـرد، ئاوێتەی کردن ، کردنی بەنێو یەکا

**شَجْ - شَجَجاً:** دیاردەی شکاوی لەسەریا دیاریدا، شکاوی بە سەریەوە دەرکەوت

**شَـجَا الرَّجُـلُ شَـجْواً:** شـادمانی‌کرد ، دڵگیری کرد(لەوشـە دژە یەکەکانـە) ، هەژاندن،سیس‌و کزی کرد،غەمگینی‌کرد

**شَجَا:** ئـەوەی لـەبین دەگـیرێ، خـەم‌و خەفەت ، ئاهو ساری

**شِـجَابْ:** دەمەوانـە ، سـەر ، ئـەوەی دەروازەی شتێکی پێدەگیرێ

**شِـجَاجْ:** شـکانێکی سـەخت‌و گـران بەسەرەوە، زامی کاریگەری سەر

**شَجَارْ ـ شِجَار:** هەڵگرێکی پچووکتر لەکەژاوە کە سەرەکەی نەگیرابێ ، کەژاوەی بێسەرو رووپۆش

**شَجَار:** دارێکە لەپشتی دەرگاوە دادەنرێ، دەمەوانەیەك دەکرێتە دەمی بێچووی ئاژەڵ هەتا دایکیان نەمژن ، دەمەوانەی سەربڕ ، سیفەتێکی وشترە، دەم قاڵی، جەنگین و شەڕ

**شَجَّارْ:** ئەو زانایەی سەبارەت بە زانیاری دارو درەخت دەکۆڵێتەوەو توێژینەوە دەکات

**شَجَاعْ ـ شَجَاعْ ـ شِجَاعْ:** ئازا ، مەرد، نەبەرد، جوامێر، دلێر، دلاوەر ، گوستاخ، چاو نەترس، بەزات ، دڵ قایم

**شُجَاع ـ شِجَاع:** جۆرە مارێکە

**شَجَبَ :** تیاچوو، لەناوچوو، فەوتا ، دوایی هات ، غەم دایگرت، دڵگیر بوو، پەژارەداریکرد

**شَجَبَ الغُرَابُ:** خوێندی ، هاواری لێبەرزبووەوە، دەنگی هات

**شَجَبَ الصَيدَ:** تیرێکی ئاراستەکردو لەجموجووڵی خست

**شَجَبَ فُلاَنَاً:** غەمی دایە ، دڵتەنگیکرد، خەفەتی کرد بەدڵیا

**شَجَبَ الشَيء فُلاَنَاً:** سەرقاڵی کرد، خەریکی کرد

**شَجَبَ الشَيء:** رایکێشا ، بەکێشی کرد، کەمەندکێشی کرد

**شَجَبَ الرَأيَ وَالمَوْقِفَ:** نارەزایی لێ دەربڕی ، راو رەخنەی گرت لە هەڵوێستی، بەرپەرچی راو هەڵوێستی دایەوە

**شَجْبُ:** پێویستیو خەمو خەفەت ، خوازیاریی و ویستداری

**شَجُبُ:** نەخۆشیو دەردەداریی کەدەدات لەمرۆڤ ، بەلاَو نەهامەتی لەنەخۆشیو جەنگ دێت بەسەر مرۆڤدا

**شَجِبَ الشَيء:** رۆیی ، چوو، ئاوابوو، بەسەرچوو

**شَجُب:** پایەیەکی چوکڵەدارە لەدار یان ئاسن جلو بەرگی پیا هەڵدەواسرێ

**شَجَبْ(حُزن):** خەم ، پەژارە، خەفەت ، دڵگیری، پەرۆش ، کزی ، پەشێوی ، مەینەت ، ئالووس، تەم، خەمگین، پیشاندن، پیشخواردن لە خەما یان لەتاوا ، خەمازە ، چەمیاگ

**شَجَّة:** برینداری، زامداری، قرنجاندن لەسەرا ، شکانی سەر

**شَجَّجَ عَلَى الأمر:** بەویستو ئیرادەوە سووربوو لەسەر ئەنجامدانی کاروبار

**شَجَجْ:** شوێنەواری سەرشکاندن یان رووبریندارکردن

**شَجَرَ الشَيء:** بەستی ، پەیوەنداریکرد، بەستیەوە

**شَجَرَ فُلاَنَاً:** دووری خستەوەو رێگریکرد

**شَجَرَ فَمَهُ:** کردیەوە، ئاوەلاَیکرد، خستیە سەر پشت

**شَجَرَ الدَابَةَ:** بەرێشمەکەی لێیدا هەتا دەمی بکاتەوە

**شَجَرَ الشَجَرَةَ:** هەندێکی بڕی ، کەمێکی لێکردەوە ، بەشێکی بڕی

**شَجَرَ البَيْتَ:** کۆڵەکەی بۆ دانا ، سایەی بۆ چەقاند

**شَجَرَ النَّبَاتُ:** ئەو لق و پۆپانەی کەوتبوونە خوارەوە بەرزی کردنەوە
**شَجَرَ بَيْنَهُمْ أَمْرٌ:** لەسەر کارێك ناکۆکی کەوتە نێوانیان ، ئاژاوەو ناتەبایی کەوتەوە لەنێوانیاندا
**شَجَرَ مَابَيْنَهُم:** تێکچوون،دەم قاڵیانبوو، بوو بەشەڕیان ، چوون بەگژ یەکا
**شَجِرَ الرَّجُلُ:** دەستەو گرۆهو تاقمەکەی زۆر بوو ، کۆمەڵەکەی زیادیان کرد
**شَجِرَ النَّبَاتُ:** بوو بەدار
**شَجَّرَ النَّخْلَ:** هێشوەکانی خستە سەر راخەرێك لەپووش و حەسیر هەتا تێکنەچێ
**شَجَرْ:** ئەوەی لەسەر قەد رابوەستێ لەروەکەکانی زەوی دارودرەخت و..
**شَجْر:** باس و خواسێك ناکۆك و جیاوازین لەسەری ، دەرچەی زارودەم ، مابەینی دوولای ریش و چەناگە
**شَجِرٌ:** بێشە، دارستان ، جەنگەڵ، جەنگەڵستان
**شَجْرَاء:** دارو درەختی پڕوچڕ ، زەوییەك پڕ لەدارو درەختی‌پڕوچڕبێت، دارو درەخت و هەر روەکێکی خاوەن قەدو لاسك
**شَجَرَة:** دار ، درەخت ، داری سەوزو سێبەردار بەرداربێت یان بێ‌بەر
**شَجَرَةُ النَّسَبْ:** رەگەزنامە، رەچەڵەك نامە
**شَجَرَةٌ عَقِيمَةٌ:** پەرك ، زڕ، بێ‌بەر، داری زڕ، داری بێ‌بەرْ
**شَجُعَ:** ئازابوو، دلێربوو، لێهاتوبوو، نەبەردبوو

**شَجِعَ:** درێژبوو ، کشا ، بالأبوو
**شَجَّعَ:** غیرەتی نایەبەر، بەهێزی‌کرد، ئازای کرد، پشتگیری کرد ، یارمەتیدا
**شَجَّعَ عَلَى الأَمْر:** هانیدا بۆ کارەکە ، غیرەتی خستەبەر
**شَجْعُ:** رەگو ریشەی درەخت
**شَجِعُ:** وشتری شێت و هار، شێتە وشتر
**شَجْعَاء:** شێری بێشەلأن ، بەزات و دڵ قایم ، رۆژگارو سەردەم ، جۆرە مارێکە
**شَجْعَة ـ شَجَعَة:** مەردومی کەم توانا و ترسنۆك
**شَجِنَ ـ شَجُنَ:** دلگیربوو، خەفەتباربوو، خەم دایگرت،دڵی تەنگ بوو، لێوبەباربوو
**شَجِنَ ـ شَجَّنَ:**دلگیریکرد،خەفەتباریکرد، پەژارەداریکرد، خەمی دایە
**شَجَن ـ شُجُون:** داخ ، خەفەت ، خەم ، پەژارە، دلگیری، دلگیربوون، لێوبەباربوون ، کەسەر
**شَجْنُ:** لق و پۆپی بەیەکا هەڵچوو ، بەشێك لەهەموو شتێك
**شَجَنَت الحَمَامَةُ:** دەنگی هەڵبڕی‌و دووبارەیکردەوە ئەمەش عەرەب بەشیوەن و ماتەمینی داناوە
**شَجَنَت الأَمْر فُلانَاً:** گرنگ بوو لایی‌و سەرقاڵی‌کرد، خەریکی کردو خەم و پەژارەی کرد بەدڵیا
**شَجْنَة ـ شِجْنَة ـ شُجْنَة:** بەشێك لەهەموو شتێك، لق و پۆپی بەیەکا چوو ، دارو درەختی چڕو پڕ
**شَجْو:** خەم ، خەفەت ، دلگیری، پەژارە، پێویستی ، کەمێك گریان و زاری

**شَجْوَى:** خەمناك ، دڵگیر ، خاكەساری، پەرێشانی ، بەدبەختی ، چارەڕەشی ، لێقــەوماوی، خــەمباری، دڵتــەنگی ، پەرۆشداری، سیاچارەیی

**شَجِيّ:** خەمناك ، دڵگیر ، خاكەسـاریی، خەفەتباریی، لێقەوماویی ، بەدبەختی، چارەڕەشی

**شَجِيَ ـ شَجَا:** خەمناك بوو، خاكەسـارو بەدبەختبوو،چارەرەش‌و مەینەتباربوو

**شَجِي ـ شَجِيّ:** خەفـەتبار ، خــەمناك ، دڵگـیراو ، لێوبـەبار، یـەكێك ســەرقاڵو خەفەتبار بێت ، نیگەران‌و دڵتەنگ

**شَجِيَّة:** سەرقاڵ ، خەفەتبار ، لێوبەبار، خاكەسار

**شَـجِيرْ:** مــەردوم‌و وشــتری بێگانـــە ، هـاوەڵو بـرادەری بـەدو هیــچ كـارە ، شمشێر ، تیغ

**شَـجِيرَة:** دەوەن ، دەوەنــــد، دەوون، بنكەدار بەروو یا مازوو كەبڕابێ‌و هــەڵی دابێتەوە

**شَـجِيغْ:** مێــخ ، ســنگ، پـــەرواز ، پێكۆڕەك ، چیخ ، مێچ ، كەلەمۆك

**شَـجِيعْ:** ئـازا ، دڵ قــایم ، بــەزات ، دلاوەر، دڵ پڕ

**شَجِيعَة:** ژنــی دڵ قـایم‌و دلاوەر ، ژنێـك بەزات‌و دلێر بێت

## ش ح

**شَحَّ الشَّيءُ:** كەم بوەوە، كەل بوو

**شَحَّ بِالشَّيءِ وَعَلَيهِ:** لێی كەم كـردەوە، لێی‌ی گرتەوە، كەمی كردەوە، بەخیلی نوانـد بەرانبـەری ، ئـێرەیی بـردو لێــی گرتەوە

**شَـحَّ الْمَــــاءُ وَنَحْــوهُ:** كــەم بــوەوەو دەگمەنبوو، نەوازەو كەم بوو، سەخت‌و گرانبوو دەستكەوتنی

**شَحْ ـ شُحْ ـ شِحْ:** چرووكی ، ڕژدیــی ، ڕەزیلی، پیسكەیی، پووچی

**شَـحَّ:** كــورت بینــی ، ســووربوون ، تەنگەبەریی لەتێڕوانیندا

**شَحَا الرَّجُلُ:** زاری كردەوە ، هـەنگاوی دوورو پان‌و بەرینی نا

**شَـحَا فِـي الفِتْنَــةِ:** تێراماو زیــاتر قوڵبـوەوە تێیـدا ، ڕۆچـوو لەئاشــوب‌و ئاژاوەگێڕیدا

**شَـحَا اللِجَـامُ فَـمَ الفَـرَسْ:** دەمی ئەسپەكەی ئاوەلاكرد، زاری كردەوە

**شَحَا الفَمُ:** كردیەوە، ئاوەڵای كرد

**شَحَا:** فراوانی‌و گوشادی هەموو شتێك، بۆشایی هەموو شتێك

**شَحَائِحْ:** ئەم وشـەیە بـۆ وشـكە ســاڵ : بێ‌ئـابرویی ، قـات‌و قـڕی : نــەبوونی : ڕۆژگاری پڕ مەینەت‌و نەهات؛ بەكاردێت

**شَـحَّاجْ:** گوێدرێـژی كێویــی ، كـــەری وەحشی

**شَحَّاجْ:** هێستر یان قەلەڕەش

**شَحَّاحْ:** ڕژد ، ئێرەیی بەر، چاوبرسی ، كۆڵ نەدەر

**شَحَّاحَ مِنَ الأَرْضِ:** ئــەو زەوییــەی ئـاوی لەبـەر نـاڕوات مەگــەر ئاوەكـە خــوڕو بەلێشاو بێت

**شَحَّاذْ(مُتَسَوِّل):** سوالكەر، دەرۆزەكەر، خــودازۆك، دەركۆدەركــۆ، لەتـــەچن، لەتـــەچین، خووازەڵـــۆك،گــــەدای دەرۆزەكەری

**شحاذة:** پیشەوکاری سوالکەریی و دەرۆزەیی

**شحاط:** دوور، دوویر، واژی نێزیکە

**شحاطة:** سۆل، پاپوچ، کەوشی پەل و سووك، جۆرە پێلاوێکی نەرم و سووکەو لەناو مالا لەپێدەکرێ

**شحام:** چەوریو بەزو پیو فرۆش، یەکێك بەزو پیوو یان چەوری زۆر دەرخواردی خەلکی بدات

**شحب لونه:** رەنگی گۆڕا بەهۆی برسێتی یان نەخۆشی یاخود هەر گرفتێکی دیکەوە

**شحب جسمه:** رەنگی گۆڕاو کزو سیس و لاوازبوو

**شحب وجهه:** رەنگی پەڕی، رەنگی هەلبزڕکا، زەردهەلگەڕا، تێکچوو گۆڕا

**شحت:** سوالیکرد، دەستی پانکردەوە، دەرۆزەرییکرد، دەرکۆدەرکۆی کرد

**شحث:** سوالیکردو زۆر پاڕایەوە لەخەلکی بیدەنێ

**شحج البغل أو الغراب:** دەنگی لێوەهات و دەنگێکی رەق و زبرو ناخۆش بوو

**شحذ السكين ونحوه:** تیژیکرد، ساویدا، برەڕی کرد

**شحذ الشيء:** پاکیکرد، دایمالی، توێکلەکەی لێکردەوە

**شحذ في التسول:** زۆریکرد، پێی داگرت

**شحذ عليه:** تورەبوو، خەشم گرتی، رقی هەستا

**شحذ الدابة:** بەتوندو تیژی بەکێشیکرد، توند لێی خوڕی

**شحذ(سن):** تیژکردن، دەمەزەردکردن، لەهەساندان

**شحذه ببصره:** چاوی تێبڕی، چاوی لێ زەق کردەوە

**شحر:** دەمی کردەوە، زاری کردەوە

**شحر:** هێس گرتی، هێسی لێنیشت، دوکەلی گرت، رەش بوو

**شحر:** سێلاو، دەروازەی ئاو، جۆگە، نێوەندی شیوو دۆل

**شحر عمان وشحر عمان:** کەناروۆخی دەریا لەمابەینی (عومان)و (عەدەن)

**شحرة:** دەریاچەی تەنگو نابەرین

**شحرور:** ریشۆلە، هەزار داستان، سێرو، بالندەیەکی رەشی کونجی دندوك باریك و درێژە لەچۆلەکە گەورەترە بەگەلێ جۆر دەخوێنێ

**شحط الإناء:** پڕیکرد، لێوان لێوی کرد، سەرپڕی کرد

**شحط اللبن:** ئاوەکەی زۆربوو، ئاوی زیاتربوو، ئاوی پتر بوو

**شحط العقرب الرجل:** پێوەیدا، گەزتی، ژارەکەی کردە نێو جەستەیەوە

**شحط الطائر:** ریقنەیکرد، جیقنەیکرد

**شحط فلانا:** پێشی کەوت، بڕیدایەوە، بەرلەو رۆیی

**شحط في المساومة:** رۆچوو تێیدا هەتا سنووری ئاسایی بڕی

**شحط الناقة:** نەخۆشیو دەرد دای لەسینەیو پێشینەك بوو بۆ مردنی

**شحط القتيل في الدم:** تلایەوە، رۆچوو، گەوزا لە خوێنی خۆیدا

**شحط الكرمة وغيرها:** لقو پۆپە تەڕەکانی درانە پال ئاسن یان دارێك بۆئەوەی رێك ببێت

**شَحَطَ الشَرَابُ:** ئاوی تێکەڵکرد هەتا خۆش ببێتو لەگەڵ ویستو حەزی خۆیدا بگونجێت
**شَحَطَ ـ شَحطَ الجَمَلُ:** سەری بڕی ، خوێنی ڕشت
**شَحْطَ ـ مِشْحَط:** کۆڵەکەی مێو ، دەستەك، داری دارەڕای سەرکاریتەو سەریانان
**شَحطَة:** شوێنەواری ڕنینو توێکڵو پێست لێکردنەوە ، نەخۆشیەکە دەدات لەسینەی وشترو دەیکوژێت
**شَحْطَة (عودُ الثقَاب):** دەنکە شقارتە
**شَحْفُ:** توێکڵ لێکردنەوە، بەرگ گرتنەوە
**شَحَكَ الجَدْيِ:** دەمەوانەی کردە دەمی بێچووی ئاژەڵان بۆئەوەی دایکیان نەمژن
**شَحَلَ الكَرْم:** لقو پۆپەکانی بڕی
**شَحَمَ الطَعَام والخُبْز:** ڕۆنی تێکردن، چەوری تێکردن
**شَحَمَ القَومَ:** بەزوپیوی دەرخوارددان ، چەوری دەرخواردان
**شَحِمَ ـ شَحَماً:** قەڵەوو پڕبوو، تێکسمڕا
**شَحِمَ العِنَبُ:** وشك بووەوە، ئاوی تیانەماو توێکڵەکەی وشك بوو
**شَحِمَ الرُمَانَة:** ئەوپەردە ناسکەی بەسەر دەنکەکانەوەیە ڕەقو زبر بوو یان خراپ بوو
**شَحُمَ ـ شَحَمَ:** بەزو چەوری زۆربوو
**شَحِمَ ـ مُشْحِم (كَثِير اللب):** دەنك زۆر ، پڕکاکڵە ، کاکڵەدار
**شَحْم (دهْن):** ڕۆن ، چەوری، ڕوهن ، کەرە، تەواش، ترنگ

**شَحَمَت النَاقَة:** قەڵەو بوو پاش لاوازی، گۆشتن بوو
**شَحْمَة:** پارچە ، بەز، پیو ، دوگ ، چەوری
**شَحْمَةُ الأذُنْ:** نەرمەی گوێچکە ، پەڕەکەی گوێ
**شَحْمَةُ الأرْض (كمـا):** دومەڵان ، دوومبەڵان، جۆرە قارچکێکی بەهاریی خڕی گەرمیانییە لەزەوی هەڵئەتۆقێ
**شَحْمَةُ العَين (مُقْلَتَها):** گلێنە ، گلێنەی چاو ، بیلبیلەی، ڕەشکێنەی چاو ، کانی چاف، گلینکە ، گووزەکاچاف، کزن، شتیکی خڕی تویَ تویَیە لەناو کالانەی چاوا کەبیلبیلەی تیایە
**شَحَنَ السَفِينَة:** پڕیکرد ، لێوان لێویکرد
**شَحَنَ الرَجُلَ:** دەریکرد، دووری خستەوە، پەراگەندی کرد
**شَحَنَ السَفِينَة أوْ السَيَارَة (مَلأهَا):** باریکرد، باری لێنا
**شَحَنَ البَطَارِيَة:** پڕی کردەوە ، بارگەیدا
**شَحِنَ عَلَيه:** ڕقو کینی هەبوو بەرانبەری ، خەشمو قیندارببوو ڕوویەو
**شَحْن:** ئەوەی دەنرێتو هەڵدەگیرێت بەئۆتومبیلو شەمەندەفەرو فرۆکەو هەر هۆکارێکی تری گواستنەوە بێت لەشتومەکی جیاوازو فرە چەشن
**شَحْنَاء:** دوژمنایەتی، کینە، ڕکەبەرایەتی، دژایەتی، دژواریی
**شَحْنَة:** بار ، بەندەك ، دووتا ، دوولنگەبار، هەرشتێك بەئۆتومبیلو شەمەندەفەرو فرۆکەو هەر هۆکارێکی دیکەی گواستنەوە بگوێزرێتەوە

**شحنة كَهْرَبَائِيَة:** بارگەی کارەبایی

**شَحْنَةُ البَلَد:** ئەوانەی دانـراون لەلایـەن پادشـاو فـەرمانڕەواوە بـۆ پاراسـتنی هێمنـیو ئاسایشـی وڵاتو بـەپۆلیس ناسـراون ، ئەسپی دابەستەو خزمـەت پێکراو ، ئەو ئالیکەی ئامـادە دەکرێت بۆ ئاژەڵ بۆ ماوەی شەوو رۆژێك

**شَحُو:** ناخ ، ناو، ناو ئاخن ، ناوجەرگە

**شَحْوَاء:** بیرێکی گوشادو دەم فراوان

**شَحُوبْ:** رەنـگ پـەڕین ، رەنـگ زەردهەڵگەران ، رەنگ سپی بـوون ، رەنگ تێکچوون ، رەنگ بزرکان

**شَحْوَة:** یـەکجار، هـەنگاو ، شـەقاو ، شـاقاو، هـەنگام ، لـۆق ، ئـەنگاو ، بێنگاف، پێنگاو

**شَحُوذ:** تیژ ، بڕەڕ

**شَحْوَر:** باڵندەیەکی دەنگ خۆشە

**شَحِيحْ:** پـارەپیس ، چـرووك ، رژد ، رەزیل ، پیسکە ، نان کوێـر ، قەمتـەر، پولەکی ، لەڕ ، کەم

**شَحِيحَة:** وشتری کەم شیر

**شَحِيذْ:** تیژ ، بڕەڕ ، لەتکەر ، بڕندە

**شَحِيطَة:** کـبریت، دەنکـە شـقارتە ، شەمچە ، شخارتە، لێخرێنە

**شَحِيمْ:** قەڵـەو ، چـەور ، پڕپـەز، تێکسمڕاو ، کیپەڵە ، گۆشتن

**شَحِيم ـ شَحِيمَة:** پـەڕاوی فـەرزکردنی نوێـژی مەسـیحیە مارۆنیەکانـەو ئـەم وشەیەش سریانییە

**ش خ**

**شَخَّ (بَـال):** مـیزی کـرد، خـۆی خـاڵی کردەوە

**شَـخَّ فـي النَّـوم(غَـطَّ):** پرخـانی ، دەنگێکـە لـەکاتی نوسـتنا لـەلووتی یـەکێك کـە لووتـی تەسـك بێـت یـان گۆشـتی زیادە لەگـەروو لووتیـدا بێـت پەیدا دەبێت

**شَخَابْ:** شـیری دۆشـراو، ئـەو شـیرەی لەگوانی ئاژەڵ دەهێنرێتە دەرەوە

**شُخَابْ:** شیری تازە، تازە شیر

**شَخَبَ اللبَنَ شَخْبَاً:** دۆشـی ، شـیری دەرهێنا لەگوانی ئاژەڵەکە

**شَخَبَ اللبَنُ:** لەبەری رۆیی ، لێی رۆیی

**شَـخَبَ أَوْدَاجُ القَتِيـلِ دَمَـاً:** رەگو ریشەکانی کوژراوەکە بڕاو خوێنی لەبەر رۆیی

**شَخَبْ ـ شُخْبْ:** تـەوژمو لێشـاوێکی شیر لەکاتی دۆشیندا

**شَخَبْ(دَم):** خوێـن ، خـووەن ، خێـن، خوویـن، ون ، هـوون ، شـلەمەنیەکی سوورە لەناو دەمارو رەگـی گیانداراندا دێتو دەچێ

**شَخْبَة:** یەکجار گـوان دۆشـین ، جـارێك شیر دەرهێنان

**شَـخُتَ ـ شَـخْتَاً:** بـاریکو جوانکیلـە ، کەسێك باریك بێ بـەهۆی رێكو جوانـی ئەندامـەکانی نـەوەك لاوازیو سـیس بوونی

**شَخْت ـ شَخِت:** ئـەندام بـاریك ، قەڵـەم رێكو جوان ، باریکەلەی جوانکیلە

**شَخْتُور ـ شَخْتُورَة:** کەشتیەکی پچکۆلە ، گچکە کەشتی

**شَخَرَ:** پرخـەی هـات ، پرخـە پرخـی لێوەهات

**شَخَرَ الفَرَسُ أَوْ الحِمَارُ:** پرمانی ، مرخانی
**شَخَرَ مِنَ الشَبَاب:** سەرەتای لاویی ، تافی جەحێلی ، هەرزەکاریی
**شَخَرَ مِنَ الرَحْلِ:** مابەینی پێش‌و دواوە
**شَخْشَخَةٌ:** تەق‌و هوڕ، تەقە تەق ، ورشە، خشە خش ، خشە، دەنگ‌و جیڕەی کاغەزو هەرشتێکی دیکە
**شَخَصَ الشَيءُ:** بەرزبوەوە، هەڵسا دەرکەوت ، ئاشکرابوو ، لەدوورەوە دەرکەوت
**شَخَصَ النَجْمُ:** دەرکەوت ، هەڵهات ، بەدەرکەوت، دیاریدا، هاتە بەرچاو
**شَخَصَ السَهْمُ:** لەنیشانەکەی خۆی دەرچوو، ترازا لەرووی سەریەوە
**شَخَصَ مِنْ بَلَدِهِ وَعَنْهُ:** لەولاتی خۆی چوە دەرەوە، بەجێی هێشت
**شَخَصَ إلَيهِ:** گەڕایەوە بۆی ، رووی تێکردەوە ، پێی شادبوەوە
**شَخَصَ أَمَامَهُ:** خۆی نواند، خۆی دەرخست، خۆی خستە ڕوو
**شَخَصَ بَصَرَهُ وَبِبَصَرِهِ:** چاوی هەڵهێنا ، چاوی کردەوە، چاوی هەڵبڕی
**شَخَصَ بِبَصَرِهِ إلَى:** چاوی تێبڕی، سەرنجی دایە، ئەبڵەق بوو، دییەی لێ نەتروکاند
**شَخَصَ بِهِ:** باروحاڵێك رووی تێکرد لێی بێزارو نیگەران بوو، ئەوەی رووی تێکرد بێزارو دڵتەنگی کرد
**شَخُصَ ـ شَخَاصَةً:** قەڵەوبوو،گۆشتی گرت ، جەستەی گەورەو زلە بوو
**شَخَّصَ الشَيءَ:** دیاریکرد، دەستنیشانیکرد، ئاماژەی بۆ کرد، دەستی خستە سەر ، ناساندی‌و لەوانی تری جیاکردەوە

**شَخَّصَ الدَاءَ:** نەخۆشی‌و دەردەکەی دەستنیشان کرد، دیاریکرد
**شَخَّصَ المُشْكِلَةَ:** تەنگ‌و چەڵەمەکەی دیاریکرد، ئاقارو تەنگەشەکەی دەستنیشان کرد
**شَخَّصَ الرِوَايَةَ:** چیرۆکەکەی نواند، تەمسیلی کرد، پیشانیدا
**شَخْصٌ:** مرۆڤ ، زەلام ، مەردوم ، هەر جەستەو پێکهاتەیەك بەرزو دیاربێت‌و زیاتر بۆ مرۆڤ بەکاردێت‌و لای فەیلەسوفەکانیش بریتیە لەو خودە بێدارەی ئاگایی بەسەر جەستەی سەربەخۆی ویستخوازیدا هەیە
**شَخْصٌ أَخْلَاقِيٌّ:** بەو مرۆڤە دەگوترێت کەوا خاوەن سیفەت‌و تایبەتمەندی وەهابێت بتوانێت هاوبەشی عەقڵی‌و رەوشتی لەکۆمەڵدا بکات
**شَخْصٌ أَوَّلٌ:** یەکەم کەس ، وتیار، قسەکەر، بێژەر
**شَخْصٌ مَعْنَوِيٌّ:** کەسی دەستکردو خەیاڵی ، ئەفسانەو خەیاڵکرد
**شَخْصِيٌّ:** کەسی ، خۆی
**شَخْصِيَّةٌ (ذَاتِيَّةٌ):** کەسایەتی ، خۆیەتی، خودی ، کەسانی
**شَخْصِيَّةٌ حَقِيقِيَّةٌ:** کەسایەتیەکی راستەقینە، کەسەکە هەر خۆی بێت
**شَخْصِيَّةٌ بَارِزَةٌ (ذو شأن):** کەسێکی دیارو بەرچاو، یەکێك ناودارو خاوەن کەسایەتیەکی بەناوبانگ بێت
**شَخِيبٌ:** دەمارە خوێنبەری گەردن کەوا خوێنی تیا گوزەر دەکات
**شَخِيرٌ:** پرخە ، پرخاندن ، پرخەپرخ، مرخە ، خپە، خرخر، دەنگێکە لەدەم‌و لووتی مرۆڤی نوستوو دێتە دەرەوە

**شخير**: مرخن ، يەكێك لەكاتی خەوو نوستندا پرخە پرخی لیّ بەرز ببێتەوە

**ش د**

**شدّ الشيء**: پتەو مەحكەمی كرد ، سەقامو تۆكمەی كرد، سەنگداری كرد، بەكێشی كرد، جەڕاندی

**شدّ فُلاَن شدّاً**: رایكرد، غاریكرد، هەڵهات

**شدّ النَّهار**: بەرزبوەوە، بڵند بوەوە

**شدّ عَلَيه فِي الحَرْب**: بەتوندی هەڵمەتو هێرشی بۆ برد

**شدّ عَلَى قَلْبه**: مۆری كرد، دایخست

**شدّ عَضُدَهُ وَشَدّ عَلَى يَدَه**: بەهێزیكردو پشتگیری بۆ نواند

**شدّ العُقْدَة**: توندو تۆكمەی كرد، بەهێزو سەقامگیری كرد

**شدّ رِحَالَهُ**:خۆی ئامادەكرد بۆ سەفەر، ئامادەبوو بۆ گەشتو گەڕان

**شدّ مِئْزَرَهُ**: كۆشاو ماندوبوو لەكارو فرماندا

**شدّ الحَبْلَ وَنَحْوَه**: بەكێشیكردو بۆی شلكرد، توند دەستی پێوەگرتو شۆڕی كردەوە

**شدّ عَلَى (ضَغَطَ)**: پەستاوتی ، دەستی پیانا

**شدّ ـ شدّةً**: بەهێزبوو، پتەوبوو، قایمبوو، جێگەی متمانەو باوەڕپوو

**شدّ**: بەستن ، بەستنەوە، شەتەكدان ، راكێشان ، جەڕاندن

**شدَا** : لەبەرخۆیەوە گۆرانی گوت

**شدَا الرَّجُل**: شیعرو هۆنراوەیەكی خوێندەوەو دەنگی درێژكردەوە وەك گۆرانی لێدەرچوو

**شدَا الإبِلُ**: گۆرانیو سرودی بۆ وتو لێی خوڕی

**شدَا الشِّعْر**: بەگۆرانیو ئاوازەوە گوتی

**شدَا مِنَ العِلم شَيئاً**: هەندێك لەزانیاری فێربوو، ئاشنابوو، بردی

**شدَا ـ شَدْوَه**: وەك ئەوی كرد، هاوتای ئەو بوو

**شدَا الطَّائر**: جریوانی، خوێندنی ، گارانی، قیڕانی ، دەنگی لێوەهات

**شدْو**: خوێندن ، گۆرانی، ئاواز، جریوە، كەمێك لەزۆرێكی بێشومار

**شدَاقِمْ**: یەكێك لاشەویلگەكانی بەرینو فروان بێت ، شێر

**شدَاة**: سەرسامی ، سەراسیمەیی، واقوڕمان، حەپەسان

**شدَّة**: هێز ،زەبر ، توانا، گەرمە ، گوڕ، گوڕم ، تاو، تین ، توندو تیژی ، زەبرو زەنگ، دڵڕەقی ، زبری ، رەقی توندی،گرفتاریو تەنگ دەستی ، تەنگو چەڵەمە ، تەنگانە، ناڕەحەتی، كەمدەستی ، گەدایی

**شدَّة العَيش**: گرانیو نەبوونی، بژێویو گوزەران سەختی

**شدَّة البَرْد**: سەرمای بێشومار، تەشقی سەرما

**شدَّة الحَرّ**: ئەوپەڕی گەرما ، قرچەی گەرما ، قرچە قرچی گەرما

**شدّة**: زمان گرتن ، لاڵەپەتیی ، زمان پیسی، راكێشانێك، پێچراو، دەسك، گورزە

**شدَخَ ـ شدْخاً**: بەویستی خۆی لایدا

**شدَخَ الرَّأسَ**: سەری شكاند، قرنجانی

**شَدَخَ الرَّجُل:** گەردنی شکاند، ملی جەڕاندو شکاند

**شَدَخَ:** شکاندن، قرنجاندن، خوێن لێهێنان، بریندارکردن، زامدارکردن

**شَدْخَةٌ:** شکاندنێك، گیایەکی نەرمو شلو ناسکە

**شَدَّدَ الأمر:** گرنگی پێدا ، بەهەندو گرنگی گرت ، بایەخداربوو لای ، ویستی وابوو هەر ببێ

**شَدَّدَ الشَّيء( قَوَاهُ ):** توندیکرد، قایمی کرد، جەڕانی، چەسپاوو پتەویی کرد

**شَدَّدَ عَلَى:** سوربوو لەسەر ، دوبارەی کردەوە، تەنگی پێ هەڵچنی

**شَدَّدَ فِي كَذَا:** سوربوو لەسەر ، پێی داگرت لەسەر ، قاچی دابەزەوییدا بۆ...

**شَدَّدَ الضَرْبَ:** توند لێیدا، پتر لێیدا

**شَدَّدَ الحَرفَ:** وشەکەی گرانکرد، وەهای لێکرد بەگران لەزار بێتە دەرەوە

**شَدِقَ ـ شَدْقَاً:** لاشەویلگەکانی فراوانو گوشاد بوون ، دەمی پانکردەوەو بۆشایی کەوتە نێو لاشەویلگەو ددانەکانی، رومەتی گوپن بوو، رووەمەتی پەلوکراوەبوو

**شِدقٌ ـ شُدْقٌ:** ناو رووەمەت ، ناو گوپ ، شەویلگ

**شِدقُ الوَادِيّ:** کەناری چەم ، شانی چەم ، لای چەم

**شَدْقَاء:** ژنی رەوانبێژی بەدەمو پل

**شَدَنَ الظَبيُ:** بەهێزو پتەو بوو پێویستی بە دایکی نەما

**شَذْنٌ:** درەختێکە گوڵەکانی وەك گوڵە یاسەمین وایە

**شَدَهَ الرَأسَ:** شکاندی ، بریندارى کرد، قرنجانی

**شَدَهُ الرَجُل:** سەرسامیکرد، واقی ورماند، تووشی سەراسیمەی کرد، بێخودی کرد

**شُدِهَ:** سەرسام بوو، تووشی سەراسیمە هات ، واقی ورما، بێخود بوو

**شَدَهٌ ـ شُدَهٌ ـ شُدْهٌ ـ شُدَاهٌ:** بێهۆشی ، سەراسیمەبوون، بێخودیی، گێژی، سەرگەرمی، واق ورماویی

**شَذْيَاق:** لای مەسیحیەکان بەیەکێك دەگوترێ یەك پلە لەخوار قەشەوە بێت

**شَدِيدٌ:** بەهێز ، بەزەبر ، بەتین ، تیژ ، توند، دڵرەق ، وشك ، سەخت ، بەتوانا، دلاوەر، پتەو، تۆکمە

**شَدِيدُ البَأس:** ئازا ، بەجەرگ، جەربەزە، نەبەرد، دلێر ، چاوقایم

**شَدِيدُ الشَكِيمَة:** لاسار ، قیرسیچمە ، کەللەرەق، چەقاوەسوو، هاروهاج، برزوو

**شَدِيدُ الوَطأة:** دڵرەق ، بێبەزەیی، بێسۆز، دوور لەبەزەیی، بێهەست ، کەم رەحم

**شَدِيقٌ:** هەردوو لاشەویلگە، جووتەکەناری گوپ

**ش ذ**

**شَذَّ عَنْ الجمهُور أو الجَمَاعَة:** بەتەنیا خۆی رای وەهابوو بەدەر لەگەڵ زانایانو کۆمەڵی موسوڵمان

**شَذَّ القَول:** پێچەوانەی بنەماو رێساکانی گوت

**شَذَّ الكَلاَمُ:** گوتەیەکی شازو جیاوازو بەدەر لەڕێسای گوت

**شَذَّ عَنِ الأُصُولِ:** ناوازەیی کرد، لەئاسایی لایدا ، لەرێ لایدا، پێچەوانەی بنەماکان بوو

**شَذَّ ـ شُذُوذ:** ناوازەیی ، نائاسایی ، ناتەبایی

**شَذَا:** بۆنی خۆشی لەخۆیدا

**شَذَا المِسْك:** بۆنەکەی بەهێزبوو بلاوبوەوە

**شَذَا فُلاَن:** بۆنی میسکی دا لەخۆی

**شَذَا:** بەهێزی بۆنکردن، داری گچەکەی بۆنداری شکاند بۆنەوەی بۆنی خۆی پێخۆش بکات ، خراپەو ئازار پێگەیاندن ، بۆنو بەرامە میسك

**شَذَاة:** پاشماوەی هێزو توندوتیژی

**شَذَاذ:** هەندێكو کەم لەمەردوم

**شَذَّان ـ شُذَّان:** ئەو وردە زیخانەی پەرشو بلاو بونەتەوە

**شُذَّان النَّاس:** جیاوازو پەراگەندەی خەڵکی ، تاكو تەرایان

**شَذَّبَ اللحَاء:** پاکی کرد، توێکڵی لێکردەوە

**شَذَّبَ الشَّيء:** لەت لەتیکرد، پارچە پارچەی کرد

**شَذَّبَ الشَّجَر:** لقو پۆپەکانی کەوتن .

**شَذَّبَ المَالَ:** کەرتو پەرتیکرد، لەتو پەتی کرد

**شَذَب:** لقو پۆپی بڕاوی دار، توێکڵ، شتو مەکی ناوماڵ، پاشماوەی گژوگیای خوراو

**شَذَّرَ النَّظْمَ:** جیای کردەوە بە مورو

**شَذَّرَ بِفُلاَن:** قسەی پێگوت ، سوکایەتی پێکرد، دژ بەو گوتی ، هەڕەشەی لێکرد

**شَذَّرَ الشَّيء:** تێی هەڵکێشا ، تێ‌هەڵکێشی کرد

**شَذَّرَ العِقْدَ وَغَيرَهُ:** ماوەی نێوان دەنکەکانی ملوانکەکەی بەمورو یان دەنکە ئاڵتوونو ...پڕکردەوە

**شَذَر ـ شَذْرَة:** مرواری ، مورو، مورووی بەنرخ ، مراری ، مەرواری

**شَذَر مَذَر:** پەرتو جیاوازبوونو هەریەك ڕێبازو بۆچونێکی هەڵبژارد

**شَذْرَة:** یەك دەنك مرواری، پارچە مرواریەك

**شَذْو:** بۆنی عەتر ، بۆنی میسك ، بۆنی خۆشو گولاو

**شُذُوذ:** نەناسراو ، ناباوی، ناوازەیی، لارو لەوێری، دەرچوون لەیاساو ڕێسای پەیڕەوکراو

## ش ر

**شَرَّ(كَانَ شِرِيراً ):** شەڕی لێباری ، شەڕ فرۆش بوو، پیاو خراپ بوو، شەڕی بەرپاکرد

**شَرَّ اللحْم أوْ الثَّوب:** گۆشت یان جلو بەرگی خستە بەرتیشکی خۆر هەتا وشك ببێتەوە

**شَرَّ فُلاَنًا:** گاڵتەی پێکرد، سووکایەتی پێکردو پێی رابوارد

**شَرَّ المَاء:** تنۆك تنۆك تکانی ، چکانی ، دایکرد

**شَرّ:** خراپە، بەدی ، بێ‌حەیایی ، زیان، تاوان، گۆتاوەڕۆ ، کرداری گوفتاری ناپەسەند، واژی چاکەیە

**شَـرَ( مكـــروه ):** نەویســـتراو ، بـــەد ، بەرپەرچ دراو

**شَرَى الشَّيء شِـرَاءً:** كـڕی، فرۆشـتی (لەوشە دژە یەكەكانە)

**شَرَى الثَّوب أَوْ اللحـم:** خسـتیە بـەر تیشـكی خـۆر ، هـەڵی خسـت لەبـەر خۆردا

**شَرَى بِنَفسه عَنْ قَومه:** خۆی بـەرگری و جـەنگی بۆ كـردن ، هاتـە مـەیدان لای فـەرمانڕەواو لـەبری گەلەكـەی قسـەو گفتوگۆی كرد

**شَرَى:** زیپكەو برینێكە بەسەر پێستەوە دروست دەبێـتو خورانیكـی تونـدی لێدەكەوێتەوە

**شَرَى:** فرۆشـتنو كڕیـن (لەوشـە دژە یەكەكانە)

**شَرَاب:** خواردنەوە، خۆشاو ، شەربەت، نۆشـــان، نۆشـــین، قـــەخووارن، بۆشـــلەمەنی بـــەكاردەبرێ وەكـــو شەربەتو چاو ئاوو...

**شَــرَّاب:** زۆر خـــۆرەوە، یـــەكێك زۆر بخواتەوە

**شَرَابَة:** ریشوە ، ریشوو، مەنگوڵە، ئەو ریشوەیەی بەسـەری تەربوشـەوە شۆڕ دەبێتو دێتە خوارەوە

**شَــرَار:** وردە پارچـــە لەپێكهاتەیـــەك دەبێتـەوەو ئـاگری تێبـەردەبێت، ئـــەو تیشـكەی لـەخاڵی بوونـەوەی بارگـەی كارەبایی دەكەوێتەوە

**شَـرَارَة:** پریشـك ، پزیسـك، پزووسـك، پرشنگ، پریشك

**شَرَاس:** سرێش ، ئەسرێك ، ئەسترێك، شتێكی لینجـی كەشـدارە ئەهاڕێتـەوەو بەئاو دەگیرێتەوە بۆ بەیەكەوە لكاندنی كاغەزو هێندێ شتیتر

**شَرَاشِب:** ریشـوە ، ریشـوو، شـاجلغ، گزوگوڵنك، گێلگێلە، پلپلە

**شَرَاشِر:** قورسایی، گرانبەها، بەكێش

**شَرَاشِرُ الذِّئب:** ئەملاولاكـەیو ئـەوەی لێی دەبێتەوە

**شَـرَاع:** چارۆكـە ، بایـەوان، چـــارك، شاڵینە، كەشتی بایی، گەردنی وشتر

**شَرَّاع:** فرۆشیاری كەتانی باشو چاك

**شَـــرَاعَة:** ئازایـــەتی، نەبـــەردی، لێهاتوویی، دلێری ، جوامێری

**شِرَاك:** قەیتانی پێڵاو، پارچە گیایـەكی سەوزی جیا

**شِرَان:** جانەوەرێكە ، دەعبایەكە

**شَرَانقُ الحَيَّة:** كاژی مار ، كاژ ، توێژی مار

**شَرَاهَة:** برسـێتی ، حـــەزو ئـارەزووی خواردن، گەدە خاڵی بوون

**شَرِبَ المَاء:** ئاوەكەی خواردەوە، نۆشی كرد، هەڵی قوراند

**شَرِبَ الدُّخَانَ:** جگەرەی كێشا، كێشای، خواردی

**شَرِبَ الكَلاَم:** تێگەیی ، حاڵی بوو

**شَرِبَ:** ئاویدا، دەرخواردیدا

**شَرِبَ القِربَةَ:** قوبو ئـاوی تێكرد هـەتا تامی خۆش ببێت

**شَرِبَ قَصبُ الزَّرْعَ:** ئاوی تێدابوو

**شُرْب:** خواردنەوە، نۆشن، نۆش كردن، هەڵقوڕاندن ، مژین

**شَرْب:** جۆرە روەكێك یان گیایەكە

**شَرْبَة:** قوم ، قیپ ، قڕ، مـژ، ئـەوەنـدە ئاو یاشلەمەنیەكە لەزار بكرێ بۆ جـارە قوتدانێك

**شرْبَة:** سووراییِ دەمووچاو، ئەندازەی ئاودێرییەك بۆ زەوی
**شرْبش:** ریشەو تاڵی جلو بەرگ
**شـرْبِین:** دارئـۆرز، دارێكـە باشـترین جۆری قەترانی لێدەردەهێنریَ
**شرَّة:** ژنی شەڕانیو بەد
**شِرَّة:** تورەیـی ، توندوتیـژی، چوستو چالاكی، چابوكی ، ریسوایی، سوربوون
**شِرَّةُ الشَّبَاب:** چوستو چالاكی لاوێتی، هەرەتی لاوێتی
**شرِثَ الرَّجُـل:** بـەری دەسـتی قلّیشا ، رەق بوو
**شَرَثٌ:** قلّیشاوی ، قەڵشان ، قەڵشاندن، ترەكیایی، قەڵشتن
**شَـرْث ـ شَـرْثَة:** كۆنـە ، شـتومەكی كۆنەو بیَ كەڵك
**شرِثٌ:** تیغو شمشێری تیژو بڕەڕ
**شَـرَجَ الشَّــيْء:** كــۆی كــردەوە، گردیكردەوە، جەمیكرد، خستیە پـالّ یەك
**شَـرَجَ الشَّـرَابَ بِالْمَـاء:** تێكـەڵیكرد، ئاوێتەی كرد
**شرَّجَ الحِجَارَة:** خستیە پالّیەكو سافو لووسی كرد
**شرَّجَ الخَرِيطَة:** لوولیكردو بەستی
**شرَّجَ الثَّوب:** بەتەقەڵی زل زل دوریـی ، درومـانێكی شـاشو تەقـەڵ لـەدووری یەكی تێدا كرد
**شرَّجَ اللحْم:** گۆشتو پیو یـان چەوری بەیەكەوە تێكەڵ كرد
**شَــرْجٌ:** ئــاوەڕۆو جۆگەلەیـــەك لەقەڵبەزەوە ئاوبهێنێت بۆ پێدەشتو نێو دۆڵ، جیاوازیی، فرەڕایی

**شرَجٌ:** گریَ قولّفە
**شَــرَجُ الــوَادِي:** ئــاوەڕۆ ، دەروازە، شـوێنی بـەفراوانو گوشـاد ، دەرچـەی دەشت
**شرْج:** كۆم ، پندۆك ، دەرچەی مرۆڤ، ئەندامی شەرمی مرۆڤ ، لەت ، كەرت، بەش ، جۆر ، هاو ، وەكو
**شرَحَ اللحْمَ شَـرْحاً:** تـویَ تـویَی كـرد، پارەپارەیكرد ، لەتیكرد
**شرَحَ الكَلَام:** تێی گـەیاند، حـاڵی كـرد، بردیە مێشكو بیروهۆشیەوە
**شرَحَ صَدْرَهُ للشَّيء وَبِالشَّــيْء:** پێـی دڵشـادبوو، دڵـی پێـی كرایـــەوە ، گەشكەداربوو، پێخۆشحاڵبوو
**شَــرَحَ المَسْـأَلَة:** نــهێنیو لایەنـــە نادیارەكانی ئاشكراكرد، تیشكی خستە سەر، نهێنیەكانی بەدەرخست
**شرَحَ الشَّيء:** تویَی كردەوە، دایهێنا، بەدرێژی بڕی، رایخستو گوشادی كرد
**شرَحَ صَدْرَهُ بِالأَمْر:** خۆشەویسـتی كـرد لەلای ، بردیـە دڵیـەوە، شـیرینی كـرد، ترشو خویَی پێوەكرد لای
**شرَحَ إِلَى الشَّيء:** ئـارەزووی خـۆی بـۆ دەربڕی ، خوازیاربوونی بۆ خستە روو
**شـرَّحَ الشَّيء:** بڕیو لەیـەكی دابـڕی، كردیەوەو هەڵیدڕیو دەریخست
**شـرَّحَ لِغَـرَضٍ طِبِّـي:** هـەڵی دڕی بـۆ مەبەستی زانینو دەرخستن
**شـرَّحَ الجُثَّة:** لاشـەكەی هـەڵدڕی بـۆ زانینی هۆی مردنی
**شَـرْح:** راڤـەكردن ، راڤـە، لێكۆڵینـەوە، لێكدانـــەوە، باســـكردن، لێـــدوان، خستنەڕوو، قسەكردن لەسەر

**شَرْحَة:** تـويٚ، پارچـەی درێـژ ، پارچـە لەسەر پارچە
**شَرَخَ الصَّبِـيُّ:** گــەورەبوو، هــەڵچوو، پێگەیی
**شَرْخٌ:** بنـەڕەت ، بنەچــە، ســەرەتا ، ســـەرەتاو تـــافی لاوی ، ســـەرەتای هەركارێك ، هەڕەت ، تاف ، ئەوەڵ
**شَرْخُ الصِبَـاء أوْ الشَبَاب:** هـەڕەت یـا تافی لاوی ، سەرەتای گەنجێتی
**شَرْخٌ:** شــكاویی ، قڵیـش ، درز، وەك یـەك ، هاوچەشـن‌و جۆر ، هاوشــێوەو رەنگ
**شَرَدَ( نَفَـرَ وَهَـرَبَ ):** هەڵهات ، رایكرد، دووركەوتــەوە، قووچـانی، تـــەرەبوو، دەرچوو، ترازا
**شَرَدَ عَلَى اللهِ:** لەگوێڕایەڵی پــەروەدگار دەرچوو، یاخی بوو، سەرپێچی كرد
**شَـرَدَ عَـنِ الطَرِيـقِ:** لایـدا ، تــرازا ، دووركەوتەوە، پەڕاگەندەبوو
**شَرَدَ البَعِيرُ:** بەلەسە بوو، یـاخی بـوو ، هەڵی تیزان
**شَـرَّدَ ـ تَشْرِيدَاً:** دەربـەدەری كــردن ، رایگوێزان، ئەملاولای پێكردن
**شَرَّدَ شَمْلَهُم:** دەستـەو كۆمـەڵو تـاقمی پەڕاگەندەو پەرتەوازە كردن
**شَرَّدَ بِفُلان:** ناتەواویو كەم‌و كوریەكانی بەخەڵكا راگەیاندن، عــەیب‌و عارەكـانی بلاوكردەوە
**شَرْدٌ:** بای گەرم ، ژارە با
**شَــرَّذَ( فَـــرَّقَ ):** بـــلاوی كـــردەوە، پەرتـــەوازەی كـــرد، كـــەرت‌و پــــەرت‌و جیاجیای كرد

**شَـرذِمَةٌ( جَمَاعَـة قَلِيلَـة ):** دەســـتەو كۆمەڵێكی كەم ، كەرت‌و بەشێك لەهــەر شتێك
**شَرَّرَ اللحْمَ أو الثَـوبَ:** گۆشـت‌و جـل‌و بـەرگی خسـتە بـەر تیشـكی خـۆر بۆئەوەی وشك ببێتەوە
**شَرَّرَ وَاشْـرَ فُلانَـاً:** نـاوی زڕان ، قسـەی شوێنخست ، شكانی، بەسووك‌و نـزم ناساندی لەنێو خەڵكیدا
**شَرَرٌ:** ئـەوەی لـەئاگر بەرزدەبێتــەوە ، بڵێسە ، تاو ، تین ، گڕوبڵێسەی ئاگر
**شَــرَرٌ:** شــەڕ ، خراپـــە ، رەقــــی ، توندوتیژی، توندو رەقی
**شَــرَزَهُ:** ســـزای‌دا، ئەشـــكەنجەی‌دا، جنێـوی پێـدا، شـەتەك‌و توندی‌كــرد ئەوجا هەردوولاكەی بەست بەیەكەوە
**شَرَسَ الجِلْدَ:** چەوری كرد، هەنوی‌كرد، شێلای
**شَرَسَ صَاحِبَـهُ:** بـەرەی‌كرد بـە قسـەی رەق‌و تیژو زبر
**شَرَسَ الدَّابَّةَ:** بەرەی كردو رێشمەكەی گرتبوو
**شَرِسَ ـ شَرَسٌ:** وردە درك ، گەنە درك
**شَرِسٌ:** دڕ ، دڕندە، بەزیان ، زیانەخرۆ، بەدخوو، چاوشـۆڕ، بـەدرەفتار، یـەكێك كـرداری نـاقۆلاو نابـەجێ بەئـــەنجام بگەیەنێت
**شَرْسَاء:** هەوری سپی ناسك‌و تەنك
**شُرْسُوف( طَـرَفُ الضِلْـع ):** كڕكڕاگـەی پەراسوو، بەرەپەراسوو
**شَرَّشَ:** رەگـی داكوتـا ، رەگــی كــرد، ریشەی كرد، بنچ‌و بناوانی نا

**شِـرْش:** رەگ، ریشــە ، رەك ، رەـــ ، رەھـ، دەمــار ، ریشــەو دەمـاری دارو گژوگیا ، رەتەوە، بنەچەکە، رەچەڵەك، تروومِ
**شِرْش اللبَن:** دۆوك ، سزك ، دۆك ، دۆ، چلكو کەفو کوڵی کەرەی گەرمکراوە
**شَرْشَرَ الشَيء:** پچڕانی لەتو پەتیکرد، گازی لێگرت
**شَرْشَرَ السكين:** تیژیکرد، ساویدا
**شَرْشَـرَ المَاشِـيَة النَبَــات:** ئاژەڵەکــە روەکەکەی خوارد
**شَرْشَرَ المَاء:** تنۆك تنۆك هاتە خوارەوە، چەکیەوە
**شُرْشُرَة:** بەشو پارچەیــەك لەهــەموو شتێك ، گیایەکە
**شُرْشُف:** چەرچەف ، بەرگەدۆشــەك ، بەرگە سەرین
**شُرْشُـور:** پەلــەوەرێکی پچووکــە وەك چۆلەکە وایە
**شَرَطَ:** مەرجی کرد ، مەرجی دانا
**شَـرَطَ عَلَيـه فِـي بَيـعٍ وَنَحْـوَه:** مــەرجی خستە ئەستۆی ، مەرجی بۆ دانا
**شَرَطَ الجِلد:** روشانی ، برینداری کرد
**شَـرَطَ عَلَيـه أمـراً:** خستیە ئەسـتۆی ، بەمەرجی گرت لەسەری
**شَرَطَ لَهُ أمْراً:** پابەندی کرد، بەستیەوە
**شَـرِطَ ـ شَــرْطاً:** کەوتــە بــارودۆخێکی مەزنەوە
**شَرَّطَ الجِلدَ:** روشاندی ، برینداری کرد
**شَرَّطَ الشَيء:** شەکەتیداو بەستیەوە
**شَـرْط:** مــەرج ، گــرەو گــرۆ ، برِیــارو پــەیمان بەســتنی دووکــەس یــان دوو دەستەیە لەســەر شتێك کەهــەر لایــەك بــەجۆرێك قســەی لیٚ بکــات ، شــەرتو پەیمان

**شَرْط(عِنْدَ الفُقَهَاء):** مەرج لای زانایان بریتیــە لــەوەی ئــەو مەســەلەیەی دەیهێننەوە مەیسەر نابێت بەو مەرجە نــەبێت بــەڵام مەرجەکــە لــەکرۆکی راستەقینەی ئەو باسە خۆیدا نییە
**شَـرْط (عِنْـدَ النُحَــاة):** مــەرج لای رێزمانەوانــەکان بریتیــە لــە رێکخســتنی شتێك لەســەر شتێکی دیکــە بــەهۆی ئامرازێکەوە
**شَـرَط:** نیشــانە ، هێمــا ، ســەرەتای هەرشــتێك ، وردەی پــارەو پــوول ، ئاوەرۆی پچووك
**شُـرْطَة:** پۆلیــس ، پۆلیســی فریــا ، داروغە ، بەوانە دەگوترێت پارێزگاری دەکەن لەئاسایشی وڵات
**شُرْطِي:** پۆلیس ، پاسەوان، پارێزگــار، یەکێك پیشــەی پاسەوانیو پارێزگاری لەئاسایشو هێمنی بێت
**شَــرطِي( إشْــتِرَاطِي):** مــەرجاوی، مەرجدار
**شَرَعَ:** داینا ، یاسای دانــا، دەســتووری دانا ، دەستی پێکرد، دەست بەکاربوو
**شَـرَعَ شَـرْعاً للقَـوم:** رێو رەسمــەکانی شەرعی بۆ تۆمارکردن، خاڵبــەندی کرد بۆیان
**شَــرَعَ لَــهُم الطَرِيــق:**رێگــەی بــۆ دیــــاریکردن، رێبــــازی بــــۆ دەستنیشــانکردن ، رێی بــۆ ئاســان کردن
**شَــرَعَ الرُّجُــل:** راســتو دروســتی دەرخستو ناحەقیشی دامرکانەوە
**شَرَعَ البَيـتُ:** بــەدەروازەو دەرچەکــەیدا تێپەری

**شَــرَعَ الشَــيء:** زۆر بــەرزی کــردەوە، یەکجار بەرزی کردەوە، هەڵی بڕی

**شَرَعَ الحَبْلَ(شَدَّهُ):** رای کێشا ، قـایمی کرد ، جەڕانی

**شَرَعَ الوَارِدُ:** ئاوەکەی خستەسەر زاری، بەدەم گرتی، هەردوو چنگی پڕ کردو دەمی بۆ برد

**شَرَعَ المَنْزِلُ:** لەرێگەکەی نزیك بووەوە، لێی نزیك بوەوە

**شَـرَعَ فُلَانَ بِفِعْلِ كَذَا:** دەسـتی کـرد بەئەنجامدانی کارەکەی

**شَرَعَ المَاشِيَةَ:** ئاژەڵەکانی بردەسەر ئاو، بردنی بۆ ئاودان

**شَــرَعَ الرِمَــاحَ:** ئاراســتەی کــرد، رووبەرووی کرد

**شَرَعَ فُلَانٌ عَلَيْنَا:** لێی نزیك کردینەوە

**شَرَعَ يَضْرِبُ:** شـانی کـرد بــە لێدانـا، دەستی کرد بەلێدان

**شَرَّعَ وَأَشْرَعَ الطَرِيقَ:** روونـی کـردەوە، ئاشکرایکرد،دیاریکرد،دەستنیشانیکرد

**شَرَّعَ السَـفِينَةَ:** چارۆکـەی بـۆ دانـا، چارۆکەی بۆ دروستکرد

**شَرْعٌ:** دەسـتوورو فـەرمانی خوداوەنـد، ئـەو یاساو رێسایەی پـەروەردگار بـۆ بەندەکانی داناوە

**شَرْعٌ:** هاوتـا ، هاوسـەنگ، وەکیـەك ، چوون یەك

**شَرْعٌ:** هاوشێوە، هاوڕەنگ، هاوچەشن، لەیەکچوو

**شَرْعَة ـ شِـرْعَة:** کۆڵەکـە ، سـتوون، هەستوون، ئەسـتووندە، پـاژەری سـەر دوو فلیقانە

**شَرَعَة:** کەشتی

**شِـرْعَة:** شــەریعەت ، یاســای پەروەردگار، رێگـەی راسـتو دروست، تۆرێکــە قــەتیێی پــێ راودەکــرێ، هاوچەشنو شێوە

**شَرَفَ الحَـائِطَ:** پەنجەرەی بـۆ دانـا، پەنجەرەی تێخست

**شَرُفَ:** پلەوپایە بـەرزبوو، شـکۆمەندو بـالآبوو، بـەڕێزو شکۆمەندبوو، خـاوەن ئـابڕوبوو، بەشـەرەف بـوو، خـاوەن ناموس بوو

**شَـرَّفَ فُلَانَـاً(رَفَـعَ مَقَامَـهُ):** بـەرزی کردەوە، شکۆی پێدا ، گـەورەی کرد، پایەو شکۆی دایە

**شَرَّفَ البِنَاءَ:** پەنجەرەی بۆ دانا

**شَرُفَ(إِرْتَفَعَ):** گـەورەبوو، بـەرزبوەوە، ناوبـانگی پـەیداکرد، بـوو بـــەخاوەن شکۆو پایە

**شَرَفٌ:** گەورەیی ، پایەبـەرزی، شـکۆ ، ئابڕوو، شــەرەف، نـاموس، خانـەدانی، شانازی، رەچەڵەك پاکی

**شُرَفَاءُ:** لانەی پەنجەرەدار

**شَرُفَتِ الدَابَّةُ:** پیر بوو، چوە ساڵەوە

**شُــرْفَة:** تــەلار ، پێــش هـــەیوان ، شانشین، بەلەکۆن

**شُـرْفَة مِـنَ المَــالِ:** باشــترین مــاڵ ، چاکترین ماڵ

**شُـرْفَة:** رەچەڵـەكو بنەچــەی مــەردوم لەباوانەوە

**شَـرُفَهُ ـ شَـرَفَاً:** لەشـەرەفـو رێزداریـدا زاڵبوو بەسەریا

**شَــرَّفَهُ:** شکۆمــەندی کــرد، کــردی بەرێزدارو شەریف

**شرَقَ:** هەڵهات ، دەرکەوت، شەوقى دايەوە ، ڕووناکی کردەوە
**شرَقَ النَّخْلُ:** پێگەیی ، هاتەبەر، پێگەیشت ، وەبەرهات
**شرِقَ المَكَانُ:** خۆى تيا هەڵهات ، خۆرى لێهەڵهات
**شرِقَ الشَّيءُ:** تێکەڵبوو، لەيەك ئالاَ
**شرِقَ لَوْنُهُ:** ڕەنگی سوورهەڵگەڕا ، سووربوو
**شرِقَ وَجْهُهُ:** ڕەنگی سوور هەڵگەڕا لەشەرما
**شرِقَ الدَّمُ بِجَسَدِهِ:** دەرکەوت يان خوێنی لێهات بەلاَم لەبەرى نەڕۆيشت
**شرِقَ فُلاَنٌ بِالمَاءِ:** ئاو لەبينی گيرا ، لەقورگی گيرا
**شرِقَ بَرِيقُهُ:** تيشكو ڕووناكی بلاَوبووەوە، پەخش بوو
**شرِقَ عَيْنُهُ:** چاوی سوور هەڵگەڕا ، چاوی سووربوو
**شرِقَ الأَرْضُ:** وشكی کرد بەهۆی ئاونەدانەوە
**شرَّقَ:** ڕوەو خۆرهەڵات ڕۆيى، ڕوەوخۆرهەڵات ملی ڕێی گرت
**شرَّقَ وَجْهُهُ:** ڕووی ڕۆشن بووەوە، ڕووناك بوو
**شرَّقَ البِنَاءَ:** تەڕاوی کرد، سپیکاریکرد
**شرَّقَ الأَرْضَ:** وشکیکرد، ئاوی لێبڕی
**شرَّقَ اللحْمَ:** تویَ تویَی کردو لەبەر خۆرا هەڵيخست هەتا وشك ببێتەوە
**شرَّقَ الشَّيءَ بِالزَّعْفَرَانِ:** بەزافەران ڕەنگی کرد، بۆيەی کرد، ڕەنگی گۆڕی بەزافەران

**شرْق:** خۆرهەلاَت، ڕۆژهەلاَت، خاوەر، ڕۆژەلاَت، دەمى هەلاَتنی ڕۆژ ، شوێنێکە کەبە دييمەن کەوتبێتە لای هەلاَتنی ڕۆژەوە
**شرَقُ:** خۆر ، ڕۆژ، ڕوز، هوویر، وەر، ڕۆش، ڕووح
**شرْق:** ئەو تيشكەی لەدرز يان لايەکی دەرگاوە دێتە ژوورەوە
**شرْقَاءُ:** گویَ بڕاو
**شرْقاً:** ڕووەوە خۆرهەلاَت، بەرەو خۆرهەلاَت
**شرْقَةٌ:** شوێنێك تێيدا دابنيشریَ لەبەر خۆردا لە وەرزی زستاندا، بەرخۆرەتاو لە زستاندا
**شرْقَة ـ شرَقَة:** ڕۆژ لەکاتی هەڵهاتندا
**شرَقْرَق ـ شرَقْرَاق ـ شرِقْرَاق ـ شقِرَاق:** باڵندەيەکی پچووکە
**شرْقِيٌّ:** لەخۆرهەلاَتەوە ، خۆرهەلاَتی، ڕۆژهەلاَتی
**شرْقِيَّة:** بايەکی گەرم کەلە ڕۆژهەلاَتەوە هەڵدەکات
**شرِكَ:** بەشداریبوو، هاوبەشیبوو، هاوبەشی پەيداکرد بۆ پەروەردگار
**شرَكَ النَّعْلَ:** قەيتانی بۆ دانا
**شرَكَ بَيْنَهُمْ:** کردنی بەهاوبەشی يەك
**شرْكٌ:** بەش ، پشك، گومان بردن بەبوونی چەن پەرستراوێك ، هاوەڵ پەيداکردن بۆ خوا
**شرُكٌ:** ناتەواو، عەيبدار، کەل، ئەنگ
**شرَكٌ:** تۆڕی ڕاوکردن، ماشەڵ، داو، تەپکە، تەڵە، فاقە، پەتی ڕاو
**شرِكَتِ النَّعْلُ:** قەيتانەکانی پچڕا، بەربوو

**شرَكَة:** ئەو چالآنەی ئاژەلٚ یان هەر گیاندارێك هەڵی دەكەنێت
**شرْكَة ـ شرِكَة:** كۆمپانیا، هاوكاریی، كاربرایەتی، بەشداری، پشك، بەش، كۆمەڵەو تاقمگەریی بازرگانی
**شرْكي ـ شرْكِي:** تیژڕەو، خێرا ، گورج و گۆلی،چوست و چالاك، یەكێك لەڕۆیشتندا خێراو گورج بڕوات بەڕێوە
**شرَمَ الشَيء:** دایهێنا ، قلێشانی، دای بڕی
**شرَمَ أنْفَهُ ـ شرَمَ أذُنَهُ:** لەلای سەرەوەی كەمێكی بڕی
**شرَمَ الثَريدَةَ:** لەلاكانیەوە لێی خوارد
**شرَمَ لفُلاَنَ مِنْ مَالِهِ:** كەمێكی پێدا ، بەشێكی دایە
**شرِمَ ـ شرَماً:** سەری لووتی بڕی
**شرَّمَ:** لەت و پەتیكرد، پارچە پارچەیكرد، كوت كوتی كرد
**شرَمَ الصَيدُ:** بەزامداری هەڵهات ، دەرچوو، قوتاربوو، دەربازبوو
**شرْم:** قلێش، درز، قەڵەش، قەڵەشت، قلێش ، درز بردنی میوەو شتیتر
**شرُمْ:** هەرقلێش و درزێك دەروازەی نەبێت لەشاخ و دیوارو...
**شرْماء:** ژنی شرو بڕ، لوت براو
**شرَمَهُ:** لەتیكرد، قلێشانی ، بڕی
**شرَنَقَ الشَيء:** بڕی، پچڕانی، لەتیكرد، پارچە پارچەی كرد، لەت لەتیكرد، پارەپارەی كرد
**شرْنَقَة:** قۆزاخە، قاوخ، سارمە، پێلە، قاپوور، كاسە، خلێف، شتێكی خڕە كرمی ئاوریشم هەڵی دەپێچێ یان هەندێ گیانداریتر هەڵی دەپێچن لەدەوری خۆیان بۆ پاراستنی سوڕو قۆناغێكی ژیانیان

**شرِهَ:** چلێس بوو، زۆری خوارد، چاوبرسێتی نواند
**شرِهَ إلَى الطَعَامِ وَغَيرِهِ:** سووربوو لەسەر خواردن، حەزی لێكرد، نەفس و حەزی جوولا بۆ خواردن
**شرَه ـ شرَهَان:** ئارەزوومەند، خوازیار، حەز، ویست، خواز، خواست
**شرْهُ (نَهَم):** چلێسی ، زۆرخواردن، سك بەردان، هەڵپە، چاوبرسێتی
**شرِه(نَهِمْ):** چلێس، زۆرخۆر، فارزك، چاوبرسی، چاوچنۆك، تەماعكار
**شرْهَاء:** وشكە سالٚ ، سالێكی قات و قڕی
**شرْو ـ شرُو(عَسَل):**هەنگوین، هەنگفین، كاریت، كۆتەفر، هنگف، هنگوف
**شرْوَى:** هاوچەشن ، هاوشێوە، وەك ، وەكو ، بەوێنەی
**شرُوب:** ئاوێك باش نەبێت بۆ خواردنەوە بەلآم دەستیش بدات بخورێتەوە، یەكێك زۆر شلەمەنی بخواتەوە
**شرُود:** راكردن، هەڵهات ، دەربەدەری
**شرُود الذَهْن:** لەزانستی نەفسیدا بریتیە لەبێئاگایی و غافلٚ بوون لە بارودۆخ و حالٚی حازر یان دەرەنجامە كتوپڕەكان ، بیر بلآوی ، بیر رۆیشتن ، خەیالٚ بردنەوە
**شرِيَ البَرَقُ:** رووناك بوەوە، تیشكی دایەوە، رۆشن بوەوە
**شرِيَ الجِلْدُ:** زیپكەی دەردا ، هەڵزڵەپا
**شرِي:** زیپكەی ئاوتێزاو، زیپكەی ئاودار
**شرَيَان:** خوێنبەر

**شرَيَان أبهر:** شا خوێنبەر
**شرَيَان رُؤي:** خوێنبەری سی
**شرَيَان التَّاجِي:** دڵە خوێنبەر
**شرِيبٌ:** ئاوێك بۆ خواردنەوە بشێ، یەكێك ئاو زۆر بخواتەوە، ئەوەی هاوبەشیت دەكات لەخواردنەوەدا، یەكێك وشتر ئاوبدات لەگەڵ یەكێكی ترا
**شرِيبٌ:** ئارەزوومەندی خواردنەوەی شلەمەنی لەئاوو ...
**شرِيجٌ:** لێچوو، هاوشێوە، وێك چوو
**شرِيجَان:** دوو رەنگی جیاواز لەهەموو شتێك
**شرِيجَة:** سەبەتە، سەبەتەیەكە لەپووشی خورما دروست دەكرێت میوەی تێدەكرێت، هێلانەی كۆترو باڵندەكان
**شرِيحٌ ـ شرِيحَة:** پارە پارەی گۆشت، پارچە، توێ توێی گۆشت، كەرت كەرت، كوت كوت
**شرِيحَة المِكرُوسكُوب:** شووشەی سلاید
**شرِيحَة الشُبَاك:** تاكی پەنجەرە، لایەكی پەنجەرە
**شرِيدٌ:** ون، دەربەدەر، بەلەسە، هەڵهاتوو، پەرەوازە، تەرا، ئاوەكی، یەكێك لەنشتمانو حاڵو باری وڵاتی خۆی پەراگەندەو هەڵبفریوێنرێت
**شرِيرٌ:** خراپ، زیانفرۆش، بەزیان، شەڕانی، سەر بەگێچەڵ، درندە، تاوانبار، تێكدەر
**شرِيسٌ:** بەدخویی، بەدرەوشتی، سووكی، رسوایی، نەوی، نامەردیی، شێر، روەكێكی تاڵو ناخۆشە
**شرِيسُ الأكْل:** زۆرخۆر، نەوسن، ورگدڕاو، تێر نەخۆر
**شرِيسَةٌ:** بەدخوییو بەدرەوشتی، زەوییەكی خراپو نابار
**شرِيطٌ:** قوتویەكە ژنان بۆنی خۆشو سپیاوو سوراویی تیا دادەنێن، جۆرە زێوارێكی تەنراوە بەلێواری كەواوە، بافتە، تیلم، پەت، قەیتان
**شرِيطُ الحذاء:** قەیتانی پێڵاو
**شرِيطُ المِصْبَاح:** پلیتە، پلیتەی چرا، پلیتەی قوتیلە، فتیلە، پۆرك، پۆرت، فتێلك، پتیلە، شتێكی بادراوە كەلەشتیتر هەڵدەكێشرێ
**شرِيطُ القِيَاس:** پێوەر، مەترە، دووین، ئەندازەگر
**شرِيطَة:** مەرج، وشتری گوێ داقڵیشاو، دەسماڵ كەوا ژنان دەیدەن بەسەر شانیاندا بۆ جوانی
**شرِيعٌ:** دلێرو ئازا، كەتانی باشو چاك
**شرِيعَة:** دەستووری یاسا، ئەو یاسایەی پەروەردگار بۆ بەندەكانی داناوە، رێبازو رێگە، لاشیپان
**شرِيعَةُ البِلاد:** یاسای وڵات، ئەو یاساو رێسایانەی لەوڵاتێكدا پیادە دەكرێت
**شرِيعَةُ الضَمِير:** یاسای دەروون
**شرِيعَةُ الغَاب:** یاسای دارستان، ئەم دەستەواژەیە بۆ دەرخستنی بارو حاڵێكی نەگونجاوەو تێیدا ستەم لەمرۆڤ دەكرێت
**شرِيفٌ:** مەزن، گەورە، پایەبەرز، شكۆدار، شەریف، بەناموس، بەئابروو، خاوەن پلەوپایە لەكۆمەڵدا، جێگەی رێزو شكۆمەندی، خانەدان

**شـرِيك**: هاوكـار، كـاربرا، بەشـدار، خاوەن بەش، هاوبەش، یەكێك هاوبەش بێت لـەكارو فرمـانێك یـان بازرگـانیو مامەڵەو ئاڵو وێڵو خانوو دوكانو...

**ش ز**

**شَزَازَة**: وشكیەكی توند، وشكی تەواو
**شَزَبَ ـ شَزَبَاً وَشُزُوباً**: باریكو لاوازیكرد
**شَـزَبَ الحَيَـوَانُ**: ئاژەڵەكـەی لاوازو باریكی كرد، لەڕی كردو چەوسانیەوە
**شَـزَرَ**: لێـی مـۆڕ بـوەوە، چـاوی لێ سـووركردەوە ، بـەچاوێكی مـۆڕەوە تەماشای كرد
**شَزَرَ ـ شَزَرَاً الرَّجُل وَإِلَيهِ**: بەتیلەی چاو تەماشـای كـردو نـاڕەزاییو توڕەیـی هەلگرتبوو
**شَــزَرَ فُلاَنــاً**: چـاوی پێوەكـــرد، بەچاویـەوەكرد، بـەلای راسـتو چـەپا بەشمشێر دایگرتەوە
**شَزَ ـ شَزَرَة( الحُمْرَة فِي العَين )**: سووری چاو
**شَزْرَاء**: چاوێكی سوور هەڵگەڕاو بەهۆی توڕەبوونەوە
**شَزَنَ ـ شَـزَنَاً**: چوسـتو چـالاك بـوو، بـەردەوام بـوو لەسـەر كـار، بێداربـوو دوای ماندوبوونو شەكەتی

**ش س**

**شَسَـعَ (بَعُـدَ)**: دوربـوو، دووركەوتـەوە، تەوانگ دەربوو، شەلپین بوو
**شَسَـعَ المَـنْزِلُ**: ماڵەكـەی دووربـوو، دووركەوتەوە، تەوانگ دەربوو
**شَسَـعَ النَّعْـلُ**: تـاڵە گرێبەسـتەكانی نەعلەكەی پچڕا، لەبەریەك بڕا

**شَسِــعَ بِــهِ**: دووری خســـتەوە، بەڕاگەندەی كرد
**شِسعْ**: رایەڵەیەكـە بـۆ راگرتنـی نـەعل بەپەنجەكانی قاچەوە
**شِسْعُ مِنَ المَكَانِ**: لایەكانی قەراغەكانی ، ئەملاولای
**شِسْـعٌ مِــنَ الأَرضِ**: زەوی تەنگەبــەر، زەوی نابەرین
**شِسْعٌ مِنَ المَالِ**: كەمێك ماڵو دارایی
**شُسُوعُ( بُعْدَ )**: دووریــی ، پێچەوانــەی نزیكی
**شَسَفٌ**: نانی وشك، وشكە نان
**شَسِفٌ**: گۆشـتێك خـەریك بێـت وشـك بكات ، فەریكە خورمای لەتكراو
**شَسْلَةٌ مِـنَ الأَقْـدَام**: قـاچی رەقو زبـر، وشكو رەقو تەق

**ش ش**

**شَشْقَلَ الدِّينَارَ شَشْقَلَةٌ**: نەنگی لێگـرت، بەناتــەواوی دانـا، رەخنــەی لێگــرت، بەتەزویری دانا
**شِشْمُ**: هاراوێكە دەپرژێنرێتـە چاو بـۆ چارەسەركردنو بەهێزكردنی

**ش ص**

**شَصَّ( بَعُدَ )**: دووربوو، دووركەوتەوە
**شَصَّ فُلاَنٌ ـ شَصاً**: ددانـەكانی لەشـتێك توند كرد، كەڵبەكانی ونكرد
**شَصَّ النَّاقَةُ وَنَحْوَهَا**: شیری تیا نـەما یان كەم بوەوە
**شَصَّ السَّنَةُ**: وشـكبوو، بێبـەروبوومبوو، بارانی كەم بوو
**شَصَّ المَعِيشَةُ**: بژێوی گـرانو قورسـبوو، بژێوی ناڕەحەتو گرفتاوی بوو

**شَصَّ فُلاَنَاً عَنِ الشَّيء:** رێگری لێکردو دووری خستەوە

**شَصٌ:** دزی فێڵبازو زۆرزان

**شَصٌ - شَصٌ( سِنَارَة - صِنَارَة ):** قولاپی ماسی، شەوکە، شەوك، نەق، نەهك، چەنگاڵ، ئاسنێکی لووت تیژی چەماوەیە شتی پیا دەکرێ و راوەماسی پێدەکرێت

**شَصَا السَّحَابُ:** بەرزبوەوە، بڵندبوو

**شَصَا القِرْبَةُ:** مەشکەکە پڕ ئاو بوو بەرزبوەوە

**شَصَا بَصَرَهُ:** چاوی تێبڕی، چاوی خستەسەر، چاوی لێنەتروکاند

**شَصَا عَيْنُهُ:** چاوی‌خستە سەر بەچەشنێك لەهەمان کاتدا بۆ یەکێکی تریشی دەڕوانی

**شَصَا المَيْتُ شُصُوّاً وَشُصِيّاً:** ئاوساو دەستو قاچی بەرزبوەوە

**شَصَبَ العَيْشُ:** ژینو بژێوی سەختو گران بوو

**شَصِبَ المَكَانُ:**وشك بوو، بێ بەرهەمبوو، رەق بوو

**شَصُبَ الأَمْرُ:** قورسو گران بوو، سەختو دژواربوو

**شَصِبٌ:** قاتو قڕی، وشكو رەقی، زبرو بێ بەروبوومی

**شَصَرَ الثَّوْرُ:** قۆچی لێدا، شاخی وەشاند

**شَصَرَ فُلاَنَاً بِالرُّمْحِ:** بریندارى‌کرد، فلانەکەسی زامدارکرد بەتیرو نێزە

**شَصَرَ الشَّوْكَةُ فُلاَنَاً:** پیامەلچەقا، تاڵەکانی پیاکرد

**شَصَرَ الثَّوبَ:** درومانی دوور لەیەکی کرد، تەقەڵی جیاجیاو شاشی لێدا، بەتەقەڵی زلو دوورلەیەك دوریی

**شَصْرٌ مِنَ الظِّبَاءِ:** مامزی چوستو چالاكو بەبزووت

**ش ط**

**شَطَّ( بَعُدَ ):** دووربوو، دوورکەوتەوە، لایدا، ترازا، لەرێ دەرچوو

**شَطَّ فُلاَنَاً:** دووری خستەوە، لەرێی راست لایدا، ستەمی لێکرد، زۆرداری نواند بەرانبەری

**شَطَّ عَنْ الحَقِّ:** لەراستو رەوان لایدا، ستەمی کرد

**شَطَّ فِي سِلْعَتِهِ ( غَالَى فِي الثَّمَنِ ):** گرانی داواکرد، زۆری داواکرد

**شَطَّ عَنْ المَوْضُوعِ ( خَرَجَ عَنْهُ ):** لەباس لایدا، لەبابەت چوە دەرەوە

**شَطَّ عَلَيهِ فِي قَوْلِهِ وَحُكْمِهِ:** لەوتەو فەرمانداریی‌دا ستەمی لێکرد

**شَطَّ( شَاطِيء النَّهْرِ أَوْ البَحْرِ ):** رۆخ، کەنار، گوێ، مۆرد، قەراخ، کەراخ، لێوار، چالاف، کەف، کەفی، قەیار، گەڕاتۆك، پیخ، رەخ، ئالی ، دەم، کەنارگە، پەرگە، کەنگ، لەوچك، هێل، سوو، رووخ، سیلە، تەنگاڵ، زجێف، فاچ، زیوار، کلا، مۆرد

**شَطَائِبُ:** گرۆهو تاقمی جیاواز جیاواز

**شِطَاطٌ - شَطَاطٌ:** قەدو بالاّ رێکی

**شَطَاطَةٌ:** دووریی، پێچەوانەی نزیکیە

**شَطَأَ( مَشَى عَلَى الشَّاطِيءِ ):** بەکەناری ئاوەکەدا رۆی، کەناری گرت، بەقەراغی ئاودا رۆیشت

**شَطَأَ الـزَرْعُ:** دەرهـات ، دەرچـــوو، سەوزبوو، ڕوا
**شَطَأَ الأُمُ بِـالوَلَدِ:** بـوو لـەدايك، هاتــە بوون ، چاوی بەژیان هەڵهێنا
**شَطَأ:** کـەڵای درەخـتو ڕوەك، بـەرگ، درەختی خورمای پچووك
**شَطَأَ مِنَ الشَـجَرِ:** ئـەوەی لـەدەوری ڕەگو قەدەکانی دەردێت
**شَطَأَةٌ( زُکَام ):** هەڵامەت ، درمێ پەسیو، پــەتا، بـاهۆڕ، ئارسـم، پەرسـیف، پەسیوی، بـاهۆڕی، فرفینـگ، پەرسو، تماو، دەمەنی ، مرك
**شَطْأَهُ:** هەریەك لەدوو هاوڕێ بەکـەناری ڕووبار یان دەریادا ڕۆیشتن
**شَطء:** ڕووبار، ڕۆخ، کەنار، چۆم، چـەم، ڕووار، چەمی گەورە
**شَـطَبَ الشَـــيءَ:** دایــهێنا، دای دڕی، شـەقیکرد، لـەتیکرد، قڵیشـی تێکــرد، سڕیەوە، کوژانیەوە
**شَطَبَ فَوقَهُ:** هێڵێکی بەسەرا کێشا
**شَـــطَبَ الرَجُـــلُ:** دوورکەوتـــەوە، دوورەپەرێزبوو
**شَـطَبَ عَنْـهُ:** لێـی تـرازا ، لێـــی دوورکەوتەوە
**شَطَبَ الرُمـحُ عَـنْ مَقْتَلِـهِ:** نـەی پێکـا ، لێی نەدا
**شَـطَبَ الكَـــاتِبُ الكَلِمَـــةَ:** سـڕیەوەو یەکێکی تری نووسی لەجێگەی
**شَـــطَبَ القَـــاضِي الدَعْـــوَى:** دادوەر شـیکایەتو سـکاڵاکەی لەتێنووســی سکاڵانامەدا سڕیەوەو هیـچ فـەرمانێکی دەرنەکرد لەبارەیەوە

**شَطَبَ إِسْمَهُ مِنْ كَـذَا:** ناوەکـەی خـۆی سڕیەوە، کوژانیەوە، لایبرد
**شَطَّبَ العَمَلَ:** کۆتایی پێهێنا، دوایی پێ هێنا
**شَـطَّبَ اللَحْـمَ:** تـــوێ توێی‌کـــرد، پارەپارەی‌کرد، لەت لەتیکرد
**شَطَبَ السَيفُ جِسْمَهُ:** شـوێنەواری لێ بەجێهێلا، شوێنەواری لەسەر جێهێشت
**شَطَبَ الجِلْدَ:** هـەڵی دڕی، قاشـی‌کرد، ڕوشانی، برینداری کرد
**شَطْب:** سـڕینەوە، کوژانــەوە، قــەدو باڵارێك، شۆخو شەنگ، پوشی سـەوزی دارخورما
**شَطب( فِـي إِصْطِـلاَحِ الدَوَاوِيـنِ ):** لـەلای دەفتـــەرداران‌و ژمێریـــاران بریتیـــە لـــــەتۆمارکردنی خەرجیــــــەکان لەتێنوسێکدا بۆئـەوەی لـەکۆی پـارەی گشتی دەری بکات
**شَطْبَة ـ شُطْبَة ـ شِـطْبَة:** خـەت‌و هێڵێك لەسەرووی شمشێرەوە بێت
**شَطْبَةٌ مِنَ النَخْـلِ:** پەلکـەدارخورمای سەوز ، شمشێر
**شَطَّةٌ:** بیبەری سوور، بیبەری هندی
**شَـطَحَ فِـي السَـيرِ أو فِـي القَـولِ:** لەڕۆیشـــتنا لایــــدا، دوورکەوتــــەوە، لەقسەدا لەمەبەست لایدا
**شَطَرَ الشَيءَ:** لـەتیکرد، کردی بـەدوو کەرتەوە، دووکەرتی کرد
**شَـطَرَ بَيـتَ الشِـعْرِ:** نیـوەی لابـــرد، سڕیەوە
**شَـطَرَ النَاقَـةَ أو الشَـــاةَ:** گوانێکـــی دۆشی‌و ئەوی تری واز لێهێنا

**شَطَرَ عَنِ القَوْمِ:** بەڕق و قینەوە رۆیی و پشتی هەڵکرد
**شَطَر ـ شَطِرَ فُلَانَ:** بۆلای چوو، سەریدا
**شَطَرَ عَنْـهُم:** لێیان جیابوەوە، دوورکەوتەوە
**شَطَرَ بَصَرُهُ:** چاوی بەچەشنێکی لێهات وەك ئەوە وەهابوو لەیەك کاتدا بۆ دووشت بڕوانێت
**شَطَرَ الدَّارُ:** دوورکەوتەوە لێی، لێی بەڕاگەندەبوو
**شَطُرَ ـ شَطَارَةً:** بەوریایی و چابوکی ناسرا، بەچوست و چالاك و وریا ناوبانگی دەرکرد
**شَطَّرَ الشِّعْرَ:** لەسەر هەر بەیتێك بەیتێکی تری زیادکرد لەلایەن خۆیەوە
**شَطْر:** نیو، کەرت، لەت، دابڕین، داهێنان، بڕین، شوێن، لا ، ناوچە، دووریی، لاو شوێن
**شِطْرَنْج:** شەترەنج، سەترەنج، شەشرەنگ، گەمەیەکی دیارو ناسراوە لەپێشدا ناوی شەشرەنگ بووە کەبەتیپی ئارەوی نوسراوەتەوە بۆتە شەترەنج لەلای راستەوە : شا ، فەرزین(وەزیر) ، فیل، ئەسپ، روخ، پیادەو ژمارەی سەرجەم ئەو داشانەش (32)داشەو دابەش بوە بەسەر هەردوو پادشایا
**شَطْشَاطُ:** باڵندەیەکە
**شَطْشَطَ:** روون و ئاشکرا رۆیی بەسەر زەویدا
**شَطَّ:** لەوزە چوە دەرەوە، زیادەڕەوییکرد، لەرادە بەدەربوو

**شَطَفَ:** رۆیی، دوورکەوتەوە، کۆچیکرد
**شَطَفَ الثَّوب وَغَيرَهُ:** شتی، شۆردی ، لەئاوی هەڵکێشا، ئاوی پیاکرد، ئاوی تێوەردا
**شَطَفَ عَنْ الشَّيءِ:** وازی لێهێنا
**شَطَفَ الحَافَةَ:** کەنارو تەنیشتەکانی خڕو لارکرد
**شَطْفَة(شَطِيَة ):** تەڵەزم، تەلاش، تیسماڵ، پارچەیەکی تەنکە لەدار یا بەرد ببێتەوە
**شَطَنَ:** پێچەوانەی بوو، دژی وەستا، لەویست و خواستا پێچەوانەو دژبوو، جیاوازبوو لەنیەت و رووگەدا لەگەڵ ئەودا
**شَطَنْ:** پەت ، گوریس، خەرکەمان، گردێنك، پەتك، پەلەتك
**شَطَنَهُ:** جیاوازو پێچەوانەی بوو، دژو ناتەواوبوو لەگەڵی
**شَطُون:** بیرێکی قووڵ ، قوڵە بیر

**ش ظ**

**شَظِيَ:** درزی برد، قلێشا
**شَظِيَ القَوم:** پەرتەوازەبوون، جیابوونەوە، بەش بەش بوون
**شَظِيَ السِقَاء:** پڕبوو، لێوان لێوبوو
**شَظِيَ المَيتُ:** دەست و قاچی بەرزبوەوە لەکاتی گیانەڵاو روح کێشاندا
**شَظَّى القوم:** پارچە پارچەی کردن، کەرت و پەرتی کردن
**شَظِي:** ئێسکێکی بچووکی ئەژنۆیە، وردە رەگی ئەژنۆو دەست، شوێنکەوتوانی گەل و نەتەوە، ئەوانەی دێنە ناو نەتەوەیەك و لەخۆیان نین

**شَظِفَ العَيشُ:** ژينى سەختو گران بوو، بژێوى ناڕەحەتو ئەستەم بوو
**شَظِفَ الجِلدُ:** تيرەكە چوو بە نێو پێستو گۆشتىدا
**شَظُفَ الشَجَر:** وشكى كرد بەهۆى كەم ئاوييەوە، رەق بوو
**شَظُفَ الخُلُقُ:** خراپ بوو، ناباش بوو، بەدخوبوو، بەدڕەوشت بوو
**شَظَفَ ( طَوَّش ):** خەسانى، گونى دەرهێنا
**شَظُفَ:** نانى رەقو وشكەوەبوو
**شَظِفٌ:** بەدڕەوشت، بەدخوو، جەنگاوەر ، يەكێك بەتوندو تيژى جەنگو كوشتار بكات ، ژينى گرانو سەخت، بێ بژێوىو دەرامەت
**شَظِفَتِ اليَدُ:** رەق بوو، زبر بوو، قڵيشى برد
**شَظَفَة:** زەوى وشك، وشكە زەوى ، رەقە خاك
**شَظِيفٌ:** درەختى وشك بوو بەهۆى بێ ئاوييەوە

**شع**

**شَعَّ( إنتَشَرَ ):** بڵاوبووەوە، تيشكو رووناكى دايەوە، پرشنگى دايەوە
**شَعَّ الماءُ:** بڵاوى كردەوە، قڵپى كردەوە، رشتى
**شَعَّ فُلان:** پەلەى كرد، خێراى كرد، دەستو بردى كرد
**شَعَّ الشَمسُ:** تيشكى پەخشو بڵاو كردەوە، رووناكى دايەوە
**شَعٌ:** ماڵى جاڵجاڵۆكە، ماڵە جاڵجاڵۆكە
**شَعُّ الشَمس:** تيشكى خۆر، رووناكى خۆر، پرشنگى خۆر، بريقەى خۆر

**شَعُّ السُنبُل:** دەنكەكانى گردبوون، خۆيان گرتو بەريزى يەكا هەڵچوون
**شَعٌ:** تيشك، رووناكى، شەوق، ترسك، پرشنگ، پرشنگ، تاو، هەتاو، تيژك، رووناكى خۆر يا مانگ يان هەر تيشكێكيتر
**شَعٌ مِن كُلِّ شَيء:** بڵاو، پەرت، پەرش، چرژ، پژياگ، بلاف، بەلاف، بلا، بەلا، پەخش، چرفر، وەلاو، بەردبار، گوشاد، بەروەدەر، تيشك پەرشو بڵاو ببێت لەهەر پێكهاتەو بوونێك
**شَعَا الشَعرُ:** بژبوو، بڵاوبووەوە، شۆڕبووەوە، هاتە خوارەوە
**شَعَائِرٌ:** رێو رەسمەكانى حەج، ئادابو شێوازى، قوربانىو خێر ، دابو نەريت
**شَعَارٌ:** شوێنو جێگەيەك دارو درەختى زۆربێت، ئەو دارە چڕوپڕانەى خەڵكى لەزستاندا دەيسووتێننو خۆيانى پێگەرم دەكەنەوەو لەهاوينانيشدا لەژێر سێبەرەكەيدا دادەنيشن ، بەر، تووكەبەر
**شِعَارٌ:** دروشم، هێما ، ناونيشان، نيشانە، هەورە، بروسكە، دارو درەختى چڕوپڕ
**شِعَارُ الحَج:** نيشانەو دروشمو رێو رەسمەكانى
**شِعَارٌ تِجَارِيٌ:** نيشانەى بازرگانى، هێماى بازرگانى، ئەو هێمايەى كە كۆمپانياو دەستەوتاقم كەلێكى بازرگانى بۆ خۆيانى دادەنێنو لەبازاڕو نێوەندەكاندا شتومەكو دەزگاو كارگەو كۆمپانياكانيانى پێدەناسێنن

**شِعَارُ المَمْلَكَةِ أوْ البَلَدِ:** هێماو نیشانەکانی ولاّتو شوێنو جێگەیەك
**شُعَاعٌ:** تیشك، رووناکی، رۆشنایی، بریقە، تیشکدانەوە، رووناکی خستنەوە، تیشکی خۆر کەپەخشو بلاّودەبێتەوە یان ئەو تیشکەی وەك هێلّو تالّی درێژ درێژ دەبینرێت
**شَعَاعٌ:** بلاّوبونەوە، پەخش بوون، خوێن بەربوون یان پژان، سێبەرێکی تەنك
**شَعَاعٌ مِنَ اللَّبَنِ:** ئەو شیرەی ئاوی زۆر تێدەکرێت، بلاّوپەراگەندەی هەرشتێك، ویستو خوازی فرەو جیاجیا
**شَعَبَ الشَّيءَ:** کۆیکردەوە، جیاو پەرتیکرد، چاکیکرد، خراپیکرد(لەوشە دژە یەکەکانە)
**شَعَبَ الشَّيءُ:** دەرکەوت، هەلّهات، ئاشکرابوو، بەچاوبینرا، دیاریدا
**شَعَبَ القَومُ:** پەرتو جیابوون، بەشبەشو پەرتەوازە بوون
**شَعَبَ الرَّجُلُ:** مرد، گیانی سپارد، دنیای بەجێهێشت، لەدنیا دەرچوو
**شَعَبَ فُلاَنًا:** سەرقالّی کرد، خەریکیکرد
**شَعَبَ اللِجَامُ الفَرسَ:** گرتی لەوشوێنەوەکە مەبەستی بوو ئەوجا لێی خوڕیو بەکێشی کرد
**شَعَبَ إلَى القَومِ:** چوو بۆ لایانو لەهاورێکانی خۆی جیابوەوە
**شَعَبَ إلَيهِمْ:** لێیان بڕاو بێتاقەتو نیگەران بوو بۆیان
**شَعَبَ عَنْهُ:** لێی دوورکەوتەوە، تەریكو دوورکەوت لێی
**شَعَبَ النَّهْرُ:** روبارو لقی تری لێبوەوە
**شَعِبَ الرَّجُلُ:** دوورکەوتەوە بەئەندازەی مابەینی نێوان هەردوو شانی ئەمەش ئامارەیەکە بۆ ماوەیەکی کەمو کورت
**شَعْبٌ:** گەل ، نەتەوە، هۆزێکی مەزن ، نەتەوەو چینێك لەخەلّك، دووریی، دوور، گەیەنەرەکانی پارەکانی سەربەیەك
**شِعْبٌ:** رێگوزارێك لەسەر شاخ، ئاوەرۆ، جۆگەلەیەك لەنێو جەرگەی زەوییەکدا، رێگەو دەرچەی نێوان دووشاخ، گەرەکێکی مەزن، مەلّبەند ، شوێن ، بنکە، نێو جەرگە ، پێچو پەنای بەردین
**شَعَبٌ:** مابەینی نێوان هەردوو شان یان هەردوو شاخی ئاژەلّی شاخدار، دەفەی شان، ناوشان
**شَعَبُ الدَّهْرِ:** حالّو بارەکانی رۆژگار، رووداوو چەرخی سەردەم
**شَعَبُ السَّفُّودِ:** ددانە تیژەکانی کەوا گۆشتی پیادەکرێ بۆئەوەی ببرژێنرێ
**شَعَبُ الجِسْمِ:** مەبەست پێی هەردوو دەستو قاچە
**شَعَبُ الصَّدْرِ:** بۆری هەناسەدان لەهەردوولای کۆئەندامی سی
**شَعْبَانُ:** شەعبان، مانگی هەشتەمی کۆچییە
**شُعْبَةٌ:** لق ، چلّ، پەل، پەلو پۆ، کۆمەلّ، تاقم، بەشێك لەشتێك، مابەینی نێوان دووشاخ یان پەلو پۆ، ئاوەڕۆ
**شُعْبَةُ المُشْطِ وَشَوكَةُ الأكْلِ:** ددانی شانەو چەتالّ
**شَعْبَذَ:** فێلّو ساختەیکرد، جادوگەرییکرد، چاوبەستیکرد

**شَعْبَذَةٌ (شَعْوَذَةٌ):** فێڵ و ساختە، جادوگەریی، جامبازی، چاوبەست، جوکێتی
**شَعْبِيٌّ:** گەلی، نەتەوەیی، رەمەکی، یەکێکی ئاسایی و سادە لەمامەڵەدا
**شَعَثَ الأَمْرُ:** بلاوبووەوە، داکەوت، تەنرایەوە ، دانرا
**شَعِثَ الشَّعْرُ:** خۆڵاوی بوو، تەپ و تۆزاوی بوو، بژبوو، لێك ئالا، شێوا، ئاڵۆزکا
**شَعَّثَ:** دای بەسەریەکا، تێکەڵ و پێکەڵی کرد
**شَعَّثَ مِنَ الشَّيءِ:** کەمێکی لێبرد، تۆزێکی لێهەڵگرت
**شَعَّثَ الشَّاعِرُ:** هۆنراوەی پەراگەندەو جیاجیای هێنا، بریتیە لە لابردنی یەکێك لە بزوێنەرەکانی (فاعلاتن)و گۆڕانی بۆ (مفعولن)
**شَعْثٌ:** بلاوبوونەوەی رووداووکاروبارێك
**شَعَرَ:** هەستی کرد، سووسەی کرد، پێی زانی، زانی، دەرکی کرد
**شَعَرَ الثَّوبَ:** فەرویەکی خوری دووریی بە ناوەکەیدا
**شَعَرَ الرَّجُلُ:** شیعرو هۆنراوەی گوت ، هەڵبەستی هۆنیەوە
**شَعَرَ بِفُلاَنٍ:** هۆنراوەو شیعری بۆ وت، هەڵبەستی بۆ هۆنیەوە
**شَعَرَ بِهِ:** زانی و هەستی پێکرد، پێیزانی
**شَعَرَ لَهُ:** هەستی پێکرد، دەرکی کرد، زانی
**شَعُرَ ـ شَعَراً:** هەڵبەست و شیعرەکانی دوورو درێژ بوون، توولانی بوون

**شَعُرَ فُلاَنٌ ـ شِعْراً:** بلیمەتی و توانای هەڵبەست نووسینی تێدابوو خۆشی هەستی پێکردو دۆزییەوە
**شَعْرٌ (مَايَنْبُتُ مِنْ مَسَامِ الجِسْمِ):** تووك، موو، پرچ، تیسك، ساچ، قژ، خوری، هەقداك، پۆڕ، پۆڕت، پوورت، تووك و پۆپ
**شَعْرٌ خَشِنٌ:** مووی زبر ، تووکی رەق
**شَعْرٌ عَارِيَةٌ (مُسْتَعَار):** بارۆکە، بارەکە، کلاوقژ، قژی دەستکرد، قژێك بۆ جوانی لەسەر دەکرێ
**شِعْرٌ (كَلاَمٌ مُقَفَى):** هۆنراوە، چامە، هەڵبەست، شیعر ، وتەیەکە هەست و سۆزو خەیاڵ و مۆسیقای لەخۆگرتووەو کێشدار
**شِعْرٌ (فِي إِصْطِلاَحِ المَنْطِقِيِّين):** هۆنراوە لای زانایانی مەنتیق بریتیە لەوتەیەك کەلە خەیاڵەوە سەرچاوەی گرتبێت و مەبەست پێی ئارەزوومەندکردن یان ترسان و دوورخستنەوە بێت
**شَعِرٌ ـ شَعْرَانِيٌّ (كَثِيرُ الشَّعْرِ):** تووکن ، کوڵکن، مووداوی، موویین، تووکدار، تیسکن، یەکێك موو قژی زۆر بێت
**شِعْرَى:** گەلاوێژ ، ئەستێرەی گەلاوێژ، ئەستێرەیەکە لەنێوەراستی هاویناندا پەیدا دەبێ کەلەدوای هەڵهاتنی ئەوەوە فێنکی دادێت
**شَعْرَاءُ:** خەڵکێکی زۆر کەوا جەنجاڵی دروست بکەن، ئەو مێشەی دەنیشێتەوە بەسەر ئاژەلانەوە، دارێکە ترشەمەنی دەگرێت، کەوڵ، فەروو
**شَعْرَانِيٌّ:** تووکن ، کوڵکن ، مووداوی، تیسکن، یەکێك مووقژی زۆرو درێژبێت

**شِعْرَة:** پارە توكێك، تاڵە موويەك
**شَعْرَةُ العَين:** مووى چاو، موو
**شُعْرُور:** بوێـژو شـاعیرێكى كـزولاواز، وردە خەيار
**شَعْشَاغ:** پەراگـەندە، پـەرش‌و بـلاو، بەرين‌و پەرش، روح سووك، خوێنگەرم
**شَعْشَعَ الضَـوءُ:** بەمێواشـى‌و سـووكى بلاوبوەوە
**شَعْشَعَ الشَـرَابُ وَنَحْـوَهُ:** لەگـەڵ كـەمێك ئاودا تێكەڵى‌كرد، ئاوێتەى كـرد لەگـەڵ تۆزێك ئاودا
**شَعْشَعَ الـثَّرِيد وَنَحْـوَهُ:** رۆنـى زيـادبوو، چەورى زيادكرد
**شَعْشَعَ عَلَيهِم الخَيلَ:** بەسوارى ئەسپ هەڵمەت‌و هێرشـى بـۆ بـردن ، هـەڵى كوتايە سەريان بە سوارى ئەسپ
**شَعْشَعَ الشَيء:** تێكەڵى‌كرد، ئاوێتەى‌كرد
**شَعْشَع:** بلاو، جياجيا، گوشـاد، بـەرين، پەرتەوازە
**شَعِطَ:** هەڵى كرووزان
**شَعْطَةُ( حَـزَّة ):** دڵـەكزێ، سـوێى دڵ، دڵـەكزە، دڵەكوتـە، دڵبوورنـەوە، دڵ تێكچوون بـەهۆى خواردنـى نابـەدڵ‌و شتى تر
**شَعَفَ الشَيء ـ شَعْفاً:** بەرزبوو بەسەريا، بڵندى كرد، بەرزى كرد
**شَعَفَ الحُـبُّ فُلاَنـاً:** دڵى سـووتا ، دڵـى بـرد، شـێت‌و شـەيداى كـرد، دڵـى داگيركرد
**شَعِفَ بِفُلان وَبِحُب فُلاَن:** شەيداى بوو، حەزى لێكرد، ئالودەو شێتى بوو
**شَعِفَ بِالأمْر:** ترسـا، تۆقـى، دوودڵبـوو بۆى

**شَـعَف:** سـەر كۆپـارە، نەخۆشـيەكە دەدات لـەچاوى وشـترو توكـەكانى برژانگـى هـەڵدەوەرێ، ئـالوودەيى ، شەيدايى، ترس‌و بيم، تۆقان
**شَـعْفَاء:** وشـترى ناسـاغ‌و نـەخۆش كەنەخۆشـى تـووك هـەڵوەرينى پێڵـوى گرتبێت
**شَعَلَ النَّـار:** داگيرسـا، گرتـى، سـووتا، سوريا، هەڵگيرسا
**شَعَلَ الأمْر:** تێـپروانى، تەماشـاى‌كرد، وردبوەوە لێيى
**شَـعَلَ النَّـارَ فِيـه:** ئـاگرى تێبـەردا، سووتاندى ، گڕى تێبەردا
**شَعَلَ السِجَارَة:** جگـەرەى داگيرسـاند، جگەرەى هەڵگيرساند
**شَـعَلَ الكِـبْرِيت:** شـقارتەى لێـدا، دايگيرساند، هەڵى گيرساند
**شَعِل ـ شَعَلاً:** رەنگـى سـپى تێكـەڵ بـە رەنگى قژى بوو
**شُعْلَة:** كڵپە، بڵێسە، گڕ، گڕيـن، هێڵـە، كڵپەسەندنى ئاگر
**شُعْلَة المُوقِـد:** مەشـخەڵ، مەخشـەڵ، گـڕێ بـەرزى ئـاگر، دارى سـەربەگڕێ ئاگر، چڵە چرا
**شَعْوَاء:** بلاوبوەوە، پەراگـەند، پـەرش‌و بلاو
**شُـعُوبِيَة:** نەتەوەپەرسـتى، رەگەزپەرسـتى، بزوتنەوەيـەكى سياسـىيە دەدرێتـە پـاڵ گـەلانى نەتـەوەى ئيسلامى بـەدەر لەعـەرەب‌و يەكەم ئامانجيان يەكسانى بوو لەنێوان ئەو گەلانەو عەرەبداو پاشان ئامانجيان ئـەوەبوو دەسـتەلاتى عـەرەب كـەم بكەنەوە

**شَــعْوَذ ـ شَــعْوَذة:** جادووگــــەریی، چاوبەستکردن، فێڵکــردن، چاوبەستو جوکێتی

**شُعُور:** هەست ، نەسـت، خـود، پـەروا، پـێزانین، تێبینــی، زرنگــی، برســت، وریـایی، بێداریـی، سۆزو هەسـتکردن، هەستیاریی

**شَــعِيَ الغَــارَةُ شَــعَاً:** بلاوبـــووەوە، پەراگەندەبوو

**شَعِير:** جۆ ، جەهـ ، جەهـە، یــەوی، یەفـە، جۆك، جۆرە دەخلێکــە وەکـو گەنم وایە بەلاَم زبرو گەورەترە بـەزۆری لەگەلْ کایا دەدرێ بەئاژەلْو ولاَخو سێ جۆری هەیـە 1) جۆی سپی 2) جـۆی رەش 3) جۆی شەشپەڕ

**شَعِيرَة:** دەنکەجۆ، جۆ، قوربانی حەج، نیشانەو هێما، رێو رەسمەکانی حەج

**شَعِيرَةُ الجَفْن:** سیچکە سلاَوە، قنچکـە سلاَوە ، باپشکێو، سیسکەسلاَوە

**شُعَيرَة:** مووی باریك، دەزوولە

**شُعَيرَة جَذْرِيَة:** موڕەگ

**شُعَيرَة دَمَوِيَة:** دەزوولەی خوێن

**شَــعِيرِيّ:** جــۆ فــرۆش ، یــەکێك کــارو پیشەی جۆ فرۆشتن بێت

**شَــعِيرِيَة:** شــەعریە ، مەعکــەرۆنی ، پارچەی پچووك پچووکی لوولو باریکە لــە نیشاسـتە دروســت دەکــرێو ســووردەکرێتەوەو دەکرێــت بەســەر برنجو قوبولێدا

**شَــعِيل:** پلیتــە، فتیلــە، ســووتێنەر، گڕتێبەردراو

**شَعِيلَة:** ئاگری چراو فەتیلە، گڕی چـراو فانۆس

**ش غ**

**شَــغَاب:** ئــاژاوەگێڕ، ســەربەگێچەلْ، دووڕوو، گێرەشێوێن، تێچێــن، فیتنــە هەلگیرسـێنەر، ئاشـوبو ئــاژاوەگێڕ، دووزمان، ئاگری بن کا

**شَغَاف:** نەخۆشـیەکە دەدات لەپێسـی دلْ ، دەردی دلْ، دەردی عیشـــــقو شەیدابوون، خۆشەویستی

**شَغَاف:** پێستی دلْ ، پێستی سەر دلْ

**شَغَّال:** کرێکار، مزور، ئیشکەر، یـەکێك ئیشی زۆر بێت ، سەرقالْو خەریك

**شَــغَبَ القَــوم وَعَلَيــهِم وَمِنــهُم وَبِــهِم:** شەڕوئاژاوەی بـەرپاکرد لـەنێوانیاندا، گێرەشــێوێنیو دژایــەتی خســتە نێوانیانـەوە، مابـەینی تێکدانو بوویـە کولـە فیتنـەی نێوانیــان، دژ بەیــەك هانیدانو کردنی بەگژی یەکا

**شَغَبَ عَنِ الطَرِيق وَغَيرِهَا:** لایدا، ترازا، دوورکەوتەوە

**شَغَبَ ـ شَغِبَ ـ شَغَبَ ـ شَاغب( هَيَّجَ الشَر ):** گێچەلْی نایەوە، ئــاژاوەی بـەرپاکرد، شــەڕی هەلگیرســاند، دووڕوویـــیو دووزمانی کردو دانی بەیەکا

**شَغْب:** پشێوی ، دووڕوویی، دووزمــانی، ئاژاوە، یـاخی بــوون، هــەراو هوریــا، گێرەشێوێنی، ژاوەژاو، شەڕو ناخۆشی، نائارامی ، شەڕو ئاژاوە

**شَغَرَ الرَّجُل:** دوورکەوتەوە، پەراگــەندە کەوت، پەرێزی گرت

**شَغَرَ السِعْرُ:** کــەمی کـرد، ناتــەواوبوو، دابەزی ، نزم بوو

**شَــغَرَ النَّــاسُ:** پەراگــەندە بــوون ، پەرتەوازە بوون، بلاوەیان لێکرد

**شَغَرَ البَلَـدُ:** ولآت چۆڵ‌و بێ‌کەس بوو لەپارێزگارو ئەوانەی دەیپارێزن‌و ئاسایشی رادەگرن
**شَـغَرَ الكَلْبُ:** سەگەکە قاچێکی بەرزکردەوە هەتا میز بکات
**شَـغَرَ فُلانـاً عَـنْ البَلَـدِ وَنَحْـوَهُ:** دەریپەڕاندو دووری‌خستەوە، رایگوێزی‌کردو ئاوارەی خست
**شَغْرِبِيَّة ـ شَغْزَبِيَّة:** جۆرە هونەرێکە لەزۆرانبازیداو زۆرانباز پاشقولێك دەگرێت لەبەرانبەرەکەی‌و بەم فێڵە بەرانبەرەکەی هەڵدەنوتێ‌و لێی دەباتەوە
**شَغَفَ ـ شَغْفاً:** دڵی کەیل‌و شەیدابوو، دڵی هۆگروئارەزوومەندبوو، عاشقی‌بوو، دڵی پیا چوو
**شَغَفَ بِهِ:** شەیدای بوو، هۆگری بوو، حەزی لێکرد، توشیاربوو بەدەستیەوە، سووتا بۆی، هۆشی بەسەر خۆیەوە نەما ، عەقڵ‌و بیری وەستا بۆی
**شَغْف:** پێستی دڵ، توێژێکە بەسەر دڵەوەیە
**شَـغَفْ:** ئەوپەڕی خۆشەویستی، چڵەپۆی ئەوین‌و خۆشەویستی ، شەیدایی، پەرۆشی، سۆزی بەتین‌و جۆشدار، هۆگری‌و عەودال بوون
**شَغَفَهُ ـ شَغْفاً:** دای لەپەڕەی سەر دڵی
**شَغَفَهُ فُؤادَهُ:** زاڵبوو بەسەریاو گرتیەوە، تەنیەوە، دایپۆشی
**شَـغَلَ الـدَّارِ ـ شَغْلاً:** جێنشین بوو، سەقامگیربوو
**شَغَلَ فُلاَنَـاً عَـنْ الشَّيءِ:** سەرقاڵی‌کردو دووری خستەوە لێی، خەریك‌و تەریکی کرد لێی

**شَغَلَ ـ شَغَّلَ ( أعْطَـاهُ عَمَـلاً وَشُغْلاً ):** دایمەزران، کاری پێسپارد، ئیشی دایە، خەریکی کرد بەئیشەوە، سەرقاڵی‌کرد بەئیش‌و فرمانەوە ، بەکاری هێنا ، خستیەگەڕ
**شَـغَلَ الوَقْـتَ:** کاتی کوشت، کاتی بەسەر برد، کاتی تیابرد، وادەی گوزەراند
**شَغَّلَ المَـالَ:** پارەی خستە ئیشەوە، دارایی‌و ماڵی خستەگەڕ لەکارو کاسبیدا
**شَـغَلَ قَلْبَـهُ:** دڵی خستەگەڕ، دڵی داخورپان
**شَـغَلَ الـدَّوَاءِ:** دەرمانەکە کاری خۆی‌کرد، کاریگەربوو، کاریگەربوو، شوێنەواری بەجێهێشت
**شُغِلَ عَنْـهُ بِكَـذَا:** سەرقاڵبوو پێوەی ، گشت کاتەکانی گرت ، خەریك بوو پێوەی
**شُغْل:** کار ، فرمان ، پیشە، ئیش، خەریك بوون، رەنجدان، سەرقاڵی
**شُغْلٌ شَاقٌ:** ئیش‌و کارێکی قورس، کاروفرمانی بەئەرك‌و گران، ئیشی سەخت
**شُـغْلَة:** جارێك، رایەك، یەکجار، خەرمان، جۆخین
**شُغْلَهُ بِكَذَا:** سەرقاڵی کرد بە ..
**شُـغُوب:** ئەوەی هەڵدەستێت بە دروستکردن‌و نانەوەی ئاژاوەو شەڕ بەرپا دەکات ، شەڕەنگێز، ئاژاوەگێڕ، فیتنەچی، شەڕانی، دوژمن‌و دڵ پیس
**شَـغِيَتْ سِنُّهُ:** درێژتر بوو لەددانەکانی تری یان لەرەگو دەرهاتنیدا جیاوازبوو

**شَفِيَتْ مِنسَرُ الطَّائِر:** گۆچ و ناتەواوبوو
**شَفِيَتْ الأَسْنَانَ:** ددانەکانی لەکورت و درێژیدا جیاوازبوون

## ش ف

**شَفَّ:** تەنك بوو، یەکبادبوو، ناسك بوو، ئاوەکی بوو
**شَفَّ الشَّيء:** ناسکبوو، تەنکبوو، ئاوەکی بوو
**شَفَّ عَنْهُ الثَّوب:** کورتبوو
**شَفَّ الجِسْم:** تەنك و باریکبوو، لەڕو لاوازبوو
**شَفَّ الشَّيء:** زیادبوو، جوولا
**شَفَّ لَهُ الأَمر:** جێگیرو بەردەوام بوو
**شَفَّ فَمُ فُلانٍ:** ژان و ئێش گەیی بەددان و پووکی
**شَفَّ الرِّيحُ:** بای سارد هەڵیکرد
**شَفَّ الهَوَاءُ المَاءَ وَغَيرَهُ:** هەوا هەندێك لەئاوەکەی برد، وشکی کردەوە
**شَفَّ الرَّسْمَ:** وێنەو نیگاری کێشا بەهۆی بابەتی تەنك و ئاوییەوە
**شَفٌّ:** جاجم، پۆپەشمین، جاجرم، پۆپەزمین، پێخەفێکی شاشی هاوینەیە لەخوری ڕێسراوی باریك دروستدەکرێ
**شَفٌّ - شِفٌّ:** جل و بەرگ یان پەردەی تەنك، سوود، قازانج، ڕێزو فەزڵ، کەم و کورتی
**شَفَا الهِلالُ:** دەرکەوت، هەڵهات
**شَفَا الشَّخصُ:** ئاشکرابوو، دەرکەوت، هاتە ڕوو
**شَفَا الشَّمسُ:** نزیکی ئاوابوون کەوتەوە، خەریك بوو ئاوا دەبوو
**شَفًا:** پاشماوەی مانگ پێش ئەوەی ون ببێت، لێوارو قەراغی هەموو شتێك

**شَفَى فُلاناً مِنْ مَرَضِهِ:** چاکی کردەوە لەنەخۆشیەکەی
**شَفَى فُلانٌ فُلاناً:** داوای چاکبوونەوەی بۆ کرد
**شَفَى الشَّمسُ:** وەختەبوو ئاوا دەبوو، خەریك بوو ئاوا دەبوو، بەرەو ئاوا بوون ڕۆیشت
**شَفَى اللهُ فُلاناً شِفَاءً:** خوای گەورە شیفای دا، خوداوەند چارەسەری پێدا چاکی کردەوە، لەشساغی پێدایەوە
**شَفَى الجُرح:** ساڕێژی کردەوە، چاکی کردەوە
**شِفَاء(بُرء):** چاکبوونەوە، ساڕێژبوونەوە، ساغ بوونەوە، بەدەستهێنانەوەی تەندروستی و لەش ساغی، چارە، چارەسەر، دەرمان، چارەدۆزینەوە بە نەخۆشی و ناساغی
**شَفَاعَة:** پاڕانەوە بۆ یەکێك، داوای لێخۆشبوون، پاکانەو داوای لێخۆشبوون بۆ یەکێك
**شَفَّاف:** ڕۆشن، ڕوون، دیودیار، تروسکەدار، پەیدا، ئاشکرا، ڕەوشەن، ڕووناك، ڕۆشنا،گەش، دیار
**شُفَافَة:** پاشماوەی ئاو لەقاپ و جاما
**شُفَافَةُ النَّهار:** پاشماوەی ڕۆژ
**شَفَّان:** بایەکی سارد لەگەڵ باراندا
**شَفَاهِي:** لچ، ئەستوور، لچ و لێوگەورە، دەم و پل زل و قەبە، لێو قەوی
**شَفَاهِيّ:** وتەو قسەیەك تۆمار نەکرابێت و هەر بەزار بگوترێ
**شَفَة - شِفَة:** لێو، لەوس، لچ، لیڤ، لەواسە، لەو

**شَفَةٌ مُتَدلاَة:** لێچ شۆڕ، لەوس داکەوتوو، لچە
**شَفَةُ الشَيء:** قەراغی شتێك، لێواری ، کەنارەکەی ، دەمەکەی
**شَفَةُ الدَلْو:** لێواری دۆڵچە، قەراغەکەی
**شَفَةُ الجَبَل:** قەراغو لێواری شاخ
**شَفَةُ الثَور:** جۆرێکە لەگوڵە نێرگز
**شَفَتَان:** هەردوو لێو ، لێوی سەروو خواری مرۆڤ
**شَفَتَر ـ شَفَتَرَةٌ :** بلاوبوونەوە، پرژان، پارچە لێبوونەوە
**شَفِرَ( نَقَصَ وَقَلَّ ):** کەم بووەوە، کەمیکرد، کەمی هێنا
**شُفر ـ شَفر:** لێوار، قەراغ، کەنار، سیلەو قەراغی هەرشتێك، لێواری پێڵو
**شَفرَة:** تیغ، شفرە، گوێزان، دەمە تیغ، ئاسنی تیژی برندە، چەقۆیەکی گەورەو پانو بەرین، قەراغی شمشێر، خزمەتکار، تەیان ، کێردی گا کوژی
**شَفرَة:** جفرە، بەهێما نووسین ، پەرلە، هێماو نیشانەیەکی نهێنییە لەنێو سوپاو نێوەندی سیخوڕیو هاوتاکانیدا بەکار دەهێنرێت
**شَفشَاف:** باران بەتەرزەوە
**شَفشَفَ الهَمُ فُلاَنَا:** غەمو پەژارە لەپیکرد، خەفەت پەکی خست
**شَفشَفَ الصَقِيعُ أوْ الحَرُ النَبَاتَ:** وشکی کردەوە، سوتانی
**شَفشَفَ المَاءُ وَنَحوَهُ:** بەمێواشی پرژاندی، ئاوپرژێنێکی سووکی کرد
**شَفشَفَ الدَوَاءُ عَلَى الجُرح:** دەرمانەکەی پرژاند بەسەر برینەکەدا، دای لەزامەکەوە

**شَفَعَ ـ شَفَاعَةً:** شەفاعەتی کرد، تکایکرد، لالایەوە، لاقەلاقیکرد ، داوای لێخۆشبوونی بۆ کرد
**شَفَعَ الشَيء:** هاوچەشنی خۆی خستەپاڵی ، هاوتای کرد، خستیەپاڵ یەك، ئەوەندەی تری خستە پاڵ
**شَفَعَ البَصَرُ الأَشبَاحَ:** بەدوو ئەوەندە بینی، چاوی دوو ئەوەندەی بەدیکرد
**شَفَعَ لِفُلاَن:** شەفاعەتی بۆ کرد ، تکای لێخۆشبوونی بۆ کرد
**شَفَعَ إِلَى فُلاَن:** هۆکارێکی گرتەبەر، هۆیەکی گرتەبەر
**شَفَعَ فِي الأَمْر:** تکاکارو ناوبژیوان بوو بۆی
**شَفَعَ جَارَهُ:** مافی کرینی ماڵەکەی دا بەدراوسێکەی، دراوسێکەی لەپێشتر دانا بۆ کرینی ئەو لانەو ماڵە
**شَفَّعَ فُلاَنَاً فِي كَذَا:** شەفاعەتو تکاکەی وەرگرت
**شَفع( زَوْج ):** جووت ، دوانە، تاکی یەك، هاوتا، هاوشێوە، هاوساڵ، هاوسەر، هاوسەر، هاوڕاز، هاوبیر ، هاو ...
**شُفعَة:** مافی کرین پێشکەسانی تر، مافی هەڵگرتنەوە بەر کەسانیتر
**شُفعَةٌ:** دووڕکات نوێژی چێشتەنگاو
**شَفِقَ:** بەزەیی پیاهاتەوە، دڵی پێ سووتا، بەزەیی پیا هاتەوە
**شَفَقَ عَلَيهِ:** سوربوو لەسەر چاکەو خێری ئەو
**شَفِقَ مِنَ الأَمْر:** ترسا لەکارو فرمانەکە، ترسی لێنیشت
**شَفِقَ عَلَى الشَيء:** رژدو بەرچاو تەنگبوو

**شَفَّقَ الشَيء**: کەمی کرد، کەلی کرد، لێی دابڕی
**شَفَّقَ الثَوبَ**: بەخراپی دوریی، دورینێکی ناباشی کرد
**شَفَقٌ (ضَوءُ الشَمسِ بَعدَ الغُرُوب)**: ئێوارە، خۆرئاوا، زەردەپەڕ، کاتی ئاوابوونی خۆر کە زەردە بەسەر کەلەوەبێ
**شَفَقَة**: شتی خراپو ناباش، ڕۆژ، ترس و بیم، لاو شوێن ، سۆزو بەزەیی، بەتەنگەوە هاتن
**شَفَهَ فُلاَنَاً**: کێشای بەلێویا، دای بەلەوسیا، دەمو پلی داگرتەوە، کێشای بەلمۆزیا ، پرسیارێکی زۆری ئاراستەکرد هەتا هیچی پێنەما
**شَفَهَ الإنَاءَ**: ئاوی نێو قاپەکەی هەموو خواردەوە
**شُفِهَ زَيد**: پرسیارکەرانی زۆر بوون ، ئەوانەی پرسیاریان لەبارەوە دەکرد بێشومارو زۆر بوون
**شُفِهَ الطَعَامُ**: بخۆرانی زۆربوون، ئەوانەی دەیخۆن زۆر بوون
**شَفَة**: لێو ، لەوس، لەوچ ، لچ
**شَفَهِي**: زوبانی، دەمی، بەدەم ، دەم بڕ، ئەوەی لەسەر زارەو بەدەم دەگوترێ
**شَفَهِيَاً ـ مُشَافَهَة**: هەر بەدەم، بەزار، دەم بڕ
**شَفَهِيَّة مِنَ الحُرُوف**: ئەو پیتانەی دەرچەیان لەدوو لێوەوەیەو بریتین لە(باء، فاء، میم)
**شَفَهِيَة مِنَ المَاء**: ئەو سەرچاوە ئاویانەی بەردەوام ئاوخۆرو ڕێبواران رووی تێدەکەن

**شَفُوق**: بەبەزەیی، بەسۆز، دڵنەرمو میهرەبان
**شَفِير**: لێواری پێڵو، لێواری هەرشتێك
**شَفِيرٌ مِنَ الوَادِي**: لێواری دۆڵو شیو لەسەرەوە
**شَفِيرُ جَهَنَّم**: لێواری دۆزەخ
**شَفِيع**: تکاکەر، شەفاعەتکار، رووڵێنەر، ناوبژیکەر، ئەوەی هەڵدەستێت بەتکاو پاڕانەوە بۆ یەکێك
**شَفِيعٌ مِنَ العَدَد**: ژمارەی جووت ، جووتە ژمارە
**شَفِيعٌ (عِندَ الفُقَهَاء)**: لای زانایانی شەرع بریتیە لەوەی مافی کڕینی هەیە بەر لەکەسانیتر
**شَفِيف**: قرچەی گەرما، ئەوپەڕی سەرما، (لەوشە دژە یەکەکانە) بای ، ساردو سەخت
**شَفِيق**: بەسۆزو بەزەیی، بەڕەحمو بەزەیی، دڵناسکی بەسۆز، میهرەبانو دڵناسك

**ش ق**

**شَقَّ الشَيء**:دوولەتیکرد، دووکەرتیکرد، درزی تێکرد، دای هێنا ، قڵیشانی
**شَقَّ ثَوبَهُ**:جلەکانی دا دڕی، جلەکانی دڕی
**شَقَّ البَطنَ**: سکی هەڵدڕی، ورگی دڕی
**شَقَّ الأَرض**: زەویەکەی کێڵا بە گاسن
**شَقَّ الطَرِيق**: ڕێگای لێدا ، گرتیە بەر
**شَقَّ الأَمر**: کارەکە قورسو گران بوو، سەختو دژواربوو
**شَقَّ عَلَى فُلاَن**: خستیە نارەحەتیەوە، داوی بۆ نایەوە

**شَـــقَّ الـــــزَرْعُ:** روا ، دەرهـــــات ، کشتوکاڵەکە سەری دەرهێنا

**شَقَّ السِنّ( طَلَع ):** دانی هـــات، دانـــی دەرهات

**شَقَّ عَصَـا الطَاعَـةُ:** سـەرپێچی کـــرد، یاخی بوو، لەرێ لایدا

**شَقَّ البَرَقُ:** درێژبـــوەوە بـــەرێکی بـــۆ ناوەڕاستی ئاسمان

**شَقَّ الفَرَسُ:** لەغاردانداا بەرەو لا رۆیشت

**شَقّ:** درز، قلّیش ، دەمکردنـــەوە، دوو کـــەرت بـــوون ، دەلاقـــە، کـــەلێن، دڕان، زەنـــگ، ســـەختیو دژواری، نیـــوەی هەموو شتێك

**شِقّ:** لا ، لایەکی مرۆڤ، نیـوە، کـەرت، لەت، رەگەز نێرێتی یان مێیەتی

**شِقّ الرَجُل:** هـاو ...، لێچوو، شـێوە ، وەکو

**شِقّ المَيتُ( شَبَحَهُ ):** تارمـایی، شـەبەنگ، سێبەریی

**شَـــقَا اللّهُ فُلاَنَـــاً:** بەدبـــەختیکرد، سەرگەردانیکرد،وێڵو سەرگەردانیکرد

**شَقَا ـ شَقَاء:** نەگبـــەتی، بەدبـــەختی، نامەد، بەدچارەیی، بەدنگین، داماوی، هـــەژاری، ژیـــواری، شەلشـــی، کلۆڵـــی، مەینـــەتی، چارەڕەشـــی، بێچـــارەیی، بەلەنگازی، رۆژرەشی، ســـەلا، گرداف، بۆپـلات، پـــارس، پارســـەکی، تـــەنگی، پێچەوانـــەی خۆشـــحاڵیەە، تاریکـــایی، چەتوونی

**شَـــقَاءُ النَـــاب شَـــقَا وَشُـــقُوَّاً:** ددانـــی دەرهـــات، ددانـــی لەپوکیـــەوە ســـەری دەرهێنا

**شَقَار:** جۆرەماسیەکە، بەگیایەك دەڵێن

**شَقَارَى ( شَقَائِق النُعْمَان ):** درۆ، گـولاڵـە سوورە، چارانچەقیلە، رەبـەنۆك، گوڵـە میـلاق، گوڵەنیسـان، گوڵێکـی ســووری بەهاریی لاسك سەوزی درێژە ناوەکـەی خالێکی رەشی تیایە

**شَـــقَاوَة:** بەدبـــەختی، نەگبـــەتی، بەدچارەیی، بەدنگینی

**شَقَّأَ نَابَهُ:** کەڵبەکانی دەرهاتن

**شَـقَّأَ شَـعْرَهُ:** قـژی شـانەکرد، خـاوی کردەوە

**شَقَّأَ رَأسَهُ:** سەری شکاند، قرنجاندی

**شُقَّة ـ شِقَّة:** دوورەســەفەر، ماوەیـەکی دوورو درێـــژ، ســـەختی، گرانـــی، دەســتەخانوو، لانــە، تـــەلارە بینـــا، ساختمانی چەند نهۆم، گرانی، قورسی، نارەحەتی ، ماندویەتی، دڕاوی

**شُقَّة:** لـەت ، کـەرت، نیـوە ، پارچـە، ئەوەی بەدرێژی کەرتو پەرت دەکرێت لـەجلو بـەرگو کۆچـانو ....، تـــەلاش، لایەك لەخانوویەك خانەوادەیـەك تیـایدا جێنشین بن

**شَقِر ـ شَقُرَ:** سورفل بوو، قژکاڵ بوو

**شَقْرَاء:** سوور ، سورباو، سورفل، شلّ، سووربۆرتۆڵ، سوورهۆڵ

**شُقرَاق ـ شِقرَاق:** باڵندەیەکـە لـــەکۆتر گەورەترەو خاڵخاڵاویەو رەنگی ســەوزو ســـوورو ســپی تیایـــەو عـــەرەبیش بەباڵندەیەکی شومی دادەنێن

**شُقْرَان:** لالەعەباس، جۆرە گیایـــەکی گەلاپانـــە گولێـــك دەگـــرێ وەك لاولاوە بەلام ئەم پچووکترە بەیانیانو ئێـــواران دەگەشێتەوە

**شـقران:** دەردو ئافەتێكــــە دەدات لەكشــتوكاڵو ســەرەتا لەگــەڵاكانو پاشان دەدات لەدەنكو بەروبومەكان

**شـقرة:** رەنگێكــە لەســوورو زەرد پێكدێت

**شقشق الطير:** خوێنــدی ، جریوانــی، قاڕانی

**شقشق النهار:** رۆژ بوەوە، دەركـەوت ، هەڵهات

**شقشـق الملابـس:** لـەئاوی هەڵكێشــا، جلەكانی ئاوهەڵكێش كرد

**شقشـق الجمـل:** وشــترەكە دەنگــی لێوەهات

**شقشقة اللسـان:** چەنـەبازیكرد، زۆری گوت، زۆربڵێی كرد

**شقشقة النهار:** رۆژبوونەوە، رۆژهەڵاتن

**شقشقة:** كەفێكـە لـەدەمی وشـتر دێتـە دەرەوە كاتێ دەهــەژێو دەنگی لێوە دێت

**شـقص الذبيحـة وغيرهـا:** بــڕی، لــەتیكرد، پارچــەكانی بەشــێوەیەكی دادپەروەرانــە دابــەش كــرد لــەنێوان شەریكو هاوبەشەكاندا

**شقص:** پارچەیەك لەشتێك، بەش، پشك

**شقف ـ شقفة:** گلێنەو سواڵەتی شكاو

**شقق الحطب:** شكاندی، لەتیكرد

**شـقق الكلام:** فــراوانو گوشــادیكردو قسەكانی قسەی تری بەبەرا هێنا

**شــقلب:** خـــۆی هەڵگەڕانــــەوە، سەرمەقولاتیدا ، تەقلەی لێدا

**شقلبة:** خۆهەڵگەڕانەوە، سەرمەقولات، تەقلە

**شـقل(وزن):** تـەرازویكرد، شـاوڵیكرد، كێشای، هەڵیسەنگاند

**شقي:** بەدبـەخت بـوو، بێبـەخت بـوو، چارەرەشبوو،نەگریسبوو، بەدنگینبوو، تاوانباربوو، بێنەوابوو

**شقيف:** گابەردێك لەشاخەوە كەوتبێتە خوارەوە، بەردی زلە

**شـقيق:** بــرا،بــرای دایــكو بــاوكی، هاوشێوەو وەك یەك

**شقيق الشـيء:** كـەرت، لــەت ، نیــوە، پارچە

**شقيقة:** خوشـك، ژانـی نیوەسـەر، نیـو سەرئێشە، سەختە زەوی لەنێو باخچەو باخدا، لێزمەباران

**شـــقيقة مـــن الـــبرق:** ئــــەو هەورەبروســـــكەیەی كەلەئاســــۆوە پەخشو بڵاو دەبێتەوە

**شقيقة النعمـــان:** یـەك پـەل گوڵاڵـە سوورە، چڵێ چاڕانچەقیلە

**ش ك**

**شك فـي الأمــر:** دوو دڵبــوو لێــی ، بەگومان بوو لێی ، دڵی لێ پیس كرد

**شك عليه الأمر:** لێــی ئــاڵۆزبوو، لێـی تێكچوو، لێی شێوا

**شك فـي السـلاح:** بەتـەواوی پۆشــیی و لەبەریكرد

**شـك الخــرز:** مورووەكــانی بەیەكــەوە هۆنیەوە ، لەیەك رشتەو ریزیەندا رێكی خست

**شــك القرابـــة:** پــــەیوەندیكرد، پەیوەستیكرد

**شـــك الدابـــة:** باســــكی نووســــا بەلایەكیەوەو شەلبوو، گۆجو شەل بوو

**شَكَّ الجِلد بالمخرَزِ وَنَحْوَه:** دووریی ، درومانی کرد
**شَكَّ القَومِ بيُوتَهم وَنَحْوَها:** بەیەك ریزو لەسەریەك تەرزو شێوە ماڵەکانیان دروستکرد، وەك یەك دروستیانکرد
**شَكَّ الشَيءَ:** بڕی ، کوناو دەری کرد
**شَكَّ إليهِ البلادُ:** بڕی بۆی ، ماوەکەی بڕیو پێی گەیی
**شَكَّ الشَيءَ إلَى الشَيءِ:** دایە پاڵی ، نووساندی پێوەی ، پێوەی لکاند
**شَكٌّ:** گومان ، خانەگومان ، دوودڵی، دڵپیسی ، دڵاودڵی، سووکردن، شك ، سووسەبردن، دڵکرمێ بوون ، قەیرانێکی دەروونییە خاوەنەکەی لەنێوان دڵنیایی‌و دوو دڵیدا دێت‌و دەچێت
**شِكٌّ:** حەواڵەی دراوو پارە، ئاڵوگۆڕ رەوانەکردنی دراوو پارە
**شَكَا ـ إشْتَكَى (تَظَلَّمَ إلَيهِ):** هاواری لەدەستکرد، شکاتی لێکرد، ناڕەزایی لێدەربڕی
**شَكَا الأمرَ:** خستیە روو، نیشانیدا، رووني كردەوە
**شَكَا أمْرُهُ إلَى الله:** دەردو ناڕەزایی خۆی لەلای پەروەردگار هەڵڕشت، لاڵەلاڵی کرد لە بارەگای خوا یا
**شَكَا مَرَضَهُ لطَبِيبٍ:** راڤەی کرد بۆی، بۆی شیکردەوە، تیشکی خستەسەر بۆی
**شَكَا المَرَضُ فُلاَناً:** ئێش‌و ژانی پێگەیاند، ژانی بردە دڵیەوە، ئازاریدا
**شَكَّى الشَاكيَ:** ناڕەزایی‌و شیکایەتەکەی وەرگرت، خۆشنودو دڵنەوایی کرد

**شَكَاء ـ شَكَاةٌ:** نەخۆشی، ناساغی، کەیل‌و ناتەواویی
**شَكَّاء:** قلیش‌و درز کەلەدەوری نینۆکەکان دروست دەبێت ، پێست لێبونەوەو قلیشانی
**شَكَائرٌ:** پێشە سەر، نێوچەوان
**شَكَاسَةٌ ـ مُشَاكَسَةٌ:** بێئابڕویی، بێحەیایی، گڕۆزیی، رق گرتن ، شەڕ فرۆشتن، نالەباریی ، زوو هەڵچوون، تورەبوون
**شِكَاكٌ:** ئەو خانوانەی لەریزی یەك دروستکراون، لانەو خانووی یەك شێوەو بار
**شَكَّاك:** یەکێك زۆر بەگومان بێت
**شُكَاكَةٌ:** لایەك لەزەوی ، ناحیە، شوێنێك
**شُكَاكُون:** کۆمەڵە فەیلەسوفێکن کەوا لەنێوان چەسپان‌و بەرپەرچدانەوە سەبارەت بەراستی شتەکان‌و لەفەلسەفەی ئیسلامیشدا بە(اللا ادرية) هاتووەو ئەمانیش تاقمێکن لە(سوفسطائی)ە کان
**شِكَالٌ (قَيد):** پێوەند، کۆت، پاوەن، پاچەبەند، پێبەند، پابەست، دەستبەند، سندم، سمدم، مەرین، ئاسنێکی زنجیردارە دەکرێتە پێی گیراوو ولاخانەوە
**شَكْبَان:** گەوڕ، پەچە ، گەنجینە
**شِكَّةٌ:** ماوە، نێوان، ماوەی نێوان دوو شت
**شَكَّةٌ:** ئەوچەکەی هەڵدەگیرێ یان دەدرێت لەخۆ ، پارچەدارێکی خنجیلانەی پچووکە دەکرێتە سەری پاچ‌و .. هەتا نەپەڕێت‌و پتەو بێت

**شَكَة(وَخْزَة):** پیاچەقان، تێوە ژەندن، پیا هەڵچەقان

**شَكَدَ:** بەخشین بێپاداشت ئەو بەروبوومەی دەبەخشرێ لەکاتی دورینەوەدا، توێشوو

**شَكَدَة:** هەندێك خواردنی دایە لەکاتی رۆیشتندا

**شَكَرَ:** سوپاسیکرد، سپاسیکرد، ستایشیکرد، پێزانینی بۆ دەربڕی

**شُكْر:** سوپاس، ستایش، پیاهەڵدان، پێزانین، چاکە لەبەرچاوبوون، شوکر، ستایشی یەکێك لەپاداشتی چاکەیەکیا

**شَكْرَى:** پارە گۆشتی قەڵەو، ئاژەڵی پڕشیر، شیردار

**شُكْراً:** سوپاس، ستایش، وشەی پێزانین و لەبەرچاو بوونی چاکەو کردارێکی باش

**شَكْرَة ـ شَكَارَى:** گوانی پڕ شیر

**شَكَزَ:** ئازاردان بەزوبان، نکوولی گوتن، بریندارکردن

**شَكِرَت الدَّابَّة:** کەمێك عەلەف بەشیکردو تێربوو، دای بەسەر لەوەڕگایەکداو پێیی قەڵەوبوو

**شَكِرَة الشَّجَرَة:** لق و پەل و پۆپی ناسکی دەرکرد

**شَكِرَت الضَّرْعُ:** پڕبوو لەشیر

**شَكِرَت السَّحَابَة:** بارانی زۆری هەڵگرتبوو

**شَكِرَت فُلاَنٌ:** سەخی و بەخشندەبوو دوای ڕژدو گیریی

**شَكُسَ:** ڕژدو بەخیل بوو، چاوبرسی و دەست نوقاوبوو، ڕەوشت و هەڵس وکەوتی قورس و گران بوو، ڕقاوی و گرژبوو

**شَكِسَ:** دڕبوو، بێتابڕبوو، بێحەیابوو، نالەبار بوو، نەگریس بوو، نەگبەتبوو

**شَكِسٌ:** بێتابڕو، بێحەیا، نالەبار، گرژ، ڕقاوی، نەگریس، شەڕفرۆش، شەڕانی، چەپخون

**شَكْشَكَ السِّلاَحَ:** تیژیکرد، برەپێکرد

**شَكَعَ الدَّابَّةَ بِزِمَامِهَا:** سەری بەرێشمەکەیەوە بەرزکردەوە

**شَكَّكَهُ تَشْكِيكاً:** گومانی بۆ دروستکرد، دوودڵی کرد، وەهای لێکرد دوودڵ و گوماندار بێت

**شَكَلَ الأَمْرُ:** ئاڵۆزبوو، لێك ئالا، شێوا بەسەر یەکا، لەیەك ئالا، کەوت بەنێو یەکا

**شَكَلَ العِنَبُ:** لێی پێگەیی، وەبەرهات، وەختیبوو پێگەیی

**شَكَلَ الكِتَابَ:** سەروبۆری بۆ کرد

**شَكَلَ الدَّابَّةَ:** بەستیەوە، رایگرت، پێوەندی کرد، کۆتی کرد

**شَكِلَ الشَّيْءُ:** لەسپێتیدا روو بە سووریی بوو، سپی سورباوبوو

**شَكِلَ المَرْأَةُ:** بەنازو لەنجەو لاربوو

**شَكَلَ اللَّوْنُ:** ڕەنگێکی تری تێکەڵبوو، تێکەڵ بەرەنگێکی دیکە بوو

**شَكَّلَ الشَّيْءَ:** وێنەی گرت، دیمەنی کێشا، وێنای کرد، ڕەسمی کرد، هەمەجۆری کرد، دایمەزراند

**شَكَّلَ الزَّهْرُ:** چەن جۆرو چەشنێکی جیاواز جیاوازی لەگەڵ یەکا ڕێکخست

**شَكَّلَ الحُكُومَةَ:** حکومەتەکەی دامەزراند

**شَكْل:** شێوە، دیمەن، وێنە، نیگار، روخسار، دەم و چاو، چۆنیەتی، مەزهەب و مەبەست، نازو عیشوەتی ئافرەت

**شكل(فِي الهَنْدَسَة ):** ديمەنی تەنێك یان ڕوپایەکە کەوا یەك سنووری هەبێت وەك بازنەیەك یاخود چەن سنورێکی هەبێت وەك سێگۆشەو چوار گۆشە
**شَكْلُ الكَلاَم( حَرَكَاتُهُ ):** سەروبۆر
**شَكْل ـ شِكْل:** هەرشتێکی گونجاوو پەسەندو باش ، نازو لارو لەنجە ، ناز فرۆشی
**شَكْلاَء:** پێویستی ، تێکەڵبوون ، ئاڵۆزبوون
**شَكْلَة:** لێچوو، وەك، هاوچەشن ، هاوشێوە، هاوڕەنگو بۆ ، هاوبیر ...، هاو ...، سوربیەك لەنێو سپێتیدا بێت ، تێکەڵبوونی ڕەنگەکان
**شَكْلَة:** عیشوەگر، ژنی بەناز
**شَكَمَ:** پاداشتی دایەوە، مافی بەسەرخۆوە نەهێشت، خەڵاتی کرد لەبری چاکەکردنی لەگەڵیدا
**شَكَمَ فُلاَنًا:** بەرتیلی دایە،دەمکوتیکرد، بێدەنگی کرد، دەمی چەورکرد
**شَكَمَ الدَابَةَ:** لغاوی کرد
**شَكَمَ المُعْتَدِيَ:** بەتوندی بەرپەرچی دایەوە، توند چووەوە بەگژیا
**شَكِمَ ـ شَكَمَاً:** برسی بوو، گەدەی خاڵی و بەتاڵبوو
**شُكْم:** بەخشینێك وەك خەڵاتو پاداشت
**شَكْمَهُ ـ شَكَمَاً وشَكْمَاً:** گەزتی ، گازی لێگرت
**شَكْو:** نەخۆشی ، ناساغی، خراپی باری تەندروستی، وشتری پچووك
**شَكْوَة ـ شَكْوَى:** سکاڵا، شکات ، دادخوازیی، ناڕەزایی
**شَكْوَة:** یەکجار شکاتو ناڕەزایی دەربڕین
**شَكْوَة ـ شَكْيَة:** كوندە، مەشكە
**شُكُور:** سوپاسگوزار، یەکێکە لەناوەجوانەکانی پەروەردگار ، پێزانین
**شَكِيّ:** گلەیی مەند، ناڕەزا، ناڕازی، سکاڵاکار، کەسێك ناساغو تەندروست شێواو بێت
**شَكِيَّة:** ئەوەی سکاڵاو ناڕەزایی دەردەبڕێت، نەخۆشی، ناساغی، پاشماوەی شت
**شَكِير:** گەنەتووكو موو لەنێو تووکی درێژو گەورەدا، ئەو پەلە ناسکانەی لەسەر درەخت دەڕوێت، گەنە موو
**شَكِيكَة:** ڕێباز، ڕێگە، ڕەوشتو هەڵسوکەوت، جیاوازی، سەبەتەیەك میوەی تێدا بێت
**شَكِيمَة:** سەرکەوتن بەسەر ستەمو زۆرداراندا، سەردەمو چەرخ، خوو، سروشت، وەك یەك، لێکچوون، سەرکەشی، هێزی دڵ
**شَكِيمَة( أَنَفَة ):** لووتبەرزی، خۆبەزلزانین ، فیزداریی ، سووکیو ڕسوایی
**شَكِيمَةُ اللِجَام:** ئاسنی لغاو ، کرۆکی لغاو

**ش ل**

**شَلَّ ـ شُلَّ ( عَطِلَ ):** پەکی کەوت ، وەستا، لەکارکەوت ، بڕستی لێبڕا
**شَلَّ الثَوب:** درومانێکی سووکی کرد، بەسووکی درویی
**شَلَّ الدرْعَ وَشَلَّهَا عَلَيه :** لەبەری کرد، پۆشی ، کردیە بەری

**شَلَّ الشَيءَ:** بڕی ، قرتاندی، لەتیکرد
**شَلَّ الإبِلَ:** دەریکرد، دەریپەڕاند، هەڵی فریوان ، لێی خوڕی
**شَلَّ الصَبَاحُ الظَـلامَ:** ڕووناکی تاریکی ڕاونا، ڕووناکی تاریکی ڕەوانەوە
**شَلَّ العُضـوُ:** تووشی ئیفلیجی هـات ، پەکی کەوت ، شەلەل لێیدا
**شَـلَّتْ يَـدُهُ:** دەسـتی ئیفلیـج بـوو، گۆجبوو، وشـك بـوو، تووشـی شـەلەل هات ، پەکی کەوت
**شَلاَ:** بەرزیکردەوە، هەڵی بڕی، بڵنـدی کردەوە
**شَلاً:** جەستەی هـەر شـتێك ، تـەنی هەرشتێك، قاڵب ، جەستە ، تەن
**شَلاَلٌ:** تاڤگە ، ڕێـژاو، سـۆلاف، پـڕژ، شیب، شیرۆ، سـوولی، ڕێـژاف، ڕێلاف، وەزەن، قەڵبـەزە، پلووسـك، ڕێژگـە، سـوولاف، سـوواف، شـۆش، تافـە، قـەڵوەزە، ئاوشـار ، جێگایـەکی بـەرزە کـەئاوێکی زۆری بـەخوڕی لێ بێتـــە خوارەوە
**شَلاَلَة:** کـۆك گرتـن ، تەقـەڵی زل زل، دورمانی شاش ، شەڵتە درو
**شَـلَّة:** دەسـتە ، کۆمـەڵ، دەسـتەك، چوون، زەهفان، تیپ ، بەرە
**شَلَّة ـ شِـلَّة:** کلافـە ، کـەلاف ، ماشـەر، کەلافەدەزوو، چـەند هـەودا دەزوو یـان ئاوریشـــمێکە کەپێکـەوە هــەڵکراین بۆئـەوەی کــەداوداو دەرکێشــرێ و بەکاربهێنرێ
**شَلَّة:**مەبەست ، مەرام ، خواست ، داوا، دەستە ، گرۆهـ

**شَلَحَ ثِيَابَـهُ:**جـلو بەرگـەکانی داکـەند، خۆی ڕووت کردەوە
**شَلَّحَ:** ڕووتی کـردەوە، جلـەکانی لەبـەر داکـــەند ، خـــەڵکی ڕووتکــــردەوە، جەردەیی کرد، تالأنی کرد
**شَلشَلَ المَاءُ:** تنۆك تنۆك هاتە خوارەوە، چکایەوە، تکایەوە
**شَلشَلَ المَاءُ وَبِالمَاء:** بەفراوانیو جیاجیـا بەریدایەوە
**شَلشَلَ السَيفُ الدَمَ:** ڕشتی ، ڕژاندی
**شَلشَـلٌ مِنَ الرِجَـالِ:** پیـاوی چـابووكو گورجو گۆڵ، نەفسو دەروون پاك
**شَلشَلَة:** تکەتکی ئاو، چکە چکی
**شَلطَة:** تیرێکی درێژی ورد
**شَلَغَ رَأسَـهُ:** سـەری شـکاند، سـەری قرنجاند
**شَلفَة:** حەربە ، کێرد، چەقۆی گـەورەو تیژ
**شَلاَفَة:** ژنـی داوێـن پیسـی سـوزانی، داوێن تەڕ ، قەپاتمە
**شَلَقَ:** لێدان بەقامچی ، جووت بوون
**شَلقَاء:** کێرد، قەمە، چەقۆی گەورە
**شَلقَة:** هێلکەو توخمی مارمێلکە
**شَـلَلٌ:** بریتیـە لـەوەی جـلو بــەرگ پەڵەیـــەکی بەریکـــەوێتو بەشـــتن لانـــەچێت، خراپـــیو ناتەواوییەکـــە لەدەستدا
**شَلَّلَ:** بەتەقـەڵی زل زل دورمـانی کـرد، شەڵتە درووی کرد
**شَـلَلٌ(فَـالِجٌ):** ئیفلیجــی ، گۆجــی ، تێکچوونـی بـاری ئەندامـەکانی لاشـە بەلەکار کەوتنیان

**شَلَل نصفيّ:** گوێتی و ئیفلیجی نێو لەش
**شَلَل جُزْئِـيّ:** یـەك ئـەندام ئیفلیـج و گۆجی
**شَـلَل إهْـتِزَازِيّ:** لـەرزۆکی ، ئـەو جـۆرە ئیفلیجیەیــە نەخۆشــەکە جەســتەی دەلەرزێ
**شَلَل الأطفَال:** ئێسکە نەرمە
**شَيلِيّ:** پاشماوەی هەر شتێك
**شَلِيَّة:** پاشماوەی ماڵو دارایی، پارچــە گۆشتێك، کوتە گۆشتێك
**شَلِيل:** ئاوەڕۆ، جۆگە ، مۆخی مورەگە، بڕبڕە مـۆخ ، مێـژەلاك، دڕکــە مــۆخ ، پارچەیــەکی دروســتکراوە لــەخوری و چەشــنەکانی و لەســەر پشــتی وڵاخ دادەنرێــت ، تیماســێکی پارێزگــاری پچووکــەو لــەژێر قەڵغانــەوە لەبــەر دەکرێت

**ش م**

**شَمّ الـوَرد:** بۆنی‌کرد، بـەهۆی لووتـەوە بۆنی کرد
**شَمّ ـ شَمَماً:** خۆی بەگــەورەزانی، خـۆی بەگەورەو تیژ دانا
**شَـمّ الجَبَـل أو الأنــف:** بــەرزبووەوە، بلّندبوو، بالآبوو
**شَم:** بۆنکردن، هەستی بۆنکردن
**شَمَات (خَائب):** بێهیوا، دەست بەتاڵ، سەرنەوی، نائومێد
**شَمَاتَة:** بەدی، نائومێدی
**شَمَاخ:** زۆربڵند، یەکجار بەرز، فرەبڵندو پایان
**شَمَاخ:** جامانە
**شَـمَاج:** ئــەوەی دروســت دەکرێــت لەبرنج و جۆ ، ئـەو تـرێ خراپـەی فـڕێ دەدرێت پاش خواردنی چاکەکەی

**شَــمَار:** ڕوەکێکــە گوڵێکـــی زەرد دەردەکــات و دەنکێکـــی ســـەوزی درێژکۆلەی هەیە
**شَمَّاس:** مجـەوری کڵێســە، شـەماس، خزمەتکاری کەنیسە
**شَمَاسِيَّة:** پیشـەو خزمــەتی مجـەوری کەنیسە
**شَمَاغ:** گەمە ، یاری، گاڵتــە، پێکـەنین، وازی، گــەپ، قەشمــەری، تــەوزە، تیزەجاڕ، حەنەق
**شَمَّاغ:** مۆمگەر، مۆم فرۆش
**شَمَال ـ شِمَال:** باکور، ژووروو، سـەروو، لای چەپ، بەبای شەماڵیش دەڵێن
**شَمَال شَرْقِيّ:** باکوری خۆرهەلآت
**شَمَال غَرْبِيّ:** باکوری خۆرئاوا
**شَمَال ـ شَمَائِل:** شووم ، بـەد، لا ، هـەر چنگێك لەکشتوکاڵ کشتیار یان جوتیار لەکاتی دورینەوەدا بیخاتە نێو دەستی، سروشت ، خوو
**شَمَالاً (نَحو الشـمَال):** ڕوەو بــاکور ، بەرەو باکور
**شَمَالِيّ (مِـن الشمَال):** خـەڵکی بـاکور، باکوریی
**شَمِتَ بِفُلاَن:** بەغەم و پەژارەی شادبوو، بەبەلاو گرفتاریی خۆشحاڵبوو
**شَمَّتَ العَاطِس وَشَمَّتَ عَلَيه:** نزاو دوعای بۆکرد بە گوتنی: خوالێت خۆش بێـت ، یاخود بۆی پاڕایەوە لەهەلوێستو بـارو حـاڵێکدا نـەبێت پێـی خــۆش بێــتو شکستو سەرنەکەوتنی تیا بەدی بکات
**شَمَّتَ بَينَهُمَا:** کۆی کردنەوە، بەیەکەوە گرێیدان

**شَمَّتَ بِهِ فِيهَا:** هیوای‌بڕی،نائومێدی‌کرد، پرزدی بڕی

**شَمَّجَ فِي الأَمْرِ:** پەلەی‌کرد، خێرای کرد، گورج‌و گۆڵ بوو

**شَمَّجَ الشَّيءِ:** تێکەڵی کرد لەگەڵ شتی ترا

**شَمَخَ (علاَ):** بەرزبووەوە، بڵندبوو، بالآبوو، هەڵکشا، چوو بەرەو ژوور

**شَمَخَ أَنْفَهُ وبِأَنْفِهِ:** بەخۆبەزلزانین‌و فیزەوە لووتی بەرزکردەوە

**شَمْخ:** گچکە درەخت، درەختی پچووك

**شَمَخ:** بیابان‌و ناوچەیەکی دوور

**شَمَرَ (مَرَّ سَرِيعًا):** خێرا تێپەڕی، بەخێرایی ڕۆیشت، بەپەلەو گورج‌و گۆڵ ڕۆیی، تیژ تێپەڕی

**شَمَّرَ النَّخْلَ:** پارچە پارچەی کرد، لەت لەتیکرد

**شَمَّرَ:** بەخێرایی ڕۆیی، تیژ تێپەڕی

**شَمَّرَ الشَّيءِ:** بڕی، لەتیکرد

**شَمَّرَ السَّفِينَةَ أَوْ الصَّقْرَ:** ناردی، ڕەوانەی کرد، بەڕێی‌کرد، هەڵی فریوان

**شَمَّرَ الثَّوبَ عَنْ سَاقِيهِ:** بەرزی‌کردەوە، بڵندی کردەوە، هەڵی بڕی

**شَمَّرَ فِي الأَمْرِ:** سووکی کرد، ئاسانی‌کرد، هێواشی کرد

**شَمَّرَ كُمَّهُ:** قۆڵی هەڵکرد، قۆڵی لێهەڵماڵی

**شَمَّرَ لِلأَمْرِ:** بەگەرم گرتی، زۆر بەتەنگ کارەکەوە هات، خۆی بۆ ئامادەکرد، چاکی لێکرد بەلادا

**شَمَّرَ عَنْ سَاعِدَهِ:** قۆڵی لێهەڵماڵی، چاکی لێکرد بەلادا

**شَمَرُ:** ڕوەکێکە

**شَمِرُ:** چوست‌و چالاك‌و سوور لەسەر ڕەفتارەکانی، سەخی‌و دڵفراوان، دەرچەو دەلاقە

**شَمَّرَت الحَرْبُ وَشَمَّرَت عَنْ سَاقَيهَا:** گەرم بوو، تاوی سەند، گەرم‌و گوڕ بوو

**شَمَّرَت نَفْسُهُ مِنَ الشَّيءِ:** نەفسی دوورو پەراگەندەبوو لێی

**شُمْرُوخ:** مێشوو کەبۆڵە تری‌ی پێوەبێت، پەلێکی نەرم‌و ناسك لەسەر چڵێکی ڕەق دەردێت

**شَمَزَ (اِشْمَأَزَّ مِنْهُ):** قێزی لێهاتەوە، لەبەرچاوی کەوت، بێزی لێکردەوە، دڵی پێ تێکەڵهات

**شَمَزَ الشَّيءِ:** ڕقی لێی بوو، خەشمی بەرانبەر هەبوو

**شَمَزَ مِنْهُ:** دڵی لێی هاتەوە یەك، لێی بەدووربوو، خەشمی هەبوو بەرانبەری

**شَمَسَ:** ڕێگری کرد، ڕێگەی نەدا، یاساغی کرد

**شَمَسَ لَهُ:** دژی وەستاو خەشم‌و دوژمنایەتی بۆ دەرخست‌و ویستی شەڕی پێ بگەیەنێت، شەڕی پێ فرۆشت، نەچوە ژێری

**شَمَسَ الفَرَسُ:** شێت بوو، هاربوو، وروژا، کەس نەیتوانی سواری ببێت یان بەکێشی بکات

**شَمَسَ اليَوْمُ:** خۆرهەڵهات، دەرکەوت، بەدەرکەوت، ڕۆژ تیایدا دەرکەوت

**شَمَسَ فُلاَنَ:** سەرپێچی کرد، یاخی بوو، بێ‌گوێی نواند

**شَمَسَ لِفُلَانٍ:** خەریکبوو ئازاری بدات
**شَمِسَ لِي:** دوژمنایەتی بۆ دەرخستم و نەیتوانی پەنهان و شاراوەی بکات
**شَمَسَ:** خۆری پەرست ، رۆژپەرستبوو
**شَمَسَ الشَّيءُ:** هەڵیخست لەبەر تیشکی خۆردا، خستیەبەرخۆر
**شَمَسَ فُلانٌ:** بوو بە خزمەتکاری کەنیسە، لەخزمەتکارانی کڵێسابوو
**شَمْس:** خۆر ، رۆژ، هوویر، وەر، رۆش ، رۆ، رووج، تاو، هەتاو، رۆژی ئاسمان
**شَمْس ـ شَمْس ـ شُمُوس مِنَ الأَيَام:** رۆژێك هیچ هەورێك بەئاسمانەوە نەبێت
**شَمْس:** سایەقە، هەتاو، سامالْ، سایقە، ئاسمانی بێهەورو تەم و مژ
**شَمْسِي:** خۆری ، رۆژی ، خۆرین ، مانگی زایین
**شَمْسِيَّة:** چەتر ، چەرداخ، سێبەر، سەیوان، سێوان ، سەیڤان، بەرباران، سەویانە، شتێکە لەژوورو سەرەوە هەڵدەدرێ لەکاتی باران یا گەرمادا
**شَمَصَ الدَّابَّةَ وَغَيرَهَا:** بەتوندی لێی خوڕی هەتا کوێری کرد
**شَمَصَ الرَّجُلَ:** ترساندی ، نیگەرانیکرد، ترسی هێنا بەبەریا
**شَمَطَ الشَّجَرُ وَنَحْوَهُ:** گەڵاو پەلەکانی بڵاوبوونەوە، پەل و پۆی فڕێدا
**شَمَطَ الشَّيءَ:** تێکەڵیکرد، لەگەڵ شتی ترا ئاوێتەی کرد
**شَمَطَ مَالَهُ:** ماڵیحەلاڵی تێکەڵ بەحەرام کرد
**شَمَطَ الكَلَامَ أَو فِيهِ:** چەن جۆرو بابەتێکی ئاوەلاکرد، لەدەرگای چەن باس و خواسێکی دا
**شَمَطَ الإِنَاءَ وَنَحْوَهُ:** پڕیکرد، لێوان لێوی کرد، سەرلێوی کرد
**شَمِطَ:** سەری بوو بەماش و برنج، سپی تێکەوت ، رەش و سپی بوو
**شَمِطَ الشَّجَرُ:** گەڵاکانی کەوتن ، بەربوونەوە
**شَمَّطَ:** تێکەڵیکرد، ئاوێتەی کرد، کردی بەنێو یەکا
**شَمْطَاء:** یەکێك مووی سپی تێکەڵبووبێ بەمووی رەش، سەرماش و برنج، سەربۆز
**شَمْطَان:** نەرم و تەڕبوونی فەریکە خورما
**شَمَعَ (لَعِبَ وَمَزَحَ):** گاڵتەیکرد، یاریکرد، گەمەی کرد
**شَمَّعَ (حَمَلَهُ عَلَى المِزَاحِ وَاللَعِبِ):** خستیە یاری و گەمە، گاڵتەی لەگەڵکرد
**شَمَّعَ الشَّيءَ:** مێوی تێهەڵسوو، لەمێوی هەڵکێشا، مێوی تواوەی کرد بەسەریا
**شَمْع ـ شَمَع:** مێو، تیرەشان، شەمێ ، فرفرۆك، قرچەنە، زیبچ، مێوی هەنگوینی، تلپەی هەنگوین، مۆم، شەم
**شَمْعَة:** مۆم ، شەم ، شەمی سووتان، شتێکی درێژکۆلەیە لەپلیتە و پیو دروستدەکرێ و لەبری چرا دادەگیرسێنرێ
**شَمْعَدَان:** مۆمدان ، شتێکی بنکداری بەرزە ، مۆمی لەسەردادەنرێ
**شَمْعَلَ القَومُ:** پەرتەوازەبوون ، بەش بەش بوون ، کەرت و پەرت بوون ، بڵاوبوونەوە
**شَمْعَلَ الغَارَةُ:** بڵاوبوەوە، پەرتەوازەبوو

**شَمْعَلَ الإبِلُ:** هـەڵی تـیزان، هــەڵتیزان بەخۆشی‌و کەیفەوە
**شَمِقَ فُلانٌ:** دڵخۆش بوو بەرادەیەك وەك شێتی وەهـابوو، کـەیفداربوو بـەڕادەی شێت‌و هاربوون
**شَمِقَ مِنَ الثِّيَـابِ:** جل‌وبـەرگی لــەت‌و پەتکراو، جلی کۆنەو شڕ
**شَمَلَ الأمْـرُ القَـومَ:** گرتیـەوە، لـەخۆی گرتن
**شَمَلَ القَـومَ خَـيراً أوْشَـراً:** گرتنیـەوە، دەوریدان ، سنووری گرتن
**شَمِلَ:** بڵاوبـوەوە، هـەمووی گرتـــەوە، لەخۆی گرت ، تیابوو، گرتی، بریتی‌بوو له ...
**شَمَّلَ الرَّجُلَ:** خـێرایکرد، پەلـەیکرد، زووی کرد
**شَمْلٌ:** بـای بــاکوور، ئـەو کاروبـارەی لەســەری کۆکـن ، ئـەوەی لەســـەری جیاوازن (لەوشه دژه یەکەکانە)
**شَمَلٌ:** بـای بـاکور، بـاوەش، ئـامێز، کەمێك باران یان تەڕی یاخود خـەڵکی‌و شتی‌تر
**شَـمْلَةٌ:** کـالاَ، بــەرگی فــراوان بــۆ خۆپێچانەوەو داپۆشین
**شَمْلَلَ( أسْرَعَ ):** پەلەی کرد، خێرای کرد
**شَـمْلُولٌ:** کــەم ، کــەمێك، تۆزێـــك، ســووکەڵە، گــورج، گــورج‌و گـــۆڵ، چوست‌و چالاك، چابووك
**شَمَمَ الزَّهْرَ:** بۆنی کرد، بۆنی هەڵمژی
**شَمَمٌ:** بـەرزی ، لوتبــەرزی ، بڵنـــدی ، بالأیی
**شَمَمَهُ الطِّيبَ أوْ الـدَّوَاءَ:** بۆنـی کـرد، هەڵی مژی

**شَـمَنْدَر۔ شَـمَندور ( شَـوَنْدَر۔ بَنجَـر ):** چەوەنەر، چەوەندەر، سلك ، گیایــەکی گـەڵاپانی پایزی‌یـە بنکێکـی گــەورەی پان‌و شیرینی هەیە بەتۆو دەچێنرێت‌و دوو جـــۆرە لـــەجۆرێکیان شـــەکر دروستدەکرێ
**شُمْوَاءُ:** بزنەکێوی
**شَمُوسٌ مِنَ الأيَّامِ:** کەوە رۆژ، بێهـەور، هەتاوو سایەقە
**شَمُوطٌ:** گوڵەگەنم‌و جۆ
**شَمُولٌ:** بادە یان بادەی سارد
**شُمُولٌ:** گرتنەوە ، بەرکەوتن ، تیابوون، داپۆشین
**شَـمِيطٌ:** تێکـەڵ ، بـەیانی بـــەهۆی تێکەڵبوونی بەپاشماوەی شەو
**شَمِيلٌ:** بای باکوور
**شَـمِيلَةٌ۔ شَـمَائِلُ:** خـوو ، رەوشــت ، پیشە، رەفتار ، جر، بانـەك، نـەریت ، پرەنگ، کەنشت ، توورزم ، هیمی چاك، هیچاك
**شَمِيلَةٌ:** یـەك دەسته گیا کەکشـتیارو جوتیار چنگی پیا بکات
**شَـمِيمٌ:** بۆنی‌خـۆش ، بڵنـد، بـــەرز ، بڵندبوو، بەرزبوو، بالاَ بوو

## ش ن

**شَـنَّ الغَــارَةَ عَلَيــهِمْ:** گـــەمارۆیدا، ئابڵوقـــەیدا، پـــەلاماریدا ، هێرشـــی بردنەســـەر ، هەڵمـــەتی بـــۆ بـــردن ، لەهەمووڵایەکـــەوە هەڵمـــەتی کـــردە سەریان
**شَنَّ المَاءَ:** بـەجیاجیا رشـتی، لـەملاولا قلپی کردەوە، تکەتکە رشتی

**شَنُّ الهُجُوم:** پـەلاماردان، هەڵمـەت بۆ بردن، هێرش کردنە سەر

**شَنٌّ ـ شَنَّة:** مەشکەی کۆن، کۆنە مەشکە

**شَـنَائَة:** کینـەو دوژمنایـەتی یـاخود بەدرەوشتی‌و سووکی

**شَـنَار:** بـەدناوی، ئـابڕوچوون، شوورەیی، نەنگی، لەکەداریی

**شَنَاعَة:** ناشیرینی، ئێسـك قورسـی، ڕەزاگرانـی، چـارەگرانی، ناخۆشـی، سامناکی، لـەرادەدەرچوون، لەسـنوور چوونە دەرەوە

**شَـنَاق:** دەم بەسـت ، زار بەسـت، زارەوانە، دەم بێن، بەلاّمك، هەرپـەتێك شتێکی پێوە پابەندو بەستراوبێت

**شَـنَان:** ئـاوی سـارد، هـەورێك ئـاوی جیاجیای لەخۆگرتبێت

**شَنَائَة:** ئەو ئاوەی لەمەشکە یان دارێك دەتکێ‌و دێتە خوارەوە

**شَنَأَ الرَّجُل:** دوژمنایەتی کردو ڕەوشتی خراپی بەرانبەر نواند

**شَنِيَ بِـهِ:** دانـی پیانـا ، دەربڕینـی دا لەسەر حەق‌و ڕەوا

**شَـنِيّ:** نـاقۆلاّو نابـاربوو وێڕای ئـەوەی جوانیش بوو

**شَنِبَ اليَوم:** ساردی کرد، سەرما داهات

**شَنِبَ الثَّغـرُ:** ددانـەکانی سپی‌و ناسـك بوونەوە

**شَنَب:** سمێڵ، سمبێڵ، مووی سەر لـچ‌و بەرلووتی گیاندار

**شَنَبُ:** جوانی ددان‌وپاك‌و درەوشانەوەی

**شَنْبَاء:** ئەو هەنارەی دەنکەکەی تۆوی نییە

**شَنْبَة:** دەم‌و زاری پاك‌و جوان

**شَنْبَث:** شێر

**شَنْبَر:** چوارچێوە ، چارچم، کێرەشـك، چارچێوە، پەرواز

**شَنْتَر ثَوبَهُ وَنَحوه:** دڕاندی ، لـەتیکرد، لەت‌و پەتیکرد، پارچە پارچەی‌کرد

**شَـنْتَرَة ـ شَـنَاتِر:** پەنجـە ، مابـەینی پەنجەکان

**شَنْتَقَة:** ئەو تۆڕەی کـەوا پـەمووی تیا دادەنێن

**شَنِجَ:** کرژبوو، هاتەوەیەك، جەمام بوو، ڕەق بـوو، دەمـارگرتی، هاتنەوەیـەکی پێست بەهۆی گەرما یان سەرماوە

**شَنَّجَ الشَّيء:** کرژی کرد، هێنایەوە یەك

**شُنْخُب:** درێژ ، بالاّ

**شُنْخَاب:** بڕبڕەی پشت

**شُنْخُوب:** چڵەپۆی شاخ ، قوتـەی چیـاو بەرزایی

**شَنْخَم:** قەڵەو ،گۆشتن

**شَـنْذُخ:** تێکسـمڕاوی بـالاّ بـەرزی هـەڵچوو، شـێر، خواردنێکـە یـەکێك ئامـادەی دەکـات گـەر خانوویـەکی دروسـت کردبێـت یـان لـە سـەفەر گەڕابێتـەوە یـاخود شـتێکی ونبـووی دۆزیبێتەوە

**شَـنْذَارَة:** یـەکێك زۆر غیرە بکـات ، دڵ پیس ، بەد گومان

**شَـنَّرَ عَلَيـهِ:** گاڵتـەی پێکـرد، ئـابڕوی برد،شکانی، سـووکی کـرد، ناتـەواوی دەرخست‌و حەیای برد

**شَنَار:** نەنگی ، ئابڕوچوون ، شورەیی ، سووکی، ناوزڕان ، نزمی

**شَنْشَنَ القِرْطَاس أوْ الثوب الجَدِيد وَنَحْوَه:** جوولاّو سووكه دەنگێکی لێوەهات

**شَنْشَنَة:** خوو ، تەبیعەت ، داب ، پارچە گۆشتێك

**شَنَطَ اللحْم:** کەمێك برژاندی

**شَنْطَة( حَقِيبَة ):** جانتا

**شَنُعَ:** قسەی پێکوت ، ئابڕوی برد، سووکی کرد، ناوو کەسێتی زڕاند لەنێو خەڵکیدا ، جنێوی پێدا

**شَنِعَ بِه:** رقی لێی بوو، رەزای تاڵبوو لای ، بەرپەرچ و دژایەتی کرد

**شَنُعَ (كَان شَنِيعاً ):** نێسك قورس بوو، ناشیرین بوو، پیس بوو، چارەی گرانبوو، رەزای قورس بوو

**شَنُعَ الرَّجُل:** کۆشا لە رۆیشتن و پەلەکردندا، زۆر رقی لێبوو، بەتەواوی ئابڕوی برد

**شَنُعَ عَلَيه الأمْر:** بەناقۆڵاو ناشیرینی دانا،دایە دواوە، بەرپەرچی دایەوە

**شَنَعَ البَعِيرُ:** خێرا رۆیی ، تیژ چوو بەرێوە ، بەپەلەو تیژ رۆیی

**شَنِع:** نێسك قورس ، ناشیرین ، رەزاقورس، ناقۆڵا، چارەگران ، سامناك، ترسناك، تۆقێنەر، لەرادەبەدەر

**شَنْعَاء:** ئەوپەڕی ناقۆڵاو ناشیرین

**شَنْعَة ـ شَنَاعَة:** ناشیرینی ، نێسك قورسی ، چارەگرانی، ناخۆشی ، سامناکی، لەرادەبەدەربوون، لەسنوور دەرچوون

**شَنَفَ إلَيه:** بەسەرسامی و سەراسیمەوە تەماشای کرد، بەحەپەساوی بۆیڕوانی

**شَنَفَ إلَيه:** بەلایەکی چاو بۆیڕوانی

**شَنَّفَ الجَارِيَة:** گوارەی کردە گوێ

**شَنَّفَ الكَلاَم:** جوانی کرد، رازاندیەوە، دەستی پیاهێنا

**شَنَّفَ الآذان بِكَلاَمِه:** تام و چێژی پێبەخشی

**شَنْف(قُرْط):** گوارە، جۆرە خشڵێکە ژنان دەیکەنە گوێیان

**شَنِف:** دژوار، رق لێبوو، ناقۆڵا، ناشیرین، بەدو خراپ ، نەگریس

**شَنَقَ:** هەڵیواسی، خنکاندن بەهەڵواسین و لەسێدارەدان

**شَنَقَ البَعِيرُ:** بەرێشمەکەیەوە لەکاتێکدا سواری بووبوو رایکێشاو سەری بەرزکردەوە

**شَنَقَ القِرْبَة:** هەردوو سەری مەشکەکەی بەیەکەوە بەست و پاشان بەپەتێکەوە هەڵیواسی

**شَنَقَ رَأسَ الدَابَة:** سەری ئاژەڵەکەی بەکێش کرد بۆلای دارێك یان مێخێکی بەرز

**شَنِقَ الأمْر:** مۆگری بوو، عەوداڵی بوو، پێوەی لکا

**شَنَّقَ العَجِين أوْ اللحْمَ:** بڕی ، لەت لەتیکرد، پارچە پارچەی کرد

**شَنَق:** پەت ، داروپەردوو، درێژی سەر، خوێنبایی، سزای خوێنڕشتن

**شُنْقُب ـ شُنْقَاب:** قوڕاویلکە ، قوڕاویلە ، باڵندەیەکە وەك (بۆرەجرە) وایە بەلام ئەو گەورەترەو قاچیشی درێژترە

**شَنْكَل:** ئەڵقە رێز ، زنجیرێکی کورتە دەرگای پێدادەخرێ و کەبتەوێ لەدەرگای حەوشە بدەی لەئەڵقە رێزەکە دەدەیت

**شَكْلُ التَّعْلِيق:** قولاپی قەسابی کەوا گۆشتی پیا هەڵدەواسرێ

**شَنَقَ الحِمَارُ:** زەڕە زەڕی گوێدرێژ ، زەڕی

**شُنُوع:** ناقۆڵایی ، ناشیرینی، بەدی، خراپی

**شَنَب:** سپێتیو بریقەی ددان

**شُئُون:** لەڕ، لاواز، قەڵەو، خڕپن ، گۆشتن ، خەپەتۆڵە (لەوشەدژە یەکەکانە)

**شَنِيع:** ناشیرین، ئێسك قورس، رەزا قورس ، چارەگران

**شَنِين:** تنۆکە ئاوو فرمێسك، چکانو هاتنە خوارەوەی هەر شتێك، شیرێك کەوا ئاوی ساردی تێکەڵ بکرێ

**ش هـ**

**شَهَا (رَغِبَ فِي):** ئارەزووی کرد، دڵی پیاچوو، حەزی لێکرد، بەپەرۆش بوو بۆی

**شَهَا الشَيء:** حەزی لێکرد، دڵی پیاچوو

**شَهِيَ الرَّجُل:** وەهای لێکرد حەزی لێ بکات

**شَهَى عَلَيهِ كَذَا:** پێشنیاری بۆ کرد ، پێشنیاریکرد، رایەکی خستە بەردەمی

**شَهَاء:** پڕئارەزوو، پڕ شەهوەت حەزدار

**شِهَاب:** بڵێسە ، کڵپە، پزیسك، هەسارە، ئەستێرە، ئەستێرەی کلکدار، فیشەکەشێتە

**شَهَادَة:** دان پیانان، گەواهی ، بەڵگە ، قەواڵە، شاهیدی ، بڕوانامە

**شَهَادَةٌ مَكْتُوبَةٌ:** گەواهنامە، بڕوانامە ، بەڵگە نامە

**شَهَادَةُ حُسْنُ السُّلُوك وَالسِّيرَة:** بڕوانامەی رەوشت باشی

**شَهَادَةٌ بَاطِلَة:** گەواهیدانی بەتاڵو پووچ، شایەتی دان بەناحەقو درۆ

**شَهَامَة:** جوامێری، دلاوەریی، پیاوەتی، لێهاتوویی، فریاکەوتن، ژیری، هۆشیاری، زیرەکی

**شَهَبَ الحَرُّ أَوْ البَرد:** گەرما یان سەرما رەنگی گۆڕی، رەنگی تێکدا

**شَهَبٌ ـ شُهْبَة:** دێزی ، خۆڵەمێشی، ماشو برنج

**شَهَب:** رەنگی دێزو خۆڵەمێش بوو

**شُهُب:** سێ شەوی مانگی کۆچییە کەبەشەوە سپیو بێگەردەکان ئاوزەد دەکرێت ئەو شەوانەش (13 ، 14، 15)ی مانگە ، هەسارە رۆشنەکان

**شُهْب:** چڵەپۆی شاخ کاتێ بەفری پێوە بێت ، قوتەی چیا کەبەفر گرتبێتی ، تەپکەی شاخو چیا بەفری بەسەرەوە بێت

**شُهْب:** رەنگی خۆڵەمێشی ، دێزی

**شَهْبَاء:** نازناوی شاری (حەڵەب)ە

**شَهْبَاءُ مِنَ الكَتَائِب:** مەزن ، گەورە ، چەكو جبەخانەی زۆرو فرە

**شَهِدَ المَجْلِس:** ئامادەی کۆڕەکە بوو، حازربوو، هاتە روو

**شَهِدَ الشَيء:** دیاریکرد، دەستنیشانی کرد، ئامازەی پێکرد، بینی ، زاڵبوو بەسەریا ، پیاروانی، تێی گەیی

**شَهِدَ الجُمْعَةَ:** پێی گەیی ، ئامادەبوو، بینی ، چوو بۆی

**شَهِدَ عَلَى كَذَا:** بەدڵنیاییەوە پێی راگەیاند، بەوپەڕی متمانەوە پێی گوت

**شَهِدَ لِفُلاَن:** گەواهی بۆ دا، شایەتی بۆدا
**شَهِدَ لَهُ بِكَذَا (أَقَرَّهُ):** بۆی سەلماند، دانی پیانا
**شَهِدَ بِكَذَا:** سوێندی خوارد
**شَهِدَ عَلَى فُلاَن:** گەواهی لێدا ، شایەتی لێدا
**شُهْدٌ - شَهْدٌ:** هەنگوینی نەپاڵێوراو
**شَهَرَ - شَهَّرَ:** بەناوبانگی کرد، ناوی بۆ دەرکرد، بڵاوی کردەوە، جاڕیدا، رایگەیاند، ناساندی، ئاشکرای کرد
**شَهَرَ الحَرْبَ:** جەنگی هەڵگیرساند، شەڕی نایەوە
**شَهَرَ السَّيفَ:** شمشێری دەرهێنا لەکێلان ، شمشێری بەرزکردەوە
**شَهَرَ الخَنْجَر:** خەنجەری هەڵکێشا خەنجەری لەکالان دەرهێنا
**شَهَرَ المُسَدَّس:** بەلاماری دەمانچەی لێدا، دەمانچەی لێدەرهێنا ، دەمانچەی لێدەرکێشا
**شَهَّرَ بِهِ:** چەپڵەی لێکوتا ، جاڕی لێدا ، ناوبانگی زڕاند، قسەی شوێنخست، ناوی زڕاند
**شَهْر:** مانگ، هەیف، هەیوبی، مانگی سی رۆژ، مۆنگ، هەفی ، زانا ، دانا
**شُهْرَة:** ناوبانگ، ناو، ناسین، ئاشکراکردن، رسوایی، شوورەیی، دەرکەوتنی شتێك
**شُهْرَةٌ لَدَى الجُمْهُور:** ناوبانگ پەیداکردن لای بینەران ، ناسین لەلای خەڵکی
**شَهْرِيًّا:** مانگانە، موچەیەك مانگەو مانگ بدرێ، کرێیەك مانگانە بدرێت بەخاوەنەکەی

**شَهَقَ - شَهِقَ الحِمَار:** زەڕی ، زەڕینی گوێدرێژ
**شَهَقَ الرَّجُل:** گریان لەسینەیدا هاتو چوو، هەنسکیدا
**شَهَقَ الجَبَلُ (إِرْتَفَعَ):** بەرزبوو، بڵندبوو، پایان بوو، بالآبوو
**شَهْقَة:** جارێك، هاوارێك، دەنگێك لەیەکێکەوە بێت ، فریاد، هاوار
**شَهِلَ اللونُ - شَهَلاً:** تێکەڵ بەیەك بوون، ئاوێتە بوون
**شَهِلَ فُلاَنٌ:** رەشی چاوی زەردی تێکەڵبوو
**شَهَّلَ ثَوبَهُ:** بەرزی کردەوە، هەڵیکێشا، چاکی لێکرد بەلادا، کورتی کردەوە
**شَهَّلَ فِي عَمَلِه:** پەلەیکرد، بەهەڵمەتبوو
**شَهِل:** چابوك، بەهەڵمەت ، بەدەستو برد، گورج و گۆڵ
**شَهْلاَء:** چاوشین ، چاوی شین
**شَهْلَة:** پیر ، ژنێك زۆر ژیرو عاقڵ نەبێت
**شَهَمَ:** قەدەغەی کرد، دەوری کرد، یاساغی خستە سەر
**شَهُمَ:** مەرد بوو، پیاوبوو، دلاوەرو جوامێر بوو
**شَهْم:** ژیر ، هوشیار، زیرەك، جوامێر، مەرد، دلێر، دلاوەر، خانەدان ، نەبەز، بەهەڵمەت ، فریاد
**شَهَقَ الحِمَارُ:** زەڕی ، دەنگی لێبەرز بوەوە
**شَهُوَ الطَّعَام:** بەتام و لەزەت بوو، بەچێژو خۆش بوو، ئارەزووکردنی شتێك بەزۆریی
**شَهْوَان:** حەزکردن لەشتێك

**شَهْوَانِيٌّ:** چلێس ،بەئارەزوو، زۆرپەڕ ، هێزی نەفسی کەحەزو ئارەزووی شتێك بکات

**شَهْوَةٌ:** ئارەزوو، دڵ بردن ، دڵ چوونەسەر ، داخوازی ، پەروش بوون، ئامەزرۆیی

**شَهْوَةٌ جِنْسِيَةٌ:** ئارەزووی سێکسی ، ئارەزووی پەڕین

**شَهْوَةٌ جِنْسِيَةٌ لِلحَيْوَانِ:** شەڕەن ، هاتنە فاڵ ، هاتنە با

**شَهِيٌّ:** خۆش ، بەلەزەت ، بەتام، بەچێژ ، ئارەزوو بەخش، حەز جوڵێن

**شَهْيَةٌ:** ئارەزووی خواردن، حەزکردن لەخواردن ، دڵکەرەوە، دڵ بردن، دڵ چوونە سەر

**شَهِيدٌ:** شەهید، ئامادە ، حازر، گیانبەخش ، گەواه ، ئەوەی لەپێناوی بەرنامەو دەستووری خوادا دەکوژرێت

**شَهِيرٌ:** ناسراو، بەناوبانگ، ناودار، هەڵکەوتوو، بڵند ئاواز، رسوا، خراپ، بەدناو، بێئابڕو ، ناو زڕاوو خراپ

**شَهِيقٌ:** هەناسە وەرگرتن

**شَهِيقُ الحِمَارِ:** زەڕین ، زەڕە، زەڕەزەڕ

**شو**

**شَوَى اللحْمَ:** گۆشتەکەی برژاند ، برژاندی

**شَوَى المَاءَ:** ئاوەکەی گەرم کرد

**شَوَى القَوْمَ:** گۆشتی برژاوی دەرخوارددان

**شَوَى:** پۆخڵەواتی ماڵو دارایی ، کاروباری سووكو ئاسان ، هەر دوو دەستو قاچو ئەملاولا، هەندێك لەهەر شتێك

**شَوَاء ـ شُوَاء:** ئەوەی دەبرژێنرێت لە گۆشت

**شَوَّاء:** ئەوەی هەڵدەستێت بەبرژاندنی گۆشت ، برژێنەری گۆشت

**شِوَاء:** برژاو ، بریان ، بریانی، بردران ، گۆشتکردنە بریانی لەناو سکی مریشك یا بەرخ بئاخنریو لەرۆندا سووربکرێتەوە

**شِوَاءَة ـ شُوَاءَة ـ شَوَاة:** پارچە گۆشتێکی برژاو، کوتە گۆشتێکی برژاو

**شَوَائِبُ:** خەوشو گەردو ناتەواویو پیسیو گەندەڵی ، بەدبەختی ، نارەحەتی ، ناخۆشی ، مەرگەسات

**شَوَايَةٌ:** کەمێك لەبەشێکی زۆر وەك پارچە گۆشتێك لەبەرخ یان مەڕ یاخود هەر ئاژەڵێکی سەربڕاو، ئەملاولاکانی ئاژەڵێکی سەربڕاو ، هەندێك لەهەر شتێك

**شَوَّايَةٌ:** برژێن ، ئامێری گۆشت برژێن

**شَوَاجِرُ:** رێگرەکان ، کۆسپەکان ، گرفتەکان ، ئاستەنگەکان ، سەختی رۆژگار

**شَوَاحِجُ:** ئەملاولای کلۆتو سمت

**شَوَاحِطُ الأَودِيَةِ:** دۆڵی دوور لەیەك ، دوورە دۆڵ

**شَوَار ـ شِوَار ـ شُوَار:** کەلو پەلی ناوماڵ ، شتو مەکی نێوماڵ ، جوانی ، دیمەن ، رواڵەت ، روخسار

**شَوَارِدُ اللُغَةِ:** وشەو رستەی ناوازەو دەگمەن ، دانسقە ، شاز

**شَوَارِعُ مِنَ النُجُومِ:** ئەستێرەی نزیك بە ئاوابوون ، ئەو ئەستێرانەی نزیکن ئاوا ببن

**شَـوَاش:** پاشـــاگەردانی، پێکـــدادان ، ئاڵۆزی، پشێوی

**شَوَاظ ـ شِـوَاظ:** بڵێسە ، بڵێسـەی بـێ دوکەڵ ، گەرماو تینی ئاگر یـان خـۆر ، هـاوارکردن، نـەڕاندن، قسە پێگوتـن ، ئەوپەڕی تاوسـەندنو کوڵانـدن، بـانگو فریاد

**شَوَاف:** چاوتیژ ، چاو روونـی، کەسێکە چاوی زۆر هەنا بکات

**شَوَاكِل:** ئەو تولەرێیانەی لەرێگەیـەکی مەزن بوونەتەوە، رێگای گوشادو بەرین

**شَوَال:** جەوالْ ، جووالْ، چاتمـە، سـاك، کـووزە، لەتـەلیس گـەورەترەو لەبـەنو مـوو دروســـتدەکرێبۆ گواســـتنەوەی دانەوێڵە

**شَـوَّال:** شەشـــەلان ، شـەوال، مـانگی دەیـەمی کۆچییـەو لـەدوای مـــانگی رەمەزان دێت

**شَـوَان:** عــەنباری خەڵـە، گەنجینـــەی خەڵەو خەرمان

**شَوَّبَ عَنْهُ:** بەرگری لێکرد، پارێزگـاری لێکرد

**شَوْب:** تێکەڵ ، ئەوەی تێکـەڵو ئاوێتـە دەکرێ لەگەڵ شتی ترا ، هەنگوین

**شَوْب (عِنْـدَ العَامَـةِ):** گـەرمی ، تـاو ، گڕە

**شَـــوْبَة:** جـــارێك ، هەڵخەڵـــەتاندن، فریودان، فێڵو تەڵەکە

**شَوبَق ـ شَـوَابِق:** تــیرۆك ، ئـەو دارەی نانی پێدەکرێت بەر لەوەی ببرژێنرێت

**شَوبَك ـ شَـــوَابِك:** تــیرۆك ، تــیرك، تیرەنـــان، نێرەمـــان ، دارێکـــی خـــڕو درێژەو لەقامك ئەستورترەو ئـەنگوتکی هەویری پێ پاندەکرێتەوە

**شَوَّحَ الشَّيءِ:** بەرپەرچی دایـەوە، دانـی پیا نەنا

**شَوَّحَ اللحم:** برژاندیو کردی بەبریانی

**شَـــوْحَة:** لێخوڕینـــی رەوگـــە وشـــتر بەسرودەوە

**شَوْذَر:** چادر، سینە بەند

**شَـوَّرَ:** رایگـەیاند ، ئامـاژەی پێکـرد، بەنجەی بۆ درێژ کرد، دیاریکرد

**شَوَّرَ إِلَيهِ:** ئاماژەی بۆ کرد، دەستی بۆ درێژ کرد

**شَوَّرَ بِالنَّار:** بەرزی کردەوە، بڵندیکرد

**شَـــوَّرَ فُلاَنـــاً:** تـــەریقی کـــردەوە، خەجاڵەتیکرد

**شَـوَّرَ الثَّـوبَ وَنَحْـوَهُ:** بۆیـەی کـــرد، رەنگیکرد

**شَـــوَّرَ عَلَيـــهِ:** ئامۆژگـــاری کـــرد، مۆچیاریکرد، هات بەسەریا

**شَور:** راوێژ ، هەنگوین ، شێوەی جلو بەرگ

**شُورَى:** راوێژ ، را ، راوێژکردن، تەگبیر، مشـوور، لێکدانـەوەی ئـەنجامی کـارێك لەگەڵ یەکێك

**شُوُرْبَة:** شۆربا ، مـەدفین ، مـەردوون ، فـرد ، ئـاڤدوونك، شـــۆربە ، شـلـەیەکە لەبرنجو رۆنو ئاو دروست دەکرێت

**شُورَة:** کورەی هەنگ، پورە هەنگ

**شُورَة:** جارێك لـەجاران ، شـــوورەیی ، شەرمەندەیی، هەنگوین

**شُورِي (إستشَارِي):** راوێژکار، راوێژکاری

**شَـوِس:** بەتیلـەی چاو تەماشای کـردو خۆبەزلزانینی پیادەرکەوت ، بـەزاتبوو، ئازابوو

**شَوس:** سیواك كردن ، دوورو درێژ
**شَوَّشَ بَینَهُم:** نێوانی تێكدان ، مابەینی شێواندن
**شَوَّشَ الأمرَ:** تێكیدا ، ئالۆزی كرد، چەواشەی كرد، شڵەژانی، شپرزەی كرد
**شَوَّشَهُ:** ئاڵۆزو تێكەڵی كرد
**شَوَّطَ:** سەفەرەكەی زۆری خایاند، درێژ بووەوە ، گەشتەكەی زۆری پێچوو
**شَوَّطَ القِدرَ:** گەرمی كرد، كوڵاندی
**شَوَّطَ اللَحمَ:** پێی گەیاند، كوڵاندی
**شَوَّطَ الصَقیعُ النَبَاتَ:** سوتاندی ، بردی، تیایبرد
**شَوط:** مەبەست ، ئامانج، یەكجار روو بە مەبەست رۆیشتن ، ماوە، كاتێكی دیاریكراو
**شَوطَ فِي المُبَارَاة أو الحَلبَة:** كایە ، خول ، كاتێكی دیاریكراو لە گەمەو یارییەكدا
**شَوَّفَ الجَارِیَةَ:** جوانی كرد، رازاندیەوە، ئارایشتی دایا
**شَوف:** ماڵەی بەنا ، زەوی سافكەر، ئامێرێكە زەوی پێ تەختو ساف دەكرێت
**شُوفَان(هَرطَمَان):** جۆداس ، گارس ، خرپۆك، قەلاس، قومام ، گیایەكی كێوی زبرە وەك جۆ وایە بەلام شیرەی كەمەو گوڵەكەی دان ناگرێ ، برژانگی گوڵەكانی لەچاوی ئاژەڵ یا ولاخ بدات برینداری دەكاتو تا ماوەیەك ئاوی پیا دێتە خوارەوە
**شَوَّقَ إلَیهِ:** ئارەزوو مەندی كرد، ئامەزرۆی كرد، شەیدای كرد

**شَوَّقَ إلَی:** سەرنجی راكێشا ، خستیە دڵیەوە
**شَوق(رَغبَة - حَنِین):** ئارەزوو، بیركردن، حەزكردن، سەربۆ خوران، ئامەزرۆیی، شەیداو ئالوودەبوون
**شَوَّكَ الشَجَر:** دڕكاوی بوو، دڕكی دەركرد، چقڵی دەردا
**شَوَّكَ الحَائط:** دڕكی پیاچەقاند، دڕكاوی كرد، دڕكەزێی بۆ دانا
**شَوَّكَ الفَرخُ:** سەری پەڕەكانی بەدەركەوتن ، سەریان دەرهێنا ، هەڵیاندا
**شَوَّكَ شَارِبُ الغُلام:** دەست لێدانی رەقو زبر بوو
**شَوَّكَ الرَأسُ بَعدَ الحَلقِ:** قژەكەی دوای تاشینی سەرلەنوێ سەری دەرهێنایەوە، هاتەوە، هەڵیدایەوە
**شَوك:** دڕك ، چقڵ ، دڕوو ، شتێكی باریكو سەر تیژە لەدرەختو گژوگیا پەیدا دەبێ لەلەشو كەڵو پەل هەڵدەچەقێ
**شَوكُ الشَام(نَبَاتٌ شَائك):** زریشك ، روەكێكی چڕو بەیەكا هەڵچووە
**شَوكَاء:** شوێنێك دڕكی زۆر بێت ، رەقو زبر
**شَوكَة:** دڕك ، چقڵ، نوكەلق ، تیژ ، لێهاتوویی
**شَوكَةُ الإبَل:** چەتاڵ ، چنگاڵ، چنگاڵی ئاسن كەوا نانو میوەی پێدەخورێ
**شَوكَةُ السَمَك (حَسكَة):** دڕكی ماسی ، دڕكە ماسی
**شَوكَةُ العَقرَب:** چزو ، چزوی دووپشك

**شــوكَرَان:** گیایەکــە لەســەر تــەرزو شێوەی رووەکە
**شَوَلَ اللبَنَ أو المَاء:** کەمیکرد، کەمبوو، دابەزی ، هاتە خوار لەئاستی پێشووی
**شَوَلَ الـنُـوقُ:** شـیرەکەی وشـکی کـرد، شیری تیا نەما
**شَـوَلَ فـي المَـزَادَة:** ئــەو ئـاوەی تیـای مابوەوە کەمیکرد، دابەزی
**شَولَ:** چابووك ، خێرا ، بەدەســتوبرد، بەهەڵمەت ، دەست سووك
**شَـوْلَة** جـارێك ، ئـەو چـزوەی دووپشـك بــەرزی دەکاتـــەوە، نیشـــانەیەکی رێنووسە کەئاماژە بەوەستان دەکـاتو بەهەڵوێست یان پشوو ناودەبرێتو بەم چەشـنەش دەنوسـرێت(،) ، یەکێکـە لەپلەوپایەکانی مانگ
**شَوْنَة:** ژنی نەزانو نادان
**شَـوُنَة:** عــەنباری خەڵــە ، کەشـتیەك ئامادەی جەنگو شەڕ ببێت
**شَوَنْدَر ـ شَمَنْدَر:** چەوەنەر، چەوەندەر، سلك
**شُـونِيز( الحَبَـةُ السَـوداء ):** رەشـکە ، بــەری گیایەکــە وەك گـــەنمی ورد وایــە بەڵام رەشەو بەســەر کولـێرەو نانیـەوە دەکەنو زۆر بەسوودە بۆ مرۆڤ
**شَــوِهَ الوَجْــه:** روخســـاری تێکچــوو، ناشیرین بوو
**شَوِهَ العُنُقُ:** درێژبوو، باڵابوو، کورت بوو (لەوشە دژەیەکەکانە)
**شَــوَّهَ اللهُ وَجْهَــهُ:** پــەروەردگار رووی ناقۆڵاو ناشیرین کرد، نابووتی کرد
**شَوَه:** ناشیرینی، شێواوی ، ناقۆڵایی ، نابووتی ، درێژی گەردن ، سەربڵندی

**شَوْهَاء:** ژنـی رووگـرژ ، رووناشــیرین ، نــاقۆڵا ، شــووم ، نــابووت ، جــۆرە ئەسپێکە بۆ دوور دەڕوانێت
**شُوْهَة:** دووریی ، ناشـیرین ، نـابووت ، ناقۆڵا
**شَوِيّ:** برژاو ، ئەو گۆشتەی دەبرژێنرێت
**شُوَيهَة:** مەڕێکی بچووك

**ش ي**

**شِـيَـاط:** بۆسـۆ ، بۆکـروز ، بۆنســۆ ، بووشمین، بێسوو، بۆنی پەڕۆی سووتاو
**شِيَاع:** چاوگە ، ئـەوەی ئاگری تێبـەر دەبێت ، جوزەلەی شـوان یـان دەنگی گۆرانیو هۆرەی خۆی
**شِـيَاف:** دەرمــانی چــاو ، مــالینوس، مالوێنچە، مالۆچــە، گیایەکــە بۆســك چواندن زۆرباشە، لاوەلاوەی کێوییە
**شَيَّال:** کۆڵکێش ، کۆڵ هەڵگر، حەماڵ
**شِـيَالَة:** پیشـــەو کـــاری حـــەماڵی ، کۆڵکێشی
**شَيء:** شت ، کار ، فرمان ، پێویستی ، شــتو مــەك، ئــەوەی دەگونجێـــت باسبکرێ
**شَيءٌ مَا:** فرمانێك ، شتێك ، کارێك
**شَيئاً فَشَيئاً:** لەسـەرخۆ ، کـەم کـەم ، وردە وردە، تۆزە تـۆزە ، بەهێواشـی ، بەشێنەیی
**شِيئَة:** ویست ، خواست ، خواز، ئیرادە
**شَيَّأَهُ:** پێی کرد، ناچاری کرد
**شَـيَّبَ الحُـزْنَ فُلانَـــاً وَبِفُـلاَن:** خـــەمو خەفـەت پـیری کـردن ، ســـەری ســپی کردن
**شَيَّبَ:** سەری سپی بوو

**شَيب ـ مَشِيب:** پیر بوون ، سەرسپی بوون، بەساڵاچوون ، کەوتنە تەمەنەوە
**شَيبْ:** ئەو شاخانەی بەفر سپی کردون، چیاو شاخی داپۆشراو بەبەفر ، دەنگی وشتر لەکاتی ئاو خواردنا
**شَيبَاء:** شەوی کۆتایی مانگ
**شَيبَان:** ئەو رۆژەی ساردو سەرمایەو بەفرو تەمو مژە
**شِيبَان:** بەمانگی کانونی یەکەم (بەفرانبار) دەگوترێت چونکە زەوی بە بەفرو بەستەڵەك داپۆشراوە
**شِيبَة:** روەکێکە بەئەسفەنتین بەناوبانگە
**شِيَة:** نیشان ، نیشانە، خاڵ، ناتەواوی، کەمو کوڕی
**شِيح:** روەکێکە زۆر جۆری هەیە هەمووشیان بۆنیان خۆشە
**شَيَّحَ:** ئاگادار، وشیار ، ئاليشك ، ئاگاداریکرد، وشیاری کرد، بێداریکرد، وریای کردەوە
**شَيخ:** پیر ، بەساڵاچوو، سەرگەورە ، سەرۆك، کوێخا ، دەم راست ، دەم سپی ، کەڵەپیاو، خاوەن راو دانایی‌و ژیری ، زاناو شارەزا، سەرۆکی هۆزو تیرە
**شَيَّخَ:** شێخ ، بەنازناوی شێخەوە بانگیکرد
**شَيخُ النَّار:** نازناوی شەیتانی نەفرەت لێکراوە
**شَيخَة:** پیرێژن ، بەساڵاچوو، ژنی بەتەمەن
**شَيخُوخَة:** پیرێتی ، بەساڵاچوون
**شَيخَهُ:** گەوەری کرد، رێزی لێنا ، کردی بەسەروەرو سەردار
**شَيَّدَ البِنَاء:** دروستی کرد، بەرزی کردەوە، هەڵی سان ، دایمەزران ، بەردی بناغەی بۆ دانا
**شَيَّدَ الحَائط:** سواخیدا
**شَيَّدَ جِلدَهُ بَالطيب:** هەنوی کرد، چەوری کرد ، شێلای پێیی
**شِيد:** سواخ ، تەراو ، لەبخ ، پیاهەڵسوون ، ئەوەی دیواری پێ سواخ‌و روپۆش دەکرێت لەگەچ‌و چیمەنتۆو ...
**شِيرَج:** رۆنی کونجی
**شِيش:**شیشی نوك تیژ، شیشی ئاسن، شیشی گۆشت برژاندن
**شِيشَة:** شووشەی نێرگەلە
**شَيَّطَ الصَقِيعُ النَبْت:** سووتانی، هەڵی پروکان
**شَيَّطَ الدَّوَاء الجَرح:** کزانیەوە ، هەڵیپەراند، سووتانی
**شَيَّطَ الرَأس وَالكَرَاع:** هەڵی کروزان بۆ ئەوەی تووك‌و موەکەی لێبێتەوە
**شَيْطان ـ شَيَاطِين:** شەیتان ، ئەهریمەن، یەکێکە لەجنۆکەکان‌و لەفەرمانی خوایی یاخی بوو خۆی خستە بەر نەفرەت‌و خەشمی خوداوەندو ئەویش بۆ هەتا هەتایە دژایەتی بۆ ئەوەی ئادەم راگەیاند، هێزی شەڕ، ئەو هێزە نادیارەی مرۆڤ هاندەدات بۆ شەڕو خراپەو ئاژاوەو پشێوی نانەوە لەسەر روپای زەویدا

**شَيطَنَ ـ شَيطَنَة:** نافەرمانی کرد، یاخیبوو، سەرکەشیو بێگوێیی نواند، شەیتانی بوون ، پەڕینو ڕەحەت بوون لەخەوا

**شَيَّعَ:** بەڕێیکرد، خواحافیزی لێکرد، ناردی ، ڕەوانەی کرد

**شَيَّعَ الرَّجُلَ:** هانیدا ، دنەیدا ، پاڵی پێوەنا ، بەهێزیکرد ، ویستو خوازی پێدا

**شَيَّعَ النَّارُ:** ئاگرەکەی خۆشکرد، تاوی پێسەند، داری دا بەدەمیەوەو ئاگرەکەی خۆشکرد

**شَيَّعَ الشَّيءِ بِالنَّار:** شتێکی بەئاگر سووتاند، ئاگری تێبەردا

**شَيَّعَ الرَّجُلَ:** شوێنی کەوت ، دوایکەوت، بانگەشەی مەزهەبی شیعەی کرد

**شَيَّعَ الزَّامِر:** فوی کرد بەجوزەلەو شمشاڵەکەیدا

**شَيَّعَ فُلَانَاً نَفسَهُ عَلَى كَذَا:** نەفسو دەروونی لەسەر ڕاهێناو ئارەزووی کرد بەبەرا

**شِيع:** ئەندازە ، وەك، بەچەشنی ، ئەوەندەی

**شَيْع:** شوێنکەوتە ، هاوبەش ، پەیڕەو، هاوڕێباز

**شِيعَة (طَائِفَة ـ فِرقَة):** دەستەیەکی ڕێککەوتوو، هاوڕێبازان، گرۆیەکە لەموسوڵمانان جەمو کۆبوون لەسەر خۆشەویستی حەزرەتی عەلی (ڕەزای خوای لێبێت)و پێشەوایەتیان بۆ ئەو بەڕەواو شیاو دادەنا

**شِيعَةُ الرَّجُلِ:** شوێنکەوتوانو لایەنگرانی، پەیڕەوانی ، یارانی، دەستو پێوەند، دەستەو دایەرە

**شِيعِيٌ (طَائِفِيٌ):** ڕەگەخواز، ڕێبازخواز، ڕەگەزپەرست، شیعی، ئەوانەی حەزرەتی عەلی(ڕەزای خوای لێبێت) بەخاوەن ماف دەزانن بۆ پێشەوایەتی موسوڵمانان

**شَيَّفَ الجَارِيَة:** ڕازاندیەوە، جوانیکرد، ئارایشتی دایا

**شِيفَة ـ شِيفَان:** پێشەنگی کۆمەڵ کەوا سەرپەرشتی جموجووڵی دوژمن دەکەن

**شَيِّق:** تامەزرۆ ، ئارەزوومەند، بیرمەند، ئالوودە ، شەیدا، عەودال

**شِيق:** لوتکەی شاخ ، سەخترین لوتکەو لا ، لایەکی تەنكو تەنگەبەر بەسەر شاخەوە، مووی کلکی ئاژەڵ ، جۆرە ماسیەکە

**شِيقَة:** جۆرە ماسیەکە

**شِيك:** چەك، چەکی دراو، فەرمانێکە لەڕێگەی پسووڵەیەکەوە لەلایەن یەکێکەوە کەپارەی هەبێت لەبانقێك دەدرێت بەو بانقەو تێدا بڕی پارە دیاری دەکات بۆیان هەتا بیدەن بەکەسی ناوبراو یان ئەوەی پسووڵەکە دەبات بۆ بانق

**شِيك:** قۆز ، جوان ، ڕێكو پێك ، سەرنج ڕاکێش

**شِيكَرَان ـ شِيكُرَان:** گیایەکە لەسەر شێوەی ڕوەکە

**شَيلَة:** بەردێکی قورس یان پارچە نانێکە دادەنرێت هەتا تواناو هێزی کەسێکی پێ دیاری بکرێت بەهۆی بەرزکردنەوەی لەرووی زەوی

**شَيَمَ فِي الشَيء أو الأمر:** چوە ناوی ، پێی نایە نێوی ، داغڵ بوو پێی

**شَيَمَ يَدَيهِ فِي رَأسِ فُلان أوْ ثَوبِهِ:** دەستی وند کرد لەسەری یەکێك یان جلو بەرگەکەیو جەنگا لەگەڵیدا

**شَيَمُ:** زەوییەك هەر بەرەقی بمێنێتەوە بێئەوەی چاڵو هەڵکەندنی تیا بکرێت

**شِيمَة ـ شِئمَة:** خووو، نەریت ، رەوشت، ئابروو، سروشت

**شَيمَل:** باکوور

**شَيْن:** پیتی شینی نووسی (نووسی (شین)

**شَيْن:** نەنگی ، ئابروو چوون، سووکی، رسوایی، شورەیی، ناوزڕان ، خراپ

**شَيْن:** بێبرەو ، بێبایەخ ، ناوزڕاو ، بەد رەوشت ، سووك ، رسوا

**شِينيز ـ شُونِيز:** رەشکە

**شُيُوع:** بلاوبوونەوە ، ئاشکرابوون ، راگەیاندن، ئەوەی ئاگری تێبەر دەبێت، داکەوتن، قاو داخستن

**شُيُوعِيّ:** شیوعی ، کۆمۆنیستی ، هەڵگرانی بیروباوەڕی کۆمۆنیستی

**شُيُوعِيَّة:** کۆمۆنیستی ، تیۆرێکە لەسەر بنەمایەکی ماددی رەها دامەزراوەو سەرمایە بەچەقی گشت گۆڕانکارییەك دادەنێت لەرەو رەوی ژیانی مرۆڤایەتیدا

**شَيُوهُ:** چاوپیس ، ئەوەی چاو دەکات بە هەر گیاندارێکەوەو زیانی پێدەگەیەنێت


شَنْطَة (جانتا)


شَمْسِيَة (چەتر)


شَجَر (دار)


شَبُوط (سووره ماسی)


شَحَاطَة (پاپووچ)


شَقَّة (تەلارە بینا)


شِرَاع (کەشتی بایی)



**شرفة** (بەلەكۆن - پێش هەیوان)



**شعر إصطناعي**

(قژی دەستكرد)



**شجيرة** (دەوەن)



**شطة**

(بیبەری سوور)



**شمعدان** (مۆمدان)



**شاكوش**

(چەكوش)



**شوكة الاكل**

(چنگاڵ - چەتاڵ)



**شموع مختلفة**

(چەند جۆرە مۆمێكی هەمە چەشن)



شادِن ( بەچکە ئاسک )



شَنبَث ( شێر )



شَمْوَاء ( بزنە کێوی )



شَحَاج
(گوێدرێژی کێوی ـ کەرە
کێوی )



شاحِنَة (لۆری ـ ترێلە)



شَخْتور ـ شَخْتورَة (گچکە کەشتی )



شُبَاك (پەنجەرە )

# ١٤ حرف الصَاد

# ص

**ص**

**ص:** چواردەیەم پیتی زمانی عەرەبیە

**ص آ - ص أ**

**صَائِب:** راست ، گونجاو ، شیاو، لەبار، دروست ، ئاگادار، پڕ بەپڕ، پێکەر، تیر ئەنداز، دەست راست

**صَائِح:** هاوارکردن،هاواری فریاکەوتن، دەنگی فریا گوزاری

**صَائِحَة:** دەنگو هاواری گریان ، شیوەنو زاریی

**صَائِد:** راوچی، نێچیرەوان ، شکارچی، کەسێك لەهونەری راوا کارامەو شارەزا بێتو راو بکات

**صَائِغ:** زەڕەنگەر، زێرینگەر، زەڕگەر، زێڕکاری کردن، ئاڵتوونچێتی، کەسێکە زێڕکاری بکات

**صَائِف:** گەرم ، تاودار، بەتاو، بەتین ، گەرمو گوڕ

**صَائِفَة:** کاتی هاوین ، جەنگو شەڕ لەهاویندا، سەرەتاو دەستپێکی هاوین

**صَائِم:** رۆژوەوان ، ئەوەی خۆی دەگرێتەوە لەخواردنو خواردنەوەو ئەو شتانەی رۆژو بەتاڵ دەکەنەوە

**صَائِمَةٌ مِنَ السَكَاكِين:** چەقۆی کول، چەقۆیەك تیژ نەبێت

**صَائِمَةٌ مِنَ الخَيلِ:** ئەسپی بێ ئاخوڕ

**صَائِمَةٌ مِنَ الكُرَاتِ:** ئەو تۆپانەی ناسووڕێنەوە، چەرخی وەستاوو بێ بزاوتو ئاگر

**صَابَ (لَمْ يُخْطِيءِ):** پێکای ، لێیدا، شکاندی، هەڵەی نەکرد

**صَابَ المَطَر:** بەلێزمە باریی، دایکرد، هاتە خوارەوە

**صَابَ الشَّيءُ:** لەسەرەوە دابەزی، لەرووی سەرەوە هاتە خوارەوە

**صَابَ المَاءُ:** ئاوی رشت ، قلْپی کردەوە

**صَابَ السَمَاءُ الأَرْضَ:** بارانی هێنا

**صَابَ السَهْمُ نَحْوَ الرَمِيَةِ:** رووەو مەبەست چوو ، پێکای ، لێیدا

**صَابَ بِالعَيْنِ:** کردی بەچاوەوە، چاوی پێوە کرد

**صَابَ المَطَرُ الأَرْضَ:** باران زەوی تەڕکرد، تەڕیکرد

**صَابَ بِهِ:** کەوت ، هەڵەنگوت، پێی ترازا ، خلیسکا

**صَاب:** درەختێکی تاڵە، تاڵە درەخت

**صَابَة:** بەلا ، نەهامەتی، کزیی و لاوازیی عەقڵ و ژیری

**صَابَرَ - صِبَاراً وَمُصَابَرَةً:** لەئارام گرتندا بۆی دایەوە، لەوبە ئارامتر بوو

**صَابِر:** بەئارام ، لەسەرخۆ، شێنەیی، بەسەبر، بەحەوسەڵە، بەپشوو، هێمنو لەسەرخۆ

**صَابِغ:** بۆیەچی، خوم خانەچی، بۆیاخچی ، نارناوی (یوحەنا)ی مەعمەرانە

**صَابُورَة**: ئەوەی دەخرێتە نێو کەشتی لەقورسایی هەتا هاوسەنگی هەردوولای کەشتیەکە رابگرێ
**صَابُورِيَّة**: زەمیلەیەکی دەم والاو فراوانەو بەناو وەستاکان خۆلی پێ فڕێ دەدەن
**صَابُون**: سابوون، خاوێنە، پشیۆر، سباین، ساوون، شتێکە لەچەوریو قەلبە دروستدەکرێو جلو بەرگو کەلو پەلی چلکنی پێدەشۆرێو خاوێندەکرێتەوە
**صَابُونَة (قِطْعَة صَابُون)**: سەلکە سابوونێك، سابوون ، یەك پارچە سابوون
**صَابُونِيّ**: سابوونی، لەسابوون دەکات، سابونچی، سابوونکەر، سابوون فرۆش، گیایەکە جۆرە پاکەرەوەیەکی لێ دروست دەکرێت
**صَاتَ**: دەنگی لێوەهات ، هاواریکرد، قیژاندی، بانگی کرد
**صَاتٌ**: دەنگ زل، قوڕگ دڕاو، دەنگ گەورە، ناوبانگی باش لەنێو خەڵکیدا
**صَاج**: پارچە ئاسنێکە بۆ نان برژاندن لەسەر ئاگر بەکاردێت
**صَاحَ**: بەتوندی هاواریکرد، نەڕاندی، قیڕاندی
**صَاحَ بِهِ**: بانگی کرد ، هاواری لێکرد
**صَاحَ عَلَيْهِ**: قسەی پێکوت ، سەرزەنشتی کرد، بەسەریا هات، قیژاندی بەسەریا، پیا هەڵشاخا
**صَاحَ الدِّيك**: کەڵەشێرەکە قوقاندی، خوێندی

**صَاحَ العُنْقُودُ**: درێژبوو لە هێشوەکەی هاتە دەرەوە
**صَاح**: بەئاگا، هوشیار، بێدار، بەئاگا
**صَاحَبَ۔ مُصَاحَبَة**: هاوەڵایەتی کرد، لەگەڵبوو، رەفیقی بوو، لەگەڵی ژیا ، کردی بەهاوڕێی خۆی
**صَاحِب**: هاوڕێ، هاوەڵ، برادەر، یاوەر،هامڕا، ئاواڵ ، ریهەڤ، هەڤرەهـ، جەوسك، هاوژین ، هاواڵ، دۆست ، یار، کەسێك هاوڕێبازو بیرو ژینو...بێت
**صَاحِبُ الشَّيْء**: خاوەنی شت ، بەرپرس، خاوەن هەڵسوکەوت پێوەی
**صَاحِبُ الأَمْر (رَئِيس۔ سَيِد)**: سەرۆك، خاوەن بڕیار، بەرپرس
**صَاحِبُ البَلَد (حَاكِمُهَا)**: فەرمانڕەوای وڵات یان شار، دادوەر، بەرپرسی شار
**صَاحِبُ الدَّيْن**: خاوەن قەرز، خاوەن وام
**صَاحِبُ السَّعَادَة أَو المَعَالِيّ**: خاوەن شکۆ، بەرێز، سەردار، بالآدەست، بەرپرسانی وڵات لە سەرۆکو پادشاو.. بڕیار بەدەستەکان دەگوترێت
**صَاحِبَة**: ژن ، هاوسەر، خێزان ، هاوڕێی ژیان
**صَاحِيَة**: رۆژی بێهەورو هاڵ، هەتاوە رۆژ
**صَاخَ فِي كَذَا**: تێی چوو، پیاچوو، چوە ناوی

**صَاخَ فِـي الأَرْض**: چوو بـەنێو زەویـدا، ڕۆچوو بەناو زەویا
**صَاخَبَ ـ مُصَاخَبَة**: لەکاتی نارەحـەتیو قـەیرانا بـانگی یـەکیان کـرد، بـۆ گیروگرفتو کێشە هاواریان لەیەك کرد
**صَاخِب**: یەکێك زۆر هاوارو نەڕەو قیـژە بکات ، هاوارکـەر، قیژەقیژکـەر، گاڵـەو هەرا بەرپاکەر، دەنگە دەنگ کەر
**صَاخَّة**: بـەڵاو نەهامـەتی، نەهامـەتیو دەردەسـەریی، شـوێنەواری هــەواڵو ڕووداوێکی ناخۆش لەسەر ئێسك
**صَاخَّة فِـي الطِب**: لوویەکـە لەئێسـکدا دروست دەبێت بەهۆی تەنگو چەڵەمـە یـان گەزتنـەوەو بـەردەوام شـوێنەواری هەر دەمێنێت
**صَادَ**: ڕاویکرد، گرتی، شکاری کرد
**صَـادَ النَّـاسَ بِـالمَعْرُوف**: جێگـەی ئالوودەیان بوو بەچاکە بەکێشی کردن
**صَـادَ سَـمَكاً**: ماسـی گـرت ، ڕاوی ماسیکرد
**صَادَ زَيـداً**: گـەردنی پـێ کـەچکرد، ملکەچی کرد، سەری پێ نەوی کرد
**صَـادَ**: پیتـی چواردەیـەمی زمـانی عەرەبییە، مـس ، زەرد، نەخۆشـیەکی وشترە، شێری بێشەڵان
**صَادَ ـ صُدَاد**: لارو لـەوێری هەرشتێك، لار بوونەوەی هەر شتێك
**صَادِح**: گۆرانی بێژ ، بێـژەر ، شـایەر ، مەردومی دەنگ بەرز

**صَادَرَ**: دەستی بەسەرا گـرت ، خستیە ژێر دەستی خۆیەوە
**صَادَرَ المَـالَ**: دەسـتی بەسـەر ماڵەکـەدا گرت ، قۆرخی کرد
**صَادِر**: نێردراو ڕەوانە کراو
**صَادِرٌ عَن الشَيء**: لێوەی وشـاوە، لێـی ڕویدا
**صَادِرَات** : نێردراو، ئەوشـتو مەکانـەی دەنێرێن بۆ دەرەوەی وڵات
**صَـادِع**: دادوەری نێـــوان خـــەڵکی، فـەرمانڕەوا ، جیاکـەرەوەی ڕاسـتو ناڕاست لەیەك
**صَـادَغَ**: نکـوولیو نـارەزایی دەربـڕی لەهەڵسو کەوتی پێ بەپێی ئەو
**صَـادَفَ ـ مُصَادَفَـة**: بەرێکـەوت بینـی، بێئـەوەی مەبەسـتی بێـت چـاوی پێکەوت، بەدی کرد
**صَـادَقَ( صَـاحَبَ )**: هاوڕێیـەتی کـرد، هاوەڵایـەتی کـرد، بـوو بـەبرادەری، دۆستایەتی لەگەڵ بەست
**صَادَقَ عَلَى** : ڕازی بوو لەسەر، قایلبوو، پەسـەندی کـرد، نکـوولی نـەبوو ، سەلماندی، چەسپاندی ، ڕێگەیدا
**صَادِق**: ڕاست ، ڕاستگۆ، سـەر ڕاست، بەگفت ، ڕاست بێژ، یەکێك لەسـەرجەم وتەکانیدا ڕاستگۆو ڕاست بێژ بێت
**صَادَقَـهُ المَـوَدَّة**: لەخۆشەویسـتیو دۆسـتایەتیدا ڕاسـتگۆ بـوو لەگـەڵیدا ، بەڕاستی خۆشەویستیو سۆزو میهری هەبوو بۆی
**صَادَمَ**: خـۆی پیـا کێشـا، بەرێکـەوت ، لێیدا، پیای کێشا، دایگرتەوە

**صَادِيْ (عَطْشَان):** تينوو،تەژنە، توونی، تێنی، تۆنە، تەهن، تێهن، بۆزینەدەوەرو دارو شینایی و گژو گیا بەکاردەبریٚ لەئاتاجیان بەئاوو ئاو خواردنەوە بێت ، بەپێچەوانەی تێراوییەوەیە

**صَارَ الشَّيْءَ:** لاری کردەوە، خواری کرد، لۆچیکرد، قوپانی ، بەلای خۆیدا لاریکردەوە،نزیکی کردەوە، هێنایەبەر

**صَارَ الشَّيْءَ كَذَا:** لەبارێکەوە گۆڕا بۆ بارو حاڵێکیتر

**صَارَ إِلَيْهِ:** گەڕایەوە، هاتە دواوە

**صَارَ فُلَانٌ غَنِيّاً:** دەوڵەمەندبوو، باری بژێوی لەهەژارییەوە گۆڕا بۆ دەوڵەمەندی

**صَارَةُ الْجَبَلِ:** لوتکەی شاخ ، قوتەی چیاو شاخ، سەری شاخ، رووی سەرووی چیاو شاخ

**صَارَحَ ـ صِرَاحاً وَمُصَارَحَةً:** بەئاشکرا دوا ، بیٚ پێچو پەنا هاتە گۆ

**صَارَحَ بِمَا فِي نَفْسِهِ:** ئاشکرای کرد، دەریخست رازی نێو دڵی هەڵڕشت، نهێنی نێو دەروونی ئاوەلاّ کرد

**صَارَحَ فُلَاناً بِالأَمْرِ:** رووبەروو پێی گوت، لێیی نەشاردەوە، بەروو تەقاندی

**صَارِخٌ:** هاوارکەر، قیژەکەر، کەڵەشێر ، کەڵەباب

**صَارِخَةٌ:** فریاکەوتن ، فریاگوزاریی، دەنگو هاواری فریاکەوتنو بەدەمەوە چوون

**صَارِدٌ:** پێکەر، لێدەر، نیشان شکێن، دەست راست

**صَارَعَ:** زۆرانی لەگەڵ گرت ، ویستی بیدات بەزەویدا

**صَارَفَ نَفْسَهُ عَنِ الشَّيْءِ مُصَارَفَةً:** نەفسی خۆی لیٚ بەدوور گرت ، نەفسی دوورەپەرێزیکرد لێیی ، بەدووربوو لێوەی

**صَارَفَهُ:** ئاڵو گۆڕی لەگەڵ کرد، گۆڕییەوە لەگەڵیدا

**صَارِمٌ:** بڕەر، بڕندە، تیژ ، بڕ، بڕۆك ، لەتکەر،مەردومی دلاوەرویەکلاکەرەوە، شێری بێشەلان

**صَارُوخٌ:** موشەك، فیشەکەشێتە، موشەکێکی حەشوەدارە لەشێوەی لوولەکدایەو بۆ شوێنی دوور دەتەقینریٚ بەهۆی تەقینەوەی گازیی لەخوارییەوە فشاری دەخاتە سەرو پاڵی پێوە دەنێت بەرەو مەبەستی دیاریکراو

**صَارُوْرٌ:** رەبەن ، رەبەنۆك، زوگورت، سەڵت، تاك، تەنیا، بیٚژنو منالّ، عەقدالّ

**صَارِيٌّ:** چارۆکە ، چاریکە، کۆڵەکەی ناوەندی کەشتی ، ئەستوونی کەشتی، ئەو شتەی دەبێتەهۆی راگرتنی شتێکیتر

**صَاصِل ـ صَوْصَلَاءُ:** گیایەکە

**صَاعَ الْحَبَّ:** پێوانەی کرد، کێشای ، بلاّوی کردەوە، پەرەوازەی کرد

**صَاعٌ:** ئەندازە ، پێوانە، پێوان، چاپان، هەند، چەندێتی ، رادە، سێو، راست، تیەن، بەقەد، بارستایی، هێندەیی، چەندێتی شت لەدرێژی یا پانی یا بەرزیی یا قەبارەی

**صَاعَـاً( بِالصَّـاع ):** سەریەسـەر، دەقـاو دەق، سەریەســـەر، بەقەدیـــەکتری، گۆڕینـەوەی دووشـت بەیـەکتری بــەبێ باقی دانەوە
**صَاعَبَ ـ مُصَاعَبَة:** سەخت‌و قورسی‌کرد، گرێدارو دژواری کرد
**صَاعِد:** ســەرکەوتوو، بــالا، بڵنــد، هەڵکشاو، بەرزبوو
**صَاعَرَ خَدَّهُ:** رووی کرد بـەولاوە، رووی وەرگێڕا ، تەماشای ئەولای‌کرد بـەهۆی خۆبەزلزانین یان هـەر سیفەت‌و خـووی وەهابوو
**صَاعِقَـة ـ صَوَاعِـق:** هەورەتریشــقە ، بروســـکە، ئەورترشـــکی، هـــەورە برووسکە، بروسـکەی ئاسمانـە لەگـەڵ گرمەی هەورا کەلەشوێنێك بدات
**صَــاغَ الشَّــيءَ:** دایڕشــت ، کــردی بەپەیکەر، لەقاڵبیدا
**صَاغَ الكَلِمَة:** وشەی دروستکرد، پێکـی هێنا ، وەبەری هێنا
**صَاغَ الكَلاَم:** قسەی هەڵبەست ، رێکـی خست‌و دروستی کرد
**صَاغَ اللهُ صِيغَـةً حَسَنَة:** خـوای گـەورە بــەجوانترین شــێوە هێنایــە بــوون، رێکسازی تێدا کرد
**صَاغِر:** رسوا ، سووك، نزم ، مەردومی گەردنکەچ‌و رسوا ، یـەکێك رازی‌و قـایل بێت بەسووکی‌و رسوایی
**صَاغِيّ:** گوێگر، بیسەر
**صَاغِيَـة:** کەســانێکن لەپێداویســتی خۆیاندا ئاتاجیان هەیە بەکەسانی‌تر

**صَـافَ ( مَـالَ ـ عَـدَلَ ):** لایـدا ، تـرازا، سەری کرد، لێـی نـەدا ، هەڵەی‌کرد، نەی پێکا
**صَافَ( صَيـف ):** چـوو بـۆ هاوینەهـەوار، هاوین گەشتی کرد
**صَــافَ الكَبْـشُ:** خوریەکـەی زۆربـوو، خوری زیادیکرد
**صَافَ اليَـوم:** گەرماکـەی تـاوی سـەند، زیادیکرد، قرچەی سەند
**صَافَ عَنْهُ:** لێی لادا ، ترازا لێی
**صَـافَ بِالمَكَـان:** هـاوین لـەوێ مایـەوە، لەهاویندا نیشتەجێ بوو لەوێ
**صَافَ القَوم مُصَافَـة:** ریزیـان بەسـت ، رێك وەستان ، بەدوای یەکا هاتن
**صَـافٍ ـ صَـافِيٌ وَالأصـوَف وَالصَّـائِف:** تووکن ، خوریدار، بەموو ، مووردار
**صَافٍ:** گەرم ، بـەتین ، بەتاو، تینـدار، گەرم‌و گوڕ
**صَافى ـ مُصَافَـاة:** پـاك‌و پوختـی کـرد، بێگەردی کرد، پاڵفتەی کرد، پالاوتی
**صَافَات:** فریشتەکان ، پەریەکان ، ئەم وشەیە بەمانای ئـەو فریشـتانە هـاتووە کـەوا لەفـەرمانداریتی پـەروەردگاردان چاوەڕێی فەرمانەکانی دەکەن
**صَـافَحَ ـ مُصَافَحَـة:** تەوقـەی کــرد، دەستی خستە نێو دەستیەوە، دەستی نایە نێو دەستی
**صَـافِر:** زەردەهەڵگەڕاو ، دز ، ترسـاو ، تۆقیو ، باڵندەیەکـە شـەوان دەخوێنـێ لەترسی ئـەوەی نـەبادا راوبکرێ، هـەر باڵندەیەك راونەکرێت، هـەر دەنگدارێك لەباڵندەو پەلەوەر

**صَافِرَة:** فیکە ، شاور، فیقە ، فیتوو، جۆرە دەنگێکە بەلێو لێدەدەرێ یان بە ئامرازێکی تایبەت بۆ مەبەستی وریا کردنەوە

**صَافَعَ ـ مُصَافَعَة:** لەیەکیاندا ، یەکتریان داگرتەوە، بەربوون لەیەك

**صَافَقَ الرَّجُلانِ عِنْدَ البَيْعِ:** دەستیان خستە دەستی یەکەوە لەکاتی مامەڵەو سەوداگەریدا ، لێیان دایەوە، تەوقەی پێکهاتنو تەباییان کرد

**صَافَقَ الرَّجُلُ بَيْنَ جُنْبَيْهِ:** جلێکی بەسەر ئەوی ترا لەبەر کرد، جلی بەسەر یەکا پۆشی

**صَافَقَ:** لەسەر لا نوست ، بەلادا خەوت

**صَافَنَ القَوْمَ:** بەریزی ئەوان وەستا ، هاوڕیزو تەك بوو لەگەڵیان

**صَافَنَ المَاءَ بَيْنَهُمْ:** بەشی کرد لەنێوانیاندا،دابەشی‌کرد،بەشبەشی‌کرد لەنێویانا

**صَافِن:** ڕۆیوو، لەدالْفەیا ڕۆچوو، دەمارێکە لەدامێنی قاچدا

**صَافِنٌ مِنَ الخَيْلِ:** ئەسپێکە لەسەر سێ پا ڕابوەستێو یەکێکیان بەرزبکاتەوە

**صَافِي:** پاك، پوخت ، پاڵفتە، پاکیو ڕۆشنی، پوختو پاکیزەیی

**صَافِيَة:** زەوییە کەوا خاوەنەکانی کۆچو باریان کردوە یاخود مردوونو میراتگری نییە

**صَاقَبَ ـ مُصَاقَبَة:** نزیك بوەوە لێیو ڕووبەڕووی بوو، هاوتای بوو

**صَاقُور:** پێك ، زەنگەن، پاچ ، قولنگ، پاچێکە بەردی پێ دەشکێنرێ

**صَالَ:** بازیدا ، قەڵەم بازیدا، هەڵبەزییەوە

**صَالَ عَلَيْهِ:** چوە سەری ، پەلاماریدا، تەنگی پێهەڵچنی

**صَالَ الجَمَلُ وَنَحْوُه:** گەزتی، گازی لێگرت

**صَالِب:** بڕبڕەی پشت ، مڕۆخە ، ترەختەی پشت ، تیغەی پشت ، پشتمازە، کاریتەی پشت ، زنجیرەی ئێسکەکانی مورەغەی پشت ، گارگارە، تیرەقی پشت ، بڕبڕاگە

**صَالَحَ:** ڕێککەوتن ، دواییان بە ئاشوبو ئاژاوە هێنا ، کۆتاییان بەتەنگو چەڵەمە هێنا

**صَالِح:** پیاوچاك، خێرەومەند، باش ، چاك، ساز، گونجاو، لەبار، بۆبوو، مەردومی ڕەوشت بەرزو باڵا لەنێو کۆمەڵدا ، ناوی پێغەمبەری نەتەوەی (ثمود)ە (سەلامی خوای لەسەر بێت)

**صَالِد:** ئەوچەرخەی ئاگر ناکاتەوە، چەرخی بێ ئاگر

**صَالِدَة:** جیرەی ددان ، دەنگی دانە جورەی گیانداران

**صَامَ صَوْماً وصِيَاماً:** بەرۆژوبوو، خۆی گرتەوە لەخواردنو خواردنەوەو جووت بوونو ئەوەی دەبێتە مایەی ڕۆژو بەتاڵکردنەوە لە بانگی بەیانیەوە هەتا بانگی شێوان

**صَامَ الشَّهْرَ:** لەو مانگەدا بەڕۆژو بوو، تێیدا بەڕۆژو بوو

**صَامَ الشَّمْسُ:** خۆرگەییە نێوەڕاستی ئاسمان

**صَامَ الرِيحُ:** وەستا ، هێواش بووەوە، نەما ، باكەی خست
**صَامَ الفَرَسُ:** هەستاو ئاخوڕی نەخوارد
**صَامَ النَعَامُ وَنَحوه:** هەستاوپیسایی‌كرد، لەسەر پێ ریخەكەی لێبەربووەوە
**صَامَ عَنْ كَذَا:** خۆی پاراست لە ...، دووره‌پەرێز بوو لە ...
**صَامِتٌ:** بێدەنگ، خامۆش ، كپ ، ماتو خامۆش ، بێ‌قسە بوون، وەڵام نەدانەوە، هەر ماڵو داراییەك رەقو خامۆش بێت، بەوپێیانە دەگوترێت كەكپو نزمن لەدەربڕیندا
**صَامَدَ(جَالَدَ):** شەڕی فرۆشت ، مشتو مڕی كرد، چەنو چوونی كرد، بەشمشێر رووبەرووی بوەوە
**صَامِدٌ:** هەمیشەیی، خۆڕاگر، بەرگەگر، بارقۆل، بەپشوو، پشوودرێژ، هەناسەدرێژ، كێشمەكێشكار، یەكێك توانای بەربەرەكانیو خۆڕاگری هەبێت لەململانێو جەنگو بارە جیاوازەكاندا
**صَامِغَانِ:** هەردوولای زار، ئەملاولای دەم ، لاشەویلگەكان، لالغاو
**صَانَ:** پاراستی ، ئاگاداریكرد، پارێزگاری لێكرد، خستیە ژێر چاودێریو پارێزگاری خۆیەوە
**صَانَ الثَوبَ أو العِرضَ:** جلو بەرگ یان حەیاو ئابڕوی پاراست لەوەی لەكەدار یان كەیلو ناتەواوی هەڵگرێت
**صَانَعَ:** نەرمی نواند بەرانبەری، دڵی راگرت، بەرتیلی دایە، دەمی چەوركرد، هەڵی فریواند، چاوبەستی لێكرد
**صَانِعٌ:** ئیشكەر، فرمانكەر، بكەر، شاگرد، بەردەست ، پیشەساز، كرێكار، خزمەتكار، پێشخزمەت
**صَاهَرَ:** لێیان نزیك بووەوە ، بوو بەخزمیان
**صَاهَرَةٌ ـ مُصَاهَرَةٌ:** لەرێی ژنو ژنخوازیەوە بوو بەخزمیان ، پەیوەندی خزمایەتی لەگەڵ بەستن لەرێگەی ژنو ژنخوازییەوە
**صَاهِلٌ:** ئەسپی حیلەكەر، ئەو ئەسپەی حیلەحیل دەكات
**صَاهِلَةٌ:** ماینی حیلەكەر، ئەو ماینەی حیلە دەكات
**صَاوَلَ:** هێرشو پەلاماریان كردە سەر یەك، هەڵمەتو هێرشیان برد بۆ یەكتری
**صَايَحَ ـ مُصَايَحَةً وَصِيَاحاً:** هاوارو بانگی یەكتریان كرد، دەنگیان بەرزكردەوە بۆ یەكو بانگی یەكیانكرد
**صَايَحَ بِهِ:** بانگی كرد، هاواری لێكرد، بەدەنگی بەرز ئامادەی هاتنو ئامادەبوونی لێكرد
**صَايَفَ ـ مُصَايَفَةً:** مامەڵەی هاوینی لەگەڵ كرد، مامەڵەی هاوینەی كرد
**صَأَى:** جووكاندی ، جریوانی، جووڵە جووڵی كرد
**صُؤَابَةٌ:** كرێش ، رشك ، نووتك، بێچووی ئەسپێ ، گەرای ئەسپێو مۆریانە
**صَبَّ مِنَ الشَرَاب (رَوَى ـ إِمتَلأَ):** تێری خواردەوە، مەستو كەیل بوو، مڕبوو

**صَبَّ الرَأس:** كرێشی كرد، رشك تێیدا، رشكی هەڵهێنا ، كرێشی زۆر بوو
**صَأصَأَ الرَّجُل:** ترسـا ، تۆقـی ، ترسـی لێنیشت ، زارەترەك بوو
**صَأصَأَ الجَـرْوُ:** تولەكـە یـان بێچوەكە چاوی كردەوە، چاوی هەڵهێنا
**صَأصَأَ مِنْهُ:** ترسا لێیی، تۆقی لێـیی، زارەتـرەك بـوو پێـیی ، رۆحـی سـپارد لێیی
**صُئصُئَة الدِّيـك:** نینۆكـی كەڵەشـێر ، چنگی
**صُؤُولٌ مِـنَ الرِّجَـال:** ئـەو پیاوانـەی دەستدرێژی دەكەنە سەر خەڵكیو رێزو ئابرویـان دەشـكێنن، دەمدرێـژ ، زمـان پیس ، زۆردار

**ص ب**

**صَـبَّ المَـاء:** رژانـدی ، قلـپیكـردەوە، رۆیكرد، تێیی‌كرد
**صَبَّ فِي الوَادِيِّ( إنْحَـدَر):** تێـیی چـوو، تێیی رژا ، بەخوڕ رۆیی
**صَـبَّ الـدِّرْعَ:** لەبـەریكرد، پۆشـی ، كردیەبەر
**صَبَّ إلَيه:** خرایە ئەستۆی ، نرایە ملی، پێی سپێردرا
**صَبَّ الرَّجُل فِيْ القَيد:** كۆتو بەندیكرد، بەستیەوە، كۆتی كرد
**صَبَّ فُلاَنَـاً عَلَـى الأَمـر:** هـانیدا ، پـاڵی پێوەنا
**صَبَّ الكَلْـبُ عَلَـى اللـص:** نـاردی ، تێـی بەردا
**صَـبَّ رَأسَـهُ:** سـەری بـۆ خـوارەوە نەویكرد، داینەواند، نەویكرد

**صَبَّ إلَيه ـ صَبَابَةً:** دڵـی بـۆی جۆشـا ، بـیری كـرد، سـۆزو ئـارەزووی بـۆی هاتەجۆش
**صَبَّ فِـي قَـالِب:** دایرشـت، لەبۆتـەیدا ، لەقاڵبیدا
**صَبَّ نِقْمَتَـهُ عَلَـى:** داخـی دڵـی خـۆی پێرشت ، پێی رشت ، جـامی خـەشمی خۆی بەسەرا رشت
**صَب:** رژان ، رژاندن، رۆكردن، تێكردن، قلپكردنـەوە، دارشـتن، شـەیدا، دڵـدار، دڵخواز
**صَبَـا:** ئـارەزووی منـاڵی كـرد، حـەزی لـەرەفتارو كرداری منـاڵان بـوو، بـیری منالی كەوتەوە
**صَبَا إلَيه:** بیری كرد، بەسۆزو پـەرۆش بوو بۆی ، حەزی پێكرد
**صَبَا (رِيحْ شَرْقِيَة ):** بای خۆرهەڵات
**صَبَى رَأسَه:** سەری دانەواند، نەویكرد
**صِبَـا ـ صِبَـاء:** منـاڵی ، تـافو كـاتی مناڵی ، گچكە
**صَبَـاُوُوت:** جوانـیو شـكۆمەندی، قەشەنگیو بڵندی
**صُبَابَة:** پاشماوەی ئاو لەقاپدا
**صَبَابَة:** شەیدایی، ئارەزوو ، حـەز، دڵ پیـاچوون ، حـەزلێكردن، دڵتـەنگی بـەهۆی ئـەوینو خۆشەویسـتیەوە ، دڵناسكی
**صَبَـاح:** بـەیانی ، سـبەهی، تـاریكو روونی بەیانی، بەزوودان ، بەرەبـەیان، سەرەتای رۆژ
**صُبَـاح:** گـرو روونـاكی فتیلـە یـاخود قوتیلە

**صَبَاحَة:** جوانیو قەشەنگی

**صُبَاحِيٌّ مِنَ الدَّمِ:** خوێنێك ئێجگار سوور بێت ، خەستە خوێن

**صَبَاحِيَّة:** بەرەبەیانی شەوی یەکەمی هاوسەرداریی

**صِبَار:** ئەو درەختانەی میوەی ترش دەگرن، دەمەوانە ، سەر ، سەرقاپ

**صُبَار۔ صُبَّارُ:** تەمەر هند، بەرهەمێکی ترشە

**صُبَّار:** سوبێر، کاڵەکی درکن ، هەنجیرە درکن

**صَبَّار:** بەئارام ، ئارام گرتوو، هێمنو دان بەخۆدا گرتوو، بەحەوسەڵە ، یەکێك زۆر دان بەخۆدا گرو بەئارام بێت

**صَبَارَةٌ:** سەرمایەیەکی زۆرو بێ شومار ، دەستەبەر کردن، کەفالەت کردن ، زامن کردن

**صَبَّارَة:** زەوییەکی رەق کەهیچی تیانەڕوێت ، رەقە زەوی ، خاکە وشکە

**صُبَارَة:** بەردێکی لووسو ساف ، سافە بەرد

**صَبَّاغ:** بۆیەچی، خوم خانەچی، بۆیاخچی، ئەوەی رەنگی شت دەکات بەبۆیەو رەنگی جیاواز جیاواز، یەکێك درۆزن بێتو قسەو باس بەرەنگی جۆراو جۆر باس بکاتو جار لەگەڵ جارا گۆڕانکاری تیا دروست بکات بە درۆ

**صِبَاغ:** رەنگ، جوور، چەشن، مەبەست لەرەنگەکانی سپیو سوورو زەردو رەشو شینو پەمەییو بۆرو ...

**صِبَاغَة:** بۆیەچێتی ، بۆیاخچێتی، خومخانەچێتی، ئەوەی پیشەی رەنگ کردنی شتو مەکانە لەدیوارو ساختمانو جلوبەرگو...

**صَبَّان:** دروستکەرو فرۆشەری سابوون، سابوونکەر، سابوونچی

**صَبَأَ النَّابُ أو النَّبَاتُ:** دەرهات ، هەڵیدا ، سەری دەرکرد

**صَبَأَ صَبأً وَصَبُوءاً:** لەئاینێکەوە چوو بۆ ئاینێکیتر، لەدین وەرگەڕا

**صَبَأَ عَلَيهِم:** هێرشی بردە سەریان ، هەڵمەتی بۆ بردن ، پەلاماری دان

**صَبَأَ العَدو عَلَيهِم:** ڕێنمایی دوژمنیکرد بۆ سەریان ، دوژمنی بردە سەریان

**صَبَاوَت:** جوانی ، قەشەنگی ، سەرنج ڕاکێش، بەدیمەن

**صَبَب:** تێرژانی روبارێك لەجێگەو شوێنێکی لارو لێژدا ، ئەو زەویانەی ڕێگەی لێژو سەربەرەوخوارە

**صُبَّة:** پاشماوەی شیرو ئاو لەقاپدا ، هەندێك لەهەر شتێك، ئەو خواردنەی کەتێدەکرێت، کۆمەڵو تاقمێك لەخەڵکی ، جلەوە ئەسپ یان وشتر یاخود مەڕ، کەمێك ماڵو سامان ، خواردنێکە لای زۆرینەی خەڵك بە شۆربا بەناوبانگە

**صَبَحَ القَومَ:** بەیانی هات بۆ لایان ، بەیانی رووی تێکردن

**صَبَحَ عَنِ الحَق:** روونیکردەوە، ئاشکرای کرد، دەریخست

**صَبِحَ صَبَحاً وَصُبحَةً:** روونو رۆشن بوو، رووناك بوو، درەوشاوە بوو

**صَبِحَ الحَدِيدُ:** ڕووناکی دایەوە، ڕۆشن بووەوە

**صَبُحَ الوَجهُ:** ڕۆشن بوو، ڕووناك بوو، درەوشایەوە، ڕەنگی دایەوە

**صَبُحَ الغُلامُ:** جوان بوو، قەشەنگ بوو، سەرنج ڕاکێش بوو

**صَبَّحَ:** شەبەقی داهات ، بەرەبەیان هات ، هەرزوو هات ، بەیانی باشیکرد

**صَبَّحَ القَومَ المَاءَ:** بەرەبەیان بردنیە سەر ئاوەکە

**صُبْحٌ:** بەیان ، سەرەتای ڕۆژ، دەمی یەکەمی ڕۆژ

**صُبْحَةٌ:** ژەمی بەیانی، ناشتاکردن، ڕەشێکی سوور باو

**صَبْحَةٌ:** خەوی بەرەبەیان ، خەوی بەیانی زوو

**صَبَرَ:** ئارامی گرت ، خۆراگر بوو، دانی بەخۆیدا گرت، هەڵنەچوو، بەئارام بوو، سەبری کرد

**صَبَرَ عَنِ الشَّيءِ:** دەستی لێگرتەوە، خۆی لێپاراست ، گرتیەوە، مۆڵیدا

**صَبَرَ عَلَى الأمْرِ:** جەربەزەو ئازاو بەئارام بوو لەسەری

**صَبَرَ الدَّابَّةَ:** بەبێ ئالیكو ئاخورِ بەجێی هێشت ، گرتی‌و ئاخوری نەخستە بەردەمی

**صَبَرَ نَفْسَهُ:** گرتی‌و ڕێکی خست

**صَبَرَ البُرَّ:** کەڵەکی‌کرد، هەڵی چنی، کۆی کردەوە

**صَبَرَ فُلاَنَاً:** گرتی ، مۆڵیدا ، پیای نووسا

**صَبَّرَ:** داوای ئارامگرتنی لێکرد، پێی وت دان بەخۆیدا بگرێت

**صَبَّرَ المَيتَ:** مۆمیای‌کرد هەتا بۆگەن نەکات

**صَبَّرَ الكَأسَ:** هەتا سەرەکەی هێنا، پڕیکرد تاسەر لێوەکەی، لێوان لێوی‌کرد

**صِبْر ـ صُبْر:** لای شتێك، قەراخەکەی ، گەواڵە هەورێکی سپی

**صُبْر ـ صُبُر:** زەوییەك چەوو وردە بەردی هەبێت بەڵام وشكو سەخت نەبێت

**صَبْر:** پەروا ، ئارامگرتن ، خۆداری، حەوسەڵە، سەبر ، دان بەخۆداگرتن ، خۆخواردنەوە، بەخۆدا ڕۆچوون

**صَبْر ـ صَبِر:** تاڵی شاری ، تاڵی شاڵی

**صَبْرُ أيُّوب:** ئارامگرتنی حەزرەتی (ئەیوب) پێغەمبەر(د.خ) لەسەرجەم ناسۆری‌و نەهامەتیەکانی کەلە ژیانیا هات بەسەریاو چیرۆکی ئارامگرتنەکەشی لەقورئانی پیرۆزدا باسکراوەو بەناوبانگە

**صَبَغَ بِهِ وَعَلَيهِ:** بەقامەی ئاماژەی کرد بۆی‌و سووکایەتی پێکرد

**صَبَّغَ فُلاَنَاً عَلَيهِ:** بەئاماژەکردن دەستنیشانی‌کرد،دەستی بۆ ڕاوەشاندو بەپەنجەو قامەی دیاریکرد

**صَبَغَ الثَّوبَ:** ڕەنگی کرد، خومی کرد، ڕەنگاو ڕەنگی کرد

**صَبَغَ يَدَهُ فِي المَاءِ:** دەستی نوقم کرد لەئاوەکەدا، ڕۆچوو، غەرق بوو

**صَبَغَ يَدَهُ بِالعَمَلِ:** بەئیش‌وکارەوە سەرقاڵبوو، بەئیش‌وکاری دەستی‌یەوە خەریك بوو، دەستی دایە ئیش‌وکارو فرمان

**صَبَغَ فُلاَنَاً فِي النَّعِيمِ:** لەبەخشش‌و خۆشگوزەرانیدا نغرۆی کرد، سەراپای هەڵکێشا لەنیعمەت‌و خۆشحاڵیدا

**صَبَغَ الحَدِيثَ:** لەگەڵ وتەکانی قسەی پروپووچ‌و بەتاڵی ئاوێتە کرد، قسەکانی تێکەڵ بەگوتەی پروپووچ بوون

**صِبْغٌ ـ صِبَغٌ:** رەنگ، خوم، بۆیاخ، بۆیە، ئەوەی رەنگی پێدەگۆڕدرێت

**صِبْغٌ ـ صِبَاغٌ:** خۆراکی وەك سرکەو رۆن‌و هاوچەشنەکانیان

**صِبْغَةٌ:** جۆر، شێواز، چەشن، شێوە، پوختە، روح، ربە، رینگ، ئاین، نەتەوە، گەل

**صِبْغَةُ اللهِ:** ئەو سروشتە پاکەی پەروەردگار خەڵکی لەسەر دروستکردوە یاخود ئەو ئاینەی بۆی داناون‌و رەوانەی کردوە بۆیان

**صِبْغَةُ الأَفْيُونِ:** تلیاکی پوخت، پوختە تلیاك

**صِبْغَةُ اليُودِ:** یۆد، ئەیۆدین

**صَبَّنَ:** وازی لێهێنا، دەستی لێهەڵگرت، دەستبەرداری‌بوو

**صَبَّنَ:** بەسابوون شتی

**صَبَّنَ عَنْهُ الهَدِيَّةَ وَنَحْوَهَا:** نەیدایە، لێی گرت

**صَبَّنَ المُقَامِرِ الكَعْبَيْنِ:** زاری گرت، دەمی بەست

**صُبُوّ ـ صَبْوَة:** بیرکردن، ئارەزووکردن، حەزلێکردن، بۆ جۆشاندن

**صَبْوَةٌ:** نادانی، نەزانی‌و گێلی، گەنجێتی، لاوێتی، هەرزەکاریی، لاوو تازەپێگەیشتوو

**صَبُوحٌ:** هەرشتێك بەیانیان بخورێت یان بخورێتەوە، ئەو شیرەی بەیانی زوو دەدۆشرێ، جوان‌و رووخۆش

**صَبُورٌ:** بەئارام، لەسەرخۆ، شێنەیی، بەپشوو، بەحەوسەڵە، ئارام گرتوو، نەفەس درێژ، دان بەخۆدا گرتوو، یەکێك دان بەخۆیدا بگرێت لەسەرجەم رووداوو بەسەرهاتەکانداو پشووی درێژبێت‌و تووشی نائومێدی نەبێت

**صَبِيَ:** کردەوەی گەنجانەی کرد، رەوشت‌و هەڵس‌وکەوتی منداڵانەی نواند

**صَبِيَ إِلَيْهِ:** بیری کرد، ئارەزووی کرد، سۆزی بۆی هاتە جۆش‌و جووڵان

**صَبِيَ القَوْمُ:** بای رۆژهەلات لێی دان

**صَبِيٌّ:** کوڕ، هەرزە، بەچکە، منداڵی نێرینە کەهێشتا پێنەگەیشتبێت

**صِبْيَانِيٌّ:** منداڵانە، هەرشتێك بەمنداڵ بخوات لەجل‌و بەرگ‌و هەڵس‌وکەوت‌و گوتە

**صَبِيبٌ:** ئەوەی دەتکێ‌و دێتە خوارەوە، رژاو، رۆکراو، تێکراو، دارێژراو، خوێن، ئارەق

**صَبِيَّةٌ:** کچۆڵە، کچی گچکەو بچکۆلانەو منداڵ، کیژۆڵە

**صَبِيحٌ:** رووخۆش، جوان

**صَبِيحَةٌ:** بەیان، چێشتەنگاو، پێش نیوەرۆ

**صَبِیر**: بەئارام ، دەستەبەر، زامن ، ئەوەی سەرۆکاری ئیش‌وکاری نەتەوەکەی دەکات‌و وەك دەم راستیان وایە، شاخ ، کێو
**صَبِیرَة**: سفرە ، خوان
**صَبِیغ**: رەنگ کراو، بۆیەکراو، خومکراو

**ص ت**

**صَتّ**: پاڵ پێوەنان بەتوندی، لێدان بەدەست
**صَتَّعَ**: گەنج‌و لاوی بەهێزو پتەو، گوێدرێژی کێوی ، توندو پتەویی
**صَتَّم**: توندوتیژ، رەق‌و زبر ، پیاوێك فرە پیر بوو بێت
**صَتَّهَ**: رێگەی نەدا ، رێگری لێکرد
**صَتَّهَ**: رسوایکرد، ملکەچی‌کرد، سەری پێدانەواند
**صَتِیمَة**: بەردێکی سەخت ، سەختە بەرد

**ص ج**

**صَجَّ**: ئاسنێکی کێشا بەئاسنێکی تراو دەنگێکی لێ پەیدا بوو
**صُجُج** ئەو دەنگەی لەبەیەکا کێشانی دوو ئاسن پەیدا دەبێت

**ص ح**

**صَحّ**: چاك بوەوە، خوێی تێگەڕا، ئاهی تێهاتەوە، نەخۆشیەکەی چاك بوەوە، لەگشت خەوش‌و ناتەواویەك قوتاربوو
**صَحَّ الجُرْحُ**: ساڕێژبوەوە، چاکبوەوە، ساغ بوەوە
**صَحَّ الشَّیءُ**: لەسەرجەم ناتەواویەك بەدوور بوو
**صَحَّ الخَبَر**: راست بوو، دەقاو دەق وەك خۆی بوو، هەواڵەکە راست دەرچوو
**صَحَّ الصَّلاة**: دروست بوو، شیاو بوو ، گونجاو بوو بەپێی رێساو رێ‌و رەسمە دیاریکراوەکان بوو
**صَحَّ العَقْد**: پەیمانەکە دروست بوو، شیاوو گونجاو بوو
**صَحَا**: بێداربوو، بەئاگابوو، بەهۆشبوو، ئاگاداربوو
**صَحَا الیَوم**: رۆژ خۆش‌و بێ هەور بوو، سایەقە بوو، ساماڵ بوو
**صَحَا السَّکْرَان**: سەرخۆشەکە بەهۆش خۆی هاتەوە، لەحاڵ‌و مەستی بەدەرچوو
**صَحَا الرَّجُل**: ئاغر بوو، وازی لەنەزانین‌و نەفامی هێنا ، بێداربوو لەنەفامی‌و نەزانین
**صَحَا القَلْبُ**: دڵ بەهۆش خۆی هاتەوە، لەنەزانین قوتارو دەربازبوو
**صَحَا السَّمَاء**: ئاسمان سایەقەو بێ هەور بوو، هەورەکانی رەوینەوە
**صَحّیَ(أیْقَظَ)**: هەڵی سان ، بەئاگای هێنا، بێداریکردەوە
**صَحَابَة**: یار ، هاوەڵ، دۆست ، برادەر، هاوڕێ، هاوەڵ‌و یارانی پێغەمبەری خوا(د.خ) کەلەگەڵی دانیشتوون بینیوانە ئەمانیش زانایان بەچەند شێوەیەکی تایبەت پۆلێنیان دەکەن
**صَحَاح ـ صِحَاح**: تەندروست ، ساغ ، دروست ، شیاو ، شایان
**صِحَاف**: چاڵی پچووکی ئاو، چاڵی پچووك پچووك

**صَحّاف**: کتێبو پەرتووك فرۆش، ئەوەی هەڵە دەکات لەخوێندنەوەی ڕۆژنامەدا، ڕۆژنامە فرۆش

**صِحَافَة**: ڕۆژنامە گەرێتی، نووسەری ڕۆژنامە، بەڕێوەبردنی کاروباری ڕۆژنامە

**صَحَافِيّ**: ڕۆژنامەگەر، یەکێك بەئیشوکاری ڕۆژنامەوانیەوە خەریكو سەرقاڵ بێت

**صَحِبَ**: هاوەڵیکرد، لەگەڵیبوو، لەگەڵی ژیا، کردی بەهاوەڵو دۆستی خۆی

**صُحْبَة**:یاوەری، هاوەڵایەتی، برادەری، ڕەفیقی، دۆستایەتی

**صِحَّة**: ڕاستی، چاکیو دروستی جەستە، ڕاستگۆیی، ڕەوایی، چاکی، باشی، چاکێتی، تەندروستی، ڕەنگو بۆ، سەلامەتی

**صَحَّ الَمرِيضَ**: چاکیکردەوە، نەخۆشیەکەی چارەسەر کرد

**صَحَّ الکِتَابَ**: پیاچوەوە، ڕاستی کردەوە، هەڵەچنی کرد، هەڵەگیری کرد

**صَحَّحَ الخَطَأَ أو العَيب (عَالَجَه)**: هەڵەو ناتەواویەکانی ڕاستکردەوە، نەیهێشت، چاکی کرد

**صَحَّرَ اللبَن**: شیرەکەی کوڵان، کوڵاندی، گەرمی کرد، خستیە سەر ئاگر

**صَحَّرَ الحِمَار**: زەڕانی بەتوندی، زەڕەزەڕی کرد بەتوندی

**صَحَّرَ الشَمسُ فُلاَنَاً**: نێشو نازاری گەیاند بەسەرو مێشکی، ژانی گەیاند بەسەری

**صَحِرَ - صَحَراً وَصُحْرَةً**: ڕەنگی سوورێکی کاڵی تێکەڵبوو، سووربوو

**صَحْرَاء**: بیابان، چۆڵ، سارا، بێروون، بیاوان، دەشتی چۆڵو بێئاو

**صُحْرَة**: زەویو خاکی نەرم، نەرمە خاك

**صَحْصَاح**: زەوییەکی لەبارو گوشاد، زەوی هەموارو بەرین

**صَحْصَحَ الأمْر**: ڕووتی کردەوە، ئاشکرای کرد، تیشکی خستە سەر

**صَحْصَح - صَحَاصِح**: بەتاڵو پووچی هەرشتێك، نارەوای هەرشتێك، زەمینی لەبارو گونجاو

**صُحْصُح - صُحْصُوح**: ئەو تێبینیارەی دوای وردەکاری هەموو شتێك دەکەوێتو ئاشکراو دیاری دەکات

**صَحَّفَ الکَلِمَة**: بەهەڵە وشەکەی خوێندەوە، هەڵەیکرد لەخوێندنەوەی وشەکەدا

**صَحَّفَ الخَبَر (حَرَّفَهُ)**: هەڵی گێڕایەوە، پێچەوانەی کرد، واژوی کرد

**صَحْفَة**: لەگەن، قاپی مس، دەسشۆر، دەفرێکی مسینی دەم واڵایە

**صَحْفَةُ العَمُود**: تەپڵەك، سەروبنی کۆڵەکە، سەر تەپڵەك

**صُحُفِيّ**: ڕۆژنامەگەر، ڕۆژنامەنووس، یەکێك سەرقاڵی ئیشوکاری ڕۆژنامەوانی بێت

**صَحِلَ صَوْتُهُ**: دەنگی نووسا، گیرا، وەك خۆی نەما

**صَحَل**: دەنگ نووسان، گرفتێکە دەدات لەژێکانی دەنگ لەگەڕووداو مرۆڤ ناتوانێت بەشێوەیەکی ئاسایی دەنگی دەربڕێت

**صَحَنَ:** لێیدا ، دایگرتەوە ، پیایدا هات
**صَحَنَ الرَّجُل:** لەلەگەنا شتی دایە ، بۆیکردە لەگەنەوە
**صَحْن:** لەگەن ، قاپ، بنی سم ، ناوسم، نێو چاڵێکی هەڵکەنراو، حەوشـە، گۆرەپان
**صَحْنُ الأكْل:** لەگەن ، قاپ ، دەفرێکی مسینە بۆ چێشت تێکردن بەکاردەبرێ
**صَحْنُ الدار:** حەوشە ، گۆرەپان ، مەیدان ، بەرماڵ
**صَحْنَا الأُذُنَيْن:** نێو هەردوو گوێ، ناوەندی گوێچکەکان
**صَحْنَاءَة:** ماسی پچووکی سوێراو
**صَحْو:** سایەقەو بێ هەورو هاڵ، سایەقەو ساف، ئاگاداریی ، وریایی ، بێداریی
**صَحْوَة:** بێداریی ، هەستیاریی ، هۆشیاریی ، بەئاگایی، خەبەرداریی
**صَحِيَ - صَحَا:** سایەقە بوو ، بێهەورو هاڵ بوو
**صَحِيَ مِن نَومِه:** لەخەو بەئاگا هات ، بێداربوو لەخەو، بەهۆش خۆی هاتەوە
**صِحِّي:** زانیاری تەندروستی، دروستگە، خانەی تەندروستی، تەندروست ، سازگار، گونجاو لەبار ، سووك ، سوودمەند
**صَحِيح:** تەواو، ساخ، رەوا، راست، راستەقینە، تەندروست، چاك، باش، گونجاو، راستو رەوان، یاسایی و دروست
**صَحِيحُ الجِسم:** لەش ساخ، تەندروست باش ، خاوەن لەشو لاری ساغو بەتەندروست

**صَحِيرَة:** شیرەوا ، شیر برنج ، شۆربای ساوەر
**صَحِيف:** رووی زەوی ، رووی پێستی جەستە
**صَحِيفَة:** لاپەرە ، روو ، رۆژنامە، نووسراوێکی چاپکراوە رۆژ بەرۆژ دەنگو باسی ناوەوەو دەرەوە بڵاوو پەخش دەکات ، رۆژنامچە

**ص خ**

**صَخَاب:** دەنگ زل ، قیژن ، هەر دەقیژێنێ، دەم بەهاوار ، قیژەکەر
**صَخَبَ(صَاحَ شَدِيداً):** قیژانی، هاواریکرد، نەرانی، قیراندی، هاواریکرد
**صَخَب(صِيَاح):** قیژە ، قاووقیژ، هاوار، ژاوەژاو، هەلا، هەرا، هەراو هوریا، دەنگە دەنگ، غەڵبە غەڵب
**صَخِبَ:** بەتوندی هاواریکرد، توند قیژاندی، بەتیژی نەراندی، بانگی فریاگوزاری کرد
**صَخَبَان:** قیژەکەر، هاوارکەر، نەرە نەرکەر، یەکێك زۆر هاوارو قیژە بکات
**صَخَدَتْهُ الشمس:** خۆر بردی ، رۆژ بردیو هەڵی قرچاند، سووتاندی
**صَخَدَ اليَوم:** گەرماکەی تاوی سەند، گەرماکەی هاتە جۆشو تین
**صَخْر - صَخْرِيّ:** بەردەلان ، هەردە ، بەردەلێن، زبران ، گەرگەر، شوێنێکە بەردی زۆر بێت
**صَخْرَة - صَخَرَة:** بەردێك ، تاوێرێك، حەلانیك، تاشێك
**صَخرَةٌ كَبِيرَة:** تاشە بەردێکی گەورە، گابەردێکی زلە ، تەلەبەردێکی گەورەو زلە

**صَخُوب**: هاوارێکی بەرزو بڵنـد، قیـژەی گەورەو بەرز

**ص د**

**صَدَّ**: بەریگرت ، ڕێی گرت، بەربەستی بۆ دانـا ، کۆسـپی خسـتەبەردەمی ، بەرهەڵسـتی کـرد، بـەرگری کـرد، بەرپـەرچی دایـەوە، نکووڵیو نـاڕەزایی لێدەبڕی

**صَدَّ عَنهُ**: رووی لێ وەرگێڕا، خۆی لێ لادا

**صَدَّ فُلانَاً عَـن كَـذَا**: دووری خسـتەوە، نەیهێشت ، ڕێگری لێکرد

**صَدَّ السَبِيل**: ڕێگەی گرت ، ڕێی نەدا، ڕێی بەست

**صَـدَّ ـ صُـدَّ**: بـارکردن ، ڕۆیشـتن ، بەجێهێشـتن ، لا ، تەنیشـت ، ئاوەڕۆیەك ئاوی پێدا بڕوات ، ڕێگرتن، بەرهەڵسـتی ، بـەرگرتن، بـەرگری ، بەرپەرچدانەوە، سەندنەوە

**صَدَى بِيَدَيه**: چەپڵەی لێدا ، چەپڵـەی کوتا

**صَدَى**: زۆری تینوبوو، زایەڵە، وڵنگـە ، دەنگدەرەوە ، دەنگدانـەوەی دەنگێك لـەمیانی شـاخو دۆڵێکـدا ، مێشـك ، کرۆکی مێشكو سەر، جەسـتەی مـرۆڤ دوای مردنـی، جـۆرە ماسـیەکە ، باڵندەیەکی ئەفسانەیە دەڵێن لەسـەری کەسـی کـوژراو دروسـت دەبێـتو بـەردەوام هـاواری تۆڵـە وەرگرتنـی خوێنەکـەی دەکـات ، جۆرێکـە لەکونەپەپوو

**صَدَاح**: گۆرانی بێـژ، بێژەر، شـایەر، شایار، دیلانەبێژ، گۆرانی بێژی شایی

**صُدَاد ـ صَدَائد**: مار ، کرمێکی پچووکە

**صدَار**: یەلـەگ، سـوخمە ، پەچەتـە، سینەبەرە، ئێلەك، سوخمەی ئافرەتان

**صَـدَارَة**: پێشـکەوتن ، پێشـەنگی، لەپێشـەوە بـوون ، پۆسـتی پێشـەنگو فەرمانداریی

**صَدَارَة( عِنْدَ النُحَاة )**: لای ڕێزمانەوانان بریتیـە لەوشـەیەك کـەوا لەپێشـەنگو سـەرەتای ڕسـتەدا بێـت وەك(أسْـمَا الإسْتِفهَام)

**صُـدَاع**: سەرئێشـــە ، ژانەســـەر، سەراسـێ، ژانو ئازارێکـە لەسـەرا دروست دەبێت

**صُدَاغ**: نەخۆشی ژانەسەر کـەوا دەدات لەسەرو مەردوم پێوەی گیرۆدە دەبێت

**صدَاغ**: تایبەتمەندییەکی لاجانگە

**صَدَاق ـ صَدَاق**: مارەیی، زێڕێکە یا زیبو یاشتێکی ترە کەژنی لەسەر مارە بکرێ

**صَدَاقَـة**: هاوڕێیـەتی ، هـاوەڵی، برادەریـی، خۆشەویسـتیو دڵسـۆزی، دۆستایەتی ، خۆشەویسـتی بەڕاسـتیو لەناخەوە ، یەکانگیریی

**صِدَام**: نەخۆشیو ناسـاغیەکە دەدات لەسەری وشترو پەرێشانی دەکات

**صُدَام**: بـارو حاڵێکـە مـرۆڤ لـەبیریا هـەلێدەگرێو بـەردەوام بـیری لێدەکاتەوە

**صَـدَاُ الحَدِيـدُ**: ژەنگـی هەڵـهێنا، ژەنگیکـرد، ژەنـگ توێـژی بەسـت بەسەریەوە

**صَدَأ ـ صَدَاءة( تَاكُسُد ):** ژەنـگ، ژەنـگ گرتن، ژەنگ هەڵهێنان، ژەنگار، خۆرە، خۆسـەرە، خـــوورك، لەئاســنو پـۆڵاو هەموو جۆرە كانێك دەداتو رەنگیشـی سوورێكی كاڵە
**صُدْأةٌ:** رەنگی ژەنگ كەسوورێكی كاڵە
**صَدَأهُ:** ژەنگەكەی لابرد، كڕاندی ، لێی كردەوە
**صَدِيءَ ـ صَدُدَ:** ژەنگی گـرت ، ژەنگـی هەڵهێنا، ژەنگاوی بوو
**صَدِيءَ فُلاَن:**خـاوبووەوە، سسـت بـوو، ساردی هات بەسەریا
**صَدِيءُ القَلْب:**سەرزەنشتی شوێنكەوت، گلەییو گازندەی دواكەوت
**صَدَحَ( غَنَّى ):** گۆرانـی وت ، دەنگـی لێ هەڵبڕی
**صَدَحَ:** تەپكەو گردێك بەردی سـەختو گران بێت
**صَدَحَ:** ئـالآ، بــەیداخ، چـۆڵ، خـاڵی، بەتاڵ
**صَدَحَت المُوسِيقَى:**مۆسیقا لێ درا ، ژەنرا
**صَدَّدَ الجُرحُ:** كێمی تێزا، زوخاوی كرد، كێمیكرد
**صَدَد:** بۆنە، بـارە، مەبەسـت، ئامـانج، روەو، بەرانبەر، پێش، نزیك، رووبەڕوو
**صَدَدَ الأَمر:** روویـدا ، فـەرمان دەركـرا، قەوما، كەوتەوە
**صَدَرَ عَنْهُ:** لێـی وەشـایەوە، لێـی كەوتەوە
**صَدَرَ عَنِ المَكَـان وَعَــن المَــاء:** لێـی گەڕایەوە، لێی هاتە دواوە

**صَدَرَ إلَـى المَكَـان:** چـوو بـۆی ، رووی تێكرد، روەو ئەوێ چوو
**صَدَرَ الرَّجُلُ عَنْ كَذَا:** گەڕاندیەوە، دایە دواوە، پاشەكشەی كرد
**صَدَرَ مِنْهُ:** لێـی دەركـەوت ، لێـی وەشایەوە، ئاشكرابوو لێی
**صَدَّرَ( أرْسَلَ ):** نـاردی ، رەوانــەیكرد، دەستی پێوەنا
**صَـــدَّرَ الكِتَـــابَ:** ژمــارەو بـــەرواری خستەسەر، سەرەتاكەی دەست پێكرد بە ..
**صَدْرُ الفَــرَسُ:** سـینەی پێشخســت ، سینەوسەری پێشخستو پێشیانكەوت
**صُدِرَ:** هاواری سنگیكرد، ئێشو ژانـی سنگی بەدەرخست
**صَدْر:** سنگ، سـینە، سینەك، سـینگ، سنگیگیاندار، مەمك، مەمكۆڵە، سنگو مەمك
**صَدْرُ الثَّـوب:** پێشـەكەی ، پێشـەوەی، لای پێشەكەیەوە
**صَدْرُ الشَّـيءِ أو المَكَـان:** سـەرەتاكەی ، پێشـەكەی ، بەشـی پێشـەوەی ، رووی پێشەوەی
**صَدْرُ القَوم:** دەم راستیان، پێشەوایان، سەرۆكیان، پێشەنگیان، سەركاریان
**صُـــدْرَةٌ:** بەروانگـــە، ســــینەبەند، ســنگپۆش، پێــش دامێــن، وەریەقــە، وەروانــە، وەروانكــە، بەرهەڵبێنـــە، بەرسـینگەی منـــاڵان یـــان ئەوانـــەی خزمەتو كاروفرمانی جیاواز دەكەن
**صُدْرَةُ مِنَ الإنْسَان:** سینەی مـرۆڤ یـان رووی سەرەوەی سنگی

**صَدْرِيَة:** مەمکدان، مەمکەبەند، شتێکە دەخرێتە هەردوو مەمکـەوە لەپشتەوە دەبەسترێ بۆ ئەوەی کۆی بکاتەوە

**صَدَعَ ـ صَدَّعَ:** شـەقیکرد، شـکانی، دایهێنا، وەبەری هێنا، هێنایە بوون

**صَدَعَ القَوم:** بـڵاوەی پێکـردن، تـەفرو تونایکردن، پەرەوازەی کردن، پەرتو کەرتیکردن، پەرتەوازە بوون

**صَدَعَ إِلَى كَذَا:** لاربوەوە، نـەویبوو، دابەزی

**صَدَعَ الأَمْر:** ئاشـكرای كـردو روونـی كردەوە، تیشکی خستەسەر

**صَدَعَ بِالحَق:** راسـتی وت، دركـانی، دانی پیانا، پێی لێنا، چوەژێری

**صَدَعَ النَّبَاتُ الأَرْضَ:** زەوی لـەتکردو سەری دەرهێنا، سەری هەڵدا ، نـەش و نمایکرد

**صَدَعَ الزُّجَاجَ وَنَحْوَهُ:** شـکاندی ، لەتیکرد ، وردو خاشیکرد

**صَدَعَ الأَمْر بِالحَق:** جیـایکردەوە، مابەینیکرد

**صَدَعَ اللَيلُ:** شەو رۆیی، تێیدا رۆیشت

**صُدِعَ ـ صُدِّعَ:** سـەری هاتـە ئێـش، تووشی ژانەسەر بوو

**صَدَّعَ الشَّيء:** درانـدی، کـەرتیکرد، لەتیکرد

**صَدَّعَ الفَلاَةَ أَو النَّهْر:** بریی، کەرتیکرد، گوزەرانی، بیابـان یـاخود رووبارەكـەی بڕی

**صَدْع:** قڵیشاوی، قڵیش ، درز، قڵیش ، قەڵەش، قەڵەشت، درزبردنی شت

**صَدْع:** پیـاوی ئـەندام بـاریكو كـەم گۆشت، لاوی بەهێزو پتەو

**صَدْعٌ:** كۆمـەڵێك لەخـەڵكی، نیـوەی شتێكی كەرتكراو

**صَدْعَة:** نیـوەی شـتێكی لـەتكراوو درز بردوو ، رەوگە وشتر، جڵەوە ئاژەڵێك

**صَدَغَ إِلَى الشَّيء:** روویـەوبوو، ئـالوودەبوو، سـەربەوبوو، لاربـوەوە بەلای ئەوا

**صَدَغَ عَن طَرِيقَة:** لایـدا لێـی، دووركەوتـەوە لێـی ، تـرازاو پەراگەندەبوو لێی

**صَدَغَ فُلاَنَاً:** لارو لەوێری راسـتكردەوە، رێكیكردەوە

**صَدَغَ فُلاَنَاً عَنِ الأَمْر:** لێـی دوورخستەوە، پەراگەندەی كرد لێی، پەرتەوازی خست

**صُدْغٌ:** لاجـانگ، جینـك، جینـوك، نێوانی گوێچكەو چاو

**صَدُغَ الرَّجُل:** لاوازبـوو، كـەم توانـابوو، لەرو كەم گۆشت بوو

**صَدَغَ:** لاری ، خـواری، لارولـەوێری، نارێكی ، چەوتی

**صَدَاغَة عَنِ الأَمْر:** دووری خسـتەوە لەوكارە، بەدووری گرت لێی

**صَدَفَ:** لایدا ، دووركەوتـەوە، تـرازا ، لەرێ دەرچوو

**صَدَفَ عَنْهُ:** رێگریكـرد، نەیهێشـت، رێی نەدا ، كۆسپی دانا لەبەردەمیدا

**صَدَفَ فُلاَنَاً:** دووری خسـتەوە، لایـدا، ترازاندی

**صَدَفَ عَن كَذَا:** دەسـتی هـەڵگرت، وازیهێنا، سڵەمیەوە، راچڵەكی

**صُدَاف:** گیاندارێكی دڕندەیە

**صَـــدَف:** مێلکـــه شـــەیتانۆکه ، لا ، تەنیشت ، لەپکه

**صَدَفٌ:** ڕێکبوونەوەی یەکێك لەلاقـەکان لەگـەڵ ئـەوی تـرا لـەکاتی ڕۆیشـتندا ، هەرشـتێك بـەرزو بـالآرێك بێـت وەك شاخ و..، قەراخ

**صَدَفـا الجَبَـل:** ئـەملاولای دووشـاخ کەبەرانبەر بەیەك بوەستنەوە، دوو لای ڕووبەڕوو بەرانبەر بەیەك

**صُدْفَة:** ڕێکـەوت ، هەڵکـەوت، هـەل ، لـەخۆوە ، هاتنـە ئـارای ڕووداوێـك بێئەوەی وادەو کـاتی بـۆ دانرابـێ یـان دەستنیشان کرابێت

**صَدَفَةُ الأُذُن:** کرکراگەی گوێ

**صَدَفَةُ السُّلَّم:** پێچی پلیکانە، تەختایی پلیکانە

**صَــدَقَ:** راســتیکرد، راســتی وت، راستگۆبوو، بەگفت بوو

**صَدَقَ فـي وَعْـدِه أو وَعِيـدِه:** پـەیمان راسـت بـوو، لەپـەیمان و بـەڵێندا راستگۆبوو، پەیمانەکەی بردەسەر

**صَدَقَ قَولُـهُ أو ظَنُّـهُ:** راسـت بۆیچـوو، بۆیچوو

**صَـدَقَ النُّصْـح أو الحُـبّ:** دڵسـۆزبوو، ئەمەکداربوو، راستیکرد لـەئامۆژگاری و دڵداری و خۆشەویستیدا

**صَدَقَ فـي الحَمْلَة:** دلێرو دانـایی تێـدا دەرخست

**صَدَقَ فِي القِتَال ونَحوه:** بەهێزو پتـەو ڕووبـەڕووی چـوو، بـەهێز بـەرەنگاری بوەوە

**صَدْق:** تەواو، کـامڵی هەرشـتێك، رەق و سەخت

**صَدَقَ الخَبَر أو الكَلَام:** بـڕوای پێکـرد، بـاوەڕی پێکـرد، پەسـەندی کـرد، سەلماندی ، چەسپاندی

**صِدْقٌ:** راستی، دەستپاکی، راستگۆیی، پـاکێتی، پـاکیزەیی، پیـاوەتی، چاکەکاریی، ئەمانەتداریی، دروستی

**صَدَقَــة:** خـێر، بەخشـندەیی، دەستگیری، خێروچاکەداریی

**صَدُقَة:** مارەیی ، مارەیی ژن، زێڕێکـه یا زیـو یاشتێکی تـره کـەژنی لەسـەر مارە بکرێ

**صَدَقَهُ الحَدِيث:** راسـتگۆبوو لەگـەڵیی، راستیکرد، قسەکانی مۆرکـی راسـتیان هەڵگرتبوو

**صَدَمَ:** خۆی پیـادا، بەرێکـەوت ، پـاڵی پێوەنا، خۆی پیاکێشا

**صَـدَمَ الشَّيءَ:** پـاڵی پێوەنـا ، فشاری خستەسەر

**صَدَمَ النَّازِلَةُ فُلَاناً:** لەناکاو هاتەرێی، کتوپڕ ڕوویداو هات بەسەریا

**صَدْمَـة:** لێکـدان، کۆسـت، کۆسـپ، خوریە، شڵەقان، مەینەتی، نەهامەتی، دەردەسەریی

**صَدْمَـةٌ عَصَبِيَـة:** مێشـکه خوریـه، لەمێشـکدان، خوریەیـەك یـان نەهامەتییەك ڕوودەکات لەمێشك

**صَدْمَتَـان ـ صَدمَتَـان:** ئـەملاولای بەرەیـەك، هـەردوولای گۆرەپـان و شوێنێك

**صَـدُوح:** دەنگو ئاواز، هـاوارو دەنـگ بەرزکردنەوە

**صَدُود:** فێڵبازی گوتە مەحاڵ، سورمە، کل کەلەچاو دەکرێت

**صَدُوف**:یەکێك زۆر نارەزایی دەربېرێت، نـاڕازی، ناقــایل ، ژنێـك رووخســاری دەربخـات بــۆ بینــەران و دواتــر روو وەربگێڕێ ، بۆگەنی نێو دەم

**صَدُوق**: هەمیشە راستگۆ، راستاڵ

**صَدِي**: زۆرتینوبــوو، تەژنــە، یــەکجار تینووی بوو

**صَدْیَان**: تینوو، تەژنە، پێویســتی هــەر گیاندارێك بەئاو

**صَدِید**: کێــم، زوخ، زوخــاو، زامــەت، کێم و زوخمی تێکەڵ بەخوێن، خۆراکــی دۆزەخیەکانە لەرۆژی قیامــەتدا ، ئـاوی گەرم و لەکوڵ

**صَدِیــع**: نیــوەی شــتێکی لــەت و کــەرتکراو، پارچەیــەك لەشــتێکدا کەبووبێت بەدوو کەرتەوە

**صَدِیغ**: لاواز، کز ، مەردومی لاوازو کەم توانـا، منـاڵێك ســێ رۆژ بێـت لــەدایك بووبێت

**صَدِیــق**: هــاوڕێ، هــاوەڵ، بــرادەر، دۆست، یار، دۆستی بەسۆزو ئەمەکدار

**صِدِّیــق(بــار)**: راســت ، راســتاڵ، راستگۆ، دڵسۆز ، دۆستی ئەمــەکدار، یــەکێك لەگوتــەکانیدا راســتگۆبێت و بەکردەوەش بیســەلمێنێت، چاکەکاری بەردەوام

**ص ر**

**صَرَّ(حزَمَ)**: پێچایەوە، بەستی، گرێیدا، گورزەی کــرد، کــردی بــەنێو یــەکا ، هەڵیگرت

**صَرَّ الدَّرَاهِـم فــي الصُّـرَّة**: دراو یــان درهەمەکانی خستە نێو تورەکەکەوە، هاویشتیە ناو تورەکەکە

**صَــرَّ الفَـرَس أذُنَــهُ وَبِأُذُنِــه**: گـوێی رەپکرد بۆ گوێگرتــن ، گوێچکــەکانی رەق کرد گوێ بگرێت

**صَرَّ النَّاقَــة وَبِالنَّاقَــة**: گوانی بەست هەتا بەچەکەکانی شیرەکەی نـەخۆن ، گوانــی هەڵبەســت بەتورەکەیـــەك بۆئەوەی شیرەکەی نەخورێت

**صَرَّ الشَيء( صَوَّتَ )**: دەنگــی لێوەهات، چپەی هات ، زیقەی هات

**صَرَّ البَابُ**: جیرەی هات، جێرەجیرەی لێوە هات

**صَــرَّ الرَّجُـل**: بــەتوندی هــاواریکرد ، تینوبوو

**صَرَّ الأُذُن**: زرنگایەوە، دەنگی دایەوە

**صَرَّ الأسْنَان**: دانەکرەیکرد، دانـی لێك خشا، جیرەی هات

**صُرَّ النَّبَاتُ**: سەرما لێیدا،سەرما بردی

**صَرّ**: جیرەی دەرگا، کرەی دەرگا

**صِرّ**: سەرما، سەردی، سـۆڵە، سـەرماو سـۆڵە، واژوی گەرمایـــە، کــــەناری ، قـــەناریی، کـــەنارە، باڵندەیـــەکی دەنگخۆشی گچکەیە

**صِرَّی**: سوربوون لەســەر کارێك، پشت ئەستوربوون و بـەردەوام بـوون لەســەر فرمان و کارێك

**صُــرَاح ـ صِــرَاح**: پـــاك و پوختـــی هەرشتێك، پاڵفتـە، پوختـە، ئاشــکرا، روون، لەروو، ئاشکراتر

**صَرَاحَة**: روونـی، ئاشـکرایی، ئاشــکرا بێژی، لەروایەتی، دڵسۆزی

**صُرَاحِيّ**: ئاشکرا، لەروو، دیار ، بەرچاو

**صُرَاحِيَة ـ صُرَاحِيَة:** شووشەی مەی، سوراحی، دەفرێکی شێوە لوولەکی‌یەو ئاوو شلەمەنی تێدەکرێ
**صَرَّاخ:** هاوارکەر، قیژەکەر، تاووس، داووس، باڵندەیەکە پەڕەکانی هەموو جۆرە نەخش‌و رەنگێک دەنوێنێ بەلآم لاقی زۆر رەشە
**صُرَاد:** هەوری بێباران، تەنکە هەور، هەوری دوورە باران
**صِرَار:** شوێنێکی بەرز کەوا ئاوی پێ نەگات، تورەکە بەندی گوان، تورەکەیەکە دەکرێتە گوانی ئاژەڵ بۆئەوەی بەچکەکانی شیرەکەی نەخۆن
**صَرَّارُ اللَيل:** سسرک، مێشەسەگانە، سیسرە،دەعبایەکی زەردی پچکۆلانەیە وەکو کرم وایە بەقەڵەمباز دەڕواو زیانبەخشەو دەنگێکی هەراسانکەر دەخاتەوە
**صَرُورَة:** ئەوەی حەجی نەکردبێت‌و ژنیشی نەهێنابێت
**صَرَّارِيّ:** کەشتیەوان، دەریاگەڕ، دەریاوان، کەشتیدار، کەسێك سەرپەرشتی بەڕێوەچوونی کەشتی بکات
**صُرَاط:** شمشێرێکی برندەی درێژ
**صِرَاط:** رێگە، رێباز، شارێ، رێگەیەکی رەوان‌و دروست
**صِرَاع:** رقەبەرایەتی، کێشمەکێش، زۆرانبازیی، ململانێ، رکابەری‌کردن، بەربەرەکانی
**صُرَاعَة:** ئەوەی خەڵکی تووشی فێڵ‌و حاڵ‌و بارێکی نائاسایی دەکات

**صِرَاعَة:** پیشەی زۆرانبازیی، زۆرانبازیی
**صَرَّاف:** زمێریار، قاسەوان، سندوقدار، بەرپرسی دارایی
**صَرَّافُ النُقُود:** دراوگۆڕ ، ئەوەی دراوو پارە دەگۆڕێتەوە
**صُرَّام:** ناوێکە لەناوەکانی جەنگ‌و شەڕ، بەلآو نەهامەتی، شەڕو ئاژاوە ، ئاشووب
**صَرَامَة:** تیژی، توندی، زەبرو زەنگ، توندوتیژی، غیرەت، کۆڵنەدان، سوربوون، بەردەوام بوون
**صُرَّة:** بوخچە، تورەکە، پریاسکە، گورزە، پێچراوە، توورك، جۆرك، تۆربە، جوهوور، جۆرکێکە هەڵدەدروێت بۆ شت تێکردن
**صُرَّةُ النُقُود:** تورەکەی پارە، کیسەی پارە
**صِرَّة:** سەرما، سەرماوسۆڵە، ساردی، هاوارو دەنگێکی بەرزو توند
**صَرَّجَ الحَوضَ:** هەڵی‌سوو، سپی‌کاری تیاکرد، ساف‌و لووسی کرد
**صَرَّحَ:** دەریخست، ئاشکرای‌کرد، رووونی کردەوە، تیشکی خستەسەر
**صَرَّحَ الأمرَ:** رووونی‌کردەوە،ئاشکرای‌کرد
**صَرُحَ:** دەرکەوت، ئاشکرابوو، کەوتە روو، بەدەرکەوت، هاتەڕوو، رایگەیاند، دەریبڕی، ئاشکرای کرد
**صَرَّحَ المُتَكَلِّم:** ئاشکرای کرد، وتی، رایگەیاند، بێ‌پێچ‌و پەنا خستیە روو
**صَرَّحَ بِمَا فِي نَفْسِه:** ئەوەی لەنێو ناخ‌و دەروونیا بوو بەدەریکرد

**صَرَّحَ النَّهَارُ:** هەورەكەی رەوییەوە، تیشكی خۆر بەدەركەوت

**صَرَّحَ الخَمْرُ:** كەفەكەی نیشتەوە، كەفی سەری رەوییەوە

**صَرَّحَ السَنَةُ:** وشكە سالبوو، قاتو قڕی بوو، بێبارانو بەرویبووم بوو

**صَرَّحَ الرَّامِي:** هاویشتی بەلام نەیپێكا، تێی گرتو لێی نەدا

**صَرُحَ(كَانَ صَرِيحاً):** لەپروبوو، دەركەوت، روون بوەوە، ئاشكرابوو، روو بەرووبوو

**صَرْح:** كۆشك، سەرا، تالار، تەلار، باڵەخانە، سەراپەردە، تاق، بانهەڵبان، خانووی بەرزو خۆش، هەور قۆچ، كۆشكی بالا

**صَرَح:** پوختەو پاڵفتەی هەرشتێك

**صَرْحَة:** جارێك، كەرەتێك ، رایەك، دەمێك، تاوێك، كاتێك

**صَرْحَةُ الدَّار:** گۆرەپانی حەوشەكەی، بەرماڵ، ساحەكەی ، ئەوزەوییەی بەردەمی ماڵ یان دەورو پشتی

**صَرَخَ:** قیژانی، هاواریكرد، نەڕاندی، هاواری لێبەرزبوەوە، داوای فریاكەوتنی كرد

**صَرَخَ القَوْمَ:** فریایان كەوتو یارمەتیدان

**صَرِدَ:** ساردبوو، سەرماو سۆڵەبوو

**صَرِدَ الرَّجُلُ:** بەسەرما قایم بوو، سەرمابردەڵەبوو( لەوشە دژەیەكەكانە)

**صَرِدَ السَهمُ:** مەڵەیكرد، نیشانی نەپێكا، ترازا، لایدا لەمەبەستی

**صَرَدَ الرَّامِيُ السَهمَ:** نیشانەگەرەكە لەنیشانەكەی نەدا، ترازا لێی، لایدا ، سەریكرد

**صَرَدَ الشَيءَ:** بڕی، لەتیكرد، پارچە پارچەی كرد

**صَرَّدَ العَطَاءَ:** كەمی كردەوە، لێی كەمكرد، كەلیكرد، هەندیكرد، كەمكەم پێی بەخشی ، نەختالو تۆزە تۆزە پێی دا

**صَرْد:** سەرمابردەڵە، بەسەرما قایم(لەوشە دژەیەكەكانە)

**صَرْد:** پاكو پوختی هەرشتێك، شوێنێكی بەرزو بالا لەچیاو شاخدا، سوپایەكی مەزنو بێشومار ، سەرما

**صَرَد:** سوپایەكی مەزنو بێشومار، بزمارێكە سەرەنێزەی پێ تۆكمەو چەسپاو دەكرێ

**صُرَد:** باڵندەیەكە سەری گەورەیەو ژێرسكی سپییەو سەرپشتی سەوزەو پەلەوەری پچووك راو دەكات

**صُرْدَان:** دووڕەگی ژێر زبانە

**صَرَّ:** گوێی هەڵخست، گوێی گرت، گوێ قولاغ بوو، گوێی قوتكردەوە

**صَرَّ الصُرَّةَ:** بەستی، پابەندیكرد، بەستیەوە

**صَرَّ أُذُنَهُ:** گوێی هەڵخست، گوێیگرت

**صَرَّ- صَرَّةً:** گولەكەنم پاش دوورینەوەی

**صَرَّتِ النَاقَةُ:** پێشكەوت، لەپێشەوە رۆیی، پێشڕەویی كرد

**صَرصَرَ(صَوَّتَ):** دەنگی لێوەهات، جیڕەی هات

**صَرْصَرَ الرَّجُل:** بەتوندی هاواریکرد، توند قیژاندی، نەڕاندی
**صَرْصَرَ الشَيء:** کۆی کردەوە، ئەوەی پەرتو پەخش بووبوو جەمیکرد
**صَرْصَرٌ مِنَ الرِيَاح:** بایەکی توندو زۆر سارد
**صُرْصُر ـ صُرْصُور:** سیسرك، جانەوەرێکی قەڵەمبازدارەو شەوان زیکە زیك دەکات
**صَرَعَ:** دای بەزەویدا ، کوتای بەزەویدا، تەختی کرد، ترساني، تۆقاندی، خورپەی هێنا بەبەریا
**صَرَّعَ البَابَ:** کردی بە دووتاك، دووتاکی کرد، دوولاییکرد
**صُرِعَ:** فێی لێهات ، تووشی پەرکەمبوو، پەرکەمی لێهات، خزاو کەوت بەزەویدا، ناپاکی کرد
**صَرْع:** فێ، پەرکەم، گەشکە، جۆرە نەخۆشیەکە کتوپڕ تووشی هێندێ کەس دەبێو کەف دەچنێو بێهۆش دەکەوێ
**صَرْع:** کەوتن ، کەوتن بەزەویدا، ژێرکەوتن، دران بەزەویدا ، وەکو ، هاوچەشن ، وەك یەك
**صَرْعُ الشِعْر:** نیوە دێڕ لەهۆنراوەدا
**صَرَع:** هاری، کرەز، گیاندارێکە تووشی دەردی هاریی بووبێ، گیانداری بزێو
**صُرْع( عِنَان ):** جلەو، دەستەوجڵەو، دەستەرەشمە، دانەلغاو، جەڵەو، هەوسار،هەفسار،قەوچە، دەستەجەڵەو
**صَرْعَان:** شەوورۆژ، بەرەبەیانو ئێواران

**صُرْعَة:** تەپو کۆ، یەکێك زۆر بکەوێتو هەڵبسێتەوە
**صَرَفَ:** دووری خستەوە، پاڵی پێوەنا، بەتاڵی کردەوە، هەڵی وەشانەوە، دەریکرد، دەستی پێوەنا، ڕەوانەیکرد
**صَرَّفَ الدَنَانِير:** وردی کردەوە، گۆڕیەوە، ئاڵو گۆڕی کرد
**صَرَفَ المَال:** خەرجیکرد، سەرفیکرد
**صَرَفَ عَنْهُ:** وازی لێهێنا، لێی دوورکەوتەوە
**صَرَفَ عَنِ الرأيِّ:** پەشیمان بووەوە، پاشگەزبووەوە، ژیوان بووەوە
**صَرَفَ النَظَر عَنْ( تَغَاضَى عَنْهُ ):** چاوی لێ پۆشی، پەڕاني، گوێی نەدایە، هەڵی بوارد
**صَرَفَ البَابُ:** جیڕە جیڕیکرد، جیڕەی هات
**صَرَفَ الأسْنَان:** دانەکرپیکرد، دانی لێك خشا، دانەجیڕەی کرد
**صَرَفَ الوَقْت:** کاتی بەسەربرد، وەختی کوشت، کاتی گوزەراند
**صَرَّفَ الكَلِمَة:** سەروبۆری بۆ کرد
**صَرَّفَ الفِعْلَ:** فرمانی خستە دۆخەکانیەوە،کاری خستەدەمەکانیەوە
**صَرَّفَ الشَرَاب:**بێئاوو سادە خواردیەوە
**صَرَّفَ الشَيء:** فرۆشتی، پاڵی پێوەنا
**صَرَّفَ الدَرَاهِم:** گۆڕیەوە ، ئاڵوگۆڕی پێکرد
**صَرَّفَ الخَمْرَ:** خواردیەوە بەبێ تێکەڵکردنی بەهیچ شتێك
**صَرَّفَ الكَلاَم:** هەندێکی لەهەندێکیتر دروستکرد، هەندێکی لەویتر پێکهێنا

**صَرَّفَ المَاءَ:** رشتی، رۆیكرد، قلْپیكردەوە، بەتاڵی كردەوە، رایكێشا
**صَرَّفَ الرِّيَاحَ:** لەلایەكەوە گواستیەوە بۆ لایەكیتر، گۆڕی لەلایەكەوە بۆ لایەكی تر
**صَرَّفَ فِي الأمْرِ:** بەرەو رووی كردەوە، پشت ئەستووری كرد
**صَرَّفَ عَنْ كَذَا(تَخَلَّى):** وازی هێنا، دەستی لێهەڵگرت
**صَرْفٌ:** زانیارییەكە لەچۆنیەتی رێكخستنی وشەی عەرەبی‌و چۆنیەتی دەكۆڵێتەوە، وتەسازكردن
**صَرْفٌ(فِي الإقْتِصَادِ):** لەئابووریدا بریتیە لەگۆڕینەوەی دراوی نیشتمانی بەدراوی بیانی
**صَرْفُ الدَّهْرِ:** ناڕەحەتیەكانی سەردەم، كۆست‌و نەهامەتیەكانی رۆژگار
**صِرْفٌ:** پوخت، رووت، پاك، پاڵفتە، سادە، بێ‌ئاو، پوختە، روون، شتێك هەر خۆی بێت‌و تێكەڵ بە هیچ نەبوبێت
**صَرْفَانِ ـ صِرْفَانِ:** شەوورۆژ
**صَرْفَةٌ:** یەكێك لەپلەكانی مانگە، جارێك، كەرەتێك، مت‌و مورویەكە بۆ پاراستن لەچاو نەفەسی پیس، سەختی رۆژگارو سەردەم، بریتیە لەوەی وشترێك بەیانی زوو بدۆشرێ ئەوجا وازی لێ بهێنرێ هەتا بەرەبەیانی رۆژی دوایی
**صَرَمَ:** بەزەبرو زەنگبوو، توندو تیژبوو، رەق بوو
**صَرَمَ الحَبْلَ:** پچڕا، لەبەریەك بڕا، لەیەك ترازا

**صَرَمَ الشَّيءَ:** بڕی، كەرتیكرد، پارچەپارچەیكرد، لەت لەتیكرد
**صَرَمَ فُلاَنَاً:** بەجێی هێشت، لای جێهێشت، دووركەوتەوە لێی، پشتی تێكرد، قسەكانی بڕی
**صَرَمَ فُلاَنٌ عِنْدَنَا شَهْرَاً:** مانگێك لامان مایەوە، مانگێك هەڵیدا لامان
**صَرُمَ السَّيفُ:** تیژبوو، بڕندەبوو، بەزەبربوو
**صَرُمَ الرَّجُلُ صَرَامَةً:** توندبوو، تیژو سووربوو، بەردەوام بوو لەسەر كاری خۆی
**صَرَّمَ:** بڕی، پچڕی، قرتاندی، پسانی، لەیەكی بڕی
**صَرْمٌ:** پێست، پۆس، پۆسە، ئەیار، ئاڤار، گوویێن، چەرم، وڵك، لۆنگ، كەوڵ، چڤلین
**صِرْمٌ:** كۆمەڵ، تاقم، گرۆهـ، كۆمەڵە خانوو ماڵێك، پێڵاوە كۆن، سۆل، چەكەپێڵاو
**صُرِمَ:** مرد، رۆژی تەواوبوو، تیاچوو، لەناوچوو، بەلادا هات، تونا‌و توون چوو، نەمان، كۆتایی هاتن بە ژیانی سەرزەمینی یەكێك
**صُرْمٌ ـ سُرم (طَرَفُ المِعيِّ المُسْتَقِيم):** كۆم، پدو، پندۆك، قوون، ئەندامی شەرمی مرۆڤ
**صَرْمٌ(قَطْعٌ):** برین ، قرتاندن، پسان، پچڕان، پەلكردن، قەدكردن، پارچەكردن، كەرتكردن، برهین، قەتاندن، فەژیلاندن، ژێكرن، بەمشارو چەقۆو شتی تیژ دارو شتیتر دەبرێتەوە

**صَرْمَاء**: وشتری کەم شیر، بیابانو چۆڵەوانیەکی بیئاوو تەڕایی
**صِرْمَة**: جۆر، چەشن، شێوە، جلەوە وشترێك یان گەواڵە هەور یاخود پارچە زیوێك
**صُرْنَايَة**: زوڕنا، زڕنە، زڕنا ، ئالەتێکی مۆسیقیەو فووی پیا دەکرێتو دەنگێکی زیقنی لێ پەیدا دەبێ
**صُرُوحَة**: پاكو پوختی هەر شتێك ، پاڵفتەی هەرشتێك
**صَرُور**: بێژن ، رەبەن، زگوورت، سەڵت، تەنیا، پیاوێك هاوسەرو هاوبەشی ژیانی نەبێت
**صَرُورَة**: وازهێنان لەژنهێنانو حەجکردن بۆ تاكو كۆش بەكار دەهێنرێ
**صُرُوف الدَّهْر**: نارەحەتیەکانی رۆژگار، نەهامەتیەکانی سەردەمو چەرخ
**صَرُوم**: شمشێرێکی برەبڕو تیژ، بڕندە، تیژ
**صَرِيّ**: پاشماوە، پاشەبەرە
**صَرِيَ الشَّيء**: دووری خستەوە ، پاڵی پێوەنا
**صَرِيَ القَوْمُ**: پێشیانکەوت، بەرلەوانکەوت
**صَرِيح**: ئاشکرا، روون، لەروو، مەردومی پاکیزەو پوخت
**صَرِيحٌ بِذَاتِه**: بەڵگەنەویست ، شتێك خۆی روون بێتو پێویست بە بەڵگەنەکات
**صَرِيخ**: هاوارکەر، قیژەکەر، فەریادو ئامانکار، دادو فووغانو رۆرۆکار

**صُرَيْدَ**: هەوری بێباران، تەنکە هەور، هەوری دووره باران
**صَرِيدَة ـ صَرَائِد**: مەرێك سەرما کزو لاوازی کردبێت
**صَرِير**: جیڕەو دەنگی پێنووس، جیڕەی قەڵەم ، کسپەی
**صَرِيرُ البَاب**: جیڕەی دەرگا
**صَرِيرَة**: پارەوپوولی بەستراو، شەدە پارە
**صَرِيع ـ مَصْرُوع**: فێدار، گەشکەدار، شێتو فێیاوی، یەکێك پەرکەمی لەگەڵ بێت
**صَرِيف**: جیرە، جیرەجیرە، خرچەخرچ، مسی پوختو رەها ، مەی کاتێك هیچی تێکەڵ نەکرابێ ، شیر لەکاتی دۆشیندا
**صَرِيفُ البَاب**: جیرەجیرەی دەرگا، ئەو دەنگە لەدەرگا پەیدا دەبێت لەکاتی پێوەدان یان کردنەوەدا
**صَرِيفُ القَلَم**: جیڕەو خشەی قەڵەم ، دەنگی قەڵەم لەکاتی نووسیندا
**صَرِيفَة**: پوشی خورما، نانی ناسكو تەنك
**صَرِيم**: بڕاو، لەتکراو، شەو یاخود ساتێك لەشەو، بەیانی، دەمەوانە کەدەکرێتە دەمی بەچکە وشتر هەتا دایکەکەی نەمژێ، زەوییەك بەروبومی دورابێتەوە، بەستەو چەپکەی بەستراو لەکشتوکاڵ
**صَرِيما اللَّيل**: سەرەتاو کۆتایی
**صَرِيمَة**: سووربوون، ساتو بەشێك لەشەو، پارچەو پارەیەك لەشتێك، سەقامگیرکردنی شتێكو سووربوون لەسەری

**صع**

**صَعَّاد:** یەکێك زۆر بەرزبێتەوە، فرە هەڵکشاو، پتر بالآبوون
**صَعَب عَلَيه الأمْر:** قورسیکرد لەسەری، دژواریکرد، گرانو ناڕەحەتی کرد
**صَعْب:** گران، قورس، دژوار، رەق، سەخت، ئەستەم، ناڕەحەت
**صَعْبُ الإحْتِمَال:** هەڵناگریٚ، ئارام ناگریٚ لەسەری، رەقو سەخت ، وشكو گران
**صَعْبُ الإرْضَاء:** گرژ، رازی ناکرێت، جوکن، ئاڵۆز، رکاوی، بەقین
**صَعْبُ المِرَاس(عَنِيد):** قیرسیچمە، کەللەرەق، لاسار، قیرسیچم، کەسێکە لەکارو باردا لاسارو گیروگرفتاویو کەللە رەق بێت
**صَعْتَر ـ سَعْتَر:** جاترە، جەهتەر، هەزبیٚ، هەربێلە، ئەزبیٚ ، زوە، جەتر، گیایەکی ماڵی کێوییە بۆنی خۆشە لەناو چێشتو دانوولەی نۆك دەکریٚو لەشێوەشدا وەك تەرخون وایە
**صَعِدَ:** سەرکەوت، هەڵزنا، هەڵهات ، سەری دەرهێنا، پیاسەرکەوت، دەرکەوت
**صَعِدَ المَكَان:** سەرکەوتە سەر، چوە سەرەوە
**صَعِدَ فِي السُلَم:** بەپیٚ پلیکانەکاندا سەرکەوت، پلە پلە بڕی، پیا سەرکەوت
**صَعِدَ بِه:** سەرکەوت پیایدا، بڕیو چوەسەرەوە
**صَعَّدَ فِي وَعَلَى الجَبَل:** سەرکەوت، هەڵزنا، پیاسەرکەوت

**صَعَّدَ فِي الوَادِيّ:** شۆڕبوەوە، سەرەوخواربوەوە، گل بوەوە، تلۆر بوەوە، دانەویەوە
**صَعَّدَ فِيه النَّظَر:** نیگای خستەسەر، بۆیروانی، تەماشای کرد لەتەوقی سەر هەتا بنی پیٚی
**صَعَّدَ الزَفَرَات:** ئاهی هەڵکێشا، ئاهو حەسرەتی هەڵکێشا ، غەمو پەژارەی خوارد
**صُعُد:** بەرزی ، بلندی، بالآیی، کەشکەلانی، بەرزایی
**صَعَد:** ناڕەحەتی، سەختی، نەهامەتی، ناخۆشی، دەردەسەریی، مەینەتی، توندیو رەقی، سزای سەختو گران
**صُعَدَاء:** هەناسەی قوولٚ، هەڵکێشانی هەناسەیەکی قوولٚ بەهۆی غەمو پەژارەوە یان ماندوبوونو شەکەتییەوە
**صُعَدَاء(مَشَقَّة ـ عَذَاب):** گرانی، سزا، ناڕەحەتی، سەختی، دژواری، مەینەتی، بەدبەختی، نەهامەتی
**صَعْدَة:** سەرکەوتنێك بەرزاییەك، تەپۆڵکە، تەپە، تەپ، گردۆڵك، گوویك، کۆسپایی، نێوزەوی، گردی چکۆلە
**صَعِرَ وَجْهُه(إلْتَوى):** گێڕیوو، رووی گێڕیوو، خوارو خێچ بوو، ئیفلیج بوو ، نارێك بوو، لوول بوو
**صَعَّرَ خَدَّهُ:** رووی وەرگێڕا، دەمو چاوی کرد بەو لاوە بەهۆی خۆبەزلزانین یان هەر خوویەکی سروشتی ئەوکەسە خۆیبوو
**صَعْرَاء:** ملخوار، مل گێڕ، سەروملی خوارو خێچ ، سەرلارو خوارو خێچ یان پچووكو گژگل

**صَغْرُور( مَاجَمُدَ مِنْ مَاءِ الشَّجَر كَالصَّمغ ):** ئـاوكی بەستووی روەك، جەوی، كەتیرە، هەنگووژە، جیوەی داران ، شتێكە وەك كەتیرە لەهێندێ درەختو گیا پەیدا دەبێ

**صَغْصَعَ الرَّجُل:** ترسا ، تۆقی، ترسی لێنیشت، روحی سپارد، زارەترەك بوو، هاواریكرد

**صَغْصَعَ القَومَ:** ترساندی‌و بڵاوەی پێكردن، تۆقاندنی‌و پەراگەندەی كردن

**صَغْصَعَ رَأسَهُ بِالدهنِ:** تەڕیكرد، نمەداریكرد، چەوری كرد

**صَغْصَغ:** پەرتەوازە، جیاجیا، پەرەوازە

**صَغْفَقَ:** جەستەی پچووك بوەوە، لەڕوو پچووك بوو

**صَغْفَقٌ:** بەیەكێك دەگوترێ دەچێتە نێوبازاڕو هیچ سەرمایەیەكی بەدەستەوە نیە بەڵام خۆی رێك دەخاتو دەشبێت بەهاوبەشی

**صَعَقَ:** هەورەتریشقە لێیدا، بروسكە لێیدا، لەهۆش خۆی چوو، بورایەوە، بێهۆش بوو، ئاگاو هۆشی بەسەر خۆیەوە نەما

**صَعَقَ الرَّعْدُ:** شریخەی هات، گرمەو ناڵەی لێوەهات، گرمەگرمی لێبەرزبوەوە

**صَعَقَ الحَیوانُ:** دەنگێكی ناقۆڵای لێ بیستڕا، شیڕاندی، نەڕاندی

**صَعِقَ الرَّجُل:** هەورە تریشقە لێیدا، بروسكە پێكای‌و بورایەوە یان تیاچوو مرد

**صُعِقَ:** بێهۆشكەوت، هات بەلایا، راچڵەكی‌و مرد

**صَعَق:** توندو تیژی دەنگ، مردن، مەرگ

**صَعِقٌ:** وڕ، كاس، داچڵەكیو، راچڵەكیو، داخورپاو، مردو، بێگیان

**صَعِقٌ:** دەنگێكی تیژو كاسێنەر، ئەوەی بێهۆش دەكەوێتو دەبورێتەوە، یەكێك رەچاوی هەورەتریشقە بكاتو ترس بەسیماو رەنگو روخساریەوە دیاربێت

**صُعْقُر:** گەرا، تۆو دانانی ماسی‌و بۆق‌و ئیدی كەدەژێتوەو وەك خۆی گیانداری لێ پەیدا دەبێ

**صَعَل:** مل باریك، سەر پچووك

**صَعُلَ:** درێژبوو، شۆڕبوو ، داكەوتوو

**صَعْلَةٌ:** باریكو لاواز لەجەستەدا، لەروڵاوازو كەم گۆشتی جەستە، دارخورمایەكە زۆر درێژ كەوا لارو لەوێربێتو بنی لقەكانیشی رووت بێت

**صَعْلَكَ ـ صَعْلَكَةٌ:** هەژاریخست، بێدەرامەتی كرد، نەبوونی هێنا بەسەریا، گەدای كرد

**صَعْلَكَ البَقْلُ الدَّوَابَّ:** روەكەكە ئاژەڵەكانی قەڵەوكرد، بەخۆوەی كردن

**صُعْلُوك:** ناكەس، هەژارو چەتە، رووتە، گەدا، نەبوو، بێنەوا، هەژاری دزو چەتە

**صُعْبُوب:** دژوار، ناهەموار، ناجۆرو بار

**صَعْو:** چۆلەكەیەكی پچووكە

**صُعُود ـ صَعُود:** سەرەو ژوورە، بەرەوسەر، بڵندی، كۆسپو كۆتەڵی سەختو دژوار ، سەریەرەوژوور، بەرزبوونەوە ، هەڵكشان

**صَعِید:** تەپۆڵكە، تەپە، بەرزی، بڵندی، زەوی بەرزو بڵند، گۆڕ، خاكو خۆڵ، رێگە

**ص غ**

**صَغَا إِلَيه**: گوێی بۆشلکرد، گوێی بـۆ هەڵخست، گوێی بـۆ گـرت، لاریـوەوە، شۆڕ بوەوە

**صَغَائِر**:گوناهی پچووك، رووداووكردەی سووكو کەم نرخ

**صَغَـار**: سـووكی، رسـوایی، نزمـی، نەبوونی، نارەحەتی، رۆژی رەش

**صَغَارَة**: جورم پچووكی، واژوی گەورەو زلەیە، پچووكی ، گچکەیی، ناگەورەیی

**صَغُرَ صَغِرَ(كَانَ أَصْغَرُهُم)**: پچووكیان بـوو، لەهـەموان پچووکـتربوو، لـەوان گچەکەتربوو، وردتربوو

**صَغُــــرَ فُلاَنـــاً**: لــــەوپچووکتربوو، لەوگچکەتربوو

**صَغُرَ**: سووکایەتی پێکـرا، سـووك كـرا، رسواکرا، سەرشۆڕکرا

**صَغَّـرَ الحَجْـمَ**: پچووكـــی كـــردەوە، شـكاندی، سـووکیکرد، گچکـەیکرد، قەبارەی پچووك كردەوە

**صَغُـرَ**: پچـووك بـوەوە، پوکایـــەوە، سووك بوو، پچووك بوو ، کەم بوەوە

**صِغَـر**: پچووکـــی، منـــاڵی، لاوێتـــی، گەنجێتی

**صُغْرَى**: پچووكتر، وردتر، گچکەتر

**صُغْـــرَة**: پچووکـــترین منـــاڵ یـــان پچووکـترین کەسـی نەتـەوەو گـەل، کۆتـــاترین، دوایـــترین، پاشـــەبەرە، لەهەموان پچووکتر

**صِغْوُ**: قەراخی بیر، ئەولایانەی دۆڵچەی ئاوو خۆڵ دەرهێنانی بیر

**صَفوُ الكَفّ أَو الغُرْفَة**: نێو لەپی دەست یان ژوور، ناوەوەی ، ناواخنی، مشـت، نێو جەرگە

**صَغْـوَاء**: خـۆر لـەکاتی ئـاوابووندا، رۆژ دەمی ئاوابوون

**صَغِـير**: پچـــووك، گچکــــە، چکۆلــــە، بووچك، ورد، وردیلە

**صَغِيرُ السِّـــن**: لاو ، هــەرزەكار، کـەم تەمەن، گەنج، جەحێل

**ص ف**

**صَـفّ الشَّيء**: ریزیکرد، رێکیخسـت، بەدوای یەکا هێنای، یـەك لـەدوای یـەك داینا، بەیەك رشتە هێنای، خستیە پاڵ یەك

**صَفّ القَومَ**: ریزیکردن، بەرِیز داینان

**صَـفّ القَـومُ**: ریزیـان بەسـت، بــەدوای یەکا هاتن، ریزیان گرت بە دووی یەکا

**صَفّ الطَّـائِر جَنَاحَيـه**: باڵی راخسـت بـەلام نـەیجوولاند ، بـاڵی فشـكردەوەو نەیهێناو نەیبرد

**صَـــفّ اللحـــم**: تـــویێ تویێیکـــرد، پارەپـارەیکرد، جنـی، لـەت لـەتیکرد، پارچە پارچەیکرد

**صَفّ الإِبْل**: قاچی بەرێکی دانا

**صَـــفّ الأَحْـــروف**: کـــۆی کــــردەوە، پیتەکانی رێکخست

**صَـفّ**: ریـز، هێـڵ، پلـە، پایـە، جـۆق، پـۆل، تیـپ، لەسـاندان، چـەند شـتێکە بەقەتارەو بەرِیز راوەستابن

**صَفّ مَدْرَسِيّ**: پۆلی قوتابخانە

**صَفّ جَانِبِيّ**: ریزی تەنیشت یەك ، یەك لەپاڵ یەکا، بەرِیز، رشتەی دوا بەدوا

**ضَاحِيَةٌ**: دیار، ئاشکرا، بەرچاو، لایەکی دیارو ئاشکرا

**ضَاحِيَةُ المَدِينَةِ**: دەورو بەری شار، دەوروپشتی

**ضَادُّهُ**: ناسازگاربوو، واژوی بوو، پێچەوانەی وەستا

**ضَارَ ـ ضَوَرًا**: زۆر برسی بوو، یەکجار پەرێشان بوو بۆ خواردن

**ضَارَ الأَمْرُ فُلاَنًا**: زیانی پێگەیان، بەزیان بوو بۆی

**ضَارَّ إمْرَأَتَهُ**: دوو یان سێ ژنی هێنابەسەری ، ژنی بەسەر هێنا

**ضَارٌ**: ناوێکە لەناوە جوانەکانی پەروەردگار ، پەروەردگار هەروەك چۆن سوود گەیەنەرە هەروەها زیانگەیەنەریشە ، بەزیان زیانگەیەن، دۆڕێنەر

**ضَارَبَ لِفُلاَنٍ فِي مَالِهِ**: بازرگانی بەماڵەکەیەوە کرد، ئاڵوویڵو سەوداگەریی پێوەکرد بەو مەرجەی پشك و بەشێکی هەبێت لەقازانجا

**ضَارَبَ فِي السُّوقِ**: لەهەرزانیا کڕیو چاوەڕێبوو هەتا گران ببێت ئەوجا بیفرۆشێ دەگونجێت پتر دابەزێتو ئەوجا زەرەر دێتە ئاراوە

**ضَارِبٌ**: لێدەر، کوتەر، پیاکێش، داپلۆسەر، لێدراو، خوێنبەر، چەتونە شەو کەوا تاریکایی باڵ بەسەر هەمووشتێکدا دەکێشێت

**ضَارِبٌ إِلَى (الحُمْرَةِ ـ الصُفْرَةِ)**: رووبەسووریی بوو ، مەیلەو سووربوو ، مەیلەو زەردبوو

**ضَارَبَا**: لەیەکیاندا، یەکتریان داگرتەوە، یەکیان کوتی

**ضَارَبَهُ مُضَارَبَةً وَضِرَابًا**: هەریەك بەرانبەری خۆی داگرتەوە، رۆچوون لەلێدانی یەکتر

**ضَارَسَ الأُمُورَ (جَرَّبَهَا وَعَرَفَهَا)**: تاقیکردەوە، تێی گەیشت ، تیا قاڵبوو، چەشتی

**ضَارَسَهُ**: دوژمنایەتیو شەڕی لەگەڵ بەرپاکرد

**ضَارَعَ ـ مُضَارَعَةً**: لێچوو، وەك یەك، هاوشێوە، لەوچوو، وێنەی ئەو

**ضَارِعٌ**: کەم تەمەن، تازەپێگەیشتوو ، وردو پچووکی هەرشتێك، کەم توانا

**ضَارَعَتِ الشَّمْسُ**: روو بەئاوابوون بوو، وەختەبوو ئاوا دەبوو

**ضَارَعَتِ القِدْرُ**: وەختە بکوڵێ، پێبگات، بێتەبەر

**ضَارَّهُ**: دژایەتی کرد، سەرپێچیکرد، بەرهەڵستیکرد، بەقسەیەنەکرد، پێچەوانەی جووڵایەوە

**ضَارُورٌ**: نیازو پێویستی، تەنگیو نارەحەتی، ناچاری، ویست ، تەنگانە

**ضَارُورَاءُ**: پێویستی، ویستن، خوازتن ، داماوی، نەبوونی، گەدایی

**ضَارُورَةٌ**: زیان، خراپە، زەرەر، ناباش

**ضَارِي**: کێوی، دڕ، دڕندە ، بەزیان

**ضَارِي مِنَ الجَوَارِحِ وَالكِلاَبِ**: ئاژەڵە ماڵیەکان لەدڕندەو سەگ کە رامکراون لەسەر راووشکار

**ضَارِيَةٌ**: سەگی ئالوودەی راووشکار

**ضَاعَ**: ونبوو، دیارنەما، تیاچوو، فەوتا، فەوت بوو، لەکیس چوو

**ضَاعَ المِسكُ ضَوعَاً**: بۆنی میسك بلاّوو پەخش بووەوە
**ضَاعَ مِنْهُ**: ونیکرد، لەکیسی چوو، دۆڕاندن، تیابردن
**ضَاعَفَ ـ مُضَاعَفَةً**: دوو ئەوەندی لێکرد،کردی بەدووئەوەندە،دووجایکرد
**ضَاغِط**: پەستێنەر، گووشەر، زۆرلێکەر، تەنگ پێهەلّچن، فشارگەر، پالّەپەستۆکەر
**ضَاغَطَهُ**: تەنگی پێهەلّچنی، فشاری خستە سەر، زۆری بۆ هێنا
**ضَاغَنَ ـ مُضَاغَنَةً**: رقی لێ بوو، کینەو خەشمی لێگرت
**ضَاغِن**: کینەدار، دلّ پیس، بەدگومان، رقدار، رق ئەستوور، بەقین، ناخ و دەروون گەندەلّ و پیس
**ضَاغَنَهُ**: رقی لێی بوو، بوغزانی، لەدلّاچارەو رەزای گران بوو لای
**ضَاغُوط(كَابُوس)**: خەوی ناخۆش، مۆتەکە، کامووسك، کامووس، دێوەزمە، گراناوییەکە لەخەوا دێتەسەر جەستەو گیانی مەردوم
**ضَافَ(نَزَلَ بِهِ ضَيفَاً)**: بوو بەمیوانی، میوانداری کرد
**ضَافَ إِلَيهِ**: سەربەوبوو، مەیلی هەبوو بۆی، حەزی پێکرد، ئالوودەو خوازیاری بوو
**ضَافَ عَنْهُ**: لایدا، ترازاو دەرچوو لێی، وێلّ بوو
**ضَافَ مِنْهُ**: ترساو وریابوو لێی، وریایی و بێداریی لێوەرگرت
**ضَافَتِ الشَمسُ**: رووبەئاوابوون چوو، بەرەو ئاوابوون رۆیی

**ضَافَتِ السَهْمُ عَنِ الهَدَفِ**: تیرەکە لەمەبەست لایدا، ترازا، نەی پێکا
**ضَافَرَهُ عَلَى الأَمرِ**: یارمەتیدا لەسەر کارەکەی ، هاوکاری کرد، کۆمەکی پێشکەش کرد، پیشتگیری کرد، پاڕیەوەیدا
**ضَافِي**: زۆر ، زیاد، لێرژاو، فرە ، لێوان لێو، لەب ڕێژ
**ضَاقَ**: تەنگ بوو، بێ بوار مایەوە، گوشادو بەرینی هاتەوە یەك
**ضَاقَ بِالأَمرِ ـ ضَاقَ بِهِ ذَرْعَاً ـ ضَاقَ صَدْرُهُ بِهِ**: بێزاربوو،دلّتەنگ بوو پێی، سینەی هاتەوە یەك لەبێزاریی و نیگەرانیدا
**ضَاقَ الرَّجُلُ**: ڕژدبوو، چاوچنۆك بوو، بەرچاو تەنگ بوو، بەخیل بوو
**ضَاقَ بِهِ السَبِيلُ**: گشت رێگەیەکی لێهاتەوەیەك و گیرا، سەری دنیای لێهێنایەوە یەك
**ضَالّ**: سەرلێشێواو، لەرێی راست لادراو، ون بوو، دەربەدەر، هیچ و پووچ، یەکێك ڕێبازو رێگەیەك ون بکات
**ضَالٌ عَنِ الدِّينِ**: لەئاین دەرچوو، یاخیبوو، بێباوەڕ ، گومڕا
**ضَالَّةٌ**: ئەوشتەی وندەبێت و دیار نامێنێت و هەر بەدوویا دەگەڕدرێت
**ضَالِعٌ**: لار، خوار، چەماوە، خێچ، گێژ، چەوت، ناراست، خواروخێچ، لارولەوێر
**ضَالِعٌ فِي كَذَا**: کارامە، لێهاتوو، لێزان، تێگەیشتوو، زۆرزان، بەتوانا، رۆچوو
**ضَامَ ـ ضَمَاً (ظَلَمَ)**: ستەمیکرد، زۆریکرد، چەوروستەمی نواند، زەبرو زەنگی خستە روو، مافی بەرانبەری خواردو چەوساندیەوە

**ضَامَ حَقَّهُ:** مافی خـوارد، حـەقی خـۆی نەدایە، مەغدووریکرد

**ضَامِرٌ:** کەم گۆشتی لەڕو باریك

**ضَامِنٌ:** دەسـتەبەر، یاریکـار، زامـن، کـەفیل، وەخۆگرتـوو، بـەڵێندەر، لێپرسراو، بەرپرس

**ضَائِى المَرَض وَنَحْوَه:** چەشتی، ژانـی نەخۆشی چوو بەدڵیا

**ضَانِي:** گۆشتی مەڕ، پەز

**ضَانِيء - ضَانِئَة:** ئـافرەتی منـاڵ زۆر، شفتەژێکار، بەو ژنە دەگوترێت هـەموو ساڵێك منـاڵی ببێـتو شـیری منـاڵی بەرمـەمکانو منـاڵی تـازەبووی یـەك بگرێتەوە

**ضَاوِي:** ئەوەی شـەو لـەدەرگا دەداتو دێت

**ضَاوِيٌ:** لـەڕو باریکی ناسـك، یـەکێك سروشتی لاشەی لاواز بەدی هاتبێت

**ضَأضَأ:** دەنگـی خـەڵکی لەجـەنگا، دەنگو هـەرای خـەڵك لـەکاتی شـەڕو پێکدادان

**ضَأضَأ القَومُ:** دەنـگو هـەرایان بەرپاکرد، بانگی یەکیانکرد

**ضَؤُلَ - تَضَاءَلَ (ضَمُرَ):** پووکایـەوە، گرژبـوو، هاتەوەیـەك، لاوازبـوو، کـەم بووەوە

**ضَؤُولَة (ضعف):** لاوازی، لەڕی، کەمی، پچووکی

**ضَأن - ضَان (غنم):** مەڕ، پەز، میهی، مەهـ، گیـاندارێکی مێینـەی خوریـداری دووگداری ماڵیە کەپێی نابێتە سـاڵی چوارەم

**ضَأنِيٌّ:** گۆشتی مەڕ، گۆشتەمەڕ

**شُئْنِيّ:** مەشکەیەکی گەورە

**ضَئِيـل:** لاواز، لـەڕ، وردو بـاریك، کەمتین، تەشك زراف، جیبقال، راژیـی، بێتینـی، لەغـەر، چـەکاڵ، پـووت، چوورچی بێ تین

**ضَئِيلَة:** مـارێکی بـاریك، زمانـە پچکۆلەیە

## ض ب

**ضَبَّ - ضَبًّا:** خامۆش بوو، بێدەنگ بوو، سرەوی بوو

**ضَبَّ الشَيءَ:** نووساپێوەی، پێوەی لکا

**ضَبَّ عَلَيهِ:** بـەتوندی گرتـی، تونـد دەستی پێوەگرت، لەنێوچنگی دانا

**ضَبَّ المَاءُ وَنَحْوَهُ:** بەکـەمی ڕۆیی، کـەم کەم لەبەری ڕۆیشت

**ضَبَّ بِكَذَا أو عَلَيهِ:** سووربوو لەسـەری، جەختی لەسـەرکردو داوای کـرد، رقو کیناوی بوو

**ضَبَّ عَلَى مَا فِي نَفْسِهِ:** شـاردیەوە، پەنـهانیکرد، دەری نەخسـت، بێدەنگبوو، لەدڵی خۆیا شاردیەوە

**ضَبَّ البَابُ (أقْفَلَ):** دایخست، پێوەیدا، جووتیکرد

**ضَبَّ الدَمُ:** خوێنی لەبەر ڕۆیی، خوێنـی بەربوو، لێی ڕۆیی

**ضَبّ:** مارمێلکە، قـۆڕی، سەرمازەڵـە، دایکە مارانە، مارمەزووبکە، مـارمێلۆ گـەورە دانکـە مارانـە، بـزن مـژە، کـێرنگرك، قومقومـە، لـەدەعبا مارخۆرەکانە

**ضَبَاب ـ ضَبَابَة:** تەم ، تـەمو مژ، مژ، تەپو لوول، هەڵمی ئـاو بوغـی تـەڕایی زەوی کەلەزەویو دۆڵو نەواڵو چیایان جویێ نەبوویێتەوە بـەڵام کەبـەرزبوەوە دەبێتە هەور

**ضَبَابُ الجَبَل:** تەمو تومان ، دومان

**ضُبَّارُ:** دارێکە دارەکەی چاکە لـەدار بەڕوو دەچێت

**ضُبَارَة ـ ضِبَارَة:** بەندە کاغـەز، یـان هەردەستەو بەندێك ، دەستەو کۆمـەڵی خەڵك

**ضَبَّـارَة:** کۆبوونـەوەی خـەڵكیو پشتگیریان

**ضُبَّارِم:** دارێژراو، تۆکمەو پتەو

**ضِبَاع:** دەست بەرزکردنـەوە بـەدوعا، لاقەلاقو دەست بڵندکردنەوە

**ضَبَان:** ناوکەف ، پارچە پێستێك یان قوماشێك لەنێو پێڵاو دەنرێ

**ضُبَّ المَكَان:** ناوچەیـەکی فـرە مارمێلکەبوو، مارمێلکەی زۆر بوو

**ضَبَّبَ عَلَى الشَّيء:** دەستی بەسەراگرت، خستیە ژێرچنگی خۆیەوە

**ضَبَّبَ عَلَى الضَّب:** خوراندی، هێنایو بردی، تەنگی پێهەڵچنی

**ضَبَّبَ البَابَ وَنَحْوَهُ:** هـەندێکی کـرد بەنێو یەکا ، تێروچاکیکرد

**ضَبَّبَ الشَّيء:** بـەتوندی دەسـتی پێوەگرتو هەتا لەدەستی دەرنەچێت

**ضَبَّبَ مِنَ المَكَان:** ئـەو شـوێنەی مارمێلکەی زۆر بێت

**ضَبَّة:** مێینـەی مارمێلکـە، شـتێکە لەئاسـن یـان ماددەیـەکی زەرد رووکەشی قاپو قاچاغی پێدەکرێ

**ضَبَّةُ البَاب:** کلۆم ، کێلـۆن، ئاسنێکی زمانەدارە لەدەرگای سندووق دەدرێو بەکلیل دادەخرێ

**ضَبَحَ ـ ضَبْحاً:** خۆیدا بـەزەویدا بـەهۆی لێدان یان ماندوبوونەوە

**ضَبَحَ الأَرْنَبُ وَالثَّعْلَبُ وَالقَوس:** دەنگی لێهات ، دەنگی لێبەرز بوەوە

**ضَبَحَ النَّارُ العُودَ:** رەنگـی گـۆڕیو نەیسووتاند بەتەواوی

**ضَبَحَ النَّارُ أو الشَّمْسُ الشَّيء:** رەنگی گۆڕی روویەڕەش

**ضُبْحُ:** خۆڵـەمێش، سـوتوو، بـۆوڵ، خەڵـەکوول، رتـام ، سـۆتەکی دار، خۆڵەکەوە

**ضَبَحَتِ الخَيلُ فِي عَدْوِهَا:** هەناسـە برکە، ئەسپەکە لـەغارغارێنا دەنگێکی لێوەهات بەدەر لەحیلە حیل

**ضَبَرَ:** کۆیکـردەوە، گـردی کـرد، دەستەی کرد

**ضَبَرَ الكُتُب:** خسـتیە دۆسـیەوە، لەدۆسیەیەکدا کۆو دەستەی کرد

**ضَبَرَ الحِجَارَة:** ڕێکیخسـت، دایـە پاڵ یەك، لەڕیزی یەك داینا

**ضَبْرُ:** ئامێرێك بوو لەداردروست دەکراو لەچەرخـەکانی پێشـودا لەجـەنگا بـەکاردەبراو جـەنگاوەر لـەژێریا خـۆی دەشـاردەوە هـەتا نزیـك بەقـەلاو حەشارگەکان دەبوونەوەو لەدەبابـەی چەرخی نوێ دەچێت

**ضُبْرُ:** دارگوێـزی دەشتو ناوچـە کـەم ئاوەکان

**ضِبْرُ:** بن باخەڵ، بن باڵ، ژێر باخەڵ

**ضَبَزُ:** گورگی زۆر دڕندەو فێڵباز
**ضَبُزَ:** بەخت ، بەش ، پشك
**ضَبِسَ الرَّجُلُ:** بەدڕەوشـــت بــوو ، خراپبوو ، ناڵەبار بوو
**ضَبِسُ:** رژد ، بەرچاوتەنگ، بەخیل
**ضِبْسُ:** کەم عەقڵی جەستە لاواز
**ضَبَطَ:** گرتی، لەنێوچنگی دانا، دەستی بەسەراگرت ، توند پاراستی
**ضَبَطَ العَمَلَ ضَبْطاً:** کارامە بوو تیـایدا، شارەزابوو، لێزان بوو، بـاش‌و کارامـەی کردن
**ضَبَـطَ الكِتَـابَ:** راسـتی کـردەوە، رێکیخست، رێك‌وپێکی‌کرد، سازی‌کرد، هەڵەو ناتەواوییەکانی راستکردەوە
**ضَبَـطَ الشَّـيءَ:** گلیدایـەوە، دەسـتی بەسـەراگرت، پاراسـتی، پارێزگـاری لێکرد
**ضَبِطَ۔ ضَبَطَاً:** بەدەستی چـەپ وەك راستی کاری کرد
**ضَبْـط:** رێکخسـتن، چـاککردن، باشـکردن، دەسـتپیاهێنان، لابردنـی ناتەواویـەکان، پڕکردنـەوەی کـەم‌و کوڕیـەکان، توندوتۆڵـی، چـاکێتی، دابینکردن
**ضَبْـطُ النَّفْـسِ:** خۆدابـین کـردن، خۆگرتن، جڵەوی نەفس گرتن
**ضَبْطُ الشَّهْوَةِ:** دەست بەسـەر حـەزو ئـارەزوودا گرتـن ، ئـارەزوو مرانـن، ئارەزوو دابینکردن
**ضَبْـطُ حِجْـزٍ أو مُصَـادَرَةٍ:** دەستبەسـەراگرتن ، داگـیرکردن ، دەستەڵات بەسەرا کێشان

**ضَبَعَ (مَدَّ يَدَهُ):** دەسـتی هـەڵبڕی، درێژی کرد، قۆڵی بەرزکردەوە
**ضَبَعَ البَعِيرُ:** لەرۆیشتنا بەپەلـەو خێرا رۆیی
**ضَبَعَ الرَّجُلَ:** ستەمیکرد، زۆرداری کرد، ستەم‌و زۆری‌کرد
**ضَبَـعَ عَلَـى فُـلاَنٍ:** دەسـت‌و قۆڵـی بەرزکردەوەو دوعای لێکرد
**ضَبَعَ الخَيلُ أو الإبِـلُ:** هـەنگاوەکانی درێژو بـەرین کـرد لەرۆیشـتنا ، بەپەلـە رۆیی، غارغارێنی‌کرد
**ضَبِعَ فُلاَنٌ:** ترسـنۆك بـوو، تۆقـی بـوو، روحی سپارد بوو
**ضَبْعُ:** قۆڵ، بن قۆڵ، بن باخەڵ
**ضَبُعُ:** کەمتیار، گیـاندارێکی کێوییـەو یاڵ‌و سمی لەهی کـەر دەچـێ ، وشـکە ساڵ، ساڵێکی قات‌و قڕی
**ضِبْعَان :** کەمتیاری نێرە
**ضَبَنَ المَكَـانُ:** تەسك بـوو، تـەنگ بـوو، نابەرین بوو
**ضَبَنَ عَنْهُ الهَدِيَةَ:** گرتی، نەیدایە
**ضِبْـنُ:** ئـامێز ، بـاوەش ، مابـەینی قەبرغەو بن باخـەڵ ، نێوانـی کەلەکـەو بن باڵ ، لا ، تەنیشت
**ضَبَنُ:** کـەمی ، ناتـەواوی‌و ناسـاغی ، جەستە بەباریی
**ضُبْنَةٌ مِـنَ الرِّجَـالِ:** دەسـت‌و پێوەنـد، گرۆهو تاقم ، پیاوو بەردەستانی
**ضَبِينَـةُ:** پـەنا ، ئـامێز ، کـۆش ، پارێزگاری ، چاودێری
**ضُبِينَـةُ:** دۆشـاوێکە دەخرێتــە قاپێکەوەو دەرخواردی منداڵ دەدرێ

ض ج

**ضَجَّ**: قيژانی، هـاواریکرد، نـەڕاندی، دەنگی داواو فریاگوزاری لێبەرزبوەوە

**ضَجَّاج**: قاوقیژکەر، یـەکێك زۆر هـاوارو قیژەی لێبەرزببێتەوە

**ضَجَّة**: قـاووقیژ، دەنگە دەنـگ، قیـژو هوڕ، هاوار کردن، ژاوەژاو، هالّو هاوار

**ضَجِرَ**: بـێزاربوو، ئـارامی لەبـەربڕا ، تاقەتی چوو،جاڕست بوو، هەراسانبوو، پەستو وەڕس بوو

**ضَجِرَ المَكَـانُ**: تەسـك بـوو، گوشـادو فراوان نەبوو، تەنگەبەر بوو

**ضَجِرٌ( تَبَرُم )**: بێزاربوون، جاڕس بوون، تاقەت چوون

**ضَجِرٌ( مُتَضَـايِق )**: بـێزار، هەراسـان، بێئـارام ، بێتاقـەت، جـاڕس بـوو، دڵتـەنگو بـێزار بـەداهاتنی رووداوو کارەساتێ، بێقەرار ، مەلوول

**ضَجْـرٌ**: شـوێنێکی تەسـكو نابـەرین، جێگەی تەنگەبەر

**ضَجْر**: سەرزەنشت ، سەرکۆنە، تـەریق کردنەوە

**ضُجْرَة**: بـێزاریی، بێتاقـەتی، قارسـی، مـەلوولی، نیگـەرانی، رووتێکردنـی نائارامی باری دەروون

**ضَجَعَ - ضَجَعاً وَضُجُوعاً**: لەسەرتەنیشت کەوت، پاڵکەوت، راکشا، تەخت بوو

**ضَجَعَ إِلَيهِ**: رووبـەوبوو، لاربـوو، کـەوت بەولایەدا

**ضَجَعَ الشَّمسُ أو النَّجم**: رووبـەئاوابوون چوو، وەختەبوو ئاوا دەبوو

**ضَجَـعَ فِـي الأَمْـرِ**: کەمتەرخـەمیکردو پێی هەڵنەسا، دوایخستو جێبەجێی نەکرد

**ضِجْـعٌ**: ئـارەزوو، حـەز، ئـالوودەیی، سەریە...

**ضُجْعَـةٌ**: سسـتی لـەراو بۆچوونـدا، لاوازیو کزی بۆچوونو رادەربڕین

**ضِجْعَة**: تەمبەڵی، تەوەزەلی، چۆنیـەتی راکشانو پاڵکەوتن ، شێوازی راکشـان، سستیو لەش گرانی

**ضُجْعِيٌ - ضِجْعِيٌ - ضُجْعِيَة - ضِجْعِيَّـة**: فرە تەمبەڵو چـاو لەخـەو، یـەکێك زۆر خەواڵوو تەمبەڵ بێت

**ضَجُور**: یەکێك زۆر بێزارو جاڕس بێـت، تەواو نیگەرانو بێزار

**ضَجُوع**: راکزو لاواز، ئـەوەی بۆچـوونو رای کـزو لاوازە، گێـل، کـەودەن، دوڵچـەی دەم والآ، هـەوری قـورس بەهۆی زۆری ئاوەوە کەهەڵی گرتووە

**ضَجِيج**: ژاوەژاو، دەنگە دەنـگ، هـەراو هوریـا ، قیـژە قیـژ ، ناڵـەو هـەرا، دادوفریاد

**ضَجِيع**: پاڵکەوتوو، راکشاو، تـەختبوو، یەکێك پاڵکەوتبێت

ض ح

**ضَحُّ الشَّمس**: تیشکی خۆر ، رووناکی ، شەوقی،ئەوەی تیشکی خۆری لێدەدات

**ضَحَـا - ضَحـيَ( ظَـهَرَ - إِنْكَشَـفَ )**: دەرکـەوت ، روون بـوەوە، کەوتـە ڕوو، دیاریدا

**ضَحَـا الشَّـمسُ ( طَلَعَـت )**: شـەبەقیدا، خۆرهەلآت، بەدەرکەوت، روون بوەوە

**ضَحَا الشَّيءِ:** تیشكی خۆر لێیدا ، خۆری بەركەوت
**ضَحَا الطَّرِيقُ:** بەدەركەوت، ئاشكرابوو، دیاریدا
**ضَحَا ظِلُّ فُلَانٍ:** مرد، دوایی هات ، كۆچی دوایی كرد
**ضَحَّى بِالشَّاةِ وَنَحْوَهَا:** كردی بەقوربانی، سەری بڕی، قۆچی كرد ، لەرۆژانی جەژنی قوربانا سەری بڕی
**ضَحَّى عَنِ الأَمْرِ( بَيَّنَهُ وَأَظْهَرَهُ):** ئاشكرای كرد، دەریخست، دەری بڕی، ڕوونی كردەوە
**ضَحَّى بِنَفْسِهِ( تَفَدَّى):** نەفسی خۆی بەخشی، خۆی بەخت كرد، خۆی دانا ، لەخۆ بورد
**ضَحَّى بِمَالِهِ( بَذَلَهُ):** ماڵو دارایی خۆی بەخشی، بەخشی بێبەرامبەر، ماڵو سامانی دانا لەوپێناوەدا
**ضَحَّى الغَنَم:** لەچێشتەنگاوا لەوەڕاندی
**ضَحَّى الأَضْحَاةَ:** سەری بڕی ، خوێنی ڕشت
**ضَحَّى عَنِ الشَّيءِ:** نەرمو نیان بوو ، پەلەی نەكرد
**ضُحَى ـ ضَحَاء:** چێشتەنگاو ، پێش نیوەڕۆ ، چێشتان ، چاشت ، چاشتەنگاو، تاشت، چێشتانگاو، كاتی قاوەڵتی ، بەیان ، بەرەبەیان
**ضَحَّاك:** دەم بەپێكەنین ، قۆشمە ، گاڵتەچی ، دەمپڕ بەخدە ، میانو ناوەڕاستی ڕێ، ڕاوبۆچوونی ڕۆشنو ئاشكرا

**ضَحْضَاح( ضَلِيلُ الغَوْر):** تەنكاو، ئاوێكی تەنكو كەم یاخود ئاوێك بنی دیارو نزیك بێت
**ضَحْضَحَ السَّرَابُ( تَرَقْرَقَ):** رەویەوە، تەنكبوو، ناسك بوو
**ضَحْضَحَ الأَمْرُ:** دەركەوت ، ڕوون بوەوە، ئاشكرابوو
**ضَحْضَح:** تەنكاو، ئاوێكی كەمو تەنك
**ضَحِكَ:** پێكەنی، خەنیەوە، بزەگرتی
**ضَحِكَ مِنْهُ وَعَلَيْهِ:** پێی پێكەنی، لاقرتی پێكرد، گاڵتەی پێكرد
**ضَحِكَ السَّحَابُ:** ڕۆشن بوەوە، ڕووناك بوەوە ، درەوشایەوە
**ضَحِكَ الطَّرِيقُ:** ڕێ ڕۆشن بوەوە، ئاشكرابوو، دیاریدا ، دەركەوت
**ضَحِكَتِ الأَرْضُ مِنَ النَّبَاتِ:** دەریهێنا، دەریكرد
**ضَحِكَ الشَّيبُ بِرَأسِهِ:** دەركەوت ، دیاریدا ، سەری هەڵدا
**ضَحِكَ طَلْعُ النَّخْلِ:** قلیشی بردو دەرهات
**ضَحِكَ عَلَيهِ:** دەستی بڕی، فریویدا، هەڵی خەڵەتان
**ضَحِكَ مَعَهُ:** گاڵتەی لەگەڵكرد، لەگەڵی پێكەنی
**ضَحِكَ فِي عِبِّهِ:** لەژێرەوە پێكەنی، لەدڵی خۆیا بزەو پێكەنین گرتی
**ضَحْك:** پێكەنین ، خەندە، بزە ، زەردە خەنە
**ضَحَّكَ:** هێنایە پێكەنین ،خستیە پێكەنین، وای لێكرد پێ بكەنێ

**ضَحَك**: ددانی سپی ، گول، کەف، بەفر،ئاوەڕاستو میانی ڕێ، سەرسوڕمان، هەنگوین یاخود شانەکەی شکۆفە

**ضُحَكَةٌ**: گاڵتەچی، قەشمەر، تیزەجاڕ، جەفەنگچی، وازی خواس، ئەوەی خەڵکی پێی پێدەکەنێت

**ضُحْكَةٌ ـ ضُحُكَةٌ ـ ضُحَاك ـ ضَحُوك ـ مِضْحَاك**: دەم بەپێکەنینو خەندە، یەکێك یەکجار پێ بکەنێت

**ضَحْكَة ـ ضَحْكَة**: پێکەنین، کەنین، خەنین، پەیخەندین، گرژینەوە

**ضَحْكَةٌ صَفْرَاوِيَة**: لاقرتی ، پێکەنینێك گاڵتەو لاقرتی پێوەدیار بێت

**ضَحْكَةٌ مَكْتُومَة**: زەردەخەنە، نەرمە پێکەنین، زەردەکەنی، لێوخەند، دەفکەنی،بزە،پێکەنینی بێدەنگ، دزەخەنە، لچخەنە، لەدڵاپێکەنین

**ضَحَلَ الْمَاءُ**: کەم بوەوە، نیشتەوە، تەنك بوو

**ضَحَلَ الْغَدِيرُ**: ئاوی ئەستێركو جۆگەلەکە کەمیکرد

**ضَحَل**: تەنکاو، تەنك، ئاوێ کەقووڵ نەبێ

**ضَحْو ـ ضَحْوَة**: کاتی چێشتەنگاو، بەیان

**ضَحُوك**: یەکێك یەکجار پێبکەنێت، هەمیشە دەم بەپێکەنین ، ڕێگەیەکی بەرینو ڕۆشن

**ضَحِيَ ضَحَاً وَضَحَاءً**: تیشکی خۆر لێیدا، کەوتەبەر تیشکی خۆر ، دەرکەوت، ئاشکرابوو

**ضَحِيَ اللَّيلَةُ**: سایەقەی سامالّ بوو، هیچ گەواڵە هەورێك بەئاسمانەوە نەبوو

**ضَحْيَاء**: جۆرە ئەسپێکە

**ضَحْيَان**: ئەوەی لەچێشتەنگاودا خواردن دەخوات

**ضَحِيَة ـ أضْحِيَة(ذَبِيحَة)**: قوربانی، قۆچکردن، مەڕو بزن یا حوشترو گایە کەلەچوار ڕۆژەی جەژنی قوربانا سەردەبڕێ بەناوی قۆچەوە

### ض خ

**ضَخَّ الْمَاءَ ـ ضَخَّاً**: ڕژانی، ڕۆییکرد، پرژانی، قلْپی کردەوە

**ضَخَّ الْعَيْنُ**: فرمێسکی ڕشت ، ئەشکی پیاهاتە خوارەوە

**ضَخَّ الْمَاءُ**: لەبەری ڕۆییو لێیی ڕژا

**ضُخَام**: مەزنو توندی هەر شتێك

**ضُخَامٌ مِنَ الطَّرِيقِ**: ڕێگەوبانی گوشادو بەرین، ڕێگای فراوان

**ضُخَامٌ مِنَ الْمَاءِ**: قووڵ ، قورسو گران

**ضَخَامَةُ الْجِسْمِ**: گەورەیی ، قەبەیی، کەتەیی، زەبەلاحی، تێکسمڕاویی

**ضَخُمَ(كَبُرَ)**: گەورەبوو، زلبوو، ئاوسا، قەڵەوبوو، بالأبوو

**ضَخَّمَ**: گەورەو زلی کرد، فووی تێکردو ئاوساندی

**ضَخْم(كَبِيرُ الْجُرم)**: گەورە، کەتە، زل، ئاوساو ، قەبە، تەڕلان، زەبەلاح، زۆپ، قەڵەو، تێکسمڕاو

### ض د

**ضَدَّ(غَلَبَ)**: زاڵبوو، سەرکەوت، بالأبوو بەسەریا

**ضِدّ**: دژ ، دژکار، ناحەز، دوژمن، دژوار، نەیار ، پێچەوانەو دژوار

**ضِدُّ كَذَا**: پێچەوانەی ، واژوی ، بەرەکانی

**ضَدَّهُ فِـي الخُصُومَـةَ**: زاڵبـوو بەسـەریا، سەرکەوتنی بەسەراهێنا

**ضَـدَّهُ عَنْـهُ**: دووری خسـتەوە لێـی، پەراگەندەی کرد، بەهێمنی ڕێگری‌کرد، هێمن هێمن نەیهێشت پێی بگات

**ضَدِيَ۔ ضَـدَّى**: تورەبـوون بـەرچاوی تـاریك کـرد،تورەبـوون زاڵبـوو بەسەریابوو، تەواو تورەبوو

**ض ر**

**ضَـرَّ فُلاَنـاً وَبِفُلاَن**: زیـانی پێگـەیان، زەرۆرمەندبوو بۆی

**ضَـرَّ إِلَـى كَـذَا**: پـەنای بردەبـەر، ناچاری‌بوو

**ضُرَّ بَصَرُهُ**: کوێربوو، نابینابوو، بینـایی لەدەستدا

**ضَرُّ۔ ضُرّ۔ ضَرَر**: زیـان، وەی، وەزەن، زەرەر، دۆڕانـدن، لـەدەس چـوون ، زیـۆن، تێشـکان، دانـان، دۆڕانـدن، نهووم، لەکیس چوون، چزە، کەتن

**ضَرّ۔ ضُرّ (تَعَدُّد الزَّوْجَـات)**: فرەژنـی، لەژنێك زیاتر

**ضَرِيَ الكَلْـبُ بِـالصَيْد**: فـێری راوبـوو ، رام بوو لەسەری

**ضَرَى**: توندوتیـژی جـەنگ ، گەرمـەی، تاوسەندنی، جەنگەی جەنگ

**ضَـرَا الخَـرق أو الجُـرح**: خوێنـی بەشێوەیەك بەربوو هەر نەگیرسایەوە

**ضَرَا الإنَـاءُ وَنَحـوه**: ئـەو شـلەمەنیەی تێدابوو بەلێشاو ڕۆیی‌و هەر ڕانەما

**ضَـرَّاء**: تیـاچوونی مـاڵ‌و روح ، خۆشـاردنەوە، خۆپـەنادان، چوونـە پـەناوە، پـەناگیری، گۆشـەگیربوون، زەوییەکـە تـەخت‌و داری تێدابێـت‌و درندەکـان خۆیـانی تیـا دەشـارنەوە، سـەختی ، نـەبوونی، هـەژاریی‌و بەدبەختی

**ضَـرَّاب**: لێـدەر، کوتـەر، پیـاکێش، داگرەوە ، فرە کوتەرو لێدەر

**ضَـرَارَة**: کوێـری،نابینـایی،چـاو لەدەستدان، تیاچوونی ماڵ‌و روح

**ضُرَّاط**: ترکەن ، ترن، یـەکێك زۆر بـای لێببێتەوە

**ضَرَاعَة (إبتِهَال۔ تَضَرُّع)**: پاڕانـەوە، لالآنـەوە، نـزا، تکـا، ئاوڕدانـەوە، نەورانەوە، لاڤاکردن

**ضِرَامَـة (شَـجَرُ البُطْـم)**: دراقـەزوان، دارەبەن، دارەوەنـی، بـەن، بەنشـتۆن، بەنگ، درەختێکی بۆنخۆشەو قـەزوان‌و بنێشتە تاڵیش دەردەدا

**ضَـرَاوَة**: دڕندەیـەتی، دڕیـی، بـەزیانی، زیانمەندی

**ضَـرَاوَةُ الحَـرْب (شِـدَّتُهَا)**: گەرمـەی جـەنگ، وەختـی تاوسـەندنی جـەنگ‌و شەڕ

**ضَـرَبَ**: لێـی‌دا، پیاکێشـا، تێـی سـرەوان، کوتـای، دایگرتـەوە، جەزرەبەی گەیان

**ضَـرَبَ الشَّـيءَ**: جـوولا، بزوا، بـزووت، جووڵەی هات، بڤا، لپا، جڤا، ڤـەخووم، جموجووڵی‌کرد

**ضَرَبَ العِرْقُ وَالقَلْبُ:** لێی‌دا، پرتەی هات، ترپەی هات، ترپەترپی‌کرد
**ضَرَبَ الجُرحُ أو الضِّرسُ:** ژانی‌کرد، ئێش‌و ئازارەکەی پەرەی سەند، ئێش‌و ئازاری زۆر بوو
**ضَرَبَ العَقْرَبُ:** پێوەیدا، گەزتی، ژاری کردە نێو جەستەی، چزەی لێهەستان
**ضَرَبَ اللیلُ:** درێژبووەوە، خایاندی
**ضَرَبَ الزَّمَانُ:** بەسەرچوو، رۆیی، گوزەرا، پشتی هەلکرد، تێپەڕی، گوزارشتی کرد
**ضَرَبَ الطیرُ:** چوو بۆ رزق‌و رۆزیی پەیداکردن، بەدوای خۆرەی رۆژا وێڵبوو
**ضَرَبَ الخَیمَةَ:** دەواری هەڵدا، چادرەکەی هەڵدا، دای کوتی
**ضَرَبَ العَنْکَبُوتُ نَسِیجَهَا:** بەستی، رای‌هێلا، چنی، جاڵجاڵۆکەکە تەتافەکەی رامێشت
**ضَرَبَ الأجَلَ:** دیاریکرد، کات‌و وادەی دەستنیشانکرد
**ضَرَبَ المَثَلَ:** قسەی نەستەقی گوت، گوتی‌و روونی‌کردەوە، وتی‌و تیشکی خستەسەر، پەندی هێنایەوە
**ضَرَبَ الدِّرْهَمَ:** لێیداو چاپی کرد، سکەی لێدا
**ضَرَبَ الخَاتَمَ:** دایرشت، لەقاڵبیدا، دروستی‌کرد
**ضَرَبَ الصَلاَةَ( أَقَامَهَا ):** نوێژی‌کرد، نوێژی دابەست، ئەنجامیدا، بەجیّی گەیاند
**ضَرَبَ الشَّیءَ بِالشَّیءِ:** تێکەڵی‌کرد، دای بەسەریەکا

**ضَرَبَ الحَاسِبُ کَذَا فِي کَذَا:** ژمێریارەکە دووبارەی کردەوە
**ضَرَبَ الجِزْیَةَ عَلَیهِم:** سەرانەی دانا لەسەریان، باجی خستەسەریان
**ضَرَبَ عَلَیهِم الذِّلَّةَ:** ملکەچی‌کردن، سەرشۆڕی‌کردن، رسواو کەساسی‌کرد، زەبوونی کرد
**ضَرَبَ لَهُ سَهْمَاً مِنْ مَالِهِ:** پشکێکی لەماڵەکەی بۆ بڕیەوە
**ضَرَبَ عَلَی یَدِهِ:** گرتی، نەیدایە، لێی گرتەوە
**ضَرَبَ القَاضِيُ عَلَی یَدِهِ:** دادوەرەکە یاساغ‌و قەدەغەی‌کرد لەهەڵس‌وکەوت بەماڵ‌و داراییەوە، دەستی بەست‌و نەیهێشت ئازادبێت لەمامەڵە بەماڵ‌و پارەوپوولیەوە
**ضَرَبَ بِنَفْسِهِ الأرْضَ:** مایەوە، گەشتی‌کرد، تیامایەوەو جێگیربوو، رۆیی‌وسەفەریکرد(لەوشە دژەیەکانە)
**ضَرَبَ فِي المَاءِ:** مەلەی کرد، چوە نێو ئاوەوە
**ضَرَبَ بَینَهُم:** نێوانی تێکدان، شێواندنی، کێشانی بەیەکا، کردنی بەگژی یەکا، دانی بەشەڕ
**ضَرَبَ فُلاَنَاً عَنْ فُلاَنٍ:** رێگری لێکرد، یاساغ‌و رێگەی نەدا
**ضَرَبَ عَنْ فُلاَنٍ کَذَا:** نەیدایە، لێی گرتەوە، یاساغ‌و قەدەغەی کرد لێی
**ضَرَبَ بِیَدِهِ:** ئاماژەی کرد، دیاری‌کرد، دەستنیشانی‌کرد
**ضَرَبَ الدَّهْرُ بَیْنَنَا:** جیای‌کردینەوە، لەیەکی دابڕین، بەدووری کردین لەیەك، لێك دابڕین

**ضَرَبَ عَلَى أُذُنِه:** ڕێگەی نەدا گوێ بگرێ، بیستنی لێ قەدەغەکرد، نەیهێشت ببیستێو گوێی لێ بێت

**ضَرَبَ عَلَى المَكْتُوب:** مۆریکرد، ئیمزایکرد، نیشانەی لێدا

**ضَرَبَ فِي البُوق:** فوی کرد بەکەڕەنادا

**ضَرَبَ إِلَيه (مَالَ):** دڵی بۆی لێیدا، ویستی لێی نزیك ببێتەوە، حەزی پێکرد

**ضَرَبَ فِي الأَرْضِ ضَرْبَاً وَضَرَبَانَاً:** چووە دەرەوە بۆ بازرگانی یان تێکۆشان

**ضَرَبَ أَخْمَاسَاً بِالأَسْدَاس:** کەوتە پیلانو فروفێڵ، کەوتە ساختەو فروفێڵ، سەری سوڕما، کەوتە بیرکردنەوە

**ضَرَبَ عَنْهُ صَفْحَاً (تَغَاضَى عَنْه):** بەخشی، لێیبورد، چاوی لێ پۆشی

**ضَرَبَ بِآفَة:** دەردی تێکەوت، بەلاو ئافە لێدا، تووش بوو

**ضَرَبَ تَلْغِرَافَاً (أَبْرَق):** بروسکەی لێدا، بروسکەی نارد

**ضَرَبَ تَلفُونَاً (تَكَلَّمَ):** تەلەفۆنی کرد، بەتەلەفۆن قسەیکرد

**ضَرَبَ العَدُود بِالقَنَابِل (قَصَفَهُم):** بۆردومانی کردن، تێی گرتن، بۆی هاویشتن

**ضَرَبَ رَأْسَهُ فِي الحَائِط (دَقَّه):** سەری خۆیدا بەدیوارا، سەری کێشا بەدیوارا

**ضَرَبَ ضَرْبَاً مُبَرِّحَاً:** توند لێیدا، دڵڕەق بوو لەلێدانەکەیدا، چاکی کوتا

**ضَرَبَ الضِرْسُ أَو نَحْوَه:** ئێشو ئازاری کاریگەربوو، بەژانو ئازاربوو

**ضَرَبَ فِي الأَمْرِ بِسَهْمٍ وَنَحْوَه:** بەشداری تێداکرد، هاوبەشی بوو

**ضَرَبَ اللَونِ إِلَى اللونِ:** مەیلەو ...بوو، روویە...بوو

**ضَرَبَ النَومُ عَلَى أُذُنِه:** خەو زاڵبوو بەسەریا، خەو بوو بەبار بەسەریەوە

**ضَرَبَ عَلَيه الحِصَار أَو النِطَاق:** سنووورداری کردو تەنگی پێهەڵچنی

**ضَرَبَ الرُزّ:** پاکیکرد، لێیکردەوە

**ضَرَبَ لَهُ الأَرْضَ كُلَّهَا:** بەشوێنیا گەڕا لەهەموو شوێنێك

**ضَرَبَ الرَقْمَ القِيَاسِيَّ فِي الرَبْعِ أَو العَدْدِ مَثَلاً:** نمرەو ڕێژەیەکی نوێی تۆمارکرد کەهیچ کەسێك پێی نەدەگەی

**ضَرَبَ الآلَةَ المُوسِيقِيَة:** ژەندی، لێدا، ئاوازی مۆسیقی پەخشکرد

**ضَرَبَ الجَرَسَ:** لەزەنگیدا، جەرەسی لێدا

**ضَرَبَ الجَذْرُ:** رەگی داکوتا، رەگی ڕۆچوو

**ضَرَبَ مَثَلاً:** نموونەی هێنایەوە، مەسەلەی هێنایەوە

**ضَرَبَ اللِحَافَ:** بەرگی تێگرت، چەرچەفی پیاگرت

**ضَرِبَ ـ ضَرَابَة:** بەتوندوتیژی لێیداو مەبەستی پێکا

**ضَرِبَ بَينَهُم:** تێکیدان، نێوانی شێواندن

**ضَرِبَ ـ ضَرَبَاً:** سەرماو گەرما لێیداو زیانی پێگەیاند

**ضَرِبَ الحَيَوَانُ:** ورگو سکی کشاو فراوانبوو

**ضَــــرْبٌ:** لێـــــدان، كوتـــــان، جەزرەبەگـــەیاندن، جـــۆر ، بابـــەت، چەشـــن، وەك، یەكســـان، هـــاو...، چوونیەك
**ضَـرْبُ العِـرقِ أو القَلب:** ترپـەو پرتـەی دڵو خوێنبەر
**ضَـرْبُ الضَرائـب:** بـاج دانـان، ســەرانە سەندن
**ضَرْبُ الأعْدَاد:** لێكـدان ، دبەرهـەڤدان، دوو یا چەندكەسێك لەیەكتری بدەن
**ضَـرْبُ النُقـود( سَـك ):** سـكەلێدان، دراو دروستكردن
**ضَرْبٌ( فِي الأحْيَـاء ):** لـەزیندەوەرزانیدا بریتیە لەیەكەیەكی پۆلێنكراوی پچووك وەك رەگەزو نەژاد
**ضَــرْبٌ( فِــي إصطـلاح العَــروض ):** لەزانستی هۆنـراوەدا بریتیـە لــەدوایین تەفعیلە(یەكە) لەرەوییـەی (مصـراع)ی بەیتی دووەمدا
**ضَرب ـ ضُرُوب( ضَارِب ):** لێدەر، كوتەر، پیاكێش ، داگرەرەوە
**ضَربٌ:** لێزان لەلێدانو داگرتنەوەدا
**ضُرِبَان:** رووداوەكانی سەردەمو رۆژگار
**ضَرَبَتِ الطَـیرُ:** فـڕی، بـاڵی گـرت، دای لەشەقەی باڵ
**ضَرْبَـةٌ:** لێدانێـك، كارەسـات، بـــەڵا، نەهامەتی كشتوكاڵو دەغڵو دان
**ضَرْبَـةُ شَـمْس( رَعَـن ):** خۆربــردن، خۆرلێدان
**ضَرْبَةٌ قَاضِیَةٌ:** لێدانی كوشندە، لێدانی كاریگەر
**ضَرْبَةٌ وَاحِدَةً:** یەك جارو كەرەت

**ضُرّةٌ:** كەمو كەلی لەماڵو دارایی‌و رۆح‌و نەفسا
**ضَرَّةٌ:** جارێك، پێویستی، پشێوی حاڵو بـار، زیـان، مـەمك یـان گـوان بەشـێوەیەكی گشـتی، مـاڵێكی زۆرو بێ‌شومار
**ضَرَّةُ المَرَأةِ:** هەوێ، هەوە، دوو یا چەند ئافرەتێك ژنی پیاوێك بن
**ضَرَّتَــان:** دوو هـــەوێ، هەوێســـار، دووبەردی دەستاڕ، دەستاڕ
**ضَـرَجَ الثَـوبَ بِـالدَم:** خوێنـاوی‌كرد، جل‌وبەرگەكەی خوێناوی كـرد، خوێنـی تێوەدا ، لەخوێنی هەڵسوو
**ضَــرَجَ الشَّــيءِ( شَــقَّهُ ):** دایــدڕی، قڵیشانی، دڕانی، دڕاندنی شتی تەنراوو هێندێ شتی‌تر
**ضَـرَجَ الشَّـيءِ إِلَـى الأرضِ:** فڕێیــدا، توڕیدا، هاوێشـتی، كـەوژاندی، تــووڕو هەڵیدا، دوورخستنەوەی شتێك لەخۆت بەهاوێشت‌و تووڕدانی
**ضَرَّجَ الثَّوبَ:** بەسوور بۆیەی كرد
**ضَرَّجَ الأنْـفَ:** خوێنـی لێـهێنا، خوێنـی بەردا، خوێناوی‌كرد
**ضَـرَّجَ الكَلامَ:** رازاندیـەوە، جوانیكـرد، دەستی پیاهێنا
**ضَرَحَ الشَّيءِ:** دڕاندی، قڵیشانی، درزی تێكرد،دەستی پێوەنا،دووری‌خستەوە، پاڵی پێوەنا
**ضَرَحَ القَبْرَ( حَفَرَه ):** هەڵیكـەند، گـۆڕی هەڵكەن
**ضَــرَحَ للمَیِّــت:** گـۆڕی بـۆ مردوەكــە هەڵكەند، گۆڕی بۆ ئامادەكرد

**ضَـرْح( تَبَـاعُد وَوَحْشَـة ):** دووری، بیرکردن، دڵ لەلابوون، یادی کەسێ یا شتێك کردن

**ضَرَحَتِ السُّـوقُ:** بازاڕ ساردی رووی تێکرد، جموجووڵی فرۆشتن دابەزی

**ضَرَحَتِ الدَّابَـةُ ضِراحـاً:** ریخی‌کرد، تەرسە قوڵی کرد

**ضَرَحَتْ شَهَادَةَ فُلاَن:** بەرپەرچی‌دایەوەو وەری نەگرت، شایەتی وەرنەگرت‌و خستی

**ضَرَّرَ:** زیانی پێگەیاند، زەرەومەندی‌کرد

**ضَـرَر:** زیان، وەی، وەزەن، زەرەر، دۆڕاندن، شکاندن، لەدەس چوون، بەدحاڵی، نسکۆو هاتنە دواوە، تەنگی

**ضَرَسَ الشَّيءَ( عضَّهُ بِـالضرس ):** گازی لێگرت، گازی توندو قایمی گرت

**ضَرَسَ الزَّمَانُ فُلاَناً:** توندو سەخت بوو لەسەری، تەنگی پێ هەڵچنی

**ضَرَسَ البِئْرَ:** بەبەرد هەڵی چنی

**ضَـرَسَ الدَّابَـةَ:** لووتی بڕی پاشان پەتێکی تێکرد هەتا ملکەچ‌و زەبوونی بکات

**ضِرْس:** خرێ، دان، خلێنە، کاکیلە، بریتیە لەچوار ددانە گەورەکانی سەرو خوارەوەی هەردوو لاشەویلگەکان

**ضِرْسُ العَقْل:** دانی ژیری، دانی عەقڵ، خرێ

**ضَـرْس:** ئەو بەردەی بیری پێهەڵدەچنرێ، کەمەباران، گردو تەپۆڵکەی سەخت‌و گران

**ضَرِس:** بەدخوو، رەفتارو توندو تیژ، یەکێك لەبرسا تووڕەببێت، ئەوەی ئەزموندارەو گەشت‌و کوشتاری کردوەو چەشتوە، یەکێك لەگەڵی هەڵنەکرێ، تووڕەو هارونالەبار

**ضَرِسَـتِ الأَسْـنَانُ (كَلَّـت):** خوورا، کرمێ‌بوو، کلۆربوو، پەکی کەوت، پیربوو، دوایی هات

**ضَرَسَـتْهُ الأَيَـام:** رۆژگارو ساڵ ئەزمونداری کرد، ئاوەسووی‌کردو دەرسی‌دایا

**ضَرَّسَهُ الزَّمَان:** گەزتی‌و دەرسی‌دایا

**ضَرَطَ:** بای لێبەربوەوە، تڕی کەند

**ضَـرَّطَ ـ أَضْـرَطَ الحِمَـار:** تڕانی، کەرەکەی تڕان

**ضَرْط ـ ضُرَاط( رِيحٌ نَتِنٌ تَخْرُجُ مِنَ البَطْنِ أو داخِلَ الإنْسَان ):** تڕ، با، کەنن، راهێشتن، بایەکی دەنگداری بۆگەنە کەلەناو سکدا پێچ دەخواو بەداوێنی پشتەوەدا دەردەپەڕێ

**ضَرَعَ مِنَ الشَّـيءِ:** لێی نزیك بوەوە، لێی هاتە پێش

**ضَـرَعَ الشَّـمْسُ:** خۆر ئاوابوو یان خەریکبوو ئاوا دەبوو یاخود نزیك بەئاوابوون بوو

**ضَرَعَ الرَّضِيعُ:** مەمکی دایکی خوارد، مژی، قومی لێدا، دەمی پێوەنا

**ضَـرَعَ الحَيـوَانُ:** لەڕوولاوازبوو، کەم گۆشت بوو

**ضَـرَعَ إِلَيـهِ وَلَـهُ:** ملکەچ‌و سەر شۆڕی‌بوو، سەری نەویکرد بۆی، داوای لێکرد یارمەتی‌و کۆمەکی بکات

**ضَرِعَ ـ ضَرَعاً وَضَرَاعَةً**: لاوازبوو، لەربوو، کەم گۆشت بوو، سستو ناتوانا بوو

**ضَرْع( ثَدي الحَيوَانات )**: گوان، مەمکی مانگاو گامێشو ئاژەڵانی مێینەیە

**ضَرَعٌ**: لاواز، ترسنۆک، سست، زەبوون، کەساس ، داماو

**ضِرْعٌ**: وەك، وەکو، هاوشێوە، هاوچەشن، هاورەنگو بۆ، لێکچوو، لەیەکچوون

**ضَرْعَاء**: گوان زل، گوان گەورە ، گیاندارێك یەکجار گوانی گەورە بێت

**ضِرْغَام**: شێرێکی درندەو بەزیان، ئازا، گوستاخ، بەهێزو توانا

**ضِرْغَامَة**: مەردومی ئازاو گوستاخ، دلاوەرو بەتوانا

**ضَرْغَم**: شێری بێشەلان

**ضَرْفَطَهُ**: توندو شەتەکیدا، پتەوو چەسپاوی کرد

**ضَرِكَ ـ ضَرَاكَةً**: هەژارو گەدا کەوت، نەزانو گێل بوو، راماوو بەدبەخت بوو

**ضَرِمَ ـ ضَرَماً**: برسێتی یان تورەبوونی تاوی سەند، ئاگری گرت، گڕی گرت، تەنیەوە، داگیرسا، رقی هەڵسا

**ضَرِمَ الشَّيء**: گەرماو تینی تاوی سەند

**ضَرِمَ فُلاَن فِي الأَمر**: کۆشاو پەلەیکرد، هەوڵیداو خێرای کرد

**ضَرِمَ فِي عَدْوِهِ ـ ضَرِمَ فِي أَكْلِه**: لەراکردنو نانخواردنا خێراو پەلەی کرد

**ضَرِمَ النَّار وَنَحْوَهَا**: ئاگری پێوەنا، خۆشی کرد، تاوی پێسەند، کڵپەی پێ سەند، دایگیرسان ، گڕوبڵێسەی ئاگرەکەی پتر زیادکرد

**ضُرْم ـ ضُرْم**: دارێکی بۆنخۆشە بەروبوومەکەی وەك بەروو وایەو دووکەڵو بۆنی خۆشەو پتر لەولاتی لوبنان هەیە

**ضِرْم**: بەچکەی داڵ ، بەچکە داڵ

**ضَرَم**: ئەودارەی ئاگری پێ خۆش دەکرێت

**ضَرِم**: برسی ، بەچکە داڵ، ئەسپی تیژرەو

**ضَرَمَة**: پشکۆ، سکڵ، پۆلووی ئاور

**ضَرُوب**: زۆرلێدەر، فرەوەشێن

**ضَرُورَة**: پێویستی، تەنگانە، ناچاری، ویستن

**ضَرُورِيٌّ( لاَزِم )**:پێویست ،وازلێنەهێنراو، دەست لێهەڵنەگر ، بەدەر لەویستو خوازی هەڵبژاردن

**ضَرُورِيَات**: شتومەکی پێویست ، پێداویستی، پێویستی ژیان

**ضَرُوس**: هار، وێرانکار، خراپکار، وشترێك هاربوبێتو دۆشێنەری بگەزێ

**ضَرُوع**: ئاژەڵی ماڵیو ئاسان جڵەو ، ئاژەڵی خۆش جڵەو

**ضُرُوع**: گوان زل، گیاندارێك گوانی گەورە بێت

**ضَرِيَ بِالشَّيء**: ئارەزوومەندی بوو، ئالوودەی بوو، حەزی لێکرد، شێتو شەیدای کرد

**ضَرِيب**: لێدەر، کوتەر، چەشن، جۆر، شێوە، بەش، شێوەی خەڵکی، بەفر، شمشێری تیژ، ئەو شیرەی لەگەڵ وشتر دەدۆشرێو دەکرێتە یەك قاپو دەفرەوە یان دۆشینی هەندێك لەوشیرانە بەسەر هەندێکی ترا

**ضَرِيبَة:** شويّنى ليّدان لەلەشدا، پارچەيەك لەخورى يان موو ياخود لۆكە كەوا برِيسريّت ، سروشتو خوو، ئەو سەرانەو باجەيە كەلەسەر موڵكو ماڵو پيشەو كارو كاسپى لەلايەن دەوڵەتەوە دادەنريّت ئەمەش بەپيّى ياساو حاڵو بارى دەوڵەتان دەگۆريّت

**ضَرِيبَةُ الأَمَانِ (جِزْيَة):** سەرانە، قوربانى سەر، باجيّكە لەمو لەو دەسيّنرىّ لەجياتى سەرى خۆىو پاراستنى ماڵو سامانىو دابينكردنى هيّمنىو ئاسايش بۆى

**ضَرِيبَةُ الأَطْيَانِ للأَرَاضِيِ الزِرَاعِيَة:** زەوييانە، پيتاكى زەوى

**ضَرِيبَةُ العَقَار:** ملّكانە،خانوانە، كرىّو باجى خانوو، داهاتى خاوەن زەمين لەرەعيەتان

**ضَرِيبَةُ التَّرِكَات:** ميراتانە ، ئەو باجەى لەسەر موڵكو ماڵى ميراتى دانراوە

**ضَرِيبَةُ الدَّخْل:** باجى دەستكەوت

**ضَرِيبَةُ المِهْنَةِ الحُرَّة:** باجى پيشەى ئازاد، كاسبانە، پيشانە

**ضَرِيبَةُ الإِنْتَاجِ المَحَلِيّ:** باجى بەرهەمى خۆماڵى، باجى بەرهەمە ناوخۆييەكان

**ضَرِيبَةُ إِضَافِيَة:** سەرباج، باجى زيادە سەربارى ئەو باجەى دانراوە

**ضَرِيبَةُ تَصَاعُدِيَة:** باجى زۆرى دەستكەوت، باجى بەرزبوونەوەى ريّژەى دەسكەوتو داهات

**ضَرِيبَةُ إِستِثْنَائِيَة:** باجى لابەلا، باجى تايبەتى، باجيّك لەناكاو بارودۆخيّكى هەڵتۆقيوا دەسەپيّنرىّ

**ضَرِيج:** رەنگو بۆيەكراو بەسوور ، مەيلەو سوور

**ضَرِيح:** گۆر، قەبر ، گڵكۆ، ئارامگە، پانايى، چاڵيّكە كەمردووى تيا بنيّژرىّو كەسوكارو دۆستانى بچنە سەرى

**ضَرِير:** كويّر، نابينا ، پشوودار، بەئارامو پشوو، نەخۆشى لاوازو لەر، هەرشتيّك ناتەواوى تيّكەڵ بووبيّت، غيرەكردن، نەفس، پاشماوەى جەستەو تەن

**ضَرِيس:** بيريّك بەبەرد هەڵچنرابيّت، برِبرِەى پشت، برسى ، هەر بيناو ساختمانيّك

**ضَرِيع:** گيايەكە - دركيّكى تاڵى بۆگەنە، گوانيّكى زلو گەورە

**ض ع**

**ضَعْضَعَ البِنَاءُ:** بيناكەى رووخان، تەختىكرد، ويّرانىكرد، تيّكيدا، رمانى، خاپوورى كرد

**ضَعْضَعَ الرَّجُل:** لاوازى كرد، زەبوونى كرد، كزو سستى كرد، ملكەچيكرد، خستيە ژيّر دەستەلآتى خۆيەوە

**ضَعْضَع:** لاواز، شلۆق، لاوازو كزو زەبوونى هەرشتيّك

**ضَعْضَعَة:** نەبوونى، بىّ دەستەلآتى، شلۆقى، تەنگانەو برسيّتى

**ضَعَفَ:** لاوازبوو، بىّهيّزو زەبوون بوو، واژوى هيّزو دەستەلآتە

**ضَعَفَ القَومَ:** ژمارەيان زيادى كرد، پتر بوون ، زۆر بوون

**ضَعَفَ الشَّيءِ:** كردى بەدوو ئەوەندە، دوجاى كرد، بىّهيّزو زەبوونى كرد

**ضَعُفَ الطَّالِبُ وَالمَطْلُوب:** داواكارو داوالێكراو هەردووكيان لاوازو بێ دەسەڵاتن ، ئەم دەستەواژەيە لەقورئانی پیرۆزدا هاتووەو لەميانەی بەراوردێكدا كەپەروەردگار بۆ بەندەكانی دەهێنێتەوە گوايە ئەوانەی هاناو هاواريان لێدەكەن لەجياتی خوا هەرگيز ناتوانن تاكە مێشێك بۆ ئەو كارە گردو دەستە كۆبكەن يان پەناو پشتگيری يەك بكەن خۆ ئەگەر مێشەكەش شتێكيان لێ بسەنێت ئەوا ناتوانن لێی بسەننەوە ئەوجا داواكارو داوالێكراو بەهيچو لاوازو بەتاڵ دەخاتە روو

**ضَعُفَ الشَّيءَ:** كردی بەنيو يەكا، تەنگی پێهەڵچنی، پاڵە پەستۆی كرد، پەستاوتی

**ضَعَّفَ الحَدِيثَ:** لاوازيكرد، لاوازكردنی فەرموودە لەرووی فەرموودە گێرەرەكانەوە يان دەقەكەيەوە

**ضَعْف - ضُعْف:** لاوازی، بێهێزی، تەنگی، ناتوانايی، چرووكی، لاوازو خواستی

**ضِعْف:** دوو جا يا چەند جا

**ضِعْفُ الشَّيء:** هاوتای خۆی لەئەندازەو كێشا يان زيادەيەكی ناديارە

**ضُعفَان:** سستو ناتواناو برەوت

**ضَعُوف:** لاواز، سست ، كەم توانا، زەبوون ، كەساس

**ضَعِيف:** بێهێز ، لاواز، چرووك، تەنك، رايج

**ضَعِيفُ البُنْيَة:** لاواز، لەڕ، رەقو تەق، زەبوون، ريوەڵە، سيس، جيقنە، كەسێك لاوازو لەرپێت

**ضَعِيفُ الإِرَادَة:** لاواز خواست، بێدەستەڵات، خوازو ويست لاواز، يەكێك ويستو خواستی لاوازو كزبێت

**ضَعِيفُ القَلْب:** ترسنۆك، تۆقيو ، ترسەنۆك، بێزاڵە، دڵسست، بێجەرگ، نەوێرەك، نەوێرۆك، نەوێر، ترساو، ترسەزاڵ، رەوەك، ترسيار، بەزدۆنەك، بزدۆك، ترسۆ، تروسك، قرچاڵە، دلكەچك، حاڵێكی دەروونييە هەميشە دەبێت بەبار بەسەر ئەوانەوە كەلەرووداو يان پێشهاتو گشت شتێك سڵ دەكەنەوە

**ض غ**

**ضَغَا المُقَامِرُ:** ناپاكی كرد، ناراستو دروستی كرد ، قومارچييەكە ناپاكیو درۆيكرد، گزيكرد

**ضَغَا إِلَيه:** ملكەچ بوو، سەرشۆڕبوو، كزو زەبوون بوو

**ضَغَا القِطُّ وَنَحوه:** پشيلەكە لەئێشو ئازارا ناڵە ناڵی لێبەرزبوەوە ، ناڵەو هاواريكرد، پشيلەو هەرگياندارێك ناڵەو هاواری لێبەرزببێتەوە

**ضُغَاء - ضَغْو:** ناڵەو هاواری پشيلە ، مياواندن

**ضُغَاب:** دەنگی كەرويشكو گورگ

**ضَغَاثَة:** خراپو ناجۆری ماڵو داراييو هەرشتێكیتر

**ضُغَامَة:** ئەوەی گازی لێدەگيریو دەكرێتە نێو دەمەوە

**ضَغَبَ ـ ضَغْباً**: وەك گورگو کەرویشك دەنگی لێبەرز بووەوە

**ضُغْبُوس**: نێرینەی ڕێوی، لاوازی سووكو ڕسوا، بەڕووله خەیارو ترۆزی

**ضَغَثَ الحَدِيثَ (خَلَطَهُ)**: ئەدای بەسەریەکا، تێکەڵو پێکەڵی کرد، ئاوێتەی کرد

**ضَغَثَ الشَيءَ (جَمَعَهُ)**: کۆی کردەوە، دەستەیکرد، دایە پاڵ یەك

**ضَغَثَ الثوبَ (غَسَلَهُ)**: شتی ، شۆردی بەلام پاکی نەکردەوە

**ضَغَثَ المَرأةُ شَعْرَهَا**: دەستی خستە نێو قژی لەکاتی شتندا هەتا ماددە پاککەرەوەکانی پێ بگەیەنێتو ئاو بگەیەنێت بەپێستەکەی

**ضَغَثَ الشَيءَ**: دەستی لێوەدا بۆئەوەی تاقی بکاتەوەو بزانێت چۆنە

**ضِغْثٌ ـ ضَغْثٌ (حِزْمَةٌ صَغِيرَةٌ)**: چەپك، دەسك، قول، باقە، تەنگە، دەسکە گوڵ یا گیا یان سەوزەو شتیتر

**ضَغْرَسٌ**: پیاوێکی نەوسنی پشت ئەستوور

**ضِغْزٌ**: شێر ، درندەو کەڵبەدارەکانی ڕەوشیان پتر دڕندەو مەترسیدارە

**ضَغْضَغَ اللحمَ**: بەباشی نەیجوی ، باش گازی لێنەگرت

**ضَغْضَغَ الكَلامَ**: ڕوونی نەکردەوە، ئاشکرای نەکرد، ڕوونو ئاشکرا نەبوو

**ضَغَطَ**: پەستانی، دەستی پیانا، پەستاوتی، گوشی

**ضَغَطَ زَحْمَةُ**: تەنگی پێهەڵچنی ، فشاری خستەسەر

**ضَغَطَ عَلَى**: تەنگی پێهەڵچنی ، گوشتی، زۆری بۆهێنا، زۆری لێکرد، ناچاری کرد

**ضَغَطَ الكَلامَ**: بەلێهاتوویی بەجێی گەیاند

**ضَغَطَ عَلَيهِ فِي غُرمٍ أو نَحْوِهِ**: توندو تیژبوو، فشاری بۆهێنا، ڕقی هەستان

**ضَغْطٌ**: پەستاوتن ، پەستان، تەوژم، پەستۆ، گوشار، فشار، پاڵەپەستۆ، زۆرلێکردن، تەنگ پێهەڵچنین

**ضَغْطُ الدَم**: تەوژمی خوێن ، خوێن پەستان

**ضَغْطٌ عَالِيٌ**: پاڵەپەستۆی بەرز

**ضَغْطٌ وَاطِيءٌ ـ خَافِضٌ**: پاڵە پەستۆی نەوی، نزم

**ضَغْطُ القَبْرِ**: گوڕەوشار، هاتنەوەیەکی گۆڕ، ئازارو ئەشکەنجەی گۆڕ

**ضُغْطَةٌ**: تەنگو نابەرینی، توندوتیژی، قەڵەبالغی

**ضَغْطَةٌ**: تەنگەبەریی، ناگوشادیی، ناچاریی

**ضَغْطَةُ القَبرِ**: هاتنەوەیەکی گۆڕ لەمردوو ، گوڕەوشار

**ضَغَمَ الشَيءَ**: قەپی پیاکرد، پڕبەدەم گەستی

**ضَغِنَ عَلَيهِ (حَقَدَ)**: ڕقی لێگرت، بەرقبوو لێی، کینەی لێهەڵگرت

**ضَغِنَ إلَى**: حەزی لێکرد، ئارەزوویکرد، دڵی پیاچوو

**ضَغِنَ العُودُ ونَحْوَهُ**: لاریوەوە، خوارو خێچ بوو، چەمایەوە

**ضَغِنَ الدَابَةُ**: یاخی بوو، سەرپێچیکرد لە سوارەکەی،هەڵی تیزانو بەلەسەبوو

**ضِغْن**: كینە، رق ، قین ، پشم ، مان ، دەغەز، دەخەز، كەرب، جەهر، حەیرس هەستان، رق هەستان

**ضَغُوف**: كانی پڕ ئاو

**ضَغِیب**: دەنگی كەروێشك و گورگ

**ضَغِینَة**: رق و قین ، خەشم و دەغەز

**ض ف**

**ضَفَّ القَومُ عَلَى الشَيء**: كۆبوونەوەو یەكیانگرت، گردو دەستەیان بەست ، كردیان بەقەڵەباڵغی

**ضَفَّ المُصطَلِي**: پەنجەكانی كۆكردەوەو لەئاگری نزیك كردەوە

**ضَفَّ الشَيءَ**: كۆیكردەوە، دایەپاڵ یەك

**ضَفَّ الحَال**: گوزەران و بژێوی خراپ، بەد دەرامەت و گوزەران

**ضَفَا الرَأسُ**: قژی زۆر بوو، فرە قژبوو، تووكەسەری زۆر بوو

**ضَفَا الإنَاءُ**: پڕبوو، لێی رژا ، لێوانبوو، سەرلێوبوو، لێوان لێو بوو، پڕبوو

**ضَفَا الشَيءُ**: گەشەی سەندو زۆر بوو، پەرەی سەندو زیادی كرد

**ضَفَا الثَوبُ**: بۆیەی كرد ، رەنگی كرد

**ضَفَا(جَانِب)**: لا ، تەنیشت ، قەراخ ، سیلە

**ضَفَاز**: فیتنە ، قسەهێنەرو قسەبەر ، دووزمان

**ضَفَّة ـ ضِفَّة**: كەنار، قەراخ ، گوێ رووبار، كۆمەڵ، دەستە، چەند كەسێك

**ضَفَد**: بەبەری لەپ پیاكێشا، شەقازلەی لێدا

**ضَفدَعَ المَاءُ أو المَكَان**: بۆقی زۆر بوو، فرە بۆق بوو، بۆقی هەڵهێنا

**ضِفدَع ـ ضِفدَعَة**: بۆق ، هەفتجاڕ، قڕواق ، قوڕباق، قوڕباقە، دەعبایەكی پانكەڵەی چوار پێی پەڵەپەڵەی مەلەوانە

**ضَفَرَ ـ ضَفْراً**: بازیداو رایكرد، قەڵەمبازیداو هەڵهات

**ضَفَرَ ـ ضَفَرَ الحَبْلَ(فَتَلَهُ)**: بایدایەوە، لوولیكرد

**ضَفَرَ الشَعْرَ**: هۆنیەوە ، بایدا

**ضَفَرَ البِنَاءَ ونَحْوَهُ**: بەبەرد دروستیكرد بێقوڕو گەچ و چیمەنتۆ، كردی بەنێو یەكا لەسەر شێوەی سێ تاڵەی پرچ و قژ ، بەوشكەكەڵەك هەڵیچنی

**ضَفَرَ الدَابَّةَ**: لغاوی كرد

**ضَفَر**: هۆنینەوە، پرچكردن، قەیاسە، قایش قەیاسە، تەنگە ، قایش ەنگە، وشكە كەڵەك

**ضَفِرَة**: ئەو گڵ و خۆڵ و لمەی لەسەریەك دەنیشێت و كۆدەبێتەوە

**ضَفَزَ**: بازیداو رایكرد ، قەڵەمبازیداو هەڵهات

**ضَفَزَ الشَيءَ**: بەدەست و قاچی پاڵی پێوەنا

**ضَفَزَ الحَیوَان**: جۆی كوتراو یا هاڕاوی خستە بەردەمی

**ضَفَز**: جۆی هاڕاو یان كوتراو

**ضَفَف**: پێویستی ، نەبوونی، كزی، خێزانداریی، منداڵ زۆریی ، ماڵ و سامان كەمی، نەبوونی و هەژاریی ، لاوازی و كزیی، پەلەكردن لەكارو كردارا

**ضَفَنَ بِالشَيء**: فڕێیدا ، توڕیدا

**ضَفَنَ الدأبَةَ بِرِجْلِهَا:** بەقاچ شەقی لێدا، خستیە ژێر پێوە
**ضَفَنَ مَعَ الضَيـف:** شـوێنی کـەوت، دوایکەوت، بەدویا ڕۆیی
**ضَفَنَ الشَيءَ عَلَى الدأبَـة:** بـاریکرد، لێی نا، خستیە سەر پشتی
**ضَفَنَ ضَرعُ النَاقَـةِ وَنَحْوَهـا:** گرتـیو دۆشی، هێنایەوەیەك بۆ دۆشین
**ضَفَنَ فُلانَاً:** بەشەق لێیدا
**ضَفَن:** کورتەبالا، کورتە بنە
**ضَفـوَةُ العَيـش (رَغَــدُهُ وَسَــعَتُهُ):** خۆشـگوزەرانی، حـالْ باشـی، بژێـوی باشی
**ضَفِـير:** هــەر دەسـتە موویـــەك هۆنرابێتەوە، قەراخی دەریا،، قایش
**ضَفِيرَة:** پرچ، پەلکە، کـەزی، گیـس، هـوون، قـژ، بەهـەموو تووکـی سـەری ئافرەتـان دەلێـن کەلـەلای پشـتەوە شۆڕبێتەوە
**ضَفِيزَة:** پاروویەکی گەورە

**ض ك**

**ضَكَ الأمْرُ فُلانَـاً:**تـەنگی پێهـەلچنیو تووشی نیگەرانیو بێزاریی کرد
**ضَكَ فُلانَاً بِالحُجَّة:** شکستی پـێ هێنـا بە بەلگەو نموونە هێنانەوە
**ضُكَـاضِك:** کورتــە بنـــەی قەلـــەوی تێکسمڕاو
**ضَكْضَكَ:** پەلەیکرد، خێرایکرد
**ضَكْضَكَ الشَـيءَ:** فشاری خستەسـەر، گوشی
**ضَكْضَكَ المَطَرُالأرْضَ:** شتی، شۆردی
**ضَكَّهُ:** پەستاوتی، فشاری خستەسەر

**ض ل**

**ضَلَّ:** گومڕابـوو، لایدا، تـرازا، لـەئایین یان راستی یـاخود هـەر رێبـازێك لایداو دوورکەوتەوە
**ضَلَّ الطَرِيـقَ أو عَنْـهُ:** نـەچوە سـەری، نەیدۆزییەوە، لێی لایدا، رێگەی ونکرد
**ضَلَّ الشَـيءَ عَنْـهُ:** ونبـوو، گـوم بـوو، کەوت، دیارنەما
**ضَلَّ سَعْيُهُ:** سـەرکەوتو نـەبوو، دۆڕا، تووشـی نسـکۆ هـات، هەولـەکانی بەهەوانتـە رۆیـیو نەگـەیی بـەپایانو مەبەست، رەنج بەبابوو
**ضَلَّ الشَيءَ:** خراپ بوو، بەسەرچوو
**ضَلَّ الرَجُلُ:** مردو بـوو بـەخاكو خۆلو هەر ئێسکەکانی مایەوە
**ضَلَّ الرَجُلَ:** لەیادی کرد، لەبیری چوو، بیری کرد
**ضَلَّ المَيتُ فِي الأرْضِ:** ونبوو، دیارنـەما، شاردرایەوە
**ضَلَّ النَـاسيَ:** بیری نەما، لەبیری چوو
**ضَلَّ - ضُلَّ:** گومڕایـی، لادان، رۆچـوو لەگومڕاییدا یان باوکی نادیـارە یـاخود نازانرێ لەکێیەو خۆی کێیە، مەینەتیو دەردەسەری
**ضَــلال - ضَلالَــة:** گومڕایـــی، سەرلێشێواویی، سـەرگەردانی، لـەرێی راسـتو ئـاین لادان، سـاختە، ناتـەواو لەبیروبۆچووندا
**ضَلَّة:** گومڕایی، سەراسیمەیی، رێنمـای شارەزاو لێزان
**ضِلَّة:** گومڕایی، وێڵیو سەرگەردانی
**ضَلعَ الشَيءَ:** لاربـوو، چەمایـەوە، وەك پەراسووی لێهات

**ضَلَعَ عَنِ الحَقِ:** لایدا ، ترازا ، دەرچوو

**ضَلِعَ ـ ضَلَعاً:** هەر خۆی لاربوو ، خواربوو، چەمایەوە

**ضَلَعَ مَعَ فُلانٍ:** سەریەوبوو هاوکاریکرد، یارمەتیداو کۆمەکی کرد، تێربوو

**ضَلُعَ ـ ضَلاعَةً:** بەهێزبوو، پتەوبوو، پەراسووەکانی پتەووقایم بوون، سینەفراوان و پتەوبوو

**ضَلُعَ فَمُهُ:** فراوانبوو، گوشادبوو، بەرینبوو، ددانی لەپاڵ یەکا بوو بێ بۆشایی، نوسابوون بەیەکەوە

**ضَلَّعَ( عَوَّجَ وَثَنَى ):** خواری کردەوە، چەمانیەوە، نوشتانیەوە، چەوتانیەوە

**ضَلَّعَ الثَوبَ:** چین چینی کرد، هێڵ هێڵی کرد و ڕێکی خست

**ضِلَع:** پەراسوو، پاڵوو، کەلەکە، دەفە، دەندە، پاراسوو، پارسوو، پارخان، پەرانسوو، پارووخان، پەرەکە، چەندئێسکێکی کەوانەدارە لەراستو چەپی لەشی گیاندارانا سەرێکیان بەستوونی سینگەوەو ئەوسەرەکەی تریشیان بەبڕبڕەی پشتەوە نووساوە

**ضِلَعٌ هَنْدَسِيٌ:** پەل ، لا ، باسك ، پاڵوو

**ضِلَعٌ مِنَ الفاكِهَةِ:** قاش ، كووز،سووچ،كۆشە، تیلم ، گوویز، دیلم، قاشی كاڵەك و شووتی و...

**ضِلَعٌ ثابِتٌ:** پەراسووی نووساو، پەلی نووساو

**ضِلَعٌ سائِبٌ:** پەراسووی بەرەلا، پەلی بەرەلا

**ضَلَع( مِيل وَعَوَج ):** خواری، لاری، چەماوەیی، چەوتی، نارێکی

**ضَلَعٌ:** لاریی و خواروخێچی ، سروشتی، رەوشت بەرزی، هێز، توانا

**ضِلْعٌ:** برۆ، ئەبرۆ، تەڵە، داو، تاکە شاخ

**ضِلَعَةٌ:** ماسیەکی پچووکی سەوزە، لا، قەراخ

**ضَلَّلَ:** گومڕایکرد، سەری لێشێواند، بەرەو تاریکی بردی، وێڵی کرد، ڕێی لێ ون کرد ، هەڵیخەڵەتاند، خۆی لێگۆڕی، شاردیەوە

**ضَلَلٌ:** وازۆی ڕێنمایی و ڕێی راستە، ئەو ئاوەی لەژێر تاشەبەردێك یان لەنێو دارودرەخت دەڕوات و تیشکی خۆر لێی نادات

**ضَلُول:** گومڕا ، سەرلێشێواو، وێڵ، سەرگەردان ، ونبوو

**ضَلِيعٌ:** بەهێز، بەتوانا، بەکار، چوارشانە، تێکسمراو، شیشمان، کەتە، زەبەلاح، دارێژراو ، سینە، تۆکمەو پتەو

**ضِلِّيل ـ ضِلِّيل:** گومڕا، سەرلێشێواو ، زۆر گومڕاو سەرلێشێواو

## ض م

**ضَمَّ الشَيءَ:** كۆی كردەوە، گردیكرد، دەستەی كرد، یەكیخست، دوورییەوە، تێكەڵیكرد

**ضَمَّ عَلَى الشَيءِ:** خستیە مشتی، نایە نێو مشتیەوە

**ضَمَّ فُلاناً إلَيهِ:** هاوەڵایەتیكرد، هاوڕابوو لەگەڵی ، هاوبیرو بۆچوون بوو

**ضَمَّ إلَيِ أو إلَى صَدْرِهِ:** نای بەسنگیەوە، نوساندی بەسینەیەوە، باوەشی پیاکرد، لەئامێزی گرت

**ضَمَّ الأعْـدَادَ:** كۆی کردنـەوە، خستیە نێو ڕشتەیەك

**ضَمَّ الحَـرفَ (حَرَكَـهُ بِـالضَمِ):** بـۆری بۆکرد

**ضَمَّ عَلَى المَـالِ:** هـەمووی بـرد، لێـی نەهێشتەوە

**ضَمَّ الشَيءِ إلَى الشَيءِ:** دایە پاڵ یـەك، خستیە یەك ڕشتەو ڕیزبەندەوە

**ضَمَّ جَنَاحَهُ عَنِ النَّاسِ:** باڵی سۆزو میـهرەبانی بـۆ ڕاهێشـت، بەسـۆزو میهرەوە مامەڵەی لەگەڵ کردن

**ضَمَّ فُلاَنٌ مِن مَالِـهِ ضَمّـاً:** لەماڵەکـەی برد، لێی هەڵگرت

**ضَـمّ:** کۆوگردکردنـــەوە، دروێنـــە، خستنەپاڵ یـەك، پیاگـەیاندن، بـۆر ، پیالکان

**ضِمَـاد:** سـارغی، پێچـار، کەرەسـەی پێچانو بەستن ، برینداری ، ژن زۆری، هاوەڵایـــەتی ژنێـــك بـــۆ دووپیـــاو لەسەردەمی نەبوونیو قاتو قڕیدا هەتا لەهەرلایـــەکیان خواردنـــی دەســـت بکەوێت، هەرشـتێك زامداری برینداری پێبەستریّ وەك سارغیو لـەفافو...، دەرمـانو چارەسـەر دەخرێتـە سـەر ئەندام کەبەتەنیا یان لەگەڵ سارغیدا

**ضِمَـــادَة:** پیشـــەی برینپێچـــی یـــان هەرشتێك برینی پێ ببێچریّ

**ضِمَار:** ماڵی نادیارو پەنهان، ڕووداوێك مـەردوم زۆر دڵنیـا نـەبێت لێـیو چارەنووسو وادەی نادیار بێت

**ضَمَاضِم:** شێری تورە، زۆر خـۆری تـێر نەخۆر ، ڕژدو دەست نوقاو

**ضَمَـام:** لکێنـەر، بەسـتێن ، گـیرە، چەسـپ ، کـەتیرە ، ئـەوەی دوو پێکهاتەو تەن بەیەکەوە دەبەستیّ

**ضَمَـــان:** دەســتەبەری، زامنـــی، لێپرسینەوە، لێپرسراوی، پابـەندبوون، بەڵێنداریی، دڵنیاییکردن

**ضَمَّة:** مێزی گرەوی بۆربۆرێنی ئەسپ

**ضَمَّـــة(عِنْـــدَ النُّحَـــاة):** لای ڕێزمانەوانـــەکان بریتیـــە لەنیشـــانەی (رفع) بۆر

**ضَمَجَ بِالأرْضِ:** نووسا بەزەویدا، پیالکا، پێوەی چەسپو نوسا

**ضَمَخَ جَسَدَه:** بۆنی لـەخۆیدا، خـۆی بۆندار کرد

**ضَمَـخَ فُلاَنَـاً وَغَـيرَهُ:** مـاندویکرد، شەکەتو مـاندوی کـرد، برستی لەبـەر بڕی

**ضَمْخَة:** بۆنـی خـۆش لـەخۆدان، ژنو وشتری تێکسمراوی قەڵەو کەوا بنوێنـن ڕۆنو چەوریبان لێدەتکیّ

**ضَمَدَ الجُرحَ:** بەسارغیو لەفاف پێچای

**ضَمَدَ الجُرحَ بِالدَوَاءِ وَنَحْوَه:** برینەکەی چەورکرد یان چارەسـەرو دەرمانەکـەی نایەسەری

**ضَمَـدَ فُلاَنَـاً:** دڵنـەواییکرد، زامـەکانی سارێژکردو دڵخۆشیدایەوە

**ضَمِدَ ـ ضَمَدَاً:** وشکی کرد، وشك بوو

**ضَمِدَ الدَّمُ عَلَى الذَبِيحَة:** خوێنی نەما، خوێنەکـەی وشـکی کـرد، تـەواو بـوو، دوایی هات

**ضَمِدَ عَلَيهِ:** زۆر ڕقو قینی لێبـوو، پـتر ڕقو قینـی لێهەسـتا، زیـاتر خەشـمو قینی لێگرت

**ضَمَدَ:** برینەکەی پێچا ، بەستی ، هەڵیپێچا

**ضَمَدَ:** زۆرداری، ستەم، جەورووستەم، زۆرلێکردن

**ضِمْدٌ:** دۆست ، دۆستی ژن

**ضَمَرَ ـ ضُمُوراً:** لەڕبوو، لاوازبوو، پووکایەوە، سیس بوو، چوەیەك، کرژبوو، پچووك بوەوە

**ضَمَرَ العُودُ:** ئاوەکەی رۆیی‌و رەق بوو

**ضَمَّرَ الفَرَسَ (هَزَلَ ـ نَحَلَ):** لەڕی کرد، لاوازیکرد، پوکانیەوە، سیس‌و لەڕی‌کرد

**ضُمْرٌ ـ ضُمُرٌ:** لەڕی‌و لاوازی، کەم گۆشتی

**ضَمْرٌ:** مەردومی قەڵەم رێك‌و باریك ئەندام ، پەنهان‌و نادیار، تەنگ‌و تەسکی هەرشتێك

**ضَمَزَ الحَيَوانُ:** ئەوەی گرتبووی لەدەمیا گرتی‌و راما بەهۆی ترس یان هەر حاڵێکی‌ترەوە

**ضَمَزَ فُلانٌ:** بێدەنگ بوو، ورتەی لێنەهات، نقەی نەکرد

**ضَمَزَ عَلَى مَالِهِ وَنَحْوِهِ:** گرتی‌و رژدبوو لەسەری، نەیداو رژدبوو، ملکەچ‌و رسوابوو، سەری نەویکرد

**ضَمَزَ فُلاناً وَنَحْوَهُ:** دایمرکانەوە، دابینی‌کرد

**ضَمَزَ اللُّقْمَةَ:** قوتیدا، لووشیدا، پاڵی پێوەنا ، رەوانەی کرد

**ضِمْزٌ:** زەوییەکی بەرزو بالا ، تاکە شاخ‌و چیایەك کەبەردەکانی سوورو تۆکمەبن‌و گڵ‌و خۆڵی نەبێت

**ضَمْضَام:** چاوبرسییەك کەهەمووشتێ بۆ خۆی دابب‌رێت‌و بەرێت

**ضَمْضَمَ الأَسَدُ:** نەڕانی ، دەنگی لێبەرزبوەوە

**ضَمْضَمَ فُلانٌ:** دڵی قایم کرد، غیرەتی نایە بەر

**ضَمْضَمَ عَلَى المَالِ وَنَحْوِهِ:** هەمووی برد، گسکیدا

**ضَمْضَمٌ:** چاونەترسی بەرەوشت، ئازاو گوستاخی تەواوو کامڵ

**ضَمِنَ:** دەستەبەری‌کرد، زامنی کرد، کەفیلی لێسەند، گرتی ، لەخۆی گرت، جێی تیابوەوە

**ضَمِنَ عَلَى أَهْلِهِ وَنَحْوِهِ:** بوو بەبار بەسەریانەوە، کۆت‌و بەندبوو بەسەریانەوە ، تەوق بوو بۆیان

**ضَمِنَ الرَّجُلَ:** نەخۆشیەك لێیدا بەردەوام بوو لەگەڵی‌و جار لەدوای جار فشاری بۆ دەهێنا

**ضَمَّنَ الشَّيءَ الوِعَاءَ:** خستیە ناوی، تێی‌کرد، نایە نێوی

**ضَمَّنَ الشَّاعِرُ:** شاعیرەکە هەستا بەوەی بەیتی شاعیرێکی تری هێنا وەك خۆی داینا لەگەڵ بەیتەکانی هۆنراوەیکەی خۆیداو تێهەڵکێشی کرد

**ضِمْنَ:** لەناو ، لەنێوان ، لەمابەینی

**ضَمِنٌ:** عاق ، شەیدا ، گیرۆدەی دەستی نەخۆشی‌و ناساغی جەستە

**ضِمْنَاً (مَعَ غَيْرِهِ):** لەگەڵیانا،لەپەنایانا، هاوتایان ، لەتەکیانا

**ضَمِـير**: دەروون، ویـژدان ، نـاخی مـرۆڤ، بۆهاتـەی دڵ ، ئامادەییـەکی دەروونییە بـۆ جیاکردنـەوەی چاكو خراپـی کرداروگوفتـارو بـیروبۆچوونو دەرکـەوتنی رووی دزێـوی نـاقۆڵاو نەشیاو

**ضَمِيرٌ (عِنْدَ النُّحَاة)**: رانـاو ، جێنـاو، لای رێزمانەوانـەکان بریتیـە لـەوەی گوزارشت دەکات لەقسەکەر وەك (مـن) یان گوتار ئاراستەکراو وەك (تۆ) یاخود کەسـێکی نادیـارو ئامادەنـەبوو وەك (ئـەو): هـەروەها لـەجۆرەکانی رانـاو 1)ضَمِیر مُتَّصِل(راناوی لکاو) 2)ضَمِـیر مُنْفَصِل(رانـاوی سـەربەخۆ ، جـویێ ؛ جیا)

**ضَمِيـم**: خـاوەن ، هـاورێ ، هـاوەڵ ، رەفیق ، خێو

**ضَمِيـن**: دەستـەبەر، کـەفیل ، زامـن ، کەسـێکە کەبـەڵێنی بەشـتێك دابـێو دەستەبەر بووبێـت بەهەسـتان پێـی، تووشـیارو دووچـار بەدەسـت نەخۆشیەکەوە

**ض ن**

**ضَـنَّ بِالشَّـيءِ**: پاراسـتی، لایخـۆی گلیدایەوە، پارێزگاری لێکرد

**ضَنَّ بِـهِ عَلَيـهِ**: زۆر رژدو بـەخیل بـوو پێـی، رژدی کرد

**ضَنَّ بِالمَكَانِ وَنَحْوِهِ**: بەجێی نەهێشت، تیای مایەوە

**ضَنّ . ضِنَّة**: گومان، ئەوەی گومانی پێ دەبرێ، تایبەت ، گومان لێکراو

**ضَنَائِن**: شتی بەنرخ بەهۆی دەگمەنیو ناوازەییەوە

**ضَنَـاك**: هەلاَمـەت ، درم ، پـەتا، پەرسیف، ئارسم

**ضَنَاكَـة**: ژینـی سـەختو گـران ، گوزەرانو بژێوی تەنگو ناڕەحەت

**ضَنَى**: نەخۆشی یاخود لەڕولاوازییـەکی یـەکجار کاریگـەر، نـەخۆشو ناسـاغێك درێژەی خایاندبێت ، بەدحاڵیو تـەنگی باری بژێویو گوزەران

**ضَنَـى**: ئێـشو ئـازاری نادیـار، ژانو ئێشێك پەنهان بێت

**ضَنَـأَ المَـالُ**: مـاڵی زۆر بـوو، فرەبـوو ، زیادی کرد

**ضَنْءٌ**: نەوەو وەچەی هەرشتێك

**ضِـنْءٌ**: منـاڵ، جـەرگ، وەچـە ، نـەوە، بەندی جگەر

**ضَنَتِ المَرأةُ غَيرَهَـا**: وەچـەو نـەوەی زۆربوو

**ضَنَتْ نَصِيبُ فُـلانٍ**: بەشـی زۆربـوو، پشکێکی زۆری بەرکەوت

**ضَنُكَ**: راوبۆچوونی یان جەستەو ژیـری لاوازو کزبوو

**ضَنُكَ عَيشُهُ**: کەم دەستو گوزەرانبوو، بژێویو دەرامەت سەختو گرانبوو

**ضُنِكَ ضَنْكاً**: هەلاَمەتی گرت، دووچاری درمو هەلاَمەت هات

**ضَنْـك**: کـەم دەسـتی، هـەژاریی، نـەداریی، نـەبوونی، تەنگانـە ، دەستکورتی، تەنگی گوزەرانو بژێویو هەرشتێك

**ضَنُـو. ضِنـو. ضُنِـيّ**: منـاڵ، وەچـە، فەرزەن، نەوە

**ضَنِيَ (ضَعُفَ وَهَزُلَ):** لاوازبوو، بێهێزبوو، کەفتەکاربوو، پەکی کەوت، پەکی کەوت، نەخۆشی سەری لێیداو جەستەی لاوازکرد

**ضَنِيك:** هەژار، کەم دەست، نەدار، بژێوی سەختو گران، ئیشکەر بەنانەسکی، شتی پچڕاوو لەیەك بڕاو

**ضَنِين:** رژد، کەنس، نەگریس، دەست وشك، بەرچاوتەنگ، پنتی، لەچەر، ناکەس، قرنووس، چەپخۆوس، بێچەڵم، ریشوە، چرووك، پیسکە، مەردومی دەستو دڵ نوقاو لەئاست بەخشینو خێرو چاکە

## ض هـ

**ضَهَبَ الرَّجُلُ:** نەگەیی بەبالغبوونو سیفەتەکانی هاوچەشنی سیفەتی پیاوان نەبوو

**ضَهَبَ اللحْمَ:** گۆڕی، بەئاگر رەنگی گۆڕی بەڵام نەیسووتان

**ضَهَّبَ الرُّمْحَ أو العَصَا أو القَوس بِالنَّار:** خستیە بەرتینو هالآوی ئاگرەکە بۆئەوەی رێکی بکاتەوە

**ضَهَّبَ اللحْمَ:** کەمێك برژاندی، لەسەر بەردی سورەوەبوو برژاندی

**ضَهْبَاء:** کەوانێك ئاگر وەهای لێکردبێت، کاری تێکردبێت

**ضَهَدَهُ:** سزایدا، چەوسانیەوە، تەنگی پێهەڵچنی، خراپ لەگەڵی جوولایەوە

**ضَهَدَةٌ:** سەرکەوتنو زاڵبوون بەسەریا، ئەوەی زۆر خەڵکی دەیچەوسێنێتەوە، چەوساوە ، زەبوون ، کەساس

**ضَهْرٌ:** چڵەپۆو لوتکەی شاخ، پارچەیەکە لەشاخ رەنگی جیاوازە لەرەنگی بەشەکانی تری، کیسەڵ

**ضَهَلَ اللبَنَ وَنَحْوَه:** کەم کەم کۆبوەوە، تۆزە تۆزە یەکی گرت

**ضَهَلَ الشَّرَابُ:** کەمو روون بوو

**ضَهَلَ الشَاةَ وَنَحْوَهَا:** شیرەکەی کەمبوو، کەم شیر بوو

**ضَهَلَ الظِّلُ:** کەمی کرد، رەوییەوە، دوایی هات

**ضَهَلَ إِلَيهِ:** گەڕایەوە بۆلای ، رووی تێکردەوە

**ضَهَلَ فُلاَنَاً حَقَّهُ:** لەمافی ئەوی دابڕی، لێی کەڵو کەم کرد، کەم کەم دایە، نەختە نەختە پێیدا

**ضَهْل:** ئاوێکی کەم ، تەنکە ئاوێك

**ضَهِيٌّ (نَظِير وَشَبِيه):** هاوشێوە، وەك یەك، چوون یەك، هاوچەشنو شێواز، لەیەکچوو

## ض و

**ضَوَى إِلَيهِ:** پەناوهانای بۆ برد، رووی تێکرد

**ضَوَى الرَّجُل:** شەوهات، شەو بوو هاتو ئامادەبوو

**ضَوَاء:** رۆشنایی، رووناکی

**ضَوَاحِي:** رووپا، قەراخ، دەوروپشت

**ضَوَارِي:** بەئاژەڵە کەڵبەدارو درندەکان دەگوترێت وەك شێرو پڵنگو گورگو..

**ضَوأَ البَيتَ:** ماڵەکەی رۆشنکردەوە، رووناکی کردەوە، کردی بەچراخان

**ضَوء ـ ضُوء:** رووناکی، رۆشنایی، روونی

**ضَوءُ الشَمس:** تیشکی رۆژ، هەتاو، خۆرەتاو

**ضَوءُ القَمَر:** تیشکی مانگ ، رووناکی مانگ، تریفه

**ضَوءُ المِصْبَاح:** رووناکی چرا ، تیشکی فەتیلەو چرا

**ضَوءُ النَّهَار:** تیشکی خۆر، رووناکی رۆژ، هەتاو

**ضَوج:** لای خوارووی دۆلّو شیو

**ضَور:** برسێتیەکی توندو کاریگەر

**ضُور:** گەوالّە هەوری رەش و تاریك ، هەوری رەش و چلّکن

**ضُورَةٌ:** رسواوسووك ، هیچو پووچێك نەتوانێت بەرگری لەخۆشی بکات

**ضَوضَی:** ژاوەژاوی نایەوە، کردی بەقیژوهورو دەنگە دەنگ، هەرای بەرپاکرد

**ضَوْضَاء:** دەنگە دەنگ، قاووقیژ، ژاوەژاو، بەرپاکردنی دەنگو هەرا لەکاتی قەلّەبالّغی یان شەڕو جەنگو بەزمو هەرادا ، گۆبەند ، گۆبەنگ، گەردش

**ضَوطَ فَكُّهُ:** شەویلگەی خوارو گێڕبوو، دەمی خواربوو

**ضَوطَاء:** دەم خوار، یەکێك شەویلگەکانی خوارو گێڕبووبن

**ضَوْطَار:** ئەوەی روولەبازاڕ دەکاتو خاوەن سەرمایەو پارە نییەو بەدەسبڕین پارەو پوول پەیدا دەکات

**ضَوْطَر:** قەبەو زلەی بێسفەتو سپلّە

**ضُوَعٌ:** بالّندەیەکە لەبالّندەکانی شەو کاتێ هەستی کرد بە رۆژبوونەوە بەدەنگێکی بەرز هاوارو قیژە دەکات

**ضَوْلَعَ فِي مَشْيَة:** کوێرانە رۆی بەرێوە، کوێربوو ، نابینا بوو

**ضَوْلَعَة:** پیاوێکی قەلّەوو تێکسمراوی گێلو ساویلکە، ژنی بەلەنجەولار کەلەرۆیشتنا دەکەوێت بەملاولادا

**ضَوْمَرَان:** رێحانەی دەشتەکی یاخود رێحانەی فارسی

**ضَون:** کچۆلّەی خنجیلانەی پچووك، زۆری وەچەو نەوەی نێرینە

**ضَوِيَ:** لاوازو سست بوو، لەڕو لاوازبوو، کەم توانابوو

**ضَوِيء:** رۆشن ، رووناك، پرشنگدار، تروسکەدار

## ض ي

**ضِيَاح:** شیرێکی روون کەوا ئاوی زۆر تێکرابێت، هەرچارەسەرو دەرمانێك یان ژارێك ئاوی تێ بکرێتو پاشان ئاوێتە ببێت

**ضِيَاع:** جۆرە بۆنێکی خۆشە

**ضِيَاع (فقدان):** ون بوون ، لەکیس چوون، سەرتیاچوون

**ضِيَافَة:** میوانداری ، بانگهێشت

**ضِيزَى:** بەش، پشك، پاداشت، خەلاّت

**ضِيضَاء:** دەنگە دەنگو قاوقیژکردن، هەراو هوریا، ژاوەژاو، دادوبێداد

**ضَيَّع الشَّيءَ:** ونی کرد، تیای برد، لەناوی برد

**ضَيَّعَ حَقَّهُ:** مافی فەوتا، مافی نەماو لەکیس چوو

**ضَيَّعَ المَال:** لەبەردیدا، بەفیڕۆیدا، تیایبرد

**ضَيْع ـ ضِيَاع:** فەوتان، لەکیس چوون، بەهەوانتە رۆیشتن، زیانو نەمان

**ضَيعَة**: ون كردنێك ، كێلگــه، خــانوو بــەرە، كــارێكی بەســوودو خــێر وەك بازرگـانیو پیشەسازیو... ، گوندێكـی خنجیلانە

**ضَيغم**: گازگر ، شێر

**ضَيغَميّ**: شێری درندەو بەهەڵمەت

**ضَيَّـفَ**: میوانــداری كــرد، پێشــوازی لێكردو خزمەتی كرد

**ضَيَّـفَ الشَّمْسُ**: روو بــەئاوابوون چــوو، وەختەبوو ئاوادەبوو

**ضَيف**: میوان، مێمان، مێڤان، مەهوان، میڤان، میێڤان

**ضِيفُ**: لا ، تەنیشت ، پەنا

**ضَيَفَة**: ژنێـك لـەعادەی مانگانـەدابێت، ژنە میوانێك

**ضَيفَن**: مشــەخۆر ، نەوســن، یــەكێك شوێن میوان دەكەوێت بۆ مشـەخۆریو نەوسنی

**ضَيَّـقَ**: تـەنگی كـرد، هێنایــەوە یــەك، چەڕانی

**ضَيَّقَ عَلَى نَفسه**: فشـاری خسـتە سـەر خۆی ، زۆری بۆ نەفسی هێنا ، تـەنگی پێهەڵچنی

**ضَيَّـقَ عَلَـى العَـدو**: تــەنگی بــەدوژمن هەڵچنی، زۆری بۆ هێنا، گەمارۆیدا

**ضَيَّــقَ الثَّــوبَ وَالرِبَــاطَ**: جــلو بۆینباخەكـەی تەسك كـردەوە، لێـی گرت، قارسی كرد

**ضِيـقٌ**: تەسـكی ، تــەنگی ، تەســكو تروسـكی، ناگوشـادیی، واژوی بــەرینو فراوانیە

**ضَيِّـق**: تەسـك، ترووســك، نابــەرین، گەمارۆدراو، چەڕاو، گیراو

**ضَيِّقُ العَقل**: كـەم ئـەقڵ، گـەلحۆ ، وڕ، دەبەنگ، ساویلكە، گێژ، كەودەن

**ضَيِّقُ الخُلق**: بێتاقەت ، جاڕس، بێزار، نیگەران، بێئارام

**ضِيـق**: خــەمو خەفــەت ، مەینــەتی، دەردو بــــەلاّ ، كۆســـت كــــەوتن، نەهامــەتیو دەردەســەری، تـــەنگو چەڵەمە، تەنگانەو نەبوونی

**ضَيقي**: دژوارتر، خراپتر، ناهەموارتر

**ضِيقَة ـ ضَيْقَة**: خراپی باروگـوزەران، هـەژاریی، نـەبوونی، تـەنگ دەسـتی ، بەدحاڵی

**ضَيم( ظُلم )**: زۆرداری، چەوروســتەم، زۆر لێكردن،سەرشۆڕكردنوچەوسانەوە

**ضَيْـهَب**: شــوێنی گۆشــت بــرژان ، شوێنێكە لەسەر چیا كاتێ خـۆر لێـی دەدات گـەرم دەبێتو گۆشتی لەسـەر دەبرژێنرێت

**ضَيُون**: گوریە ، نێرە پشیلە، پشـیلەی نێر



ضِفْدِع ـ ضِفْدِعَة
(بۆق)



ضَأن (مەڕ ، پەز)



ضَبَّةُ البَاب (کێلون)



ضِرم (ئەسپی تیژڕەو)



ضَارِيَة
(سەگی ئالوودەی
ڕاووشکار)



ضَفِيرَة (پرچ)



ضَرَبَ تلفوناً
(تەلەفۆنی کرد)



ضَيْوَب (گوربە)

# ١٦ حرف الطَاء

**ط**

**طَ:** شانزەیەم پیتی زمانی عەرەبی‌یە

**طا - طأ**

**طَائِر:** مەل، باڵندە ، فڕیو، باڵگرتوو، پەلەوەر، باڵدار، گیانداری باڵدار، هەسارەیەکە، ئەوەی بەشووم یان نەسەمەی باشە دابنرێت

**طَائِرَة:** فڕۆکە، بالافڕ، پفۆك، فڕۆك

**طَائِرَةٌ ذاتُ سَطحٍ واحِد:** فڕۆکەی یەك باڵ

**طَائِرَةٌ ذاتُ سَطحَين:** فڕۆکەی دووباڵ

**طَائِرَةٌ نَفّاثة:** فڕۆکەی دوکەڵدار، فڕۆکەی تیژڕەو

**طَائِرَةٌ وَرَقِيَّة:** کۆلارە ، بادەوە، شتێکە منالان لەکاغەزی ڕەنگاو ڕەنگ دروستی دەکەن‌و هەڵی دەدەن بەئاسمانا بەدەزوو

**طَائِرُهُ:** توڕەبوو، ڕقی هەڵسا، خەشم‌و قین گرتی

**طَائِش(نَزِق):** هەڵەشە، بێئەقڵ، بەرەلا، سەرکێش، سەرەوڕۆ، سەرچڵ، سەرەخەر، بێگوێ، سەربزێو، عەقڵی باریکرد

**طَائِشُ عَلَى غَيرِ هُدَى:** بێئامانج، بێمەبەست، بەدرەوشت، بەرەلا، بەرباد

**طَائِشُ السَهمِ عَنِ الغَرَض:** ئەو تیرانەی لەمەبەست‌و نیشان ترازان‌و نەیان پێکا

**طَائِع:** فەرمانبەردار ، گوێڕایەڵ، ئەمەکدار

**طَائِف:** گەڕۆك، گەڕییدە، حەسحەس، پاسەوان، شەوگەڕ

**طَائِفَة:** تیرە، تایەفە، هۆز، پۆل، چەند کەسێك، دەستە، ئەوانەی لەچوارچێوەی مەزهەب‌و بیرو بۆچوون‌و ئایدیایەك کۆدەبنەوەو جیاواز دەبن لەخەڵکی‌تر

**طَائِفَة(في علم الأحيَاء):** لەزانیاری زیندەوەرزانیدا بریتیە لەیەکەو دەستەیەکی پۆلێنکراو وەك خشۆکەکان‌و شیردەرەکان‌و دووپەلکەکان‌و ...

**طَائِفِيٌّ (مَذهَبِيٌّ):** تیرەگەر، ڕەگەزپەرست، دەمارگەر، مێوژ یان ئەو ترێیەی بۆڵەکانی لەیەك ریزو ڕشتەوە شۆڕبووبێتەوە

**طَائِفِيَّة:** تیرەگەریی، ڕەگەزپەرستی، حیرس‌و دەمارگیری بۆ کۆمەڵ‌و گرۆهو تاقمێك بەدەر لەخەڵك‌و تاقم‌و گرۆهەکانی‌تر

**طَائِل (نَفع ـ فَائِدَة):** سوود، کەڵك، قازانج، قانزانج، دەستکەوت، دەستگیر، کەڵك، هاتل، هەو، کار، ئایە، داهات، بەرخووەر، بەهرە، سوودێکە لەکڕین‌و فرۆشتنەوە دەست بکەوێ

**طَائِلَة (قُدْرَة)**: توانا، هێز، قـەزەن، گـووژم، گـوڕ، مەندینـە، سـتووری، هـەڤل، تین، تاقـەت، پـەلوپۆ، رەوال، وەتین، هێزو دەستەلات

**طَابَ ـ طِيبَاً وَطَابَاً وَطِيبَة**: خۆش بوو، باشـبوو،چـاکبوو، بـەتام بــوو، بەلەزەتبوو، حەلاڵو دروستبوو

**طَابَ عَيشُهُ**: گوزەرانی باشبوو، بژێوی چاكو گونجاو بوو، خۆشگوزەران بوو

**طَابَ عَنْهُ نَفْسَاً**: وازی لێـهێنا، دەستبەرداری بوو، لێی تەکیـەوە، دەستی لێبەردا

**طَابَ نَفْسُهُ بِالشَّيء**: پێی خۆش بوو، شادو خۆشحاڵبوو، رێگەیدا، بواری بۆ رەخساند

**طَابَ المَرِيضُ**: نەخۆشەکە چاك بوەوە، تەندروستی باشبوو

**طَابَ لَـهُ (رَاقَ لَـهُ)**: پێی خۆشـبوو، پەسـەندی کـرد، حـەزی لێکـرد، بەدڵیبوو، گونجاو بوو لای

**طَابَ الأمْرَ**: چارەسەریکرد، باشیکرد، گونجانی، هێنایە سەر بارو را

**طَابَ عَنِ الشَّيءِ نَفْسَاً**: وازی لێهێنا، دەستبەرداریبوو، لێیدوورکەوتەوە، بەویستی خۆی رەهایکرد

**طَابَـاق**: بـەردێکی پانـە ئاشـەوان کولـیرەی ئاشی پێدەبرژێنێ، خشـتی سووری گەورە

**طَابِخ**:بایەکی توندو سەخت، سەختەبا

**طَابِخَة**: گەرمای نیوەڕۆ، قرچەقرچی گەرمای نیوەڕۆ

**طَـابع ـ طَـابَع**: شـەقڵ، مـۆر، پـول ، هەرشتێك مۆرو چاپی پێ بکرێ

**طَـابِعُ الـبَرِيد**: پـوولی پۆسـتە، پـوولی چەپەرخانــە، پارچــە کاغــەزێکی چـاپکراوی میرییـە بەنامـەو هــەندێ شتیترەوە دەنرێ

**طَابِعٌ مَالِيٌ**: پوولی دارایی

**طَـابِعُ ـ طَـابَعُ**: سرووشــت، خــوو، رەوش، نیشان، هێما، چاپچی

**طَابِعٌ حَسَنٌ**: رەوشتی جوان، رەوشتو هەڵسوکەوتی بەرزو شیرین

**طَـابَقَ**: قـایل بــوو، بــەدڵیبوو، پەسەندبوو لای

**طَابَقَ بَيْنَ قَمِيصَين**: خستیە سـەریەك، کردنـی بەنێویـەکا، جووتـی کـردن، بەسەریەکا لەبەری کردن

**طَابَقَ بَيْنَ شَيئَين**: وەك یەکی لێکـردن، جوونیەکی کردن، هاوتای کردن

**طَـابَقَ الرَّجُلَ عَلَـى العَمَـلَ**: رایـهێنا، رامیکرد، فێریکرد ، دەقی پێوەگرت ، راهات لەسەر کارو فرمان

**طَابَقَ بِالحَقِ**: ملکەچ بوو بۆی ، دانـی پیانا، قایل بوو پێی

**طَـابَقَ الفَـرَسُ**: ئەسـپەکە قـاچی لەشوێنی دەستی دانا

**طَـابَقَ المُقَيَّـدُ**: بـەکۆتو بەندەکانــەوە رۆیی و هەنگاوەکانی نزیك بەیەك نا

**طَـابَقَ عَلَــى الأمْــرِ**: یارمـــەتیدا، کۆمـەکیکرد، دەستی یارمـەتیدانی بـۆ درێژکرد

**طَابَقَ الشَّيءَ عَلَى الشَّيء**: جووتی کرد، نایەسەریەك، لەسەریەك جووتی کردن

**طَابِق ـ طَابَق:** تاوه، ئاخليفنك، رمبێژ، دەفرێكە لەمەنجەڵی گچكە پەلترە شفتەو هێلكەو رۆنی تێیدا دروست دەكرێ و گۆشت و شتی تری تێدا سوور دەكرێتەوە

**طَابِقٌ مِنَ البَيتِ:** نهۆم، قات، تەبەقە، چین، چەپەل، خانووی فەرهادی چەن قاتە

**طَابُو:** تاپۆ، تاچك، قەواڵە، توویل، دەزگایەكی دەوڵەتیە موڵك و خانووی لێتۆمار دەكرێ و قەباڵەیێكی دەوڵەتیشە دەدرێ بەخاوەن موڵك و زەویوزارو خانووبەرە

**طَابُور:** دەستەو تاقمە سەربازێكە لە(300ـ 1000)كەس پێكدێت

**الطَّابُور الخَامِس:** لەزاراوەی سیاسیدا بریتیە لەلایەنگرانی دوژمن لەخەڵكی ولات و نیشتمان یان جێنشینانی ولاتێك دوژمن داگیری كردبێت یان لەجەنگ و شەڕا بێت لەگەڵیان پروپاگەندە لەبەرژەوەندی دوژمن لەولاتی خۆیان بلاوبكەنەوە یان یارمەتی بدەن بەجۆرێك لەجۆرەكان

**طَابُوق:** خشت، هەموو قورێكی لەقالب دراوە بەكاڵی یا بەسووركراوەیی بۆ دیوارو شوێنانیتر بەكاردەبرێت

**طَابُوق نَارِيٌّ( آجُر ـ قَرمِيد ):** خشتی سوور ، سوورە خشت

**طَابُوقٌ أصفَر:** خشتی نەباتی

**طَابَة:** تۆپێكە لەلاستیك یان پەڕۆ دروستكرابێت منالان یاری پێبكەن، مەی، بادە

**طَاجِن( مِقلاَة ):** تاوە، ئاخلیفنك، دەفرێكە شفتەو هێلكەی تیا سووردەكرێتەوە، ئەوەی شتی تیا سووردەكرێتەوە

**طَاحَ ـ طَوْحاً:** تیاچوو، فەوتا ، نەما، كەوت، لەناوچوو، دیار نەما، وەختە تیادەچێت

**طَاحَ السَهْمَ:** لەمەبەست و نیشان لایدا، نەیدا لەنیشان و مەبەستی دیاریكراو

**طَاحَ ـ طَيْحَاً:** تیاچوو، فەوتا، نەماو دوایی هات

**طَاحِنَة:** خرێ، ددانە خرێ، كاكیلە، هاڕەڕ، خلێنە، بریتیە لەچوار ددانە گەورەكانی سەروخوارەوەی هەردوو لاشەویلگەكان

**طَاحُون ـ طَاحُونَة:** ئاش، دەستاڕ، دەستهاڕ، ئاسیاو، شوێنی هاڕینی دانەوێڵەیە

**طَاحُونُ الرِّيحِ:** ئاشی با، ئاشێكە بەبا كار بكات

**طَاحُونُ المَاءِ:** ئاشی ئاویی ، ئاشێكە بەئاو كاربكات

**طَاحُونَة:** ئاش، شوێنی هاڕینی دانەوێڵە

**طَاحِيٌّ:** بەرز، بڵند، گردۆمێكی مەزن، شوێنی بەرفراوان

**طَارَ الطَّائِرُ:** فڕی، باڵیگرت، چوو بەئاسمانا، لەهەوایا فڕی

**طَارَ بِفُلاَنٍ:** لێی نزیك بووەوە، هاتە پێش

**طَارَ صِيتُهُ:** ناسرا، ناوبانگی بلاوبووەوە، ناوی دەركرد، ناوبانگی پەیدا كرد

**طَارَ عَقْلُهُ**: تێکچوو، شێت بوو، هۆش و ئەعقڵی لەدەستدا

**طَارَ الشَّعْرُ**: قـــژی درێژبـــوو، هاتەخوارەوە ، بەربوەوە

**طَارَ إلَى كَذَا**: بەخێرایی چوو بۆ لای ، زوو ڕۆیشـــت بـــۆلای، بەفڕۆکـــە گەشت وگوزاری کرد

**طَـارَ قَلْبُـهُ مَطَـارَهُ**: ڕووبـــەو بـــوو، ئارەزووی کرد ، حەزو ئارەزووی هـــەبوو بۆی

**طَارَ الشَّيءُ عَنِ الشَّيءِ وَمِنْهُ**: لێـی کـــەوت، لێـــی بـــەربوەوە، کەوتـــە خوارەوە لێی

**طَـارَ طَـائِرُهُ**: تووڕەبوو، ڕقـی هەسـتا، خەشم و قـین گرتـی، حـیرس و تووڕەیـی هەستا

**طَـار ـ طَـارَة**: دەف ، دەفـە، دەفـك، ئـــامرازێکی ئاهـــەنگ و بەزمانـــە کەلەبێژنگێکە چەرمی خاوی بەڕوویەکی داگیرابێ یا بەپەنجـەو لـەپی دەسـت لێ بدرێ

**طَارُ التَّطْرِيزِ وَالمُنْخُلِ**: کەمە، قاسـناغ، دەفرێکە لەتەختـە دروسـت دەکـرێ و دانەوێڵـەی پـێ دەپێـورێ، تەختـەی کەوانـــەداری ئەمســـەرو ئەوســـەری بێشکەیە

**طَارِي**: نامۆ، بێگانە، ناگەهان

**طَارِئَــة**: ناڕەحـــەتی و مەینـــەتی ، سەخت و گرانی

**طَــارَحَ الكَــلاَمَ مُطَارَحَـــةً**: گفتوگـــۆو وتووێژیان کرد لەگەڵ یەك

**طَــارَدَ ـ مُطَــارَدَةً**: دوایکـەوت، شـوێن پێـی کـەوت، هەڵمـەتی بردەســـەر، ڕاوینا، دوایکەوت

**طَـارَدَ الأَقْـرَانُ**: هـێرش و هەڵمـەتیان بردەسەریەك

**طَـارِد( مُبْعَـد )**: دوورخـەر، دەرکـەر، باکێش

**طَارِف**: تازە، نوێ، نفت

**طَارَقَ بَيْنَ الثَّوبَيْنِ**: بەسەریەکا لەبەری کردن، بەدوای یەکا پۆشینی

**طَـارَقَ الظَّلاَمُ أو الغَمَـامُ**: بەسـەریەکا کەوتن، بەدوای یەکا هاتن

**طَارَقَ الشَّيءَ**: هەندێکی دا بەسەریەکا

**طَارِق**: هاتوو، کوتەر، پیاکێش، بەشەو هـاتوو، لێدەر، پیاکێشـەر، گەشـتیار، موسافیر

**طَارِقَـــة**: کارەســـات ، مەینـــەتی و نەهامەتی، ڕەختێکـی پچووکـە ، هـۆزو تیرەی پیاو

**طَازِج**: تازەو نوێ، پاك و پوختـی هـەر شتێك

**طَـاس( زَيَّـنَ )**: جوانیکـرد، ڕازاندیـەوە، وەك مـانگی چواردە وابـوو لـەجوانی و ڕازاوەیدا

**طَاس الشَّيءَ**: شێلای ، پێـی پیانـا، نایە ژێر، شکاندی

**طَـــاس ـ طَاسَـــة**: جـــام، لەگـــەن، یەغنکێش، قەرەوانە، بایە یامـە، قـاب، ئامـــانی مـــس، ئـــاوخۆرە، جـــامی ئاوخواردن

**طَاشَ - طَيْشَاً**: شێت بوو، ئەقڵی لەدەستدا، زوو هەڵچوو، بێ ئەقڵ و ژیری‌بوو، پێکدادان رووی تێکرد، ترازا، هەڵەیکرد

**طَاشَ السَهْمُ عَنِ الغَرَضِ**: لەنیشان لایداو نەی پێکا، ترازا ، دوورکەوتەوە

**طَاعَ - إنطَاعَ - أطَاعَ ( إنْقَادَ لَهُ )**: گوێڕایەڵی‌کرد، بەگوێی کرد، دوایکەوت، بەقسەی کرد، ملیدا، سەری نەوی‌و شۆڕکرد

**طَاعَ النَبَاتُ طَوعَاً وَطَاعَةً وَطَوَاعِيَةً**: گونجاو بوو پەروەردەو پێگەیاندنی

**طَاعَ الشَجَرُ**: گونجاوو شیاوبوو کۆکردنەوەی بەروبوومەکەی

**طَاعَ لَهُ المُرَادُ وَنَحْوَهُ**: بەئاسانی‌و سانایی هاتە بەردەمی

**طَاعَ لِسَانُهُ كَذَا وَبِهِ**: رام بوو لەسەری، راهات لەسەری

**طَاعَ الغُلاَمُ أبَاهُ وَلَهُ**: گوێڕایەڵبوو، ملکەچ بوو، بەگوێی کرد

**طَاعَ الكَلأُ الحَيوَانَ وَلَهُ**: لەوەڕگاکە فراوان‌و بەرین بوو بۆ ئاژەڵەکەو بەئارەزووی خۆی تیای سووڕایەوە

**طَاعَةً ( إنْقِيَادُ )**: گوێڕایەڵی، بەقسەکردن، مل درێژکردن

**طَاعَةٌ عَمْيَاءُ**: گوێڕایەڵیەکی کوێرانە، بەقسەکردنی بێ هیچ پێودانگێك، پابەندبوون، بەندەگی بوون

**طَاعَمَ مُطَاعَمَةً**: کردی بەدەمیەوە، خستیە نێودەمی ، دەمی نایە نێو دەمی

**طَاعَمَهُ ( أكَلَ مَعَهُ )**: لەگەڵی خوارد، خواردی لەگەڵیدا، هاوبەشی خواردنبوو لەگەڵی

**طَاعِنٌ فِي السِنِ**: پیر ، بەساڵاچوو، کۆنەساڵ، بەتەمەن، سەرسپی، لەنێوەوە چوو، کەوهل بوون، فەرتبوون، یەکێك چووبێتە تەمەنەوە

**طَاعَنَهُ بِكَذَا**: هەریەکەیان رەخنەیان لەوی تریان گرت

**طَاعُون**: رشانەوە، تاعون ، چارەقووڵە، ناساغی‌و نەخۆشی، پەتاو درم

**طَاعُونُ البَقَرِ**: دەردەگا، نەخۆشی گاقڕان

**طَاغُوت**: سەرداری گومرایی، هەرپەرێز شکێنێك، شەیتان کەلەرێی راست لایداوە، هەرپەرستراوێك بەدەر لەپەروەردگار، بەتاڵ، ناحەق، ناڕەوا، جادووگەر

**طَاغِيٌ**: نافرمانی، ستەمکار، زۆردار

**طَاغِيَةٌ**: زۆردار، ستەمکار، گێل ، کەودەن ، خۆبەزلزان، هەورەتریشقە

**طَافَ بِالمَكَانِ وَحَوْلَهُ**: بەدەوروخولیا هات‌و چوو، گڕی خوارد، بەدەوریا گەڕا

**طَافَ فِي البِلاَدِ**: گەڕا، سووڕایەوە، پیاگەڕا، بەولاتدا گەشت‌و گوزاری کرد

**طَافَ بِهِ الخَيَالُ ( حَلَمَ بِهِ )**: خەوی پێوەبینی، دالغەبردیەوە

**طَافَ الكَرَى أو النَومُ بِهِ أو عَلَيهِ**: خەوبردیەوە، خەواڵوبوو، خەوی هات

**طَافَ بِهِ ( جَالَ بِهِ )**: گەڕانی، سووڕانیەوە، گەشتی پێکرد

**طَـافَ عَلَـى وَجـهُ المَـاءِ:** سـەرئاوكەوت، هاتەسەر ئاو

**طَافَ بِالشَيءِ( أحَـاطَ بِـهِ ):** گـەمارۆيدا، دەوروخوليـدا، ئابلۆقـەيدا، تـەنگى پێهەڵچنی

**طَافِحٌ:** پـڕ، لێـوان، داگیراو، ئـاخنراو، تیکمـە، لێـوان لێـو بوونـی شـتێك، هەشـاندن، رتمـاندن، دەفرێـك تاسـەر لێوو دەمەكەی تێكرابێت

**طَافِحٌ بِشراً:** دڵخۆش ، شادمان، شـاد، كەیفدار، دڵشاد، بەختیار

**طَافِحَة:** وشـك، رەق ، وشـكەوەبوو، وشك هەڵگەڕاو

**طَافِيٌ:** ئەوەی دەكەوێتە سەرئاو

**طَافِيءٌ:** كوژاوە، دامركاو

**طَافِيـةٌ مِنَ العِنَـبِ:** ئـەو بۆڵەترێیـەی لەئاڕاستەی بۆڵەكانیتر دەرتۆقیوە

**طَـاقَ ( أطَـاقَ الشَـيءَ وَعَلَيـهِ ):** توانـی، دەری بڕی، بەرگەی گرت، بۆیكرا

**طَـاقَ الشَـيءَ:** دەسـتەلأتی بەسـەریا شكا، توانای بەسەریا هەبوو

**طَاقٌ:** تاق ، كەوانە، كەڤانە، گومبەزی سـەر دەرگـاو پـردو بـانی ژوور كەبەخەرپشت دروستكراوەو كەوانەییە، جۆرە جلو بەرگێكە

**طَاقَـةٌ:** وزە، توانـا، هـێز، توانـین، لێهاتن، پەك ، تاقەت، ئەندازە، ئەوەی مـرۆڤ دەتوانێـت بیكـات بەهـەوڵو لێبڕانی

**طَاقَةٌ كَامِنَةٌ:** وزەی مت ، متە وزە

**طَاقَـةٌ ذَرِيَـةٌ:** وزەی ئـەتۆم ، ئەتۆمـە وزە

**طَاقَةٌ حَرَارِيَـةٌ :** وزەی گـەرمی، گەرمـە وزە

**طَاقَةٌ شَمْسِيَةٌ :** وزەی خۆر

**طَاقَةٌ كَهْرَبَائِيَةٌ :** وزەی كارەبایی

**طَـاقِمٌ:** دەسـتە، گـرۆە ، كۆمـەڵێك یەكیان گرتبێت

**طَاقِيَةٌ:** كڵاو، تەپلە ، تاقیلە، كووتۆز، كـولاڤ، پۆشـاكی سـەرییەو لەسـەر دەنرێو پێچی لەسەر دەبەسترێ

**طَالَ:** درێژبـوو، درێژبـوەوە، داكـەوت، هاتەخوارەوە، كشا، درێژەی كێشا

**طَالَ عَلَيهِ:** خۆی بایا بەسەریا ، خـۆی راوەشـان بەسـەریا ، فـیزو دەعیـەتی بەسـەرا دەربـڕی ، چاكـەكانی دایـەوە بەچاویا

**طَـالَ فُلاَنَـاً:** لـەو درێژتربـوو، بـالأی بەرزتر بوو

**طَـالَبَ:** داوای كـردەوە، داوای مـافی خۆی لێكردەوە

**طَـالَبَ بِحَـقٍ:** داوای مـافی لێكـرد، داواكاری ماف بوو

**طَـالِب:** قوتـابی، خوێندكـار، داواكـار، داخواز

**طَالِبُ الزَوَاجِ( خَـاطِب ):** خوازبێنیكـار، یەكێك خوازیاری هاوسەرگیری بێت

**طَـالِحٌ( خِلاَفُ صَـالِحٌ ):** خـراپ ، بـەد، پیاوخراپ، نامەرد، واژوی چاكو باشە، شەكەت، شپرز

**طَـالَعَ الكِتَـابَ( قَـرَأهُ ):** خوێندیـەوە، چاوی پیاخشان

**طَالَعَ فُلاَنَاً:** تەماشایكرد بزانێـت چـی هەیە

**طَالَعَ فُلاَنَاً بِكُتُبِهِ :** كتێبەكانی بۆ نارد هەتا تەماشای بكات

**طَالِع:** شانس، بەخت، چارە، ناوچەوان، هات ، كامرەوایی، كامرانی، هیر، كام، كۆس، چارەنووس، كۆس، چارەنووس، نگین

**طَالَعَهُ:** بەوردی تەماشای كرد، چاوی تێبڕی، سەری لێ هەڵنەبڕی

**طَالَعَهُ بِالأَمْرِ:** خستیە بەردەمی، لەبەردەمی دانا

**طَالِق:** بەرەڵا، ئازادكراو، سەربەستكراو، رەها، ژنی تەڵاقدراو

**طَالِقَة ـ طَوَالِق:** ژنی تەڵاقدراوی رەها، وشترو ئاژەڵێك بۆ لەوەڕاندن رەهاو ئازاد كرابێت

**طَالَمَا:** چونكە، لەبەرئەوەی ، بەهۆی ئەوەوە ، مادام

**طَامَّة:** بەڵاو نەهامەتی سەختو گران، ناوێكی رۆژی قیامەتە ، بەدبەختی، كارەسات، بەڵای ناگەهان، چورتم

**طَامِث( حَائِض ):** بێنوێژ، ئافرەت لەخوێندا، عادەی مانگانە

**طَامِح:** بەرزخواز، رەهەند، بەرزو بڵندی هەرشتێك

**طَامِحٌ مِنَ النِسَاءِ:** ژنێك رقی لەمێردی خۆی بێتو بۆ پیاوێكی تر بڕوانێت

**طَامِر:** كێچ، قێچ، چێچ، كەكی، گیاندارێكی رەشی وردی قاچ برگەبرگەی بەئاڵۆشی خاوەن قەڵەمبازە بەهاران دەژێتەوە

**طَامِع:** چاوچنۆك، سوربوو لەسەر كارو رەفتارێك، بەردەوام، چاوبرسی ، بەهەڵپە

**طَامُور:** پەڕاو، نامە، دەفتەر، تێنووس، بابۆڵە

**طَانَ( طَلاَهُ بِالطِين ):** بەقوڕ سواخیدا، قوڕی تێهەڵسوو

**طَانَ الكِتَابَ:** مۆری كرد

**طَانَ اللهُ فُلاَنَاً عَلَى الخَيرِ أو الشَرِ :** بەدیهێنا، دروستی كرد

**طَاهِر:** پاك، خاوێن، پوخت، پاكیزە، بێخەوشو ناتەواوی ، داوێن پاك

**طَاهِرُ الذِمَّة :** ساویلكە ، بێنیاز، سادە

**طَاهِرُ القَلْبِ( عَفِيف ):** دڵپاك، دڵڕاست، دڵفەكری، واژوی دڵپیسییە ، دڵڕاستی

**طَاهِرُ الذَيل:** بێتاوان، بەویژدان، خاوەن ویژدانو دەروونێكی راستو مافپەروەر

**طَاهِي:** لێنەر، چێشتكەر، شێوپەز، چێشتلێنەر، نانكەر، نانەوا

**طَاوَة:** تاوە ، دەفرێكی والایە بۆ سووركردنەوەی خواردەمەنی بەكاردەبرێ

**طَاوَحَهُ ـ مُطَاوَحَة:** تاوانباری كرد، ئاماژەی بۆ كرد بە ..

**طَاوَعَهُ مُطَاوَعَة فِي الأَمْرِ وَعَلَيهِ :** پەسەندی كرد، قایل بوو، رازی بوو لەسەری ، گونجاوو شیاو بوو لای، گوێڕایەڵیكرد، فەرمانبەرداریی بۆ نواند

**طَاوَلَ( تَوَانَى ):** دوایخست، ئەمڕۆ بەسبەیكرد، دەستی بەدەستی پێكرد

**طَاوَلَ فِي الشَيءِ:** ماوەكەی درێژكردەوە

**طَاوَلَ فُلاَنَاً فِي الطُول أو فِي الطَول:** زاڵبوو بەسەریا، بۆری دایەوە، سەركەوت بەسەریا

**طَـاوَلَ فُلاَنَـاً فِـي الدَّيْـنِ وَنَحْـوَهُ:** دوايخست ، دواكەوت لەدانەوەيدا

**طَاوِلَة:** خوان، مێز، نانەبەرە، سفرە، یاری تاوڵە، نـەرد، تەختەنـەرد، دوو تەختەی بیستو چوار خانەییە بەسـی پوولو دووزار یاریی لەسەر دەكرێ

**طَاوُوس:** تاووس، داووس، باڵندەیەکە پـەرەکانی هـەموو جـۆرە نـەخشو رەنگێـك دەنوێنـێ بـەلام لاقـی زۆر رەشـەو نێرەكـەی بـەكلكی چـەتر هەڵدەداو تاجی هەیە

**طَـاوِيْ:** برسـی، هەسـتكردنی گیانلەبەران بەپێویستی بۆ خواردن ، خاڵی بوونی گەدە

**طَـايَبَ ـ مُطَايَبَـةً:** گاڵتـەو یـاری لەگەڵكرد، شۆخی لەگەڵكرد، گەمـەو گاڵتەی لەگەڵكرد

**طَـايِحْ:** تیـاچوو، فـەوتاو، کـەوتوو، نـەماو، وێـڵ، سـەرگەردان، ونبـوو، دیارنەماو

**طَايَرَهُ:** پێشبڕكێی فرینی لەگەڵكرد، بۆربۆڕێنی لەگەلاكرد

**طَأطَـأَ رَأسَـهُ:** سـەری دانـەواند، ملیكەچكرد، سەری شۆڕكرد

**طَأطَأَ الحُفْرَةَ:** قووڵیكرد، دایخست

**طَأطَأَ فُلاَنٌ مِن فُـلاَنٍ( حَـطَّ مِـنْ قَـدْرِهِ ):** سووكیكرد، لـەنرخی كـەم كـردەوە، بێبایـەخیكرد، لـەنرخی دابـەزاند، كەسایەتی لەكەداركرد

**طَأطَأَ فَرَسَهُ وَنَحْوَهُ:** بەڕانی تێی ژەن ئـەوجا بەهـەردوو لاقیش پیـای كێشـا بۆئەوەی غاربكات

**طب**

**طَـبَّ ( دَاوَى ـ عَـالَجَ ):** تیمـاریكرد، چارەسەریكرد، دەرمانی دایە ، بـاشو چاكیكرد

**طَبَّ الرَّجُل ( تَـأَنَّى لِلأُمُـورِ ):** شـێنەیىو لەسـەرخۆبوو، هێـواشو هێمـن بـوو، بەئارامو هێدی بوو

**طَـبَّ فُـلاَنٌ:** لـێزان بـوو، زۆرزانو شارەزابوو

**طَبَّ الشَّيءَ:** باشو چاكی كرد، لـەبارو گونجاوی كرد

**طَبَّ ـ طِبَّ ـ طُبَّ:** چارەسـەری لاشـەو دەروون ، نـەرمو نیـانی، میـهرەبانی، جادوو، چاوبەست

**طِبّ:** پزیشكی، دكتۆریـی، چارەسـەری جەستەو دەروون ، زانیاریی پزیشـكی، نـەرمو نیـانیو بـاش مامەڵـەكردن، جادووچاوبەست، خـوو راهـاتن، دەق پێوەگرتن

**طَبَائِع الأَرْبَعِ( عِنْدَ قُدَمَاءِ الطَّبِيعِيينَ ):** لای سروشـتگەرە دێرینـەكان بریتیـە لەگەرماو سەرماو تەڕیو وشكی

**طِبَابَـة:** پزیشـكی، پزیشـكەریی، پارچەیـەكی لاكێشـەیی لـەجلو بـەرگ زیاد دەكرێت بۆ فـروان بوونـی، پارچـە زەوییەكی درێژ یان هەورو دارێكی بالاَو بەرز

**طَبَّـاخ:** چێشـتكەر، چێشـت لێنـەر، شـیوپەز، نـان ئامادەكـەر، سـوتكە، ئاگردان، سێپا

**طِبَاخَـة:** پیشـەی چێشـت لێنـەریی، شیوپەزی، چێشتكەریی

**طُبَاخَة**: کەفو کوڵی ئەوچێشتەی لەسەر ئاگر لێدەنرێ

**طَبَاشِير**: تەباشیر ، پارچە گەچێکە بۆ نووسین لەسەر تەختە بەکاردەبرێ لەخوێندنگەو قوتابخانەکاندا

**طِبَاع**: سرووشت ، خوو، ئەو شێوازەی مرۆڤی لەسەر بەدیهاتووەو رامبوە

**طَبَّاع (مَطبَعي)**: چاپکەر، چاپیار، پیت چن، پیت رێکخەر، شمشێرساز

**طِبَاعَة**: پیشەی چاپو چاپەمەنی، چاپکردنی کتێبو نووسراوە هەمەچەشنەکان ، شمشێرسازیی یان چەقۆکەریی

**طِبَاق**: وەك یەك، هاو...، چوون یەك ، بەرابەر، هاوتا

**طِبَاق(عِنْدَ أهل البَدِيع)**: لای زانایانی رەوانبێژیی بریتیە لەکۆکردنەوەی دوو مانای هاوتای یەك وەك : مردنو ژیانو...

**طُبَّاق**: دوکەڵ، رووەکێکە لەشامو گەلێ ولاتی تر دەروێت

**طَبَّال**: تەپڵ ژەن ، دەهۆڵ کوت، تەپڵ لێدەر، ئەوەی تەپڵ لێدەدات لەشاییو ئاهەنگو بۆنە جیاوازەکاندا

**طِبَالَة**: پیشەی تەپڵ ژەنین، لێدەری تەپڵو دەهۆڵ، دەهۆڵ کوت

**طَبَّبَ ـ تَطبِيبَاً**: چارەسەری کرد، چاکیکردەوە، تیماری کرد

**طَبَّبَ الخَيَاطَ**: پارچەیەکی زیادکرد لەجلەکان هەتا گوشادو بەرین بێت

**طَبَّبَ القِرْبَة**: دەمی مەشکەکەی بەست

**طَبَّة**: پارچەیەکی درێژ یان لاکێشەییە لەجلوبەرگ یان هەور یاخود پێست یان زەویو زار

**طَبَخَ طَبْخَاً**: دروستیکرد، ئامادەیکرد، هێنایەبەر

**طَبَخَ الطَعَامَ**: لێی نا، پێی گەیان

**طَبَخَ اللحْمَ**: گۆشتەکەی لێنا، خستیە سەر ئاگر

**طَبْخ ـ طَبِيخ**: ئەوەی لێدەنرێ ، لێنراو، ئامادەکراو

**طَبْخُ الطَعَام**: لێنان، پێگەیاندن، پەزان، شیوپەزکردن

**طَبَرَ ـ طَبْرَاً**: بازیدا، خۆی شاردەوە، خۆی مەلاسدا

**طَبَرْ ـ طُبَر(فَأس)**: تەور، دوودەو، بیسوور، دوودەم، تەوەر، ئاسنێکی کلکداری دەم پانی کەوانەداری تیژ داری پێدەبڕێتەوە

**طَبَشَ فِي المَاءِ**: شڵپوهوڕی کرد لەئاوەکەدا، شڵپەشڵپی نایەوە

**طَبَش**: شڵپوهوڕ، شڵپەشڵپ، پێکدادان، شەپو هوڕ

**طَبطَابَة**: تەختەیەکی پانو بەرینە بەتۆپ یاری لەسەر دەکرێ

**طَبطَبَ المَاءَ أو السَيلُ**: خورەی هات، شڵپو هوڕی هات

**طَبطَبَ المَاءَ**: جوولانی، شڵپو هوڕی لێهەستان

**طَبطَبَة**: شڵپو هوڕی ئاو ، سرپەو تەقەی قاچی رەوەندە لەکاتی رۆیشتنا

**طَبَعَ الشَيءَ**: وێنەی کێشا لەدیمەنێکدا، دەریخست لەشێوەیەکدا

**طَبَعَ الدَّراهِم:** سکەی لێدا، چاپیکرد، دراوی دروستکرد
**طَبَعَ اللهُ الخَلْقَ:** دروستی کردن، هێنانیە بوون، مافی بوونی پێدان
**طَبَعَ الإِنَاءَ مِنَ الطِّينَ وَنَحْوَهُ:** قاپەکەی لەقوڕ یان شتێکیتر دروستکرد، شێوەی کێشاو دروستیکرد
**طَبَعَ الكِتَابَ:** چاپیکرد، لەچاپیدا، لەدەستنووسەوە هێنایە دنیای کتێبو پەرتووکو بڵاوی کردەوە
**طَبَعَ عَلَيهِ:** مۆری کرد، پێکی هێنا
**طَبَعَ السَّيفَ:** دروستی کرد، پێکی هێنا
**طَبَعَ الدَّلْوَ:** پڕیکرد، لێوان لێوی کرد
**طَبَعَ فُلاناً عَلَى كَذَا:** رای هێنا لەسەر، رامیکرد لەسەر
**طَبَعَ الشَّيءَ وَعَلَيهِ:** مۆریکرد بەمۆرێك، شقڵی لێدا، دایخستو مۆری لێدا
**طَبَعَ الدَّابَّةَ:** بارێکی لێنا بۆی هەڵنەگیرا، پتر لەتوانای خۆی باری لێنا
**طَبَّعَ الحَيَوانَ (رَوَّضَهُ):** رای هێنا، ماڵیکرد، دەستەمۆی کرد
**طُبِعَ عَلَى كَذَا (عُوِّدَ):** پێیی راهات، خووی پێوەگرت، رسکا، راهێنرا، دەقی پێوەگرت
**طَبِعَ ـ طَبَعاً:** ناتەواویو خەوشێکە لەجەستە یان رەوشو رەفتاردا
**طَبِعَ السَّيفُ وَنَحْوَهُ:** ژەنگی لێنیشت، ژەنگ لێیدا
**طَبِعَ الثَّوبُ وَنَحْوَهُ:** بەتەواوی پیسو چڵکن بوو، تەواو پیس بوو

**طَبْعٌ:** سروشت، نەریت، خۆرسك، رەفتار، شێواز، رووخسار، هەوەس، ئارەزوو، کەیف، ویست
**طَبْع (فِي عِلْمِ النَّفْس):** لەزانستی دەروونناسیدا بریتیە لەگەڵ دیاردەی هەستو هەڵسوکەوت بەدەستهاتوو بۆماوە کەتاکێك لەتاکێکی تر جیادەکاتەوە
**طَبْعُ الكُتُب:** کتێبو پەرتووك چاپکردن، لەچاپدان
**طَبْعُ الأَصَابِع:** پەنجەگرتن
**طَبْعُ الحَجَر (كِتَابَةٌ عَلَى الحَجَر):** بەرد هەڵکەندن، لەبەرد نووسین، لەبەرد هەڵکۆڵین
**طَبِعٌ:** پیسو چڵکنی تەواو، ژەنگ، کەمو کوڕیو ناتەواوی
**طَبْعٌ:** پڕی ئاوو کێشانەو ...هتد
**طَبِع (دَنِيءِ الخُلق):** بێئابڕو، بەدخوو، بەدرەوشت، رسواو سووك، رسوا
**طَبِع ـ طَبَع (الصَّدَأ وَالدَّنَس):** ژەنگ، گڵاوی، پیسی
**طَبَقَ:** دایخست، پێوەیدا، جووتی کرد
**طَبِقَ:** داخرا، پێوەدرا، جووت بوو
**طَبِقَ الشَّيءَ:** بڵاوبوەوە، بوویەباو، بوو بەمۆدە، دای پۆشی، سەری نایەوە
**طَبَّقَ الحَاكِمُ فِي حُكْمِهِ:** پێکای، مەبەستی پێکا، دادو رەوابوو لەبڕیارەکەیدا
**طَبَّقَ السَّحَابُ الجَوَّ:** هەورو تەمو مژ کەشی داپۆشی، گرتیەوە
**طَبَّقَ الفَرَسَ:** لەغارغارێندا نزیك بوەوە، هاتە پێش، قاچو دەستی بەرزکردەوە

**طَبَّقَ المَاءُ وَجْهَ الأَرْضِ:** ئاو رووی زەوی داپۆشی ، گرتیەوە

**طَبَّقَ اللَيلَ:** شەو داهات ، تاریکی کرد، داهات

**طَبَّق( مُقْفَل ):** داخراو، جووت، پێوەدراو، داخراو، دەرگاو پەنجەرەی هەڵپێکراو

**طَبَق:** سەرقاپ، قاپ، دەوری، سینی، رووی زەوی، قاپو قاچاغێك نانی تیا بخورێ، حاڵو بار، پلەوپایە

**طَبَق( فِي الطب ):** لەزانستی پزیشکیدا بریتیە لەکرکراگەی نێوان هەردوو جومگەی پشت

**طَبَقُ الفنْجَان:** ژێر کوب، ژێر پیاڵە

**طَبَقُ التَدْخِين:** تەپڵەکی جگەرە، جێسوتووی جگەرە ، دەمە سوتوو

**طِبق( وِفْق ):** وەکو، گونجان لەگەڵ، بەگوێرەی،بەپێی، وەك، هاوچەشنی، هاوشێوەی، هاوتا ، هاوجووت، هاویەك

**طِبْقَ الأصْلِ:** دەقاو دەق ، کوتو مت ، بەکاردەبرێ بۆ هاووێنەیی‌و دووشت لەگەڵ یەك

**طِبْقَ المَرَام:** بەگوێرەی خواستو داوا، وەك خواستو داواکراو

**طَبِق:** تەسك، داخراو، هاتوەیەك، واژوی گوشادو بەرینە

**طِبْقاً لرَغْبَة:** بەگوێرەی خواستی، بەپێی ویستو داوا

**طَبَقَة:** پلەوپایە، بار، دۆخ، چین ، حاڵ، چین لەدوای چین ، یەك جومگەی پشت

**طَبَقَةٌ مِنَ البِنَايَة** چەن نهۆمێك لەبیناکە، چین لەسەر چین

**طَبَقَة( فِي الجيولوجي ):** یەکەیەکی گونجاوە لەبەردە نیشتوەکان لەچین‌و توێژەکانی تر جیاوازە لەرەنگو شێوەو پێکهاتەدا

**طَبَقَةُ الفُقَرَاء:** چین‌و توێژی هەژاران، چینە گەداو نەدارەکان

**طَبَقَةُ الأغْنِيَاء:** چینە دەوڵەمەندو خۆشگوزەرانەکان

**طَبَقَةُ النُبَلاَء:** چینە ئوروستوکراتیەکانی کۆمەڵ، چینە خۆشگوزەران‌و خانەدانەکان

**طَبَقَةٌ مُنْخَفِضَة:** چینی نزم‌و رەنج بەر

**طَبَقَةٌ مُتَوَسِطَة:** چینی مام ناوەندی، ناوەڕاست، میانجیگەر

**طَبَقَةٌ مِنَ النَّاسِ:** چینی خەڵك، توێژی خەڵك

**طَبَقَةُ النَغَم:** ئاواز، تۆن ، ئاستی مۆسیقی دەنگو ژێیە

**طِبْقَة( فَخ ):** داو، تەڵە، تالهە، خەفك، دەهفك، پێداف، پێگرۆك، هەف

**طَبَلَ ـ طَبْلاً:** تەپڵی لێدا، دەهۆڵو تەپڵی ژەن، دەهۆڵی کوتی

**طَبَّلَ:** بەتوندی تەپڵو دەهۆڵی ژەن، تەپڵی زۆر لێدا

**طَبْل( صَوتُ الطُبُول ):** تەپڵ لێدان، دەنگی دەهۆڵ

**طَبْل ـ طَبْلَة:** تەپڵ، دەهۆڵ، باڵەبان، دابریم، ئامرازێکی شاییو بەزم‌و ئاهەنگەو لەدەفرێکی قوولْ پێکهاتووەو چەرمێکی خاوی پیادەگیرێو بەدار یان بەدەست لێدەدرێ

**طَبْلَة( طَبْل صَغِير ):** تەپڵێکی پچووك، گچکە تەپڵ

**طَبْلَةُ الأُذُن:** پەردەی گوێ، تەپڵی گوێ
**طَبْلِيَّة:** پنە، خوان، مێز، تەپڵەك
**طَبْلِيَّةُ العَمُود(كُشْفَة):** تەپڵەكی سەر پایەو كۆڵەكە، كۆتەڵە
**طَبَنَ النَّارَ:** ئاگرەكەی پاراست هەتا نەكوژێتەوە
**طَبَنَ الشَّيءَ وَلَهُ وَبِهِ طَبْنَاً:** هەستی پێكرد، پێیزانی
**طَبَنَ فُلاَنَاً:** دەستی بڕی، هەڵیخەڵەتان
**طَبْن:** ئەو تەختەو دارەی لەسەر ڕووی زەوییە، خۆڵەمێش، ژیلەمۆ، ماڵێكی دروستكراو لەقوڕ
**طَبَنْجَة:** جۆرە تفەنگو چەكێكە
**طُبُوغرَافِيَا:** دەرخستنی دیاردە گشتیەكانی سەر ڕووی زەوی سروشتی یاخود دەستكرد
**طِبِي - طُبِي:** گۆی مەمكی گیانداران كەشیری لێدەمژن
**طَبِيب:** پزیشك، دكتۆر، خاوەن زانیاری سەبارەت بەتەندروستیو ساغی لەشو لار، هەر زاناو لێزانێك لەكارو پیشەی خۆیدا
**طَبِيبٌ بَيطَرِيٌّ:** بەیتاڵ، بەیتار، پزیشكی ئاژەڵ
**طَبِيبُ العُيُون:** پزیشكی چاو
**طَبِيبُ الأَمْرَاضِ العَصَبِيَةِ:** پزیشكی نەخۆشیەكانی سەرو مێشك
**طَبِيبُ أَمْرَاضِ النِسَاءِ:** پزیشكی نەخۆشیەكانی ژنان
**طَبِيبٌ جَرَّاح:** پزیشكی نەشتەرگەر
**طَبِيبٌ بَاطِنِي:** پزیشكی نەخۆشیەكانی هەناو
**طَبِيبٌ نَفْسَانِيٌّ:** پزیشكی نەخۆشیە دەروونیەكان
**طَبِيبٌ مُقِيم:** پزیشكی نەخۆشخانە
**طَبِيبُ الأَسْنَان:** پزیشكی دەمو ددان
**طَبِيبُ الأَمْرَاضِ الجِلْدِيَةِ:** پزیشكی نەخۆشیەكانی پێست
**طَبِيبُ الفَوَاصِلِ وَالمَفَاصِلِ:** پزیشكی ئێسكو جومگە
**طَبِيبُ الأَمْرَاضِ الصَدْرِيَةِ:** پزیشكی نەخۆشیەكانی سنگ
**طَبِيبُ التَّجْمِيل:** پزیشكی جوانكاریی، جوانكردنی جەستەو لەشو لار
**طَبِيبُ الأَشِعَةِ وَالسُونَار:** پزیشكی تیشكو سۆنەر
**طَبِيخ:** چێشت، لێنراو، گەچ، جۆرە خواردنەوەیەكە
**طَبِيعَة:** سروشت، هەوەس، ئارەزوو، خۆرسك، خوو، ڕەوشت، نەریت، ئەوسروشتەی مرۆڤی لەسەر بەدیهێنراوە
**طَبِيعِي:** سروشتی، خۆرسك، سروشتكرد، ئاسایی، سروشتی، ڕێكوپێك، سروشتزان
**طَبِيعِيَات:** زانیاریە سروشتیەكان
**طَبِيق:** چوونەیەكو بەرابەر

**ط ث**

**طَثّ:** یاریەكی منداڵانە بریتیە لەدارێكی خڕو هەڵیدەدەن
**طَثَّا:** یاریكرد بەدارینە گچكەو بچووكەكان
**طَثْرَة:** كەفی شیر، چەوری سەرەكەی، توێژاڵی، بژێویو ژیان، تووكی خوری

**طَثْرَج**: مێرووله
**طَثَنَ**: گۆرانی ، شایی، ئاوازو گۆرانی گوتن
**طَثَّهُ**: فڕێیدا، تووڕیدا، هەڵیدا
**طَثْیَار**: شێر، مێشووله

**ط ج**

**طَجَنَ الشَّيءَ**: سووری کردەوەو برژاندی
**طَجْنٌ**: سوورکردنەوە، برژاندن

**ط ح**

**طَحَ (بَسَطَ)**: تەختی‌کرد، دایخست، بڵاوی کردەوه
**طَحَا - طَحْواً**: دوورکەوتەوە، دووره پەرێزبوو، پەراگەندە کەوت ، تیاچوو، فەوتا ، نەما
**طَحَا القَومُ**: کێبڕکێیان کرد، پێشبڕکێیان کرد، بۆربۆرێنیان کرد، شان شانێنیان کرد
**طَحَا المَکَانُ**: تەختو گوشادو بەرینی‌کرد، فراوانی کرد
**طَحَا بِالکُرَةِ**: هەڵیدا، تێی گرت
**طَحَا الشَّيءَ**: پالی پێوەنا، تەنگی پێهەڵچنی
**طَحَا**: زەوییەکی پانو بەرین ، تەختە زەوی
**طَحَى**: فراوانو درێژ بوو، گوشادو بەرین بوو، نووسا بەزەویدا، لچکا پیایدا
**طُحَارُ**: سك شۆرییەك نقەو هەناسەبڕکە تووشی نەخۆش دەبێت، نەخۆشی دیزانتر تووشی یەکێك ببێتو ناڵەو هاواری لێبەرز ببێتەوه

**طَحَال - طُحَال (غُدَّةٌ إِسْفَنْجِيَة)**: سپڵ، خاڵحالك، لەپارە گۆشتێکی شین کارە بەلای جەرکی گیاندارەوە
**طُحَال (اِلْتِهَابُ الطُّحَال)**: دەردی سپڵ، هەوکردنو ئاوسانی سپڵ
**طَحَّان**: تەختە زەوی، تەخت ، تەختانی ، زەوی تەخت
**طَحَّان**: ئاشەوان، باراش هار، ئارد فرۆش، ئاشەڤان، ئاساوان، قەراش، لوویێنه، کریچ، کەسێکە کاروباری ئاش هەڵسووڕێنێ‌و باراش بهاڕێ
**طِحَانَة (حِرْفَةُ الطَّحَّان)**: پیشەی ئاشەوانی، ئارد فرۆشی
**طَحَرَ الرِّيحُ السَّحَابَ**: باکه هەورەکەی پالْ پێوەنا ، تەفرو تووناى کرد
**طَحَرَ - طَحَراً - طَحِيراً - طُحَاراً**: هەناسەکانی بەدەم ئێشو ئازارەوە دەرکرد، هەناسەی بەسەختی‌و دژواری‌دا
**طَحَرَت العَينُ قَذَاهَا**: فڕێ‌ی‌دا، توڕیدا، هەڵیدایە دەرەوە
**طَحْطَحَ**: زەردەخەنە گرتی، هێواش هێواش پێکەنی‌و بزەگرتی
**طَحْطَحَ الشَّيءَ**: شکانی، کەرتو پەرتی‌کرد، بەهیلاکی برد
**طَحْطَحَ بِهِم الدَّهرُ**: رۆژگارو سەردەم تووشی مەینەت‌و بەدبەختی کردن
**طَحْطَحَ القَومُ**: پەرش‌و بلاوی کردنەوە، تەفرو توناى کردن
**طَحِلَ - طَحْلاً وطَحَلاً**: سپڵی ئاوسا، هەڵسا، وەك رەنگی سپی وابوو
**طَحِلَ المَاءُ**: خراپ بوو، بۆگەنیکرد، گەنی

**طَحِلَ فُلاَنٌ:** لەتورەبوونا دەنگی گۆڕا، تورەبوون ، رەنگی گۆڕی

**طُحِلَ طَحَلاً:** سپڵی ئازاری هەبوو، ئێش و ئازارگەیی بەسپڵی

**طَحِلٌ:** سپڵ گەورەو ئاوساو ، تورە، پڕ، لێوان لێو، سەرپڕ

**طَحِلٌ( ملآن ):** پڕ ، لێوان ، لێوان لێو، لێواو لێو

**طَحِلٌ:** رەشی لێڵ، تورەو خەشم گرتوو

**طَحْلاَءُ:** شتێك رەنگی لەرەنگی سپڵ بچێت وەك ئاژەڵو ...

**طَحْلَبَ الْمَاءُ:** قەوزە کەوتە سەر ئاوەکە، قەوزەی گرت

**طَحْلَبَ الأَرْضُ:** بەرووەك سەوز بوو، سەوز بوو بەرووەك

**طُحْلُب ـ طِحْلِب:** قەوزە، گەفس، لیم، کەزووکووز، خوریەجنە، خوریەچندۆك، کەز، کووز، جۆرە بەڵغ و ملتەیەکی سەوزە لەنێو ئاوی مەنگدا پەیدا دەبێ

**طُحْلَة:** رەنگێك وەك رەنگی خۆڵەمێشی وایە، بۆر

**طَحْمَاءُ:** رووەکێکە

**طُحْمَةُ النَّاس:** کۆمەڵیان، گرۆهو تاقمیان، دەستەیان

**طَحْمَ:** بازیدا، قەڵەمبازیدا

**طَحْمَ السِّقَاءُ:** پڕیکرد، تالێوەکەی هێنا

**طَحْمُورَث:** یەکێکە لەپادشا مەزنەکانی ئێرانەو ماوەیەکی زۆر فەرمانڕەوایی کردووە

**طَحَنَ الْبُرَّ:** هاڕی، وردی کرد، کردی بەئارد

**طَحَنَ الْمَنِيَّةَ القوم:** تیای بردن، لەناوی بردن، سەریان فەوتا

**طَحْن ـ طَحِين:** ئارد ، هارد، ئارڤان، هاردی، ئاردە، دانەوێڵەی هاڕاو

**طُحْنَة:** زۆر هاڕاوو وردکراو، زۆر کورت و کەم بالآ

**طَحُون:** جەنگ، دەستەو گرۆهێکی مەزن و بێ‌شومار، جڵەوو گەلە وشترێك

**طَحِين:** ئارد، هارد، ئارڤان، ئاردە، دانەوێڵەی هاڕاو

## طر

**طَرَّ الْمَاشِيَةَ:** بەتوندی لێی خوڕی، بردی بەرێوە

**طَرَّ الإِبِلَ:** لەلایەکدا کۆی کردنەوەو لێی خوڕین، گردی کردن

**طَرَّ الشَّيْءَ:** بڕی ، لەتیکرد، کەرتیکرد

**طَرَّ الثَّوبَ:** دایدڕی، هەڵی قڵیشان

**طَرَّ السِّكِّينَ:** تیژیکرد، ساویدا، دەمەزەردی کرد

**طَرَّ الشَّارِبَ وَالشَّعْرَ( طَلَعَ ):** دەرهات، مووی لێهات، سمێڵیکرد، سمێڵی بۆرکرد ، گووگرەبوو

**طَرَّ الْبُنْيَانَ:** تازەی کردەوە، نوێی کردەوە، دەستی پیاهێنا

**طَرَّ الْحَوْضَ:** قوڕکاری کرد، قوڕی پیاهەڵسوو

**طَرَّ الْمَالَ:** بردی، هەڵیگرت، دەستی بەسەراگرت، خستیە ژێرچنگی خۆیەوە

**طَرَّ فُلاَنًا:** لێیدا، پیای کێشا، شەپازللەیەکی لێدا، دەریکرد، دەری بەڕان

**طَرَّ النُّجُومَ:** ئەستێرەکان هەڵهاتن ، رۆشن بوونەوە، رووناکیان پەخش کرد

**طَرَّ الرَّجُلُ مِنَ السَطحِ:** پیاوەکە لەسەربان کەوتەخوارەوە، بەربووەوە، ترازاو کەوت
**طَرَّ الشَعرُ:** رووا، سەری هەڵدا، دەرکەوت، بەرزبووەوە
**طَرَّ اليَدَ:** بڕی، کورتی کردەوە، لێی کردەوە
**طَرَّ البِنَاءَ وَنَحْوَهُ:** جوانیکرد، دەستی پیاهێنا، رووکەشی کرد بە ....، بەرزی کردەوە
**طَرَّى ـ تَطرِيَةً:** نەرمی کردەوە، پاراویکرد، شلی کردەوە
**طَرَّى الطَعَامَ:** لەگەڵ بەهاراتا تێکەڵیکرد، بۆنی خۆشی تێکرد
**طَرَّى الطِيبَ:** تێکەڵ بەداودەرمانیکرد، ئاوێتەی کرد لەگەڵ دەرمانا
**طَرَائِف:** دەگمەن، دانسقە، شتە دانەدانەییەکان، نەوازە، سەرسوڕهێنەرەکان، شتە ئەستەمو نەوازەکان
**طَرَائِفُ الحَدِيثِ:** فەرموودە نەوازەکان، باسو خواسە دەگمەنو دانسقەکان
**طَرَائِفيّ:** فرۆشەری شتەدەگمەنو ناوازەکان
**طَرَاحُ:** شوێنو جێگەیەکی دووری بەرینو گوشاد
**طَرَادُ:** کەشتی جەنگی، کەشتی راونەرو شوێنکەوتە، شوێنی فراوان، کەشتیەکی گچکەی فراوانی جەنگیە، رۆژێکی دوورو درێژ
**طَرَادُ النَهرِ:** کەناری روبار، قەراخەکەی، رۆخەکەی

**طَرَّار:** دز، جەردە، گیرفانبڕ، بەیەکێك دەگوترێت شقڵو کون بکاتە گیرفانو جلوبەرگ بۆئەوەی تالآنی بکات
**طِرَاز:** رێگە، رێباز، چۆنیەتی، دیمەن، شێوە، رەنگ، جۆر، شێواز، ئەو شوێنەی جلوبەرگی چاكو باشی لێ دەدروون
**طِرَازَة:** پیشە، کار، فرمان، یەکێك پیشەی نەخشو نیگار دروستکردن بێت لەسەر جلو بەرگ
**طَرَافِيَة:** گەنمە پووچەڵ
**طَرَاق:** چەرمی نەعل، ناسنێکە دوای ئەوەی گەرم دەکرێ ئەوجا دەکرێت بەزرێو قەڵغانو شتی لەوبابەتە، هەرچەرمێك سەری نەعلی پێدەگیرێ
**طُرآن (الأمر المُنكَر):** کاری نابەجێ، کرداری ناشایستەو گونجاو، رەفتەی ناشیاو
**طُرآنِيّ:** نامۆ بیانی، بێگانە، نەناسراو، نادیار، ونبوو، کەسێك بنەچەو رەچەڵەکی نەناسراوو نادیار بێت
**طَرَاوَة:** نەرمی، نەرمو شلی، پاراوی، شێواوی، تەڕی، نم داریی، شنەی شەماڵ، کزە، بای ساردو فێنك، نەسیم
**طَرَأَ عَلَيهِم:** کوتو پڕ هات، لەناکاو هات، لەپڕا دەرکەوت، روویدا، لەپڕو ناکاو قەوما، لەشوێنو جێگەیەکی دوورەوە هات بۆلایانو رووی تێکردن
**طَرَأَ المَكَانَ (إستَعمَرَهُ):** داگیریکرد، دەستی بەسەرا گرت، خستیە ژێر دەستی خۆیەوە

**طُـرّاً:** سـەراپا، هـەموو، بەکۆمـەڵ، سەرجەم، هەمووان

**طَرِبَ( إهْتَزَ فَرَحاً وَحُزنَاً ):** دڵخۆشبوو، شادبوو، گەشـکەداربوو، هاتـەجۆش‌و خرۆش ، پەشۆکا ، هـەژی، هەراسان‌و نیگەران بوو ، غەمبار بوو (لەوشـە دژە یەکەکانە)

**طَرَّبَ:** گۆرانی وت ، چرانی، دەنگـی لێهەڵبڕی، چریکانی

**طَـرَّبَ عَـنِ الطَرِيـقِ:** دوورکەوتـەوە، لایدا، ترازا

**طَـرَّبَ فُلاَنَـاً:** گۆرانـی پێگـوت، دڵشـادیکرد، دڵخۆشـیکرد، هێنایـە خۆشی‌و پێکەنین

**طَرَب:** خۆشی ، شادی، گەشکە، بەزم، هـەژان‌و خرۆشـانی نەفسـە بـەهۆی خۆشی یـان ناخۆشـییەوەو پـتر بـۆ خۆشی‌و شایی بەکاردەبرێ

**طَـرِب:** دڵشـاد، دڵخـۆش ، شـاد، پێخۆشـحاڵ، شـادمان، گەشـکەدار، بـەزم‌و کـەیفدار، خرۆشـاو، هـەژاو، جونبوش خواردوو ، کینگڵدان

**طِرْبَـال** نیشـانە، ڕێنیشـان، تـەلار، کەڵەکەبەرد، هەریەشێکی شـاخ‌و دیـوار کەچوویێت بەئاسمانا

**طَرْبُـوش:** فێسـت، فێـس، کلاَوێکـی سووری خڕە، کۆمسۆر، جۆرە کلاَوێکی سفتی سووری سوواوەیە

**طَرْبِيـد:** موشـەکێکی گەورەیـە بەلەمەگچکـەکان یـان فڕۆکـە یـاخود مەلـەوانی ئـاویی دژ بەکەشتی دوژمـن دەیتەقێنێ

**طَرْبِيل:** گاسن

**طُرَّة:** ناوچەوان، تەوێڵ، کەنار، لێوار، قەراخ

**طَرثُوث:** روەکێکە

**طَـرَحَ الشَّـيءَ وَبِالشَّـيءِ (رَمَـاهُ):** هاویشـتی، هـەڵیدا، فرێیـدا، توڕیـدا، دووری خستەوە

**طَرَحَ الثَّوبَ عَلَيَه:** جلـەکانی کـردە بەری، دای بەسەریا

**طَرَحَ عَنْـهُ:** فرێیـداو دووری خستەوە، دووری خستەوە لێی‌ی

**طَرَحَ الأُنثَى:** منداڵەکـەی فرێـدا بـەر لەتـەواوبوونی، بەرەکـەی خسـت، لەباریچوو فرێ‌ی‌دا

**طَرَحَ الحَاسِـبُ:** ژمارەگـەورەکانی لادا، وازی‌لێـهێنا، دەسـتبەرداری بـوو ، دەرکردنی ژمارەی گەورە لەپچووك

**طَرَحَ عَلَـيهِ مَسْـئَلَةً( عَرَضَهَا ):** راوێـژی پێکرد، باسێکی بۆ گێڕایەوە، پرسیاری پێکرد

**طَـرَحَ عَلَـى الأَرْضِ (رَمَـاهُ):** کوتـای بەزەویدا، تەختی کرد

**طَـرَحَ عَلَيـهِ سُؤالاً:** پرسـیاری لێکـرد، پرسیاری ئاڕاستەکرد

**طَرْحُ البَحْرِ فِي مِصْر:** پارچە زەوییەکە لـەرۆخی روبـاری (نیـل)و بـەرزترە بـۆ کشتوکاڵ بەکاردەبرێ

**طَـرَحَ بِـهِ السَـفَرَ إلَـى نَاحِيَـةِ كَـذَا:** رەوانـەی کـرد، نـاردی، پـاڵی پێوەنـا، بەرێ‌ی‌کرد

**طَرَحَ الأُنثَى:** وەهای لێکـرد منداڵەکـەی فڕێ بدا، بەرەکەی لـەبار بـرد ، پێـی‌ی فرێدا

**طَرَّحَ البِنَاءَ:** زۆر بەرزی کردەوە، فرە باڵاو بڵندی کرد
**طَرَحَ(إلقَاء ـ نَبذ):** فڕێدان، هەڵدان، هاویشتن، تووڕدان، دوورخستنەوە، ئەفەرۆزکردن، نەویستن
**طَرَحَ فِي الحِسَاب:** دەرکردن، لێدەرکردن، لێکدەرکردن، داشکاندن
**طَرَحَ الجَنِين:** بەرفڕێدان، لەبارچوون، فەوتان، فڕێدان
**طَرْح:** فڕێدراو، منداڵی ناتەواو کەژنی دووگیان فڕێی دەدات بەر لەتەواوبوونی، هاوێژراو، کەوتوو، لەبارچوو، لەبارچوون
**طَرْحَة:** جارێك، کەرەتێك، پەچە، رووپۆش، چادر
**طَرْخُوم:** درێژ، ئاوێك مەنگی بەستبێت
**طَرْخَة:** نیمچە گۆلێکی گەورەیە لەدەمی جۆگەلەیەکدا
**طَرْخَنَة:** سووکی، نزمی، رسوایی
**طَرْخُون:** تەرخوون، گیایەکە لەنێو ماستو دۆکولێوو تووراخ دەکرێت گەڵاکەی باریکە تامی خۆشو توندە بەگۆشتیشەوە دەخورێ
**طَرَدَ مِن مَنْصَبِه:** لەپۆستو دەستەڵاتی خۆی دەرکرا، لەکارو فرمانی خۆی دوورخرایەوە
**طَرَدَ مِن بِلادِه:** دوورخرایەوە لەوڵاتی خۆی، پەراگەندە خرا، نەفی کرا
**طَرَدَ الإبِل:** لەملاولاوە کردنی بەنێویەکاو ئەوجا لێی خوڕین
**طَرَدَ بَصَرَهُ فِي أثَرِ القَوم:** چاوی تێبڕی، چاوی تێکرد

**طَرَدَ المَولُودُ أخَاهُ:** لەدوای براکەیەوە لەدایك بوو، بەدوای ئەوا هات
**طَرَدَ الصَيدَ وَنَحوَهُ:** مەولی راووشکاریدا، بەردەوام بوو لەسەر راوو شوێنی نێچیرەکەی کەوت
**طَرَدَ:** دووریخستەوە، راوینا، قاویدا، هەڵی بڕی، کردیە دەرەوە، دەریپەڕان
**طَرَدَ السَوطَ:** درێژی کرد، هەڵیسوڕان، وەشاندی
**طَرْد:** دوورخستنەوە، لابردن، راوەدونان
**طَرَد:** لق و پۆپە پچووکەکانی دارخورما
**طَرَدَان:** دەنکی رەش بووەوە لەنێو گەنما
**طَرَدَهُ:** دەریکرد، دووریخستەوە، پەراگەندەی کرد
**طَرُزَ ـ طَرَزَاً:** رەوشتی باش بوو پاش خراپی و ناڵەباریی
**طَرَزَ فِي المَلبَس:** جلو بەرگی جوانی پۆشی، لەجلو بەرگی گرانبەهای لەبەرکرد، کەشخەی لەبەرکرد
**طَرَّزَ الثَوبَ(وَشَّاهُ):** نەخشانی، نەخشی تیاکرد، چنی
**طَرْز ـ طِرَاز:** شێوە، رێگە، چۆنیەتی، دیمەن و شێوە، رەنگ و بۆ
**طَرَسَ:** سڕیەوە، کوژانیەوە، لایبرد
**طَرَسَ الكِتَابَ:** نووسی، تۆماریکرد
**طَرَّسَ الكِتَابَ:** دیسان کوژاندیەوە، سڕیەوە
**طَرَّسَ الكَاتِبُ:** دیسان نووسیەوە، تۆماریکرد
**طِرْس:** لاپەرە، نوسراو، رووپەرە، رووپەل، کاغەز

**طَرِشَ( ذَهَبَ سَمْعُهُ ):** کەڕبوو، گوێی لەدەستدا، گوێی گران بوو
**طَرِش:** کەڕی، بێگوێی، لەدەستدانی هەستی بیستن، گوێ قورسی
**طَرَّشَ ( أصَمَّ ):** کەڕیکرد، هەستی بیستنی لەدەستدا
**طُرْشي:** ترشیات
**طَرِط:** بێئەقڵو ژیری بوو
**طَرِط:** گەمژە، گەلحۆ، گێل ، کەودەن
**طَرْطَرَ:** خۆی هەڵکێشا، شانازی کرد، شانازی کرد بەشتێکەوە کەوا نەیبوو
**طَرْطَرَ بِضَأنِه وَنَحوِه:** مێنای بۆ دۆشین
**طَرْطَرُ:** نیشتنەوەی مەی بەرەهاو پوختی
**طُرْطُور:** باریکو درێژ، بالآبەرزی لەڕ، داری واوەیلا، کلاوی قووچ
**طَرَفَ عَينَهُ:** چاوی ئاویکرد، ئاوی پیاهاتە خوارەوە
**طَرَفَ بِعَينِه ـ طَرَفَ بَصَرَهُ:** چاوی داگرت، چاوی تروکان
**طَرَفَ إلَيه:** تەماشایکرد، بۆیڕوانی، چاوی تێبڕی
**طُرِفَ عَينُهُ الحُزنُ وطَرَفَ عَينَهُ المَالَ:** لەحەقو راستی کوێری کرد، نابینابوو
**طَرَفَ فُلانَاً عَنِ الشَّيءِ:** دووری خستەوە، پەراگەندەی کرد
**طَرَفَ الجُندِيُّ:** خستیە سەرپەڕ، لەملاولا کوشتاری کرد
**طَرَّفَ الشَّيءَ:** کردی بەلایەکو ئەملاولای بۆ دروستکرد
**طَرَّفَ المَرأةُ أنامِلَهَا وأظْفَارَهَا:** خەنەی لێدا، رەنگی کرد بەخەنەو رازاندیەوە
**طَرَّفَ بَنَانَهُ:** سەری پەنجەکانی بەخەنە سوورکرد
**طَرَّفَ بِكَذَا:** پێشکەشی کرد، بەدیاری دایە
**طَرْف:** چاو، کەنار، لێوار، جەمسەر، سنوور، پەڕ، لا ، ئەوپەڕی، کۆتایی، سەر، نووك
**طَرَف:** دەستە، کۆمەڵ، لا، لایەن، کۆتایی، سەر، پەڕ، کەنار، چمك، لێوار، گوێ، شوێنو جێگە، تەنیشت، پەڵ، قاچو دەست ، پیاوی رێزدارو خاوەن کەسێتی
**طَرْف:** پیاوو لاوی بەرێزو بەکەسێتی
**طَرَف:** رێزداری هەردوولا ؛ مەبەست پێی باوكو دایکیخەڵکییە یان ئەسپێکی رەسەن لە هەردووسەرەوە، ماڵی نوێو تازە
**طَرِف:** رارا، ناجێگیر ، بێهاوڕێو برادەر، هەر شوێنو جێگەیەك ، ئەوەی تاسەر لەگەڵ کەس نابێتو دۆستایەتی ناپارێزێ، رەچەڵەکی پاكو بێگەرد
**طَرَفا الخُصُومَة:** هەردوولا، دوولای ناکۆك
**طَرْفاء:** دارگەز، گەز، گەزی چار، دارێکی باریکی جیبڕە لەداری سەرو دەچێ لەقەراغ رووبار شین دەبێو گەلای ریشاڵ ریشاڵەو بەتەڕی دەسووتێو لقەکانی لەگەزی پێوان دەچێ
**طُرْفَة ـ طَرِيفَة:** نوکتە، قسەی خۆش ، پێکەنین، نایاب، نادیدە، دیاری، خەڵات

**طَـرَقَ البَـابَ :** لـەدەرگای‌یدا، تەقـەی لێهەستان
**طَرَقَ المَوضُوعَ:** باسیکرد، بۆیچوو، دانی پیانا، لەباسەکە دوا
**طَرَقَ أُذُنَهُ:** بەرگوێی کەوت ، بیستی
**طَـرَقَ الصُـوفَ(نَتَفَـهُ ):** شـیکردەوە، ڕێزاڵ ڕێزاڵی کرد، بەبانکوت لێیدا
**طَرَقَ القَومَ:** شەو چوە سـەریان، شـەو چوە لایان
**طَرَقَ النَّجمَ:** شەو هەڵهات ، ئەسـتێرە دەرکەوت
**طَـرَقَ المَعْـدَنَ:** لێیـدا، کوتیـــەوە، دایگرتەوە
**طَرَقَ الطَرِيـقَ:** ڕێگـەی گرتەبـەر، ملـی ڕێی گرت
**طَرَقَ الكَـلامَ:** ملـی پیاکرد، باسیکردو ڕووی تێکرد
**طَـرَقَ بِالمِطرَقَـةِ:** بەچـەکوش لێـدا، چەکوشکاریی کرد
**طَـرَقَ بِالبَـال( خَطَـرَ):** هـات بـەبیریا، هاتە نێوبیری
**طَرَّقَ المَعْدَنَ:** تەنکی کردەوە، کشـانی، کێشای پیایدا
**طَرَّقَ لَهُ:** ڕێگەیەکی بۆدانـا، دەروازەی بۆ کرد
**طَرَّقَ طَرِيقَةً حَسَنَةً:** دای مێنا، وەبەری مێنا
**طَرَّقَ الحَدِيدَ:** تەنکی کردەوە، کشانی
**طَـرْق ـ طَـرَق:** یـەکجار ئامـــادەبوون بەشـــەو، جـــارێك، چەکوشـــکاری ، بەچەکوش لێدان
**طَـرْقُ البَـــاب:** لـەدەرگادان، تەقـە هەستان لەدەرگا

**طَرْقُ المَعَادِنِ:** پانکردنەوە، کوتان، کش پێهێنان
**طَرْقَـةٌ:** لێدانێك ، پیاکێشانێك، جـار، کەڕەت، جارێك، کەرەتێك
**طُرْقَـــةٌ:** ڕێبـــازێك بـــۆ گەیشــــتن بەمەبەســـتێك، خـــوو دابو نـــەریت، چاوبرسێتی، چاوچنۆکی، ڕیزە بـەردێك لەسەر یەك
**طَرْمٌ:** هەنگوین، کەرە
**طُرْمَـةٌ:** هاتنـــە دەرەوەی هـــەنگوین لەشانەکەی بەلێشاو
**طَرمَخَ بِنَـاءَه:** درێژو بالآی کـرد، بـەرزی کردەوە
**طِرْمِسَـــاءُ:** تـــاریکی، نیشتنەســـەری شەپۆلەکانی تاریکی، هـەورێکی سپی‌و ناسك، تەپ‌و تۆز
**طَرْمَسَـــةٌ:** کرژبـــوون، هاتنەوەیـــەك، هەڵهاتن ، ڕاکردن
**طَرْمَشَ اللیلُ:** تاریکی کرد، تاریك بوو
**طَرْمُوثٌ:** لاواز، کز، زەبوون
**طُرْمُـــوحٌ:** درێـــژ ، بـــالآ، خـــاوەن ڕەچەڵەك‌و بنەچە
**طَرْنَاس:** تاریکاییەکی چەتوون
**طَرُوَ ـ طَـرَاوَةً :** نـەرم‌و شـلی، پـاراوی، تەڕوبڕی
**طَرُوبٌ:** زۆر شادمان، یەکجار کـەیفدار، بەزمدار، دەم بەپێکەنین
**طَرُوحٌ:** فرێدەر، هەڵدەر، زۆر فرێدەر
**طَرِيٌّ:** پاراو، نەرم‌و شل، تازە، سـەوز، نوێ
**طَرِيحٌ:** فرێدراو، هاوێژراو، کەوتوو
**طَرِيحُ الفِرَاشِ:** کـەوتوو لەجێگـەدا، کەسیفی سەرجێ، پاڵکەوتوو

**طَرِيد**: دوورخراو، دەرکراو، نەویستراو، راکـردوو، لانـەواز ، پاشـە بـەرە، دەربـەدەر، ئـەوەی لـەدواوە لـەدایك دەبێت

**طَرِيدُ العَدَالَة**: راکـردوو، هەڵـهاتوو لەدادگەریی، رەهەندە، رەهەند

**طَرِيدُ مِنَ الأَيَام**: رۆژی درێـژ ، رۆژی دوورو درێژ

**طَرِيدَان**: شەوو رۆژ

**طَرِيدَة**: ئـەوەی شـوێنی دەکـەویت لەراووشـکارو شـتیتر، پارچەیـەکی لاکێشەیی‌یە لەئاوریشم یان شـتی‌تر، وشـتری دزراو ، پارچە پەڕۆیەك تـەڕ دەکرێ‌و نێـو تـەنوری پێدەسـڕێت ، شاڵ

**طَرِير**: روخسـار جـوان‌و قەشـەنگ، ئەوەی تازە سمێڵی بۆر کردبێت

**طَرِيف**: تازە، نوێ، نفت‌و نـوێ، تـازە پیاکەوتوو، تـازە دەوڵەمـەند، نـامۆ، دەگمـەن، نۆبـەرە، دانسـقە، قسـەو گوتەیەکی باش‌و پەسەند

**طَرِيق**: رێگە، رێبـاز، راڕەو، توولـەرێ، شەقام، جادە

**طَرِيقَة**: چۆنیەتی، شێواز، شێوە، بار، سـەمت، رەفتـار، رێگـە، هـۆ، هۆکـار، رێڕەو، رێباز، باوەڕ، ئایین

**ط ز**

**طَزَاجَة**: تـازەیی، نـوێ ، تـازەو نفت‌و نوێ

**طَـزَرُ**: پـاڵ پێوەنـان بەدەسـتی قوچاوەوە

**طَزَر**: روەکی هاوینە

**ط س**

**طَسَ فِي الأَرْضِ وَإِلَيهَا**: لەرۆیشتنا دوور رۆیی ، فرە دوورکەوتەوە

**طَسَّ فُلاَنَاً**: بریندارِیکـرد، لێیـدا، زامـداری کـرد، دژایـەتی لەگـەڵ کـردو تەنگی پێهەڵچنی

**طَسَ الشَّيءَ فِي المَاءِ وَنَحْوِه**: نغرۆیکرد، نوقمی کرد، بەسەری پەنجەکانی گرتی

**طَسَاسَة**: پیشەی تەشت دروسـتکردن، تەشت فرۆش

**طَسَان**: خـۆڵ‌و بـاران، میـانی جـەنگ‌و شەڕ

**طَسْت**: تەشت، لەگەن ، گەرکە، تەسە، تـەس، دەفرێکـی گـەورەی دەم والآی لێواردارە لەمس‌و یان تەنەکـە یـا لـەوح یـاخود لایلـۆن دروسـت دەکرێـت بـۆ جلشتن‌و دەست شتن‌و پێداویستی نێـو ماڵ بەکار دەبرێ

**طَسَّة**: جارێك دوورکەوتنـەوە، تەشـت، زەفەر بردن

**طَسْسَ**: رۆیی بەسەر زەویدا، تێپەڕی

**طَسَمَ الشَّيءَ**: کوژایەوە، ئاوابوو ، نەما

**طَسَم**: تاریکی ، تەم‌و مژ، تەپ‌و تۆز

**طَسْمَة**: تیلماسێکە لەچـەرم گوێزانـی لەسەر ساودەدرێ

**ط ش**

**طَشَّ الرَّجُـل**: تووشـی هەلآمـەت بـوو ، درمی گرت، تووشی پەتا هات

**طَشَّ المَطَر**: لاوازبـوو، کزبـوو، هێواشـی کردەوە

**طَشَّ فُلاَنَ**: پژمی‌و پرژەی بلآوکردەوە، پرژەی دا لەچاوی بەرامبەرەکەی

**طَشَّ:** پرژەلێیدا، نمەلێیدا

**طَشَّ الأرْضَ:** نمەنمەی باران لێیدا

**طَشّ ـ طَشِيش(المَطَرُ الخَفِيفُ):** نمەباران، رشێنە، بارانی کەم

**طَشَّ المَاءَ:** ئاوپژان، ئاورشێن

**طَشَاش:** نمەباران، رشێنە ، لاوازیی بینایی

**طَشَّت السَّمَاءُ:** نمەیەك باری، رشێنەیەك

**طُشَّة:** هەلامەت ، پەسیو

**طَشِيش:** نمەبارانێك ، رشێنە

## طع

**طَعَام:** خۆراك، خۆرشت، خواردن، نان، شەوەسارد، ئەوەی توانـاو برستی جەستەی پێدەدرێت

**طَعَامُ البَحْر:** ئەو ماسیەی بەبێ راوكردن ئاو لای دەدات

**طَعَامِيّ:** خۆراك فرۆش

**طَعَّان:** توانجـدەر، تـانووت دەر، رەخنەگر، نكوولی كەر

**طَعِمَ:** برسیبوو،پێویستی بەخواردنبوو، كەدەی خالی بوو، تێری خوارد

**طَعِمَ ـ طَعْماً وَطَعَاماً:** خواردی

**طَعَّمَ الغُصْنَ أو الفَرعَ:** موتوربەی كرد، ئەمام كردنی درەختێك یا گوڵێك لەدرەختێك یا گوڵێكیتر

**طَعِمَ الشَّيءَ وَمِنْهُ:** خستیە سەر لێویو خواردی، چەشتی، تامی كرد

**طَعِمَ عَلَيه:** دەستەلاتو توانای بەسەرا شكا

**طَعَّمَ الغُصْنَ أو الشَّجَرَ:** موتوربەی كرد

**طَعَّمَ فِي الطِب(لَقَّحَ):** كوتـای، دەرزی لێدا

**طَعَّمَ الخَشَبَ أو المَعْدَنَ:** نەخشـانی، نەخشی كرد

**طَعْم:** تام، مەزە، خۆشی، شادی

**طُعْم:** خـواردن، توانـا، ئـەو دانـەی بـۆ بولبولو پەلـەوەر یـان ماسـی دەخـرێ هەتا راوبكرێ ، دان ، ژارماسی، دان بۆ رۆكردن، بەرتیل، رەشوە ، هۆكـاری گەیشتن بەمەبەستو خوازێك

**طُعْمُ النَّبَات:** موتوربە كردن

**طُعْمٌ طِبِّيّ:** دەرمانی كوتـان ، دەرزی كوتان

**طَعِم:** بەتام، تامدار، خۆش، مەزەدار

**طَعْمٌ:** ئـەوەی بەهەسـتی چەشـتن هەسـتی پێدەكـرێ لـەخواردنو خواردنـەوە وەك شـیرینیو تـاڵیو ترشیو تامی تـر، ئـەوەی تـامو چێژی هەیە لەخواردنا ، خۆراك ، خواردن

**طُعْمَة:** بـانگكردن بـۆ خـواردن، رزقو رۆزی، سەرچاوەی بژێویو رزق

**طِعْمَة:** جـۆر، چەشـن، سـەرچاوەی بژێویو ژیان

**طَعَنَ بِـالرُمْحِ أو السِّكِين:** لێـیدا، پیاكرد، پیاچەقان

**طَعَنَ فِي السِّن(شَاخَ):** پـیربوو، چوەساڵەوە، بەساڵاچوو ، تەمەنداربوو

**طَعَنَ فِيهِ وَعَلَيهِ بِالشَّر:** قسـەی ناشـیرینی پێكـوت، جنێـوی پێـدا، سەرزەنشتی كرد

**طَعَنَ فِي المَفَازَة:** چوو، رۆیی، رۆیشت

**طَعَنَ فِي الأرْضِ وَنَحْوَهَـا:** رۆیـیو وردبوەوە، رۆشتو سەرنجیدا

**طَعَنَ الفَرَسُ وَنَحْوَهُ فِي عِنَانِهِ:** لەرۆیشتنا قاچی بلاوكردەوە

**طَعَنَ الليلَ وَنَحْوَه أو فِيه:** ڕۆیی، چوو بەڕێوە، بەڕێکەوت، بەدرێژایی شەو بەڕێوە بوو
**طَعَنَ فِي شَرَفِه:** ئابڕوی برد، قسەی ناشیرینی پێگوت
**طَعَنَ فِي الحُكْم:** بەرپەرچی فەرمانی دادگایی دایەوە، رەخنەی لێگرت، نکوولی لێکرد
**طَعَنَ فِي قَوْلِه:** رەخنەی لێگرت، نکوولی کرد، بەدرۆی خستەوە
**طُعِنَ الرَّجُل:** تووشی تاعون بوو، تاعون لێیدا
**طُعِنَ فِي بَطْنِه أو فِي جَنَازَتِه:** کەوتە سەرەمەرگ، نزیک بەمەرگو مردن بووەوە، وەختە بوو بمرێ
**طَعْن:** لێدان ، پیاکردن، پیاچەقان، قسەی ناشیرین وتن ، پلار تێگرتن ، تانەلێدان
**طعن(فِي قَانُون المُرَافَعَات):** بریتیە لەبەرزکردنەوەی سکالاو داوایەک لەسەر بڕیاری دوایی لەلایەن فەرمان بەسەرا دراوەوە بۆ دادگای رەخنەو نکوولی تێدا رەخنەو نکوولی لەسەر بڕیارەکە دەخاتە ڕوو ئەمەش لەرووی یاساییەوە نەک واقیعو بارو حاڵی بەرچاو
**طَعْنَة:** رەخنەو نکوولییەک، شوێنەواری لێدانو برینداربیەک
**طَعِين:** لێزانو شارەزا لەپێکانو لێدانا، لێزان لەبریندارکردنا

**طغ**

**طَغَا(هَاجَ):** تورەبوو، هەڵچوو، ئاگری گرت، وروژا، هەژی
**طَغَا الكَافِر:** بێباوەڕەکە رۆچوو لەنەزانینو نەفامیدا
**طَغَا الرَّجُل:** لەگوناهو تاوانا رۆچوو، لەتاوانو سەرپێچیدا پەرێزی شکان
**طَغَا المَاءُ:** بەرزبووەوە، هەڵچوو
**طَغَا البَحْرُ:** شەپۆلەکانی هەڵسا، هەڵچوو، هەژا
**طَغَا السَّيلُ:** لافاو هەڵسا، لافاو هات
**طَغَى فُلانًا:** ناچاری کرد ستەمو زۆرداری بکات
**طُغَام:** خەڵکی سووکو رسوا
**طُغَامَة:** گێل ، کەودەن، گەمژە، نەزان
**طُغْرَى ـ طُغْرَى:** وشەیەکە لەسەرووی نامەوە دەنووسرێو پتر نازناوی فەرمانڕەوای تێدایەو ئەم هونەرەش لەرومو فارسەوە داهات
**طُغْمَة (زُمْرَة ـ جَمَاعَة):** کۆمەڵ، دەستە، تاقم، گرۆه، چەند کەسێك
**طَغْوَى:** یاخی بوون، لادان، سەرپێچی
**طُغْوَة:** سووکو رسوایی، نزمی ، هیچ لەبارا نەبوو
**طَغِيَ طُغْيَانًا:** ستەمی‌کرد، رۆچوو نافەرمانی کرد، سەرپێچی کرد
**طَغِيَ المَاءُ:** شەپۆلیدا، مەوجی دا
**طَغِيَ الكَافِرُ:** سنووری شکاند، بێباوەڕەکە لەسنوور دەرچوو
**طُغْيَان:** ستەم، ستەمکاریی، زۆرداری، جەور، لافاو، ئاوهەڵسان
**طُغْيَان(فِي الجِيُولُوجِيَا):** داپۆشینی رووی زەوی بەئاوی دەریا بەدرێژاییەکی بەر فراوانو کەڵەکەبوونی نیشتەو پێکهاتەکانی دەریا بەسەر ئەو ناوچانەدا

**طُفَيْة:** هەر شوێنێکی بەرزو سەخت، لووسی سپیو روون

**ط ف**

**طَفَّ الشَّيءِ مِنهُ(دَنَا):** لێی نزیک بوەوە، لێی هاتە پێش

**طَفَّ الشَّمسُ:** وەختەبوو ئاوا دەبوو، رووبەئاوابوون چوو

**طَفَّ مِنهُ وَلَهُ:** دەرکەوتو لەمیانی دەست لێدانا بوو، گرتنی ئاسانو سانابوو

**طَفَّ الفَرَسُ وَنَحْوَه:** مێواشو تیژ بوو، خاوو پەلە بوو

**طَفَّ لَهُ بِحَجَرٍ وَنَحْوَهُ:** وەختەبوو بەردی تێبگرێ

**طَفَّ الحَائِطَ وَنَحْوَه:** بەرزتر بوو، بڵندتربوو

**طَفَّ الشَّيءَ بِيَدِهِ أو بِرِجْلِه:** بەرزی کردەوە، بڵندی کردەوە

**طَفَّ النَّاقَةَ وَنَحْوَهَا:** ڕێشمەکەی توند گرێدا

**طَفّ:** تەنیشت، لا، رۆخ، کەنار، کەناری ئاو، قەدپاڵ، لاپاڵ، داوێن، کۆرەپان

**طَفَا فَوقَ المَاءِ:** سەرئاوکەوت، سەرکەوت

**طَفَا الفَرَسُ:** سەری بەرزکردەوە، سەری بڵندکردەوە

**طَفَا الظَّبيُ:** بەخێرایی رۆیی

**طَفَا فُلانٌ:** چوە نێو باسەکەوە

**طَفَا فُلانٌ فَوقَ الفَرَسِ:** بازیدا، قەڵەمبازێدا

**طَفَا الخُوصَةُ فَوقَ الشَّجَرَة:** دەرکەوت، دیاریدا

**طَفَّاح:** پڕ، تەواو، تێکسمڕاو

**طَفَّاح:** ئەسپی تیژو خێرا

**طُفَاحَة:** کەفی هەر شتێك کەهەڵبچێ بۆ سەرووی دەفرەکە

**طَفَاف ـ طِفَاف:** تاریکی شەو

**طَفَافُ الشَّمس:** روو بەئاوابوون بوو

**طَفَافٌ مِنَ المِكيَالِ وَنَحْوَهُ:** سەرەوەی یان کۆتاییەکەی لەسەرەوە، سەرتا کردنی

**طَفَّاف:** باریکی تیژڕەوو خێرا

**طُفَافَة:** خڵتە، پاشماوەیەکی کەم لەقاپدا دەمێنێتەوە، ئەوەی هیچ بەهاو نرخێکی نییە

**طُفَال:** قوڕی گڵێنە، تەمۆخ، تەموخ

**طَفَالَة:** منالی، پچووکی، باروحالی منالی

**طُفَاوَة:** کەف، هالە، خەرمانە، هێڵێکی گردە بەدەوری مانگدا بەهۆی تەنکە هەورێکەوە پەیدا دەبێ گوایە بەنیشانەی بارانەی دادەنێن

**طَفَّايَة:** ئوتومبیلی ئاگر کوژانەوە، ئوتومبیلی حەریق، ئاگرکوژێن

**طَفِئَت النَّار طُفوًا:** ئاگرەکە کوژایەوە، دامرکایەوە، خامۆش بوو

**طَفِئَت عَنهُ:** رووناکی بینایی کوژایەوە، نووری چاوی لەدەستدا

**طَفِئَت الفِتْنَةُ:** ئاژاوەکە کوژایەوە، خامۆش بوەوە

**طُفِئَت فُلانٌ:** شادمانی لەدەستدا، چوستو چالاکی نەما، مرد، گیانی تیا نەما

**طَفَحَ الإِنَاءَ:** پڕبوو، لێوان بوو، سەرڕێژبوو، پڕی کرد، لێوان لێوی کرد

**طَفَحَ الكَيلَ:** پڕبوو، تاسەرەکەی هات ، لێوان لێو بوو

**طَفَحَ السَكرَانُ وَنَحوَهُ:** زۆری خواردەوە، پڕبوو

**طَفَحَ القِدرُ وَنَحوَهَا بِزَبدِهَا:** کەفی مەنجەڵەکە هەڵچوو، ڕژا، تاسەرەکەی هات

**طَفَحَ البَشَرَةُ أو الجِلد:** زیبکەی کرد، سوور بوەوە، لیری کرد

**طَفَحَ عَقلُهُ:** ئەقڵی تەواوبوو، ژیری تەواوو کامڵ بوو

**طَفَحَ الحَامِلُ بِالأولاد:** منداڵی زۆر بوو، فرە منداڵبوو

**طَفَحَ بِالوَلَدِ:** بەتەواوی بووی، تەواوبوو لەدایك

**طَفَحَ الفَرَسُ:** خێرا غاریدا، خێراو پەلە رۆیی بەرێوە

**طَفَحَ الرِيحُ وَنَحوَهَا الشَيءَ فِي الهَوَاءِ:** بەرزی کردەوە ، بلندی کرد ، بالآیکرد

**طَفَحَ الإِنَاءَ:** پڕیکرد هەتا لێی ڕژا

**طَفَحَ:** لیر ، زیبکە، سوربوونەوەی پێست

**طَفحَان:** سەرڕێژ، پڕ ، لێوان، لێوان لێو ، تەمەڵ، تەوەزەل، گەمژەو تەمەڵ

**طَفَرَ(وَثَبَ):** بازیدا، قەڵەمبازیدا

**طَفَرَ الشَيءَ:** بازیدا لەسەریەوە

**طَفَرَ اللبَنُ:** زۆر هەڵچوو، فرە هەڵچوو

**طَفَرَ الفَرَسَ وَنَحوَهُ:** وای لێکرد لەسەریەوە بازبدات، بازی پێدا لەسەریەوە

**طَفَرَ عَلَى وَجهِهِ:** هەڵپڕا بەدەمو چاویا

**طَفَر:** بازدان، قەڵەمبازدان، چەنك کرن، خۆهەڵدان لەجێگایەکەوە بۆ جێگایەکیتر

**طَفرَان:** بێهیچ، دەست بەتاڵ، موفلیس

**طَفرَة(وَثبَة):** باز، قەڵەمباز، چەنککرن

**طَفَسَ ـ طُفُوسَاً(فَطَسَ):** مرد، گیانی سپارد بێئەوەی نەخۆشیەکی دیارو ئاشکرای هەبێت

**طَفِسَ ـ طَفَسَاً ـ طَفَاسَةً:** پیس و گەندەڵبوو، بۆگەنو چڵکن بوو

**طَفطَاف:** لا ، کەنار، تەنیشت، دەریا، روەکی تەڕوبڕ، لقو پۆپی دارو درەخت، گەڵای پەلەکان

**طَفطَفَ:** خۆیدا بەدەست دوژمنەکەیەوە

**طَفطَفَ الطَائِرَ:** باڵەکانی والآو گوشادکرد

**طَفطَفَة:** کەنار، قەراغ، پەڕ، گۆشتی نەرمو شلی ورگ، هەرگۆشتێکی ناسكو نەرمو داکەوتوو

**طَفَّفَ المِكيَال:** کورتی هێنا، تەواو نەبوو، کەمێکی لێکەل کرد

**طَفَّفَ الطَائِر:** باڵەکانی بەرینو فراوانکرد

**طَفَّفَ عِيَالَه:** رژدبوو بۆ منداڵەکانی، پێی نەدان ، دەستی لێگرتنەوە، رەزیلو چرووك بوو لەگەڵیان

**طَفَّفَ الشَمسُ:** نزیك بەئاوابوون بوو، رووبە ئاوابوون چوو

**طَفَّفَ بِهِ مَوضِعَ كَذَا:** پالی پێوەناو لێی نزیك کردەوە، نزیك بەوی کرد

**عَادَلَ عَنْهُ:** لێی لایدا، دوورکەوتەوە لێی

**عَادَلَ الشَّيءَ بِالشَّيءِ:** خستیە شوێنی، لەجێگەی دانا، وەك ئەوی لێکرد

**عَادَلَ فُلاَنَاً فِي المَحْمَل:** لەگەڵی سواربوو، هاوڕێی سواری بوو

**عَادَلَ الأَمْرَ:** لەسەری وەستاو بەرێی نەکرد، راما لەسەری، تیای ماو نەیگوزەران

**عَادَلَ بَيْنَ الأَمْرَيْنِ:** دوودڵبوو لەنێوان دوو کاراو نەیزانی کامیان هەڵبژێرێت

**عَادَلَ فِي الأَمْرَيْنِ:** شڵەژا، سەری لێتێکچوو

**عَادِل:** بەداد، ماڤپەروەر، راستکار، راستخواز، راستگر، هاموار، دادپەرست، راست ڕەو

**عَادِيّ (العَتِيق):** ئاسایی، سروشتی، باو، رێساو کاری کۆن و دێرین، ئەوەی دەقی پێوەگیراوە

**عَادِي:** دوژمن، دەستدرێژکار، ئەوەی پەرێزو سنوور دەشکێنێ، شێر

**عَادِي العَوَادِيّ:** سەرقاڵترین رووداو کەلە کاروباری ئاسایی مەردوم دووربخاتەوە

**عَادِيَا اللَّوح:** ئەملاولا کەی، هەردوو لای

**عَادِيَة:** کۆمەڵێك لەنێو گەل و نەتەوەدا ئامادەیی وەربگرن بۆ کوشتار، سەرقاڵیەك مەردوم دووربخاتەوە لەکاری سەرەکی خۆی، توندو تیژی و توڕەبوون، ئەسپی دابەستەی هەڵمەتبەر لەجەنگا، سنوورشکێن، روەکێکە

**عَادِيَةُ السَّم:** زیان و خراپەی، دەرەنجامی، سەرئەنجام و کاریگەریی

**عَاذَ بِهِ (إِسْتَعَاذَ بِهِ):** پەنای بردەبەر، هانای برد، خۆی خستە پاڵیەوە، خۆی لامەلآسدا، خۆی نایە ئامێزی، خۆی هاویشتە نێو پارێزگاریی ئەوەوە

**عَاذَ بِالشَّيءِ:** گرتی، بەری نەدا، لەئامێزی گرت

**عَاذِر:** شوێنەواری برینداری، جێ برین، رەگێکە لێوەی خوێنی نەخۆشی ژنان دێتە دەرەوە، پیسی و پۆخڵی

**عَاذِق:** خورماوان، باخەوانی خورما

**عَاذِل:** سەرزەنشت کەر، لۆمەکار، دەم بەگلەیی، گازندەکار

**عَاذِيَة:** لەوەڕگایەك کەوا گیاکەی شیرین بێت و ترش نەبێت، چڕگەی شیرین گیا

**عَارَ- عَوْرَاً:** چاوێکی کوێر کرد، کوێریکرد، نابینای کرد

**عَارَ الشَّيءَ:** تیای برد، لەناوی برد، فەوتانی

**عَارَ- عَيْرَاً:** بەلەسەبوو، رایکرد، هەڵهات، قوچانی، بەدوودڵیەوە هات و چوو

**عَارَ فُلاَنَاً:** ئەنگی لێگرت، پلاری تێگرت، کەم و کورتی گوت

**عَارَ القَصِيدَةَ:** بلاویوەوە لەنێو خەڵکیدا

**عَارَ فِي القَوم:** خراپەی بلاوکردەوە لەنێویاندا، دەستی دایە خراپەو نالەباری لەنێویانا

**عَارَ الرَّجُل فِي الأَرض:** سەرگەردانبوو، سەری لێی شێوا، وێڵ و سەرگەردانبوو

**عَارَ عَلَيهِ:** لێی پیس کرد، لێی شێواند
**عَار:** شوورەیی، نەنگی، کەم و کوڕی، خەوش، نام و نەنگی، عەیب، ناتەواویی، لەکەداریی
**عَار( مَعرور۔ أجرَب ):** گەڕ، گول، گرویی
**عَار( ظَلِيم ):** وشترمورخ، نەعامە
**عَارَة۔ عَارِيَة۔ عَارِيَّة:** ئەوشتەی بەشێوەیەکی کاتی دەدرێت بەیەکێك بەمەرجێك ئەو کەسە بیگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکەی، ئەوەی لەنێو خەڵکیدا بەئەمانەت دەستاو دەست دەکات
**عَارَضَ( قَاوَمَ ):** بەرهەڵستیکرد، بەرگری کرد، دژایەتیکرد، لالووت بوو
**عَارَضَ الشَّيءَ بِالشَّيء:** بەراوردی کرد، پەرچیدایەوە، بەربەرەکانی کرد
**عَارَضَ فُلاَنَاً:** دوورە پەرێز وەستا لێی، لایدا لێی
**عَارَضَ فُلاَنَاً فِي السَّير:** لەپاڵیا ڕۆیی، لەتەکیا چوو بەڕێوە
**عَارَضَ الجِنَازَة:** لەنیوەی ڕێ پێی گەیی و لەماڵی مردوەکەوە لەگەڵیی نەبوو
**عَارَضَ( فِي الحُكم الغِيَابي ):** بەرزیکردەوە بۆ دادگاو تێیدا داوای پوچەڵ کردنی بڕیارەکەی یان ڕێککردنی کردەوە
**عَارِض:** ڕووداو، بەرکەوتن، تووش بوون، ئەنگاوتن، بەڕێکەوت، لابەلا، بەرهەڵست، کۆسپ، تەگەرە، ئەستەم، هەردوولای ڕوو دەموچاو، هەور، واژوی بنەڕەتو چەسپاوو جێگیر، ئەوەی لەئاسۆوە بەبەرینی دەردەکەوێت

**عَارِضَة:** ڕوو، ڕووخسار، کوڵم، لاجانگ، پێویستی، باهوە، پایە، قسەی چاك
**عَارِضَةُ الأَزيَاء:** ئەو کیژەی جلو بەرگ بۆ بینەران دەخاتە ڕوو لەهۆڵی تایبەت بەو نمایشە
**عَارِف:** زانا، شارەزا، لێزان، لێهاتوو، ئاشنا، بەئارام، هێمن و لەسەرخۆ
**عَارِفَة:** چاکە، باشە، خێرۆمەندی
**عَارَكَ:** جەنگی، شەڕی کرد
**عَارَكَهُ مُعَارَكَةً وَعِرَاكَاً:** جەنگی لەگەڵی و تەنگی پێهەڵچنی، شەڕی لەگەڵ کردو زۆری بۆ هێنا
**عَارِم( شَرِسٌ مُؤذِيٌّ ):** بەزیان، زیانبەخش، دڕ، تیژ، توند ڕەوی بەزیان
**عَارَمَهُ( خَاصَمَهُ ):** دژایەتی لەگەڵ کرد، ناکۆك بوو لەگەڵی، نەیاربوو پێی
**عَارٍ:** ڕووت و قووت، بێجلو بەرگ
**عَارِيٍ مِنَ العَيب:** بەدوور بوو لە ناتەواوی، کەم و کوڕی تیا نەبوو
**عَارِيٌ مِن كَذا:** لەوەی نیە، بێبەشە، بێبەری، نیەتی
**عَارِيُ الرَّأس:** سەرقوتین، سەر ڕووت
**عَارِي القَدَم( حَافِي ):** پێپەتی، پەتی، پێ ڕووت
**عَارِيَة:** قەرزی بێسوودو سەلەم، ئەوەی دەدرێت بەیەکێك بەمەرجێ بیگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکەی، دەستخواز، دروستکراو، هێنراو بەئەمانەت، دەستیاو، وام
**عَازَ:** لێی بڕا، پێویستێتی، دەیەوێ

**عَازَ الشَيءَ**: پێویستی پێی هەبوو بەڵام دەستی نەکەوت

**عَازَ الشَيءَ فُلاَنَاً**: پێویستی پێی هەبوو

**عَازِب**: رەبەن، سەڵتی بێ ژن ، رەبەنۆك، زوگورت، عەڤداڵ، بێوەپیاو

**عَازِبَة**: قەیرەکچ، گەورە کچ، شووی نەکردوە، ئاحیل، قەدرە

**عَازِف**: مۆسیقا ژەن ، گۆرانی بێژ، ئاوازخواز

**عَازِل**: جیاکەرەوە، جیاکار، نەگەیەن، رێگر، کۆسپگەر

**عَازِم**: سووربوو، بڕیاردار، بانگکەر، پشت ئەستوور

**عَاس( حَارِسُ لَيل )** پاسەوان ، چەرخی، حەسحەس ، ئێشکگر

**عَاسَ عَلَى عِيَالِه**: ماندوبوو ، شەکەت بوو بەمناڵەکانیەوە

**عَاسَرَهُ مُعَاسَرَةً**: بەتوندو تیژی مامەڵەی لەگەڵ کرد، توندو رەق بوو لەگەڵی

**عَاسِل**: مەردومی خاوەن کردارو رەفتاری باش، ئەوەی هەڵدەستێت بە دەرهێنانی هەنگوین لەشوێنی خۆی، گورگ

**عَاسِلَة**: شانەی هەنگوین

**عَاشَ**: ژیا، ژین لەجیهاندا، زیندەگانی، گوزەرانکردن

**عَاشَ عَلَى كَذَا**: پێی ژیا

**عَاشَ مَعَ**: لەگەڵی ژیا ، هاوژینی بوو

**عَاشِب**: شوێنو جێگەیەك گژوگیای زۆر بێت

**عَاشَرَ**: تێکەڵی کرد، برادەری لەگەڵ بەست

**عَاشِر( وَاقِعٌ بَعْدَ التَّاسِع )**: دەیەم ، دەهەم ، ژمارەی پاش نۆ

**عَاشِرَة ـ عَاشِرَات**: ئایەتی دەیەمی دەئایەت، گفتار، تووشیار

**عَاشِق**: دڵدار، شەیدا، عەوداڵ

**عَاشِقٌ وَمَعْشُوق**: دڵدارو دڵخواز، نێرەومێیە

**عَاشُورَاء( العَاشِر مِن مُحَرَم )**: عاشورا، رۆژی دەیەمی محەڕەم

**عَاشِي**: نیازمەند، خوازیار، ئەوەی مەبەستو نیازی هەبێت

**عَاشِيَة**: ئەو حوشترانەی بەیانیان دەلەوەڕێنرێت

**عَاصَ**: گران بوو تێگەیشتنی، تێگیرا ، لەیەك ئاڵاو تێنەگەیشت

**عَاصَ الشَيءَ**: تیگیرا، عاسی بوو، تێ چەقی

**عَاصَ الكَلاَمُ**: گرانو ئەستەم بوو تێگەیشتنی، مەحاڵو گران بوو لێی حاڵی ببێت ، ماناو واتاکەی نادیاربوو

**عَاصَاهُ**: بێگوێیکرد، سەرپێچی کرد، گوێڕایەڵی نەکرد

**عَاصَرَ فُلاَنَاً**: هاودەمی بوو، هاوچەرخو سەردەمی بوو ، لەیەك دەمو کاتدا ژیان بەیەکەوە

**عَاصَرَهُ مُعَاصَرَةً**: لەکاتو سەردەمی ئەوا ژیا، هاوچاخو سەردەمی بوو

**عَاصِف**: بای گێژەڵوکەدار، تیرێك لەمەبەستی خۆی لابدات، سەرکردوو

**عَاصِفَة**: رەشەبا ، گەردەلوول ، بای قایم، باگێژە ، شڵێوە ، توندەبا، ئەو تۆزەیە کەوەك منارە بڵند دەبێو باریکە

**عَاصِم:** پارێزەرو بەرگری کار، قەڵغانو سوپەر

**عَاصِمَة ـ عَوَاصِم:** پایتەخت ، شارێکە کەپادشاو سەرۆکی دەوڵەتی تیا دابنیشێتو بنکەی سەرەکی وڵات بێت

**عَاصِي:** سەرپێچیکار، لاسار، سەرپاخی ، سەرپێچ، نافرمان

**عَاضَ فُلاَنَاً مِن كَذا:** دایە لەبری، خەڵاتیکرد، حەقی بۆ کردەوە، خەراماتی دایە

**عَاضَتِ الدَّوَابُ:** هەندێکیان گازیان لەهەندێکیتریان گرت، یەکتریان گەزت

**عَاضَدَهُ مُعَاضَدَةً:** هاوکاری کرد، یارمەتیدا، پشتگیری کرد

**عَاضِه(سَاحِر):** جادووگەر، ئەفسونگەر، چاوبەستکار

**عَاضِهَة:** درۆو بوختان، درۆ بەدەمەوە کردن

**عَاطَى الرَّجُل شَيئاً:** پێیدا ، دایە، خواستی

**عَاطِي:** پێیدا، پیی بەخشی

**عَاطِر:** ئارەوزوومەندی عەترو بۆنی خۆش، ئەوەی حەز لەهەموو جۆرە بۆنێکی خۆش دەکات

**عَاطِس(صُبح):** بەیان ، ڕۆژ

**عَاطِسٌ مِنَ الظِّبَاء:** ئەوەی لەبەردەمەوە دێت بەرەو روو ، بەردەم

**عَاطِش:** تینوو، تەژنە، گیانداری ئاتاج بەئاو

**عَاطِف:** دامێن ، بەسۆزو دڵناسك، میهرەبان، پۆشاك ، پێخەف ، پەیوەندکار

**عَاطِف(عِندَالنَحوِيين):** ئامرازی پەیوەندیی وەك (واو)

**عَاطِفَة:** خواستی دەروونی، دڵسۆزی ، بەبەزەیی،هەستو نەست ، خزمایەتی، ئارەزومەندی بۆ

**عَاطِفَة(فِي عِلم النَفس):** لەدەروونناسیدا بریتیە لەهەستێکی دەروونی کەپاڵ بەخاوەنەکەیەوە دەنێت بۆ هەژانو دروستبوونی جۆرە هەڵسوکەوتو هەستێك سەبارەت بەبیرو بۆچوون یان هەرشتێکیتر

**عَاطِفِيّ:** بەسۆزو بەزەیی، دڵناسك، یەکێك زۆر دڵناسكو بەبەزەیی بێت

**عَاطِل:** بێئیشوکار، هیچ نەکردو، پەککەوتوو، بێکار، نیەتی، لێی کراوەتەوە، ئەوەی دارایی و ڕەوشتی لەدەست دابێت

**عَاطُوس:** پژمەر، برنوتی، کوندوش

**عَاطُوف:** دارێکە دارێکی سەر چەماوەی پێوەیە

**عَاظَلَ الكَلاَمَ:** ئاڵۆزی کردو هەندێکی ئاڵاند لەهەندێکیترەوەو دووبارەی کردەوە

**عَاظَلَ الشَاعِرُ:** تێی هەڵکێشا، هەندێ بەیتی پابەند کرد بەهیترەوە هەتا بەیەکەوە مانا بدەن بەدەستەوە

**عَافَ الطَائِرُ (حَامَ عَلَى الشَيءِ):** دەورووخولیدا، بۆیچوو

**عَافِي:** چاکی کردەوە، دەردو بەڵای لێ دوورخستەوە

**عَافَاهُ اللهُ مُعَافَاةً:** خوای گەورە چارەسەری کرد، شیفای داو چاکی کردەوە، خراپەی لێ دوورخستەوە

**عَافِيٌ**: بەخشندە، تووك درێژ ، تووكن، میوان، داواكار

**عَافِيَة**: تەندروستی چاك، رەنگو بۆ، هێز، توانا، تین

**عَاقّ أَبَاهُ**: سەرپێچی باوكی كرد، پێچەوانەی بوو

**عَاقّ**: ئازاردەری دایكو باوك، رەنجێنەری دڵی دایكو باوك، سەرپێچی كاریان

**عَاقّ**: دوایخست، تەگەرەی تێخست، كۆسپی نایە بەر، ڕێی لێگرت

**عَاقَبَ بِذَنْبِه**: پاداشتی دایەوە، سزایدا لەبەرانبەر تاوانی خۆیدا

**عَاقَبَ**: جێگیر، جێنشین، ئەوەی جێگەی یەكێك دەگرێتەوە لەپلەوپایەو جێنشیندا

**عَاقِبَة**: ئەنجام، ئاكام، ئاكامو دەرئەنجامی شتێك، وەچە، نەوە، پاداشت دانەوە بەچاكە

**عَاقِبَةُ الشَّيء**: دەرئەنجامو ئاكامی، دوایی و كۆتایی

**عَاقَبَهُ مُعَاقَبَةً**: بەپێی ئەو ڕۆیشت ، بەدوای ئەوا هات

**عَاقَبَهُ فِي الرَّاحِلَة**: بەدوایا سواربوو، بەنۆبە سواربوو، بەسەرە سواربوون

**عَاقَدَ**: گەردنی دەبات بۆ دواوە بۆئەوەی بنوێت

**عَاقَدَهُ**: پەیمانی لەگەڵ بەست، هاوپەیمانی بوو، پەیمانو بەڵێنیدا

**عَاقَرَ الخَمْرَ**: بەردەوام بوو لەسەری

**عَاقَرَ الشَّيءَ**: راهات لەسەری، رامبوو، دەقی پێوە گرت، خوی پێوە گرت

**عَاقَرَ فُلاَنَاً**: لەسەربڕینی وشتردا بۆ دەربڕینی خێرۆمەندیی و سەخاوەت پێشبڕكێیی كرد؛ ئەمەش خوویەكی تافی لاوی بوو كاتێ ئیسلام هات قەدەغەو یاساغی كرد

**عَاقِر**: ئافرەتو پیاوی نەزۆك، وەجاخ كوێر، پیچەڵ، منالٚ نەبوو

**عَاقِرٌ مِنَ الطُّيُور**: ئەو باڵندانەی پەرەكانیان تووشی نەخۆشی دەبێتو كار لەنەشونمایان دەكات

**عَاقِرٌ قَرحَاً**: رووەكێكە رەگەكانی لەدەرمان دروستكردندا بەكاردەبرێو لەئەفریقا زۆرە

**عَاقِف**: نەخۆشیەكە دەدات لەقاچی مەڕو گرۆمۆڵەو كێڕی دەكات

**عَاقَلَ**: ژیر بوو، عاقڵ بوو، عەقڵو راكانی بەسەرا زاڵبوو

**عَاقِل**: ژیر ، زرنگ، هۆشیار، ئاقڵ، دانا، زانا، تێگەیشتوو، كارامە

**عَاقِلَة**: هێزو توانای ژیری و ئەقڵ

**عَاقِلَةُ الرَّجُل**: كۆمەڵو خزمو كەسی لەڕێی باوكیەوە كەبەشداری دەكەن لەخوێنباییدا

**عَاقَلَه**: پێشبڕكێی لەگەڵكرد لەئەعقڵدا

**عَاقُور**: ئەوەی پشتی چوار پێ بریندار دەكات

**عَاقُول**: حوشترخۆر، حوشتر ئالوك، جۆرە گیایەكی گەرمیانی دڕكاوییە حوشتر دەیخوا، كاروباری ئاڵۆزو شێواو، زەوی و ناوچەیەك فرە ئاڵۆزبێتو كەس نەیدۆزێتەوە بەهۆی فرە پێچو كەلەبەرەوە، سەرجەم ئاوی دەریا

**عَاكَسَ الكَلاَمَ:** هەڵیگێڕایەوە، ئاوەژووی‌کرد

**عَاكِسَةُ النُّور أو الحَرَارَةُ:** پەرچاوە، پەرچەدەری رووناکیو گەرمی، ئامێری پەرچاوە

**عَاكِسَةُ:** پێچەوانەی بوو، دژی بوو، بەئاراستەی جیاواز لەو جووڵایەوە

**عَاكِفٌ:** جێنشین ، گۆشەگیر، کەنارگیر، گۆشەنشین، شارنشین

**عَاكِفٌ عَنْ كَذَا:** وازی لیٚ ناهێنیٚ، دەستی لێهەڵ ناگرێت، بەتەنیا دەژی، تێکەڵی ناکات ، گۆشەگیرە

**عَاكَفَهُ مُعَاكَفَةً:** گرتی، لەخۆی گرت، پیانووسا، بەری نەدا

**عَالَ(مَالَ عَنِ الحَقِّ):** لەراستی لایدا، نارەوابوو

**عَالَ فِي المِيزَانِ:** ترازووەکەی ناتەواوبوو، دزی‌کرد

**عَالَ المِيزَانُ:** کەمی هێنا، کەم دەرچوو، ناتەواو بوو

**عَالَ اليَتِمَ(كَفَلَهُ):** بەخێوی کرد، بژێوی‌دا

**عَالَ أمْرُ القَوم:** سەریان لیٚ تێکچوو، شپرزەبوون، ئاڵۆزی رووی تێکردن

**عَالَ الرَّجُل:** مناڵی زۆر بوو، ماڵو منداڵداربوو

**عَالَ الرَّجُل عِيَالَهُ:** بەخێوی کردن، بژێوی بۆ پەیدا کردن

**عَالَ فُلاَنٌ فِي المِيزَانِ:** ناپاکی کرد، دژی‌کرد، ناراستی نواند

**عَالَ السَّهْمُ:** لایدا، ترازا، لەنیشانی نەدا

**عَالَ الحُكْمُ:** دادوەرەکە لەراستی لایداو ستەمی کرد، غەدری کرد

**عَالَ الأَمْرُ فُلاَنًا:** لایداو قورسو گرانبوو لەسەری

**عَالَ صَبْرُهُ:** سەبری لەبەر بڕا، ئارامی نەما

**عَالٍ(جَيِّد لِلغَايَةِ):** زۆر باش، چاك، زۆر پاكو باش

**عَالَةٌ:** مشەخۆر، لاپلەرسەنگ، وشتر مورغ ، کەپر، چادر، بارانگێڕ، سەیوان، سابات، هەژاری، نەداری

**عَالَجَ المَرِيضَ:** چارەسەری‌کرد، چارەی‌کرد ، تیماری کرد، دەرمانی‌کرد

**عَالَجَ الأَمْرَ(مَارَسَهُ):** چارەی کارەکەی‌کرد،بەرێوەی برد، جیٚبەجێی‌کرد

**عَالَجَ المَوضُوعَ(أحَاطَ بِهِ وَأَلَمَّ بِهِ):** تێگەیی، حاڵی‌بوو، چوە بنجو بناوانی، چارەی کرد

**عَالَجَ الحَدِيدَ أو الفُولاَذَ:** زاخاوی دایەوە

**عَالَجَ المَسْأَلَةَ:** چارەسەری کرد، مەسەلەکەی چارەسەر کرد

**عَالَجَ المُشْكِلَةَ:** چارەسەری تەنگو چەڵەمەکەی کرد

**عَالَجَ عَنْهُ:** بەرگری لێکرد، پارێزگاری‌کرد، پاراستی

**عَالَجَهُ:** چارەسەری کرد، فریای کەوت، پێی هەستا، ئەنجامیدا

**عَالَمٌ:** گێتی، جیهان، پێکهاتووە لەشەوو رۆژو چوار وەرزەو چۆنیەتیەکەی کەبەسەر زەویدا دیٚ بەهۆی مانگو ئەستێرەو سەرجەم گیانداروبوونەوە

**عَــالِم:** زانــا، زانیــار، تێگەیشــتوو، زۆرزان، مــامۆتك، شــارەزا، ئاشــنا، مــەحلان، هــیر، زانــەر، خوێنــدەواری بەتواناو شارەزا لەبوارێك یان چەن بوارێكدا

**عَالِمَـه:** لەزانیاریدا زاڵبوو بەسەریا، لەویەتواناتر بوو

**عَـالَمِي:** دنیـایی، جیهانی، ئــەوەی زانیاریو هەوڵەكانی لەسنووری دنیـا دەگەڕێ

**عَـالَنَ( أعْلَنَ الأمْرَ):** ئاشكرای كـرد، رایگەیاند، دەریخست ، خستیە ڕوو

**عَالِن:** دەرخراو، ئاشكرا كراو، ئـەوەی دەخرێتە ڕوو

**عَالَنَهُ وَبِـهِ مُعَالَنـةً وَعِلاَنـاً( جَـاهَرهِ ):** ئاشكرای كردو دەریخست

**عَالُوف:** ئالیك ، ئاخوڕ

**عَالِي:** بەرز، بڵند، گەردن كەش، بـالاَ، پایەبەرز، شكۆدار، شكۆمەند، ڕێزدار

**عَـالِي المَنْزِلَــة:** پلــەو پایــەدار، شكۆمەندترین

**عَـالِيّ الدَّرَجَة:** پلەوپایەبـەرز، نمـرە بەرز، پایەدار

**عَالِيَــة:** بـــەرزترینی هەرشـــتێك، ســــەرەنێزە یـــان ناوەڕاســـتەكەی، بەسەرووی (نەجد) تا(توهامە)و ئەولای (مەككە)ش دەگوترێ

**عَالِيَـةُ مِـنَ الـوَادِيْ:** قەڵبـەزە ، ئـەو لێژاوەی ئاوی لێدێتە خوارەوە

**عَامَ فِي المَـاء:** مەلـەی كـرد، چـوە نێـو ئاوەكەو مەلـەی كـرد، سـەرئاو كـەوت، هاتە سەر ئاوەكە

**عَـامَ الرَّجُل- عَيمَـاً وَعَيمَـةً وَعَيَامَـاً:** حەزی لەشیر كـرد، دڵـی بۆشیر لێیـدا، شـیری ئاژەڵـەكانی كـــەمی كـــرد، تینوویبوو

**عَامَ الزِّمَام:** شـیوا بەسـەریەكا، كـەوت بەسەر یەكا

**عَـام:** ســالّ، نــاوە بــۆ هـــەردوازدە مانگەكانی وەرز كـەرۆژ چەرخەیـەكی تەواوی تیا دەكا لەكەلووی بەرخەوە تا دوایی كـەلووی ماسـیو 3 مـانگ بـەهار 3مـانگ هـاوینو 3مـانگ پـایزو 3مــانگ زستان

**عَـامّ:** گشــتی، بۆهــەموان، بــەریلاّو ، واژوی تایبەتە

**عَامَّة - عَوَام:** سـەرو شێوازی سوارێك كـاتێ لـەدوورەوە بەدەردەكــەوێت ، چەپكی دەغلّو دان كاتێ دەدورێتەوە، جۆگەلە گۆلاوێكی پچـووك لـەڕووبارێك بووبێتەوە

**عَامَّة:** گشـتی، سـەرجەمی، تــەواوی، خڕی، گردی، گشكێ

**عَامَّةُ النَّاس:** خەڵكی گشتی، هەڕەمە، خەڵكی ئاسایی

**عَامِد:** مێلـی ئەندازەییـە كەوابەستەی ستوونێك بێت

**عَـــامِر:** دانیشـــتوو، نیشـــتەنی، ئاوەدانكــەر، ئــەوەی هەڵدەســـتێت بەكشتوكالّ

**عَامِرُ البَيت:** مار، تووله كەمتیار

**عَامَلَ:** رەفتاری لەگەلّ كـرد، سـەودای لەگەلا ئەنجامدا

**عَـامِل:** بكـەر، كارەكـەر، دروسـتكار، كارگـەر، كارمـەند، پیشەسـاز، خزمـەتكار، نۆكـەر، تـەیان، سـەرۆكو كاربەدەسـت، ئـەوەی كاروبـارێك دەگرێتـە ئەسـتۆ لـەماڵو دارایـیو سەرچەم كارێكدا، كۆكەرەوەی زەكات

**عَـامِلٌ فِـي مَصْنَـع:** كرێكـاری كارگـە، مزبەر

**عَـامِلٌ فِـي مَحَـل:** شـاگرد، یـەكێك لەدوكانێك ئیشو كار بكات

**عَامِلٌ زِرَاعِـيٌ:** جووتیـار، رەنجبـەر، كشتیار، وەرزێر

**عَامِلٌ فِي الرِيَاضِيَات:** هۆ ، كۆلكە

**عَامِلٌ عَلَى البَلَـد:** فەرمانبـەر، دادوەر، فەرماندار

**عَـامِلٌ مُسَاعِد:** یـاریدەدەر، هۆكـار ، یارمەتیدەر

**عَـامِلُ مَصْنَـع:** كرێكـاری كارگـە، ئیشكەری كارگە

**عَامِلَة:** ئـەو گـاو مانگـاو وشترانـەی لەكشتوكاڵو ئاودانو ...بەكار دەبرێن

**عَامِلَةُ الرمْح:** ناوەڕاستی ، نێوەندی

**عَامَه:** سـەرگەردان، گومـڕا، شـێتو شەیدا

**عَامِيٌ:** دەدرێتە پاڵ شتێكی گشتی

**عَـامِيٌ مِـنَ الكَـلاَم:** گوتـەو قسـەیەك بـەدووربێت لـەزمانی عـەرەبی پـاراوو رێساو بنەمای پاراوی

**عَانَ الحَفَّارُ عَيناً:** گەیی بەئاو

**عَانَ البِئْر:** ئاوی زۆر بوو، فرە ئاوبوو

**عَـانَ عَلَـى القَـوم:** چـاودێربوو بەسەریانەوە، چاوی لێ بوو

**عَانَ فُلاَنَاً:** چاولێیدا، چاوی پێوەكرا

**عَانَ الحَاسِدُ فُلاَنَـاً:** چـاوی پێوەكـرد، چاوی پێهەڵهێنا

**عَـانَ القَـومَ وَلَـهُم عِيَانَـة:** بـوو بەچاودێریان ، هەواڵگەیەنی ئەوانبوو

**عَانَ المَاءَ أو الدَمْعَ:** تكا ، رژا ، رۆیی

**عَانَ عَلَيهِم:** چاودێربوو بەسەریانەوە، ئاگادارو بێداربوو پێیان

**عَـانَ القَـوم:** پیتـی بـۆ هێنـان، فـەڕو خێری بۆ هێنان

**عَانَاهُ:** چەشتی، چێژتی، كێشای

**عَـانَى مُعَانَـاة:** رەنجیـداو چارەسـەریكرد، كۆشـاو چـارەیكرد، چەوسایەوە، چێژتی

**عَانَى الرَّجُـل مَالَـهُ:** سـەرۆكاری كـرد، سەرپەرشتی كرد

**عَـانَى الهُمُـوم فُلاَنَـاً:** هـات بەسـەریا ، رووی تێكرد، سەری لێدا

**عَانَة:** دامێنی سـك، بـەر، تووكـی ژێـر سك

**عَانَدَ:** بەرهەڵستی كرد، بەرگری كرد

**عَانَدَ الشَيءَ:** گرتیە خۆ ، لەخۆی گرت

**عَـانَدَ الرَجُـل:** وەك ئـەوی كـرد، هاوپیشەو رەفتاربوو لەگەڵی

**عَـانَدَ فُلاَنَـاً:** پێچەوانـەی وەسـتا، دژ بەوە بوو كەكردی

**عَانِد:** لاسار، قیرسیچمە، رقاوی، گرێژ

**عَانَدَهُ مُعَانَدَةً وَعِنَاداً:** كەناری خستو جیاو پەرێزی كـرد، لێـی جیـابوەوەو دژی وەستا

**عَـانِس:** قـەیرە كـچ، پـیرە كـچ، كچـێ مابێتەوەو شووی نەكردبێت

**عَائِقَ:** دەستی کردە ملی، باوەشی پیاکرد، لەئامێزی گرت
**عَانِي:** دیل ، ئەسیر، بەند، گیراو ، دەستگیرکراو
**عَاهَ:** تووش بوو، دەردو بەڵای لێدا، نەهامەتی داباری بەسەریا
**عَاهَ الرَّجُل:** ئافاتو بەلا هات بەسەر ئاژەڵو کشتوکاڵەکەیدا
**عَاهَ الزَّرْعُ:** ئافەو نەهامەتی رووی لەکشتوکاڵ کرد
**عَاهَةٌ:** ئەو بەڵاو ئافەو نەهامەتیەی دێت بەسەر کشتوکاڵو ئاژەڵدا، دەرد، ئافە، نەخۆشی، بەڵا، نەهامەتی
**عَاهَةٌ نَبَاتِيَّةٌ( آفَةٌ ):** دەردو ئافاتەکانی کشتوکاڵو روەك
**عَاهَدَ:** پەیمانیدا، بەڵێنیدا، بەڵێنی بەست
**عَاهَدَ الذِّمِّيَّ:** پەیمانی دایە، بەڵێنی پێدا
**عَاهَدَهُ:** پەیمانی لەگەڵ بەست، گرێبەستی لەگەڵ گرێدا
**عَاهِر. عَاهِرَةٌ:** سوزانی، زیناکەر، خراپەکار، بەد رەوشت، سووكو نزم، داوێن پیس
**عَاهِل:** بێوەژن، ئافرەتی بێپیاو، شاهەنشا، سەرکردەو سەرۆکی گەورە
**عَاهِلِيَّةٌ:** دەوڵەت ، مولکی بنەماڵە
**عَاهِنٌ:** هەژار، نەدار، نەدارا، جێگیر، تەمەڵ، شلەپەتە، تەوەزەل، ئامادە
**عَاوَى الكِلاَب:** وەڕی ، لوورانی، وەڕە وەڕی کرد
**عَاوَاهُم:** وەڕی پێیان ، هاواری لێکردن

**عَاوَدَ الرَّجُل:** بۆی گەڕایەوە، تێهەڵچووەوە، دەستی پێکردەوە، شانی پیاکردەوە، گەڕایەوە سەرکاری یەکەمی
**عَاوَدَ الشَّيءَ:** کردی بە خوو، عادەتو خوی بوو
**عَاوَدَتْهُ الحُمَّى:** تاکەی بۆ هاتەوە، تای لێهاتەوە ، تا دایگرتەوە
**عَاوَدَهُ بِالمَسْئَلَةِ:** جار لەدوای جار پرسیاری کرد ، بەردەوام پرسیاریکرد
**عَاوَرَ الشَّمْسَ:** چاودێری کرد، لێی وردبووەوە
**عَاوَرَ فُلاَنًا الشَّيءَ:** وەك ئەوەی کرد کەهاوەڵەکەی لەگەڵی کردبوو
**عَاوَزَهُ الشَّيءَ:** پێیدا، پێی بەخشی، دایە
**عَاوَضَ فُلاَنًا مِن كَذَا:** دای لەبرییدا، پێیدا لەجیاتی
**عَاوَمَ فُلاَنٌ فُلاَنًا:** ساڵ بەساڵ مامەڵەی لەگەڵکرد، مامەڵەی ساڵانەی لەگەڵکرد
**عَاوَمَتِ النَّخْلَةُ:** ساڵێك هێنایو ساڵێك نەی هێنا، ساڵێك گرتیو ساڵێك نەیگرت
**عَاوَنَ:** یارمەتیدا، کۆمەکی کرد، دەستی یارمەتی بۆ درێژ کرد
**عَاوَنَهُ مُعَاوَنَةً:** یارمەتیدا، کۆمەکیکرد، پشتگیری لێکرد
**عَايَا فُلاَنٌ:** قسەو کارێکی وەهای کرد ڕێو شوێنی نەبوو، نامۆ بوو
**عَايَا صَاحِبَهُ:** قسەیەکی وەهای پێوە بەست ڕێو شوێنی نەبوو
**عَايَا الرَّجُل:** دژوارانە دوا بەرانبەری ، بەدقسەبوو بەرانبەری

**عَايَرَ:** خۆی هەڵکێشا، گەزافی لێدا، خۆی تاقیکردەوە، تاقیکردەوە، پێوای، ئەندازەی گرت
**عَايَرَ المَكَايِل:** هەڵیسەنگان ، بەردەکانی هەڵسەنگان
**عَايَرَ المِكْيَال أو المِيزَان:** ئەندازەی گرت و تاقیکردەوە بەهەڵسەنگاندی لەگەڵ هی‌تردا هەتا پێوانەی راستی بۆ دەربکەوێت
**عَايَرَ فُلاَنَاً:** شانازی بەسەرا کرد، خۆی بەسەرا هەڵکێشا
**عَايَشَ:** ژیا لەگەڵی، ژینی لەگەڵ بردەسەر
**عَايَنَ:** بینی، روانی، تەماشای کرد، چاوی پێکەوت
**عَايَنَ الطَّبِيبُ المَرِيضَ:** بەوردی پشکنی و تەماشای کرد هەتا نەخۆشی و ناساغیەکەی بدۆزێتەوە
**عَايَنَهُ:** بەچاو تەماشای کرد، لێی وردبووەوە، چاوی تێبڕی، پشکنی، سەرنجی لێدا، سەیری کرد

## ع ب

**عَبَّ المَاءَ(شَرِبَهُ بِلاَ تَنَفُّس):** بینی پێوەنا، خواردیەوە ، هەڵی قوڕاند
**عَبَّ النَّبَاتُ:** پێگەیی، بەرزبووەوە، هەڵیدا، هەڵچوو، بەرزو بالآبوو
**عَبَّ البَحْرُ عُبَابَاً:** شەپۆلەکانی بەرز بوونەوە، زیادیان کرد ، هەڵچوون ، پڕبوون، هەڵسا
**عُبّ:** باخەڵ، دەرباخەڵ، باخڵ، باغەڵ، بەخەڵ، باشل، گیرفان، دوو تویی کالآو بەرگ لەئاستی پەراسوو

**عَبُّ:** ئاوخواردنەوە، جارێك ئاوخواردنەوە یان بەبەردەوامی
**عَبّى الجَيْشَ( هَيأَهُ وَجَهّزَهُ ):** لەشکری ئامادەکرد،کۆی کردەوەو ئامادەیکرد، بێدارو ئامادەی کرد
**عَبَاء:** عەبا، کومسرهـ ، کرومزرهـ، هەورانی، عاپا، کالآیەکی پانوپۆڕی فراوانی بێ قۆڵە لەسەر هەموو کالآوە دەدرێ بەشانا
**عُبَاب:** لافاو، لێشاو، شەپۆل، هوروژم، سەرو بەرزی هەرشتێك، سەرەتای هەرشتێك
**عُبَاب البَحْر:** شەپۆلی دەریا ، تەوژمی دەریا
**عَبَاب:** ئاوخواردنەوە، تۆشکردنی ئاو
**عَبَابِيد:** رێگەی جیاواز جیاواز، رێگەی دوور ، دوورە رێ
**عَبَابِيدٌ مِنَ الخَيْل وَالنَّاس:** پەرتەوازە، هەریەك سەرگەردان و روو لەلایەك کردن
**عَبَادِيد ـ عَبَابِيد:** گرۆهو تاقمی جیاواز جیاواز لەخەڵك و ، رێگەوبانی دوور
**عِبَاد:** بەندە، ئادەمیزاد، مرۆڤ ، خەڵك، مەردوم، گەلە هۆزو تیرەیەکی عەرەبی‌یە لە(حیرە) یەکیان گرتووە لەسەر (مەسیحیەت)
**عَبّاد الشَّمس( نَبَات و زَهْرة ):** گوڵە بەرۆژە، رۆژپەرست، گولآ بەریرۆژ، گول بەرۆژ، روجیار پەرس، گیایەکی بالآ بەرزی لاسك ئەستوورە گوڵێکی پانی گەورە دەگرێ هەمیشە رووی لەرۆژەو تۆوەکەی وەك دەنکە کوولەکە بەسووێرکراویی و برژاوی دەخورێ

**عِبادَة( تَعَبُد ـ نُسُك ):** خواپەرستی، پەرستن، ملکەچ کردن بۆ پەروەردگار بەهۆی مەزنیو گەورەیی ئەو زاتەوە، سرووتو ڕێو ڕەسمەکانی بەندایەتی

**عَبادِلَة:** بەهەریەك لەم چوار کەسە دەگوترێت 1)عەبدوڵلای کوڕی عومەر 2) عەبدوڵلای کوڕی مەسعود 3)عەبدوڵلای کوڕی عەبباس 4)عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر(ڕەزای خوایان لێبێت)

**عِبادِيّ:** دەدرێتە پاڵ گرۆهو هۆزە جیاوازەکانی عەرەب

**عَبّار:** زۆر سەفەرو گەشتکار، ڕاڤەکاری خەون

**عِبارَة:** دەستەواژە، وتە، ڕستە، دەربڕین ، لێکدانەوە، ڕوونکردنەوە

**عِبارَةٌ عَنْ كَذا:** بریتیە لە ، پێکهاتووە لە ...

**عَبّاس:** گرژ، مۆن، ڕووگرژ، مرومۆچ، پۆرخز، مارس ، پەست، خەمبار، دڵگیر، ناوێکە لەناوەکانی شێرو بەو شێرەش دەگوترێت گوستاخو ئازایەو شێرەکانیتر لێیی هەڵدێن

**عَبّال:** گوڵی کێوی

**عَبايَة:** عەبا، کومسرە ، کوومزرە، کاڵایەکی پانو پۆڕی فراوانی بێقۆڵە لەسەر هەموو کاڵایەکەوە دەدرێ بەشانا

**عَبَأَ الجَيشَ:** کۆی کردەوە، ئامادەیکرد،ڕەش بگیری کرد، تەیاریکرد، سەراپای ئامادەو گرد کردن

**عَبَأَ إلَى فُلانٍ وَلَهُ:** مەبەستی بوو، ڕووی تێکرد، گرتیە بەر

**عَبَأَ فُلانٌ:** ڕووی گەشو ڕووناك بووەوە

**عَبَأَ الطِّيبَ:** دروستو پێشکەشی کرد

**عَبَأَ لَهُ شَرّاً:** ئامادەیکرد، سازیکرد، خستیەوە

**عَبَأَ المَتاعَ:** ئامادەی کرد، سازاندی، خستیە ئامادەباشیو بەردەستەوە

**عَبَأَ الشَّيءَ فِي الوِعاءِ( كَيَّسَ ):** ئاخنی، پاکۆی کرد، دایگرت، پەستاوتی، ئاخنی کرد

**عَباء:** هاوتا، هاوشێوە، بەرانبەر، لەوچوو

**عِبء:** بار، قورسایی، کێش، قورسیو گرانی، هاوتاو هاوشێوە ، لەیەکچوو، قورساییو باری هەرشتێك

**عِبءٌ ثَقِيل:** بارو کێشێکی قورسو گران، قورسە بار

**عَبَثَ:** تێکەڵی کرد، دای بەسەر یەکا، تێکەڵو پێکەڵی کرد، شێواندی، تێکیدا

**عَبِثَ( لَعِبَ وَهَزِلَ ):** یاریکرد، گاڵتەیکرد، شۆخی کرد

**عَبِثَ بِالشَّيءِ ( اِسْتَخَفَّ ):** گاڵتەی پێهات، بەسووك هاتە پێش چاوی ، بەسووكو سانای زانی

**عَبِثَ بِالدِّين:** گاڵتەو سووکایەتی بەئاین کرد

**عَبَث:** یاری ، گاڵتە ، شۆخی، لاقرتی، شێواندن، فیڕۆ، کاری بێسوودو بێئەنجام، بێسوود، بێئەنجام، بێ کەڵك

**عَبَثاً:** بێسوود، بێئەنجام، بەهەوانتەو فیڕۆ، بێکەڵکانە

**عَبَدَ اللهَ عِبَادَةً وَعُبُودَةً وَعُبُودِيَةً:** پەروەردگاری پەرست، بەندایەتی بۆ ئەنجامدا، ملی بۆ کەچ کرد
**عَبِدَ الشَيءَ:** پێوەی لکا، پێوەی چەسپاو لێی جیانەبوەوە
**عَبُدَ - عُبُودَةً وَعُبُودِيَةً:** خۆیو باوانی لەرابردوودا هەریەندەو خاوەندار بوون، کۆیلە بوون
**عَبِدَ - عَبَدًا:** پاشگەزبوەوە، پەشیمانبوو ، ژێوان بوو
**عَبِدَ عَلَيهِ:** توڕەبوو لێی ، رقی لێهەستا ، قینی لێی بوەوە
**عَبِدَ عَلَى نَفْسِهِ:** سەرزەنشتی کرد، گلەییو گازندەی ئاڕاستەکرد
**عَبِدَ عَلَيهِ:** سووربوو لەسەری ، داکۆکی لێکرد، جەختی لەسەر کردەوە
**عَبِدَ بِهِ:** گرتیو لێی جیا نەبوەوە، لێی نەبرا
**عَبَّدَ( إِسْتَعْبَدَ ):** کردی بەکۆیلەی خۆی، رسوای کرد ، سووکایەتی پێکرد
**عَبَّدَ الطَرِيقَ:** قیرتاوی کرد، تەختیکرد
**عَبَّدَ السَفِينَةَ:** رووکەشی کرد بە قیر ، قیری تێهەڵسوو
**عَبَّدَ البَعِيرَ:** قەترانی لێدا، بەقەتران رەشی کرد
**عَبْد:** بەندە، کۆیلە، ئەڵقە لەگوێ، گوێ لەمشت، قول، قولە رەش، مرۆڤ، ئادەمیزاد گەر ئازادبێت یان کۆیلە چونکە بەندەو مرۆڤ بەدی هێنراوی خوان
**عَبَدَةٌ:** هێزو قەڵەویی ، توانا و تێکسمڕاویی
**عَبْدِيَة:** بەندایەتی، بەندەگی، حاڵو باری بەندە، ئەو تەرزو شێوەیەی بەندە لەسەریەتی
**عَبَرَ - عَبْرًا:** خەفەتبار بوو ، فرمێسکی رشت
**عَبَرَ العَينُ:** فرمێسکی رشت، تکا، تك تك هاتە خوارەوە
**عَبَرَ النَهْرَ وَغَيرَهُ:** پەڕییەوە، رەتبوو، تێپەڕی، گوزەری کرد، بڕی
**عَبَرَ الكِتَابَ:** بەچاو خوێندیەوەو دەنگی هەڵنەبڕی
**عَبَرَ الدَرَاهِمَ:** تەماشای کردو هەڵیسەنگاند تابزانێت کێشی چەندەو چۆنە
**عَبَرَ عَبْرًا وَعُبُورًا السَبِيلَ:** پەڕییەوە، بڕی، مرد، تێپەڕی ، گوزەرا
**عَبَرَ عَبْرًا وَعِبَارَةً الرُؤيَا:** لێکیدایەوە، راڤەی کرد، هەڵیسەنگان
**عَبَّرَ عَمَّا فِي نَفْسِهِ:** دەریبڕی، هێنایە دەرەوە ، خستیە روو ، ئاشکرای کرد
**عَبَّرَ بِهِ الأَمرَ:** زۆری بۆ هێنا، تەنگی پێهەڵچنی، فشاری خستەسەر
**عَبَّرَ بِفُلانٍ:** تیای برد، فشاری خستەسەرو تەنگی پێهەڵچنی
**عَبَّرَ النَهْرَ:** پەڕییەوە، چوە ئەوبەر ، رووبارەکەی بەجێهێشت
**عَبَّرَ فُلانًا:** خستیە گریان
**عَبِرَ - عَبَرًا:** فرمێسکی رژا ، هاتە خوارەوە، هۆن هۆن تکا
**عَبْرٌ - عَبْرٌ مِنَ الوَادِي:** کەناری، قەراخی، لێواری، لای
**عِبْرَانِيّ:** جوولەکە، جوو، زمانی جوولەکە

**عَبْرَة (دَمْعَة):** فرمێسك، ئەسرین، رۆنك، هەس، ئەشك، رۆنتك، هۆرمیس، دلۆپەو تكەی ئاوی چاو

**عِبْرَة:** ئامۆژگاری ، پەند وەرگرتن، نموونەو ورياكردنەوە، بێداركردن، بەهۆش خۆ هاتنەوە ، سەرسوڕمان، ئەو بنەڕەتەی بۆیدەگەڕێتەوە

**عِبْرِي:** زمانی جوولەكە، عیبری، جوولەكە

**عَبَسَ ـ عَبَسَ وَجْهَهُ (قَطَبَهُ):** رووی گرژكرد، خۆی گرژو مۆنكرد، دەموچاوی دابەیەكا

**عَبِسَ الثَّوبَ:** پیس بوو، خەوشی گرت

**عَبِسَ الوَسَخُ عَلَيهِ وَفِيهِ:** لیوی وشك بوەوە

**عَبُسَ (تَقْطِيبُ الوَجه):** مۆنی ، گرژی، روویەكادان، دەموچاو مۆنو گرژكردن

**عَبَسُ:** كەمێڵ، پشكەڵ، پاشلی ئاژەڵ

**عَبَسُ (نَبَات):** جۆرە روەكێكە

**عَبَطَ (فَعَلَهُ إعتِبَاطَاً):** كوێرانە كردەوەی كرد، بێهیچ بەرچاو رۆشنیو رێسایەك ئەنجامیدا

**عَبَطَ الثَّوبَ:** درانیو لەتو پەتی كرد ، شوختی تێخست

**عَبَطَ الذَّبِيحَةَ:** ئاژەڵەكەی بێهیچ ناتەواویو كەمو كورییەك سەربڕی

**عَبَطَ الأرْضَ:** شوێنو جێگەیەكی لێهەڵكەند پێشتر هەڵی نەكەندبوو

**عَبَطَ الرِّيحُ وَجْهَ الأرْضِ:** رایماڵی، گسكیدا، پاكی كردەوە، رووتەنی كرد

**عَبَطَ التُّرَابَ:** بردی بەئاسمانا، كردی بەئاسماناو بەرزی كردەوە

**عَبَطَ النَّبَاتُ الأرْضَ:** زەوی قڵیشاند، سەری دەركرد، هاتە دەرەوە

**عَبَطَ فُلَانٌ نَفْسَهُ وَبِهَا فِي الحَرْبِ:** بەویستی خۆی چوو بۆ جەنگو شەڕ، خۆی هاویشتە نێو جەنگو هەراوە

**عَبَطَ الفَرَسَ:** غارغارێنی پێكرد هەتا ئارەقی دەردا، راوینا تا عارەقی پێكردەوە

**عَبَطَ الكَذِبَ عَلَيهِ:** درۆی بۆ هەڵبەست، درۆی خستەپاڵ

**عَبَطَ فُلَانَاً:** سەرزەنشتی كرد، ئەنگیو ناتەواوی لێگرت

**عَبْطَة:** جوانەمەرگ، یەكێك بەجەحێڵیو گەنجی بمرێتو دنیا بەجێ بهێڵێ

**عَبِقَ بِهِ الشَّيءَ:** پێوەی لكا، نووسا پێوەی، چەسپ بوو

**عَبِقَ بِهِ الطِّيبُ:** بۆنی خۆشی گرتو بڵاوی كردەوە

**عَبِقَ بِالمَكَان:** تیای مایەوە، هەڵیكرد، جێگیر بوو، سرەوی

**عَبِقَ بِالشَّيء:** شەیدای بوو، ئالوودەو عاشقی بوو، حەزی لێكرد

**عَبِقَ المَكَانُ بِالطِّيبِ أو الدُّخَانِ:** قانگ درا، بۆنو دووكەڵ بڵاو بوەوە

**عَبِقٌ (ذَكِيُّ الرَّائِحَةِ):** بۆنخۆش، بۆندار، خاوەن بۆنو بەرامی خۆش ، مەردومی ئالوودەی بۆنی خۆش

**عَبَق (شَذَا):** بۆن ، بۆنو بەرامە، بۆنی خۆش، بێهن، بووە، بووی

**عَبَقَ:** بۆنی خۆش، بۆنو بەرامی خۆشو سەرنج راكێشی بڵاوكردەوە

**عَبقَة**: پاشماوەی شتێك، پاشماوەی چەوری
**عَبقَة**: ئەو ئافرەتەی بۆنێك لەخۆی دەدات تاچەند رۆژێك هەر پێوەی دەمێنێتو ناڕوات
**عَبقَر**: خێونشین، جنۆکەنشین، شوێنو جێگەیەکە عەرەبەکان دەیانگوت شوێنو جێگەی جنۆکەیە پاشان هەرشتێك جوانبوایە لایانو پێی سەرسام ببونایە دەیاندایە پاڵ ئەو شوێنە
**عَبقَرَةٌ مِنَ النسَاء**: ژنی جوانو شۆخو شەنگ، باریکەڵەی جوان ئەندام
**عَبقَرِيّ**: بلیمەت، هەڵکەوتوو، زرنگ، بەهرەدار، بەتوانا، لێهاتوو، سیفەتێکی تایبەتە بۆ هەرشتێك کە لەژێری و ئەقڵدا جێگەی سەرنج راکێشانو سەراسیمە بێت، گەورە، سەردار، ئاوریشم، فەرشی گران
**عَبقَرِيَة**: زرنگی، بلیمەتی، لێهاتوویی، بەهرەداریی
**عَبَلَ**: بڕی، قرتاندی، گەڕانیەوە، دەستی پێوەنا، پاڵی پێوەنا
**عَبَلَ بِهِ**: بردی، رۆیی
**عَبَلَ الشَجَرَ**: گەڵاکانی وەری، هەڵوەری، کەوتە خوارەوە
**عَبَلَ الشَيء**: گەڕاندیەوە، دایە دواوە، پاڵی پێوەنا
**عَبِلَ (ضَخُمَ)**: ئاوسا، زلبوو، کەشی هات، کف هەڵات
**عَبِل**: ئاوساو، زل، کەتە، قەبە، کفهەڵاتوو، کەش هاتوو

**عَبْل**: گەورەو کەتەی هەرشتێك
**عَبْلُ الذرَاعَين**: باڵ گەورەو کەتە
**عَبَل**: هەر گەڵایەکی لوول وەك گەڵای دارگەز، گەڵای وەریوی لوولو ژاکاو
**عَبلَاء**: بەردێکی سپی رەقو تۆکمەیە
**عَبهَر ـ عُبَاهِر**: یاسمینو نێرگس، تێکسمراو
**عَبهَرَةٌ مِنَ النسَاء**: ئەو ئافرەتانەی جوانیو رەوشت بەرزییان بەیەکەوە کۆکردوەتەوە
**عُبوَة (مِلء)**: پڕکردن، پڕکراوە، ئاخنراو، داگیراوە
**عُبوَةُ الشَيء**: ئەندازەو ئەوەندەی پڕی دەکات
**عُبوَةٌ نَاسِفَة (كتلَةٌ مُتَفَجِرَة)**: تەقەمەنی، بڕێك تەقەمەنی کەدەتەقێتەوە
**عُبُودَة ـ عُبُودِيَة**: بەندایەتی، بەندەیی، گوێڕایەڵی، ملکەچی، ملکەچ کردن، کۆیلەیی
**عُبُور**: تێپەڕین، گوزەرکردن، رەت بوون، رێباز، رێرەو، پیاچوون
**عَبُوس**: گرژ، مۆن، رووکرژ، مرومۆچ، پۆرخز، مارس، دەمو چاو بەیەکا دراو
**عُبُوس**: مۆنی، گرژی، روویەیەکادان، دەمو چاو ترشان
**عَبِير**: بۆنی خۆش، تێکەڵە بۆنێکی خۆش
**عَبِيط (أحمَق مَعتُوه)**: گەوج، گەمژە، کەودەن، حۆل، گێژ

**عَبِط (الذَّبيحَةَ تُنحَرُ وَهيَ سَمينَةٌ وَفَتيَةٌ)**: سەربڕینی دابەستە، سەربڕینی ئاژەڵی قەڵەوی گۆشتنی تازە پێگەیشتوو کەناتەواوی و کەمو کوڕی تیا نییە

**ع ت**

**عَتَّ فُلاَنًا**: جار دوای جار قسەی بۆ دووبارە کردەوە

**عَتَّ فُلاَنًا بِالكَلاَمِ**: سەرزەنشتی کرد، لۆمەی کرد

**عَتَا (إستَكبَرَ وَجَاوَزَ الحَدَّ)**: لەخۆی بایی بوو، شووڵی لێهەڵکێشا، لووتبەرزییەکەی لەئاستی خۆی بەدەرکەوت، لەسنوور چوە دەرەوە

**عَتَا الشَّيءُ**: کۆتایی هات، دوایی پێهات، لێبوەوە

**عَتَا الشَّيخُ**: پیر بوو، چوەساڵەوەو خەڵەفا، بەساڵاچوو تەمەنی بەسەر برد

**عِتَاب (لَوم)**: گلەیی، سەرزەنشت، رازوگلەیی

**عَتَاد**: کەل و پەل، کەرەستە، تفاق، کەرەستەی جەنگ، کەل و پەل و پێویستی جەنگ، کاسەی گەورە

**عُتَاق**: شەراب و مەی کۆنە

**عَتَّال (حَمَّال)**: بارەبەر، کۆڵ هەلگر، کۆلکێش، حەماڵ

**عِتَالَة (حَمَالَة)**: باربەری، کۆلکێشی، حەماڵی، کۆڵ هەلگری

**عَتَامَة**: لێڵی، خەوشداریی، واژوی روونییە

**عُتَاشِلِّيٌّ**: نەخۆشییەکە دەدات لەمێشک و نەخۆش تووشی لەرزین و بڕینی قسەو گوتەدەکات و بەردەوامیش توشبوو ئەقڵی لاواز و کز دەبێت

**عَتَاهُ البَاكِرِ**: لاوازییەکی ئەقڵییە تووشی گەنج و هەرزە دەبێت

**عَتَاهَة**: کەودەنی، گێلی، گەمژەیی، بێئەقڵی، لەدەستدانی ژیری

**عَتَاهِيَة**: شێت و وێت، کەودەن، پەتەڕی، شێتۆکە، گەمژەیی، مەردومی گێل و نادان

**عَتَبَ عَلَيهِ**: نکوولی لەرەفتاروکرداری کرد، ناڕازیبوو لەسەر هەندێك رەفتارو کرداری

**عَتَبَ فُلاَنًا**: سەرزەنشتی کرد، هات بەسەریا، لۆمەی کرد

**عَتَبَ فُلاَنٌ عَتبًا وَعَتَبَانًا**: قاچێکی هەڵبڕی و ئەوی تری دانا، پیاوێك قاچی نەبێت و بەدارشەق بڕوات بەڕێوە، لەسەریەك پێ وەستا

**عَتَبَ البَرقُ عَتَبَانًا**: تیشك و رووناکی بەدوای یەکا هات، تیشکی دایەوە

**عَتَبَ البَابَ عَتبًا**: پێی نایە بەردەرکی، چوە بەردەرکی

**عَتَبَ مِن مَكَانٍ إلَى مَكَانٍ**: بڕی و لەشوێنێکەوە چوو بۆ شوێن و جێگەیەکی تر

**عَتَبَ مِن قَولٍ إلَى قَولٍ**: لەگوتەو قسەیەکەوە پەڕییە سەر گوتەو قسەیەکی‌تر، لەم قسە بازیدا بۆ ئەوقسە

**عَتَبَ فُلاَنٌ**: خاربوو، هێواش بوو

**عَتَّبَ البَابَ:** چوارچێوەی بۆ دانا ، لاشیپانی بۆ دانا

**عَتَّبَ:** گلەیی، سەرزەنشت، گازندە، راوگلەیی ، ماوەی نێوان دوو شاخ

**عَتَبُ البَابِ:** باهوی دەرگا ، چوارچێوەی، لاشیپانی

**عتِب(كَثِير المُعَاتَبَة):** خۆش گلەیی، یەکێك هەمیشە دەم بەگلەیی بێت روو بەکەسانی دەوروپشتی

**عُتْبَى:** رازی، قایل، خۆشنودیی، ئاشتی

**عَتَبَاتُ المَوت:** نارەحەتیەکانی مردن، ژانو ئێشی سەرە مەرگ

**عَتَبَة:** زەوی وشكو رەق ، وشكە زەوی، هەر پێ پلیکانەیەك یان جێ پێیەك، پەیژە ، قالدرمە، بەردەرگا

**عَتَبَة(فِي الهَنْدَسَة):** پێکهاتەیەکە لەدوو کۆلەکە پێکهاتووە

**عَتَبَةُ البَابِ العُلْيَا:** باهوی سەرەوە، سەر دەرگا، بالشمە

**عَتَبَةُ البَابُ السُفْلَى:** باهۆی خوارەوە، ناو دەرگا

**عُتُبَة:** خوارووی دۆلو شیو، لای خوارەوەی

**عَتَدَ (تَهَيَّأَ):** ئامادەبوو، هاتەبەر، سازا، هاتەبەر

**عَتَّدَ (هَيَّأَهُ):** ئامادەی کرد، سازاندی

**عَتَرَ الرُمْحَ:** لەریەوەو گەڕایەوە دواوە

**عَتَرَ(ذَبَحَ):** سەری بڕی، ملی لێکردەوە

**عِتْرُ:** بنەما، روەکێکە بۆ چارەسەر بەگەڕ دەخرێ

**عِتْرَةُ:** ئەوەی لقو پۆپی لێدەبێتەوە، وەچەو نەوەی پیاوو هۆزو تیرەو کەسو کاری، خانەوادە، خێزان

**عَترَة:** سەربڕاو، ئاژەڵی سەربڕاو لەنەفامیدا بۆ گەلە خواکانیان سەر دەبڕی

**عَتْرَسَ فِي الأَمْر:** بەتوندو تیژی کردی

**عَتْرَسَ فُلاَنَاً:** ستەمی لێکرد، چەوسانیەوە، مافی خوارد

**عَتْرِيس:** زۆرداری تورەو ترۆ

**عَتَقَ عِيتقَاً وعَتَاقَاً:** کۆن بوو، دێرینبوو

**عَتَقَ الشَيءَ:** پێشکەوت، گەیی بەپایانو کۆتایی

**عَتَقَ المَالُ:** چاك بوو، هاتە سەریار

**عَتَقَ اليَمِينُ:** بەپێویست گەڕا، پێویست بوو لەسەری سوێند خواردنەکەی

**عَتَقَ العَبْدُ:** ئازادبوو، سەربەست بوو، رەهابوو، لەکۆیلایەتی رزگاری بوو

**عَتَقَ الخَمرُ:** کۆن بوو، دێرین بوو

**عَتَقَ فُلاَنَاً بِفِيه:** بەددان گازی لێگرت، گەزتی

**عَتَّقَ الثَوبَ:** کۆنی کرد، دێرینی کرد، شڕی کرد

**عَتَّقَ العَبْدَ:** سەربەخۆی کرد، سەربەستی دایە، ئازادی کرد ، رەهایکرد

**عَتَّقَ الخَمْرَ:** داینا کۆنو خۆش ببێ ، کۆنی کرد

**عُتُق:** سەربەخۆیی، ئازادی، سەربەستی، جوانی، رەهایی

**عَتُقَ الشيء**: تازەكردنی، نوێكردنەوەی
**عتق**: پاڵفتەو پوختـەی شت، جوانی، ڕێزو پایەداری، ئازادی، پێشكەوتن
**عَتَكَ فِي القِتَال**: هەڵمەتی بردە سـەر، هێرشی بۆ برد
**عَتَكَ فِي الأرْضِ**: بەتـەنیا ڕۆیی، تـەنیا چوو
**عَتَكَ عَلَيهِ يَضْرِبُهُ**: بەتوندی هەڵمـەتو هێرشی كردەسەر
**عَتَكَ عَلَى يَمِينٍ فَاجِرَةٍ**: سـوێندێكی درۆی خوارد
**عَتَكَ المَرأةُ عَلَى زَوْجِهَا أو أبِيهَا**: سـەرپێچی كـرد ، یـاخی بـوو، بێگوێیكـرد، لەگوێڕایـەڵی مـێردو باوكی دەرچوو
**عَتَكَ عَلَيهِ بِخَيرٍ أو شَرٍ**: نـاڕەزایی دەربڕی، ناڕازیی بوو
**عَتَكَ القَومُ إلَى مَوضِعِ كَذَا**: لایـاندا، ترازان
**عَتَكَ اللبَنُ أو النَبِيذُ**: ترشو توندبـوو، زۆر بوو ، فرە بوو
**عَتَكَ بِفُلَانٍ**: گرتی، بـەری نـەدا، نوسـا پێوەی
**عَتَكَ الطِيبُ بِهِ**: بۆنی گرت، بۆنداربوو، بۆنی هەبوو
**عَتَكَ يَدَهُ عَتْكَاً**: بردیـە نێـو سـنگی، لەنێو سنگیا ونی كرد
**عَتَلَ ـ عَتلاً**: هەڵی گرت، لێـی نـەوی، بەتوندی كێشی كرد، ڕایكێشا
**عَتَلَ إلَى الشَرِ**: پەلـەیكرد، خـێرایكرد، دەستو بردی كرد
**عُتُل**: توندو تیژی هەرشتێك

**عَتَلَة**: نوێلْ، پیك، ئاسـنێكی درێـژو قورسـە بـەردی پـێ هەڵدەكـەنرێ، ڕنگلیزە
**عَتَلَهُ ـ عتـلاً**: تونـد بەكێشـی كـرد، بەتوندی كێشی كرد
**عَتَمَ ـ عَتْمَ**: خاوەخاویكرد، شێنەییكرد
**عَتَمَ عَنِ الأمرِ**: دەستی لێهـەلگرت، وازی لێهێنا ، دەستی لێكێشایەوە
**عَتَمَ الليلُ**: بەشـێكی گـوزەراو بەسەرچوو، ڕۆیی
**عَتَمَ الشَيءَ**: دوایخسـت، خاوەخـاوی تیاكرد
**عَتَمَ فُلانُ قِرَى ضَيفِهِ**: دوایخسـت، خوانو سفرەی میوانەكەی دواخست
**عَتَمَ (أظْلَم)**: تـاریكی كرد، تـاریكی داهات
**عَتَمَ عَنهُ**: وازی هێنـا دوای دەسـت بـەكاربوونی، كشـایەوە دوای ئـەوەی شانی پیا كردبوو
**عَتَمَ قِرَاهُ**: میوانداریيەكەی دواخست
**عُتُمُ ـ عُتْم**: دار زەیتونی كێوی
**عَتَمَة (ظُلمَة)**: تاریكی ، زەنگ، واژوی ڕووناكیە
**عَتَمَة**: سـێیەكی سـەرەتای شـەو، تاریكـایی بەشێوەیەكی گشتی، خـاوە خاو، هێواشیو لەسەرخۆیی
**عُتُو**: بـایی ، فـیزو لووتبـەرزی، سەركەشی، خۆ لێگۆڕان ، بایی بوون ، غەڕابوون
**عُتَهَ**: شێتۆكەبوو، كەودەن بوو، ئەقڵی كـەم بـوەوە، سەرسـام بـوو، سـەری سوڕما

**عُتـهَ فِـي العلـم:** سـوربوو لەسـەری ، بەردەوام بوو لەسەری

**عُتــه (بَلاَهَــة):** کـەودەنی، گێلـی ، گەمژەیی

**عَتِيَ:** خۆبەزلزان‌و ستەمکار، لەسنوور دەرچوون

**عَتِيـد:** ئامـادە، ئامـادەکراو، نزيکـی روودانە

**عَتِيدَة:** سندوقێکە بۆنی خۆش‌و بابەتی جوانکـای‌و خۆرازاندنـەوەی تێیـدا هەڵدەگیرێ

**عَتِيــق:** کـۆن، دێریــن ، پــەرپوت، سـەربەخۆ، سەربەست، ئـازاد، بـەرێز، بەتەمەن‌و دێرینی هەرشتێك

**عَتِيقَة:** مەی کۆنی چەن ساڵە، کۆن، دێرین

**عَتِيه:** سوربوو، بـەردەوام بـوو، پشت ئەستوربوو ، ئالوودەی بوو

**ع ث**

**عُث ـ عُثَّة (سوس):** مۆرانە، مەریکانـە، خوورك، خیرك، مرکە، مۆرکە، گیـوە، گیاندارێکی وردەو کەل‌و پەلی خوریـی‌و داری گەندەڵ دەخوا

**عَثَاء:** مار

**عُثَاث:** ئاوازخوان، سرووود خوێن

**عِثَار:** شەڕ، ئەوەی لێی هـەڵدەنوتێ ، کۆسپ ، ڕێگر

**عُثَان:** تەپ‌و تۆز ، خۆڵ‌و لم

**عَثَت الحَيَّةُ فُلاَنَاً:** پێوەیدا، گەزتی

**عَثَتَ العُثَّة الصُّوفَ:** خواردی

**عَـثَرَ(زَلّ وَسَــقَطَ):** هـەڵنوتا، کـەوت، هەڵـەنگوت، سـاتمەی کـرد، رەتیـدا، سەرسمیدا

**عَثَرَ عَلَى السِّرِّ:** رازو نهێنی دۆزیـیەوە، ئاگاداری بوو

**عَثَرَ عَلَى الشَّيء (وَجَدَهُ):** دۆزییەوە، دیتیەوە ، چاوی پێکەوتەوە

**عَثَرَ عَلَيهِ الزَّمَـان:** ڕۆژگـار خـراپ بـوو لەگـەڵی، شـانس نـەی هێنـا ، ڕۆژگـار قورس‌و گران بوو لەسەری

**عَثَرَ فِي ثَوبِـهِ ـ عَـثَرَ بِـهِ فَرَسَـهُ ـ عَـثَرَ جَدُّهُ:** بەدبەخت بوو، بێشانس بوو ، فەوتا

**عَثْرَ:** هەڵی نوتان، خستی، سـەرسمی پێدا

**عَثْرُ:** درۆ، داڵ، قەلەڕەش

**عَـثْرَة:** کـەوتن، هــەڵنوتان، سەرسـم، سـاتمەکردن، ڕەتـدان، تێکۆشـان‌و جەنگ

**عَثْعَثُ:** خراپە، نالەباریی

**عَثَقَ:** جۆرە دارێکە

**عَثْكُ:** رەگەکانی دارخورما

**عَثْكَلَة:** دوژمنی رەزا قورس‌و گران

**عَثْكَلَـه:** جوانـی کـرد، رازاندیـەوە، دەستی پیا هێنا

**عَثْكُـول:** خۆشـە خورمـا، خورمـای بەتام‌و پێگەییوو

**عُثْكُولَــة:** ئەوشـتانەی بـۆ جوانـی هەڵدەواسـرێن‌و بــەدەم بــاوە دەشەکێنەوە

**عَثْل:** زۆرو فرەی هەمووشتێك، تونـدو زلە

**عَثَمَ العَظمُ:** بەخواردن گیرایەوە

**عَثَمَ الجُرحُ:** قەتماغەکەی وشـکی کـرد بەڵام هێشتا هەر چاك نەبوو بوەوە

**عَثمَ القِرْبَـةَ وَنَحْوَهَـا:** بەباشـی دای نەخست، باش هەڵی نەپێچا
**عَثم:** کەمتیار، فیل
**عُثمَان:** بەچکەی حوباری، بەچکە مار، تولـە مـار، مـار، توولـە، نـاوی سـێیەم خەلیفەی راشـدینی موسـوڵمانە (رەزای خوای لێبێت)
**عَثـنَ مِـنَ الطَعَـام:** خواردنێـک بۆکزیووبێت، بۆنی دوکەڵی گرتبێت
**عَثَنَتِ النَّارُ:** دووکەڵی کرد
**عَثَنَتَ فُلاَنٌ فِي الجَبَلِ عَثْنَاً:** سەرکەوت، هەڵزنا پیایدا
**عَثَنَـتَ الثَّـوبَ بِـالطِّيبِ:** دوکـەڵی بوخوردەکـەی کـرد بەسـەریا هـەتا پێوەی نووساو بۆنی گرت
**عَثَنَتَ فُلاَنٌ عَلَيهِم بِالفَسَادِ:** خراپـەی هێنایە ناویان، هەژاندی، جووڵاند
**عُثنُون:** ئەو موانەی لەچەناگەو ژێرەوە تـا خـوارەوەی گـەردن دێـت، مـووی درێـژی گـەردن ، وشـترو سـابرێن ، ریشـەکەی، پـەڕی شـۆڕبووی خـوار دەنووکی کەڵەشێر
**عَثُور:** یەکێك زۆر بکەوێت یان هەڵنوتێ
**عُثُور:** زانین، بۆدەرکەوتن، دۆزینـەوە، چاوپێکەوتن
**عَثِيَ ـ عُثُوَّاً:** خراپەی نایەوە، ئاشوبو خراپەی بڵاوکردەوە
**عِثْيَر:** تـەپو تـۆز، خـاكو خـۆڵ، گەردەلوول، تۆزو گەردی زۆر

**ع ج**

**عَـجَّ (صَـاحَ):** هـاواریکرد، نـەڕاندی، قیژاندی، دەنگی بەرزکردەوە
**عَـجَّ بِـالدُّعَـاءِ إِلَـى اللهِ:** دەنگـی نـزاو پاڕانـەوەی لـەبارەگای خـوای گـەورەدا بەرزکردەوە
**عَجَّ الرِّيحُ:** بـەتوندی هـەڵیکردو لەگـەڵ خۆیدا تەپو تۆزی باراند
**عَـجَّ الطَّرِيـقُ:** پڕبـوو لەخـەڵك، جمـەی هات، یەکجار خەڵکی لێبوو
**عَجَّ المَكَانُ بِكَذَا(تَحَشَّدَ):** پڕبـوو، بـوو بەچڕەو قەڵەبالغی
**عَـجّ:** نـەڕە، قیـژە، هـاوار، قـاووقیژ، دەنگە دەنگ، هاوارو دەنگی بەرز
**عَجَائِن:** فەرمۆکە، پلاستیك
**عُجَابٌ ـ عُجَّابٌ:** سـەیر، سەرسـوڕهێن، سەرسـامکەر، سەراسـیمەهێن، لەرادەبەدەر
**عَجَـاج:** خـۆڵ، تـەپو تـۆز، دووکـەڵ، چڕە، چەڕە
**عَجَاج:** نەڕەکەر، قیژەکەر، خۆڵ بارێن
**عِجَـارٌ:** پۆشـاکێکە ژنـان دەیپێچـن بەسەریانەوە
**عَجَارِفُ الدَّهْرِ:** رووداوو نەهامەتیەکانی رۆژگار، رووداوەکانی
**عِجَارَةٌ:** ئـەوەی ژنـان دەیکەنـە پاشـی خۆیانـەوە بۆئـەوەی سمـتو کلۆتیـان رێك بنوێنێت
**عِجَاف:** بێبارانی، وشکە ساڵ
**عُجَالَــةٌ:** ئــەوەی پێشــدەخرێ لەهەرشتێك، شتو مەکی ئامـادەکراوی گەشـتیارو موسـافیر کەئـەرکی بـۆ دروست نەکات
**عُجَام ـ عُجَامَة:** دەنکی خورمـا، نـاوك، دەنكو ددانەی هەرشـتێك وەك خورمـاو هەنارو ...

**عَجّـــان:** هەویرشـــێل ، ئـــەوەی هەڵدەستێت بەشێلانی هەویر، گـەمژە، گێل، کەودەن ، نەزان

**عُجـاوَة:** شـیریك بدرێـت بـەمناڵێکی هەتیوو بێباوك

**عَجِبَ لَهُ وَمِنْـهُ:** سەرسام بوو، سەری سوڕما، واقی وڕما، تووشی سەراسیمە هات

**عَجِبَ إلَیـهِ (أحَبَّـهُ):** خۆشـی ویسـت، بەدڵیا چـوو، حـەزی لێکـرد، لـەدڵیا شیرین و خۆشەویست بوو

**عَجَّبَ:** سەری سوڕمان، سەرسامیکرد، واقی وڕمان، سەراسیمەی کرد

**عُجب (زُهو وتَکَبُّر):** لەخۆبایی بوون ، خۆبەزلزانین

**عَجَـبٌ (دَهْشَـة):** سەرسـامی، سەرسـوڕمان، واقوڕمـان، سەراسـیمە بوون

**عَجْبٌ:** کۆتایی، پاشەڵ، دوا، کلێنچکە، بنکی کلك

**عُجَّة:** هێلکەو ڕۆن بەئاردەوە

**عَجَّ الغُبَـارَ (أثـارَهُ):** کردی بەتـەپو تۆز

**عَجَّجَ البَیتَ مِنَ الدُّخـانِ (مَلأهُ):** کردی بەچەرە دوکەڵ، ماڵەکـەی قـاندا لـە دۆکەلا

**عَجَرَ الفَرَسُ:** کلکی بەرزکردەوە، کلکی هەڵبڕی

**عَجَرَ الفَرَسَ وَالرَّجُل:** بـەخێرایی ڕۆیـی بـەڕێوە لەترسـا یـان لەبـەر هـەر هۆیەکیتر

**عَجَـرَ عَلَیـهِ بِالسَّـیفِ:** بەشمشـێر هەڵمەتی بۆ برد ، نیشتە سەری

**عَجَرَ عَلَیه:** زۆری لێکرد، داکۆکی کرد، جەختی لێکرد

**عَجَرَالرِّیـقُ عَلَـی أسْـنَانِه:** تفەکـەی خەست بووەوە بەددانەکانیەوە نووسا

**عَجَـرَ بِالعَصَـا:** بـەگۆچان لێیـداو شوێنەکەی هەڵکفاو بەرزبووەوە

**عَجِرَ - عَجَرَاً:** کەتەو زلـە بـوو، قەڵـەوو تێکسمڕاوبوو، سکی ئاوساو هەڵکفا

**عَجَرٌ (نُتُوءٌ):** هەڵتۆقیوی ، ئاوساویی، لوو، گرێ

**عَجْرَاءُ:** کۆم، قەمبوور، کووڕ

**عَجْرَاءُ مِنَ العِصِيِّ:** گرێدار، قەفدار

**عُجْـرَة:** گـرێ، سـەلك، نـەنگی، هەڵـەو خەوش، ناتەواوی ، کەمو کوڕی، نـامو نەنگی

**عُجْرَةُ فیرکوف (فـي الطِـب):** لوویـەکی لاوەکییە لەجگـەردا دروسـت دەبێـت لەشیر پەنجەی گەدەوە دەگوێزرێتەوە

**عَجْرَدُ:** سووك، خێرا ، تیژ ، توندڕەوی

**عَجْرَفَة:** لەخۆباییبوون، خۆبـەزلزانین، فیز، قسەرەقی، قسە ساردی

**عَجْرَفِیَّة:** رەقی، ساردی، خۆبەزلزانی، فیزو دەعیە

**عَجْرَقَبٌ:** دوودڵی گەندەڵ، بـەدگومانی دڵ پیس

**عُجْـرُمُ:** کرمێکـە لـەنێو دارا، قەڵـەوی کورتەبنە، کەتەوڵ

**عَجْرَم:** پێقەلـە، گیایـەکی بەهارییـە گـەلای وەك کەڵەویّ وایـە تـامی گـەلا توور دەدات

**عَجَزَ - عَجُزَ (صَـارَ عَجُـوزاً):** پـیر بـوو، بەسالاچوو، کەوتە تەمەنەوە

**عَجَزَ عَنِ الشَّيءِ:** كەم توانابوو، نەیتوانی بیکات، بێدەستەڵات بوو لەئاناییدا
**عَجَزَ فُلاَنٌ عَنِ الشَّيءِ عَجْزاً:** سوورنەبوو لەسەری، بەلاوەکی گرتی
**عَجَزَ عَنِ العَمَلِ:** توانای کاری نەبوو بەهۆی پیری‌و بەساڵاچوونیەوە
**عَجِزَ عَنْ كَذَا (لَمْ يَقْتَدِرْ عَلَيْهِ):** نەیتوانی، بۆینەکرا، لەتوانایا نەبوو
**عَجِزَ الرَّجُلُ أو المَرأةُ:** سمت‌و کلۆتیان گەورەو زلە بوو، دەرپەڕیو بوو
**عَجَّزَ:** پیری کرد، پەکی خست، برستی لەبەر بڕی، کورتی هێنا، ناتەواو بوو، گەشەو نەش‌و نمای وەستا
**عَجْزٌ:** لاوازی، بێهێزی، توانا نەمان، لەپەل‌و پۆ کەوتن، کەمتەرخەمی ، کەم‌و کوڕی‌و ناتەواوی، کورت هێنان
**عَجِز ـ عُجْز ـ عِجْز (مُؤخر الشَّيءِ وَالجِسْم):** پاش، دواوە، سمت، کەفەڵ، کلۆت، تەریزە، کلێنچکە، پاشەڵ، سمت‌و ساتان، قاڵچە، کۆلۆت، کەماخ، تەڕاف، تەڕماقوون، دوو گوڵمی گەورەی گۆشتییە کەلەلای راست‌و چەپی گیاندارەوەیە
**عَجُزٌ ـ عَجِزٌ:** پیاوی بێهێزو توانا
**عَجُزُ البَيْتِ (الشَّطْرُ الثَّانِي مِن بَيْتِ الشِّعْرِ):** نیوەی دێری دووەمی هۆنراوە
**عُجْزَة ـ عِجْزَة:** پاشەبەرە، دوایین منداڵی دایک‌و باوک ، دوا منداڵ
**عَجَزَة:** پەککەوتوان، ئەوانەی بەساڵاچوون‌و پەکیان کەوتووە

**عَجَزَت المَرأةُ:** پیر بوو، بەساڵاچوو، تەمەنی‌کرد
**عَجْعَاج:** هاوارو قیژەی هەر خاوەن دەنگێك
**عَجْعَاجٌ مِنَ الخَيلِ:** ئەسپی رەسەن‌و نەجیب
**عَجْعَجَ:** قیژاندی، هاواری‌کرد، نەڕانی، دەنگی بەرزکردەوە
**عَجْعَجَة:** هاوارکردن، نەڕاندن، قیژاندن
**عَجْعَجَة (فِي لُغَةِ قُضَاعَة):** لەزمانی (قوزاعە)دا بریتیە لەگۆڕینی (یا) بۆ (جیم) لەگەڵ (عین)دا
**عَجَفَ نَفْسَهُ:** وازی لێهێنا، لەخۆی گرتەوە، دەستبەرداری بوو
**عَجَفَ نَفْسَهُ عَنِ الطَّعَامِ:** لەدەمی خۆی گرتەوە بۆئەوەی تر، دەستی گرتەوە ، هاتە دواوە
**عَجَفَ نَفْسَهُ عَلَى فُلاَنٍ:** خواردنی دا بەو خۆی نەیخوارد
**عَجَفَ نَفْسَهُ عَنِ المَقَابِحِ:** نەفسی گرتەوە لەخراپەو رەوشتی نالەبارو دزێو
**عَجَفَ نَفْسَهُ عَلَى المَرِيضِ:** لەسەر نەخۆشی ئارامی گرت ، دانی بەخۆدا گرت
**عَجَفَ الدَّابَّةَ:** لاوازی کرد، لەڕیکرد
**عَجِفَ البِلاَدُ:** باران نەباری ، وشکە ساڵ بوو
**عَجُفَ الرَّجُلِ:** تێری نەخوارد، تێر نەبوو
**عَجَفٌ:** لاواز، لەڕ، کەم توانا، بێبڕست
**عَجْفَاء:** لاوازو کەم توانا ، لەڕو لاواز

**عَجِلَ ـ عَجَلاً:** پەلەی کرد، خێرای کرد، زوویکرد
**عَجِلَ إلَيه:** خێراو پەلەی کرد بۆی
**عَجِلَ فُلاَنَاً وَالأمر:** پێشی کەوت، بۆڕیدایەوە، بەرلەو رۆیی
**عَجَّلَ فُلاَناً:** پێشی کەوت، پێشی دایەوە، هانیدا، دنەیدا
**عَجَّلَ لَهُ مِنَ الثَمَنِ كَذَا:** پێشەکی دایە، لەپێشەوە دایە، پێشکەشی کرد، خستیە خزمەتو ژێر رکێفی
**عَجَّلَ اللَحْمَ:** لێینا، ئامادەیکرد
**عُجل ـ عُجْلَة ـ عُجَالَة:** پێشخستنو زوو ئامادەکردنی هەرشتێك، ئەو خواردنەی ئامادە دەکرێت، ئەوەی بۆ میوان ساز دەکرێت
**عَجِل (مُسْرِع):** خێرا، پەلە، دەستبەجێ، گورج
**عَجَل ـ عَجَلَة:** خێرایی، پەلەکردن، فرکە، فرکان
**عِجْل:** گوێرەکە، پارێن، پۆغە، جوانەگا، تۆبەن، نەوەن، نیۆن، نوێنگین، پەلَخ
**عَجْلاَن (عَجِيل ـ مُسْرِع):** پەلە، خێرا، بەتاو
**عَجَلَة:** پەلە، خێرایی، تاو، دەستوبردکردن، گوڕ، چوستی، گورجو گۆڵی، فرکە، گالیسکە، پێچکە، رەوڕەوە، پاسکیل، دووچەرخە، قوڕو لیتە، خڵتە، ئەو ئامێرەی قورسایی لەسەر هەڵدەگیرێ، دۆڵاب، کەنتۆر، سووکی
**عَجَلَة (فِي الرِيَاضَة):** رێژەی گۆڕانی خێرایی

**عَجَلَةُ القِيَادَة:** سوکان، چەرخە، هەڵسوڕێن
**عِجْلَة (أنثى العِجْل):** گوێرەکە، پۆغە
**عَجَمَ الحَرفَ وَالكِتَابَ (أزَالَ إبْهَامَهُ):** بەنوکتەو سەروبۆر پەنهانو نادیاریی ئاشکرا کرد، روونی کردەوە
**عَجَمَ الشَيء:** گازی لێگرت بۆئەوەی پتەوییو تۆکمەیی بۆ دەربکەوێت
**عَجَمَ فُلاَناً:** تاقیکردەوە، هەڵیسەنگان
**عَجَمَ السَيفَ:** رایوەشاندو تاقیکردەوە، هەڵیسوڕاند بۆ تاقیکردنەوە
**عَجَمَ الكِتَابَ:** رانەماو نەوەستا لەسەر پیتەکانی بەپێی خۆی یان وەك پێویست
**عَجُمَ فُلاَنٌ:** زمانی پاراو نەبوو، گیرەو نارەوانیەك لەزمانیدا بوو، لاڵە پتە بوو
**عَجَم ـ عُجْم:** نەتەوەو کەسانی نا عەرەبو بەتایبەت بۆ (فارس) بەکاردەبرێ، ئێرانی، عەجەم، واژوی عەرەبە
**عَجْم ـ عُجْم (عَصعَص ـ أصل الذَنب):** کلێنچك، کلێنچە، ئێسقانێکی باریکی گرێگرێی کورتە بەژوور قنگی بزنو مەڕو هێندێ گیانداری ترەوەیە لەجیاتی کلك
**عَجَم ـ عُجَام:** ناوکە خورما، هەرشتێك لەنێو خواردنێکدا بێت وەك دەنکی مێوژو ...
**عَجْمَاء:** چوارپێ، ئاژەلآن، گیانەوەر
**عُجْمَة ـ عِجْمَة (إبْهَام):** نادیاری، ئالۆزی، شێواوی، لێڵی، نارێکی

**عَجَمَة(نَوَاة):** ناوك، كرۆك، نێوك، دەنكی رەقی ناو خورماو هەڵوژەو هێندێ شتی تره

**عَجَمِيّ:** ئێرانی، جگە لەکەسانی رەگەز عەرەبی

**عَجَنَ الدَقِيقَ:** شێلای ، کردی بەهەویر

**عَجَنَ فُلاَنٌ:** دەستی خستە سەر زەوی کاتێ بەرزبووەوەو هەستا بەهۆی پیریو نەتوانینەوە

**عَجَنَ علَى العَصَا:** خۆیدا بەسەر گۆچاندا لەرۆیشتنا

**عُجُنٌ:** خەڵکی دەوڵەمەندوخۆشگوزەران

**عَجْنَاء:** وشترێك كەم شیر بێت

**عَجْوَة:** باشترین جۆری خورمایە کەپتر لەشاری (مەدینە) هەیە ، لەسەریەك هەڵچنین‌و دانانی خورما

**عَجُوز:** پیر، بەساڵاچوو، بەتەمەن، کۆنەساڵ، سەرسپی، قەرتبوون، بەساڵاچوون، ئارەق ، بەڵاو نەهامەتی، کەشتی، رێگەوبان، ئەندازە، کەوان، ئاگر، تیاچوون، دارخورما، وشتر

**عَجُول:** خێراکەر، پەلە پەلکەر، بزێو، هەڵەشە، زۆر بەپەلەو خێرا

**عَجِيب:** سەرسوڕهێن، سەرسامکەر، سەیر، لەرادەبەدەر

**عَجِيبَة:** ئیعجاز، کارێکی لەرادەبەدەر

**عَجِيل:** خێرا ، تیژ ، بەگوڕ ، گورج

**عُجَيلَة:** رۆیشتنێکی خێراو بەپەلە ، رۆیین بەتیژی‌و پرتاو

**عَجِين:** هەویر، هەڤیر، هەمیر، ئاردی بەئاو گیراوەی شێلراو

**عَجِينَة:** گێل، کەودەن، گەمژە، نامەرد، ژنانی

## ع د

**عَدَّ:** ژماردی، حسابی‌کرد، ژمارەی‌کرد، وایزانی، وایدانا، قەبلاَنی، خەملاَنی

**عَدَّ الدَّرَاهِمَ وَغَيرَهَا:** پارە وردەکانی ژمارد، حسابی کردن

**عَدَّ فُلاَناً صَادِقاً:** وایزانی راست دەکات، وایدانا لەگەڵیەتی

**عِدٌّ:** ئەو ئاوەی لەبەری دەڕوات‌و وشك ناکات، زۆری هەرشتێك، کۆن، دێرین

**عُدٌّ:** زیبکە، لیر

**عُدُّ الوَرْدِيّ:** زیبکەیەکە لەسەر هەردوو کوڵم‌و لووت دەردەکەوێت

**عَدَا (جَرَى - رَكَضَ):** رایکرد، غاریدا

**عَدَا عَلَيهِ (وَثَبَ):** هەڵمەتی دایە، پەلاماریدا، هێرشی کردە سەر

**عَدَا اللِّصُ عَلَى الشَّيءِ عَدَاءً:** دزی ، بردی

**عَدَا فُلاَناً عَنِ الأَمْرِ عَدواً:** سەرقاڵیکرد، دووری خستەوە

**عَدَا عَلَيهِ:** ستەمی لێکرد، ستەمی کرد بەرانبەری

**عَدَا الأَمْرَ وَعَنْهُ:** بڕی‌و وازی لێهێنا، گوزەراندی‌و دەستبەرداری بوو

**عَدَا (مِنْ أَدَوَاتِ الإِسْتِثْنَاء):** بێجگە ، جگە لە، جگە ، بەدەر، دوور لە

**عَدَّى فُلاَنٌ عَنِ الأَمْرِ:** بەرەلای کردو رۆیی، دەستبەرداری بوو

**عَدَّى الشَّيءَ:** بەجێی‌ی هێشت بۆ هی‌تر

**عَدَّى الشَّيءَ إِلَيهِ:** رێگەیدا،بەسەری برد

**عِدَى:** دوژمن، غەریب، غەوارە، ئەوانەی لەیەکەوە دوورن، کەنارو قەراغی دۆڵ‌و شیو

**عُدَى**: شوێنی بەرزو بڵند، باڵاو بەرز
**عَدَاء - عَدَاوَة**: دوژمنایەتی، ناحەزی، شەڕەنگێزی ، گێچەڵگەریی، رکەبەرایەتی، قینەبەرایەی
**عَدَاءُ**: کاروبارێك سەرقاڵکەربێت بۆ مەردوم لەکاری سەرەکیو بنەڕەتی خۆی
**عَدَاءُ الخَنْدَقِ أو الوَادِي**: ناوەڕاستی، میانەی
**عَدَّاءُ( جَرَّاء )**: راکەر، خۆش رەوت، خۆشرەو
**عَدَاءُ**: یەك گێم راکردن، بەردێك لەسەر شتێك دابنرێو دایبپۆشێ
**عَدَاد**: بەخشین ، زەبزەبەی شێتی، وادەو کاتی مردن، رۆژی خستنە ڕوو
**عَدَالَة( فِي الفَلْسَفَة )**: بەیەکێك لەچاکەو باشەکان دەگوترێت کەفەیلەسوفەکان لەدێرزەمانەوە باسیان لێکردوە 1)دانایی 2)ئازایەتی 3)پاکی 4)دادپەروەریی
**عَدَّ المَيِّتَ ( عَدَّ مَنَاقِبَهُ وَوَصْفَهُ )**: لاوانیەوە، پیاهەڵدا، بۆی لاوانەوە، چاکەو باشەکانی باسکرد
**عَدَّ الشَّيءَ ( أحْصَاهُ )**: ژماردی، ژمارەی کرد، ژمارەی بۆ دانا، سەرژمێری کرد
**عَدَّ المَالَ**: ماڵو دارایی گردو کۆکردەوە
**عَدَد**: ژمارە، ئەژماردە، ژومارە، نمرە، بەسەرکردنی شتی زۆر دانە دانە
**عَدَدٌ أوَّلِيٌ**: ژمارەی خۆبەش
**عَدَدٌ غَيرُ أوَّلِيٍّ**: ژمارەی دابەشی
**عَدَدٌ بَسِيط**: ژمارەی سادە
**عَدَدٌ صَحِيح**: ژمارەی تەواو
**عَدَدٌ كَسْرِيٌ**: ژمارەی جووت
**عَدَدٌ فَرْدِيٌ**: ژمارەی تاك
**عَدَدٌ تَرْتِيبِيٌ**: ژمارەی ریزیەندو یەك لەدوای یەك
**عَدد - عُدد( المَطَر الغَزِيز )**: رەهێڵە، بارانی بەخوڕ ، لێزمەباران
**عَدَسَ فِي الأرْض**: رۆیی، تێپەڕی، گوزەرا
**عَدَسَ فُلاَنَاً**: خزمەتی کرد، لەخزمەتیابوو، پێداویستیەکانی جێبەجێ کرد
**عَدَسَ بِالبَغْلِ**: تێی خوڕی، نەڕاندی بەسەریا
**عُدِسَ فُلاَنٌ**: ئاوڵە لێیدا، تووشی نەخۆشی ئاوڵە بوو
**عَدَس( نَبَاتٌ وَحَبٌ )**: نیسك، دانەوێڵەیەکی وردی پانکەڵەی سوورە دەکرێ بەچێشت
**عَدَسَة - عَدَسِيَة**: هاوێنە، وردبین، گەردبین، زەڕەبین
**عَدَسَةُ العَين**: تۆڕی چاو
**عَدَسَةٌ مُكَبِّرَة**: زەڕەبین
**عَدَسَةٌ (فِي الطِب)**: چاڵی یان زیبکەیەکە لەجەستە دەردێت وەك ئاوڵەو دەگمەنە مرۆڤ لێی قوتار ببێت
**عَدَلَ - عَدُلَ ( أعْدَلَ - قَوَّمَ )**: راستی کردەوە، بەدادبوو
**عَدَلَ فُلاَنَاً بِفُلاَن**: ئاشتی کردنەوە، رێکی خستن

**عَدَلَ عَنِ الطَرِيقِ**: لایدا، دوورکەوتەوە، پەڕاگەندەکەوت

**عَدَلَ فِي أَمْرِهِ** : جێگیر بوو، چەسپا، وەستا، راما

**عَدَلَ فِي حُكْمِهِ**: بەدادپەروەرانە فەرمانڕەوایی کرد، دادپەروەربوو لەفەرمانڕەوایدا

**عَدَلَ فُلاَنَاً عَنِ طَرِيقِهِ**: لەوڕێیە گەڕاندیەوە بۆ ڕێگەیەکی دی، پەشیمانی کردەوە بەلایەکی ترا ئاڕاستەی کرد

**عَدَلَ بِرَبِهِ**: هاوتاو هاوەڵی بۆ پەیداکرد، شەریکی بۆ دانا

**عَدَلَ فُلاَنَاً بِفُلاَنَ**: هاوتای کردن، لەجێی یەك دانان

**عَدَلَ عَنْ كَذَا**: وازی لێهێنا، دەستی لێهەڵگرت

**عَدَلَ عَنْ رَأيِهِ**: پەشیمان بووەوە، پاشگەزبووەوە، گۆڕی

**عَدَلَ عُدُولاً إِلَيهِ**: گەڕایەوە،پەشیمان بووەوە، پاشگەزبووەوە، ژێوان بوو

**عَدُلَ**: دادپەروەربوو، مافپەروەربوو، مافی پاراستو بەرگری لێکرد

**عَدَّلَ**: چاکیکرد، ڕێکی خست، هێواشی کردەوە، دایمرکانەوە، خاوی کردەوە

**عَدَّلَ المَتَاعَ**: کردی بەدووبەش، دووتایکرد

**عَدَّلَ الحُكْمَ (بَدَّلَهُ ـ خَفَفَهُ)**: گۆڕی، سووکی کرد، کەمی کردەوە

**عَدَّلَ الشِعْرَ**: ڕێکی کرد، هاوسەنگیکرد

**عَدْل**: دادپەوەریی ، داد، راستی، دروستی، بریتیە لەپێدانی ماف بەتاکەکانو لێسەندی ئەو ئەرکو فرمانو داوایەی لەئەستۆیاندایە، هاوتا، هاوشێوەو چەشن، پاداشت، چوونیەکی، یەکسانی، راستکردنەوە، دادمەند، قوربانی

**عِدْل**: هاوشێوەو هاوچەشن، تایەکی بار کەدەنرێت لەئاژەڵو ولآخ، جەواڵ ، هۆڕ، توورەکە، خورج، تا، هاو، وەك، وەکو، هاوشێوە

**عَدَل**: ڕێککردنی دووتای بارێك، بەرانبەرکردنی دووتا

**عَدِل**: دادپەروەر، مافخواز، راستگر، سەرڕاست

**عَدْلَة**: ژنی دادگەر، ژنی مافخواز

**عَدَلَة ـ عُدَلَة**: ئەوانەی پاکیو بێگەردی گەواهی دەران دەچەسپێنن

**عَدِمَ الشَيءَ( فَقَدَهُ )**: ونیکرد، لەکیسی چوو، لەدەستی چوو، نەیما

**عَدِمَ المَالَ**: ماڵەکەی لەدەستدا، لەکیسیدا

**عُدِمَ (إِنْعَدَم ـ فُقِدَ )**: ونبوو، لەکیس چوو، نەما، فەوتا

**عَدَم ـ عُدْم ـ عُدُم**: لەدەستدان، لەکیس چوون، فەوتان

**عَدَم (مَالاَ وُجُودَ لَهُ )**: هیچ ، نەبوون

**عُدْمُ**: هەژاری، نەداریی، گەدایی

**عَدَمِيّ**: پەیڕەوی بیروباوەڕی عەدەمی کەبوون پوچەڵ دەکەن لەگشت مەبەستو مەرامێك

**عَدَنَ بِالْمَكَان**: مایەوە، جێنشین بوو، هەڵیکرد

**عَكَظَ خَصْمَهُ بِالحُجَجِ (قَهَرَهُ):** شكستى پێهێنا ، دۆڕاندى ، لێى بردەوە
**عَكَظَ الدَّابَةَ:** بەندى كرد، گرتى
**عَكَظَهُ عَنْ حَاجَتِهِ:** لەپێويستى خۆى دووريخستەوە
**عَكَفَ عَلَى كَذَا(إِنْهَمَكَ فِيهِ وَلاَزَمَهُ):** خووى پێوەگرت، دەستى لێهەڵنەگرێ
**عَكَفَ عَلَى (إِنْكَبَّ عَلَى):** خۆى دا بەسەريا، سوربوو لەسەر
**عَكَفَ فِي المَكَانِ:** مايەوە لێى، نيشتەجێبوو تێيدا
**عَكَفَ فِي المَسْجِدِ:** لەمزگەوت مايەوە بەنيازى ئەنجامدانى بەندايەتى
**عَكَفَ عَلَى الشَّيءِ:** رووى تێكردو بەرى نەدا، گرتيە بەرو وازى لێنەهێنا
**عَكَفَ القَومُ حَوْلَهُ:** دەورو خوليـاندا، دەوريان گرت
**عَكَفَ فُلاَنَاً عَلَى كَذَا:** بەنديكرد بۆ ...، بەگيرى هێنا بۆ ...
**عَكَفَ فُلاَنَاً عَنْ حَاجَتِهِ:** گيريدا، نەيهێشت، رێگەى لێگرت
**عَكَّفَ الشَّيءَ:** لارى كـردەوە، خوارىكرد
**عَكَّفَ الشَّعَرَ (جَعَّدَهُ):** لوولى كرد، بايدا
**عَكَّفَ القَومَ عَنْ كَذَا(حَبَسَهُم):** گيريدان، بەندى كردن، رێگەى نەدان
**عَكَفَ (الشَّعْرُ المُجَعَّد):** قژى لـوول ، قژى لوولو هۆنراوە
**عَكَلَ عَلَيهِ الأَمرُ:** لێى ئـاڵۆزبوو، تێكەڵبوو لێى ، شێوا بەسەريەكا
**عَكَلَ فُلاَنٌ فِي الأَمرِ:** راى خـۆى وت، راى خۆى دەربڕى

**عَكَلَ الشَّيءِ:** كـۆى كـردەوە دواى پەرتەوازە بوونى
**عَكَلَ المَتَاعَ:** لەسەريەك گـردى كـرد، هەڵيچنىو كۆى كردەوە
**عُكْلُ(اللَّئِيم):** بێسفەت، سپڵە، هيچو پووچ ، نزمو سووك
**عَكَمَ (جَمَعَ وَشَدَّ):** كۆيكـردەوە، بەستى، شەتەكيدا، توندیكرد
**عَكَمَ ـ عَكَمَاً (سَمِنَ):** قەڵەوبوو، گۆشتنبوو، گۆشتى گرت
**عَكَمَ فُلاَنٌ (إِنْتَظَر):** چـاوەڕێبوو، وەستا، راما
**عَكَمَ المَتَاعَ (شَدَّهُ بِالعِكَامِ):** بەپەت يان گوريـس بەسـتىو شـەتەكيدا، بەرابەريكرد، هاوسەنگى كرد
**عَكَمَ عَنْ كَذَا (إِمْتَنَعَ أَو كَفَّ عَنْ):** وازى هێنا، نەيكرد، دەستى لێهەڵگرت
**عِكَامُ (مَا شُدَّ وَجُمِعَ):** بەسـتراو، پێچراو، كۆ، گوريزەكراو
**عِكْمٌ:** جلو بەرگ، پەتى بير
**عَكَنَ البَطْنُ(تَثَنَّى لَحْمُهُ سِمَنَاً):** ورگى لۆچى تێكـەوت لەقەڵەويدا، داكـەوت، شۆڕبووەوە
**عَكَنَتْ الشَّيءِ:** لەسەريەك كۆبووەوەو لۆچو لوول بوو لەسەريەك
**عُكْنَةٌ:** لۆچى سك، ورگ داكەوتن، ورگ شۆڕبوونەوە
**عَكُوب:** تەپو تـۆز ، كنگر ، گيايەكى بەهارييـەو دەخورێـتو دەكرێـت بەچێشت
**عَكْوَةٌ:** بناغەو بنەچەى كلـك، بێخـى زمـان، كونێكـە لەچەناگـەى منـاڵى گچكەو پچووكدا

**عُكْوَة:** زۆرینەی شت، ناوەڕاست، ڕاستی هەرشتێك، بێخی زمان
**عَكِيَ:** یەكێك زۆر شیر بخوات
**عَكِيس:** جۆرە شۆربایەكە لەشیرو برنج یان ئارد دروستدەكرێ، شیرەوا

## عل

**عَلٌ (لَعَلَّ - عَسَى):** خۆزگە، رەنگە، كاشكی، لەوانەیە
**عَلَّ - عَلاًّ - وَعَلَلاً:** جارێكی تر خواردیەوە یاخود یەك بینە خواردیەوە
**عَلَّ فُلاَن عَلاًّ (مَرِضَ):** نەخۆشكەوت، ناساغ بوو، تەندروستی خراپ بوو
**عَلَّ فُلاَنَاً - عَلاً:** جارێكی دی ئاوی پێدا، بۆجاری دووەم ئاوی دایە
**عَلَّ فُلاَنَاً ضَرْبَاً:** بەزللە دایگرتەوە، لێیدا
**عَلَّ اللهُ فُلاَنَاً (أَمْرَضَه):** خوای گەورە نەخۆشی خست، نەخۆشی خستە ئەستۆی
**عُلَّ الإِنْسَانُ عِلَّة:** نەخۆشكەوت، ناساغبوو، باری تەندروستی خراپ بوو
**عَلٌّ:** یەكێك پێستی جەستەی كرژ بووبێتەوە بەهۆی نەخۆشیەوە، ئەوەی زۆر سەردانی ژنان دەكات، پیرو پەككەوتە لەهەمووشتێك، جەستە لەڕو لاواز
**عَلاَ الشَّيء عُلواً:** بڵندو بەرزبوەوە، بالآبوو
**عَلاَ الرَّجُلَ:** زاڵبوو بەسەریا، شكستی پێهێنا
**عَلاَ المَكَانَ وَبِه:** سەریخست، بالآیكرد، بەرزی كردەوە

**عَلاَ الدَّابَة:** سواری بوو، چوە سەر پشتی
**عَلاَ فِي الأَرْضِ:** خۆی بەزلو گەورە دانا، خۆی بەگەورە زانی
**عَلاَ بِه:** بەرزی كردەوە، بڵندی كرد
**عَلاَ الأَمْر وَلَهُ:** توانی، لەتوانایا هەبوو، دەستەلآتی بەسەریا هەبوو
**عَلاَ بِالأَمْر:** سەربەخۆبوو تێیدا، ئازادبوو
**عَلاَ قِرنُهُ:** دیاریدا، دەركەوت، ئاشكرابوو
**عَلاَ وَعَلِيَ فِي المَكَارِمِ:** بالآبوو، پایەداربوو پێی
**عَلَى (حَرف جَر):** سەر، لەسەر، بۆ، لەپێناو، لەبەر، لە، سەرەڕای، لەگەڵ، شكاتی لێكرد
**عَلَى ذَوْق أو عَقْله:** بەئارەزووی خۆی، بەپێی حەزو ئەقڵی خۆی
**عَلَى مَا (عَلاَم - لِمَاذا):** بۆ، بۆچی، بۆچ، لەبەرچی، لەسەرچی
**عَلَى حِينِ غَفْلَة (فَجْأَة):** كوتو پڕ، لەناكاو
**عَلَى ضَوءِ كَذَا:** لەشێوەو چۆنیەتی ئەودا، لەژێر ڕۆشنایی ئەوەدا، بەگوێرەی، وەك
**عَلَى عَهْدِ فُلاَن:** لەسەردەمی ئەودا، لەسەردەستی، لەرسەر ڕێی فلآندا
**عَلَى وَشْك:** خەریكە، نزیكە، ئەوەندەی نەماوە، هاكا، وەختە
**عَلَى السَطْح:** چوە سەریان، چوە سەرەوە، هەڵچوو
**عَلَى الشَّيء:** بەرزی كردەوە، بڵندیكرد

**عَلَى الكِتَابَ ( عَنْوَنَهُ ):** ناونیشانی بۆ دانا، ناونیشانداریکرد

**عَلَى وَأعْلَى المَتَاعَ عَنِ الدَّابَةَ :** لەسەری دایگرت ، دایبەزاند

**عَلَّى اللهُ فُلاَناً :** بەرزیکردەوە، بالآیکرد

**عَلاَء ـ عُلَى :** بەرزی، بلّندی، ریّز، شەرەف

**عِلاَج :** چارەسەر، چارە ، دەوەرەکردن، دەرمان ، چاککار، چاکار

**عُلاَس :** خواردن، ئەوەی دەخوریّت

**عِلاَط :** لای گەردن ، نیشانەیەکە لەسەر گەردن وەك میّلیّك یان زیاتر، پەتیّکە لەدەوری گەردن

**عَلاَّف :** ئالیك فرۆش ، کافرۆش

**عَلاَقِ( إسْم فِعل أمْر بِمَعْنَى تَعَلَّقَ ):** پیّوەی بەسترا ، پابەندبوو

**عَلاَق :** دۆلّچەی گەورە، بەرکولّ، ئەوەی پیّش ژەمەکان دەخوریّ

**عَلاَقَة :** پیّوەند، خۆشەویستی، خزمایەتی ، دۆستایەتی، ئاشنایەتی، هاوریّیەتی، خۆشەویستی، ئەوەی پابەندە بە مرۆڤەوە لەمالّو ژنو منالّ، بەرژەوەندی، لەنێوانا، پەیوەستی، ناریّکی، ناحەزی، ناکۆکی، ئەو خۆشەویستیەی لەنێوجەرگەی دلاّ جیّگیر دەبیّت

**عَلاَقَة ( فِي عِلم البَيَان ):** لەرەوانبیّژیدا بریتیە لەو پەیوەندییەی لەنێوان مانای راستەقینەو مەبەست لەمەجازو تویّکلّداردایە

**عَلاَّقَة :** هەلّواسەر

**عَلاَّقَة الثِّيَاب :** بەرگ هەلّواس

**عِلاَقَة :** ئەوبەروبوومەی بەدارو درەختەوە شۆربوەتەوە

**عُلاَك ـ عَلاَك :** ئەوەی بجوریّ، بنیّشت، جاچکە ، بەنوشت، بەنیشت، جاچك، ویّژەن، شتیّکی سپی جیری بەکیّشە لەدارەبەن یا دارە قەزوان پەیدا دەبیّ؛ لەبەهاردا دارەکە بەتەشوێ بریندار دەکریّو لەقوری کۆجیلەتیکی دروست دەکەنو بەبەر شویّنە برینداره‌کەیەوە دەنیّن تا پایز پڕ دەبیّ لەشیلە پیّیی دەلّیّن بنیّشتە تالّ کەشلّو تالّە لەدواییدا لە مەنجەلیّکدا دەدلّۆپیّنریّو لەناو کیسەیەکی خامی دەکەنو دەنینیّرنە بازار

**عَلاَّك :** بنیّشتو جاچك فرۆش

**عُلاَلَة :** پاشماوەی هەرشتیّك، ئەوەی جیّگەی رابواردنو خۆشی دەربڕینە، جار لەدوای جار راکردنو هەلّهاتن ، دۆشینی ئاژەلّ لەچیّشتەنگاودا لەنێوان دۆشینی بەیانیو ئیّواراندا

**عَلاَمَ ( لِمَاذَا ):** لەسەرچی ، بۆچی ، لەبەرچی

**عَلاَّم ـ عُلاَّم ـ عَلاَمَة ـ عَلاَّمَة :** زۆر زانا ، فرە زاناو شارەزا ، زانیار، زانا، زۆرزان،تیّگەیشتوو، مەلاچاك، زاناو شارەزا سەبارەت بەرەچەلّەكوبنەچە، باز

**عَلاَمَة :** نیشانە، هیّما ، خالّ، دروشم ، ئامار، شەقلّ، پەیوەندی، ریّنیشاندەر، ئاردی سفرو ورد، نیشانەی جیاکەرەوەی نێوان دوو زەوی

**عَلاَمَة (فِي الطب):** لەپزیشکیدا بەو نیشانانە دەوترێت کەوا پزیشکی پشکنەر دەیدۆزێتەوە لەنەخۆش
**عَلاَّمَة:** زۆرزان، فرە زاناو شارەزا یەکجار لێزانو شارەزا
**عَلاَمِيٌ:** زیرەكو زرنگ
**عَلاَنِيٌ:** لەڕوو، بەئاشکرا، دیارو بەرچاو
**عَلاَنِيَة:** ئاشکرا ، دیار، بەرچاو، روونو ئاشکرا، لەڕوو، واژووی نهێنیە
**عِلاَوَة:** سەربار، سەلاّو، سەرباری مووچە، زیادەی مووچە، ئەوەی دەنرێت لەولاّخ دوای تەواو بارکردنیو زیادەیەکە
**علاوَةً عَلَى:** سەرەڕای ، وێڕای ، لەگەلّ ئەوەشدا
**عِلاوَة الذَهَب (فِي الإقتِصَاد):** لەئابوریدا بریتیە لە زیادبوونی نرخی بەسەر ڕێژەو رادەی یاسایی خۆیەوە
**عَلاوَة دَوْرِيَة:** بۆ کارگەرو کرێکار ئەو زیادەیەیە کەوا لەسەر موچەی زیاد دەکات هەر دوای ماوەیەك گوزەران بەسەر ئیشو کارەکەیدا
**عَلاوَة تَرفِية:** بریتیە لەبەرزکردنەوەی پلەوپایەی کارگەر لەئاستێکەوە بۆ ئاستێکی بەرزتر
**عَلاَيَة:** هەرپلەوپایەکی بەرزو بالاّ
**عَلَبَ الشَيء:** وشك بوەوە، رەق بوو
**عَلَبَ اللحمُ:** بۆنەکەی گۆڕا، وشکبوەوە
**عَلَبَ الشَيء عَلبَاً وَعلُوبَاً:** رووشانی ، برینداریکرد، هێلّی لێدا، نیشانەیکرد، شوختی تێکرد
**عَلِبَ الشَيء:** رەقو وشك بوو
**عَلِبَ يَدَه:** دەستی رەق بوو، توندبوو

**عَلبَ الحَيَوَان:** نەخۆشو دەردێك دای لەگێپەڕەی ملیو شکاندی
**عَلِبَ السَّيفُ:** درزی تێبوو، شکا، کەرتبوو
**عَلَبَ(عَبَأَ فِي العُلبَة):** خستیە قوتوەوە، دایگرتەوە
**عَلَبَ الرَّجُل:** سندوقێکی دانا، هەیبوو
**عَلَبَ السَيفَ وَنَحْوَه:** خستیە سندوقەوە، هەلّیگرت
**عَلَبَ الشَيء:** کاری تێکرد
**عَلَبَ الفَاكِهَةَ واللحمَ وَالخضر وَنَحْوَهَا:** میوەو گۆشتو سەوزەی کردە قوتوەوە هەتا بەشێوەیەکی تایبەت بیپارێزێ
**عَلْبٌ:** شتێکی رەقو پتەو، شوێنەوار، ئەوزەوییەی هیچی تیا ناڕوێت
**علْبٌ مِنَ الأَرْض:** وشکە زەوی ، پیاوێکی وشكو رەق
**عِلبٌ:** تایبەتمەندییەکە دەدرێت پالّ بزنە کێویو بەرانو مامز ، زەوییەکی وشكو رەق ، پیاوێکی رەقو وشك
**علبَاء (عَصَبَة فِي صَفحَة العُنُق):** گێپەڕەی مل
**عُلبَة (إنَاءٌ يُعَلَّب فِيه):** قوتوو، تەنەکە، دەفر، خلّێف ، قۆدی ، گەروانك ، مەخمەر، شتێکی بۆشی سەرقاپدارە لەتەنەکە یاشتیتر دروست دەکرێو شتی تێدەکرێ
**عَلّة:** نیاز، پێویستی ، هەوێ
**عِلَّة:** دەرد، نەخۆشی، زەدە ، خەوش، شورەیی ، کەمو کوڕی ، هۆ ، بیانوو، پەلّپ

**عِلَّــة (عِنْــدَ الفَلاســفَة)**: لـــەلای فەیلەسوفەکان هەرشتێك کاردانـــەوەو کـارێکی لێبکەوێتـــەوە بەســـەریەخۆیی یان بەدانەپاڵی شتێکیتر ئـەوا هۆیەکـە بۆ ئـەوکارەو کارەکـەش هـۆداری ئـەو دەبێ

**عِلَّة (عِنْدَ العَروضِيِن)**: لای هۆنـراوە زانـەکان بریتیـە لـە گۆڕانێك لەبـەیتو بەشێکیدا

**عَلَثَ الشَيء**: کۆیکردەوە، تێکەڵیکرد

**عَلَثَ القَومُ**: شـەڕیان کـرد ، دژایـەتی یەکیانکرد

**عَلَثَ بِه**: گرتی، لەخۆی گرت

**عَلَثٌ**: ئـەو خواردنـەی تێکـەڵ بەگـەنمو جۆ دەکرێ

**عَلـثٌ**: ئـەوەی دەدرێتـە پـاڵ جگـە لەباوکی

**عُلثَة**: مووچەو بژێویدەر

**عَلَثـت النَفـسُ**: شـێوا ، تێکـەڵبوو، دایبەسەریەکا

**عَلَثـت الشَــيء**: دای بەســـەریەکا، ئاوێتەیکرد، تێکەڵ بەیەکی کرد

**عَلَجَ فُلاَنَاً عَلجاً**: زاڵبوو بەسەریا

**عَلَجَ النَاقَة عَلَجَانـاً**: دایبەسـەر یـەکا، بشێو بوو، ناتەواو بوو

**عَلِجَ**: توندبوو، ڕەق بوو

**عِلج(كَافِر)**: گومڕا ، بێئایین ، کـافر ، بێبڕوا ، یاخی

**عِلـجٌ**: گوێدرێــژ ، گوێدرێــژی کێــوی ، قەڵەو بەهێز، قەڵەو بەهێز، پیـاوێکی کەتەو بەهێز

**عَلج ـ عِلج ـ عُلَجُ ـ عَلَجُ**: پیاوێکی تونـد چارەسەری کێشەو گیروگرفت بکات

**عَلَجَان**: درەختێکـی گچکەیـە لـەبیابان دەڕوێـتو بۆنێکـــی خۆشـــی هەیـــە، وردەمێروولە

**عُلجَان**: کۆمەڵە مێروولەیەکی بچووكو ورد

**عَلجَم**: ئەستێركو پەنگاوێکی فرە ئاو ، وشتری درێژی سوور

**عُلجُم**: زۆر ڕەش ، فرە ڕەش

**عُلجُوم**: فرە ڕەش ، ماکەرێکی قەڵـەوو تێکســـمڕاو ، ئـــاوی بەلێشـــاوو زۆر ، نێرینەی بۆقو مراوی

**عَلِدَ الشَيء**: تونـدو ڕەق بـوو، تۆکمـەو بەهێزبوو

**عَلَـدٌ**: ڕەگـی مـل ، ڕەقو تۆکمـــەی هەرشـــتێك ، ڕوەکێکـــە لـــەبیاباندا دەردێتو ئاژەڵ دەیخوات

**عَلِزَ**: دوو دڵبوو ترسا ، گومان بـەرۆکی گرتو تۆقی

**عَلِزَ إلَی الشَيء(مَال ـ إشتَقَ)**: ڕووبـە ، سەربە ، ئالوودە، حەزکردوو لە

**عَلَس ـ عَلسَاً(أكَلَ وَشَرِبَ)**: خـواردیو خواردیەوە

**عَلَس الرَجُل(صَخِبَ)**: هـاوارو قیـژەو هەرایکرد، دەنگە دەنگی کرد

**عَلَسَ الإبِـلُ**: کـەوت بەســەر ئـەوەدا کەدەیخوات

**عَلَسَ الـدَاءُ (إشتَدَ وَعَظُمَ)**: سـەختو توندبوو، ڕەقو گران بوو

**عَلَس فُلاَنٌ(صَخِبَ)**: دەنگە دەنگی کرد، هەرای بەرپاکرد

**عَلَسٌ**: خواردنو خواردنەوە

**عَلَــس**: جـۆرە خواردنێکـــی خـــەڵکی (سەنعا)ی (یەمەن)ە

**عَلَسِيٌّ**: پیاوێکی توندو تیژ ، ڕەقو توند
**عَلَّصَت التُخْمَةُ فِي بَطْنِه**: ئازاریدا ، بەهۆی زۆر خۆریەوە سکی دایە ئێش و ژان
**عَلَضَهُ ـ عَلْضاً**: جوولاندی هەتا هەڵ بکێشێ
**عَلَطَ البَعِيرِ**: گەردنی داخکردو نیشانەیەکی لێدا
**عَلَطَ الرَّجُل بِقَبِيح**: قسەو وتەی خراپی دایە پاڵ، قسەی ناقۆلای بۆ هەڵبەست
**عَلَّطَ البَعِيرَ**: هێماکەی لەگەردن کردەوە، سڕیەوە
**عَلَطٌ**: شوێنەواری داخ کردن و نیشانە لەگەردندا، خاڵێکە ژنان بۆ جوانی لەدەموچاویاندا دەیکوتن یان دەیکێشن
**عُلْطَةٌ**: خاڵێکی ڕەشە ژنان لەدەموچاویاندا دەیکوتن یان دەیکێشن بۆ جوانی، ملوانکەیەکی مێخەك
**عَلَفَ الرَّجُل**: زۆری خواردەوە
**عَلَفَ الحَيَوان**: ئالیکی دایە، ئازووی دا، دایبەست
**عَلَّفَ الحَيَوانَ**: خووی پێوەگرت ئالیکی پێ بدات
**عُلُف**: دارێکی بەمەنیە گەڵاکانی وەك تریێ وایە وشك دەکرێتەوەو لەگەڵ گۆشتا لێدەنرێ و دەکرێ بەچێشت
**عِلْف ـ عُلُف**: زۆرخۆر ، فرە خۆر
**عَلَف**: ئالیك ، ئازۆ ، ئالك ، چلمسی ، چلمساندن، مووچەکاو جۆیەکە کەبدرێ بەولاخ و ئاژەلان

**عُلْفُوفٌ**: وشکی پیرو فرە گۆشت ، پیرە پیاوێکی کەتەو زلەی خاوەن قژێکی درێژو شۆڕ
**عَلَقَ الصَّبِي**: پەنجەکانی مژی
**عَلَقَ البَهِيمَةُ الشَجَر عَلْقاً**: گەڵاکانی خوارد
**عَلَقَ فُلاَنٌ فُلاَناً**: پێشی کەوت لەبواری بەدەستهێنانی ئەوشتانەی دەبنە مایەی شانازی
**عَلَقَ فُلاَنٌ فُلاَناً ( شَتَمَه )**: قسەی پێگوت، هات بەسەریا
**عَلِقَ( إِسْتَمْسَكَ )**: نووسا ، لکا ، پێوەی نووسا، پیالکا ، پێوەی گیرسایەوە
**عَلِقَ قَلْبَه بِه ( أَحَبَّهُ )**: دڵی پیاچوو ، خۆشی ویست ، گرفتاری بوو
**عَلِقَ يَفْعَلُ كَذَا**: دەستی پێکرد، دەستی دایە، شانی پیاکرد
**عَلِقَ دَم فُلاَن**: کوشتی، لەناوی برد، تیایبرد
**عَلِقَ الشَّوكُ الثَّوبَ**: دڕکەکە چوو بەجلەکانیدا، دڕك چوو بەجل و بەرگەکەیدا
**عَلِقَ الإِنْسَانُ وَغَيرَه**: زاروو نووسا بەگەروویدا لەکاتی ئاوخواردنەوەدا
**عَلَّقَ الشَيء بِالشَيء وَعَلَيه**: لەسەری داینا ، وابەستەی کرد پێوەی
**عَلَّقَ بَاباً عَلَى دَارِه**: چەسپاندی، بەستی، داینا، دایمەزراند
**عَلَّقَ الأَمر ( أَرجَأَهُ )**: دوایخست ، خستیە دواوە
**عَلَّقَ بِه ( رَبَطَ )**: پیاهەڵواسی، پێوەی بەست ، پابەندی کرد پێوەی

**عَلَّقَ القَاضِي الحُكم**: دادوەرەکە بڕیارەکەی هەڵسپارد، بڕیاری نەدا

**عَلَّقَ عَلَى البَهِيمَة**: ئالیکی پێدا، ئاژووی دایە

**عَلَّقَ عَلَى كَلَام غَيرِه**: قسەو وتەی کرد لەسەری بەرەخنە یان ڕوونکردنەوە یاخود ڕاڤەکردنو ڕاستکردنەوەیان هەڵهێنجانو ڕادەربڕین

**عَلَّقَ أَهَمِيَّة عَظِيمَة عَلَى (أعطَى أَهَمِيَّة)**: گرنگی پێدا، بایەخی پێدا

**عَلَّقَ فُلَان إِمرَأَة**: حەزی لێکرد، دڵی پیاچوو

**عَلَقٌ**: زەرو، زاڵوو، زوورك، زێروو، کرمێکی ڕەشی ئاویی دەم تیژە خوێنی پیس دەمژێ لەلەشی مرۆڤیان، خوێنی بەستوو، زوریەری ڕێ، پینەی جلو بەرگ کەپێوەی دەکرێ، ئەو قوڕەی بەدەستا دەنووسێ، ئەوەی هەڵدەواسرێ

**عَلْقٌ**: درەختی دەباخ کردن

**عِلْقٌ**: بەنرخ، گرانبەها، گرانبەهای هەرشتێك کەوا دڵ پابەندبێت پێوەی

**عُلْقَة**: بەرکول، ئەوەی بژێوی پێدەڕوات بەرێوە، دارێکە لەزستاندا دەمێنێتەوەو حوشتر پێی دەژی هەتا بەهار

**عِلْقَة**: جلو بەرگی گرانبەها، یەکەم جلو بەرگ بۆ منداڵ بدورێت، کراسێك بێقۆڵو گیرفان، دارێکە لەدەباخ کردندا بەکار دەبرێ

**عَلَقَة**: زەرو، زاڵوو، زێروو، خوێن

**عَلقَمَ الشَيء**: تاڵبوو، خۆش نەبوو

**عَلقَمَ الطَعَام**: شتێکی تاڵی تێکرد

**عَلقَم**: تاڵ، تاڵکە، هەمووشتێکی تاڵ، تەهل، تاڵ، تێڵ، گوژاڵك، گوژاك، گیایەکی کێویو هاوینیە بەبرکەو بەرەوە هەر لەشووتی دەچێ بەرەکەی هێندەی نارنجێکی لێدەیو زەرد دەبێو دووجۆرن: نێرەو مێیە

**عَلَكَ (مَضَغَ وَلَاكَ)**: جووی، جاووی، جاکاندی، ژاویی

**عَلَكَ نَابَيه**: بەیەکێکیان ئەوی تری خوراندو دەنگێکی لێبەرزکردەوە

**عَلَكَ الدَّابَة اللِجَام**: گازی لەلغاوەکەی گرت لەدەمیا

**عَلَكَ مَالَهُ**: بەباشترین شێوەی مامەڵەی پێوە کرد

**عَلَكَ يَدَيه عَلَى مَالَه**: دەستی پێوەگرتو خەرجی نەگرت، دەستی توند نوقاندو لەبەخیلییو ئێرەییدا نەیبەخشیو خەرجی نەکرد

**عَلَكَ العَجِين**: توند شێلای، بەتوندی شێلای

**عِلْك**: ئەوەی بجوورێ، بنێشت، جاچکە

**عَلِك**: خواردنێکە کەجووینی سەختو گرانە

**عَلِكَة**: زەوییەك ئاوی لێوە نزیك بێت، ئەو کەفو ئاوەی لەدەمی حوشتر دێتە دەرەوە لەکاتی دەنگ لێبەرزبوونەوەدا

**عَلَّلَ فُلَان**: جار لەدوای جار ئاوی دایە، جار لەدوای جار بەرووبوومی چنیەوە، یەك بینە ئاوی دایە

**عَلَّلَ**: ڕوونی کردەوە، هۆی دەرخست، پاساوی دایەوە

**عَلَّلَ النَفس بِكَذَا ( تَمَنَّى ):** ئاواتی خواست ، خۆزگەی کرد
**عَلَّلَ فُلاناً بِطَعَام أو غَيره:** سەرقاڵیکرد پێوەی ، خەریکی کرد
**عَلَّلَ الشَيء:** هۆکەی دەرخستو بەبەڵگە سەلماندی
**عَلَّلَ فُلاناً:** لەنەخۆشیو ناساغیەکەی چارەسەری کرد، چاکی کردەوە
**عَلَّلَ الكَلِمَة:** رووی گۆڕانی وشەکەی دەرخست
**عَلَلُ:** بۆ جاری دووەم خواردنەوە
**عَلَمَ ـ عَلَّمَ:** خاڵی کوتا ، نیشانەی دانا
**عَلِمَ الأَمر:** فێربوو، فێری بوو ، زانی ، لێی روون بوو
**عَلِمَ الشَيء عِلماً:** زانی، ناسی ، شارەزای بوو، هەستی پێکرد ، تیپی گەیی
**عَلِمَ الشَيءَ حَاصِلاً:** دڵنیابوو لێی، بەراستی زانی
**عَلِم الشَفَة:** لێوی قڵیشا ، درزی برد
**عَلَّمَ ( هَذَّبَ ):** فێرە رەوشتی کرد، پەروەردەیکرد ، دەرسی دادا، تەمێیکرد
**عَلَّمَ العِلمَ أو الصنعَة( جَعَلَه يُعلمُها ):** فێری کرد، رامیکرد
**عَلَّمَ لَهُ عَلامَة:** نیشانەیەکی بۆ دانا هەتا پێی بیناسێتەوە
**عَلَم( رَايَة ):** ئالا ، بەیداخ ، بەندێر، بەیرەق ، بێراق ، ئاڵە ، درەوش، پارچە تەنراوێکی رەنگاو رەنگە ئەکرێ بەسەری دارێکی درێژاو لەسەر کۆشکی دەوڵەتیی هەڵ دەدریو هەر دەوڵەتەی جۆرە بەیداخێکی هەیە
**عَلَم:** شوێنەوارو نیشانە، جیاکردنەوەی دوو زەوی، هێمایەکە لەسەر رێگە دادەنرێ بۆ رێنومایی کردن، وێنەیەکە لەجلو بەرگدا، گەورەو سەرداری گەلو نەتەوەیەك، چیاو شاخ
**عَلَمُ( عَالَم ):** جیهان ، گێتی ، گەردوون
**عِلم:** زانیاری ، زانین ، فێربوون ، خوێندەواری، زانست ، دیارناو، ئاگاداری، ئاگالێبوون ، زانینی راستەقینەی شتێك ، نورێکە خوای گەورە دەیخاتە دڵی ئەو بەندانەوە کەخۆشی دەوێن ، بەوگەلە باسو خواسە دەوترێت کەیەك رووگەو مەبەست کۆی دەکاتەوە
**عِلمُ الإجتِمَاع:** کۆمەڵناسی، زانستی کۆمەڵناسی
**عِلمُ الأَصوَات:** ئاوازناسی، دەنگ ناسی
**عِلمُ الحَيَاة:** ژیانناسی
**عِلمُ الحَيوَان:** زیندەوەرزانی
**عِلمُ الزِرَاعَة:** کشتوکاڵزانی
**عِلمُ الصِحَة:** تەندروست زانی، تەندروستی
**عِلمُ الفَلَك:** گەردوون ناسی، هەسارە ناسی
**عِلمُ الكَون:** جیهانناسی
**عِلمُ النَبَات:** گیاناسی، گژوگیا زانی
**عِلمُ السِيَاسَة:** سیاسەت زانی، رامیاری
**عِلمُ التِجَارة:** زانیاری بازرگانی
**عِلمُ الإقتِصَاد:** ئابووری زانی، ئابووری ناسی
**عَلمَاء:** ژنێك لێوی قڵیشابێت ، لێو داقڵیشاو ، قەڵغان ، مەتاڵ

**عِلمَاد:** ئەوەی دەزوو خوری لەسەر لوول دەکرێ ، مەکۆ
**عِلمَانِيّ:** واژووی ئاینی‌یە ، نائاینی ، عەلمانی
**عُلمَة ـ عَلَمَة:** قلێشاوییەکە لەلێوی سەرەوەی مرۆڤدا
**عِلمِيّ:** بیردۆزی ، زانیاریانە، زانستی، قوتابخانەیی، خوێندمەنی
**عَلَنَ الأَمرُ:** دەرکەوت ، ئاشکرابوو، دیاریدا، واژووی نهێنی‌و پەنهانە
**عَلَّنَ الأَمر:** دیاری کرد، ئاشکرای کرد ، دەریخست
**عَلَنَاً (جَهْرَاً):** بەئاشکرایی ، بەدیار چاوەوە
**عُلَنَةٌ:** ئەوەی زۆر نهێنی ئاشکرا دەکات
**عَلَنِيّ(جَهْرِيّ):** لەڕوو، ئاشکرا ، دیار
**عُلُو مِن كُلِّ شَيء:** بەرزترین ، بڵندترین
**عُلُوّ:** خۆبەزلزانین‌و ستەمکاری
**عَلُوس:** خواردن ، خواردەمەنی
**عَلُّوص:** ئینتەلاو ژانەسك، گورگ
**عَلُوفَة:** دابەستراو، ئالیك دراو، ئەو ئاژەڵانەی بۆ گۆشت بەخێو دەکرێن
**عَلُوق:** شتی پەیوەست بەمرۆڤەوە ، مەرگ ، بەڵاو نەهامەتی
**عَلُول:** خواردنێکە سووکە دەدرێت بەنەخۆش
**عُلُوم:** سەرجەم زانستە مرۆڤیەکانە سەبارەت بەزانیاری سروشتی‌و خوداوەندییەکان
**عَلوَنَ الكِتَابَ:** ناونیشانی بۆ دانا ، ناونیشانی پێدا

**عَلَوِي:** ئاسمانی، بالآیی ، بەهەشتی
**عَلِه ـ عَلِهَاً:** سەرسام بوو، تووشی سەرسوورمان‌و سەراسیمە هات ، لەترسا روحی سپاردو تۆقی، نەفسی گەندەڵ‌و لاواز بوو، غەمباربوو، بوو بەمایەی گلەیی‌و گازندە
**عَلَهٌ:** غەم ، خەفەت ، خراپە
**عَلَّيَ الشَيء:** بەرزیکردەوە ، بڵندی کرد
**عَلِيَ فِي الشَرَف:** بەرزبوەوە، بڵندبوو، بالآبوو
**عَلِيَ فِي المَكَارِم:** پلەوپایە بەرزبوو، ئاست بەرزبوو
**عَلِيّ:** بەرزو بڵند، بالا ، رێزدار، توند ، یەکێکە لەناوە جوانەکانی خوای گەورە
**عَلِيُ ـ عِلِيُ ـ عَلاَيَة:** مەرشوێنێکی بەرزو بڵند
**عُلْيَاء:** ئاسمان ، شوێنی بەرزو بڵند، سەرەوە
**عَلْيَاء:** بالآخانە، تەلاری بەرز
**عَلْيَان:** زەبەلاح ، کەتەو زلە ، دەنگی زلەو گەورە
**عُلِيَّة:** ژووری سەرەوە، بالآخانە، ژووری بەرز، خوا پێداو ، چینی بالآو سەرەوە، ناوی ئاسمانی حەوتەمە
**عَلِيف:** دابەستراو ، ئالیکدراو ، ئەوئاژەڵەی بۆ گۆشت بەخێو دەکرێ
**عَلِيق ـ عَلِيقَة الدَوَاب (عَلَف):** ئالیك ، ئالف
**عُلَيق ـ عُلَيقِيّ:** روەکێکە هەڵدەچێ لەدارو درەخت ، لاو لاو

**عُلَيقَـة:** دەوەن ، ئـەو پنكەدارانەيـە كـەكورتن هــەر لەناوييــەوە چــەند لكێكيان لێ جـوێ دەبێتـەوەو زۆر بڵنـد نابن ، پنچك ، كوورس ، جەنگەڵ

**عَلِيقَة:** توورەكە ، چارۆكە

**عَلِيـل (مَعْلُــول ـ مَرِيــض):** نـەخۆش ، دەردەدار، زەدەدار، ناســاغ ، لــەش بەبار ، تەندروست نەخۆش‌و گران

**عَلِيلَة:** ژنی نـەخۆش‌و ناساغ ، ژنێكـە بۆنی خۆش لەخۆی بدات بۆ جارێكی تر

**عَلِيم:** زانيـار ، ئاگـادار ، تێگەيشـتوو، يەكێكە لەناوە جوانەكانی پەروەردگار

**عِلِّيُون:** پلەوپايەكی بەرزو بڵندە روحی موسوڵمانانی تيا نيشتەجێ دەبێ

## ع م

**عَمَّ (شَمَلَ):** گرتيەوە، هەمووی گرتەوە

**عَمَّ المَطَرُ الأَرضَ:** زەوی گرتەوە

**عُـمّ :** مــێزەری بەســت ، مــێزەری لەدەوری سەری بەست

**عَمٌّ:** كۆمەڵێكی فرەو زۆر ، برای باوك ، مام

**عَمَّ ـ عَمَّا (عَنْ مَا):** بۆ ، بۆچی ، لەچی

**عَمَى العَمَاءُ المَاءُ وَغَيرَه:** لەبەری رژيی، لێی رۆيشت

**عَمَى المَوجُ:** شت‌ومەكی پاڵ پێوەنا

**عَمَــی البَعِــيرُ بِلُعَابِــهِ:** فــڕێی دا ، تكاندی

**عَمَى إِلَى كَذَا:** چوو بۆلای‌و پێكای

**عَمَى:** كوێری كرد، فريويدا، دەستی بـڕی، خەڵــەتانی، لەخشــتەی بــرد ، بەپێچ‌و پەنا دوا

**عَمَى المَعْنَى:** شاردیەوە، دەری نەخست

**عَمَــی:** كوێــری، نــەبينين، ســۆمايی داهــاتن ، كوێرايــی هــاتن، نــەزانين، دواكەوتوويی، سەرلێشێواويی، نـادانی، گومرايی

**عَمَّا قَرِيب:** پاش ماوەيەكی كەم ، بەم نزيكانە

**عَمَاء:** گومرايی ، وێڵی، سـەرگەردانی، گەواڵە هەور

**عَمَــاءَة:** گومرايی‌و رۆچوون لەبـەتاڵ‌و پڕووپوچدا

**عِمَــاد:** كۆڵەكـە ، پايـە، ئەسـتوونـدە، هەستوون، هاچە، بەگاوركردن، بـەرێز، خـاوەن كەسێتی، سـەرۆكی ســەربازو بەرپرسان

**عِمَادَة:** بيناو كۆشكی بەرزو بڵند

**عَمَّــار:** ديـاری، خـەلات، هەرشــتێك لەسەربكرێ لەمێزەرو كلاّوو ....، رێحانە كـەوا كـۆڕی بـادەی پێدەڕازێنرێتــەوە، سلاّو

**عُمَّــار:** جێنشـينی مــاڵ لەجنۆكــە، جنۆكەی نێو ماڵ

**عَمَّــار:** بـاوەڕدار، لەسـەرخۆ، ئـاغر، بۆنخۆش، ئــەوەی فــەرمان بەچاكــەو رێگری لەخراپە دەكات هەتا دەمرێت

**عُمَــارَة:** كـرێی وەسـتاو بنيادنــەری خانوو لانەو ساختمان

**عَمَــارَة ـ عِمَــارَة:** گـەرەكی گــەورە، ئــاوەدانی، خـــانوو، ســـاختمان، كەڵەخانوو، ماڵ ، تەلاربەند، هۆز، گەلە كەشتی، واژوی كاولەو وێرانەيە

**عَمَاش:** هەر كاروبارێكی قورس‌و گران نـەزانرێ لــەكوێوە ئــەنجام بــدرێ، جەنگ‌و هەراو بەزمی گران‌و سەخت

**عَمّال:** يەكێك فرە ئیش‌و كار بكات ، بەردەوام لەسەر ئیش‌وكار

**عَمالَة ـ عِمالَة ـ عُمالَة:** كرێ، مزی ، رۆژانە مانگانە، كرێی كرێكارو كەسێك خزمەت‌و كارێك پیشەكەش بكات ، پیشەی كرێكاریی

**عِمامَة:** مێزەر، مەندیل، شاشك، سەرپێچ ، پووتك، ئەردی، مەندیلێكی سپی‌یە كەبەسترابێ بەسەرەوە

**عُمان:** ولاتێكە دەكەوێتەسەر كەنداوی عەرەبی‌و دەیاری هیندی

**عَمّان:** پایتەختی ولاتی (ئەردەن)ە

**عَمت فُلانٌ:** كۆچانی وەشاندو گوێی نەدایە بەر هەركەسێك بكەوێ

**عَمَتَ الصُّوفَ وَنَحْوَهُ:** پێچایەوەو بایدا بەباری پانی‌و خڕی‌یدا هەتا لەدەستیا گردبێت

**عَمَتَ حَبْلَ القَتِّ:** بایداو لوولی كرد

**عَمَتَ فُلاَناً:** تورەیكرد، خەشم‌و قینی تاودا

**عَمَّة:** پور، تیتك ، خوشكی باوك، پلك، میمك ، دێدە

**عِمَّة:** شێوازو دیمەنی مێزەرو سەرپێچ

**عَمَجَ ـ عَمْجاً:** لەرۆیشتنا خێرا رۆیی بەرێوە

**عَمَجَ الرَجُل( سَبَحَ فِي المَاءِ ):** مەلەی كرد لەئاودا

**عَمَدَ الشَّيءَ:** كۆلەكەی دایە بەر ، رایگرت ، وەستاندی

**عَمَدَ فُلاَناً:** بەئاسن لێیدا

**عَمَدَ الشَّيءَ ولِلشَّيءِ وإِلَيهِ ( قَصَدَهُ ):** گرتیەبەر، نیازی كرد، چوو بۆ لای

**عَمَدَ المَرَضُ فُلاَناً:** پەرێشان‌و كاریگەریكرد، بێزارو نیگەرانی كرد

**عَمَدَ الأَمْرَ وإِلَيهِ:** بەئەنقەست كردی

**عَمِدَ البَعِيرُ:** كۆپارەكەی ئاوسا بەهۆی زۆر بار هەلگرتنەوە

**عَمِدَ الثَّرَى:** باران تەڕیكردو لەسەریەك كەلَەكەبوو

**عَمِدَ الإِنْسانُ:** نەخۆشی پەرێشانیكرد، پەرێشان‌و جاڕس بوو بەدەست نەخۆشیەوە

**عَمَّدَ الخَيمَةَ:** كۆلەكەو ستوونی بۆ داكوتی، بەكۆلەكەو ستوون هەلیدا

**عَمَّدَ فُلاَناً:** كردیان بەراگرو چاودێر بەسەر خۆیانەوە

**عَمَّدَ السَيلُ:** دەرچەو دەروازەكەی گرت هەتا لەیەك شوێن‌و جێگەدا جەم‌و مۆلَ ببێت

**عَمَّدَ الوَلَدَ:** كردی بە گاور

**عَمَّدَ الشَّوقُ فُلاَناً:** پەرێشانیكرد، دلَی برد، خۆشەویستی پەرێشان‌و سەرگەردانی كرد

**عَمْد:** ئەنقەست ، قەستی، هەوەس، پالَپشت ، كۆلەكە، پەنا

**عَمْداً( قَصْداً ):** بەئەنقەست ، بەدەستی ئەنقەست، بەقەستی، بەئارەزوو

**عُمْدَة:** پشت پێ بەستوو، سەرۆك‌و بەرپرسی سەربازان، كۆلەكە، پالَپشت

**عُمْدَةُ البَلَد:** كوێخا ، گەورەو بەرپرسی شار

**عَمَدَهُ المَرَض:** نەخۆشی سیس‌و پەرێشانی كرد

**عَمَرَ الرَّجُل**: زۆر ژیا ، تەمەن درێژبوو، بەتەمەن بوو، بەساڵاچوو ، ساڵانێکی دوورو درێژ ژیا

**عَمَرَ المَالُ**: ماڵو سامانی زۆر بوو ، دارایی زۆر بوو

**عَمَرَ المَنْزِلُ بِأَهْلِهِ**: ئاوەدان بوو بەجێنشینەکانیەوە

**عَمَّرَ اللهُ فُلاَناً**: خوا تەمەنی درێژ کردو مایەوە

**عَمَّرَ فُلاَنٌ الدَّارَ**: دروستیکرد، بینایکرد، بنیادی نا

**عَمَرَ القَومُ المَكَانَ (سَكَنُوه)**: جێنشینبوون تێیدا

**عَمَرَ المَنْزِلَ**: ئاوەدانی کردەوە، تیادانیشت ، چوە ناوی

**عَمَرَ رَبَّهُ**: خوای پەرست ، بەندایەتی‌کرد

**عَمَّرَ اللهُ فُلاَناً (أَطَالَ عُمْرَه)**: تەمەنی درێژ کرد ، زۆر ژیاندی

**عَمَّرَ الأَرْضَ**: ئاوەدانی کردەوە، ئاوەدانی تێخست

**عَمَّرَ الدَّارَ (بَنَاهَا)**: دروستیکرد، بنیادی نا

**عَمَّرَ المَكَانَ بِالسُّكَانِ**: ئاوەدانی کردەوە، نوێی کردەوە، چاکی کردەوە، پڕی کردەوە

**عُمْر۔ عَمْر۔ عُمُر**: ژیان ، تەمەن ، مافی گیاندارە لەژیاندا، ژین لەجیهاندا

**عُمُر**: مزگەوت ، پەرستگا ، گۆشتی پووك

**عُمُرُ النِّصْفِ (فِي عِلْمِ الطَّبِيعَةِ النَّوَوِيَّةِ)**: لەزانستی سروشتی ئەتۆمیدا بریتیە لەو ماوەیەی ژمارەی گەردیلەکانی رەگەزێکی تیشکدەر دەیخایانێت‌و تێدا ژمارەی گەردیلەکانی هەمان رەگەز دەبێت بەنیوەی ئەوەندەی خۆی

**عَمَر**: لەچك ، سەرپۆش، سەراشمە، سەرگووش، دەرخۆنە، دەڤك، پارچەیەکی چوارگۆشەیە لەسەرو مل دەئاڵێنرێ‌و گرێ دەدرێ، ئاین ، رێبازی خواناسی

**عُمَر**: ناوێکە ، خەلیفەی دووەمی موسوڵمانانە

**عُمَرَان**: ئەبوبەکری سدیق‌و عومەری کوڕی خەتتاب (رەزای خوایان لێبێت)

**عُمْرَان**: ساختمان ، خانوو ، ئاوەدانی، خەڵك زۆری ، شارستانی

**عُمْرَى (عُقُود التَّمْلِيك)**: لەموڵکداریدا بریتیە لەو گرێبەست‌و رێکەوتنەی کەسێك بڵێ ئەو ماڵە بۆ تۆو تیای دابنیشە گەر مردی دەگەڕێتەوە بۆ خۆم یان ئەگەر من مردم بیگەڕێنەرەوە بۆ میراتگرانم

**عُمْرَةٌ**: بۆچوون، سەردان ، عەمرە، حەجی بچووك، بەجێهێنانی سرووتەکانی حەجە بەڵام کاتێکی دیاری کراوی بۆ نیەو وەستانی (عەرەفات)یشی تێدا نییە

**عَمْرَةٌ**: هەرشتێك لەسەر بکرێ وەك مێزەرو کڵاوە، ماوەو بۆشایی نێوان دەنکەکانی ملوانکەو زریزەیەك .

**عَمَرَّثَان**: دووبنكەو بێخی ژێر زمان
**عُمْرِيُّ مِنَ الشَّجَر**: كۆنەدار، تووترِكو كونار لەسەر رۆخی رووبار بێت یان نە
**عَمَرَّدُ**: درێژی هەرشتێك، بەد رەوشتی بەهێز، گەندەڵو پیسی زۆرزانو فێڵباز
**عَمَرَّسُ**: پیاوی بەهێزو رەقو توندوتیژ، توندو تیژ رۆیشتن ، رۆژگارێكی سەختو گران ، بەدرەوشتی بەهێزو پتەو
**عَمْرَطَ الشَّيِ(أَخَذَه)**: هەڵیگرت
**عَمْرُود**: درێژو بالآی هەموو شتێك
**عُمْرُوس**: منالّی قەلّەوو تێكسمراو ، بەرخۆلە
**عَمَسَ الكِتَابَ**: سریەوە، كوژاندیەوە، لایبرد
**عَمَسَ فُلانَ الشَّيءِ (أَخْفَاهُ)**: شاردیەوە، پەنهانی كرد، لەبەرچاو ونیكرد
**عَمَسَ عَلَيهِم الخَبَر وَنَحْوَه**: هەواڵەكەی لێ شاردنەوە، لێی پەنهانو نادیار كردن
**عَمَسَ عَلَيهِ الأَمْرَ**: تێكەڵیكردو دای بەسەریەكا، شێواندی بەسەریەكاو روونی نەكردەوە
**عَمَسَ اليَومُ**: تاریكو چەتوون بوو
**عَمَّسَ عَلَيهِ الأَمْرَ**: كاروبارەكەی لێ ئاڵۆزو شێواند، لێی تێكدا
**عَمَّشَ فُلاَنَاً**: بەكوێرانەو بێ پێزانین بەگۆچان دایگرتەوە
**عَمِشَ فُلاَنُ**: چاوی كزبوو لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی كات فرمێسك لەچاوەكانی دەهاتن
**عَمِشَ جِسْمُ المَرِيضِ**: چاكبوەوە، چوەوە سەرباری ساغو تەندروست باشی
**عَمِشَ فِيهِ الكَلاَمُ(نَجَعَ)**: بەسوودو كەڵك بوو بۆی ، سوودی پێگەیاند، كەڵكی گەیاند
**عَمَّشَ عَنِ الشَّيءِ**: چاوی لێ پۆشی ، رابورد بەسەریا
**عَمَّشَ فُلاَنَاً**: كزی چاوی چاك كردەوە
**عَمَّشَ اللهُ المَرِيضَ**: خوای گەورە شیفایدا، چاكی كردەوە ، تەندروستی بۆ گەڕاندەوە
**عَمَشُ**: ئەوەی بەرزەوەندیو تەندروستیو جەستەی تیایە، شتی گونجاوو لەبار
**عَمْشَاء**: چاوكزو پڕوپوشاوی، چاوكوتو كوێر
**عَمِشَتْ عَينُه**: چاوی كزوپڕوپووشاوییوو
**عُمْشُوش**: بۆڵە تری هەندێكی لێ خورابێت
**عَمُقَ المَكَانُ أَو الطَّرِيقُ**: دوورو گوشادو بەرین بوو، قووڵبوو ، درێژ بوەوەو دووركەوتەوە
**عَمَّقَ(غَوَّطَ)**: قووڵیكرد
**عَمَّقَ وَتَعَمَّقَ فِي الأَمْرِ وَالبَحْثِ**: چوە بنچو بناوانیەوە، قووڵیكردەوە، درێژەی پێدا
**عَمَّقَ البِئْرَ**: بیرەكەی قووڵكرد، زۆری لێهەڵكەند
**عُمْق ـ عُمُق**: قووڵی، بن ، ناخ، قووڵی، تەختی بن
**عَمْق ـ عُمْق ـ عُمُق**: قووڵایی بیرو دۆڵو شیوو ڕێگا
**عُمْقِيّ**: پیاوێك لەقسەو وتەكانیدا قووڵ بیر بكاتەوە

**عَمِلَ ـ عَمَلاً**: دروستیکرد ، کردی، بەجێیهێنا، کاریکرد، ئیشی کرد، نواندی

**عَمِلَ فُلاَن عَلَى الصَدَقَة**: کاروپیشەی کۆکردنەوەی خێرو بەخشیشەکان بوو

**عَمِلَ عَلَى البِلاَد**: بوو بەسەرکردەی وڵات ، بوو بەفەرمانڕەواو کاربەدەستی

**عَمِلَ فِيه( أثر )**: کاری تێکرد، کاری لێکرد

**عَمِلَ بِالأمر**: پەیڕەویکرد، شوێنی کەوت، بەدویا ڕۆیشت

**عَمِلَ البَرقُ**: بەردەوام بوو، هەردرەوشایەوە

**عَمَّلَ**: کرێی خۆی دایە

**عَمَّلَ عَلَى البَلَد( جَعَلَهُ حَاكماً )**: کردی بە فەرمانڕەوا ، کردی بەدادوەر

**عَمَّلَ عَلَى القَوم**: کردی بەسەردارو فەرمانڕەوا بەسەریانەوە

**عَمَلٌ**: کاروپیشە، کردار، کردە، ڕەفتار، تەقەلا ، هەوڵ، کۆشش ، هەوڵدان ، دروستکردن

**عَمِل**: کاربەدەست ، کارگوزار

**عِمْلاَق**: بەرز ، بڵند، زەبەلاح ، چەلاك، مەردومی زەبەلاح و کەتەو زلە

**عُمْلَة**: دراو، پارە ، پوول، پەرە، زەڕ، دراڤی نەغد، پارەی دەوڵەتیی

**عُمْلَةٌ صَعْبَة**: دراوی سەخت

**عُمْلَةٌ وَرَقِيَة**: دراوی کاغەز

**عُمْلَةٌ مَعدَنِيَة**: دراوی کانزایی

**عَمْلَة**: کارێکی ناپەسەندو شیاو ، خیانەتو ناپاکیو نادروستی

**عِمْلَة**: چۆنیەتی کارکردن ، ئەوەی کارەو ئەنجام دەدرێ

**عَمْلَسَ فِي سَيرِه ( أسْرَعَ )**: پەلەی کرد، خێرایکرد

**عَمَلَّسٌ**: پتەوو بەهێز لەسەرڕۆیشتن بەخێراییو پەلە، سەگو گورگی گەندەڵو پیس

**عَمْلَقَ المَاءُ ( قَلَّ )**: کەم بووەوە

**عَمْلَقَ المَاءُ فِي الحَوض**: تێکەڵبوو، مەیی، شێواو مەیی

**عَمَلِيّ( إجْرَائيّ )**: کرداری، بەدەستکرد، کردەیی، کارین

**عَمَلِيَّة**: کردار، ڕەفتار، کردن، بەجێهێنان ، مەبەست ، مەرام ، بەڕێوەبردنی کار

**عَمَلِيَة جِرَاحِيَة**: برینسازی، برینکاری، نەشتەرگەریی

**عَمَلِيَة حَربِيَة**: کارێکی جەنگی ، هەستان بەڕووداوێکی جەنگی

**عَمَلِيَة مَالِيَة**: کارێکی دارایی

**عَمَّمَ ( ضد خَصَّصَ )**: هەمووی گرتەوە، بەهەموانی ڕاگەیاند ، گشتانی، سەرجەمی، تێکڕایی ، واژووی تایبەتە

**عَمَّمَ ـ تَعْمِيماً**: مێزەری کردە سەر، مێزەری بەست

**عَمَّمَ الأمر**: دووبارەکردیەوە، ئەنجامیدایەوە، چاوی لێکرد یان وایان لێکردو بوو بەشوێنی گەڕانەوەیان

**عَمَمٌ**: زۆرو کۆبووەوە ، تەواوو گشتی هەموو شتێك

**عَمَمٌ مِنَ الرَّجُل**: ئەو پیاوانەی خێریان گشتیو زۆرە

**عُمُم**: تەواوو کاملی ئەندام، جوانی، تەواوی لاویو ماڵو جەستە جوانیو سەرنج ڕاکێشی

**عَمَنَ بِالَمَكـانِ:** مايـەوە لێـی ، تێیـدا نیشتەجێبوو

**عَمَهَ ـ عَمَهاً:** سەرسامو سەراسیمە بوو لـەوەی بزانێـت روو لـەکوێ بکـات ، سەرکەش بوو

**عَمَهَ فِي الأمر:** رێگەی راستو دروستی نەزانی

**عَمِـهَ ـ عَمَـهاً ،وَعَمَـهاَناً وَعُموهَـاً:** سەرسـامبوو، سـەرگەردانو سەراسیمەبوو

**عَمِـهَ الأرضُ:** رێنمـاییو هێمـای تێـدا نەبوو، بێئالآبوو ، بێنیشان بوو

**عَمِهَ فِي ظُلمِـهِ:** بـەبێ تـاوانێکی زیـادو ئاشکرا ستەمیکرد

**عَمَـهٌ:** سەرسـامی ، سەرسـوورمان ، سەراسیمە بوون ، واق ورمان، دوودڵی

**عَمَهٌ (فِي الطب):** لەپزیشـکیدا بریتیـە لەلەدەسـتدانی هەسـتپێکردن بەشـت وەك لەدەسـتدانی هەسـتکردن بەشێوازی شـتو مـەكو كەسـەكانو سروشتیان

**عَمـهاء:** زەوییـەك هیـچ نیشـانەو هێمایەکی تێدا نەبێت

**عَمُود:** کۆڵەکە، پایە، ستوون، چلاك، دارتـەل، ئەسـتوون ، دیـرەگ، نیرگـە، ئـەو گـەورەو سـەردارەی پشـتی پێدەبەسترێ لەهەمووشتێکدا

**عَمُودُ مِنَ الأعضار:** گەردەلوولو بـۆران لەئاسماندا

**عَمُودُ مِـنَ الصُبـحِ:** ئـەوەی شـەبەق دەدات ، روونـاك دەبێتـەوە، دەدرەوشێتەوە

**عَمُودُ البَطنِ:** پشتی ، تەختی

**عَمُودُ الأمرِ:** کۆڵەکەی کـارێك مەبەست پێی ئەوەیە کەبێ ئەو ناکرێ

**عَمُـود(فـي الهَندَسَـةِ):** لەئـەندازەدا بەهەر پارچەیەك دەوترێت درێژییەکـەی دەجـار زیـاترە لـەدرێژی ناوچـەی پچـووكو خۆگـرە لەبەرانبـەر هـێزی فشاردا

**عَمُـود(فـي الميكَانكَـا):** لـەمیکانیکدا بریتیە لەستوونی بەڕێوەبردن

**عَمُودُ الإشَـارَةِ:** ستوونی هێما ئامێر، عەموودی نیشانەو ئاڕاستەکراو

**عَمُـودُ المـيزَانِ:** سـتوونی وابەسـتەی هەردوولای ، راگری

**عَمُـودِيٌ:** کۆڵەکـەیی، ئەسـتوونی، ستوونی، وەستاو، تان، قین

**عَمُول:** کاسب ، ئیشکەر، بـەئیشوکار، فرە ئیشو کارکەر

**عُمُولَـةٌ:** کـرێ، بەشـتیا، ئـەو برەپارەیـەی دەلاڵو دەزگایـەك لـەبری کارێکدا وەری دەگرێت

**عُمُوم:** گرتنـەوە، هـەموان گرتنـەوە، سەراپا، سەرپا ، تێکرا، گشتی، زوریە

**عُمُومِـيٌ:** گشـتی، تێکراپـی، بـاو، هاوبەشی

**عَمِيَ(ذَهَبَ بَصَرَه):** کوێربوو، چـاوی کوێربوو، سۆمای چاوی داهات

**عَمِيَ عَنِ الشَيءِ (لَم يَـهتَدِ إلَيـهِ):** لەئاستیا کوێربوو، نەی بینی، کوێربـوو لەئانایا

**عَمِيَ عَلَيهِ الأمر (إلتَبَـسَ):** سـەری لێتێکچوو، سەری لێشێوا

**عَمِيَ الأَخْبَار وَالأُمُور عَنْهُ وَعَلَيهِ :** لیٚ ی شارایەوە، پەنهان بوو، نادیاربوو لێی

**عَمِيَ عَلَيهِ طَرِيقَه :** ڕێگەی لیٚ ون بوو، نەیدۆزیەوە

**عَمِيَ فُلاَنٌ عَمَايَةً :** ڕۆچوو لەبەتاڵو پووچدا ، لەسەرگەردانیدا تەواو نغرۆبوو

**عَمِيَ قَلْبُه :** دڵ کوێربوو، ڕاستیو حەقی نەدی

**عَمْيَاء:** ئافرەتی کوێرو نابینا

**عَمْيَة (ضَلاَل):** نەزانین، دواکەوتوویی، سەرلێشێواویی

**عُمْيَة ـ عَمْيَة :**گومڕایی،سەرلێشێواویی، وێڵیو سەرگەردانی

**عَمِيت:** زیرەکی، لێهاتوویی ، بەتوانایی

**عَمِيد:** بەڕێوەبەر، سەرۆك ، ڕاگر، پێشەوا، نەخۆشێك نەتوانێت دابنیشێت هەتا لەملاولاوە ڕاخەر نەخرێتە پشتو لاکانی، پلەیەکی سەربازییە

**عَمِيد الجَامِعَة :** سەرۆکی زانکۆ ، ڕاگری زانکۆ

**عَمِير:** شوێنو جێگەی ئاوەدان

**عَمِيرَة:** شانەکانی هەنگ بەگشتی

**عَمِيق:** قووڵ، کوور، چاڵ، سووتال، سووتار، بیرەچاڵ، زەوی قووڵو هەڵکەنراو

**عَمِيقُ التَّفكِير:** یەکێك قووڵ بیربکاتەوە، بیرمەند، بیریار

**عَمِيل:** کارئاشنا، بسێن، جێگر، نوێنەر، سیخوڕ، جاسووس، هەمیشە کڕیار

**عَمِيل سِرِّي:** شۆفار، جاسووسێکی نهێنیو پەنهان، سیخوڕێکی پەنهان، ئەوسیخوڕەی بەپەنهانو نهێنی کاری سیخوڕی ئەنجام دەدات

**عَمِيم:** گشتی، باو، ئەوەی گردو کۆدەبێتەوەو زۆری نیشان دەدات، تەواوی هەرشتێك ، گیایەکی وشکە

## عن

**عَنْ (حَرف جَرّ):** بەم مانایانە هاتووە: دەربارەی، بەهۆی ، بۆ ، پاشان ، پاش ماوەیەك ، تاوێك

**عَن إذْنك:** تکایە، بەیارمەتی خۆت

**عَن قَلِيل( بَعْدَ قَلِيل ):** لەدوای کەمێك، پاش ماوەیەکیتر، پاش چەن ساتێکی دی

**عَن يَسَارِه(مِن يَسَارِه ):** لەلای چەپیەوە

**عَن قَرِيب (عَمَّا قَرِيب):** بەم نزیکانە، بەم زووانە

**عَنَّ لَهُ :** بۆیدەرکەوت، بۆی ئاشکرابوو، ڕوون بوەوە بۆی

**عَنَّ بِفكرِيَ الأَمر:** هات بەبیرما ، بۆم ڕوون بوەوە

**عَنَّى الأمر فُلاَناً (أَهَمَّهُ):** لای گرنگبوو، مەبەستی بوو ، بەتەنگیەوە بوو

**عَنَّى الأَرضُ بِالنَّبَات:** دەریکرد، دەریدا، سەری هەڵدا ، هاتە دەرەوە

**عَنَّى اللهُ بِهِ عِنَايَةً (حَفِظَهُ):** پاراستی، خوای گەورە پارێزگاری لێکرد

**عَنَا ـ عَنَاء:**ڕەنج ، ڕەنجدان ، کۆشش، کوێرەوەری، دەردەسەری، ماندووبوون، شەکەتی ، هیلاکی

**عُنّاب:** شاخێكی درێژی خڕ
**عُنَّاب:** دارێكه دەنكەكانی وەك دەنكە زەيتوون وايەو تامێكی شيرينو خۆشی هەيەو شەش مەتر درێژەو رەنگی سوورە
**عَنَّاب(بَائِع العِنَب):** ترێ فرۆش
**عَنَاجُ:** جڵەوی حوشتر، پەتێكە دۆڵچەی پێوە دەبەسترێ، پشتی پياوو جومگەكانی
**عَنَاجٌ مِنَ الأمر:** خاوەنی، بەتوانای
**عَنَاد:** بەرهەڵستی، بەرگری، سەركێشی، وڕك بەستن، ڕق گرتن، خۆسەری، ياخی بوون، بەلەسەبوون
**عَنَادِيَة( فِرْقَةٌ مِنَ السُوفسطَائيِن ):** تاقمو گرۆهێكە لە (سوفستائيەكان)و نكوولی دەكەن لەراستی پێكهاتەكان و هەموو بوونێك بەخەياڵو ئەندێشە دادەنێن
**عَنَاس:** ئاوێنە، رووپا ، تەخت
**عَنَاقٌ:** داماوی، كەساسی، كارە مێ، مێچكەی مەڕوبزن هەتا ساڵێك تەواو دەكات
**عِنَاق (مُعَانَقَة ـ حِضن ):** دەست لەملكردن، لەئامێز گرن، باوەش بەيەكتردا كردن
**عَنَان:** هەور، ئەوەی بەرچاو دەكەوێت كاتێ تەماشای ئاسمان دەكرێت، لای هەرشتێك، تەنيشت ، لا
**عَنَان السَمَاء:** فەلەكە، ئاسمان ، چەرخ
**عِنَان:** قايش لغاو ، جڵەو ، دەستەرەشمە، دانەلغاو، هەوسار، هەفسار، قەوچە

**عِنَايَة( إعتِنَاء ـ إهْتِمَام ):** گرنگی، گرنگی پێدان، بايەخ، پاراستن، چاودێری
**عَنَبُ الكرمُ( صَارَ ذا عِنَب ):** ترێی گرت، بەريگرت، مێوەكە ترێی گرت
**عِنَب( ثَمَر الكَرم ):** ترێ، ترێ ، هەنگوور، بەری درەختی مێوە كەبەهێشوو دەيگرێو چەشنی جياوازو فرەی هەيە لەوانە: زەردكە، زەردێ، زەلكە، سپيلكە، سووراو، سوورشامی، شەقشەقە، شيازی، عشاق، فەرخی، كاژاو، كشميشی، كلكەرێوی، گەرمكە، گوت توولە، مام برايمە، مێخی ، نينۆكی بووك، ياقووتی ، سەرقوڵكە ، رەش ميری ، سايەنی ، پايزە
**عِنَبُ الذِئب:** رووەكێكی كێوی‌يە لەگەڵ پەمووودا دەڕوێتو بەرێكی پچووكی رەنگ رەشی وەك ترێی هەيەو تامێكی مزری هەيە
**عَنْبَا ( أنبَج ـ مَنجَة ):** دارێكە لەوڵاتو شوێنە گەرمەكان دەڕوێتو بەروبوومەكەی خۆشو بەتامەو دەكرێ بەشەربەت
**عَنبَرَ الشَيء:** بەعەنبەر بۆنخۆشی كرد، بۆنداری كرد
**عَنبَر:** بۆن عەنبەر، عەماری دانەوێڵە، چاڵە خەڵە، كەندو، جۆرێكی زۆر گەورەيە لەنەهەنگو حووت كە درێژيەكەی دەگاتە (60) پێو جەستەی گەورەيەو ددانداره ، پەناگەيەكە سەربازو كەسانی نەخۆش تێيدا دادەنيشنو هەڵدەدەن، گيايەكە، سەرگۆناو كوڵم

**عَنْـبَرَ الشِّـتَاء وَعَنْبَرَتـه (شِـدَّته):** سـەرماو سـۆڵەی زسـتان، سـەرمای سەختی زستان
**عَنْبَرِي:** مەیو شـەرابی عەنبـەر، مـەی بۆن عەنبەر
**عَنِـتَ (لَقِـي الشِّـدَّة):** تووشـی تەنگانـەبوو، کەوتـە تەنگانـەوە، نارەحەتیو دەردەسەری هات بەسەرا
**عَنِتَ الشَّيءُ (فَسَـد):** تێکچوو، شـکا ، شێوا
**عَنِـتَ العَظْـمُ:** شـکا دوای بەسـتنی، شکایەوە
**عَنِّـتَ (شَـدَّد عَلَـى):** زۆری لێکـرد، ناچاریکرد، تەنگی پێهەڵچنی
**عَنَت:** هەڵە، تاوان، زینا، داوێن پیـسی، لووتبەرزی، خۆبەزلزانین
**عُنَّة:** پەککـەوتن، ناتوانـایی جنسـی، لەپیاوەتی کەوتن ، کەپرێك لەلقو پەلی دارو درەخت دروست کرابێت
**عَنْـتَرَ الذُّبَـاب:** ویـزە ویـزی هـات ، دەنگی لێهات
**عَنْتَرَ فُلاَنٌ:** هانیدا لەجەنگدا، دنـەیدا، پاڵی پێوەنا، رێگـەی سـەختو دژواری گرتەبەر
**عَنْـتَرَ فُلاَنـاً بِـالرُّمْح:** برینـداری کـرد، زامداری کرد، لێی دا
**عَنْتَر:** ئازا ، گوستاخ
**عَنْتَر ـ عُنْتَر ـ عَنْـتَرَة:** مێـش ، مێشـی سەوز
**عَنْتَرَة:** ئازاو گوستاخ لەجەنگدا
**عَنَجَ الشَّـيء (جَذَبَـه):** بەکێشـی کـرد، رایکێشا
**عَنَجَ رَأسَ البَعِير:** سەری حوشـترەکەی بەکێش کرد
**عَنْجَدَ العِنَـب:** مێوژەکـەی خـراپ بـوو، باش نەبوو
**عَنْجَهِي:** ئەوەی خۆبـەزلزانینو کـەشو فشی تێدایە ، یەکێك وشكو توندوتیژی تیابێت
**عَنْجَهِيَـة:** خۆبـەزلزانینو کـەشو فـش، زاڵو باڵادەست نواندن
**عَنَـدَ ـ عَنَـدَ عَـنِ الطَّرِيـق أو القَصْـد أو الحَقّ:** لایدا ، لەرێ لایدا ، لەمەبەست لایدا ، لەرێی راست دەرچوو
**عَنَـدَ الرَّجُـل( خَـالَفَ الحَـق ):** لـەرێی راست لایدا ، چەوتیکرد
**عَنَـدَ عَنْـهُ:** لێی دوورکەوتـەوە، دوورەپەرێز کەوت لێی
**عَنَـدَ النَّاقَـة:** لەحوشـتری تـر دوورکەوتەوەو بەتەنیا لەوەڕا
**عَنَـدَ العِرقُ أو الجَرح:** خوێنـی لەبـەر رۆیـیو وشـکی نـەکردەوە، لێی رۆیـیو نەوەستایەوە
**عَنَـدَ فُـلاَن:** خـۆی بـەزلزانیو لەسـنووردەرچوو لـەگومڕاییو سەرلێشـێواویدا، پێچەوانـەی حـەقو راستی وەستا، دژ بە حەقو رەوا بوو
**عِنْد( إسْم لِمَكَـان الحُضُور):** لـەپاڵ ، تەنیشت ، لەکن ، لەلای، لەتەك
**عِنْدَ( إسْم لِزَمَـان الحُضُور):** لـەکاتی، کاتی، دەمی، وادەی، کاتێ ، کە
**عِنْدَئذٍ( حِينئـذٍ ):** ئەوسا ، لەوکاتـەدا، ئەو دەمەی ، ئەوجا
**عِنْدَمَا( مَتَى مَا ):** لـەکاتێکدا ، لـەکاتی، هەر کاتێ ، کەی

**عِنْدَكَ( قِفْ ):** بوەستە، راوەستە، رابمێنە، ئیستێك بكە
**عَنْدَلِيب( بُلْبُل ):** بلبل ، شالوور، ئالۆر، شالووك، شالۆك، شەهلوول ، جۆرە بولبولێكە فرە جووڵەیەو بەچەن جۆرێك دەخوێنێت و لەرۆژانی بەهارا بەدەر دەكەوێت
**عِنْدِي:** لام وایە، لای من ، پێموایە، رام وایە
**عِنْدِيَة( فِرْقَة مِن السُوفسطَائية ):** تاقمێكن لە(سوفستائیەكان) بانگەشەی ئەوەدەكەن گوایە بنەچەو بنەڕەتی هەرشتێك دەگەرێتەوە بۆ بیرو بۆچوون تەنانەت گەر یەكێك وا پەی بەرد مرۆڤ بێگیان و ئەن بێت ئەوا راستو گونجاوە لایان
**عَنَزَ عَنْهُ:** لێی دوور كەوتەوە، دوورو پەراگەندە كەوت لێی
**عَنَزَ فُلاَنَاً عَنْزَاً:** بەنێزەیەكی گچكە بریندارى كرد
**عَنْز ـ عَنْزَة( أُنْثى الْمَعز ):** بزنە مێ ، بزنە مێچكە
**عَنَزَة:** لەگۆچان درێژترەو لەرمیش كورترەو لەخوارەكەیدا نێزەیەكی وەك نێزەی رمی پێوەیە
**عَنَزَةٌ مِنَ الفَأس:** رووەكەی ، تیژیەكەی
**عَنَزِي:** پیاوێكە لە(بني عنزة)و كاتێ چووەتە دەرەوە ئیدی نەگەڕاوەتەوە ئەمەش بووە بەمەسەل لەنێو عەرەبەكاندا بۆ كارێك كەوا هەرگیز روو نەدات

**عَنَسَ الرَّجُل ( أَسَن وَلَم يَتَزَوّج ):** پیربوو ژنی نەهێنا، چووە ساڵەوەو هاوسەری نەگرت
**عَنَسَ ـ عَنَسَاً:** هەموو سەعاتێك تەماشای ئاوێنەی كرد، هەر كاتژمێرێك لەئاوێنە وردبووەوە
**عَنْسُ:** بەردێك لەئاودا ، حوشترێكی بەهێزو توانا، دالْ، رەشە دالْ
**عَنَسَتِ البِكْرُ:** كیژەكە پاش پێگەیشتنی زۆرمایەوەو شووی نەكرد، پاش بالْق بوونی مایەوەو مێردی نەكرد
**عَنَسَت البِنْتُ البِكْرُ:** كیژەكە مایەوەو شووی نەكرد، قەیرە بوو مێردی نەكرد
**عَنَّسَت البِكْرَ أَهْلُهَا:** كەس وكاری بەشوویان نەدا هەتا كاتی بەسەرچوو، مێردیان پێنەكرد تا قەیرە بوو
**عُنْصُر:** بنەڕەت ، بنەچە، رەگ، ریشە، رەچەڵەك، رەگەز، توخم ، بەشێك لەپێكهێنەرەكانی شتێك ، لای پێشینەكان چوار توخم و رەگەز هەیە: ئاگر، هەوا ، ئاو ، خاك و خۆڵ
**عَنْصَرَة:** جەژنێكی مەسیحیە یادی دابەزینی (روحی قودسە) بۆسەر قوتابیەكانی دوای (عيد الفصح) بەپەنجا رۆژ یادی دەكەنەوە ، لای جوولەكەكانیش یادی دابەزینی شەریعەتە لە كێوی (سينا)
**عُنْصُرِي:** رەگەزپەرست، رەگەزخواز، توخمین
**عُنْصُرِيَة:** رەگەزپەرستی، دەمارگرژی دەمارگیری تاكێك یان كۆمەڵێك بۆ رەگەزو نەژادێك

**عِنْصَاةٌ**: هەرکەسێکی پەرتەوازە لەرووەك و قژو شتیتر، پاشماوەی هەرشتێك کاتێ زوربەی دەڕوات، جڵەوە حوشتر یان مەڕ

**عُنْصُل**: پیازە ورچانە، رووەکێکە نزیکەی مەترێك بەرزدەبێتەوە بەشی خوارەوەشی وەك پیازێك وایەو لەمەبەستی تەندروستیدا بەکاردەبرێ بۆ رۆماتیزمە باشە، پیازدەشتیو پیاز نێرگیس

**عَنْظَى بِهِ**: گاڵتەی پێکردو بەقسەی ناشیرین و ناقۆڵا هات پیایدا

**عُنْظَاب**: کوللەی زەردی گەورە، گەورە کوللەی زەرد

**عُنْظُوَان**: رووەکێکە گەر حوشتر زۆری لێ بخوات تووشی ژانەسك دەبێت، کولله، دڕندەی زمانپیس و بۆگەن

**عَنْعَنَ عَنْعَنَةً**: جۆرە بێژەیەکە لەقسەداو (هەمزە) بە(عەین) دەردەبرێ و ئەمەش لەزمانی(تەمیم)دا هاتووە

**عَنْعَنَ الراوِيَ (فِي عِلم الحَديث)**: لەزانیاری فەرموودەیا ناتەواوییەکەو فەرموودە گێڕەرەوە رشتەی گێڕەرەوانی فەرموودە یەك لەدوای یەك باس دەکات بەبێ ئەوەی خۆی هەموویانی بینیبێت و چاوی پێیان کەوتبێت

**عَنَفَ بِهِ**: بەتوندی سەرزەنشتی کرد، توندگرتیو هات بەسەریا، سەرزەنشتیکردو بەنەنگو نکوولی دانا، رەق بوو لەگەڵی، توندوتیژ بوو لەگەڵیو پیا هەڵشاخا

**عَنَّفَ تَعْنِيفاً**: بەرەقو تیژی رەفتاریکرد، توندو تیژ بوو

**عَنُفَ ـ عُنْف ـ عِنْف ـ عَنْف (شِدَّة ـ خشُونَة)**: توندی، توندوتیژی، رەقی، زەبرو زەنگ، زبرو رەقی

**عَنَفَة**: ئامێرێکە ئاوی لەخوڕو تیژ لێ دەدات و پەروانەو ئامێرەکە هەڵدەسووڕێنێ، نێوانی هێڵەکانی کشتوکاڵ، نێوان گوڵەکان

**عَنْفَقٌ**: کەمیو سووکی شت، کەمو نزمی

**عَنْفَقَة**: گەنەمووی نێوان لێوی خواروو چەناگە

**عُنْفُو**: سەرەتاو باشی، ئەوەڵو چاکی

**عُنْفُوَان الشَّبَاب (شَرخ)**: هەرەتی لاوی، تافی لاوی، سێرەی گەنجێتی، سەرەتای لاوی

**عَنِقَ (طَالَ عُنُقه)**: ملی درێژ بوو، گەردنی درێژو باڵابوو

**عَنَّقَ (أخَذَ بِعُنُقه)**: ملی گرت، یەخەی گرت، گەردنی توند گرت

**عَنَّقَ طَلْعُ النَخل**: درێژ بوو، هەڵیدا، بەرزبووەوە

**عَنَّقَ فُلاناً**: توند ملو گەردنی گرتو گوشی

**عُنْق ـ عُنُق ـ عَنَق ـ أعْناق**: گەردن، مل، گەردەن، ئەستۆ، گێپەڕە، خیگە، ملی گیاندار بەرووکاری پێشەوەدا

**عَنَقٌ**: جۆرە غارغارێن و رۆیشتنێکە حوشترو ئەسپ تێیدا بەخێرایی دەڕۆن بەرێوە

**عَنْقَــاء:** عــەنقا ، سمـــرخ، شـــامەل، باڵندەیـــەکی ئەفســـانەییە ، دانـــا، زۆرزان، مل درێژ

**عَنْقَاش:** سپڵە ، سەرسواڵکەر، ئەوەی گوند بەگوند دەگـەڕێو شـتو مـەك دەفرۆشێ ، وردەواڵە فرۆش

**عَنْقَد:** ماسیەکی زیوینی بریسکەدارە

**عُنْقُر:** بنکی پاقلە ، بنکی دارخورما

**عَنْقَشَ فُلاَن:** پابەندبوو پێوەی

**عَنْقُود:** هێشوو، بۆڵ

**عَنَــكَ الرَّمــلُ:** بــەرزبوەوەو ڕێگــەی تێپەڕبوونی نەهێشتەوە

**عَنَكَ الفَرَسُ:** هەڵیگرتو چوە سەری

**عَنَكَ اللبَنُ (خَثَر):** مەیی ، بەستی

**عَنَــكَ المَــرأةُ عَلَــى زَوجِــهَا:** لەرشــتەو بەندی مێردەکەی دەرچوو، یاخی بوو

**عَنَـــكَ عَلَـــى أبِيـــهَا (عَصَتْـــــهُ):** سەرپێچیکرد، یاخی بوو، بەلەســەبوو، بێگوێیکرد

**عِنْكَ مِنْ كُـلِّ شَـيءٍ:** مـەزنی هەرشـتێك، بەشێك لەشەو ، ساتێك

**عَنْكَبُ:** نێرینـەی جاڵجاڵۆکـە ، توخمـی جاڵجاڵۆکە

**عَنْكَبَاةٌ ـ عَنْكَبَةٌ:** مێیینەی جاڵجاڵۆکە

**عَنْكَبُوت:** جاڵجاڵۆکە، جۆلاویـی کـەرە، پیرعەڤۆك ، شەڤن پیرك، پیرهەلالووك، پەسپەسکلێ، داپیرۆچك، ماماڵە، پنـد، پندەپیر، کاکڵە مووشان ، دەعبایـەکی چنـگ چنگـە لـەکوندو قوژبنـی دیـوارو بنمیچـا بـەداوێکی زۆر بـاریك هێلانـە دەتەنێ بۆ گرتنی مێشو مەرۆش

**عَنْكَشَ العُشْبُ:** هەڵچوو، هەڵیدا ، چـوو بەناویەکا ، بەرزبوەوە، باڵای کرد

**عَنْكَشُ:** ئـەوەی گـوێ بـەخۆجوانکردن نادات

**عَنَمُ البَنَانِ:** رەنگی کرد

**عَنَـمُ:** تــەرز، ریشـاڵی مێـو، بەوتاڵــە باریکانـە دەڵێــن کەلــەدەوری لاسـكو گەلای مێوەکە دەردێتو تامێکی مزری خۆشی هەیە

**عَنَمَةٌ:** قلێشاوی دەمو لێوی مەردوم

**عَنْمِيٌّ:** رووگەشی سوورو سپی

**عَنَّنَ الكِتَــابَ:** ناونیشـانەکەی نووسـی، ناونیشانی بۆ دانا

**عَنَّـنَ المَـرأةُ شَـعْرَهَا:** قـژی کـرد بــەنێو یەکا، هۆنیەوە

**عَنَّنَ الفَرَسَ أو اللِجَام:** جڵەوی بۆکـرد، قایشو جڵەوی بۆ کردن

**عِنْـــو:** نارەحـــەتی، چەرمەســـەری ، دەردەسەری

**عِنْوَان:** ناونیشان

**عِنْـوَانُ الكِتَـــاب:** ناونیشـانی کتێـب ، ناوی پەڕاو

**عِنْـوَان المَقَالَـــةِ:** ســەروتار، ســەرناو، سەرباس

**عُنْـوَةً:** بــەزۆر ، بـەتۆپزی، بــەزەبرو زەنگ، جەور، زۆردارەکی

**عَنُـود:** لاسـار ، قیرسـچمە ، رق قـایم ، سەرکێش ، رقاوی

**عَنْـوَنَ الكِتَــابَ عَنْوَنَـةً:** ناونیشـانی بـۆ دانا ، ناونیشانی پێدا

**عَنِيَ (كَدَّ وَتَعِبَ):** رەنجیدا ، کۆششیکرد، کۆشا ، تەقەلایدا ، هەولّیدا ، ناسۆریو چەرمەسەری چەشت

**عَنِيَ الرَّجُل:** بەند کرا ، ئەسیرکرا ، دەستگیر کرا ، گرتیان

**عَنِيَ فُلاَنُ بِالأَمر:** سەرقالّبوو پێوەی ، خەریك بوو پێوەی

**عَنِيَ الأَكلُ فِيهِ:** بەکەڵك بوو، بەسوودبوو، سوودی لێوەرگرت

**عُنِيَ بِالأَمرِ:** سەرقالّبوو پێوەی، خەریك بوو

**عَنِيّة:** رەنج ، کۆشش ، ماندوبوون ، هەولّدان

**عَنِيد:** شێرگیر ، دەمارگەرم، چەقاوەپوو، کەللەرەق، سەهەند، سەرکێش، قیرسیچمە ، گیر، رقاوی ، چەموور، یاخی ، بەلەسە ، رارا ، چەپخوون

**عَنِيف:** رەق ، توندو تیژ ، بەزەبر ، چەبگەر، رەشکوژ ، سەخت ، ماندووکەر

**عَنِين (عَاجز تَنَاسُلِيَاً):** پەککەوتوو، لێوەبوو، سست بوو لەهێزی پیاوەتیدا، ناتواناو کەمهێز لە جنسدا

**ع هـ**

**عِهَادَة:** بارانی سەرەتای ساڵ، یەکەم بارانی بەهار

**عَهِدَ فُلاَن إِلَى فلان عَهْدَاً:** پەیمانی خستە ئەستۆیو رایسپارد پارێزگاری لێبکات

**عَهِدَ إِلَيهِ بِالأَمرِ:** رایسپارد، خستیە ئەستۆی

**عَهِدَ الشَيءَ:** ناسی ، زانی

**عَهَّدَ فُلاَنَاً:** جار لەدوای جار پەیمانی پێ تازە کردەوە

**عَهِدَ فُلاَنَاً بِمَكَانِ كَذَا (لَقِيَهُ فِيهِ):** چاوی پێکەوت، بینی، دیتی

**عَهِدَ الوَعْدَ(وَفَاهُ):** پەیمانی هێنایەدی، بەوەفاو ئەمەکداربوو

**عُهِدَ المَكَان:** بارانی سەرەتای ساڵ لێیدا

**عَهِدَ اللهُ (وَحَدَّه):** بەتاكو تەنیا رایگرت ، بەتەنیا پەرستی

**عَهْد:** گفت ، بەڵێن، پەیمان ، رێککەوتن ، دڵنیایی، پاراستن، بینین، پێگەیشتن، دەم ، کات ، سەردەم ، چەرخ، خۆشەویستی، هاورێیەتی، وەسیەت، ئەو نووسراوەی بەرپرسو کاربەدەست دەینووسێ بۆ کاربەدەستەکانیو تێیدا داوای پیادەی دادپەروەرییان لێدەکات

**عَهِدُ:** بەجێ هێنەری بەڵێنو پەیمان ، پەیمانپارێز

**العَهْدُ القَدِيم (مِن الكِتَاب المُقَدَّس):** چەرخی دێرین لەکتێبی پیرۆز بەو دەقانە دەوترێت بەر لەهاتنی حەزرەتی(مەسیح) - سەلامی خوای لێبێت - نووسراوە

**العَهْدُ الجَدِيد (مِن الكِتَاب المُقَدَّس):** چەرخی نوێ لەکتێبی پیرۆز بەو دەقانە دەوترێت دوای حەزرەتی (مەسیح) - سەلامی خوای لێبێت - نووسراوە

**عَهْدَان:** دەستبەرو زامنکردن

**عَهْدَة:** باران لەدوای باران

**عُهْدَة**: بەرپرسی، زامنی ، دەستەبەری، دڵنیایی، لاوازی، زەبوونی، کەساسی، گەڕانەوە بۆ شتێك و چاككردنی

**عُهْدَة (في البَيع)**: لەمامەڵەو فرۆشیاریدا بەدەستبەركردنی دروستیو شیاوی مامەڵەکە دەوترێت وێڕای چاكو باشی فرۆشراوەكەدا

**عَهْدِي بِه أنَّهُ كَذَا**: لێی پشت ئەستوورم ، دڵنیام ئەوەیە، لێی دڵنیام

**عَهَرَ (فَجَرَ)**: خراپەیكرد، زینای كرد، داوێن پیسی ئەنجامدا

**عَهَرَ المَرأة وَإليهَا (زَنَى بِهَا)**: زینای لەگەڵكرد، بەشێوەیەكی نادروستو رەوا جووت بوو لەگەڵی، بەحەرام دروست بوو لەگەڵی

**عَهْر ـ عَهَارَة (فِسْق)**: خراپەكردن، داوێن پیسی ، سۆزانێتی، خۆ فرۆشتن، لەش فرۆشی

**عَهِر ـ عَاهِر**: داوێن پیس ، زیناكار، خراپەكار، بەدڕەوشت

**عَهَنَ الشَّيءَ (دَاوَم وَثَبَتَ)**: جێگیربوو، چەسپا ، رەگی داكوتا

**عَهَنَ في العَمَل (جَدَّ)**: تێكۆشا ، هەوڵیدا، تەقەلایدا، رەنجیدا

**عَهَنَ بِالمَكَان (أقَام بِه)**: مایەوە، جێنشین بوو

**عَهَنَ النَّخْلَة**: لقو پۆپەكانی وشكیانكرد، وشك بوون

**عَهَنَ لَهُ مُرَادَهُ**: هیواو ئاواتی بۆ هێنایە دی، ئاواتەكانی بۆ پێشخست

**عَهَنَ مِنَ المَكَان (خَرَج)**: گواستیەوە، كۆچی كرد، رۆیی، دەرچوو، باری كرد

**عِهْن**: خوری، هری، پەژم ، پەشم، بلوول، پۆر ، تووكی مەڕە

**عِهْنَة**: پارچە خوریەك ، دەرەختێكە گوڵێكی سوور دەردەكات

**عَهِيد**: بەڵێندەر، دەستەبەر ، پەیمان بەست ، كۆنو دێرین

## ع و

**عَوَى الكَلْبُ**: لوورانی، وەڕی ، وەڕە وەڕی كرد

**عَوَى القَومَ (دَعَاهُم إلَى الفِتْنَة)**: بانگی كردن بۆ خراپەو فیتنە ، بانگەشەی كردن بۆ بشێویو ئاژاوەگێڕی

**عَوَى الشَّيءَ (عَطَفَ ـ مَالَ)**: خواریكردەوە ، لاری كردەوە، لایدا ، ترازانی

**عَوَى الحَبْل وَالشَّعْر وَالقَوس**: بایدا ، لوولی كرد، پێچایەوە

**عَوَى الشَّيءِ تَعْوِيَةً**: لاریكردەوە، بایدا، خواریكردەوە

**عُوَاء (صَوت الكلب وَابن آوي أو الذئب)**: لووره، لورەلوور ، وەڕین ، حەپ حەپ

**عَوَّاء**: زۆر وەڕ، زۆر ئەلورێنێ

**عَوَائِد**: سوور، دەستكەوت ، كەڵك، قازانج

**عَوَائِذ**: چوار هەسارەیە چوار گۆشەیەك دروست دەكەنو لەناوەڕاستیانا هەسارەیەك هەیە

**عَوَائِر مِنَ الجَرَاد**: كۆمەڵە كوللەی پەرتو جیاواز جیاواز

**عَوَائِق الدَّهْر**: بەلاو كۆسپەكانی سەردەمو رۆژگار، چورتمەكانی ، ئەهامەتیو دەردەسەریەكانی

**عَـوّاج ( بَـائِع العَـــاج أو صَانِعَــه ):** كەڵبەی فیل فرۆش ، شفرە فرۆش و سازندەی

**عَــوّاد ( إسْــم فِعْــلٍ بِمَعْنَــى عُــدْ ):** بگەڕێرەوە، وەرە

**عَوّاد:** کاری چاکە ، سۆزو بەزەیی، چاکەو باشە

**عَوّاد:** عود ژەن یان دروستکەری

**عُوادَة:** ئەو خواردنەی ئامادەکراوەو جارێك لێی خورابێت

**عُوادَة المَرِيض:** سەردانی نەخۆش ، چوون بۆ لای نەخۆش

**عُوار:** ناتەواوی، کەم و کوڕی، پینەو دڕاوی لەجل و بەرگدا

**عُوار:** ریپۆق ، رچقاوە، گوژاو، چڵکی نێو کەپوو چاوانە ، ترسنۆکی ، تۆقیوو، یەکێك لەڕۆیشتنا هیچ نەبینێ

**عُواسَة:** قومە شیرێك یان هەرشتێکیتر

**عُواف ـ عُوافَة:** نێچیر ، دەستکەوت ، نچیر ، گۆر

**عُواق:** دەنگێکە لەورگی ئاژەڵ دێت کاتێ دەڕوات بەڕێوە

**عَوّام:** مەلەوان ، مەلەکار، ئەسپێکی رۆچوو تیژڕەو لەغار غارێندا

**عُوام:** سەرو رووخساری سواربووی حوشتر کاتێ لەدوورەوە بەدەر دەکەوێت لەبیاباندا

**عَوّامَة:** ماڵێکە لەدارو تەختە دروست دەکرێت لەسەر رۆخی دەریا، ماڵ کەشتی

**عَوّامَة لإرْشَاد السُفُن:** دەریانیشان

**عَوّامَة السمكَة ( نُفَاخَة ):** میزەڵدان

**عَوامِرُ البُيُوت:** ماری نێو ماڵ، ماری ماڵی

**عَوامِل:** هۆکار ، مەبەست ، مەرام

**عَوان:** نیوە تەمەن ، ناوەڕاست ، نیوە تەمەنی هەرشتێك، ئەو جەنگەی جار لەدوای جار کوشتاری تیا دەکات ، زەوییەکی شاراوەو نادیار

**عَوانَة:** دارخورمایەکی بەرزو درێژ، کرمێکە لەنێو خۆڵدا، گیاندارێکە بچووکترە لەژیشك

**عَواهِن( جَرائِد النَّخل اليَابِس ):** کەلا وشکەی خورما

**عَوَّة:** هاوارو فریاد ، نیشانەو هێمایەکە لەسەر رێ دادەنرێ و رێ نیشاندەری رێگەیە

**عَوَّثَهُ الأمْر:** دووریخستەوە، بەدووری گرت، سەرقاڵی کرد، خەریکی کردو رێگەی لێگرت

**عَــوِجَ العُــودُ وَنَحْــوَهُ:** لاربووەوە، خواربووەوە

**عَوِجَ الأرضُ:** رێك نەبوو، خواربوو

**عَوِجَ الطَرِيقُ:** پێچ پێچ بوو، خوارو لاربوو

**عَوِجَ الإنْسَانُ عِوَجاً ( سَـاءَ خلقـه ):** رەوشت و خووی خراپ بوو

**عَــوَّجَ العُـودُ وَنَحْـوَه:** لاری کردەوە، خواریکردەوە، چەمانیەوە چەوتانیەوە

**عَــوَّجَ فُلانَــاً عَــنِ الشَّــيء:** لارو خواریکردەوە

**عَــوج( إعوجَــاج ـ إلْتِــواء وَعَــدَم الإسْتِقَامَة ):** خواری، چەوت و چێڵی ، لاری ، ناڕاستی، پێچ و پەنا

**عَوَجُ العِظَـام( مَـرَضُ إرْتِخَـاءِ العِظَـام ):** ئێسکە نەرمە، گێڕی
**عَوْجَاء:** کەوان ، وشتری لەڕو لاواز
**عَوَّدَ الرَّجُل عَلَى كَذَا ( مَـرَّنَ ):** رایهێنا ، فێریکرد، رامیکرد
**عَوَّدَ البَعِيرُ:** پیر بوو، بەساڵاچوو
**عَوَّدَ الرَّجُلُ:** بەساڵاچوو، بەتەمەن بوو، پیر بوو
**عَـوْد ـ عَـوْدَة:** گەڕانـەوە، ڕۆیشـتنەوە، پێچدانـەوە ، حوشـترو مـەڕی پـیر ، کۆنەڕێ
**عُود:** دار ، چیلکە ، شوڵك ، لـق و پـەل کـاتێ دەبڕێـت ، جـۆرە بۆنێکـە، عـود، ئامێرێکی مۆسیقیە ، بێخی زمان
**عُودُ الثِّقَاب:** دەنکە شقارتە
**عَوَّذَ الرَّجُل:** دوعای پاداشتی بـۆ کـرد، دوعای بۆ کرد هەتا خوا بیپارێزێ
**عَوَّذَ( رَقَى ـ عَلَّقَ العَـوْذَةَ ):** نوشـتـەیکرد، نوشتەی پیاکرد، چاوەزاری هەڵواسی
**عَـوْذ ـ عَـوَذ ـ عِيَـاذ:** پـەنا ، پەناگـە، پاسێر، پـەناو هانا بـۆ بـردن ، پـەنا بردنەبەر
**عُـوَّذ:** بناغـەی دارودرەخـت یـان لـەژێر بەردا شارا بێتەوە
**عَـوذَة ـ تَعْوِيـذَة:** نوشـتـە ، جـادوو، چاوەزار
**عُوذَة:** نوشتەو چاوەزاری پیا هەڵواسی
**عَـوِرَ( ذَهَبَ حِسُ إحْدَى عَيْنَـه ):** یـەك چاوی کوێربـوو، چـاوێکی لەدەسـتدا، بینایی یەکچاوی نەما
**عَوَّرَ( صَيَّرَهُ أعْوَر ):** کوێریکرد، چـاوێکی کوێرکرد

**عَــوَّرَ المَكَــاييل:** هەڵیســەنگاند، پێوانەیکرد
**عَـوَّرَ عَلَيـه أمْـرَهُ:** بـەناقۆڵای دانـا، بــەخراپو نالــەباری خـــەملاند، سەرزەنشتیکرد، هەڵشاخا پیایدا
**عَـوَّرَ عَــن فُـلانٍ:** درۆیکـردو بـەرگری لەیەکێکیتر کرد
**عَـوَّرَ فُلانَـاً:** گەڕاندیـەوەو نەیهێشـت پێداویستیەکانی بەجێ بهێنێ، دەستی نا بەڕوویەوە
**عَوَرٌ:** ناقۆڵایی، خراپو نابـار، نالـەبارو نەگونجاو
**عَـوِرٌ:** بـەد ڕەوشـت، رابـردوو خـراپو بەد، بەدوو نارەسەن
**عَورُ مِنَ الأشْيَاء:** بێپارێز، نەپارێزراو
**عَــوْرَة:** ئــەندامی شــەرمی مــرۆڤ (قنــگـو...)، ناتــەواوی لەشــتێکدا ، مەربوارو کەلێنێك دوژمـن لێوەی بێتـە ژوورەوە
**عَـوِزَ( إفْتَقَـرَ ):** دەســتی کــورت بــوو، هەژاربوو، نەدارابوو، نەیبوو، گەدابوو، بێنەوابوو
**عَـوِزَ الشَّـيء:** پێویسـتی پـێی بـوو، ئاتاجی پێبوو
**عَـوِزَ الرَّجُل:** پێویسـتی هـەبوو، بـاری دارایی خراپ بوو
**عَــوِزَ الأمْــرُ ( إشْــتَدَّ ):** توندبـــوو، قورسبوو، گران بوو، ئەستەم بوو
**عَـوَز( الحَاجَـة وَالضِيـق ):** نـەبوونی، هــەژاری، دەســتکورتی، نــەدارایی، گەدایی
**عَــوِز( مُحْتَــاج ـ فَقِــير ):** هــەژار، کەمدەست، گەدا، نەدارا ، نەبوو

**غَرَّبَ فُلاَنَاً( أَبْعَدَه وَنَحَاهُ ):** دووری خستەوە ، پەڕاگەندی کرد

**غَرَّبَ الدَّهْرُ فُلاَنَاً وَعَلَيهِ :** دووریخستەوە، پەڕاگەندەو دووری خست

**غَرَّبَ فِي الضَحْكِ( بَالَغَ فِيه ):** ئەوپێکەنینەی نەدەویست ، زۆری پێوەنا

**غَرْبُ:** خۆرئاوا، ڕۆژئاوا، دووری، بیانی، تیژی، توندوتیژی، سەرەتای هەرشتێك ، لێوار ، قەراخ ، لێڵیەکی زۆر

**غَرْبَ الدَّمعِ( مَدْمَع ):** کان فرمێسك، فرمێسکدان ، زمان تیژی

**غَرَبُ:** ئارەق ، مەی ، بادە، ئالتوون ، زیو ، پەرداخ ، تنۆکە ئاوی دۆڵچە لەنێو حەوزو بیردا کاتێ دەردەهێنرێو خێرا بۆنی دەگۆڕێت، جۆرە دارێکە ، نەخۆشیەکە دەدات لەمەڕو تووکی هەڵدەوەرێنێ

**غِرْبَال:** بێژنگ، کەو ، سەرەد، سەرەن، وێچنەویژنگ، مرازێکە دەغڵو دانی پێدا دەبێژرێ

**غَرْبَاً( ضِد شَرْقَاً ):** خۆرئاوا ، ڕۆژ ئاوا

**غُرْبَة:** کۆچکردن، وڵات بەجێهێشتن ، توونابوون، رەوەندە بوون

**غَرَبَة( بُعْد ):** دووری ، واژوی نزیکییە

**غَرْبَلَ الحِنْطَةَ( نَخَلَهَا ):** بێژایەوە، لەبێژنگیدا

**غَرْبَلَ الشَيء( نَقَاهُ ):** پاکی کردەوە، پاکژی کرد، پوختی کرد، بژاردی

**غَرْبَلَ فُلاَنٌ فِي الأَرْضِ( ذَهَبَ فِيهَا ):** پیای ڕۆیی ، ڕۆیی پیایدا، بەسەریا ڕۆیی

**غَرْبَلَ الحَبَّ وَنَحْوَه:** بەهێڵەك بێژایەوە، لەهێڵەکیدا

**غَرْبَلَ القَوم:** کوشتی، لەتو پەتیکرد

**غَرْبَلَ البَلَدُ وَالنَّاس:** خالّی ئاشکراکردن، حاڵو باری بەدەرخستن

**غَرْبَلَة:** بێژانەوە، کەوکردن، لەکەودان، پوختو پاکژکردن

**غَرْبِيُ:** خۆرئاوایی، ڕۆژئاوایی ، ئەوەی لەڕۆژئاواوە دێت لەبیروبۆچوونو ئایدیاو خەڵكو شتومەكو ...

**غِرْبِيب:** جۆرێکی باشی تریێیە، بەتەمەنێك قژی سپی بەخەنە رەنگ بکات ، رەشی چەتوون

**غُرَّة مِن كُلّ شَيء:** سەرەتای هەرشتێك، نۆبەرەی، یەکەمو باشترینی، سپێتیەکە لەنێوچەوانی ئەسپدایە، مارۆ

**غُرَّةٌ مِنَ الشَهْرِ:** مانگی نوێ، سەرەتای مانگی نوێ

**غُرَّةٌ مِنَ الهِلاَل:** دەرکەوتنی، هەڵهاتنی، سەرهەڵدانی ، ئاشکرابوونی

**غُرَّةٌ مِنَ الأَسْنَان:** سپێتیو بریقەی ددان

**غُرَّةٌ مِنَ الرَّجُل (وَجهه ):** ڕووخساری ، ڕووی

**غُرَّةٌ مِنَ القَومِ( شَرِيفُهُم وَسَيِدُهُم ):** ڕێزدارو گەورەیان، بەڕێزو گەورەیان

**غُرَّةٌ مِنَ المَتَاعِ( خِيَاره وَرَاسَه ):** باشەکەی ، چاکەکەی

**غَرَّةٌ:** هەڵە ، ناشی، ساویلکەیی، بێئاگایی لەکاتی وریاییو هۆشداریدا

**غَرِثَ( جَاعَ ):** برسی بوو، پێویستی بەخواردن بوو
**غَرَّثَهُ( جَوَّعَه ):** برسی کرد، نان‌و خواردنی لێگرتەوە
**غَرِدَ الطَّائر:** جریواندی ، خوێندی
**غَرِدَ الأَسْنَان:** دەنگی بەرزکردەوە بەگۆرانی وتن
**غَرَد:** جریوە ، خوێندن ، قاسپە، گۆرانی، هۆرە ، دەنگ بەرزکردنەوە
**غِرد ـ غَرد ( نَوعٌ مِنَ الفُطر ):** جۆرە قارچکێکە
**غَرَّرَ بِهِ تَغْرِيراً( عَرَّضَهُ لِلهَلَكَة ):** تووشی کرد، خستیە مەترسی‌و تیاچوونەوە
**غَرَّرَ بِنَفسِهِ وَمَالِهِ** خۆی‌و ماڵ‌و سامانی خستە مەترسیەوە
**غَرَّرَ الغُلامُ( طَلَعَ أولُ أسْنَانِه ):** یەکەم ددانی دەرهات
**غَرَّرَ الطَّيرُ:** هەردووباڵی بەرزکردەوەو فڕی ، باڵی دا بەیەکاو فڕی
**غَرَّرَ القِربَةَ( مَلأَهَا ):** پڕیکرد، تا دەمەکەی هێنا
**غَرَّرَ بِه:** تووشی کرد، دەستی بڕی، دەستخەڕۆیکرد
**غَرَر:** مەترسی، تووشکردن، مەترسی بەسەرهێنان ، مامەڵەی نەچەسپاوو جێگیر بەهۆی نەناسینی شت‌و مەکی کراوەوە
**غَرَزَ ـ غَرِزَ:** پیا چەقان، پیای‌کرد، تێی هەڵچەقان
**غَرَزَ الشَّيءَ فِي الشَّيءِ:** تێیدا جێگیری‌کرد، چەسپاندی تیایدا
**غَرَزَ العُودُ بالأرض ـ غَرَزَ الإبْرَةَ فِي الثَّوب:** چەقاندی ، پیاهەڵچەقان، پیاکرد، چەسپاندی، دایکوتا
**غَرِزَ ـ غَرْزاً:** گوێڕایەڵی، فەرمانڕەوایی‌کرد دوای یاخی بوون‌و سەرپێچی
**غَرَّزَ فُلانٌ الغَنَم:** لەنێوان دوو دۆشیندا جارێك نەیدۆشی هەتا قەڵەو ببێت
**غَرْز:** نەمام ، داری چەقاو
**غَرَز:** روەکێکی ساڵانەیەو زۆر بەربڵاوەو لق‌و پۆپی لێدەبێتەوە
**غَرَّزَت الجَرَادَة:** کلکی کرد بەزەویدا بۆئەوەی هێلکەی تیا دابنێت
**غَرَسَ الشَّجَر وَنَحْوَه:** دارەکەی رواند، ناشتی، لەزەویدا جێگیرو چەسپاوی‌کرد
**غَرْس( زرع ):** رواندن،ناشتن ، چەقاندن، جێگیرکردن
**غِرْس:** پێستێکی سپی ناسکە بەسەری منداڵی تازە لەدایك بووەوە ، نەمام ، شەتڵ، قەڵەم ، روەك، ئەوەی دەچەقێنرێ‌و دەروێنرێ
**غَرْسٌ مِنَ المَسْكُوكَات:** دراوێکی تورکی‌یە
**غَرَضَ فُلانٌ ـ غَرَضاً:** زوو هاتە سەرئاوەکە، گورج سەرئاو کەوت
**غَرَضَ السِّقَاءَ وَنَحْوَه ( مَلأَهُ ):** پڕیکرد، تاسەر لێوەکەی هێنا
**غَرَضَ الشَّيءِ ( كَفَّ عَنْه ):** وازی لێهێنا، دەستی لێکێشایەوە
**غَرَضَ ـ غَرِضَ الشَّيءَ( اجْتَنَاه طَرِيّاً ):** بەتەڕی کردیەوە، بەسەوزی لێی کردەوە
**غَرِضَ إلَيه( اشْتَاقَ ):** بیری کرد، غەریبی کرد ، دڵی بۆی سووتا

**غَـرِضَ مِنْـهُ( ضَجِـرَ وَمَـلَّ )**: بـێزاربوو، وەڕسبوو، جاڕس بوو، قەڵس بوو
**غَرِضَ الشَيءَ (كَانَ طَرِيَـاً )**: سـەوزبوو، هێشتا پێنەگەیی‌بوو، وەبەر نەهاتبوو
**غَـرِضَ فُلانَـاً( جَعَلَـهُ غَرَضَـاً يُرْمَـى )**: دەستنیشانی کـرد، کـردی بەنیشـانە ، کردی بەمەبەست
**غَرِضَ**: گۆشتی تـازەی خـوارد، گاڵتـەو شۆخی کرد
**غَـرِضَ الشَـيءَ**: بەسـەوزی لێـی کردەوە، بەسەوزی چنیەوە
**غَـرِضَ فـِي سِقَائِهِ( لَـمْ يَمـلأهُ )**: پـڕی نەکرد ، سەرلێوی نەکرد
**غَـرِضَ فُلانَـاً**: کـردی بـەجێی قسـەو تانـەو تەشـەر، کـردی بـەجێ نیشـان‌و توممەتبارکردن
**غَـرَض**: ئامـــانج ، مەبەســـت ، مەبەستێکی تایبەتی، نیشانە،خواستن، ویستن ، خواز، بەرژەوەندی، سوود
**غَرْضُ**: بەش‌و لایەکی دۆڵ‌و شیو
**غُرْضَـانِ فِـي الأَرْضِ**: ئێســـکی شۆڕبوەوەی هەردوولای لووت
**غُرْضُوفَـانِ**: دوو دارەی ناوەڕاســـت‌و دوای ولاخ کەبەراست‌و چەپا دەهێنرێ‌و دەبرێ
**غَرْغَرَ الْمَاءُ عَلَى النَّارِ( بَقْبَقَ )**: بڵقـە بڵقی کرد، قوڵپە قوڵپی کرد
**غَرْغَـرَ الرَّجُـلُ**: غەرغـەرەی پێکـرد لەدەمیا ، هێنای‌و بردی
**غَرْغَرَ الرُوحُ**: گەییـە گـەرووی لـەکاتی مەرگ‌و مردندا
**غَرْغَـرَ اللَحـمُ**: لـەکاتی برژاندنیـدا دەنگێکی لێهات ، چزە چزی هات

**غِرْغِـرُ( دَجَـاجُ حَبَشَـةَ )**: مریشـکی شاخدار، مریشکی حەبەشـی، جـۆرە مریشکێکی کێوی‌یەو شوێنی سەرەکی (ئەفریقا)یە
**غَرْغَرَةُ**: ئاو لەدەم وەردان، غەرغەرە، هێنان‌و بردنی دەرمان یان ئاو لەدەما ، دەرمانێك غەرغەرەی پێ بکرێ
**غَرْغَـرَةُ الْمَـوتِ( حَشْـرَجَةُ الْمَوتِ )**: دەم بەیەکدادان ، سەرەمەرگ، گیانەڵا
**غُرْغُـور**: ئاژەڵێکـە دەسـت‌و قـاچی کورتەو رەنگی بۆرە
**غَـرَفَ ـ إغْـتَرَفَ**: بەئەسـکوێ گرتـی، کەفەڵەی گرت
**غَرَفَ الغَـرَفَ وَالشَـيءَ( قَطَعَـهُ )**: بـڕی ، لەتیکرد، پارچە پارچەی کرد
**غَرَفَ النَّاصِيَةَ**: بڕی ، قرتاندی ، بڕی ، هەڵیپاچی
**غَرَفَ الجِلْدَ( دَبَغَهُ بِالغَرَفِ )**: خۆشی‌کرد پێی ، دەباغی کرد بەوداره دەباغی پێدەکرێ
**غَرَفَ الطَبِيخَ فِي الصَحـنِ( سَكَبَ الطَعَـامَ فِيـهِ )**: کردیـە قاپـەوە، خواردنەکـەی خستە نێو قاپەوە
**غَـرَفُ**: دارێکـی پچووکـە لەدوورگـەی عەرەب‌و میسرو ئەفریقاو هینـد هەیـەو گـــەڵاکانی درێژکۆلەیــــەو رەنگـــی بەرووبوومەکەشـی پرتەقاڵی‌یـــە هـــەتا سێمەتر بەرز دەبێتەوە
**غَرَفُ**: وردە گیا ، گیا وردە
**غُرْفَةُ**: ژوور ، هۆدە، دیو، ژۆر
**غُرْفَةُ عَلِيَةُ**: ژووری سەرەوە، باڵەخانە
**غُرْفَةُ الأَكْلِ**: ژووری نانخواردن

**غُرْفَةُ الطَّبْخ (مَطْبَخ):** ژووری چێشت لێنان ، مووبەق ، چێشتخانە
**غُرْفَةُ النَّوم:** ژووری نووستن ، خەوگە
**غُرْفَةُ الجُلوس:** ژووری دانیشتن
**غُرْفَةُ الإسْتِقْبَال:** ژووری میوان ، دیوەخان
**غُرْفَةُ المَكْتَب:** ژووری نووسینگە
**الغُرْفَةُ الزِرَاعِيَة:** ژووری کشتیاران ، بەکۆمەڵە کشتیارێك دەڵێن نوێنەری خۆیان هەڵبژاردوە بۆ لێکۆڵینەوە لەبەرژەوەندی کشتوکاڵی ، شوێنی کۆبوونەوەی جوتیاران
**الغُرْفَةُ التِجَارِيَة:** ژوور بازرگانی ، کۆمەڵە بازرگانێکن لەنێوخۆیاندا نوێنەر هەڵدەبژێرن لەپێناوی هەوڵدان بۆ بەرژەوەندی بازرگانی، شوێنی کۆبوونەوەی بازرگانەکانە
**غرْفَة:** نەعل ، سۆل
**غَرِقَ(غَاصَ):** نقوم بوو، بەقوولاچوو، نغرۆبوو
**غَرِقَ فِي المَاء:** لەنێو ئاوەکەدا خنکا ، ئاو گەییە گەرووی و بۆری هەناسەی و خنکاندی، کەوتە بنی ئاوەکەوە
**غَـرِقَ الحَـيِّ:** لەئاوا خنکا، خنکاو نقومبوو لەئاودا
**غَرِقَ فِي كَذَا(إنْهَمَكَ):** رۆچوو، خەریکبوو، سەرقاڵبوو
**غَرَّقَ الشَيءَ فِي المَاء:** لەنێو ئاوەکەدا نقومیکرد، ونی کرد
**غَرَّقَ المَكَانَ بِالمَاء (بَلَّلَه بِالمَاء):** پڕیکرد لەئاو ، بەئاو دایپۆشی
**غَرَّقَ السُوقَ بِالبَضَائِع:** بازاڕی پڕکرد لەشتو مەك
**غَرَّقَ الحَيَّ:** خنکاندی ، نقومی کرد
**غَرَّقَ فِي القَوس(مَدَّهَا غَايَةَ المَد):** زۆر درێژی کردەوە، بەڕادەیەکی زۆر درێژی کردو کشاندی
**غَرَقَ:** نقوم بوون ، رۆچوون
**غَرْقَأت الدَجَاجَة:** هێلکەیەکی کرد توێکڵە نەرمەکەی پێوە بوو
**غُرْقَة:** قومە شیرێك یان هەرشتێکیتر، مژێك
**غَرْقَدُ:** دارێکە لە(1- 3) مەتر بەرز دەبێتەوە
**غَرْقَلَ الرَّجُل:** بەیەك جام ئاویکرد بەسەریا
**غَرْقَلَ البَيضَةُ وَالبَطِيخَة:** ئاوەکەی تێکچوو، خراپ بوو، گەنی
**غرقِل:** سپێتی ، شووشەیی
**غِرقِيء:** توێکڵی سپی پێوەلکاوی دەوری هێلکە
**غَرِلَ الصَبِيُّ(عَظُمَت غُرْلَتَه):** پێستی براوی خەتەنەی گەورەبوو
**غَرِلَ العَامُ(أخْصَبَ):** بەفەڕو پیت بوو، ساڵێکی بەفەڕو پیت بوو
**غَـرِلَ العَيشُ(إتَّسَعَ):** فراوان بوو، خۆشبوو ، بەرین بوو
**غَرِلَ الرَّجُل:** کزولاوازبوو،سست بوو، راکشا، درێژ بوو
**غُرْلَة:** ئەوپێستەی لەئامرازی منداڵ دەبڕیێ لەکاتی خەتەنەو سوننەت کردندا
**غَرِمَ(خَسِرَ):** دۆڕانی ، زەرەری کرد، زیانی کرد

**غَـرِمَ غُرمَـاً وَغَرَامَـة:** پارەیـەك كەوتـە ئەستۆیو بەپێویسـت گـەڕا لەسـەری بیدات
**غَرِمَ الدِّيَة وَالدَّين:** خوێنباییو وامەكە كەوتە ئەستۆیو لەبری كەسانیتر دای
**غَرَّمَ( أَلْزَمَ بِغَرَامَة ):** پێی بـژارد، لێـی سەند، پێیدا
**غُرْمٌ:** ئەو بەلاّو زیانـەی دەدات لـەماڵو دارایـی مـرۆڤ بێئـەوەی سـووچی پـارەدارو خـاوەن بازرگـانی خـۆی تیابێت، تاوان ، وام
**غَرِنَ العَجِينُ عَلى الإِنَاء( يَبَسَ ):** وشـك بوەوە، وشك بوو
**غَرِنَ الرَّجُل( ضَعُفَ ):** لاوازبوو، كزبـوو، سیس بوو، لەڕبوو
**غُرْنُوق ـ غَرْنِيق:** جۆرێكە لەسـەقاكوڕ، قولنگ، لاوی جوانو قۆز
**غَرْوَى( الولوع بِالشَّيء ):** ئالوودەبوونی شتێك، حـەزكردن لەشتێك، پەرێشـان بوون بۆ شتێك، بەدلاّچوون
**غُرُوب الشَّمْس ( أُفُول ):** خۆرئـاوابوون ، ڕۆژئاوابوون
**غُرُور:** لەخۆبایی بـوون ، بـەخۆنازین ، خۆپەسـەندی ، بـایی بـوون ، فیـلّ ، گزی، تەڵەكە
**غَـرُور:** هەرچیـەك ببێتـە مایـەی گومڕایـیو لـەخۆبایی بوونـی مـرۆڤ لەدەستەلاّتو ئارەزوو شەیتانو ...
**غُرُوفٌ مِنَ الآبَار:** ئـەو بیرانـەی ئاویـان بەدەست دەردێت ، دەستی پێدەگات
**غُـرَوِيّ( كَـالغَراء ، لَـزِج ):** كـەتیرەیی ، ملّ، ملّی، لینج ، لیقن

**غَرِيَ بِهِ:** دڵی پیـاچوو، حـەزی لێكـرد، ئالوودەی بوو
**غَرِيَ فُلاَنٌ ( تَمَادَى فِي غَضَبِه ):** ڕۆچـوو لەتووڕەبووندا، یەكجار تووڕەبوو
**غَـرِيَ الغَدِيـرُ ( بَـرَدَ مَـاؤه ):** ئاوەكـەی ساردبوو، فێنك بوو
**غِرِيّ:** بۆیەیەكی سـوورە، نـاوی بتێكـە لەنەفامیدا بەخوێن سـوور دەكرا ، ڕوو دەموچاوی جوان
**غَرِيب:** نامۆ ، ئاوارە، ئاوەكی، توونا ، ناباو، سەیر ، سەمەرە، سەرسام كەر
**غَرِيبٌ مِنَ الكَلاَم:** گفتاری نادیار، وتەی سەیرو سەمەرە، درەنگ دەزانرێ
**غِرِّيد:** بـاڵندەی خـۆش ئـاواز، دەنـگ خۆش
**غَرِيــر:** خەڵــەتێنراو، فێڵلێكــراو، دەستبڕاو، فریودراو، هەڵخەڵەتاو، چـاو بەست لێكراو
**غُرَير( غُرغُور ـ يَربُـوع ):** گۆڕهەڵكەنـە، گۆڕكەنكــە، كــەمتیار، كفــن دز ، دەعبایـەكی كێـوی ڕەشـە لەپشـیلە پچووكترە گۆڕی مردوو هەڵ دەداتــەوە بۆ خواردنی جەستەو لاشەی
**غَرِيزَة:** خۆڕسك ، سرووشـت ، خۆمـاك، ژیری ، بەهرە، هۆش،توانا،حەزوویست
**غَرِيـزَة( فـي الفَلْسَـفَة ):** لەفەلسـفەدا بریتیـە لەدیمـەنێكی چوسـتو چـالاكی نەفسـیو جـۆرە ڕەوشێكیشـە پشـت دەبەسـتێت بەسروشــتو خۆڕسـكی بۆماوەیی بیۆلۆژی
**غَرِيــزِي( طَبِيعــي ):** خۆڕســكی ، سروشتی، ڕەوشتی خۆڕسكی ، خــووی سروشتی

**غَرِيس:** روێنراو، چێنراو، نێژراو

**غَرِيسَة( شَتْلَة ـ نَوَاة الزَرع ):** نەمام ، شەتڵ، شتل ، ئەشتر ، چێنراوو نێژراوی زەوی بەتۆو دەنك یان شەتڵو قەڵەم ، چەوتەك

**غَرِيض:** تازە ، پاراو ، نوێ، هەرسپییەکی تەڕو پاراو ، گۆرانی بێژی باش‌و چاك ، ئاوی باران

**غَرِيضَة:** دەنکە گەنمو جۆیەك بەر لەپێکەیشتنی بدورێتەوە

**غَرِيف:** دارودرەختی چڕوپڕ ، قامیشەلآن

**غَرِيفَة:** دارودرەختی چڕو بەیەکا دراو، نەعل، پێستەیەکە لەدەسکی شمشێر دەدرێت

**غَرِيق:** نقوم ، نقوم بوو، خەریك ، سەرقاڵ

**غَرِيم:** قەرزار، وامدار، دژکار، ناحەز، خەنێم، دژ ، دوژمن، خاوەن قەرز، قەرزدەر، وامدەر

**غَرِين:** لیتە ، قوڕو لیتەی پاش لافاو

**غَرِين ( في الجيُولوجيا ):** لەزەميناسيدا بەو بەردە قورینانە دەوترێت کەدەنکەکانی وردو ناسکن‌و لەسەریەك دەنیشن گەر ئاویان بەریکەویت

**غز**

**غَزَّ فُلاَن بِفُلاَن ( إختَصَه مِن بَين أصحَابِه ):** لەنێو هاوەڵەکانیدا دەستنیشانیکرد، دیاریکرد

**غَزَّ فُلاَن بالقَرَابَة وَالأولاَد وَالجِيرَان( بَرَّ بِهِم ):** چاك بوو لەگەڵیان، باش بوو لەگەڵیان ، چاکەکار بوو بۆیان

**غَزَّ الثوبَ أو الجِسم بالإبرَة وَنَحوِهَا :** بەمێواشی پیای چەقاند، تێی ژەند

**غَزَا العَدو:** داگیری کردن ، لەلانەو نیشتمانی خۆیاندا دای بەسەریاندا

**غَزَا الشَيءَ( طَلَبَهُ وَقَصَدَهُ ):** داوایکرد، مەبەستی بوو، خواستی

**غَزَّى فُلاَنَاً:** ئامادەی کرد، سازیکرد، خستیە گەڕ بۆ هێرش‌و پەلاماردان

**غَزَاة:** ناوی جەنگە

**غَزَّار:** روەکێکە قەڵەمی لێدروست دەکەن‌و لەپەرژینی بێستاندا بەکاردەبرێ

**غَزَارَة:** زۆری، خورەمی ، مشە ، لێشاو

**غَزَال:** ئاسك ، مامز ، ئاهو ، وەرەماس، گیاندارێکی چاورەشی جوانی خێرایە

**غَزَّال:** ریسەر، جاڵجاڵۆکە ، تەشی ، فرە ریسەر

**غَزَالَة :** مێ ئاسك ، ئاسکە مێ، رۆژ کاتێ بەرز دەبێتەوە

**غَزَالَةُ الضُحَى وَغَزَالاَتُه( أوّلُه ):** سەرەتای ، ساتی یەکەمی هەڵدانی

**غَزُرَ الشَيء (كَثُرَ):** زۆر بوو، فرەبوو، خورەم بوو، مشەبوو

**غَزَرَ:** لەنێو دوو دۆشیندا جارێك دەستبەرداری بوو

**غَزْر:** دەفرێکی پەڵو والآیە لەپەلکە دارخورما دروست دەکرێ

**غَزَلَ الصوفَ أو القُطن وَنَحْوَها**: رستی، بایدا ، ریسای
**غَزِلَ ـ غَزَلاً**: ئالوودەی قسە کردن بوو لەگەڵ ژناندا ، زۆر باسی ژنانی کرد، پیای هەڵدان ، لاواز لەهەوڵو کۆششدا
**غَـزَل**: دەستبازی ، چاوبازی، ماچو مووچ ، رابواردن ، دەمەتەقێ
**غَزْل**: رستن ، بادان ، ریسان
**غَزْلُ البَنَات**: پەشمەك
**غَزَلَ**: عەشقبازیو پیاهەڵدان بەژناندا
**غَزَلِي( غَرامِيّ )**:دلّداری، خۆشەویستی، شەیدایی، سەودایی
**غَـزو ( إغَـارَة )**: هـێرش ، هەڵمـەت ، هێرش بردنە سەر، هەڵمەت بردن بۆ ..
**غَزْوَة( غَارَة )**: هـێرش، هێرشی ناکاو، هێرشی کوتو پڕ، هەڵمـەتێك لـەپڕو ناکاوێکدا
**غَزِيـر( كَثِيـر )**: زۆر ، فرە ، خـورەم ، مشە ، لێشاو ، زۆرو فرەی هەرشتێك
**غَزِيرَة**: چـاوی پڕ ئەشكو فرمێسك ، بیری فرە ئاو ، حوشتری بەشیر
**غَزِيـل**: یـەکێك فـرە شـوێن ژنـان بکەوێت، مێباز ، ژنانی

**غ س**

**غَسَ خُطبَةَ الخَطِيبِ( عَابَهَا )**: رەخنەی لێگرت ، نکوولی لێکرد
**غَـسَّ البَعِـيرُ**: نەخۆشـی گـرت ، نەخۆشکەوت
**غُسّ**: پیاوی لاوازی سپڵە
**غَسَا الليلُ**: تاریکی شەو داهات
**غَسَّـاق**: کێـمو زوخـم ، ئـەوەی لەجەسـتەی دۆزەخیـەکان دەردێـت لەکێمو زوغم
**غَسَّـال ـ غَسَّـالَة**: جلشۆر ، ئامێرێکـە جلی پێدەشۆرێ یـان یـەکێك بەدەست جل بشوات
**غُسَـالَةُ مِنَ الشَّيءِ**: ئەو ئاوەی جلی پێدەشۆرێ
**غَسَـان**: نێوجەرگـەی دڵ ، نـاخی دەروون، بەندی هەناو
**غَسَانِيّ**: فرە جوانو شۆخ
**غَسَـرَ عَلَـى الغَرِيـم ( شَـدَّدَ عَلَيـهِ )**: توندبـوو لەسـەری ، رەق بـوو ، توندوتیژبوو بەرانبەری
**غَسر**: کاروباری ئاڵۆزو تێکەڵ
**غَسَـرُ**: پـوشو تـەپو تـۆزو شـتیتر کەرەشـەبا دەیخاتـە نێـو جۆگـەو ئەستێرك، پووشو پەلاش
**غَسَقَ الليلُ ـ غَسَقاً( أظلَـم )**: تاریکبوو، تاریکی داهات
**غَسَقَ القَمَرُ( أظلَم بِالخسوف )**: بـەمانگ گیران تاریك بوو
**غَسَقَ عَينـه ( سَـالَ دَمْعهَا )**: فرمێسکی لەبەر رۆیی ، ئەشکی رشت
**غَسَقَ السَمَاءُ( أظلَمَت وَأمطَرَت )**: تاریکی کردو باران باری
**غَسَـقَ الجُـرحَ**: زەرداوی لێ رۆیـی ، زەرداوی لێ تکا ، زەرداوی دەردا
**غَسَـق**: تـاریك داهـاتن ، زەردەپـەڕ، جۆرە گەنمێکە
**غَسَلَ الشَّيءَ ( أزَالَ عَنـهُ الوَسَخَ وَنَظَفَـهُ بِالمَـاءِ )**: پیسـایی بـەئاو لێکـردەوە، پاکی کردەوە
**غَسَلَ اللهُ حَوْبَتَـه( طَهَّرَهُ مِـن إثمِـهِ )**: لەگوناهو تاوان پاکی کردەوە

**غَسَلَ فُلاَنَاً بِالسَّوط (ضَرَبَه فَأَوجَعَه):** لێیداو ئێش و ژانی پێگەیاند
**غَسَّلَ الأَعْضَاءَ:** زۆرشتی، زیادەڕەویکرد لەشتنیدا
**غَسَّلَ المَیِّتَ (طَهَّرَهُ وَنَقَّاهُ):** پاک شتی، پاک و پوختی کردەوە
**غُسْل ـ غُسُل:** ئاوی شتن، سەرجەم جەستە شتن
**غِسْل ـ غُسْل:** ئەوەی جل و بەرگ و شتی پێدەشۆرێ لەئاوو ...، شتن، ششتن
**غَسْلَة:** شتن، بۆنیخۆش، ئاوی خۆشتن
**غِسْلِین:** چڵکاوو دەرهاویشتەی جل و بەرگ، کێم و زوخمی جەستەی دۆزەخیەکان کاتێ دەستوێنرێت بەئاگری دۆزەخ
**غَسَمَ اللیلُ:** تاریکی کرد، گەواڵە هەورێك
**غُسْمَة:** گەواڵە هەورێك، هەورێك
**غَسَنَهُ:** مژی
**غُسَنَه:** پارچە قژی پێشە سەر، پەرچەم
**غَسُول ـ غَسُول:** ئاوی خۆشتن
**غَسِیل:** شتن، ششتن، جل و بەرگی پیس و شۆراو

**غ ش**

**غَشَّ (خَدَعَ):** گزی کرد، فێڵی کرد، کەڵەکیدا، تەڵەکەی کرد
**غَشَّ صَدرُهُ (إنْطَوَى عَلَى الحِقْد وَالضَغِینَة):** پڕ لەخەشم و قین بوو، لەخەشم و قینا پەنگی خواردبوو
**غَشَّ صَاحِبَهُ:** ناپاکی کرد لەگەڵ هاوڕێکەی، دەستی بڕی، قۆڵی بڕی

**غَشّ:** فێڵکردن، گزی کردن، فەنگ، خەڵەتاندن، فاك و فیك
**غِشّ (خِداع):** فێل، تەڵەکە، گزی، خەڵەتاندن، دەستبڕین، چاوڕاو، کەڵەك، تەڵەکەبازی، ناپاکی، دەست پیسی، داوێن پیسی
**غَشَا فُلاَنَاً (أَتَاهُ):** هات بۆلای، ڕووی تێکرد
**غَشَّى اللهُ عَلَى بَصَره:** خوای گەورە دیەی کوێرکرد، وای لێکرد نەبینێ
**غَشَّى فُلاَنَاً بِالسَّوط أو السَّیف:** توند لێی‌دا، بەتوندی دایگرتەوە
**غَشَّى:** داپۆشی، ڕووکەشی کرد، بەرگی تێگرت
**غِشَاء:** بەرگ، توێکڵ، کەلوو، سەرقاپ، داپۆشەر، پێست توێژاڵ، توێژ
**غِشَاء (فِي الحَیوَانَات وَالنَبَاتَات):** ئەتەم، گەرای بەگیان هاتوو
**غِشَاء البَکَارَة:** کچێنی، بن، پەردەی کچێنی
**غِشَائی (قشري):** پێستدار، توێکڵدار
**غَشَّاش:** فێڵباز، گزیکەر، خەڵەتێنەر، کەڵەکچی، سەرچەوت، جامباز، تەڵەکەباز، دەست پیس، داوێن پیس، فریو باز، ساختەچی
**غَشَاش ـ غَشَاش:** یەکەم و دوا تاریکایی شەو، نەبینراو
**غَشَاشَ مِنَ النَّوم:** کەم، هەندێك، تۆزێك، خێرایی
**غَشَاشَة:** گرۆهو کۆمەڵی قۆڵبڕ
**غَشَّام (ظَالِم ـ جَائِر):** زۆردار، ستەمکار، داگیرکەر، چەوسێنەر

**غَشَاوَة:** داپۆشەر،پەردەو پۆشەر
**غَشَاوَةٌ عَلَى العَينِ:** لێڵیو پەڵەی سەرچاو ، لەکەی دیبه ، تانە ، لێڵی
**غشَايَة ـ غُشَايَة ـ غُشْيَة:** پەردە ، بەربەست ، کەمەرچین ، پۆشار ، چارشەف ، پەیە، شتێکە لەرووکاری شتێکیتر بگرێ
**غَشَشَ(خَدَعَ):** گزیکرد، فێڵیکرد، کەڵەکەی کرد
**غَشْشَهُ(مَكَرَ بِهِ):** خەڵەتانی ، هەڵیخەڵەتان ، فێڵی لێکرد ، کەڵەکی لێدا
**غَشَمَ ـ غَشِمَ:** زۆری لێکرد، زۆرداریکرد، جەورو ستەمیکرد، مافی خوارد
**غَشَمَ الحَاطِبُ:** بەشەو داری بڕیو بێبیرکردنەوەو سەیرکردن بڕی
**غَشَمَ الرَّجُل:** ستەمو زوڵمێکی گەورەی لێکرد
**غَشْمَرَ السَيلُ(أَقْبَلَ):** هات ، داباری ، دایدا
**غَشْمَرَ فُلانٌ:** بەحەقو ناحەق کەللەرەقی نواندو بەگوێی خۆی کرد، گوێی نەدایە رەفتارەکانی
**غَشْوَة ـ غُشْوَة ـ غِشْوَة(غِطَاء):** داپۆشەر، پەردە ، چەرچەف
**غَشُوم:** ستەمکار، زۆردار، یەکێك ستەم لەخەڵکی بکاتو تەمەنو ماڵو دارایی‌و هەموو پێکهاتەیەکی مرۆڤ بەهەدەر ببات
**غَشِيَ الليلُ(أَظْلَمَ):** تاریکی کرد، تاریکایی داهات
**غَشِيَ الفَرسُ وَغَيرَهُ:** ئەسپەکە بەتەنیا رەنگی سەری سپی بوو بەدەر لەجەستەی
**غَشِيَ المَكَانَ غِشْيَانًا(أتَاهُ):** هات بۆ لای ، رووی تێکرد، سەری دا ، بۆی چوو
**غَشِيَ الأمرَ(لابَسَهُ وبَاشَرَه):** کردی ، ئەنجامیدا ، بەجێی گەیاند
**غَشِيَ الأمرُ فُلانًا:** بەسەری هات ، تووشی بوو
**غَشِيَ فُلانًا بِالسُوط:** بەقامچی لێیدا ، توند هات بەسەریا ، دایگرتەوە
**غَشِيَ المَرأة (دَخَلَ عَلَيهَا):** لاقەی کرد، چوە لای
**غَشِيَ الحِصَانُ الفَرَسَ:** جووت بوو لەگەڵی ، چاکی کرد
**غُشِيَ عَلَيهِ(أُغمِيَ عَلَيهِ):** بوورایەوە، لەهۆش خۆی چوو ، بوردەوە
**غِشيَان(إتيَان):** هاتن ، سەردان ، بۆهاتن ، رووتێکردن
**غَشَيَان(إغمَاء):** بورانەوە، لەهۆش خۆچوون ، بوردنەوە
**غَشِيم(عَدِيمُ الخِبْرَة ـ غَيرُ مَاهِر):** نەزان ، گێل ، گەمژە ، بێئەزموون، کەودەن، تازەکار

**غ ص**

**غَصَّ بِالمَاءِ وَالطَعَامِ (إعتَرَضَ فِي حَلْقِهِ):** لەبینی گیرا ، لەقورگی گیرا
**غَصَّ المَكَانُ بِأهلِه (إمتَلأَ بِهِم وَضَاقَ):** توندو تەنگەبەر بوو پێیان ،قەڵەباڵغبوو
**غَصَّ الشَيءَ(قَطَعَهُ):** پارچەپارچەیکرد، لەت لەتیکرد، بڕی

**غَصّان:** لەبینگیران ، لـەقورگ گـیران ، هەناسەدان بەئەستەمو گران
**غَصَبَ الشّيءَ( أَخَذَهُ قَـهْراً وَظُلْمـاً ):** بـەزۆر بـردی ، بەسـتـەمو زۆرداری داگیری کرد
**غَصَبَ مِنْهُ مَالَهُ:** ماڵەکەی لێداگیرکرد، ماڵو سامانی لێسەند بەزۆر
**غَصَبَ المَـرْأَةَ (زَنَـى بِـهَا كُرْهَـاً ):** بـەزۆر دەستی بۆ برد، بەزۆر لاقـەی کـرد، ئەتکی کرد، فڕاندی
**غَصَبَ الجِلْدَ:** مووتوکەکانی لێکردەوە، موەکانی هەڵگرتو لایبرد
**غَصَـبَ فُلاَنَـاً عَلَـى الشَّـيءِ( قَـهَرَه ):** توڕەیکـرد، زۆری لێکـرد، خـەشمی لێگرت
**غَصْـب( جَـبْر ):** زۆر ، زۆرکـردن، ناچارکردن ، داگیرکردن
**غَصْباً( جَبْراً ):** بەزۆر ، بەزەبر
**غَصْبـاً عَـنْ( عَلَـى الرَّغْـمِ مِـنْ ):** لەگەڵ ئەوەشـا ، سـەرەڕای ئـەوە ، وێـڕای ئەوەش، سەرباری ئەوە
**غَصْبـاً عَلَـى (رَغْمَـاً عَلَـى):** بـەزۆری زۆردارەکی ، بەزەبرو زەنـگ ، لـەژێر زەبری
**غُصَّة:** خـواردنو ئـاوی گـیراو لـەبینو گەروو، خەمو خەفەت
**غَصَنَ الغُصْنُ( قَطَعَه ):** بڕی ، لـەتیکرد، لێی کردەوە
**غَصَنَ الشّيءَ( أَخَذَه ):** بردی ، هەڵیگرت
**غَصَـنَ فُلاَنَـاً عَـنْ حَاجَتِـه:** پێیـدا ، پێویستیەکانی بۆ دابینکرد
**غَصَنَ( نَبَتَت أغْصَانُها ):** لقی کرد، پـەلی دەردا

**غَصَّنَ العُنْقُود:** بۆڵەکانی گەورە بوون
**غُصْن( فَرع الشَّجَرَة ):** لق ، پـەل ، چڵ، زەل، زل، پت ، تل ، تەنیا بۆ تاکە گیا یا پووشێك بەکار دەبرێ
**غُصْنَة:** لەتـە چڵێکی پچووك لەپـەلو لقێك

**غ ض**

**غَضَّ طَرْفَهُ( خَفَضَه ):** چاوی دانـەواند ، دیبەی نەویکرد
**غَضَّ الطَـرفُ أو النَّظَـر عَـن ـ تَغَـاظَى عَنْ ):** چـاوی لێ پۆشـی ، لێـی بـورد، بەخشی
**غَضَّ مِن فُلان ( حَطَّ مِن قَـدْرِه ):** لـەنرخو رێــزی کــەم کــردەوە، شــکانی، سووکیکرد، بێبایەخی کرد
**غَضَّ النَّبَاتُ( نَظُر وطرو ):** تەڕو پاراو ، تەڕوبڕ
**غَضَّ الغُصْـنَ( كَسَـرهُ وَلَـم يتـم كَسـرَه ):** نوشــتانیەوە، خــواری کــردەوە، لاریکردەوە ، چەمانیەوە، شکانیەوە
**غَضَّ الشّـيءَ( نَقَصَـه ):** کـەمیکردەوە، کەلی کرد
**غَضَّ صَوْتَـهُ وَمِـن صَوتِـه( خَفَضَـه ):** دەنگی نزم کـردەوە، دەنگـی هێـواشو کزبوو
**غَضَّ طَرْفَـهُ عَـن فُلاَن:** ئـارامی گـرت بەرانبەر ئەو خراپەیەی کـردی لـەدژیو لێی نەگرت
**غَضّ( خَفـض ـ طَرِيء ):** نزمکردنـەوە، شۆڕکردنەوە، تەڕوپاراو، ناودار، سەوز
**غَضُّ الطَرَفِ( صَرفُ النَّظَر ):** چاوپۆشین، لێبوردن

**غَضَا الليل( عَمَّ ظَلاَمه كُل شَيء ):** تاریکاییەکەی هەمووشتێکی داپۆشی
**غَضَا فُلاَنٌ:** ناندەربوو، پێڵوەکانی لێك نزیك کردەوە
**غَضَا عَلَى الشَيء( سَكَتَ ):** بێدەنگبوو، خامۆش بوو، دەنگی لێنەهات
**غَضَا البَعِير:** لەدرەختی دارگەزی خوارد
**غَضَاة:** درەختی دارگەز، دار حەیزەران
**غَضَاب ـ غَضَاب( القَذَى فِي العَين ):** ریپۆق ، گوژاو، رچقاوە ، چڵکی نێو کەپۆو چاوانە
**غُضَابِيٌ:** ئالۆزو گرژ لەمامەڵەو تێکەڵبووونیدا
**غَضَار:** قوڕ، خاك، خاكو خۆڵ، خاكو خۆڵی پاکیزە، مووروویەکە دەکرێتە ملو گەردنی منالآن یان ئاژەڵ بۆ دوورخستنەوەی نەفەسو چاوی پیس، کووژەکە
**غَضَارَة:** پیت ، فەڕ، خۆشگوزەرانی، خۆشحاڵی، گڵەسوور، زەوی بەپیتو فەڕ، ژینی خۆشگوزەران
**غُضَاضُ:** پێشی سەرو دەمووچاو
**غَضَاضَة:** سووکی، نزمی، کەمی، ناتەواویی، تەڕو پاراوی
**غَضِبَ عَلَيه ـ غَضَباً:** لێی تورەبوو، خەشمو قینی هەستا بەرانبەریو ویستی تۆڵەی لێ بکاتەوە ، پیاهەڵشاخا، لێی زویر بوو
**غَضِبٌ مِنَ الرِّجَال:** پیاوی تورە، پیاوێك زوو تورەببێت

**غَضَبٌ:** تووڕەبوون ، تووڕەیی، هەڵشاخان، قین، رق ، داخ لەدڵی،بارو حاڵێکی دەروونییە لەئەنجامی حاڵێکەوە دەکەوێتەوە
**غَضِبَ ـ غَضْبَان:** تورە ، دڵگیر ، ترشو تاڵ، قیناوی، بەد مامەڵە
**غَضْبَة:** پێستەو کەوڵی نەهەنگ، پێستی سەر، تووڕەبوونێك ، خەشمگیرییەك
**غَضَّت المَرأة:** پێستی ناسکبوو، دەمارەکانی دیاربوون
**غُضَّة:** سووکی، نزمی، رسوایی، ناتەواویی ، کەمو کوڕی
**غَضَرَ عَلَيه( عَطَفَ ):** بەسۆزبوو بۆی ، بەزەیی پیاهاتەوە
**غَضَرَ عَنْهُ( عَدَلَ وَانْصَرَف ):**وازیلێهێنا، لێی دوورکەوتەوە
**غَضَرَ الشَيء( قَطَعَه ):** بڕی، لەت لەتیکرد، پارچە پارچەی کرد
**غَضَرَ لَهُ مِن مَالِه:** پشکێکی دایە، بەشێکی لەماڵەکەی دایە
**غَضَرَ الرَّجُلَ( حَبَسَه وَمَنَعَه ):** بەندی کردو یاساغی کرد لەسەری ، گرتی، نەیهێشت
**غَضَرَ الجِلد( أجَاد دِبَاغَه ):** بەباشی دەباخی کرد، پێستەکەی چاكو باش دەباخو خۆشکرد
**غَضَرَ اللهُ فُلاَناً ( أوسَعَ عَلَيه ):** خوا دەرووی لێکردەوە، رشتی بەسەریا ، رزقو رۆزی فراوانی دایە
**غَضِرَ الرَّجُل بِالْمَال وَالسَّعَة وَالأهْلِ:** ژینی بەپیتو فەرداربوو پاش قاتو قڕیو گرانیو نەبوونی

**غَشِرَ عَنِ الشَّيءِ( إِنْصَرَفَ ):** دووركەوتەوە، لایدا
**غَضُرَ ـ غَضَارَةً:** لەژین و گوزەرانێکی بەرین و گوشادابوو، لەحاڵ و بارێکی خۆشدابوو
**غَضُرَ النَّبَاتُ:** چاکبوو ، باش بوو، شیاوو لەباربوو
**غَضْرَاء:** خاک و خۆڵی بەپیت و فەڕ، گڵی سوور ، خۆشگوزەرانی، باشحاڵی
**غُضْرُوف:** کرکراگە، کرکرۆچکە، کراگە، ئێسقانێکی تەنکی نەرمە لەگوێچکەی گیاندار یان لە شوێنیتری جەستەدا
**غَضَّضَ فُلاَنٌ:** خواردنێکی تەڕو تازەی خوارد، تووشی سووکایەتی و سووکی هات
**غَضَّضَ الشَّيءُ:** تەڕبوو، تازەبوو، پاراوبوو
**غَضَفَ الفَرَسُ وَنَحْوَهُ:** بێشومار غاریکرد
**غَضَفَ العَيشُ غُضُوفاً ( نَعُمَ وَإتَّسَعَ ):** فراوان و گوشادبوو، خۆشگوزەران بوو، باش و چاکبوو
**غَضَفَ فُلاَنٌ( نَعِمَ بَالُهُ ):** حاڵ و باری باش ، بەئارام و هێمن بوو
**غَضَفَ العُودُ وَالشَّيءُ:** شکاندی و لوولیکرد، لەتیکردو نوشتانیەوە
**غَضَفَ الكَلبُ أُذُنَهُ:** هێنایە پێشەوە، قووتی کردو هێنایە پێشەوە
**غَضِفَ الشَّيءُ( إِستَرخَى ):** شۆڕی کردەوە، هێنایە خوارەوە
**غَضَفَ اللَيلُ( أَظْلَم وإسْوَدَّ ):** تاریکبوو، رەش بوو

**غَضِفَ العَامُ( أَخْصَبَ ):** بەپیت بوو، بەفەڕو پیت بوو
**غَضِفَ العَيشُ:** خۆشگوزەران بوو، حاڵ و باری باش بوو
**غَضَفٌ:** دارێکە لەهیندو لەدارخورما دەچێت و پەلکەکانی شتومەکی لێدروست دەکرێت
**غَضْفَرَ الشَّيءُ( ثَقُلَ ):** قورس بوو، کێشداربوو
**غَضْفَرٌ( الجَافِي الغَلِيظُ ):** وشکی توندو تیژ، رەق و زبری توندڕەو
**غَضَنَ الشَّيءَ( ثَنَاهُ ):** نوشتانیەوە، چرچیکرد، چرچ و لۆچیکرد، لوولیکرد، ژاکاندی
**غَضِنَ ـ غَضَنَ( تَجَعَّدَ ـ عَنَاءَ ):** چرچ بوون ، لوول بوون ، هەڵقرچان، ناڕەحەتی،زەحمەت، کێشە، هیلاکی
**غَضَنَ فُلاَنَاً( حَبَسَهُ ):** گرتی ، دەستگیری کرد
**غَضِنَتِ العَينُ( إِنْكَسَرَت خِلقَةً ):** چاوی خۆڕسکانە کوێربوو، زگماك کوێربوو
**غَضَنَتِ السَّمَاءُ:** بەردەوام بارانی باراند، بارانی وشکی نەکردەوە
**غَضَنْفَرٌ( أَسَد ):** شێر
**غُضُونٌ( تَجَعُّدَاتٌ ):** چرچ و لۆچی ، ژاکاوی
**غَضْيَاءُ مِنَ الأَرضِ:** زەوییەك دارگەزی زۆر بێت
**غَضِيرٌ:** بەپیت ، بەبەرهەم، بەفەڕوپیت، نەرم و نۆڵی هەرشتێك
**غَشِيرَةٌ:** زەمینی پاکیزەو بەفەڕو پیت

**غَضِيض:** سووك ، نزم ، رسوا، ناتەواو، بەروبووم كاتێ پێدەگات و بەدەردەكەوێت

**غَضِيضَة:** كەم و كوڕی، ناتەواویی

**غ ط**

**غَطَّ الشَيء فِي المَاء:** خستیە ئاوەوە، لەئاوی هەڵكێشا، نقومی‌كرد

**غَطَّ النَائِم( شَخَر ):** پرخانی، پرخەی هات ، پرخە پرخی هات

**غَطَّ القِدر:** كوڵاو دەنگی هات ، ویزەویزی لێوە هات

**غَطَّ الشَيء:** پەستاوتی، پەستایەوە ، كەبسی‌كرد، بەتوندی گوشی

**غَطَّ( غَمَس ):** نقوم كردن، خستنە ئاوەوە

**غَطَا الشَيء( سَتَرَهُ وَوَاراه ):** شاردیەوە، داپۆشی، خەفەیكرد، پەنهانی كرد

**غَطَا المَاءَ وَغَيرَهُ( إِرتَفَعَ ):** بەرزبووەوە، بالآبوو

**غَطَا اللَيلُ( سَتَرَت ظَلَمَتَه كُلَّ شَيء ):** تاریكاییەكەی گشت پێكهاتەو بوونێكی داپۆشی

**غَطَّى الشَيء:** شاردیەوە، پەنهانیكرد

**غِطَاء:** سەرقاپ ، تۆپەوانە، گوڵبێنە، داپۆشەر، تارا

**غِطَاءُ السَرِير:** چەرچەف، سەرجێگە

**غِطَاءُ المَائِدَة:** سەرمێز

**غِطَارِف( السَيِّدَ الكَرِيم ):** گەورەی ڕێزدار

**غَطَّاس:** مەلەوان ، بێ‌ئاوگەر

**غِطَاس( عِندَ النَصَارى ):** جەژنێكی گاورەكانە

**غِطْرَاف:** جوانمەردی سەخی و بدەر، لاوی رووخۆش و خۆش مەشرەب، گەورەیەكی پیاوچاك و مەرد

**غَطْرَسَ:** گەنجەفەی كرد، لووتی بەرزكردەوە، خۆی زلكرد

**غَطرَسَ عَلَى أَقرَانِه:** خۆی بەگەورەو زلتر دانا لەهاوەڵەكانی

**غَطْرَسَ فُلاَنَاً( أَغضَبَه ):** تووڕەیكرد،خەشم و قینی هەستان

**غِطرِس( الظَالِمُ المُتَكَبِر ):** ستەمكاری خۆبەزلزان، جەورداری لووتبەرز

**غَطرَسَة( تَكَبُر ):** روح زلی ، لووتبەرزی، گەنجەفەكردن

**غَطرَشَ فُلاَنٌ غَطرَشَةً( تَعَالَى عَنِ الحَق ):** لووتبەرزی‌كرد لەبەرانبەر حەق و راستیدا

**غَطرَفَ( عَبِثَ وَإِحتَالَ وَتَكَبَّرَ ):** خۆی بەگەورە دانا ، لووتبەرزی نواند

**غُطرُوف ـ غِطرُوف:** جوان ، قەشەنگ، لاوی زیرەك و دانا

**غِطرِيس:** روح زل ، لووتبەرز، خۆبەزلزان، بەخۆناز

**غِطرِيف:** سەرداری رێزدار، جوانمەردی بەخشندە

**غَطَسَ فِي المَاء( إِنغَمَسَ فِيه ):** نقومبوو، چوە بن ئاوەوە، خۆی نقوم كرد

**غَطَسَ فِي الإِنَاء( شَرِبَ مِنهُ بِفِيه ):** بەلێوگرتی و خواردیەوە

**غَطَسَ الشَيءَ فِي المَاء( غَمَسَهُ فِيه ):** نقومی كرد لەنێویدا، خستیە بن ئاوەكەوە

**غَطْس( إِنغِمَاس ):** نقوم بوون ، چوونەبن ئاو، لەئاو هەڵكێشان

**غَطَشَ الليلُ( إظْلَمَ ):** تاريكىكرد، تاريك داهات

**غَطَشَ فُلانٌ غَطَشاً:** مێدى مێدى ڕۆيى بەهۆى نەخۆشى يان خۆبەزلزانينەوە

**غَطِشَ ـ غَطَشاً:** چاوكزو لاوازبوو ، چاوكزبوو

**غَطَّشَ لِي شَيئاً:** دەروازەو ڕووى كارو فرمان يان قسەو ڕادەربڕينم بۆ والآبكە

**غَطْغَطَ القِدْرُ( صَوّتَ عِنْدَ الغَلَيانِ ):** ويزە ويزى هات ، ويزەو فيشكەى هات

**غَطْغَطَ البَحْرُ( عَلَتْ أمْوَاجُه ):** شەپۆلەكانى بەرزبوونەوە، هەڵسان

**غَطْغَطَ عَلَيهِ النَومُ( غَلَبَ ):** خەو زاڵبوو بەسەريا ، خەواڵوبوو، خەو گرتى

**غَطِفَ العَيشُ( إتَّسَعَ وَلانَ ):** فراوانو گوشادبوو ، بەرينو والآبوو، هێمنو بەئارام بوو

**غَطِفَ الرَّجُلُ:** ئەبرۆكانى كەم بوو بوون

**غَطَوَانٌ:** زۆريى ، فرەيى، ڕێگريىو قەڵغانداريى

**غَطُوس:** پێشەنگ لەجەنگو شەڕا

**غَطَيَانٌ:** شەپۆلەكانى دەريا ، گەردەلوولو شەپۆلى دەريا

**غ ف**

**غَفَا ـ غَفْواً ـ وَغُفُوّاً ( نَامَ قَلِيلاً ـ نَعَسَ ):** كەمێك نووست ، خەوت ، سەرخەوى شكاند، كەم نوست

**غَفَا الشَيءُ عَلَى المَاءِ( طَفَا فَوقَه ):** كەوتەسەرى، هاتە سەر ئاو

**غَفَا:** كا لەسەرخەرمانو جۆخێنەكەى، توێكڵى گەنم

**غَفَّار(كَثِير المَغْفِرَة ـ مَن يَغْفِر ):** بەخشندە، بەخشەر، دەبەخشىٚ، يەكێكە لەسيفەتەكانى پەروەردگار

**غُفَارُ:** گەنەموو، مووى گەردنو ڕووخسارو لاق

**غِفَارَةٌ:** سەرپۆش ، سەرقاپ ، داپۆشەر، پۆشين، گەواڵە هەورى لەسەريەك نيشتوو

**غَفَارَةٌ:** جبەيەكى بەرينو والآيە كەشيشو قەشەكان لەبەرى دەكەن

**غُفَّةٌ:** شتێكى كەم لەبەهارا ، ئەوەى حوشتر لەناكاوێكدا بەدەمەوە دەيگرێت

**غُفَّةُ الإنَاءِ وَالضَرعِ (بَقِيَة مَافِيه ):** پاشماوەى نێوى ، تياماوەى

**غَفَرَ( إغْتَفَرَلَهُ الذَنْب ):** بەخشى ، پێىبوو، بۆى پۆشى ، لێى خۆش بوو، چاوى لىٚ پۆشى ، بووراى

**غَفَرَ الجَرِيح أو المَرِيض:** شكايەوە، چرووسايەوەو پەرێشان بوو

**غَفَرَ الشَيءِ ( سَتَرَه ):** داپۆشى ، بەنهانيكرد

**غَفَرَ الشَيب بِالخِضَابِ:** بەخەنە پيرى داپۆشى ، بەخەنە موە سپيەكانى گۆڕى

**غَفَرَ المَتَاعَ فِي الوِعَاءِ:** شتو مەكانى لەنێو قاپو قاچاغدا شاردەوەو هەڵگرت

**غَفَرَ اللهُ لَهُ ذَنْبَه:** خواى گەورە لەگوناهو تاوانەكانى خۆش بوو، لێى بوورا

**غَفَرَ الشَيءَ:** داپۆشى ، سەرى نايەوە، دەريخست

**غَفَرَ الرَّجُل( قَالَ: غَفَرَ اللهُ لَه ):** گوتی: خوای لێی خۆش بێت، خـوای گـەورە ببورێت لێی
**غَفَر:** گەندەموو، مووی گەردن و لاق
**غَفَر:** ورگ، سك
**غفر( وَلَدُ البَقَر ):** بەچکـەی نـێرەی مانگا ، پارێن ، پانێر، سەنگۆ، پارنگۆ، لامێش، گۆلکە نێر
**غَفَـر:** روەکێکـە لەکێڵگـەو باخچـە دەروێت
**غَفَرَ مِنَ الكَلأ:** وردە گیا ، گیا گردە
**غُفـَـرَة:** سـەرقاپ، سـەرپۆش ، دەمەوانە، سەرو رووپاگیری هەر شتێك
**غَفَقَ فُلاَنٌ( هَجَمَ عَلى الشَّيء فَجْأَة ):** لەناكاو هێرشـی بـردە سـەر ، لـەپڕا هەڵمەتی بۆ برد ، لەناوارەیی و دووریـی لەناكاو گەڕایەوە
**غَفَـقَ الرَّجُـل:** جـار لـەدوای جـار خواردیەوە، بەردەوام هەڵیقوڕاند
**غَفَقَ فُلاَن غَفْقَة:** چاوی لێکنـاو گـوێی لەقسەی دەوروبەرەکەی بـوو، نوستـو گـوێی لەوانـەی دەوری بـوو قسـەیان دەکرد
**غَفْق:** نەرمە باران ، بارانێکی هێـواش و لەسەرخۆ
**غَفَـلَ عَـنِ الشَّـيء:** هەڵـەیکرد، سەهویکرد، بەهۆی کەمی ئەزموونەوە هەڵەی کرد، نەی پێکا ، بەهەڵەدا چوو
**غَفَلَ الشَّيء( تَرَكَه إهْمَالاً مِن غَيرِ نِسْـيَان ):** هـەروا وازی لێـهێناو فەرامۆشـی کـرد، بەدەسـتی ئەنقەسـت دەستبەرداری بوو

**غَفَلَ عَنْ( سَهَا عَنْ ):** لـەبیری چـوو، فەرامۆشی کرد، خافڵ بوو
**غَفَّـلَ فُلاَنـاً:** بێئاگـایکرد، لـەبیری بـردەوە، هۆشـی لەبـەرخۆی بـڕی ، گێلیکرد، بوویەهۆی فەرامۆش بوونی
**غَفَّـلَ الشَّـيء( سَتَـرَه ):** شـاردیەوە، داپۆشی، پەنهانی کرد
**غُفْل:** بێناونیشـان ، نیشـانەی پێـوە نییـە ، نەکـەڵکی هەیـەو نـەزیان ، نەناسـراو، ماددەیـەکی خـاو کـەهێچ گۆڕانێکـی بەسـەرا نـەهێنرابێت، بەکارنەهێنراو، شەقڵ نەشکێنراو
**غُفْلٌ مِنَ الشِّعْر( مَا يُجْهَل قَائِلُه ):** هۆنراوەی بێخاوەن
**غُفْلٌ مِنَ الأرْض( مَالا عِمَارَةَ فِيه ):** چۆڵ، بیابان ، کەلاوە ، بەیار
**غُفْلٌ مِنَ الكُتُب( الذي لَم يُسَمَّ وَاضِعُه ):** کتێب ناوی تیا نەبێت ، پەرتوکێك ناوی دانەرو نووسەری پێوە نەبێ
**غَفَل:** گوزەرانباشی، بەرینـی و فراوانـی ژین و بژێوی
**غُفْلاَن:** بێئاگایی، بێخەبەر
**غَفْلاَن** بێئاگا، گێل ، گەمژە ، کەودەن
**غَفْلَة:** گێلی ، لەبیرچوون ، بێئاگایی
**غَفْوَة:** سەرخەوشکان ، چاوچوونە خەو
**غَفُـور:** لێخۆشـبوو، بەخشـەر، بەخشندە، ناوێکی جوانی پەروەردگارە
**غَفِيَ البُر:** پاکـی کـردەوە، بـژاردی لەکاو پووش
**غَفِيَ( نَعَسَ ):** سەرخەوی شکان، چـاوی چووەخەو، کەم نوست
**غَفِير:** پاسـەوان، حەسـحەس، مـووی گەردن و لاق و رووخسار

**غ ق**

**غقْ غقْ:** گیزەگیزی ئاوی لەکولْ، دەنگی باڵندەو ئاو لەهەندێك حاڵو باردا

**غقَّ القارُ وَالقِدرِ وَنحْوَهَا:** دەنگی لێهات، گیزەگیزی هات

**غقَّ الطائِرُ غقِيقاً:** دەنگی لێهات، دەنگی بەرز کردەوە

**غَقَقَةُ( الخُطاطِيف الجَبَلِيّة ):** پەرەسێلکەی شاخو چیا

**غَقْغَقَ الصَّقَرُ:** دەنگی ناسك بوو، دەنگێکی ناسکی لێهات، زیقەی هات

**غ ل**

**غَلَّ المَاءُ بَينَ الأشجارِ:** ئاوەکە لەنێو دارەکانەوە ڕۆیی، بەنێو دارەکانا جۆگەی بەست

**غَلَّ بَصَرُ فُلاَنٍ( حَادَ عَنِ الصَوابِ ):** لەراستی لایدا، لەراستی ترازا، دەرچوو

**غَلَّ فِي الشَيءِ( دَخَلَ فِيهِ ):** چوە نێوی، ڕۆچوو بەناویا

**غَلَّ الشَيءَ فِي غَيرِهِ( أدْخَلَهُ فِيهِ ):** خستیە ناوی، لەنێوی نا

**غَلَّ فُلاَناً:** کۆتو بەندی خستە نێو دەستو گەردنی

**غَلَّ الغُلاَلَةَ:** لەژێر جلەکانیەوە لەبەریکرد

**غَلَّ فُلاَنٌ غُلُولاً( خَانَ فِي المَغْنَمِ ):** خیانەتو ناپاکیکرد لە دەستکەوتەکاندا، دزی کرد

**غَلَّ صَدْرَهُ:** سینەی پڕ لەخەشمو قینبوو، دڵپیسو گەندەڵ بوو، غەریزەی هەڵگرت

**غَلَّ يَدَهُ:** دەستی بەست، دەست بەستی کرد، کەلەبچەی کرد

**غُلَّ( عَطِشَ أشَدَّ العَطَشِ ):** فرە تینوبوو، زۆر پێویستی بە ئاوبوو

**غَلَّ البَعِيرُ. غُلَّةً:** چوە سەر ئاوو نەیخواردەوەو ڕۆیی

**غُلُّ:** کۆت، تەوق، پێوەند، دەستبەست، زنجیر، کەلەبچە، تینوویەتی

**غِلّ:** کینە، رق، کووڤان، ئەرناف، پیش، پشم، رۆڤك، رك، دەخەز، جەنە، غەید، دڵپڕ، مەڕس

**غَلاَ السِعْرُ:** گرانیکرد، بەرزبوەوە، لەئاستی خۆی دەرچوو

**غَلاَ النَبْتُ( إرْتَفَعَ وَعَظُمَ وَالتَفَّ ):** بەرزبوەوەو چڕوپڕبوو

**غَلاَ فُلاَنٌ فِي الأمْرِ وَالدِّينِ( تَشَدَّدَ وَأفْرَطَ ):** لەسنوور دەرچوو، زیادەڕەوی کرد، توندڕەوبوو

**غَلاَ السَهْمُ:** بەرزبوەوە، لەڕادەی خۆی دەرچوو

**غَلاَ بِالسَهْمِ:** دەستی بەرزکردەوەو ویستی هەتا دوورترین رادە هەڵی بدات

**غَلاَ فِي الأمْرِ:** زیادەڕەویکرد، لەسنوور دەرچوو

**غَلَى السِعْرَ( أغْلاَهُ ):** گرانیکرد، نرخەکەی بەرز کردەوە

**غَلَى القِدْرُ( جَعَلَهَا تَغْلِيّ ):** کولاندی، هێنایە جۆشو کوڵان

**غَلَى الرَّجُلَ:** لەدوورەوە سەلامی کرد، دووراو دوور ئامآژەو سەلامیکرد

**غَلاَء( إرتِفَاع السِعْر ):** بەرزبوونەوەی نرخ، گرانی

**غَلاءُ المَعِيشَة:** گرانی بژێوی، پاڵپشتی دەرامەتو بژێوی

**غَلائِل:** سوویەرو پۆشاکی ژێر قەڵغان

**غَلاّب:** یەکێك زۆر سەرکەوتوویێت

**غَلاّط(كَثِيرُ الغَلَط):** هەڵەکار ، فرە هەڵە

**غُلاَط:** گەورەو ورد، وردو درشت

**غِلاَف:** بەرگ، زەرف ، پاکەت ، پەردە، روو

**غِلاَفُ الكِتَاب:** بەرگی کتێب، رووی دەرەوەی

**غِلاَلَة:** پەردەی ناسك، جلێکە لەژێر جلو بەرگەوە یان قەڵغانەوە لەبەردەکرێت

**غُلاَم:** گەنج ، لاو ، هەرزەکار، ئیشکەر، پیاو، کۆیلە، منداڵ لەوکاتەوە لەدایك دەبێت تا پیربوونی

**غُلاَمِيَّة:** منداڵی ، پچووکی

**غَلاّيَة:** ئاوکوڵێن، بۆیلەر، کوڵێنەر

**غَلَبَ عَلَيه:** بەزانی، شکانی، زاڵبوو بەسەریا ، بۆرپیدا، سەرکەوت بەسەریا، لێی بردەوە

**غَلِبَ ـ غَلَباً:** گەردنی رەق بوو، مل پتەو بوو

**غَلِبَ الحَدِيقَة:** دارو درەختەکانی چڕوپڕبوون

**غَلَبَ عَلَى الشَّيء(أَخَذَ مِنهُ قَهراً):** بەزۆر لێی سەند، لێی زەوتکرد

**غَلَبَ عَلَى صَاحِبِه:** بڕیاری سەرکەوتنو زاڵبوونی بۆدا

**غَلَب:** سەرکەوتن ، شکاندن، داگیرکردن، زاڵبوون ، بردنەوە، بۆردان

**غَلْبَاء:** باخچەیەکی فرەدارو درەخت، تەپۆلکەیەکی بەرزو بڵند، مۆزوتیرەیەکی زۆر بێشومار

**غَلَبَة:** داگیرکردن، زاڵبوون، سەرکەوتن، بردنەوە

**غُلَّة:** تینوویەتی سەختو گران ، سەری چاپەز، داپۆشەری مرۆڤ

**غَلَّة:** دەستکەوت ، بەرهەم

**غَلَّةُ الأَرض(مَحصُول ـ حُبُوب):** خەڵە ، بەرهەم، دانەوێڵە، دانوو

**غَلَتَ ـ غَلَتاً(فَسَخَ البَيع):** مامەڵەکەی هەڵوەشانەوە

**غَلَتَة(أَوَّلُ اللَيل):** سەرەتای شەو

**غَلَثَ الشَّيء بِالشَّيء(خَلَطَهُ بِهِ):** تێکەڵیکرد، ئاوێتەی کرد

**غَلَثَ فِي الحَرب:** رۆچوو تیایدا ، پێی داگرت

**غَلِثَ بِالشَّيء(لَزِمَه):** گرتی ، پێوەی نووسا

**غَلِثَ الطَّائِر:** قووتیدا ، هەڵیدا

**غَلِثَ فُلاَنٌ:** حەزی لەخواردنو خواردنەوە کرد، شەهیەی بۆ جوولا، خەوگێژو گۆجی کردبوو

**غَلَثُ الحُلم:** خەوی تێکەڵو پێکەڵ، رووداوو حاڵێکە لەخەوداو خەونی راستەقینە نییە

**غَلَجَ:** غارێکی‌کرد ، جار بەجار خێرای دەکردو دەوەستا

**غَلَجَ الحِمَارُ:** ئاوی خواردەوەو زمانی دەرهێناو لێوی سڕی

**غَلَسَ القَومُ:** بەتاریکی شەو رۆیشتن ، تاریکبوو بەرێکەوتن

**غَلَّسَ فُلانٌ بِالصَلاَة( صَلاَّهَا بِغَلَس ):** هێشتا تاریكبوو نوێژی كرد
**غَلَّسَ القَومُ المَاءَ:** شەو هاتنە سەر ئاوەكە، شەوبوو چوونە سەری
**غَلَسٌ:** تاریكایی كۆتایی شەو ، بەرەبەیان
**غَلْصَمَةُ الحَلْقِ:** قورگ، گۆشتی مابەینی سەرو گەردن، گەروو
**غَلْصَمَةُ السَمَك:** گوێچكە ماسی
**غَلطَ ـ غَلَطاً:** هەڵەیكرد، نەی پێكا
**غَلَط ( خَطَأ ـ غَيرَ صَحِيح ):** هەڵە ، چەوت ، ناڕاست ، نادروست
**غَلَّطَ( نَسَبَ إلَى الغَلَط ):** بەهەڵەیا برد
**غَلْطَان:** هەڵەكار ، چەوتكار
**غَلْطَةٌ كتابِيَةٌ:** هەڵەی نووسین
**غَلـظَ ـ غَلُـظَ ( أصبَـحَ غَلِيظَاً ):** ئەستوربوو، رەق بوو
**غَلُظَ الزَّرعُ:** رواو دیاریدا ، سەری هەڵدا
**غَلُظَ الرَّجُل( إشْتَدَّ ):** توندو رەق بوو، زبر بوو
**غَلُظَ الأرضُ( كَانَت غَير سَهْلَة ):** رەقبوو، سەخت بوو
**غَلُظَ الخُلُقُ ، وَالطَبْعُ ، وَالقَولُ ، وَالفِعلُ ، وَالعَيشُ( إشْتَدَّ وَصَعُبَ ):** توندو سەخت بوو، گرانو ئەستەم بوو ، مەحاڵبوو
**غَلَّظَ اليَمِينَ( أكَدَّهَا ):** چەسپاندی، جێگیری كرد ، سوێندەكەی دووپات كردەوە
**غَلظ ـ غِلْظَة:** ئەستووری ، قەدداریی، زبری، رەقی ، رەقو وشكی ، توندوتیژی ، دوژمنایەتی، ناحەزی

**غَلَظَ منَ الأرْض:** زەوییەكی رەقو زبر
**غَلْغَلَ( أسرَعَ فِي سَيرِه ):** لەڕۆیشتنا پەلەیكرد، خێرایكرد
**غَلْغَلَ الشَّيءَ فِي الشَّيء:** خستیە ناویەوە، تێی هەڵكێشاو بوو بەبەشێك لەو
**غَلْفَل:** رەگو ریشەی دارو درەخت كاتێ رۆدەچێت بەنێو زەویدا
**غُلْغُلَة:** تێكەڵبوونی دەنگ، دەنگە دەنگ، هەراو قاووقیژ، ژاوەژاو
**غَلَفَ الشَّيء:** خستیە بەرگەوە، بەرگی بۆ دروست كرد
**غَلَفَ القَارُورَة:** داپۆشی ، سەری نایەوە، پێچایەوە
**غَلَفَ الكِتَاب:** بەرگی بۆ كرد، بەرگی تێكرت
**غَلِفَ الصَبِيُّ( لَم يُختَن ):** خەتەنە نەكرابوو، سوننەت نەكرابوو
**غَلِفَ قَلْبُهُ( لَم يَعِ الرُشْد ):** بێدارنەبوو، كوێربوو، راستیو دروستی نەبیست ، دڵكوێربوو
**غَلْف:** دارێكە لە دەباغو خۆشكردنی پێستەدا بەكاردەبرێ
**غُلْفَة( الجُلَيدَة التي يَقْطَعهَا الخَاتِن ):** پێستی خەتەنە، ئەو پێستەی پێی ئەڵێن خەتەنە
**غَلَقَ البَاب:** دایخست ، پێوەیدا، جووتیكرد، دەریخست، قووچانی
**غَلِقَ البَابَ( عَسُرَ فَتْحُه ):** بەچەشنێ دایخست ئەستەم بوو كردنەوەی
**غَلِقَ الرَّهْنُ:** لەدەستی بارمەتە وەرگرا مایەوە، بوو بەهی خۆی

**غَلَقَ الجَانِي وَالأسِير:** بەدەستگیرکراویی مایەوە، وەك خۆی مایەوە

**غَلِقَ فُلاَنٌ( ضَاقَ صَدْرَهُ وَقَلَّ صَبْرَه ):** سینەی تەنگ بوو، بێئارام بوو، سینەتەنگو بێئارام بوو

**غَلَّقَ الأبْوَابَ:** بەتوندو قایم دایخست

**غَلِقَ( مَا أَشْكَلَ مِنَ الكَلاَم ):** نادیار، قورسو گران، نارووونو ناشكرا، قسەو وتەی دژوارو نائاشكرا

**غَلَق( مَا يُغْلَق بِهِ البَاب ):** كلۆم، كلیل، دەرگا، داخەر

**غَلَق( البَاب المُغْلَق ):** دەرگای داخراو، جووتكراو

**غَلَّ الغلاَلَة:** لەبەری كرد، پۆشی

**غَلَّ يَدَيـه:** دەستی بەست، كەلەبچەیكرد، دەست بەستی كرد

**غَلَل:** تینوویەتی سەختو گران، ئاوی بێدەرچەو دەروازە جارێك دەردەكەوێتو جارێك وندەبێت، ئاوی نێو رەگو ریشەی دارو درەخت

**غُلُـو:** رۆچوون، لەرادەبەدەر پێراكێشان

**غُلْوَاء ـ غُلَوَاء( مُجَاوَزَة الحَد ):** لەوزەو رادەچوونە دەرەوە، سەركەشی، لاف، گەزاف، پێوەنان

**غُلْوَاء الشَبَاب:** هەرەتی، لاوی، سەرەتای تەمەن، هەرزەكاری

**غَلْوَة:** ئەندازەی رۆینی تیر لەكۆندا بە(300 ـ 400) باڵ دەپێوراو ئەمرۆش بە(200) مەتر

**غَلُوطَة:** باسو مەسەلەیەك فرە هەڵەی تیابكرێ

**غَلُـول:** خواردنو خواردنەوەیەك راستەوخۆ كاریگەری دەربكەوێت لەسەر مرۆڤ

**غُلُومَة:** هەرزەكاری، ئارەزووهەڵسان، ئارەزووی پەرین، حەزو ئارەزووی جینسی

**غُلُومِيَّة:** حاڵی هەرزەكاری، هەرزەیی

**غَلِيٌّ:** نرخدار، گران، بەنرخ

**غَلِيظ:** ئەستوور، قەفدار، زبر، رەق، رەقو وشك، توندوتیژ، بەزەبر

**غَلِيظ القَلْب( عَدِيم الرَحْمَة ):** دڵرەق، بێسۆزو بەزەیی

**غَلِيظ الرَقَبَة( عَنِيد ):** سەركێش، قەیسیچمە، لاساری، ملهوڕ

**غَلِيل:** تینوویەتی سەختو گران، خەشمو قین، كینەو دڵزامداری، گەرمی ئەوینو خەمو خەفەت

**غَلِيلَة:** پۆشاكی ژێر ئەڵقان

**غَلْيُون:** سەبیل، دارجگەرە، ناوێكی كەشتی چارۆكەدارە

**غ م**

**غَمَّ اليَومُ ( إشْتَدَّ حَتَّى كَادَ يَأخُذ بِالنَفَس ):** تاوی سەند بەرادەیەك هەناسەی سواركرد، یەكەمجار گەرمبوو

**غَمَّ الشَيء( غَطَاهُ وسَتَرَه ):** دایپۆشی، شاردیەوە، پەنهانی كرد

**غَمَّ القَمَرُ النُجُوم:** تیشكی رووناكی خۆر ئەستێرەكانی دایپۆشی

**غَمَّ فُلاَنـاً ( حَزَنَه ):** غەمباری پەژارەی دایە، داخی كرد بەدڵیا

**غَمَّ الشَيءَ الشَيء ( عَلاَه ):** زاڵبوو بەسەریا، بالابوو، لەسەرییو ئەودرەبوو

**غُمَّ عليه الهِلالُ:** مانگی نەبینی، لێی شاردرایەوە، مانگی لێ ونبوو بەهۆی هەورەوە

**غَمّ (حُـزْن):** پەستی، دڵگیری، پەژارە، خەمو خەفەت، ماتەمینی، داخ، جەخار

**غَمّ:** تاریکی، لێڵی، ناڕەحەتی کاتێ دێت بەسەر کۆمەڵێکدا لەجەنگو شەڕدا

**غَمّ الشّيء:** دایپۆشی، گرتی

**غُمَّى (شَدِيدَة مِن شَدَائِد الدَّهْر):** نەهامەتیو ناڕەحەتیەکانی سەردەمو ڕۆژگار، مەینەتیەکانی، کاری دژوار

**غَمَّى البَيتَ (غَطّاهُ بالخَشَب والطِّين):** سەریگرت، دارەڕایکرد، گڵەبانی کرد

**غَمًى:** دارەڕا، گڵەبان، داری، ئەو دارانەیە کەبەسەر خانووەکاندا ڕایەڵ دەکرێو قامیشو بەڕدیچیان لەسەر دادەنرێو دادەپۆشرێ

**غَمَّـاء:** نەهامەتی، بەدبەختی، بەلاوگرفت

**غُمَاء ـ غَمَار:** گرۆهو تاقمی خەڵکی، دەستەو کۆمەڵیان

**غَمَار (الجَهْل وعَدَم الخِبْرَة):** نەزانینو کەم ئەزموونی، گێلیو نەئەزموونی، ناشێنی، نەفامی، نەزانین، گێلی

**غَمَاز:** ئاماژەکردن بەچاوو برۆ، ڕازدەربڕین، چاوداگر

**غَمَّازَة:** قولاپی ماسی گرتن، کیژی جوان ئەندامو ڕازدەربڕ

**غَمَّاسَة:** تێهەڵچەقاندن یان سمین، ونبوونی ئامرازیبریندارکردن لەگۆشتدا

**غَمَاص ـ غَمَاض:** چاولێکنان، خەوتن، نوستن

**غُمَام:** هەور، گەواڵە هەورێك

**غَمَام:** هەلامەت، پەسیف

**غَمَامَة:** گەواڵە هەورێك، پەڵە هەورێك، هەوری سپی

**غَمَامَة ـ غُمَامَة:** چاوبەست، دەم بەست،قەمتەر، لەواشە

**غُمَّة:** خەمو پەژارە، خەفەت، نادیار، شاراوە

**غَمَتَ الطَّعَامُ فُلانًا:** خواردنی چەوری خواردو گەدەی تێکچوو

**غَمَتَ الشَّيءَ (غَطّاه):** دایپۆشی، گرتی

**غَمَدَ السَّيفَ (أدخَلَهُ فِي غِمد):** خستیە نێو گێلانەکەیەوە، لەنێو کالانەکەی هەڵکێشا، خستیە بەرگەکەیەوە

**غَمَدَ الشَّيءَ (سَتَرَه):** شاردیەوە، پەنهانی کرد، دایپۆشی

**غَمَدَ الأمرَ (أصلَحَه):** چارەسەریکرد، چاکیکرد، باشی کرد

**غِمْد:** کێلان، کالان، باڵ سەرەوەی مێرو

**غَمِدَت البِئرُ (كَثُرَ مَاؤُهَا):** ئاوی زۆر یان کەم بوو (ئەوشە دژەیەکەکانە)

**غَمِدَت اللَّيلُ (أظلَم):** تاریکبوو، تاریکی کرد

**غَمَّدَهُ تَغْمِيدًا:** کەمو کوڕی داپۆشی، ناتەویەکانی باس نەکرد

**غَمْدِيَةُ الأحْيَاء (فِي عِلم الأحياء):** لەزیندەوەرزانیدا کۆمەڵە جانەوەرێکە باڵەکانی پێشەوەی پتەوەو باڵی دواوەی دەپارێزێ

**غَمَرَ المَاءُ المَكَان( عَـلاَه ):** ئاوداپۆشـی ، پڕبوو لەئاو
**غَمَـرَ المَكَـان بِالمَـاء( غَطَـاه ):** بـەئاو داپۆشی ، پڕیکرد لەئاو
**غَمَرَ فِـي المَـاء( غَمَسَ ):** نقومی کـرد، بەئاو داپۆشی ، لەئاوی هەڵکێشا
**غَمَرَ صَدْرَهُ عَلَـىَّ( إمتَلأَ حِقْداً ):** رقـی هەڵسا ، سینەی پڕ لەخەشمو قین بـوو بەرانبەری
**غَمَرَ يَدُهُ:** ، دەستی چەوربوو
**غَمَّرَ وَجهُهُ:** تێی هەڵسوو ، لێیدا هـەتا رەنگی دیاربێت
**غَمَّـرَ الرَّجُـل( أَلقَـى بِنَفسِـه فِـي الشَّـدَائِد ):** خـۆی خسـتە نێـو مەترسـیەوە،نەفسیهاویشـتە نێـو ناڕەحـەتیو دەردەسـەریەوە، گیانبازیکرد
**غَمَّـرَ بِالشَّيء( رَمَـاهُ أو دَفَعَـه ):** فڕێیـدا یان پاڵی پێوەنا
**غُمِرَ عَلَيه( أُغمِيَ ):** بوورایەوە، لـەهۆش خۆی چوو
**غَمَرَ المَاءُ:** زۆر بوو هەتا هەڵسا
**غَمِـرَ الرَّجُـل( لَـم يُجَـرِب الأُمُـور ):** کاروبارەکـەی تاقینـەکردبوەوە، ئـەزموونی نـەبوو لەسـەری ، ناشـی ، نەفام، گێل ، نەزان
**غَمْـر:** تێهەڵکێشـان ، ژێـر ئاوخسـتن، نقوم کردن
**غَمْرُ المَاء:** لافاو ، لێشـاو ، ئـاوی زۆر ، ئاو هەڵسان
**غَمْـرُ البَحْـر( مُعظَمَـه ):** بەشـی زۆری دەریا ، پانیو بەرینی دەریا، تاچاو بـڕ بکات

**غَمْرٌ مِنَ الثِّيَاب( الوَاسِع السَّاتِر ):** جلو بـەرگی پـانو بـەرین ، پـانو بـەرین ، پانو پۆڕ، شۆڕو داپۆشەر
**غَمْرٌ مِنَ الخَيل:** ئەسپی تیژەو خێرا
**غِمْر- غَمَرَ( حِقْد ):** کینە، رق ، قین
**غُمْر- غَمَر:** ناشی ، نـاکردە ، نـەفام ، نەزان ، گێل ، گەمژە، کەودەن
**غَمَرُ النَّـاس:** ناشـی ، نـەزان، نـەفام ، لێنەزان
**غُمُر:** زافەران ، سپیاو
**غُمَـرُ:** گچکـەترین پەرداخـە کـاتێ لەسـەفەردا ئـاو کـەم بێـت ئـاوی پێدەخورێتەوەو بەرد دەخرێتە نێوی‌و هەریـەك بەئـەندازەی بـەردێك دەخواتەوە
**غَمَرَاتُ المَـوت( شَدَائِدُهُ ):** سـەرەمەرگ، گیانەلا، گیاندان ، دوایین ساتی مـرۆڤ لەژیانا
**غَمْـرَة:** تـەنگو چەڵەمـە ، تەنگانـە، ناڕەحـەتی، مەینـەتی، دەردەسـەری، ئاوێکی زۆرو بێشومار
**غُمْرَة:** زافەران، گێلەژن
**غَمَزَ( جَسَّ ):** پەلی کوتا ، دەستی لێـدا، دەستی کوتا
**غَمَزَ بِالعَينِ أو الحَـاجِب( أشَارَ بِهِمَا ):** چاوی داگرت ، برۆی هەڵتەکاند
**غَمَزَ بِهِ وَعَلَيـه( طَعَنَ عَلَيه ):** توانجـی تێگرت ، بوختانی بۆ کرد
**غَمَزَ فِي مَشيِه( عَرَج ):** لەنگی، شـەلی ، شـەلە شـەل رۆیـی بـەرێوە، لـەنگو شەلبوو لەرۆییندا
**غَمَزَ بِفُلاَن:** خراپی گوت بەرانبەری

**غَمَزَ عَلَى فُلَانٍ( طَعَنَ فِيهِ ):** رەخنەی لێگرت ، نکوولی دایە پاڵی

**غَمَزَ الكَبشَ وَغَيرَه بِيَدِه:** دەستی دا لەبەرانەکە هەتا بزانێت قەڵەوە یان لاواز

**غَمَزَ زِرَّ الجَرَسِ وَنَحْوَه( ضَغَطَ عَلَيهِ بِأَصْبِعِهِ ):** دەستی خستەسەر ، دەستی پیاناو زەنگی لێدا

**غَمْز - غَمْزَة( طَرفَةُ عَيْنٍ ):** چاوداگرتن چاو هەڵتەکاندن ، تیلایی چاو

**غَمَزَتِ الدَّابَّةُ:** لارو لەوێڕیوو لەرۆیشتنا، قاچی بەیەکا هات

**غَمَسَ النَّجمُ( غَابَ ):** ونبوو، دیار نەما ، ئاوابوو

**غَمَسَ الشَّيءَ فِي المَاءِ:** خستیە ئاوەوە، نقومی کرد، لەئاوی هەڵکێشا ، بیاچەقان ، دایچاند

**غَمَسَ فِي الشَّيءِ( دَخَلَ فِيهِ ):** تێی چوو، چوە ناوی، تێوەگلا

**غَمَسَ اليَمِينُ الكَاذِبَةُ صَاحِبَهَا فِي الإِثْمِ:** سوێندی درۆ خاوەنەکەی خستە گوناهو تاوانەوە

**غَمَسَ الطَّعْنَةَ:** لەجەستەیدا رۆچوو، جەستەی بڕی

**غَمَسَ فِي المَلَذَّاتِ أو الشَّرِّ أو الدَّيْنِ:** نقوم بوو لەشەڕو خراپەیا یان لەقەرزدا

**غَمَّسَ شَرْبَةً( قَلَّلَه ):** کەمیکردەوە، دایبەزاند

**غَمَّسَ الأَمَلَ( سَقَاهَا ثُمَّ ذَهَبَ ):** ئاوی دا، ئاوی پێدا

**غَمْش - غَمَشَاً:** چاوی ئاو دەکا پڕوپوشاویيە

**غَمِصَ عَينُهُ:** چاوی ڕیپۆقاوی بوو، چڵکی پێوەبوو ، ڕیپۆقی دەرکرد

**غَمَصَ فُلَانَاً:** بەسووکو نزم تەماشایکرد

**غَمَصَ النِّعْمَةَ( لَم يَشْكُرهَا ):** سوپاسگوزار نەبوو، سوپای نەکرد

**غَمَصَ عَلَيهِ قَولاً قَالَهُ( عَابَ عَلَيهِ ):** بەلەنگو ناتەواوی دانا، بەسووکو نزمی تەماشایکرد

**غَمَص:** چڵکێکی سپییە کونی فرمێسکو ئەشك دەگرێت

**غَمَضَ الكَلَامُ:** نادیاربوو، نهێن واتابوو، ناڕوونو ئاشکرابوو

**غَمَضَ المَكَانُ:** نزم بوو ، نەویبوو هیچی لێ نەدەبینرا

**غَمَضَ الدَّارُ( بَعُدَتْ عَنِ الشَّارِعِ ):** لەشەقامەکەوە دووربوو

**غَمَضَ عَينُهُ( نَامَتْ ):** چاوی لێکناو نوست ، خەوت

**غَمَضَ الكَعْبُ:** گۆشتو قەڵەوی رەقایی قاچی داپۆشی

**غَمَضَ فُلَانٌ فِي الأَرْضِ ( ذَهَبَ فِيهَا وَغَابَ ):** رۆییو ونبوو بەنێو زەویدا، دیار نەما

**غَمَّضَ عَنْهُ فِي البَيْعِ أو الشِّرَاءِ( تَسَاهَلَ ):** ئاسانکاری کرد، نەرمو نیانی نواند

**غَمَّضَ السَّيفُ فِي اللَّحمِ ( غَابَ ):** ونبوو، رۆچوو، دیار نەما

**غَمَّضَ الكَلَامَ( أَبْهَمَه ):** نادیاریکرد، واتاکەی پەنهانو شاراوەکرد ، قسەو وتەکانی شاردەوە

**غَمَّضَ عَينَهُ( أَطبَقَ جَفنَيهِ ):** چاوی نوقاند، پێڵوی چاوی نایەسەر یەك

**غَمَضَ عَينَهُ عَنْ كَذَا:** چاوی لێ پۆشی ، لێی بورد، گوێی نەدایە

**غَمَضَ فُلانٌ (ارتَكَبَ الذُنُوب):** تاوانی ئەنجامدا

**غَمَضَ عَلَى هَذَا الأمر:** لەسەری رۆیی و دەیزانی چی تێدایە

**غَمَضَ فِي البَيع (تَسَاهَلَ):** ئاسانکاری تێدا کرد، ئاسان و سانای کرد

**غَمَّضَ المَيتَ (أغمَضَه):** چاوی نوقاند، دیدەی لێکنا

**غَمُضَ المَكَان:** نادیاربوو، پەنهان بوو

**غَمْض:** زەوییەکی نزم و نشێو

**غُمُوض:** چاونوقان، چاولێك نان ، نووستن ، خەوتن ، سەرخەوشکاندن

**غَمضَةُ عَين (رمشَةُ عَين):** چاوتروسکان، چاولێك نان [illegible]

**غَمَطَ فُلانٌ [illegible] (...واحتقره):** [illegible]

**غمط النعمة (...ولم يشكرها):** [illegible] نیعمەت و [illegible]

**[illegible] بشدة:** بەتوندی [illegible]

**غمط الحق (أنكره وهو يعلمه):** [illegible]

**غمط العافية والنعمة:** بەرچی دایەوە و سوپاسی نەکرد

**غَمط (المنخفض من الأرض):** زەوییەکی نزم [illegible]

**[illegible]:** لەکاتی [illegible]

**غَمْغَمَ الأبطَالُ:** لەکاتی جەنگ و هەرادا دەنگیان لێبەرزبووەوە

**غَمْغَمَ الصَبِي:** بۆمەمکەی دایکی گریا ، بۆ شیر گریا

**غَمْغَمَة (الكَلامُ الذي لايُبَيِن):** قسەو وتەیەکی نادیار ، قسەی نادیار

**غَمِقَ ـ غَمِقَ ـ غَمُقَ المَكَان (كَانَ رَطباً):** شێداربوو، زرنگبوو

**غَمَقَ المَكَانُ (غَمُقَ):** قووڵبوو، نشێوبوو

**غَمِقَ النَبَاتُ:** خراپ بوو ، شێدارو تەڕبوو بەهۆی شەونم لێنیشتنەوەی بۆگەنی کرد

**غَمِقَ البَلَدُ:** ئاوی زۆر بوو ، شێداربوو

**غَمَّقَ (عَمَّقَ):** قووڵیکرد

**غُمْق (عُمْق):** قووڵی ، چاڵی

**غَمَق (النَّدى):** شەونم ، [illegible] ، [illegible] قەراو، [illegible] شەوان

**غَمِلَ النَّبَاتُ:** لەسەریەك نیشت و بۆگەنی کرد، بۆنیکرد

**غَمَلَ الأمر (سَتَرَهُ وأخفَاهُ):** شاردیەوە، پەنهانیکرد، نادیاریکرد

**غَمَلَ فُلاناً (غَطَاهُ بِاثِيَاب لِيعرَقَ):** بەجل و بەرگ دایپۆشی هەتا ئارەق بکاتەوە

**غَمَلَ البُسر:** [illegible] هەتا [illegible] بگات [illegible]

**غَمَلَ الأُديم:** [illegible] تا بگەنێت و تووکەکەی [illegible] بکاتەوە لەکاتی راکێشانیدا

**غَمَلَ العِنَبُ فِي الزَّبِيل:** یەك لەسەریەك پێگەیی، وەبەرهات

**غَمِلَ النَّبْتُ:** بۆگەنبکرد ، بۆنیکرد

**غَمِلَ الجرحُ:** بەستن خراپــی کــرد ، تێکیدا ، پتر شێواندی

**غُمَالِج:** ڕوەکێکە لەبەهاراندا دەڕوێت

**غُمَالِجٌ مِـنَ الرَّجُـلِ( الـذي لايَثْبُـتُ عَلَـى حَـالٍ ):** ئـەوەی لەسـەر حـــاڵو بــارێك جێگیر نابێتو ناوەستێ

**غُمَالِجٌ مِنَ القَصَبِ:** ئاودراو

**الغَمَلَّج ـ الغَمَلَّجُ:** ناجێگیر ، نەچەسپاو، ناجێگیرو لەسەر حاڵو بارێك

**الغَمَلَّسُ:** گەندەڵو پیسی تیژڕەوو پـتر بۆ گورگ بەکار دەبرێ

**غَمَـنَ الجِلْـدَ:** لـەخاكدا دایپۆشـی هـەتا تووکەکانی لێبێتەوە

**غَمَنَ البِسرَ( غَطَّاهُ لِيَطِيـب ):** دایپۆشـی بۆئەوەی پێی بگات

**غَمَنَ فُلاناً ( غَطَّــاهُ لِيَعْـرِقَ ):** دایپۆشـی بۆئەوەی ئارەق بکاتەوە

**غَمَنَ فِي الأَرضِ( أَدخَـلَ فِيهَا ):** خستیە نێو زەوییەوە ، بردی بەنێو زەویدا

**غُمْنَة:** سپیاوو سووراو ، میکیاج

**غَمُـوس:** ســوێندی درۆ ، جــەرگ بــڕ، کاری سەختو دژوار

**غَمُـوسٌ مِـنَ الرِّجَــال:** مــەردی دلــێرو گوستاخ

**غَمُوص:** درۆزن ، ناڕاست

**غُمُــو ـ غُمُوضَـــة( إِبْـهَام ):** نــهێنی، نادیاری، شــاردراوەیی، پۆشــراوەیی، پۆشراوی ، نێلایی

**غَمَـــوم:** هەســارەو ئەســتێرەی وردی نادیار

**غَمِـــيَ( أُغْمِـــيَ عَلَيــــه ):** بووراپــەوە، بوردەوە، لەهۆش خۆی چوو

**غَمِيَ اليومُ والليـل:** شـەوو ڕۆژ بەهـەور گیرابوو نەتیشکی خۆرو نەهی مـانگ بەدەرنەکەوتن

**غَمِــيرٌ( المَــاءُ الكَثِــير ):** ئــاوێکی زۆرو بێشومار

**غَمِيزٌ( العَيب ):** ناتەواوی، کەمو کوڕی

**غَمِيزَة:** سستیو لاوازی ئەقڵو ژیــری ، لاوازییەکە لەئەقڵ یان کرداردا

**غَمِيضَة:** ناتــەواوی، کــەمو کــوڕی، لارو لەویری

**غَمِيق:** قووڵ، سووتاڵ ، سووتار

## غ ن

**غَنَّ:** لوتنبوو، بـەلووت قسـە دەکـات ، مینگن بوو

**غَنَّ الروضـةُ أو الـوادي:** پـڕ درەخـتو سەوزایی بوو

**غَــنَّ النَّخــــلُ( أَدْرَكَ ):** پێگــــەیی ، وەبەرهات

**غَنَّى ـ تَغَنَّــى( طَـرِبَ ـ تَرَنَّـم ):** گۆرانـی وت ، چریکانی ، چراندی

**غَنَّى الحَمَام:** کۆترەکە خوێندی

**غَنَّى الشِّعْرَ وبالشعر:** هۆنراوەکەی کرد بەگۆرانی

**غَنَّى بـالمرأة ( تَغَزَّلَ بِـهَا ):** پیاهـەڵدا ، باســی جوانــیو شــوێنی ســەرنج ڕاکێشی کرد

**غَنَّى الشَّاعر بفُلانٍ( مَدَحَـهُ أو هَجَـاهُ ):** پیـای هـەڵدا یـان زەمیکـرد، باســی سیفەتە باشەکانی کرد یان خراپەکانی، بەرزی کردەوە یان سووكو نزم

**غَنَّـى اللهُ فُلانَـــاً:** دەوڵەمـەندی کـرد، دایە، پیّی بەخشی

**غَنَّى فُلاَنٌ الرَّكْبَ بِفُلاَن( ذَكَرهُ لَهُم فِي شِعْر ):** هۆنراوەی ئەوی بۆ خوێندنەوە

**غَنَاءُ:** دەوڵەمەندی، وازووی هەژارییە، سوودو پێویستی

**غِنَاء:** گۆرانی وتن ، گۆرانی بێژیی ، سروود، گوتنی هۆنراوە بەدەم ئاوازێکی مۆسیقی تایبەتەوە

**غَنَاء:** سەوزایی ، دارستان

**غُنَاج( دَلاَل ):** ناز ، چەم و خەم ، نازو نووز، گریشمە ، گروشمە

**غِنَاظُ( الهَم الشَّدِيد وَالْمَشَقَّة ):** غەم و پەژارەی سەخت و گران

**غَنَّام:** یەکێك مەڕو ماڵاتی زۆر بێت ، شوانی مەڕ، ئەوکەسەی تالانی و دەستکەوتی زۆر دەست دەکەوێ

**غُنَان( صَوتُ الذُّبَاب ):** گیزەگیزی مێش، دەنگی مێش و مەگەز

**غُنَّة :**مینگە، دەنگێکە لەلووت دێتە دەرەوە

**غَنِجَ ـ تَغَنَّجَ( تَدَلَّل ):** نازیکرد، خۆی نازان ، خۆی بەناز فرۆشت

**غُنْج ـ غُنُج( دَلاَل ):** ناز ، نازکردن، نازو نووز، چەم و خەم ، گرێشمە، گروشمە ، لارولەنجە، عیشوە، چِف

**غُنُجٌ:** چاوتێری گەورە، چاو مەست

**غَنِج( مُدَلَّل ):** نازدار، بەناز

**غُنْدُبَة:** دوو پەردەی جووتەی لۆزەتێن

**غُنْدُر:** قەڵەو ، ئەستوور، تێکسمڕاو، کەتە ، شیشمان

**غُنْدُر:** لاوی جوان و نەرم و نۆڵ

**غَنْدَرَة( مِشْيَة فِيهَا تَبَخْتُر وَدَلاَل ):** لارو لەنجە ، رۆیشتنێك خۆبەزلزانینی تیایە، ترۆفیز

**غُنْدور ـ غُنْدُورَة:** بەلارو لەنجە ، بەترۆفیز

**الغُنُوصِيَّة:** رێبازێکی فیکرییە هەوڵدەدات فەلسەفە تێکەڵ بەئایین بکات و لەسەدەی یەکەم و دووەمی زاینیدا سەری هەڵدا

**غَنَظَ ـ غَنَظَاً:** خەریکبوو تیابچێت و پاشان رزگاری بوو، وەختەبوو لەناوبچێ، بەئەستەم قوتاربوو

**غَنَظَ الأمرُ فُلاَنَاً( صَعُبَ عَلَيهِ وَأتْعَبَه ):** قورس و گران بوو لەسەری و ماندووشەکەتیکرد ، ئەستەم و سەخت بوو لای

**غَنِمَ الشَّيءَ( فَازَ بِه ):** بردیەوە، دەستی کەوت ، بەدەستی هێنا

**غَنِمَ الغَازِي فِي الحَرب( ظَفَرَ بِمَال عَدُوه ):** ماڵ و دارایی دوژمنەکەی دەستکەوت ، ماڵی دوژمنەکەی کەوتە دەست

**غَنَّمَ ( أغْنَمَ ـ مَنَحَ ):** بەخشی ، پێی‌دا، دایە

**غُنْم( الفَوز بِالشَّيء مِن غَير مَشَقَّة ):** بردنەوەی شتێك بەبێ ناڕەحەتی و کۆسپ و رێگر، دەستکەوت ، سوود

**غَنَم( شَاة ):** مەڕ، پەز، بیهی ، مەهی ، مەهـ ، گیاندارێکی مێینەیە خوریداری دووگداری ماڵییە

**غَنَم ذُو الأُذُن البَيْضَاء:** چار ، مەڕێکی لەش سپی خاڵێکی رەش یا خەتێکی درێژو رەش بەنێو چاودا هاتبێ

**غَنُوجَة:** ژنی بەنازو مەکر، مەکرباز

**غَنِيَ فُلاَن( كَثُرَ مَالُه ):** دەوڵەمەندبوو، ماڵ و دارایی زۆر بوو

**غَنِيَ عَنِ الشَيءِ( لَم يَحتَج إلَيهِ ):** پێویستی پێی نەبوو، بێ پێویست بوو بۆی
**غَنِيَ المَكَان( عُمِرَ ):** ئاوەدانکرایەوە، دیاردەی ئاوەدانی تێکەوت
**غَنِيَ بِالمَكَان( أقَامَ فِيهِ ):** تیای مایەوە، جێنشین بوو تیایدا
**غَنِيَ القَومُ فِي دِيَارِهِم( طَالَ مُقَامُهُم فِيهَا ):** زۆر تێیدا مانەوە، مانەوەیان درێژ خایان بوو
**غَنِيّ:** دەوڵەمەند، بوە، لەناوەجوانەکانی خوای گەورەیەو بەتەنیا زاتی خوا پێویستی بەکەس نییەو مەردومیش بەشێوەیەکی گشتی ئاتاجی ئەون ، ساماندار، دەسترۆیوو ، چاوتێر
**غَنِيٌّ عَنِ البيان( وَاضِحٌ بِذَاتِهِ ):** ئاشکرا، روون ، پێویست بەباس و لێدوان ناکات
**غَنِيٌّ عَنِ التَّعرِيف:** خاوەن ناوبانگەو ناوبانگی رۆیوەو پێویست ناکات بناسێنرێت
**غُنيَان:** بێنیازی، بێپێویستی، تێرو پڕی، چارە
**غِنيَة - غُنيَة:** بێپێویستی ، بێنیازی، تێری ، رازی بوون
**غَنِيَت المَرأة:** بێنیاز بوو لەمێردو شوەکەی، دەستبەرداری مێردەکەی‌بوو
**غَنِيم:** ئەو دەستکەوتانەی بەتۆپزی‌و زۆر لەجەنگاوەران دەسێنرێ
**غَنِيمَة:** دەستکەوت ، سوود ، کەڵك ، تاڵانی ، یەغما ، ئەوشتانەی بێرەنج‌و ماندوبوون بەدەست دێت ، فەرهووت

**غ هـ**

**غَهِبَ عَنهُ( غَفَلَ عَنهُ وَنَسِيَهُ ):** لێی بێئاگابوو، لەبیری‌کرد، لەیادی چوو
**غَهَب:** بێئاگایی، لەبیرچوون، لەیادکردن، نەخۆشی لەبیرچوونەوە

**غ و**

**غَوَى:** وێڵبوو، سەرگەردان بوو، ونبوو، سەری لێشێوا ، تووشی بەڵاو نەهامەتی هات
**غَوَى الرَضِيعُ:** شیری زۆر خوار هەتا گەدەی ترشاو تێکچوو
**غَوَى الشَيطَانُ فُلاَناً( أضَلَّهُ وَخَيبَهُ ):** سەری لێشێواند، وێڵ‌و سەرگەردانیکرد
**غَوَى - تَغوِيَة:** فریوویدا، هەڵی خەڵەتان، چاوبەستی لێکرد
**غَوَائِل:** بەدبەختی، نارەحەتی، مەینەتی، دەردو نەهامەتی
**غُوَاث( المَعُونَة ):** یارمەتی، کۆمەکی، یاریدەدان، فریادڕەسی
**غَوَارِزُ مِنَ العُيُون:** چاوی وشك‌و بێفرمێسك ، چاوی بێسۆزو بەزەیی، بێفرمێسك
**غَوَّاص:** مەلەوان ، ئەوەی دەچێتە ژێر ئاو ، دەسبڕ لە پەیداکردنی بژێوی‌و دەرامەتدا
**غَوَّاصَة:** کەشتی جەنگی، ژێرئاو گەڕ، کەشتی ژێر ئاو، ژێر دەریایی، ژێر ئاوی، کەشتیەکی ژێر ئاوەو ماوەیەکی زۆر دەتوانێت لەژێر ئاوا بمێنێتەوەو کاری گوللەبارانکردنی کەشتیەکانی دوژمنە لەدەریادا
**غَوّثَ الرَجُل:** هاواری فریاگوزاری لێبەرزبوەوە، داوای فریادگوزاری کرد

**غَـوث:** پارسەتی، پشتگیری، هاوار بردن، ئالۆزەسی، پەنابردنە سەر، داوای پارمەتیکردن، هانا بردن

**غوج مِنَ الرجـال:** پیاوی راكشاوی خەوالوو

**غَوَرَ غاصَ:** نقوم بوو، رۆچوو

**غَوَرَ الماءُ:** چوو بەناخی زەویدا، رۆچوو بەناویدا

**غَوَّرَ الشَّمْسُ( غرَبَـتْ ):** ئاوابوو، دیار نەما، ونبوو

**غَوَّرَ النَّهارُ( زالَـتْ شَمْسَـه ):** خۆرەكەی ئاوابوو، تیشكی خۆر دیار نەما

**غَـوَّرَ فُلانٌ:** چـووە بنـج و بناوانیـەوەو رۆچوو تیایدا، قوول بووەوە

**غَوَّرَ عینُه:** چاوی بەقوولاچوو

**غَوَّرَ الرَّجُلُ:** رۆیی یان دابەزیی یاخود بەرۆژی نیوەرۆ نوست

**غَوَّرَ التّـومُ( هزَمهُم ):** بەزاندی، زالبوو بەسەریا

**غَوْر:** قوولی، قەولایی، چالایی، بن، قوولایی هەرشتێك، گەنجینەی پەنهانی نادیار لەنێو زەویدا، هەر زەوییەكی نزم و نەوی، ئەشكەوت

**غَور( الدِيَةِ ):** خوێنبایی، خوێن

**غَوْرَةٌ:** خۆر، رۆژ، نوستنی نیوەرۆ، نیوەڕۆخەو

**غَـوَّزَ المـادةَ( كيمياوِيّـاً ):** لەكیمیادا ماددەكەی گۆری بۆ گاز، كردی بەگاز

**غَـوَص( جعلَـه يَغُـوص ):** نقومیكـرد، خستیە ژێر ئاو، هەڵیكێشا لەئاو

**غَوَص( غطَس ):** نقوم بوون، چوونە ژێر ئاو

**غَوَّطَ البِئْر:** فرە هەڵیكەندو قوولیكرد

**غَـوْطُ:** زەوییەكی بەرینی نزم، فرە نزم و بەرین

**غَوْطَة:** زەوییەكی نزم

**غُوْطَةٌ:** كۆگەی رووەك و ئاو، زەلكاو، زرنگاو

**غَوْغَـاء:** قاووقیژ، دەنگە دەنگ، هەراو هوریا، گرم و هـور، شەرەنگێز، خەڵكی هەرچی و پەرچی، نزم و سووك، ئاژاوەچی، قەڵەباڵغی، چرە، مێرشی كوللە، ژاوەژاو

**غَـــوْل:** سەرئێشە، ژانەسەر، سەرخۆشی، ناڕەحەتی، ماڵ وێرانی، نەهامەتی، بەلا، خاك و خۆڵی زۆرو بێشومار

**غُـول:** دێو، درنج، دەعبا، مار، ئەژدیها، مەرگ، بەلاو نەهامەتی

**غُوْلَة( أُنثَى الغُول ):** دەلەدێو، بەچكەی مێینەی دێو

**غَـوِيَ:** گومرابوو، سەرگەردان بوو، وێڵبوو

**غَوِيَ الرَّجُل:** گومرابوو، سەرگەردانبوو

**غَـوِي:** گومـڕا، سەرگەردان، وێڵ، نائومێدی، ونبوو

**غَوِيـش:** پیتـاك، ئەوەی دەدرێت بەلێقەوماو بێ دەرەتان لەخواردن و پارە یاخود نەوازش و دڵنەوایی و ...

**غَويطٌ مِنَ الأشْيَاءِ( البَعيدَةُ القَعْر ):** بن قوول، شتێ بنی قوول بێت

**غ ي**

**غَيَّا الغَايَـةَ:** ئالای هەڵكرد، بەیداخی چەقاند

**غَيَّا فُلانَاً ( جَعَلَ لَهُ غَايَةً ):** ئامەبەستێکی دەستنیشان کرد، ئامانجی دیاریکرد

**غَيَّا الشَّيءَ( جَعَلَ لَهُ نِهَايَةً ):** کۆتاییەکەی بۆ دانا ، کۆتاییەکەی دەستنیشانکرد

**غَيَّا الطَّيرُ عَلَى الشَّيءِ( رَفْرَفَتْ ):** هەڵفڕی ، فڕی، باڵی گرت

**غَيَابٌ( قَبر ):** گۆڕ، قەبر ، گۆڵکۆ، چاڵ

**غَيَاب الشَّجَرِ( عُروقُه ):** رەگو ریشەی، رەگەکانی

**غَيَاب:** خۆرئاوابوون، نەبوون ، لەوێ نەبوون ، نەهاتوو ، ئامادە نەبوون ، دیارنەبوون

**غَيَابَةُ( قَعْر ):** بن ، قوولی، چاڵی

**غَيَابَةُ الجُبِ( قَعْرُه ):** بنی بیر

**غِيَاثٌ:** پشتگیری ، یارمەتی ، هاوار بۆ بردن ، دادرەسی ، پەنابردنەبەر

**غِيَار:** گۆڕین ، لەجیاتی دانان ، قەرەبووکردن، بژاردن ، خواردنێکی هێنراو ، هێماو نیشانەی زیمی (نا موسوڵمانەکان)

**غَيَّان:** گومڕا ، وێڵ، سەرگەردان

**غَيَايَة:** سەربان ، بان ، سەر ، هەر شتێك لەسەرووی مرۆڤەوە بێت وەك هەورو تاریکایی ، رووناکیو تیشکی خۆر ، قوولایی بیر

**غَيَّبَ( أبْعَدَ ):** دووری خستەوە، پەراگەندەی کرد

**غَيْب:** نادیار، ون بوو، نهێن، غەیب ، نەبوون، نادیاری، هەرشتێك نادیاربێت لەمرۆڤ، زەوی لەبارو گونجاو

**غَيْبَة:** دوورو پەنهان

**غِيبَة:** غەیبەت ، باسکردنی یەکێك لەپشت خۆیەوە بەخراپە ، بەدگۆیی بەرانبەر بەیەکێك

**غَيْبُوبَة:** بێهۆشی ، بێئاگایی ، خۆرئاوابوون ، لەهۆش خۆچوون ، بوورانەوە ، بوردنەوە

**غِيَّة ـ غَيَّة:** گومڕایی ، گوناه ، تاوان، سەرگەردانی ، وێڵی، ئاوارەیی ، خولیا، حەزلێکردن

**غِيَّة:** منداڵی نادروست ، یەکێك لەئەنجامی پەیوەندییەکی نادروستەوە لەدایك بووبێت ، زۆڵ

**غَيث:** باران ، باران ، ڤاران ، ئەو تنۆکە ئاوانەیە کەهەور بەسەر گۆی زەویدا دەباریّنێ دەخڵو داروگژوگیاو باخچەی پێ تێراو دەبێ، گیایەکە بەئاوی باران روابێت

**غَيْثَرَة:** تێکەڵبوونو تێکچڕان لەکاتی کوشتارو شەڕدا

**غَيِدَ:** ملی خواربوەوە، شلەپەتێبوو ، خوارو خێچ بوو ، تەپەترەبوو

**غَيَدْ( نُعُومَة ):** نەرمی، وردی، نیانی، ناسکی

**غَيْدَاء:** ژنی ناسكو باریك ئەندام

**غَيْدَان:** لاوێتی ، هەرزەکاری، گەنجێتی، سەرەتای تەمەن و ژیان

**غَيْدَاقٌ مِنَ الغِلْمَان:** نەرمو شلەپەتە، منداڵی تەپەترە ، تەپۆ

**غَيدَاقٌ مِنَ الرجُلِ ( الكَرِيم الجَوَاد ):** پیاوچاك، چاکەکار، سەرڕێز بەخشندە، چاکەخواز

**غَيدَاقٌ مِنَ الخَيلِ:** ئەسپی تیژڕەوی خێرا

**غَيْـدَاقُ مِـنَ العَيْـش:** ژنێکـی خۆشگوزەران، ژینی بەرین و گوشاد لەرووی ئابوورییەوە

**غَيْدَقَ الرَّجُل(كَثُرَ لُعَابُه):** تفو لیکی زۆر بوو، لیکن بوو

**غَيْرَ (بَدَلَ):** گۆڕی، شتێکی تری لەجێ دانا

**غَـيْر(سوَى ـ آخر ـ خِلاَف):** بێجگـە ، جگە ، جگە لە ، بێجگە لە، دی، هیتر، دیکە، جیاواز، جیا لە

**غَيرُ صَـافٍ:** ناپـاك، نامـەرد، لێـڵ ، ناروون

**غَيْرُ مَأْلُوف:** ناباو، نائاسایی، نابەجێ

**غَيْرُ مَوجُود(غَائِب):** نەبوو، نادیار، نیە

**غَـيْر(فِي القَـانُون):** لەیاسـادا لایـەنی سێیەمە لەکێشەو گیرو گرفتدا

**غِـيَرُ الدَّهْـر:** باروحاڵـە گۆڕاوەکـانی رۆژگارو سەردەم

**غَـيْرَان:** مـەردومی گومـاندار، ژن و پیاوێك غیرە لەیەك بكەن ، زۆمـدار، رەشكن

**غَـيْرَى:** ژنـی بـەگومان ، ژنێـك غـیرە بكات لەمێردەكەی

**غَـيْرَة:** زۆم ، رەشـك ، پـەرۆش ، پیاوەتی پەروەر، خەمخۆر ، جگەرسۆز

**غَيْرِيّ(مُحِب للآخَرِين):** كەسان دۆست، خۆشەویستی كەسانیتر، خۆنەویست ، واژووی خۆپەرستە

**غَيْرِيَّة(حُـبُّ الغَـير):** كەسـان ویسـتی، خۆنەویستی

**غَيِسَ ـ غَيَسَـاً(نَعُـمَ ولاَنَ):** نـەرم و نۆڵبوو، نیان و نەرم بوو

**غَيْسَـان:** هـەرزەكاری، گـەنجێتی، سەرەتای لاوی ، هەرەتی لاوی

**غَيْسَانِيّ:** جوان ، قەشەنگ، كەشخە

**غَيَّضَ المَاءُ:** كەمیكردەوە، كەلی كرد

**غَيَّضَ الثَّمَن:** نرخـی كـەم كـردەوە، نرخی دابەزاند

**غَيَّضَ دَمْعَهُ(حَبَسَه):** فرمێسكی گـرت ، نەیرشت

**غَيْض:** كـەم ، كـەمێك، تۆزێك، منـاڵی لەبارچوو، نابەكام، ناتەواو

**غَيْـض(الطَّلْـع):** سـەرەڵداو، سەركەوتوو، دەركەوتوو

**غَيْضَـة(أجَمَـة):** بێشـە، جەنگـەڵ، دەوەن، زۆنگ، زەلكاو

**غَيْـطُ:** زەوییـەكی بـەرین و فـراوان، باخچە، باخ

**غَيَّـظَ(أغْضَـبَ):** تورەیكـرد، رقـی هەڵسان، دیقی پێكرد، خەشمی گرت

**غَيَّظَ(إغْتِيَـاظ ـ غَضَـب):** تورەیـی، تورەبوون ، جـاڕس بـوو ، رق ، قـین ، دیق كردن

**غَيفَ الأَسْنَان:** كەردنی نەرم و ناسكبوو

**غَيَّـفَ(فَـرَّ وجَبُـنَ):** ترسـنۆك بـوو، هەڵهات ، قووچاندی ، رایكرد

**غَيَّقَ فُلاَن فِي رَأْيِه(إخْتَلَط فِيه فَلَم يَثْبُت عَلَى شَيء):** تێكـەڵبوو ، جێگیر نـەبوو لەسەر حاڵ و بارێك

**غَيَّقَ مَالَهُ(أفْسَدَه):** خراپیكرد، تێكیدا، شێواندی

**غَيَّـقَ الشَّـيء بَصَـرَه(حَـيَّرَه):** سەرسـامیكرد،تووشـی سـەر سوڕمانیكرد، ئەبڵـەقی كـرد، واقـی وڕمان

**غَیْل**: شیری سك پڕ، شیری ئاوس، ئاوی لەبەرۆیشتوو بەسەر رووی زەویدا
**غَیْلٌ مِنَ الغِلْمَان**: منالّی قەڵەو، خڕ، قەڵەو، خەپان ، گۆشتن ، خڕپن
**غَیْلٌ مِنَ الأرض**: ئەو زەوییەی بەنزیك دەبینرێت بەلاّم لەراستیدا دوورە
**غَیْلٌ مِنَ الشَّجَر**: دارودرەختی چڕوپڕ، بەیەکاچوو
**غِیل**: دۆڵو شیوێك ئاوداربێت ، بێشە، جەنگەڵ، دارودرەختی چڕوپڕ
**غَیْلاَن**: دەرەختی مۆز، دارمۆز
**غَیْلَة**: ژنی قەڵەو تێکسمڕاو، خەپە ، قەڵەو
**غِیلَة**: خەڵەتاندن، فێڵ، تەڵەکە، شیردان لەکاتی سك پڕیدا
**غَیْلَم**: نێرە کیسەڵ، رەقە ، تووکن ، لاوی جوانو قەشەنگ، سەرچاوەی ئاو لەبیردا
**غَیِمَ البَعِیرُ**: تینووی بوو، پێویستی بەئاو بوو
**غَیْم**: هەور، ئەور، کەشەوری ئاسمان ، تینووێتی
**غَیْمَاء**: تینوو، گەواڵە هەور
**غَینَ عَلَى الرَّجُل**: بێئاگاو نەزان بوو، بەنەزانی شانی پیاکرد
**غِینَ بِفُلاَن( غُشِيَ عَلَيه )**: بورایەوە، لەهۆش خۆی چوو
**غِینَ بِه**: قەرزاری سەری لێدا ، قەرزاری گشت لایەکی لێگرت
**غِینَ عَلَى قَلْبِه**: حەزو ئارەزوو زاڵبوو بەسەریا

**غَیْن**: پیتی (19) یەمی زمانی عەرەبی‌یە، داری چڕوپڕ
**غَیْنَاء**: درەختی سەوزو چڕوپڕ
**غَیْنَة**: درەختی چڕو پڕ لەچیاو دۆڵێکدا کەدوور لەسەرچاوەی ئاو بێت
**غِینَة**: جەنگەڵو بێشەی فرە درەختو دار، ئەوەی لەمردارەوەبوو دەکەوێتەوە لەبۆنو زوخمو ...، زوخمو کێم
**غَیْهَب**: تاریکی ، شەوی تاریكو چەتوون، ئەسپی رەشی قەترانی، پیاوی رەزاگرانی ساردو سڕ، لاوازی بێئاگا
**غَیْهَبَة**: هەڵمەت لەجەنگا ، هاواری فریادرەسی لەجەنگو شەڕا
**غَیُور**: زۆمدار، رەشکن ، پەرۆش ، پیاوەتی ، خەمخۆر ، جگەر سۆز



غِرْبَال ( بێژنگ )



غُلّ ( کەلەبچە )



غَمَّارَة ( قولاپی ماسی گرتن )



غَنَم ـ شَاة ( مەڕ )



غَفَّارَة (جبەی قەشە)



غَوَّاصَة (ژێر ئاو)



غَشَايَة (پەردە)



غَزَال (ئاسک)



غُرفة الاستقبال ( ژووری پێشوازی )



غرفة النوم (ژووری نوستن)



غرفة الانتظار ( ژووری چاوەروانی )

غرفة الدراسة

( ژووری خوێندن‌و

کۆشش )





غرفة العزف على البيانو

(ژووری لێدانی بیانۆ)



غرفة الاكل

( ژووری نانخواردن)